تصوير ابو عبد الرحمن الكردي





دار المعرفة
بەیرووت

نارين

ناوی کتێـــــــــب: ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ خستنە ڕووی ڕووداوەکان و شیکردنەوەی بەسەر هاتەکان

نوسینــــــــــــی: دکتۆر علی محمد محمد الصّلابی

وەرگێڕانــــــــــی: إحسان برهان الدين

نەخشەسازی نـاوەوە: شنۆ حمدامین

نۆبـــــەی چاپ: یەکەم - ٢٠٠٩.

ژمارەی سپـــــاردن: (١٢٩٤)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێ دراوە.

کتێبخانەی نارین

هەولێر - چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی

E- mail: nareen_1@yahoo.com

تەلەفۆن: 2511982. 66 (00964)

# ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ

## خستنە ڕووی ڕووداوەکان و شیکردنەوەی بەسەرهاتەکان

نوسینی

علي محمّد محمّد الصّلابي

وەرگێڕانی

إحسان برهان الدين

بەرگی یەکەم

نارین

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

والصلاة و السلام على رسول الله

اما بعد، إن ترجمة الكتب العربية الى لغات أخرى ساهم ويساهم في نشر الفكر و التاريخ الإسلامي و يعزز التواصل بين الشعوب و إن اختلفت ألسنتها.

و إنه من دواعي سروري أن تكون كتبي قد طبعت في عدة لغات و منها الكردية- باذن مني - حيث تم الإعتناء و التدقيق بالترجمة و الطباعة الراقية من خلال : **مكتبة نارين - في أربيل – العراق**، فصدرت الكتب بحلة تستأهل منا الشكر و التقدير.

وفقكم الله و سدد خطاكم، و أخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

**د.علي محمد الصلابي**

الدوحة 1/ 6 / 2009

# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العلمين والصلاة والسلام على خاتم الانبياء والمرسلين سيدنا محمد وعلى آله واصحابه واتباعه واحبابه الى يوم الدين.

کارکردن لەبواری ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، لەهیچ بوارێکی تر ناچێت، لە ڕووی نوسین و خوێندنەوەو وەرگێڕان و تێڕامان، چونکە باسەکانی دڵ و دەروون و هەستەکان بەجارێ، ڕادەکێشێ، چی ڕێگرە لەوەی وابێت، لەکاتێکدا ئەوکەسەی باسی دەکرێت موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایە، هەزاران درودو سڵاوی خوا لەسەر بێت، کە هەرگیز مێژووی مرۆڤایەتی، لەسەرەتای بوونەوەرو، تاکو کۆتایی ژیانی سەرزەمین کەسی وەهای تیا دووبارە نەبووەتەوەو نابێتەوە.

ئێمەی مسوڵمانان سەربەرزو خۆشبەختین، بەوەی لە ئوممەتی ئەوین، چەندیش سەربەرزین تاکو پەیوەست بین بە ئایننەکەیەوە، چەندیش لەو واتایە لابدەین، ئەوەندە لەناو تاریکی نەفامیدا قووڵ دەبینەوەو ڕۆ دەچین، ئێمە لەم سەردەمەدا ـ لەوانەیە ـ لەهەموو سەردەمێك زیاتر پێویستیمان هەبێت بەخوێندنەوەیەکی چڕ بۆ ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، چونکە ڕووبەڕووی بەرەنگارییەکی سەخت بووینەتەوە لە شێوەی تاقیکردنەوەدا، ئینجا هۆکارەکانی لەڕێ دەرچوون و لەخشتە بردن زۆرن و زۆرتر دەبن لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژەکاندا، ئێمەش مەزنترین سەرمایەمان بریتی نییە لەماڵ و سامانەکانمان، یان ژن و منداڵەکانمان، یان هەر شتێکی تر ناوی دەنێیت لەم گەردوونە فراوان و جیهانە ئاڵۆزەدا، بەڵکو ئاییننمان سەرمایەو ڕێگای ڕزگار بوونمانە، ئەو ئاینەیش ڕووبەڕووی سەختترین هێرش بووەتەوە لەلایەن عەولەمەوە، کە دوژمنێکە نەك ناوی هەیەو هەزار دەمامك، هەر بۆیە ئێمە لەهەموو سەردەمێکی تر زیاتر پێویستمان بەوە هەیە ژیاننامەو فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ بکەینە مەشخەڵێك ڕێگای خۆمانی پێ بدۆزینەوە، چونکە بریقەی شارستانیەت ـ کە زیاتر نییە لە تراویلکەیەك ـ چاوو دڵەکانمانی ڕاکێشاوەو، خەڵکی خستووەتە خەونێکی قورسەوەو، سەرقاڵی کردوون لەڕاستیە گەورەکەی پاش مردن، ئەم خەونەیش ـ

مەخابن ـ ئەوەندە قورسە، ئەگەر یارمەتی خوای گەورە نەبێت، مەگەر مەرگ بیڕوێنێتەوە، مەرگیش ڕاچەڵەکێنەرێکی ترسناك و بێ سوودە بۆ کەسێك چاوەڕوانی بێت بەبێ کردەوەی چاکە، لەوەش چاکتر پەیڕەوکردنە لەڕێبازی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی.

ئێمە لەئەوپەڕی پێویستی داین بۆ شارەزا بوون لەدیدی پێغەمبەرﷺ بۆ مرۆڤ و جیهان، بۆ ئەوەی خۆمان بناسینەوەو، ڕاستی ژیانیش بەتەواوی شارەزابین، ئەمەیش لەکتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ و فەرموودە ڕاستەکان دەستدەکەون.

منیش زۆر خۆم بەبەختەوەر دەزانم، کە ئەم نووسینەی مامۆستا (علي محمد الصلابي)م وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، چونکە بەشێوازێکی ووردو جوان باسی لە ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەرﷺ کردووە، هەروەها پەندو ئامۆژگاری گرنگی لێ هەڵێنجاوە، بایەخی نووسینەکەشی لەوە سەرچاوە دەگرێت، کە ئاراستەی کردووە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە مسوڵمانانی ئەم سەردەمەو، هاوکات ڕەچاوی ئەو نەخۆشین و گرفتە گەورانەی کردووە، کە وەکو کۆسپێکی نا لەبار ڕێگای مسوڵمان دەگرن، هەروەها لەم سەردەمەدا دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ نوسراون لەهەموو ڕوانگەیەکەوە، بۆیە ئەوکەسەی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، وەکو ئەوەیە چەندین کتێبی دەربارەی ژیانی پێغەمبەرﷺ خوێندبێتەوە.

لەکۆتایشدا داواکارم لەخوێنەری ئەم کتێبە ئێمەش بێ بەش نەکات لەنزاو پاڕانەوەی چاکی لەلای خوای پەروەردگار.

**وسبحانك اللهم وبحمدك اشهد الا إله إلا انت استغفرك واتوب إليك.**

وەرگێڕ

إحسان برهان الدين

کەلار ١٤/ ٤/ ٢٠٠٩

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەكی

إن الحمدلله نحمده، ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهد الله فلا مضل، ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لاإله الاالله وحده لا شريك له، وأن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾(آل عمران \١٠٢) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ (النّساء\١) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾(النساء: الآية/ ١)

يارب لك الحمد حتى ترضى، ولك الحمد بعد الرضا.

لێكۆڵینەوەی ڕێبازی پێغەمبەرایەتی كارێكی گرنگە بۆ هەموو موسڵمانێك، چەندین ئامانجیش بەدی دەهێنێ، لەوانە:

پەیڕەوكردنی ڕێبازی پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەی ئاشنابون بەكەسایەتی و كردارو گوفتار ودەرخستنەكانی، هەروەها خۆشەویستی پێغەمبەری خواﷺ دەبەخشێ بە موسڵمان و پەرەی پێدەداو، ئاشنای دەكات بە ژیاننامەی هاوەڵە بەڕێزەكان، كەجیهادیان كردووە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەولێكۆڵینەوە بانگەشەیان دەكات بۆ خۆشویستنیان و ڕێكردن لە سەر ڕێبازەكەیان و شوێنكەوتنیان، هەروەها ژیاننامەی پێغەمبەرایەتی هەموو وردەكاری ژیانی پێغەمبەرﷺ ڕووندەكاتەوە لە سەرەتای لە دایك بوونەوە تا كۆچی دوایی، بە تێپەڕ بوون بەسەر قۆناغی منداڵی و لاوی وبانگەواز وجیهادو ئارامگرتن و سەركەوتن بەسەر دوژمنانی، بە ئاشكراش دەردەكەوێت، كە پێغەمبەر ﷺ مێردو باوك وسەركردەو جەنگاوەرو فەرمانڕەواو

سیاسەتمەدارو بانگخواز و دادوەرو دونیا بەکەم زان بووە[١]، بۆیە هەموو موسڵمانێك نیازو پێریستی خۆی تیا دەبینێتەوە، بانگەواز لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ فێری شێوازەکانی بانگەواز و قۆناغە یەك بە دوای یەکەکانیدا دەبێت، هەروەها ئاشنا دەبێت بە هۆکاری شیاو بۆ هەر قۆناغێك، سودیان لێوەردەگرێت، سەبارەت بە پەیوەندی کردن بەخەڵك و بانگکردنیان بۆ ئیسلام، هاوکات هەست دەکات بەکۆششی مەزنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاینی خوا، هەروەها پەیبردن بە ڕێگاچارەی ڕاست لەکاتی پێشهاتنی هەر گرفتاری و پەژارەیەك، پەروەرشیاریش (المربي) لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ وانەی پێغەمبەرایەتی وەردەگرێت لە پەروەردەکردندا و کاریگەری لەسەر خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی و لەسەر ئەو هاوەڵانەی لەسەردەستی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ پەروەردە بوون و نەوەیەکی بێ وێنەی قورئانی لێدروستکردن، بە پەروەدەی ئەو پێغەمبەرە مەزنە چاکترین نەوەکانی سەر زەویان لێدەرچووە فەرمانیان دەکرد بەچاکەو خراپەیان قەدەغە دەکرد و باوەڕیان بە خوا قایم بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسانە دەوڵەتی دروست کرد و داد پەروەری بڵاوکردەوە لە سەرتاسەری زەمیندا.

بە هەمان شێوە سەرکردەی جەنگاوەر لە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ دا سیستەمێکی پتەو ڕێبازێکی وردکاری بەر چاوی دەکەوێت، سەبارەت بە هونەرەکانی سەرکردایەتی سوپاو گەل و نەوە، نمونەی ڕونی بەرچاو دەکەوێت لە پلان دانان و کارامەیی لە جێبەجێکردنیان و پەرۆشبوون لەسەر بەرجەستەکردنی دادپەروەری و ڕاگرتنی بنەماکانی ڕاوێژکرن لە نێوان سەرباز و سەرکردەکان، هاوڵاتی و فەرمانڕەواکان.سیاسەتمەداریش فێری ئەوە دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن مامەڵەی دەکرد لەگەڵ سەر سەخترین ناحەزە چەپەڵەکانی وەکو عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول، کە سەرکردەی مونافیقەکان بوو، ئەو بەڕواڵەت ئیسلامی پیشان دەداو لە ناخیشەوە بێ باوەڕو کینە لە دڵ بوو بەرامبەر پێغەمبەرﷺ و پیلانی دەگێڕاو پڕوپاگەندەی بڵاودەکردەوە دژ بە پێغەمبەری

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية دراسة و تحليل، د محمد أبو فارس ل ٥٠.

خواﷺ بۆ ناشیرن کردن و لاوازکردنەوەی و بڵاوە پێکردنی خەڵك لە دەورو بەری، ئینجا چۆن پێغەمبەرﷺ دانی بەخۆیدا گرت و ئارامی گرت بەرامبەر ئیبنو ئوبەی تاکو ڕاستێتی بۆ هەموان دەرکەوت و لێ ی دورکەوتنەوە، تەنانەت نزیکترین کەسەکانی خۆیشی ڕقیان لێ هەڵگرت و لە دەوری پێغەمبەرﷺ کۆبونەوە.

سەبارەت بە زانایانیش کەڵك لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرن بۆ تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز، چونکە ڕاڤە کردنە بۆ قسەکانی خوای گەورە، زۆرێکیشی تیادایە لە هۆی دابەزینی ئایەتەکان و لێك دانەوەیان، بۆیە یارمەتیدەرێکی چاکە بۆتێگەیاندیان لەوئایەتانەو هەلێنجانی فەرمانە شەرعییەکان و ژیان لەگەڵ ڕوداوەکانیدا، هەڵدەستن بەدەرهێنانی ئەو حوکمە شەرعیانەو بەمانای سیاسەتی شەرعی و زانیاری ڕاستیشیان دەستدەکەوێت، هەروەها بەهۆی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ فێری زانستی(ناسخ منسوخ)و زانستەکانی تر دەبین، بەم شێوەیەش دەتوانن حاڵی بن لە ئیسلامی ڕاستەقینەو ئامانجە بەرزەکانی، بەهەمان شێوە خواپەرستان و دونیا بەکەمگرتوان فێری ماناکانی خواناسی و ڕاستی و ئامانجەکانی دەبن، بازرگانیش ئامانجەکانی بازرگانی و سیستەم و ڕێبازەکانی لێوەردەگرن، گرفتارانیش بەرزترین پلەی خۆڕاگری و ئارام دەبەن و توانایان بەهێز دەبێت لەسەر بەردەوامی وابەستە بوونی ڕێگای بانگەوازی ئیسلامی و متمانەشیان بە خوای خۆیان بەهێز دەبێت، چونکە دڵنیا دەبن، کە دوا ڕۆژ بۆ کەسانی لە خواترسە[١]

ئوممەتیش بەجارێ فێری ڕەوشتی جوان و ئاکاری پەسەندو بیروباوەڕی ڕاست و خواپەرستی دروست و دڵپاکی و جیهاد و خۆبەختکردن لە پێناوی خوا دەبن لە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ،بۆیە عەلی کوڕی حەسەنﷺ دەیفەرموو: ئێمە ئاشنایان کردین بەغەزاکانی پێغەمبەرﷺهەروەکو چۆن فێری سورەتێکیان دەکردین لە قورئان.

١ـ بڕوانە: مدخل لفهم السيرة، د. يحيى اليحيى ل ١٤.

واقیدیش دەڵێت: گوێم لە محمدی کوڕی عبدالاّ بوو دەیووت: گوێم لە زوهری مامم بوو دەیفەرموو: غەزاکانی پێغەمبەرﷺ زانستی دونیاو ڕۆژی دوایی تێدایە.[١]

ئیسماعیلی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەیفەرموو: باوکم فێری غەزاکانی پێغەمبەرﷺی بۆ دەکردین و بۆی دەژماردین، دەیووت: لە ڕاستیدا ئەمە شانازی باو باپیرانتانە لێی بێئاگا مەبن.[٢]

لە ڕاستیدا لێکۆڵینەوەی ژیاننامەی پێغەمبەرایەتی سەبارەت بە پەروەردەکردنی ئوممەت و دامەزراندنی دەوڵەت یارمەتی زاناوسەرکردەو فەرمانڕەواکان دەدات بۆ دۆزینەوەی ڕێگای سەربەرزی ئیسلام و موسڵمانان، لە ڕێگەی ناسینی هۆکارەکانی هەڵسانەوەو دواکەوتن، هەروەها ئاشنا دەبن بە شێوازی پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ تاکە کەسەکان و دروست کردنی کۆمەڵی موسڵمانان و زیندوکردنەوەی کۆمەڵگاو بەرپاکردنی دەوڵەت، هەروەها موسڵمان بزوتنەوەی پێغەمبەرەکەی دەبینی لە بانگەوزداو ئەو قۆناغەش، کە پێیاندا تێپەڕیوەو تـوای ڕوبەڕوو بونەوەی شێوازی بەرەنگاری بتپەرستانیان بۆ ئاینی ئیسلام وە پلاندانانی وردی پێغەمبەرﷺ لە کۆچکردن بەرەو حەبەشەو هەوڵدانی بۆ قایلکردنی خەڵکی تاییف بە بانگەوازی ئیسلامی و هەروەها خستنە ڕووی بۆ هۆزەکان لە کاتی کۆبونەوەکانیان لە مەککەو پلە بەپلە بانگەواز کردنی ئەنصارەکان و دواتر کۆچی پیرۆزی بۆ شاری مەدینە.

ئەو کەسەی، کە وردببێتەوە لە ڕووداوی هیجرەت و وردەکاری پلاندان و جێبەجێکردنی سرنج بدات لە سەرەتایەوە تاکو کۆتایی، بۆی دەردەکەوێت، کە پلاندانی پێغەمبەرﷺ هێزی لە وەحییەوە وەرگرتووە، ئەوەشی بۆ دەردەکەوێت، کە پلاندان بەشێکە لە سوننەت، بە شێکیشە لە داوا کاری خوای گەورە لە موسڵمانان بۆ ئەوەی ڕەچاوی بکەن.

---

١ـ البداية والنهاية إبن كثير(٢/٢٥٦، ٢٥٧)ط/ دارالمعرفة، (٢/ ٢٤٢) ط(١٩٧٨) مكتبة المعارف لبنان، مكتبة النصر الرياض.

٢ـ بڕوانە: البداية والنهاية(٢/٢٤٢).

موسڵمانان لە بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەرﷺ فێری هەموو هونەرەکانی بە ڕێوبردنی ململانێ و لێهاتووی دەبن، کە مامەڵەکردن لە هەموو قۆناغەکاندا و هەروەها لە گوێزانەوەی لە ئاستێکی تر و، هەروەها ئەوە فێردەکات، کە پێغەمبەرﷺ چۆن ڕوو بەڕووی هێزی دووژمنەکانی بوویەوە لە جولەکەو مونافیق و بێباوەڕو گاورەکان و چۆنیش سەرکەوتە سەر هەموویاندا بە پشتیوانی خوای گەورە و بە هۆی وابەستەبوونی بە مەرجەکانی سەرکەوتن و هۆکارەکانی، کە خوای گەورە باسیکردوون لە قورئانی پیرۆزدا.

سەر کەوتنی نەتەوەی ئیسلام و گێڕانەوەی سەروەریەکانی وشەرعی خوای گەورە، هەموو ئەوانە بە سراون بە شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەرەوەﷺ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ﴾ (النور:٥٤) ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەی ڕونکردۆتەوە، کە ڕێگای بە هێز بوون لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەﷺ، چونکە ئایەتەکانی پاش ئەم ئایەتە هەر باسی بە هێزبوون دەکات و مەرجەکانی ڕوون دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (النور: ٥٥ـ ٥٦)

پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکانی هەڵسان بە جێبەجێکردنی مەرجەکانی بە هێزبوون، بۆیە توانیان ئیمان بەر جەستە بکەن لە خۆیاندا بە هەموو ماناو بنەماکانی یەوە، هەروەها کاری چاکەیان بە هەموو شێوازەکانی ئەنجامداو سوور بوون لە سەر هەڵسان بە هەموو جۆرەکانی خێرو چاکەو خوا پەرستی لە هەموو شێوازو جۆرو شاراوەییەکانییەوە، هۆکارەکانی بە هێزبوونیان هەمووی بە دەستهێنا لە ڕووی

مادی و مەعنەوییەوە لە سەر هەردوو ئاستی تاك و کۆمەڵ، تا ئەو کاتەی دەوڵەتیان دامەزراند لە مەدینە، ئا لێرە ئاینی بۆ نێو گەلانی سەر زەویدا بڵاوکردەوە.

دواکەوتنی موسڵمانانی ئەم سەردەمە لە سەرکردایەتی جیهانی بۆ گەلانی سەرزەوی، دەرئەنجامێکی سروشتی یە بۆ کەسانێك، کە پەیامەکەی خۆیانیان پشت گوێ خستووە و،کار بەیاساخواییەکان ناکەن و وادەزانن بەهێزبوون بەئاوات و خۆزگە دێتە دی.

ئەوەی، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا تووشی موسڵمانان بووە لە لاوازی بیروباوەڕ و بێسەروبەری فکری و دڵەڕاوکێی دەروونی و پەرتەوازەیی و ناشیرینی ڕەوشت، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم کەلێنە گەورەی دروستبووە لە نێوان موسڵمانان و قورئان وسوننەتی پێغەمبەر ﷺ و سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین و ئەو لاپەڕە پڕشنگدارانەی مێژووی ئیسلامی.

بێگومان ئێوەش وەکو من تێبینی دەکەن، کەسانێکی زۆر پەیدا بوون بەناوی ئیسلامەوە قسە دەکەن، لە کاتێکدا خۆیان زۆر دوورن لەقورئان وسوننەت و ژیاننامەی خەلیفە ڕاشیدەکان، هەندێ زاراوەی نوێ و واتای لاوازیان خستووەتە نێو گوفتاری خۆیان، ئەوەش لە ئاکامی ئەو شکانە دەروونیەیە، کە تووشی بوونە بەرامبەر شارستانی ڕۆژئاوا، بەڵکو وایان بەسەر هاتووە یاری بە ووشەکان دەکەن و ملیان بادەدەن، بە چەندین کاتژمێر قسەدەکەن و چەندان وتار و کتێب دەنووسن دەربارەی فەلسەفەی ژیان و بوونەوەرو مرۆڤ و ڕێبازەکانی گۆڕاندن، بەڵام ئێمە لە قسەی ئەو جۆرە کەسانەدا، یان لە نوسینەکان هەست ناکەین بە قووڵی تێگەیشتن لە چۆنێتی بە هێزبوون و سوننەتەکانی خوای گەورە لە گۆڕینی گەلان و دروستکردنی دەوڵەت لەڕێگەی ئاڕاستەکانی قورئانی پیرۆزو بەرنامەی پێغەمبەری خواﷺ بانگەوازی پێغەمبەران بۆ نەتەوەکانیان بەدوا داچوونی مێژووی پڕ لە سەروەریمان، تاکو بتوانن بۆ نموونە فاکتەرەکانی هەڵسانەوەمان بۆ باس بکەن لە لای نورەدین محمود، یان صەلاحەددینی ئەییوبی، یان یوسفی کوڕی تاشفینی،یان

مەحموودی غزنەوی، یان موحەممەدی فاتح، لەو کەسانەی ڕێگای پێغەمبەرﷺ یان هەڵبـژاردووە لـە پـەروەردەکردنی ئومـەت و دەوڵـەت، بـەڵکو ئـەو کەسـانە بەڵگـە دەهێننەوە لە قسەی هەندێك سیاسەتمەدارو بیریار و ڕۆشنبیری ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات، کە دور ترین کەسـانێکن لـە سروشـت و بەرنامـەی خـوای پـەروەدگار، ئەڵبەتـە مـن یەکێك نیم لەو کەسانەی، کە دژ بە هەموو وەرگرتنێکن لە ئەزموونی گەلان، چونکە دانایی ویستی ئیماندارەو ئەویش مافـداترە پێـی لـە هـەر کوێیـەك دەسـتی کـەوت، بەڵام مـن دژ بـەو کەسـانەم، کـە خۆیـان لـە ڕێبـازی خـوای گـەورە گێـل دەکـەن و بیرەوەری مێژوی پڕ لە پەندو وانە پشت گوێ دەخەن، لە گەڵ ئەوەشدا دەیانەوێت پێـشەوایەتی موسـڵمانان بکـەن لەسـەر هـەواو ئـارەزوی خۆیـان و بـیرو بۆچـوونە دوورەکانیان لە ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزو ڕێنوێنی پێغەمبەرایەتی.

بەڕاستی ئیبنولقەییم جوانی ووتوە، کە دەفەرموێت:

والله ما خوفی من الذنوب فإنها لعلی طریق العفو والغفران.
لکنما أخشی إنسلاخ القلب عن تحکیم هـذا الـوحي والقـرآن
و رضـا بـاراء الرجـال وخرصـها لا کـان ذاک بمنـة الـرحمن.

واتە: سوێند بە خوا ترسم نییە لە گوناهان، چونکە دوور نییە بـەر لێخۆشـبوونی خوا بکەون، بـەڵام لـەوە دەترسـم دڵ هەڵگەڕێتـەوەو قورئـان نەکاتـە فـەرمانڕەوای خۆی، یان بە ڕاوبۆچوون و درۆی مرۆڤەکان ڕازی بێت.

ئێمــە زۆر پێویــستمان هەیــە بــە ناســینی بەرنامــەی پێغەمبەرایــەتی لــە پـەروەردەکردنی ئوممـەت و بـەرپاکردنی دەوڵـەت و ئاشـنابوون بـە سـوننەتەکانی خوای گـەورە لـە گـەل و نەتـەوەو دەوڵەتـدا، چۆنێتی مامەڵـەکردنی پێغەمبـەرﷺ لەگەڵ ئەوانەدا، کاتێك کە دەستی کـردە ئاشـکراکردنی بانگـەوازی ئیـسلام لـە نێـو خەڵکیدا، بەڵکو لە ڕێنوێنی پێغەمبـەرﷺ ڕێگـای ڕاسـتی بانگـەواز بدۆزینـەوەو بـە هێزبوون بۆ ئایینەکەمان دەستەبەر بکەین لەسەر بنەمایـەکی پتـەوو ڕاسـت، پـشت

ئەستوور بین لە هەموو شتێکدا بە قورئان وسوننەتی پێغەمبەرﷺ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب: ٢١) تێگەیشتنی پێغەمبەرﷺ لە پەروەردەکردن و دامەزراندنی دەوڵەت، گشتگیرو بێ کەم و کورتی و هاوسەنگ و، هەروەها ملکەچ بوو بۆ یاساکانی خوای گەورە لە کۆمەڵگاکان و بوژاندنەوەی گەلان و بنیاتنانی دەوڵەت، پێغەمبەرﷺ مامەڵەی لەگەڵ ئەو یاسایانە دەکرد بەئەو پەڕی دانایی و ژیریەوە، وەکو یاسای پلەپلەو، پاڵپێوەنان و، تاقیکردنەوە،وەرگرتنی هۆکارەکان و گۆڕینی دەروونەکان.

پێغەمبەری خواﷺ هەڵسا بە چاندنی ڕێبازی خوایی بە هەموو واتاو بەهاو بیروباوەڕەو بیر لێکردنەوەی دروست دەربارەی پەروەردگارو مرۆڤ و بونەوەر وژیان و بەهەشت و دۆزەخ و قەزاو قەدەر، ئەو شێوازە لە پەروەردەکردندا کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر هاوەڵان، ئەوان سووربوون لەسەر پەیوەست بوون بە ئاراستەکانی یەوە، تەنانەت ئەو کەسەی، کە بۆ ماوەیەك دوور دەکەوتەوە و دەگەڕایەوە، یەکسەر پرسیاری دەکرد لە هاوڕێکانی ئایا چیان دیبێ لە حاڵەتەکانی پێغەمبەرﷺ و فێرکردنی و ئامۆژگارییەکانی، هەروەها پرسیاری دەکرد دەربارەی دابەزینی قورئان لەو ماوەی، کە لەوێ نەبووە، ئەوان پەیڕەوییان دەکرد لە پێغەمبەرﷺ لەهەموو گەورەو بچوکێکدا، ئەم پەرۆشییە و بە دواداچونەیان شتێك نەبوو تایبەت بە خۆیان بەتەنها، بەڵکو دەشیانگەیاندە مناڵەکانیان و دەوروبەریان.

ئەم کتێبە بەدواداچوونی ڕووداوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری ﷺ لە خۆ گرتووە، زانیاری تێدایە دەربارەی بارودۆخی جیهان پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر ﷺ و، ژیارە جیا جیاکان و بارو دۆخی سیاسی وئابوری و کۆمەڵایەتی و ئاکاری لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا، هەروەها دەربارەی ئەو ڕووداوە گرنگانەی پێش لە دایك بوونی پێغەمبەر ﷺ ڕویانداوە و بەهەمان شێوە دەربارەی دابەزینی وەحی و قۆناغەکانی بانگەواز و دامەزراندنی بیروڕاو ڕەوشت و خواپەرستن لە سەردەمی مەککەو، ئەو شیوازانەی بتپەرستەکان دژایەتی بانگەوازی ئیسلامیان پێدەکرد،

جگە لەوانەش زانیاری تێدایە دەربارەی کۆچکردن بۆ حەبەشەو دەردەسەری تاییف و بەخشندەیی ئیسراو میعراج و گەڕانەوە بەنێو هۆزەکانداو کەژاوەکانی چاکەو پێشەنگەکانی ڕۆشنایی لە خەڵکی یەسریب و کۆچی پێغەمبەر ﷺ، هاوکات ئەم کتێبە خوێنەر ئاگادار دەکاتەوە لە ڕوداوەکان و پەندو وانەی پڕ سودیان تیا دەردەهێنێ، بۆ ئەوەی موسڵمانان لە جیهانی هاوچەرخدا بەهرەمەند بن لە سوودەکانی.

توێژەر لەم کتێبەیدا باسی ژیانی پێغەمبەر ﷺی کردووە، هەر لەسەرەتای گەیشتنی بە مەدینە تاوەکو لە دونیا دەرچوونی، هەروەها هەڵساوە بە ڕونکردنەوەی فیقهی پێغەمبەر ﷺ لە گیرسانەوەی کۆڵەکەکانی کۆمەڵگا و پەروەردەکردنی هۆکارەکانی بۆ بنیاتنانی دەوڵەت و بەرەنگاریکردنی دوژمنەکانی لە ناوەوەو ولەدەرەوەیش، توێژەر ڕادەوەستێت لە سەر فیقهی پێغەمبەر ﷺ لە بەڕیوبردنی کۆمەڵگاو ڕێکەوتننامەکانی لەگەڵ ئەهلی کیتابدا، کە تۆمارکراوە لە بەڵگە نامەکەدا، هەروەها باس لە بزووتنەوەی جیهادی و چارەسەرکردنەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ کێشە ئابووریەکان و بەرزبونەوە بە موسڵمان بەرەو واتاکانی ئەم ئایینە، کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ قوتارکردنی مرۆڤایەتی لە تاریکی نەفامیی و بتپەرستی و لادانیان لە شەریعەتی خوای باڵادەست.

توێژەر هەوڵی داوە کێشەی هەڵپاچینی ژیاننانەی پێغەمبەر ﷺ، لەبیرو هۆشی زۆرێك لەڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە چارەسەر بکات، لەم ساڵانەی دووایشدا هەندێك لێکۆڵینەوەی ناوازە نووسرا سەبارەت بەژیاننامەی پێغەمبەرﷺ خوای گەورەیش وەرگرتنی بەو نوسینانە بەخشی لەلای موسڵمانان، وەك: (الرحيق المختوم)ی موبارەك فوری و(فقه السيرة)ی غەزالی (فقه السيرة)ی(البوطي)و (السيرة النبوية)ی ئەبو حەسەنی نەدەوی، ئەم نوسینانە لە ڕاستیدا کورت و پوختەکراو بوون و گشتگیر نەبوو بۆ هەموو ڕوداوەکانی ئەو سەردەمە، هەندێ لە زانکۆکانیش ئەو کتێبانەیان خستە نێو پرۆگرامی وانەکانیانەوە، زۆرێك لە قوتابیەکانیشیان وایانزانی هەرکەسێك ئەو کتێبانە وەربگرێت و لەبەری بکات هەموو سیرەی پێغەمبەرایەتی

زانیـوە، ئەمـەش بـە بۆچـونی مـن هەڵەیـەکی ترسـناکە ئـەنجام دەدرێت بەرامبـەر ژیانامەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، هەمان ئەم هەڵەیە گەیشتەهەندێك لە پێش نوێژی مزگەوتـەکان و سـەرکردەکانی بزوتنـەوە ئیـسلامی یـەکان، بـێ گومـان لـە لای شوێنکەوتوانیش ڕەنگدانەوەی هەبوو، بوو بە مایەی تێگەیشتنێکی ناتـەواو، شـێخ موحەممەد غەزالیش وریاکردنـەوەی ڕاگەیانـدبوو دەربـارەی مەترسـی یـەکانی ئـەم جۆرە بۆچوونە لە کتێبی(فقه السيرة) داو دەیووت: لەوانەیە وابزانیت ئەگەر مێژووی پێغەمبەر ﷺ بخونێتەوە لە لـە دایـك بوونـەوە تـاوەکو لـە دونیـا دەرچـوونی ئـەوا هەموو شتێکی تێگەیشتوی، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە.

تۆ ناتوانیت لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بگەیت، تاوەکو بە تـەواوی لێکۆڵینـەوە نەکەی لە قورئان و سونەتی پیرۆز، تا زۆریش لـەو سەرچـاوانە تێبگـەیت، ئەوەنـدە پەیوەندیت پتەو دەبێت لە گەڵ پێغەمبەری ئیسلام،

بۆیە لەم کتێبەدا خوێنەر دەبینێت، کـە نوسـەر هەڵساوە بـە ڕۆشـنایی خـستنە سەر غەزای بەدرو ئوحود و ئەحزاب و (بني النضير) و صوڵحی حودەيبیە و غـەزای تەبوك، ئینجا هەڵساوە بە دەرخـستنی پەنـدو وانـەکانیان، هـەروەك یاسـای خـوای گەورە لەسەرکەوتن و تێکشکاندا، قورئانی پیرۆزیش بـەچ شـێوەیەك هەڵساوە بـە چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروو نییەکان لە کاتی ڕووداوەکاندا.

لە ڕاستیدا ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بەهەموو نەوەیـەك شـتانێك دەبەخەشـێت، کە سوودی لێوەرگرن لە کاروانی ژیاندا، چونکە گونجاوە بۆ هەموو کـات و سـاتێك، هەمیشە چاککەرو چارەسەرکەریشە.

من سالانێکم لە گەڵ توێژینەوەی قورئان و ژیانامەی پێغەمبـەردا ﷺ لـە تەمـەنم بەسەر بردووە، لە ڕاستیدا ئەوانە چاکترین ڕۆژانی ژیانم بوون، لە کاتی توێژینەوەدا نامۆیی و کۆچکردنی خۆمم لە یاد دەکـرد، کـار لێکردنم بـوو لەگـەڵ ئـەو گەوهـەرو گەنجینانەی، کە لەدووتوێی ئەو کتێب و سەرچاوانە بەدەسـتم کـەوت، ئـیتر منـیش کۆششم کرد بۆ کۆکردنەوەو ڕێخستن و ئامادەکردنیان بۆ نەتەوە مەزنەکەم، ئینجـا مـن دەرکـم بـەوە کـرد، کـە جیاوازییـەکی بەرچـاو هەیـە لـە باسـی پەنـدو وانـە

وەرگیراوەکـان لـە نێـوان نوسـەرانی ئـەم بابەتـە لـە کـۆن و نوێـدا، جـاری وا هەیە(الذهبي) باسی شتێك دەکات، کـە ئیبنـو هیـشام باسـی نـەکردووە، یـان (إبـن کثیر) باسی ڕوداوێکـی کـردووە، کۆکـەرەوانی سـونەتەکانی پێغەمبـەر ﷺ باسـیان نەکردووە، ئەمە سەبارەت بە دێرینەکان، لە هاوچەرخانیش لەوانەیـە زانیاریـەك لـە لای سیباعی بخوێنیتەوە لە لای غەزالی نەبێت، یان(البوطي) شتێکی باس کردبێـت، کە(الغـضبان) باسـی نـەکردبێت، بـەم شـێوەیەش هەنـدێ شـتم بەرچـاو کـەوت لـە کتێبـەکانی تەفـسیر و ڕاڤـەکانی فـەرموودە وەکـو(الفـتح البـاري) و (شـرح صـحیح مسلم)ی نەوەوی و کتێبی زانایان، کە نووسەرانی ژیانامـەی پێغەمبـەر ﷺ باسـیان نەکردووە نە لە کۆن‌و نە لەم سەردمەدا، خوای گەورە بە بەخشندەیی خۆی بـواری بۆ ڕەخساندم ئـەو پەنـدو وسـوودانە کۆبکەمـەوە و ڕێکیـان بخـەم لـە زنجیرەیـەکی درەخشاوەدا، کە سـوود لێوەرگرتنیـان ئاسـان بێـت و، یارمـەتی دەریـش بێـت بـۆ بەدەست هێنانی بەرو بومەکانی بە ئاسانی.

ئەم کتێبە بریتی یە لە بەرهەمێکی زانستی و چەندان هزری کردەیی، لـە سـەدان سەرچاوە کۆکراوتەوە، زۆر کەسیش ئەم هەوڵەیان دەوڵەمەند کرد بە وتوێـژو کـۆڕ، هەندێکیان سـوودیان گەیانـد لەڕێگـەی ئامـاژەکردن بەهەنـدێ کتێـب وسەرچـاوەی ناوازە و کاریشیان کرد بۆ دەسـت خـستنیان، هەنـدێکی تریـشیان ڕێنماییـان وابـوو جەخت بکرێتە سەر ئەو یاساو سوننەتانەی پێغەمبـەر ﷺ مامەڵـەی پێکـردووە لـە بزوتنەوە پیرۆزەکەیدا، وەکو یاسای هەل لە فەتح کردنی خەیبەر و مەککەدا، چەند کەسێکی تـریش ئاماژەیـان کـرد بـە گرنگـی بەسـتنەوەی ڕووداوە مێژووییـەکان بـە لایەنی ڕەوشتی یەوە، یان ئەو ڕوداوەی، کە بە فەرموودەیەك دەربڕینی لێدەکرێت، یـان بـەکردارێکی پێغەمبەرانـە، ئینجـا ئـەو بەسـەرهاتانەی قورئـان باسـیان لێـوە دەکات، کاتێـك بـە شـێوەیەکی زانـستی و ڕێـك وپێـك بخرێتـە ڕوو زانـستێکی پـڕ و عاتیفەیەکی گەرم و گوڕ دەبەخشێتە نـەوەکانی موسـڵمانان، چـونکە بریتـی یـە لـە خۆراکی گیان و ڕۆشەنبیری مێشك و ژیانی دڵ و پاك و بێگـەردی بـۆ هـەر کەسێك، کە وەریبگرێت.

بێ گومان ژیانامەی پێغەمبەرﷺ، گەلێك دەوڵەمەندە لە هەموو ئەو لایەنانەی بانگەوازی ئیسلامی پێویستی پێی هەیە، چونکە پێغەمبەری خواﷺ لە دونیا دەرنەچووە تاکو سامانێکی گەورەی بەجێنەهێشت بۆ هەر کەسێك، کە بیەوێت پەیڕەویی بکات لە پێغەمبەرﷺ لەبانگەوازو پەروەردەکردن و ڕۆشنبیری و فێرکردن و جیهاد و هەموو کاروبارەکانی ژیان,لەلایەکی تریشەوە ڕۆچوون لە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ یارمەتی خوێنەر دەدات بۆ ئاشنا بوون بە ئەو ڕەوشتە مەزنەی پێغەمبەر ﷺ ی جیاکردەووەتەوە لە مرۆڤەکان بەگشتی، هەروەها ئاشناش دەبێت بە خەسڵەتە جوانەکانی، کە لە سەریان دەژیا لە نێو خەڵکی دا، ئەوجا لە ژیانامەکەیدا ڕاستگۆی حەسسانی کوڕی سابیتی بۆ دەردەکەوێت، کە دەفەرمووێت:

وأحسن منک قط لم تر عيني    وأجمل منک لم تلد النساء

خلقت مبرء من کل عيب    کأنک خلقت کما تشاء

ئەمەو من لە کتێبەکەمدا شتێکم کردووە ئەوانەی پێش من نەیانتوانیوە بیکەن، چونکە گرنگی پێغەمبەرﷺ سنووردار نیەو، ڕوونکردنەوەی لایەنەکانی ژیاننامە پیرۆزەکەی پێویستی هەیە بە کەسێکی هەستیارترو زانستێکی وردتروبیروباوەڕێکی پتەوتر، هەروەها من بانگەشەی ئەوەش ناکەم، کە ئەم کارەم بێ کەم وکوڕیە، ئەو قسە لە ڕاستیدا تەنها لایەقی پێغەمبەرانە، هەر کەسێکیش وابزانێت لە زانستدا گەیشتۆتە چڵەپۆپە ئەوە خۆی نەناسیوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾الإسراء:٨٥)

زانست دەریایەکی بێقەراغە، شاعیریش ڕاستی کردووە، کە ووتویەتی:

وقل لمن يدعي في العلم معرفة    حفظت شيئاً وغابت عنک أشياء.

واتە: بەو کەسە بڵێ: کە وادەزانی زانایەو شارازیە، شتێکت لەبەر کردو چەندین شتت لێڕەتبووە.

سەعالیبی دەڵێت: کەسێك کتێبێك بنوسێ و یەك شەو لە لای بمێنێتەوە، ئیتر حەز دەکات بۆی زیاد بکات، یان لێ ی کەم بکاتەوە، ئەمە لە یەك شەودا، ئەی چۆن ئەگەر چەند ساڵێك لەلای بمێنێتەوە؟

عیمادی ئەصبەهانی دەڵێت: من بۆم دەرکەوتووە هیچ کەسێك نییە کتێبێك بنوسی تاکو ڕۆژێك دوای ئەوە نەڵێت: ئەگەر ئەوەم بگۆڕابا باشتربوو، ئەگەر ئەمەم زیاد کردابا چاکتر بوو، ئەمە پێشخرایە ڕێکتر دەبوو، ئەوە دوا خرایە جوانتر دەبوو، ئەمەش پەندێکی زۆر گەورەیەو بەڵگەشە لەسەر زاڵبوونی کەم و کورتی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا.

لە کۆتایشدا دەپاڕێمەوە لە خوای پەروەردگار، ئەم کارە تەنها لە بەر خاتری خۆی کردبێتم و بەسوودیش بێت بۆ موسڵمانان، داواکارم پاداشتم بداتەوە لە سەر هەموو پیتێك، کە نوسیومەو بیخاتە تەرازووی چاکەکانمەوە، پاداشتی براکانیشم بداتەوە، کە یارمەتیان داوم بە هەموو توانایەکیانەوە لە پێناو تەواوبوونی ئەم کتێبە، شاعیر دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أسير خلف ركاب القوم ذا عرج | مؤملاً جبر ما لاقيت من عوج |
| فان لحقت بهم من بعد ما سبقوا | فكم لرب السما فى الناس من فرج |
| وان ظللت بقفر الأرض منقطعاً | فما على عرج فى ذاك من حرج |

واتە: لەدوای کاراوانەوە ڕێدەکەم بە ئومێدی ڕاستکردنەوەی لاریانەکانم، ئەگەر فریایان کەوتم ئەوە دەروویەکە و خوا لێم دەکاتەوە، ئەگەریش ڕێگام ون کردو دابڕام ئەوە لەبەر ئەوەیە من شەلم و شەلیش تەنگی لەسەر هەڵگیراوە.

سبحانك اللهم، وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك.

تکاکاری ڕەزامەندی خواو لێخۆشبونی

علي محمد محمد الصلابي

١٦/ /٢٠٠٠

١٨/ رجب/ ١٤٢١

# بەشی یەکەم

# گرنترین ڕوداوە مێژووییەکانی پێش ناردنی پێغەمبەرﷺ و دابەزینی وەحیی خوا.

## باسی یەکەم: ژیارو ئاینەکانی پێش هاتنی پێغەمبەرﷺ:

### یەکەم: ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی.

ڕۆژهەلات بە ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتە دەناسرا، فەرمانڕەوایی هەبوو بەسەر دەوڵەتەکانی یۆنان و بەلقان ئاسیاو سوریاو فەلەستین و حەوزی دەریای ناوەڕاست هەمووی و، میصرو هەموو ئەفریقیای باکور، پایتەختی ئەو ئیمپڕاتۆریەتە قوسەنتینیە بوو، دەوڵتێکی ستەمکار بوو، هەڵدەستا بە ئەنجامدانی زەبرو زەنگ و ستەم لەگەڵ ئەو گەلانەی، کە فەرمانڕەوایی دەکردن و باجەکانی لە سەریان زیاد دەکرد، بۆیە بشێویی و شۆڕش بەرپاکردن هەمیشە هەر هەبوو، ئەوان ژیانیان بەگشتی پڕبوو لە جۆرەها یاری و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی.

سەبارەت بە میصریش، ڕووبەڕووی چەوساندنەوەی ئاینی و ستەمی سیاسی دەبوونەوە، بێزەنتەکان مامەڵەی مەڕێکی شیرداریان لەگەڵ دەکرد، کە بە باشی دەیاندۆشی و بە خراپی خۆراکیان دەدایە.

سوریاش بەهەمان شێوە چەوساندنەوەو کۆیلەی تیادا زۆر بوو، لە سەرکردایەتی گەلدا تەنها پشت بە هێزو دامرکاندن دەبەسترا، ئەوانەش، کە حوکمیان دەکرد خەڵکی بێگانە بوون و بەزەییان بە خەڵکدا نەدەهاتەوە، تەنانەت زۆر جار سورییەکان مناڵەکانی خۆیان دەفرۆشت لە پێناو گێڕانەوەی قەرزەکانیان.[1]

---

١ـ بڕوانە: (السیرة النبویة)ی نەدەوی (ل ٢١، ٢٢) بەدەستکارییەوە.

کۆمەڵگای ڕۆمانی پڕ بوو لە جیاوازی و بشێوی، لە کتێبی (الحضارة ماضيها و حاضرها) بەم شێوەیە باسکراوە:

(جیاوازییەکی یەکجار زۆر هەبوو لە ژیانی کۆمەڵایەتی بێزەنتەکان، ڕەوت و بیروباوەڕی ئاینی چەسپابوو لە بیرو هۆشیاندا، قەشەییش بەشێوەیەکی فراوان بەر بڵاوبویەوە، تا گەیشتبووە ئەوەی، کە هەرکەسێك هەڵدەستاو خۆی هەڵدەقورتان لە باسەکانی ئاین و مشتومڕی بێزەنتی و خۆی پێ سەرقاڵ دەکرد، هەروەها ژیانی ڕۆژانە بە مۆرکی ڕێڕەوی(باطني)، مۆر کرابوو بەڵام لە لایەکی تریشەوە دەبینین ئەوان بە پەرۆش بوون بۆ ئەنجامدانی جۆرەکانی ڕابواردن و کەیف و خۆشی، هەندێ گۆڕەپان هەبوو جێگای هەشتا هەزار کەسی تیا دەبوویەوە بۆ سەیرکردنی زۆرانبازێ ی پیاوان و جاروبار لە نێوان پیاوان و دڕندەکان، جەماوەریانیش لە سەر دوو ڕەنگ دابەش دەکرد: ڕەنگی شین و ڕەنگی سەوز، ئەوان جوانییان خۆشدەویست و عیشقیانیش هەبوو بۆ توندو تیژی دڕندەیی، یارییەکانیشیان زۆر جار توندو خوێناوی بوو، سزاکانیشیان بە هەمان شێوە موچڕکەی بە لەشدا دەهێنا، ژیانی سەرگەورەو سەرکردەکانیان بریتی بوو لە خراپەکاری و خۆش گوزەرانی و پیلانگێڕان و خۆشدویی ناگونجاوو خەسڵەتی ناشیرین و نابەجێ.[١]

## دووەم: ئیمپراتۆریەتی فارسی

ئیمپراتۆریەتی فارسی بە ئیمپراتۆریەتی کیسرایی دەناسرا، زۆریش زەبەلاحتر بوو لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵات، ئاینی شێواو لاری زۆر تیادا بوو، وەکو زەرادەشتی و مانی، کە لە سەرەتای سەدەی سێیەمی زاینی دامەزرا لە سەردەستی مانی، دواتر موزدەگی سەری هەڵدا لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی زایینی، کە بانگەشەی دەکرد بۆ بەڕەڵایی لە هەموو شتێکدا، ئەویش بوو بە مایەیی بڵاوبوونەوەی شۆڕشی جوتیارەکان زۆر بوونی دزو چەتەی تەلارەکان، ئیتر هەڵدەستان بە دیل گرتنی ئافرەتان و دەستگرتنە سەر خانوبەرەو موڵکەکاندا،

---

١ـ بڕوانە: (السيرة النبوية)ی نەدەوی .

تەنانەت زەوی وزارو و کێڵگەو ماڵەکان، وەکو چۆن پێشتر کەسی تیادا نیشتە جێ نەبووبێ.

پادشاکانیان لە ڕێگەی میراتەوە حوکمیان دەکرد و خۆیان لە سەروی ئادەمیزادەوە دەژمارد، چونکە خۆیان بەنەوەی خوداکان دەزانی، داهاتی وڵات هەمووی بریتی بوو لە موڵکی ئەوان، دەستکارییان دەکرد بە لوت بەرزییەکی بێ ئەندازەوە، هەروەکو ئاژەڵیش دەژیان، تەنانەت زۆرێك لە جوتیارەکان دەستیان لەکارەکانیان هەڵگرت و ڕویان کردە کڵێساو پەرستگاکان لە ترسی ئەو باجانەی دەسەپێنرا بەسەریاندا، هەروەها لە ترسی خزمەتی سەربازی، چونکە ئەوان سوتەمەنییەکەی بێبەهابوون بۆ ئەو شەڕە وێرانکەرانەی لەو سەردەمانەدا هەڵدەگیرساو ساڵانێکی خایاند لە نێوان فارس وڕۆمەکاندا، هیچ پەیوەندییەکی ئەو گەلانەی تیادا نەبوو، ئەوە نەبێت، کە جێبەجێکردنی ئارەزووی پادشاکانی تیادابوو.

## سێ یەم: هیندستان

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە نالەبارترین کاتەکانی لە ڕووی ئاینی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئەو سەردەمە بوو کە لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زاینیەوە دەست پێدەکات، بێئابڕویی لەهەموو شوێنێکدا بڵاوبوویەوە، تەنانەت لە پەرستگاکانیشدا، چونکە ئاین جۆرێکی لە بتپەرستن پێیان بەخشیبوو، ئافرەتیش هیچ بەهاو ڕێزێکی نەبوو، سوتاندنی ئەو ئافرەتەی پیاوەکەی دەمرد باوبوو، هیندستان لەهەموو وڵاتەکانی جیهان جیادەبوویەوە بەجیاوازییەکی یەکجار زۆر لەنێوان چینەکانی خەڵکدا، ئەوەش سەرچاوەی دەگرت لە یاسایەکی سیاسی ئاین، یاسا دانەرە هیندییەکان دایاننابوو، کە سیفەتێکی ئایینییان هەبوو، ئیتر ئەوە بووە یاسایەکی گشتی لە کۆمەڵگاو دەستورێك بۆ ژیانیان، ئەو وڵاتە لە حاڵەتێکی بشێوی و شڕدابوو، چونکە میرنشینەکانیش لە نێوان خۆیاندا لە جەنگێکی نالەباردابوون ئەو وڵاتە دوورە پەرێز بوو لە ڕووداوەکانی جیهان، هەروەها شێوازی

بە توندگرتن و زیادەڕەوی لە داب و نەریت وچینایەتی و دەمارگیری بۆ ڕەگەز و نەژاد بە ئاشکرا زاڵبوو بوو بەسەریاندا.

مێژوونووسێکی هیندۆکی ـ کە ئێستا مامۆستایە لە یەکێك لە زانکۆکانی هیند ـ باسی ئەو سەردەمەی پێش گەیشتنی ئیسلام دەکات بۆ ئەو وڵاتەو دەڵێت: خەڵکی هیندستان لە جیهان دابڕابوون، نوشتابوونە سەرخۆیان و هیچ شارەزاییەکیان نەبوو دەربارەی بارودۆخی جیهان، ئەم بێئاگابوونەیان هەڵوێستیانی لاواز کردبوو، بۆیە بێ جوڵەیی سەری هەڵدا لە ناویاندا نیشانەکانی ڕووخان و ئاڵۆزبوونیان تیادا دەرکەوت، وێژە لەوسەردەمەدا بێ گیان بوو، بە هەمان شێوە هونەری بیناسازی و هونەرجوانەکانی تر.[1]

کۆمەڵگای هیندی کۆمەڵگایەکی وەستاو نەبزێو بوو، جیاوازییەکی ناشیرین هەبوو لە نێوان چینەکاندا، بەڵکو لە نێوان خێزانەکانیشدا جیاوازییەکی ناشیرین هەبوو، ڕێگە نەدەدرا بێوەژن شوبکات، سەبارەت بە خواردن و خواردنەوەش لە دژی خۆیاندا زۆر توندبوون، بەڵام دەرکراوەکان ناچاربوون لەدەرەوەی شارەکانیان بژین.[2]

دانیشتوانی هیندستان دابەشدەکرانە چوار بەشەوە:

١ـ چینی قەشەو پیاوانی ئایینی (بەراهمە)

٢ـ پیاوانی جەنگ و سەربازان (شەترا)

٣ـ جوتیاران و بازرگانان(ویش)

٤ـ خزمەتکاران، کە (شودەر)یان پێدەوترا، ئەوانە نزم ترین چین بوون، چونکە دروستکەری گەردوون ـ لە باوەڕی نەفامانەیاندا ـ لە قاچی خۆی دروستیانی کردووە، ئەوانەش هیچ مافێکیان نییە، جگە لە خزمەتکاری سێ چینەکەی تر نەبێت.

---

١ـ بڕوانە: (السيرة النبوية)ی نەدەوی ل ٣٨.

٢ـ هەمان سەرچاوە، ل ٣٩.

ئەم یاسایە پلەو پایەیەکی باشی بەخشی بە بەڕاهیمەکان، کە کەسی تر بەشدار نەبوو لەگەڵیاندا، بەرهەمیی پیاوێکی لێخۆشبوبوو ئەگەر سێ جیهانەکەشی بە گوناهەکانی لەناو ببردایە، هیچ باجێکیشی لە سەر نەدەسەپێنرا، سزای کوشتنیشی بەسەردا نەدەدرا لە هیچ حاڵەتێکدا، بەڵام چینی شۆدەر بۆیان نەبوو ببنە خاوەنی هیچ ماڵێك، یان پاشەکەوت بکەن، یان لەگەڵ بەهەرمییەك دانیشن، یان دەستی پێوە بدەن، یا فێری کتێبە پیرۆزەکان بن.[١]

## چوارەم: بارودۆخی ئایینی جیهان پێش ناردنی پێغەمبەرﷺ:

مرۆڤایەتی لە پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا، لە یەکێك لە نزمترین قۆناغەکانی مێژوودا دەژیان، سەبارەت بە کارو باری ئایینی و ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی دەیانناڵاند بە دەست ئاژاوەیەکی گشتی یەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا، ڕێبازی نەفامیش زاڵبوو بەسەر هەموو بیروباوەڕەکاندا، بەڵکو نەفامی و ئارەزوو بەدەڕەوەشتی و ستەم و زۆر، دیارترین ڕوخساری ئەو ڕێڕەوە نەفامانە بوو، کە زاڵبوو بەسەر دونیا.[٢]

ئاینە ئاسمانی یەکانیش کاریگەری ئەو تۆیان نەبوو لەسەر ژیان بە هۆی ئەو گۆڕین و لارییەی تووشیان بوو، بەو شێوەیەش بە های خۆی لە دەستدا بوو، وەکو ئاینێکی ئاسمانی، خەڵکیش سەرقاڵبوون بە ململانێی بیروباوەڕی تیۆری، کە بە هۆی کاریگەری بیرۆکەی مرۆڤەکان و تێڕوانینەکانیان بۆ ئەو ئایینانە دروست بوو، تا لەسەر ئەنجامدا بوو بە مایەی دروستبوونی چەندین شەڕی سەخت لە نێوانیاندا، کەسانێکیش لەوانە مابوون لە سەر ئاینەکەیان بێ لادان و گۆڕانکاریکردن زۆر کەم بوون و خۆیشیان دوورگرتبوو لە خەڵکی، چووبوونە نێو خەلوەتگاوە بە ئومێدی قوتاربوونیان لە ئەو بارودۆخە، چونکە ئەوانە بێ ئوومێد بووبوون لە چاکسازی.

---

١ــ بڕوانە: (القانون المدني الإجتماعي)کە پێیدەوترێت منوشاسنز بەشەکانی ١ــ ٢ــ ٨ــ ٩ــ ١٠ لە کتێبی (السيرة النبوية)ی نەدوی ل ٢٨.

٢ــ بڕوانە: (الغرباء الأولون) سلمان العودة ل ٥٧.

خراپی گەیشتبووە هەموو چین و توێژو ڕەگەزەکان، هەموو بوارێکیشی گرتبوویەوە بێ جیاوازی، لە بواری ئاینیدا خەڵکیان هەلگەڕابوونەوە لە ئایین، یان لێی دەرچوو بوون، یان هەر لە بنچینەوە نەچوبوونە هیچ ئایینێکەوە، یان کەوتبوونە نێو شێواندنی ئایینە ئاسمانییەکان و گۆڕینیان.

سەبارەت بەلایەنی شەریعەتیش خەڵکی شەریعەتی خوایان فڕێدابوویە پشتی خۆیان، لە لای خۆشیانەوە هەندێك یاسایان دروستکردبوو، دوور لە ڕەزامەندی خواو نەگونجان لەگەڵ بیرو هۆش و فیترەتدا.

ئەم خراپەکارییە ڕابەرایەتی دەکرا لەلایەن سەرکردەی گەل و نەتەوەکانەوە، لە لایەن سەرکردەو قەشەو بازرگان و پادشاکانەوە، جیهان هەمووی لە تاریکییەکی ڕەش و شەوێکی تاریکدا دەژیا، هەروەها لە لادانێکی ئاشکرا لە پەیڕەو پرۆگرامی خوای گەورە.

یەهودییەت: بوو بوویە کۆمەڵێك ڕێ و ڕەسم و داب و نەریتی بێ گیان، کاریگەری بیروباوەڕی نەتەوەکانی تریشی لە سەربوو، کە بەرکەوتن هەبوو لە نێوانیاندا، یان ئەوانەی کە لە ژێر دەسەڵاتیاندا بوون، بۆیە هەڵسا بەوەرگرتنی زۆرێك لە ئەو ڕێ و ڕەسمە بتپەرستیە نەفامانە، مێژوونووسانی جولەکەش دانیان بەو ڕاستیە داناوە.[1]

لە(دائرةالمعارف اليهودية) دا هاتووە:

خەشم و تووڕەیی پێغەمبەران لە بتپەرستی بەڵگەیە لە سەر ئەوەی، کە پەرستنی بت و ئەو خودایانە تەشەنەی کردبوو بۆ دەروونی ئیسرائیلییەکان، بنەبڕیش نەکرا لە دەرونیاندا تا کو ڕۆژگاری گەڕانەوەیان لە دورخستنەوەکەیان لە بابل، ئەوان باوەڕیان هەبوو بە هەندێ بیروباوەڕی ئەفسانەیی و هاوتا بۆ خوا بڕیاردان، تەلمودیش شایەتی ئەوە دەدات، کە ئارەزووی جولەکەکان بە زۆری لەگەڵ بتپەرستیدا بوو.[2]

---

١ــ بڕوانە: (السيرة النبوية)ی نەدەوی (ل٢٠)

٢ــ هەمان سەرچاوە: (ل ٢٠).

کۆمەڵگای جولەکە پێش ناردنی پێغەمبەرﷺ گەیشتبووە ئاستێکی یەکجار نزم لە بواری بیرو هۆشی ئاینیی، ئەگەر بڕوانیتە تەلمودی بابل، کە جولەکەکان زیادە ڕەوی تێدا دەکەن لە پیرۆز سەیرکردنیدا، کە دەستاو دەستی پێدەکرا لە نێو جولەکەکاندا لە سەدەی شەشەمی مەسیحیی، هەندێ نمونەی سەیرو سەمەرەی تیادا دەبینیت لە سوکی ئەقڵ و قسەی پوچەڵ و بێ شەرمی بەرانبەر خوای گەورەو گاڵتەو گەپ بەڕاستیەکان ویاری کردن بە ئایین وهۆش. [1]

سەبارەت بەمەسیحیەتیش: تووشی تاقیکردنەوە بوو لە ڕێگەی تێکدانی توندڕەوەکان و گۆڕاندنی نەفامەکانەوە، هەورە ڕەشەکانی نەفامی ڕۆشنایی یەکتاپەرستی و دڵسۆزی بۆ خوای گەورەی شاردبوویەوە [2] شەڕیش هەڵگیرسا لە نێوان گاورەکانی شام و عیراق و گاوەرکانی میصردا، سەبارەت بەڕاستی مەسیح و سروشتەکەی، ماڵ و قوتابخانەو کڵێساکان بوونە سەرباز گەلێك بۆ ململانێ.

بتپەرستیش لە چەندین ڕواڵەت خۆی پیشان دەدا، لە کتێبی (تأريخ المسيحية في ضوء العلم المعاصر) هاتووە:

ڕاستە بتپەرستی نەما، بەڵام لە هەمان کاتدا بە تەواوی لەناو نەچو، بەڵکو ڕۆچوونی کرد لەناو دەرونەکاندا هەموو شتێکیش هەر بەردەوام بوو، بەڵام بەناوی مەسیحیەتەوەو لە ژێر پەردەی ئەوەوە بۆ نمونە ئەوانەی، کە وازیان لە خوداکان و پاڵەوانەکانیان هێنا، هەڵسان بەناونانی شەهیدێك لە شەهیدەکانیان و هەمان سیفەتی خوداکانیان پێدا، ئینجا پەیکەریان بۆ دروست کرد،بەم شێوازەش شیرك و بتپەرستی گوێزرایەوە بۆ ئەو شەهیدە ناوخۆیانە، ئەم سەدەیە تێنەپەڕی تاکو پەرستنی شەهیدان و پیاوچاکان بڵاوەی نەکرد، ئینجا بیروباوەڕێك دروست بوو، ئەوەش ئەوەیە، کە ئەولیاکان خەسڵەتی خوداکانیان هەیە، ئیتر بوونە هۆکار لە نێوان خواو مرۆڤەکاندا، لە هەمان کاتدا خەسڵەتەکانی خوایان تیادایە بەپێ ی بیروباوەڕی ئەریسەکان،بوونە سمبولی پیرۆزی سەدەکانی ناوەڕاست، لەڕووی پاك و بێگەردیەوە، ناوی جەژنە بتپەرستیەکانیش گۆڕدران بە چەند ناوێکی نوێ،

---

١- بڕوانە: (السيرة النبوية)ی نەدەوی (ل ٢١).

٢- هەمان سەرچاوە: (ل ٢١).

تەنانەت لە ساڵی(٤٠٠)ی زایینی جەژنی خۆری کۆن کرا بە جەژنی لە دایك بوونی مەسیح.[١]

لە کتێبی(دائرة المعارف الکاثولوکیة الجدیدة) دا هاتووە:

پەلهاویشتنی ئەو بیروباوەڕەی، کە دەڵێت: خوای تاك و تەنها پێکهاتووە لەسێ کەس لە هزری مەسیحیدا، هەر لە کۆتایی سەدەی چوارەمی کۆتاییەوەو بەردەوامیش بوو وەکو بیروباوەڕێکی باوەڕپێکراو لە هەموو جیهانی مەسیحی، پەردەش لە سەر ئەم بیروباوەڕەو نهێنی پەرستنی سێ خوا لا نەبرا تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی.[٢]

جەنگ هەڵگیرسا لە نێوان خودی نەصرانییەکانداو یەکتریشیان بە بێباوەڕ دەزانی و سەرقاڵی یەکتر بوون لە نێوخۆیانداو دژایەتی خراپەو چاکسازییان لە بیرکرد.[٣]

مەجوسەکانیش هەر لە دێر زەمانەوە بە پەرستنی ڕەگە سروشتی یەکان دەناسران، کە لە هەموویان مەزنتر ئاگربوو، پەرستگاکانی ئاگر لە هەموو لایەکی وڵاتدا بڵاوەی کردبوو، خەڵکەکەش خەریکی پەرستنی ئاگربوون و هەمیشە پەرستگاو ڕێ و شوێنی تایبەتیان بۆ دروست دەکرد لە نێو ئەو پەرستگایانەشدا داب و نەریتی وردیان هەبوو، بەڵام لە دەرەوە ئازاد بوون چی بکەن، هیچ جیاوازییەکیش نەبوو لەنێوان ئەوان و هەرکەسێکی بێ ئایین.

مێژوونوسێکی دەنیمارکی باسی چینی سەرۆکە ئایینیەکان و ئەرکەکانیان دەکات لە لای ئاگر پەرستەکان لە کتێبی (إیران فی عهد الساسانیین)و دەڵێت:

ئەرکی ئەو فەرمانبەرانە ئەوەبوو چوار جار لە ڕۆژێکدا خۆر بپەرستن، جگە لەوەش پێویست بوو مانگ و ئاگرو ئاویش بپەرستن، هەندێ پاڕانەوەی تایبەتیشیان لێ داوا دەکرا لەکاتی خەوتن و هەڵساندا، یان لە کاتی خۆشۆردن و

---

١ـ هەمان سەرچاوە: (٢٣)

٢ـ دائرة المعارف الکاثولوکیة الجدیدة، مقال التثلیث(١٤/ ٢٩٥)

٣ـ بروانە: فتح العرب لمصر وەرگێڕوانی محمد أبو حدید(ل ٣٧، ٣٨، ٤٨).

پشتوێن لەپشت کردن و نان خواردن و پژمین و تەراشکردن و نینۆکردن و چوونە سەر ئاوو چرا هەڵکردن ، فەرمانیشیان پێکرابوو، کە ڕێگە نەدەن ئاگر خامۆش ببێت و، ئاگرو ئاویش لە یەك نەدەن و، نەهێلن ئاسن ژەنگ بگرێت،چونکە هەموو کانزاکان پیرۆزن بەلایانەوە.[١]

خەڵکی ئێران لە نوێژەکانیاندا ڕوویان دەکردە ئاگر، جارێکیش(یەزدەجەرد) کە دواترین پادشای ساسانییەکان بوو سوێندی بە خۆر خواردو ووتی: سوێند بە خۆر، کە ئەو خوای گەورەیە، ئاگر پەرستەکان باوەڕیان بە سەنەویەت بوو لە هەموو سەردەمێکدا، ئەوەش بووە دروشمێك بۆیان وباوەڕیان بە دوو خوا بوو، یەکێکیان ڕۆشناییە، یان خوای چاکە، ئەوی تریشیان تاریکییە، یان خوای خراپە.[٢]

سەبارەت بە بوزییەتیش: لە هندستان و ئاسیایی بچووك بتپەرستییەکی پەتی بوو، بۆ کوێ بچونایە بتەکانیان لەگەڵ خۆ دەبردو، پەیکەریان دروست دەکرد بۆ(بوذا) لە هەموو شوێنێکدا.[٣]

سەبارەت بە بەرهەمیەت: ئاینی ڕەسەنی هندیەکان، تایبەتمەندی لە زۆری پەرستراو و خوداکانیان بووە لە سەدەی شەشەمی زایینیشدا گەیشتە چڵەپۆپە، بێ گومان ئایینی هیندۆکی و بوزی وەکو یەك بتپەرستن، جیهانی ئاوەدان لە دەریایی ئەتڵەسی یەوە بۆ زەریایی ئارام نگرۆ بوون لە بتپەرستیدا، وەکو چۆن گاورو جولەکە و بوزیو بەرهەمی لە کێبڕکێدا بوون بۆ مەزن ڕاگرتنی بتپەرستی و بە پیرۆز زانینی، هەمووشیان وەکو ئەسپی پێشبڕکێ لە یەك گۆڕەپاندا غاریان دەدا.

پێغەمبەری خواشﷺ ئاماژەی کردووە بە گشتی بۆ ئەم گەندەڵیە لە هەموو ڕەگەز و هەموو بوارەکان بەبێ جیاوازی، جارێکیان لە وتارێکدا فەرمووی: ((ألا إن ربي أمرني أن أعلمكم ما جهلتم مما علمني يومي هذا، كل ما نحلته عبداً حلال، وإني خلقت عبادي حنفاء كلهم، وإنهم أتتهم الشياطين فاجتالهم عن دينهم، وحرمت عليهم

---

١ـ إيران في عهد الساسانيين(ل ١٥٥) لە کتێبی(السيرة النبوية) نەدەوی(ل ٢٧).

٢ـ هەمان سەرچاوە(ل ٢٧)

٣ـ بڕوانە: (السيرة النبوية) نەدەوی(ل ٢٧).

ما حللت لهم، و أمرتهم أن يشركو بي ما لم أنزل به سلطاناً، وأن الله نظر إلى أهل الأرض فمقتهم: عربهم، و عجمهم، إلا بقايا من أهل الكتاب)).[١]

واتە: خوای گەورە فەرمانی پێکردووم ئەوەی، کە نایزانن فێرتانی بکەم لەو شتانەی لەم ڕۆژەدا فێرکراوم، هەرچ شتێکم داوەتە بەندەیەکم حەلاڵە، ئینجا من بەندەکانم بە پاکی دروست کردوون ، بەلاّم شەیتان هات و لە ئایینەکەیانی دوورخستنەوە، ئەوەی من بۆم حەلاّلکردبوون قەدەغەیانکرد لەسەریانوئەوەش کەمن حەرامم کردبوو لەسەریان حەلاّلیانکرد بۆیان، فەرمانیشی پێکردن، کە هاوتا بۆ من بڕیار بدەن بەبێ ئەوەی بەلگەیەکم لەسەری دابەزاندبێت، خوای گەورەش تەماشایەکی سەرتاپای خەلّکی سەرزەوی کردو ڕقی لە هەموویان هەلّگرت بە عەرەب و عەجەمەوە، تەنها هەندێ پاشماوەی ئەهلی کتاب نەبێت.

ئەم فەرموودەیە ئاماژە دەکات بۆ لادانی مرۆڤایەتی لە چەند بوارێکی جیاجیا، وەکو هاوتا بۆ خوا بڕیاردان و فرێدانی شەریعەتەکەی و گەندەڵ بوونی چاکسازەکان لەوانەی سەر بە ئاینێکی ئاسمانی بوون و شلییان دەنواند بەرامبەر گومڕایی خەلّکەکە.[٢]

---

١ـ مسلم، كتاب الجنة، باب الصفات التي يعرف بها في الدنيا اهل الجنة واهل النار (٤/٢١٩٧، رقم ٢٨٦٥)

٢ـ بڕوانە: الغرباء الأولون (ل ٥٩).

## باسی دووەم: بنچینەو شارستانی عەرەب.

### یەکەم: بنچینەی عەرەب: مێژوونوسان بنچینەی عەرەبیان کردۆتە سێ بەشەوە بە پێی ئەو وەچانەی، کە لێوەی هاتوون.[١]

**١ـ عەرەبی لە نێوچوو(العرب البائده):**

بریتی یە لەهۆزەکانی عادو، سەموودو،تەسەم و، جەدیس و،ئومەیم و،جرهوم و، حەزرەمەوت و ئەوانەی، کە پیاندەگەیشتن، ئەم هۆزانە هیچ شوێنەوارێکیان نەماوەو لە پێش ئیسلام لە ناوچوون، هەندێك پادشایانیش هەبوو، کە موڵکەکانیان تاکو شام و میصری دەگرتەوە.[٢]

**٢ـ عەرەبی عارییە(العرب العاربە):**

ئەوانەش بریتین لەو عەرەبانەی، کە لە پشتی یەعروبی کوڕی یەشجوبی کوڕی قەحتانەوە هاتوون، بە عەرەبی قەحتانی دەناسرێن[٣]، هەروەها بە عەرەبی باشوریش دەناسرێن[٤]، لەوانە پادشاکانی یەمەن و شانشینی مەعین و سەبەء و جیمیەر[٥].

**عەرەبی عەدنانی (العرب العدنانیە):**

ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمعليه السلام، هەر ئەمانەشن بە ڕەچەڵەك دەگەڕێنەوە بۆ ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم سەلامی خوایان لێبێت هەر ئەمانەشن بە عەرەبی موستەعرەبە دەناسرێن، واتە: ئەوانەی، کەخوێنێکی نا عەرەبی هاتۆتە گیانیانەوەو دواتر یەککگرتن ڕوویداوە لە نێوان عەرەب و ئەو خوێنە، زمانی عەرەبیش بوو بە زمانی نوێ ی ئەم ئاوێتەیە.

---

١ـ بروانە: السيرة النبوية، منير الغضبان(ل ٤٥)

٢ـ بروانە: السيرة النبوية، إبن شيبة(٤٦/١)

٣ـ فقه السيرة النبوية، الغضبان(ل ٤٥).

٤ـ مدخل لفهم السيرة (ل ٩٨)

٥ـ السيرة النبوية، إبن شيبة(٤٧/١)

ئەوانە عەرەبی باکوربوون، کە ڕێ و شوێنی ڕەسەنیان مەککەبوو، وەکو ئیسماعیل عليه السلام و، کوڕەکانی و هەروەها جەراهیمەکان، کە ئیسماعیل لەوانەوە فێری عەرەبی بووخزمایەتی لەگەڵدا کردن، نەوەکانیشی لە نێوان ئەواندا هەروەکو ئەوان پەروەدەبوون، یەکێ لەگرنترین نەوکانی ئیسماعیلیش عەدنانە، کە باپیرە گەورەی پێغەمبەرە ﷺ، هەر لە عەدنانیشەوە هۆزو تیرەکانی عەرەب پەیدا بوون، لە پاش عەدنان مەعەدی کوڕی هات و ئینجا نیزارو ئینجا موزەر و ڕەبیعە.

سەبارەت بە ڕەبیعەی کوڕی نیزار، نەوەکانی بەرەو لای ڕۆژ هەلآت ڕۆیشتن، ئیتر عەبدولقەیسیش لە بەحرێن جێگیر بوون و، حەنیفە لە یەمامەوە، بەنو بەکری کوڕی وائیل لە نێوان بە حرێن و یەمامەو، تەغلیبیش لە ڕووباری فوڕات پەڕپینەوەو لە خاکی جەزیرە نیشتەجێ بوون لە نێوان دیجلەو فوڕاتدا، تەمیمیش لە بیابانی بەصرە نیشتەجێ بوون[1].

سەبارەت بەلقی موزەر: سەلیم لە نزیکی مەدینە جێگیر بوون و سەقیفیش لە تایف، ئەوانی تر لە هەوازین لە ڕۆژهەلآتی مەککە جێگیربوون، ئەسەدیش لە ڕۆژهەلآتی تەیمائی ڕۆژهەلآتی کوفە نیشتەجێ بوون، بەلآم زوبیان و عەبس لە حۆران گیرسانەوە[2].

ئەوەی، کە یەك دەنگی لە سەرە ئەوەیە، کە عەرەب دابەش دەبن بۆ عەدنانی و قەحتانی، بە بۆچوونی زۆربەی زانایانی ڕەچەڵەك ناس و زانایانی تریش، بەلآم هەندێکی تر لە زانایان پێیان وایە، کە عەرەبی عەدنانی و قەحتانی دەگەڕێنەوە سەر ئیسماعیل عليه السلام.[3]

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا سەرباسێکی داناوە بە ناوی (باب نسبة اليمن إلى إسماعيل عليه السلام) فەرموودەیەکیشی گێڕاوەتەوە لە ئوممو سەلەمەوە، کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ لای کەسانێك لە هۆزی ئەسلەم تیربازیان

---

١ـ مدخل لفهم السيرة(ل ٩٨، ٩٩)

٢ـ بڕوانە: الطريق إلى المدائن، عادل كمال(ل ٤٠)

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية، إبن شهبة(١/ ٤٨)

دەکرد لە بازاڕدا، ئیتر فەرمووی: ((إرموا بني إسماعيل، فإن أباكم كان رامياً، وأنا مع بني فلان ـ لِأحد الفريقين ـ فامسكوا بأيدهم، فقال: ما لهم؟ قالوا وكيف نرمي وأنت مع بني فلان؟ فقال: إرموا، وأنا معكم كلكم))[١]

واتە: تیر بهاوێشن ئەی نەوەی ئیسماعیل، چونکە باوکتان تیر هاوێژ بوو، منیش لەگەڵ فلانە بەشتان دەبم، ئەوانیش دەستیان هەڵگرت پێغەمبەرﷺ فەرمووی:چییانە ؟ئەوانیش ووتیان چۆن تیر بهاویشین‌وتۆش لەگەڵ فلانە کەسیت, پێغەمبەرﷺ فەرمووی : تیر بهاوێژن لەگەڵ هەمووتانم.

بوخاری دەفەرموێت: ئەسلەمی کوڕی ئەفسای کوڕی حاریسەی کوڕی عەمری کوڕی عامیری خوزاعە، واتە: خوزاعە بەشێك بوو لە هۆزەکانی سەبەئ، کە پەرتەوازە بوون، پاش لافاوی عەریم.[٢]

پێغەمبەرﷺ لە هۆزی موزەر لە دایك بووە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە کولەیبی کوڕی وائیل، کە وتوویەتی: بەخێوکراوی لای پێغەمبەرﷺ زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە وتویەتی: پێم وت: ئایە پێغەمبەری خواﷺلە موزەر نییە لە کێیە؟ بەڵێ لە موزەری کوڕی کینانەیە.[٣]

قوڕەیش خۆی لە کینانەوە هاتووە، کە بریتین لە کوڕانی فیهری کوڕی مالیکی کوڕی نەزری کوڕی کینانە، ئینجا قوڕەیش دابەش بوون بۆ چەند هۆزێکی جیا جیا، بە ناوبانگترینیان: جومەح، سەهم، مەخزوم، تمیم، زوهرە، هەروەها تیرەکانی قوصەی کوڕی کیلاب، عەبدو مەنافی کوڕی قوصەی، ئەسەدی کوڕی عبدالعوززای کوڕی عەبدوشەمس، نەوفەل، موتتەلیب، هاشم، بنەماڵەی هاشمیش ئەو بنەماڵەیە، کە پێغەمبەرﷺ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی کوڕی هاشیمی تیا لە دایك بوو.[٤]

---

١ـ البخارى كتاب المناقب(٧، ٢٥)

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية، إبن شهبة(١/ ٤٨)

٣ـ البخاري كتاب المناقب(٢٤٩١).

٤ـ أنظر فقه السيرة، الغضبان (ل ٤٧)

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((إن الله اصطفى كنانة من ولد اسماعيل، واصطفى قريشاً من كنانة، واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم))[1]

واتە: خوای گەورە کینانەی لە نەوەی ئیسماعیل هەڵبژاردووەو قورەیشی لە نەوەی کینانە هەڵبژاردووە، ئینجا بەنی هاشمی لە قورەیش هەڵبژاردووە، منیشی لە بەنی هاشم هەڵبژاردووە.

## دووەم: ژیارەکانی دوورگەی عەرەب

هەر لەسەردەمانی دێرینەوە چەند ژیارێکی ڕەسەن و شارستانییەکی بەناوبانگ دروست بوونە، لەوانە:

### ١ـ شارستانێتی سەبەئـ لە یەمەن:

قورئانی پیرۆز ئاماژەی کردووە بۆی، لە یەمەن سوودیان لە ئاوەکانی باران دەبینی، هەروەها لەئەو لا فاوانەی لەناو خۆڵدا وندەبوون و لێژ دەبوونەوە بەرەو دەریاکان، ئەوانیش بەنداوو عەمبارە ئاویان دروست دەکرد بەشێوازێکی ئەندازیاری پێشکەوتو، بەناوبانگترینی ئەو بەنداوانەش بەنداوی مەئریبە، کە سودیان لە ئاوەکەی وەردەگرت بۆ کشتوکاڵی جۆراو جۆرو باخچەی پڕ لە دارو درەختی جوان و بەروبومی بەتام، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ﴾(سبأ١٥ـ ١٧) هەروەها قورئانی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکات، کە هەندێ ئاوایی یەك بەدوای یەکدا لە سەردەمی کۆندا لە نێوان یەمەن تاکو وڵاتی حیجاز

---

١ـ رواه مسلم، باب فضل نسب النبي ﷺ (١٧٨٢/٤ ژمارە ٢٢٧٦).

وولاتی شام، کاروانی بازرگان و گەشتیارەکانیش لە یەمەنەوە دەردەچوون بۆشام و لە ڕێگادا هەمیشە سێبەرو ئاوو خواردنیان لێنەبڕا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾(سبأ: ١٨ـ ١٩).

**٢ـ شارستانێتی عاد لە ئەحقاف:**

ئەوان لە باکووری دوور گەدا بوون، هەر ئەوانیش بوون، کە خوای گەورە هودیعليه السلام بۆ ڕەوانە کردن، ئەوان خاوەنی خانوو ماڵی قەشەنگ و کارگەی زۆر و باخچەو کشتوکاڵ و کانی زۆر بوون،[1] خوای گەورە لە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾(الشعراء١٢٣ـ ١٣٤)

**٣ـ شارستانێتی سەموود لە حیجاز:**

قورئانی پیرۆز ئاماژە بە بوونی شارستانیەت لە وڵاتی حیجازدا دەکات، باسی توانایی ئەوان دەکات لە تاشینی خانوو لە چیاکان، هەروەها باسی کردووە لە ئەو کانی و باخ و کێڵگانەی تیایدا بوونە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾

---

١ـ السيرةالنبوية، لأبي شهبة(١/٥١).

فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾ (الشعراء: ١٤١-١٥٠) هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِنْ سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾(الأعراف: ٧٤) هەموو ئەوشتانە لە سەردەمێکی زووەوە لەناچوون، خانوو تەلارەکانیان وێران بووە، کانی ئاوەکانیان وشك بوویەوەو درخت و باخەکانیان هەمووی لەگەڵ زەویدا تەخت بوون.[1]

---

١ــ هەمان سەرچاوە

## باسی سێ یەم: بارودۆخی ئاینی وسیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی لە لای عەرەب.

### یەکەم: باری ئاینی

نەتەوەی عەرەب دەیانناڵاند بەدەست دوا کەوتنێکی کوشندەو بتپەرستییەکی چەپەڵی بێ وێنەو لادانێکی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و ئاژاوەیەکی سیاسی ویاسایی زۆر سەخت و نالەبار، ئالێرەوە پلەوپایەیان کەم وبێ بەها بوو، لە قەراغی مێژووەوە دەژیان، لە چاکترین حاڵەتەکانیاندا پاشکۆی دەوڵەتی فارسی یان ڕۆمانی بوون، دڵەکانیان پڕ لە مەزنڕاگرتنی باو وباپیرانیانبوو، هەمیشە شوێنی ئەوانیش دەکەوتن، با هەرچەندە نوقمی گومڕایی و لادانیش بوونایە، هەمان هۆکاریش ڕێگای خۆشکرد بۆ بتپەرستی، بۆیە هەر هۆزێك بتی خۆی هەبوو، هۆزی هوزەیلی کوڕی مودریکە سواعیان هەبووە، کەلبیش وەددو ومەزحەج یەغوس و خەیوان یەعوق حیمەر نەسر، بەڵام هۆزەکانی خوزاعەو قوڕەیش ئیساف و نائیلەیان دەپەرست، مەناتیش لە ڕۆخی دەریا بوو، عەرەب تێکڕا دەیانپەرست و بەتایبەتی هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج، بتی لاتیش لە لای هۆزی سەقیف بوو، هاوکات عوەززایش لە سەر (ذات عرق) دانرابوو، کە بە مەزنترین بتەکانی قورەیش دەهاتە ئەژمار.[1]

بێجگە لەم بتە سەرەکیانەش ژمارەیەکی بێ ئەندازە هەبوو لە بتی بچکۆلە، کە بە ئاسانی دەگوێزرانەوە لەکاتی گەشتەکان و دانانیان لە نێو ماڵەکانیاندا.

پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەگێڕتەوە لە ئەبی ڕەجائی عوتاریدی، وتویەتی: ئێمە بەردمان دەپەرست، جا ئەگەر بەردێکی چاکترمان دەست کەوتبا کۆنەکەمان فڕێ دەدا و تازەکەمان هەڵدەگرت، خۆ ئەگەر بەردیشمان دەست نەکەوتبا، مشتێ خۆڵمان کۆدەکردەوە و مەڕێکمان دەردەهێناو دەمان دۆشیە سەریداو ئینجا دەسوڕاینەوە بە دەوریدا.[2]

---

١ـ بڕوانە: الغرباء الأولون: (ل ٦٠)

٢ـ البخاری کتاب المغازی ـ وفد بني حنيفة(١١٩/٥، رقم: ٤٢٧٧)

ئەم بتپەرستیە ناماقوڵە بوو بە پەرژینێك لە نێوان عەرەب و ناسینی خوای گەورە و باوەڕ پێهێنانی و باوەڕ بوون بەڕۆژی دوایی، ئەگەر چی ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کەئەم بتانە هۆکارگەلێکن لەنێوان ئەوان و خودا ،ئەو خودا درۆینانەیان بە تەواوی زاڵبووبوویە سەر دڵەکانیان و هەموو کاروبارو لایەنەکانی ژیانیاندا.

مەزنی خوای گەورەش لە دەروونیاندا پتر لاواز دەبوو، خوای بالآدەست دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ (الأنعام: ٣٦).

سەبارەت بەو پاشماوەیەش، کە مابوو لە ئاینی ئیراهیمعليه السلام، ئەویش گۆڕان و تێکدانی بە سەردا هاتبوو، حەجیش بوو بوویە وەرزێك بۆ شانازی کردن و خۆهەڵنان و ئەو دوای بیرو باوەڕە پاکەکانیش هەر لایان دابوو لە ڕاستەقینەی خۆیان و ئەفسانە و درۆی زۆریان پێوە لکابوو.

کەسانیك مابوون لە حەنیفیەکان ڕازی نەبوون بە بتپەرستی و ئەو ڕێ و ڕەسمانەی لە دەوریان دەکرا، وەکو ئاژەڵ سەربڕین و شتی تر، یەکێ لەو کەسانە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل بوو، ئەو بۆ ئەنصاب سەربڕینی ئەنجام نەدەدا، گۆشتی مردارەوەبوو و خوێنی نەدەخوارد، دەشی ووت:

أربــاً واحــداً أم ألــف ربّ أديـن إذا تقـسّمت الأمـور؟

عزلت اللات والعزى جميعاً كـذلك يفعل الجلـد الـصّبور

فـلا العـزى أديـن ولاابنتيهـا ولا صـنمي بـنى عمـرو أزور

ولاغنمـاً[1] أديـن وكـان ربـاً لنا في الـدهر إذحلمي يسير

تاكو ئەگاتە ئەوەی دەڵێت:

ولكــن أعبــد الرحمــن ربــي ليغفر ذنبى الرب الغفور[2]

واتە: ئایە یەك خوا، یان هەزار خوام هەبێت؟ من وەکو کەسێکی خۆ ڕاگر دوورم

---

١ـ لە کتێبی (الأصنام)ی إبن الكلبي بە(حبلا) هاتووە: السيرة النبوية لإبن هشام(ق١/ ٢٢٦)

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية، إبن كثير(١/١٦٢).

گرتووە لە لات و عوززا و بتەکانی تریش هەموویان, خۆیشم کاتێك ئەقڵم نەبوو بتێکم دەپەرست ناوی غەنەم بوو.

یەکێك لەوانەش، کە باوەڕیان هەبوو بە شەریعەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل عليهما السلام قوصەی کوڕی ساعیدەبوو، ئەو وتاربێژ و داناو هۆشمەند بوو، وریاو پیاو چاك بوو، بانگەوازیشی دەکرد بۆ یەك خوا پەرستی و دوورکەوتنەوە لە بتپەرستی، هەروەها باوەڕی هەبوو بە زیندووبوونەوەی پاش مردن، مژدەشی دەدایە خەڵکی بە هاتنی محمدﷺ، ئەبو نوعەیم لە (دلائل النبوة) لە ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوەرضي الله عنه، کە ووتویەتی: جارێك قوصەی کوڕی ساعیدی ئیادی وتاری دەخوێندەوە لە بازاری(عکاظ) دا ووتی: هەقێك سەرهەڵدەدا لەو ئاڕاستەوەو دەستی بۆ لای مەککە درێژکرد، وتیان کام حەق؟ وتی: پیاوێك لە نەوەی لوئەی کوڕی غالیب بانگتان دەکات بۆ وتەیەکی دڵسۆزی و ژیانی هەمیشەیی و خۆشیەکی نەبڕاوە، هەرکاتێك بانگی کردن بچن بە دەنگیەوە، ئەگەر بمزانیبا دەژیم تاکو ئەو کاتە من یەکەم کەس دەبووم لە پێشوازیدا، ئەم پیاوە ژیا تا پێغەمبەری ﷺبینی، بەڵام پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد.[1]

ئەمەش یەکێکە لە هۆنراوەکانی:

| | |
|---|---|
| فی الـذاهبين الأولين | من القرون لنا بصائر |
| لما رأيت مـواردًا | للموت ليس لها مصادر |
| ورأيت قومي نحوها | يمضي الأكابر والاصاغر |
| لا يرجع الماضي إليَّ | و لا من الباقين غابر |
| أيقنت أني لا محالة | حيث صار القوم صائر[2] |

هەندێك لە عەرەبەکان بوون بەنەصرانی و هەندێکیشیان بوون بە جوولەکە، بەڵام زۆربەیان بتپەرست بوون.

---

١ـ السيرة النبوية في ضوء القرآن والسنة(١/٨٠).

٢ـ السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٨١) دلائل النبوة للبيهقي تحقيق د عبدالمعطي قلعجي(٢/١٠٢، ١٠٣).

## دووەم: باری سیاسی

دانیشتوانی دورگەی عەرەب دەبوون بە دوو بەشەوە: بیابان نشین و شار نشین، سیستمی باویش لە نێوانیاندا سیستمی هۆزایەتی بوو، تەنانەت لەو شانشینە پێشکەوتوانەیش، کە لە دورگەکەدا دروست بوون، وەکو شانشینی یەمەن لە باشوور و شانشین حیرە لە باکوری ڕۆژهەلات، شانشینی غەساسینە لە باکوری ڕۆژئاوا، کۆمەڵ نەدەتوایەوە لەگەڵیدا، بەڵکو هۆزەکان هەر وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو هەر مانەوە.

هۆزی عەرەبیش کۆمەڵێکە لە خەڵکی، یەکەی خوێن(نەژاد)و یەکەی کۆمەك دەیانبەسێت بە یەکەوە، لە سایەی ئەم پەیوندیەدا یاسایەکی نەریتی دروست بوو، کە ئەرکی ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵی لە ئەستۆ گرت، لەسەر بنەمای هاوکاری لە ماف و ئەرکەکاندا، ئەم یاسا نەریتی یە هۆز پەیوەست بوو پێیەوە لەبواری سیاسی وکۆمەڵایەتیدا.[1]

ئەو خەصلەتانەش سەرکردە دەپاڵێوێ بۆ سەرکردایەتی هۆز برتین لە: پلەو پایەی لە ناو کۆمەڵگاداو، سیفەتەکانی و، تایبەتمەندیەکانی وەکو ئازایەتی و جوامێری و بەخشندەی و، سەرۆکی هۆز مافی ئەدەبی هەیە، وەکو ڕێزلێنانی و بەقسەکردنی و ڕازی بوون بە فەرمانی، هەندێ مافی داراییشی هەیە، وەکو (المرباع)، کە چوارەیەکی دەستکەوتەکانە(الصفایا) ئەویش بریتی بوو لە دەست کەوتەکانی ماڵی دوژمن پێش یەکگرتن لە مەیدانی شەڕداو، (الفضول)، کە دابەشی قبوڵ نەدەکردو لە زیادە دەمایەوە، شاعیرێکیش ئەم مافانەی هۆنیوەتەوە لە هۆنراویەکداو دەڵێت:

لک المرباع فينا والصفايا وحكمك والنشيطة والفضول[2]

بەڵام لە بەرامبەر ئەم مافانەدا ئەرك و لێپرسراوێتی هەبوو، لە کاتی ئاشتی دا بەخشندەو چاو تێرە، لە کاتی جەنگیشدا پێش ڕیزەکان دەکەوێت، ڕێککەوتن

---

١ـ السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٢٠).

٢ـ أنظر: مكة والمدينة في الجاهلية وعصر الرسول(١٣).

نامەو گرێبەستی ئاشتی ئەنجامدەدا.

سیستمی هۆزایەتی ئازادی تیا بەدیدەکرێت، چونکە مرۆڤی عەرەب لە کەش و هەوایەکی ئازادا پەروەردەبوو، بۆیە ئازادی یەکێك بوو لە دیارترین سیفەتەکانی عەرەب، ئەوان شەیدای ئازادی بوون و ڕقیان لە ستەم و سەرشۆڕی بوو، هەموو کەسێکیش لە ناو هۆزدا بەرگریدەکات لە هۆزەکەی و شانازی دەکات بە سەروەریەکانیەوەو، بەرگریدەکات لە هەرکەسێك لە ئەندامانی هۆز، چی ستەم لێ کراوبێت، یان ستەم کار، یەکێك لە بنەماکانیشیان ئەوەیە، کە دەڵێن: (أنصر أخاك ظالماً أو مظلوماً) واتە: پشگیری براکەت بکە لە براکەت ستەمکاربێت، یان ستەملێکراو.

دوروشمیانیش لەم هۆنراوەیەدا خۆی دەبینیەوە:

لا يسألون أخاهم حين يندبهُم     فی النائبات على ما قال برهاناً

واتە: کاتێ براکەیان هانایان بۆ دەهێنێ لە کاتی نارەحتیدا، ئیتر پرسیاری لێ ناکەن مەسەلەکە چیەو چۆنە.

تاك لە هۆزدا شوێنکەوتووی کۆمەڵە، ئەوەندەش شانازیان دەکرد بەکۆمەڵەوە تا ئەو ڕادەی، کە کەسایەتیان تێدا دەتوایەوە، دورەیدی کوڕی صیممە دەڵێت:

وهل أنا من غزية ان غوت غويت     وأن ترشد غزية أرشد[1]

واتە: ئایا من کەسێك نیم لە هۆزی غەزییە، ئەگەر گومڕا بن گومڕا دەبم، ڕێگایی ڕاست بگرن لە گەڵیان دەبم.

هەموو هۆزێك لە هۆزە عەرەبەکان کەسایەتی سیاسی خۆیان بوو، بە هەمان ئەو کەسایەتیشەوە ڕێکەوتن نامە و هاوپەیمانێتی دەبەست لەگەڵ هۆزەکانی تر، بەهەمان شێوە شەڕیشیان ڕادەگەیاند، یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو هاوپەیمانێتیانەی کرا لە نێوان هۆزە عەرەبەکان هاوپەیمانی(الفضول) بوو، کە بە(حلف المطيبين) ناسرا.[2]

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٦١)

٢ـ بڕوانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسول محمدﷺ، د. محمد قلعجي (ص ـ ١٢)

جەنگ هەمیشە بەردەوام بوو لە نێوان هۆزەكاندا، جەنگی (الفجار)[١] بریتی یە لە بەناوبانگترین جەنگەكانیان، جگە لە شەڕە گەورەكانیش، هەندێ هێرش و پەلاماری ناوبەناو هەر هەبوو لە نێوان هۆزەكاندا، هۆكارەكانی كەسێتی بوو هەندێ جار یان لە پێناو بژێویدا دەبوو، چونكە هەندێ لەو هۆزانە ڕۆزییان بە سەر شمشێرەكانیانەوە بوو، هەر بۆیە هۆزێك متمانەی نەبوو، كە هۆزەكەی تر هێرشی نەهێنێتە سەر لە هەركاتێكدا لە شەو یان لە ڕۆژ، ماڵ و موڵكیان بە تاڵانی نەبات و وێرانی نەكات.[٢]

## سێ یەم: باری ئابووری

دورگەی عەرەب بە زۆری بیابانی بەر بڵاوە، ئەویش بووە بە هۆی نەبوونی كشتوكاڵ لەو دوورگەیە، تەنها لە قەراغەكانیدا نەبێت، بە تایبەت لە یەمەن و شام و هەندێ مێرگەكانی دورگەی عەرەب، لە بیاباندا زیاتر خەریكی حوشترو مەڕو ماڵات بە خێوكردن بوون، هۆزەكانیش جێگۆڕكێیان دەكرد بە مەبەستی گەڕان بەدوای لەوەڕدا، سەقامگیریش نەدەبوون لە جێگایەكدا، مەگەر لەو شەوێنەی، كە خێوەتیان هەڵدەدا.

ئینجا دورترین كە سانێك بوون لە پیشەسازی و بەكارێكی گونجاویان نەدەزانی بۆخۆیان، بەڵكو ئەوكارەیان دەسپاردە عەجەمەكان و ئەوانەی كە دەهاتن بۆ كاركردن لە لایان، تەنانەت كاتێك نیازیان كرد، كەعبە دروست بكەن، پەنایان بردەبەر پیاوێكی قیبتی قوتاری بوو بوو لەو كەشتی یەی كە نقوم بوو لەلای جوددە، دواتر لە مەككە جێگیر بوو.[٣]

ئەگەر چی دورگەی عەرەب بێ بەش بوو لە نیعمەتی كشتوكاڵ و پیشەسازی، بەڵام جێگا ئیستراتیژییەكەی لە نێوان ئەفریقاو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، بواری بۆ ڕەخساندبوو، كە ببێت بە ناوەندێكی پێشكەوتوو لە بازرگانی نێودەوڵەتیدا لەو سەر دەمە.

---

١ـ هەمان سەرچاوە(٢٢ـ ٢٥)

٢ـ سەرچاوەی پێشوو(ل ٢٥)

٣ـ بڕوانە: فقه السیرةالنبوية، منير الغضبان(ل ٦٠)

ئەوانەش، کە هەڵدەستان بە کاروباری بازرگانی لە دانیشتوانی دورگە خەڵکی شارەکان بوون، بە تایبەتی شاری مەککە، چونکە ناوەندێکی بازرگانی نایاب بوو، ئینجا لە بەر ئەوەی ئەوان خەڵکی حەرەم بوون پلەوپایەیەکی بەرزیان هەبوو لە لای هەموو عەرەب، بۆیە هیچ زیانێك نەبە خۆیان ونەلە بازرگانییەکانیان نەدەکەوت، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ﴾(العنكبوت: ٦٧) هۆزی قورەیش دوو گەشتی گەورەیان هەبوو: یەکێکیان لە زستاندا بۆ یەمەن، ئەویتریشان لە هاویندا بۆ شام، بە ئاسوودەیی ئەو دوو کۆچەیان ئەنجام دەدا، لە کاتێکدا خەڵکی لە دەوروبەریاندا لە تەنگ و چەڵەمەو ناڕەحەتیدا بوون، ئەمە جگە لە گەشتەکانی تر، کە ئەنجامیان دەدا لە درێژایساڵدا، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾﴾ (قورەیش: ١ — ٤).

باری کاروانەکان بریتی بوون لە گوڵاو و دارعود و کەتیرەو بنێشت و بەهارات و خورماو بۆنی خۆش وکەڵبەی فیل و درەختی ئەبەنوس ومووروو و پۆشاکی یەمەنی و ئاوریشمی چنراو و چەك و چەندین کاڵای تر کە لە نێو دورگەی عەرەب هەیە، یان لە دەرەوەی دەهێنران و دەبران بۆ شام و شوێنی تر، لەو لاشەوە دەگەڕانەوە بە باری گەنم و دانەوێڵەو مێوژو زەیتون و جل و بەرگی شامی و شتی تر.

یەمەنی یەکانیش ناوبانگیان هەبوو لە بازرگانیدا، چالاکیان لە وشکانی و دەریادا هەبوو، گەشتیان دەکرد بۆ ڕۆخەکانی ئەفریقیا و بۆ هیندستان و ئەندەنووسیاو سۆمەترەو چەندین شوێنی تر لە ولاتی ئاسیاو دورگەکانی زەریای هیندی، یان دەریایی عەرەبی وەکو پێی دەگوترێت، ئەوان پاش موسڵمان بوونیان چاکەیەکی گەورەیان کرد بە بڵاوکردنەوەی لەو شوێنانە.

مامەڵە کردن بە سوو باو بوو لە دورگەی عەرەب، لەوانەشە ئەم

دەردەکوشـندەیە لـە جولەکەکانـەوە[1] کەیـشتبێتە عەرەبـەکان، سـەرەگەورەکان و کەسانی تریش مامەڵەیان پێوەی دەکرد، ڕێژەی سوەکەش جاری وابوو دەگەیـشتە سەد لە سەد.[2]

ئینجا عەرەب چەند بازاڕێکی بەناو بانگیان هەبوو وەکو: (عکاظ)و، (مجنة)و،(ذوالمجاز) هەندێ لە نووسەرەکانیش دەگێڕنەوە لە هەواڵەکانی مەککە، کە عەرەب دەمانەوە لە (عکاظ) لە مانگی(ذي العقدة)، دواتر کە دەچوون بۆ(مجنة)پاش تێپەڕبوونی بیست ڕۆژ لەو مانگە ئینجا مانگی (ذی الحجة) یان دەبینی، دەچوون بۆ(ذي المجاز) و هەشت ڕۆژ لە وێ دەمانەوە، دوای ئەوە دەچوون بۆ عەرەفە، ئیتر لە وێ و لە مینا دەستیان لە کڕین و فرۆشتن هەڵدەگرت، تاکو ئیسلام هات و ئەوەی بۆ حەڵاڵ کردن، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَـٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ (البقرة: ١٩٨) ئەم بازاڕانە لە سەردەمی ئیسلامیش تاکو ماوەیەك هەر مانەوەو دوایی لە ناو چوون، ئەو بازاڕانە تەنها بۆ بازرگانی نەبوون، بەڵکو بازاڕ گەلێك بوون بۆ وێژەو هۆنراوە و وتار بێژیش، گەورە شاعیرانی تیادا کۆ دەبوویەوە، لە گەڵ وتاربێژە بە تواناکانداو، کێبڕکێیان دەکرد لە باسکردنی ڕەچەڵەکەکان و شانازییەکانیان،بۆیە بووە سامانێکی گەورە بۆزمان و وێژەو، بێجگە لەوەی، کە سامانێکی بازرگانی بوو[3].

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٦٠)

٢ـ بڕوانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسولﷺ(ل/ ١٩)

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ١٠٢)

## چوارەم: باری کۆمەڵایەتی

داب و نەریت زاڵ بوو بەسەر ژیانی عەرەبدا، هەندێك یاساو داب و نەریتیان هەبوو سەبارەت بە نەژادو ڕەچەڵەك و پەیوەندی نێوان هۆزەکان و کەسەکان، دەکرێت پوختەی باری کۆمەڵایەتی بەم شێوەی لای خوارەوە کورت بکرێتەوە:

### ١ـ شانازی کردنی بێ ئەندازە بە ڕەچەڵەك و نەژاد:

ئەوان سوور بوون لە سەر پارێزگاری کردن لە ڕەچەڵەکیان، هەر بۆیە خزمایەتیان نەدەکرد لە گەڵ ڕەگەزەکانی تر، بەڵام ئیسلام کاتێك هات ئەوەی لە ناو برد، ڕوونیشی کردەوە بۆیان، کە پێوەری چاکی لە تەقواو کرداری چاکدایە.

### ٢ـ شانازی کردن بە وشە، بە تایبەت هۆنراوە:

زۆر ئارەزوویان هەبوو لە ووشەی پاراوو شێوازی پێگەیشتوو، هۆنراوەکانیان تۆمارگەیەك بوو بۆ شانازی و نەژادو ڕەچەڵەك و زانست و سۆزەکانیان ، بۆیە سەیر نییە، کە ووتاربێژی بە تواناو شاعیری بلیمەتیان تیادا هەڵکەوتووە، جاری وابووە کۆپلە شیعرێك پلەوپایەی هۆزەکەی بەرزکردۆتەو، کۆپلەیەکی تریش دایبەزاندووە، بۆیە ئەوان بە هیچ دڵخۆش نەدەبوون ئەوەندەی بە هەڵکەوتنی شاعیرێك دڵخۆش دەبوون لە ناویاندا.

### ٣ـ ئافرەت لە کۆمەڵگای عەرەبدا:

ئافرەت بەلای زۆرێك لە هۆزەکانەوە وەکو کاڵایەکی بێ کەڵك تەماشا دەکرا،ماڵی ئافرەت بە میراتی وەردەگیرا، کوڕی گەورەی پیاوەکەشی لە ژنێکی تر بۆی هەبوو مارەی بکات پاش مردنی باوکی، یان هەر ڕێگەی نەدایە شوو بکات، تاکو ئاینی ئیسلام ئەوەی قەدەغەکرد، کوڕیش مافی ئەوەی بوو خێزانی باوکی مارە بکات[1]، تاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزان: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٨٧)

ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ (النساء: ٢٢)

عەرەب بە لایانەوە قەدغە بوو مارەکردنی کەسی بنچینەیی وەکو دایك، یان لقەکان وەك کچ، یانە لقەکانی باوك وەکو خوشك، چینی یەکەمیش لە لقەکانی باپیر، وەکو خوشکانی باوك و دایك.[1]

ئینجا لە میراتی هەندێ کەسیان بێ بەش دەکرد وەکو کچ و خێزان و منداڵ، میراتییان نەدەدا بە کەسێك نەبێت توانای تالآنی هەبێت، یان توانای شەڕی هەبێت بەسەر ئەسپەوە، بێ بەشکردنی ژن و منالّ لە میراتی نەریتێکی کار پێکراو بوو لە لایان، تا ئەو کاتەی ئەوسی کوڕی سابیت کۆچی دوایی کرد لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ و دووکچی بە جێ هێشت لە دوای خۆی، هەندێ ناشیرین بوون، لە گەڵ کوڕێکی منداڵدا، لەو کاتە هەردوو ئامۆزاکەی ئەوس هاتن و هەموو میراتەکەیان بۆ خۆیان برد، خێزانەکەی پێی وتن: دوو کچەکە مارە بکەن، ئەوانیش ڕازی نەبوون، چونکە ناشیرین بوون، ئیتر ئافرتەکە هاتە لای پێغەمبەرﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوس لە دونیا دەرچوو و کوڕێکی منالّ و دوو کچی بە جێهێشتووە، عەرفەتەو سوەیدی ئامۆزای مێردەکەم هاتن و هەموو میراتییەکەیان بۆ خۆیان برد و ڕازیش نەبوون کچەکان مارە بکەن پێغەمبەرﷺفەرمووی: دەستکاری میراتەکە مەکەن[2]، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴾(النساء: ٧).

عەرەب تانەیاندەدا لە کەسێك کچی هەبوایە، چونکە کچ ناتوانێت بەشداری شەڕو تالآنی بکات و پارە دەربهێنێ، وەکو کوڕان، ئەگەریش لە کاتی جەنگدا دەستی دوژمن بکەوێت دەست بە دەستی پێدەکرێت و دەبێتە ئامرازێك بۆ

---

١ـ بڕوانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسولﷺ(ل ٢٢ـ ٢٤)

٢ـ تفسيرالقرطبي(٥/ ٤٥).

ڕابواردن، بەڵکو جاری وا بووە زۆری لێکراوە بۆ ئەوەی هەڵسێت بەکاری داوێن پیسی وەکو پیشە، بۆ ئەوەی سەرگەورەکەی سوود لە ئەو پارانە وەربگرێت، کە دەریدەکات لە ڕێگەی داوێن پیسی یەوە، عەرەب ئەم کارەیان بەلاوە ڕەوا بوو، ئەم کارەش دەبووە مایەی خەم و خەفەت و سەر شۆڕی بۆ باوکەکە کاتێك کچێکی لە دایك ببوایە، قورئانی پیرۆزیش باسی حاڵەتی ئەو باوکەی بۆ کردوین، کە کچێکی دەبێت و دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾(النحل: ٥٨ـ ٥٩)

زۆر جاران زیندە بەچاڵیشیان دەکرد، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی ئەنجام دابێت، ئەوە نەبێت، کە کچە[١]، بۆیە قورئان سەرزەنشتی ئەوانی کردووە لەسەر ئەو کارە ناشیرنەیان و فەرمویەتی:﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴾(التكوير: ٨ـ٩).

هەندێ لە عەرەبەکان کوڕەکانیشیان دەکوشت لە مەترسی هەژاریدا، تاکو ئیسلام هات و ئەوەی قەدەغە کرد، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾(الأنعام: ١٥١)

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾ (الإسراء: ٣١).

بەڵام هەندێك لە هۆزەکان کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکرد، بەڵکو هەندێکیان ئەو کارەشیان بە تاوانێکی گەورە دەزانی، وەکو زەیدی کوڕی نوفەیل.[١]

---

١ـ بڕوانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسولﷺ(ل ٢٥ـ ٢٦)

هەندێ لە هۆزەکانیش ڕێزی ئافرەتیان دەگرت و پرس و ڕایان پێدەکردن لەکاتی بەشوودانداا، ئافرەتی عەرەبی ئازادیش تەنها بۆمێردەکەی نەبێت هیچ کەسێك بۆی نەبوو پێوەی ڕابوێرێ، هەروەها بەوەش دەناسرا، کە ئازایەو بە دوای جەنگاوەرەکاندا دەڕواو هانیان دەدا، بەڵکو لە کاتی پێویستیدا بەشداری جەنگیشیان دەکرد، ئینجا ئافرەتی بیابان نشین هاوکاری مێردەکەی دەکرد لە بەخێوکردنی ئاژەڵ ورستنی خوری و چنینی پۆشاك و عەباو لە ئەو پەڕی خۆپارستن و داوێن پاکیدا بوو.

## ٤ـ هاوسەرگیری:

لە نێو عەرەبەکاندا چەندین هاوسەرگیری باوبوو، کەسیشیان ڕەخنەیان لە کەسیان نەدەگرت، ئەگەر هەڵسابا بە ئەنجامدانی جۆرێك لەو هاوسەرگیرییانە، عائیشەرضي الله عنها بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: هاوسەرگیری لە سەردەمی نەفامیدا بە چوار شێواز ئەنجام دەدرا، یەکێکیان وەکو هاوسەرگیری ئەمڕۆی خەڵکی بوو: کەسێك دەهاتە دەیخواست بۆلای کەسێکی تر، ئەویش خوشکەکەی یان کچەکەی لێ مارە دەکرد و پیاوەکەشی مارەیی دەداو دەیخواست، شێوەیەکی تر هەبوو پیاوەکە بەژنەکەی خۆی دەووت کاتێك پاك دەبوویەوە لە سوڕاوی مانگانە، بڕۆ بۆ لای فلانە پیاو با لەگەڵت جووت بێت، دوای ئەوە پیاوەکەی لێی دوور دەکەوتەوە و لەگەڵی نە دەخەوت تاکو دەردەکەوت، کە باردار بووە لە پیاوەکەی تر، دوای ئەوە پیاوەکەی خۆی ئەگەر بیوستبا دچووە لای، ئەم کارەشیان بۆ ئەوە ئەنجام دەدا کوڕەکە ڕەسەن دەربچێت، ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە پێی دەوترا(نكاح الاستبضاع) شێوەیەکی تریش هەبوو: کۆمەڵێك لە دەکەس کەمتر کۆدەبوونەوەو هەموویان دەچوونە لای ئافرەتێك، جا کە منالی دەبوو، چەند شەوێکی بەسەردا تێپەر دەبوو، دەینارد بەدوایاندا کەسیان بۆی نەبوو نەیەت، پێیانی دەوت: چاك دەزانن چیتان ئەنجامداوەو ئێستاش من منداڵم بووە، ئیتر ئارەزووی لە هەر کامێکیان بووایە پێی

---

١ـ البخاري كتاب النكاح، باب من قال: لا نكاح إلا بولي(رقم ١٢٧).

دەووت: منالەکە منالی تۆیە، ئەویش نکۆلی نەدەکرد، جۆرێکی تریش هەبوو لە هاوسەرگیری، کەسانێکی زۆر لە سەر ئافرەتێك کۆدەبوونەوەو ئەویش دەستی بە ڕێگای کەس نەدەهێنا، ئەو جۆرە ئافرەتانە پیشەیان داوێن پیسی بوو، لە دەرگای مالەکەشیان ئالایەکیان هەلدەدا، هەر کەسێ بیویستبا دەچووە ژوورێ بۆ لایان، جا ئەگەر لە یەکێکیان سکی پڕبووایە و منالەکەی ببوایە، هەموویان کۆدەکرانەوە لای ئەو ئافرەتەو(قافة) بانگ دەکرا، واتە: ئەو کەسەی شارەزایە لە لەیەکچوونی کوڕو باوك، ئیتر ئەو منالە دەکرا بەکوڕی یەکێکیان و ئەو کەسە دەبووە باوکی و ناڕازیش نەدەبوو، جا کە خوای گەورە پێغەمبەریﷺ نارد بە پەیامی ڕاستی ئەو جۆرە هاو سەرگیریانەی لابرد، تەنها ئەوەی ئەمڕۆ نەبێت، کە خەلکی ئەنجامی دەدن.

هەندێ لە زانایان شێوازگەلی تریشیان باس کردووە، وەکو (نکاح الخدن)، کە خوای گەورە باسی کردووە: ﴿وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾(النساء: ٢٥) دەیان ووت: ئەوەی شاراوە بێت زیانی نییە، ئەوەش ئاشکرا بێت جێگای لۆمەیە، نزیکتریشە لە زینا کردن، تا هاوسەرگیری، هەروەها (نکاح المتعة)، کە بر یتی بوو لە هاوسەرگیری بەسراو بەکاتی دیاریکراو، ئینجا(نکاح البدل)، پیاوێك بە پیاوێکی تری دەووت: واز لە ژنەکەی خۆت بهێنە بۆ من، منیش ژنەکەی خۆمت پێدەدەم و سەریشت دەدەمەوە.[1]

جۆرێکی تری هاوسەرگیری بەتال هەبوو ناوی(نکاح الشغار)، واتە: کەسێك کچەکەی خۆی لەوی تر مارە دەکرد بە مەرجێك ئەویش کچەکەی خۆی لە ئەم مارە بکات، بەبێ مارەیی.[2]

ئینجا کۆکردنەوەی دوو خوشکیان بەڕەوا دەزانی لە لای مێردێك، یان پیاو هەر چەند ئارەزووی هەبێت ژن بهێنێت، ئەوانەش کە زیاتر لە چوار خێزانانیان هەبووە

١ـ فتح الباري (٩/١٥٠ ذكره إبن حجر عن أبي هريرة)
٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٩)

لە ژماردن نایەن[١]، ئەو کاتەش ئیسلام هات کەسی وایان هەبوو دەهاوسەر یان زیاتری هەبوو، یان کەمتر، بەلام دواتر ئەوە کورت کرایەوە سەر چوار لە حالی توانینی خەرجیدان و یەکسانی کرن لە نێوا نیاندا، ئەگەر نا تەنها خێزانێك ڕاگرێت، لە سەردەمی نەفامیدا پەیوەست نەدبوون بە دادگەریی لە نێوان هاوسەرەکانیان، خراپیش مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن و مافەکانیان دەخواردن، تا ئەو کاتەی ئیسلام هات و مافەکانی بۆ گەڕاندنەوەو ڕاسپاردەی کرد چاکەیان لەگەڵ بکرێت، هەندێك مافیشی بۆ دەستە بەرکردن، کە خەونیان پێوەی نەدەبینی.[٢]

## ٥ـ جیابوونەوە:

لەو سەردەمانە تەلاقیان ئەنجام دەدا، بەبێ سنوورێکی دیاریکراو، بۆ نمونە پیاوێك هاوسەرەکەی خۆی تەلاق دەداو دەیگێڕایەوە، تەلاقی دەدا و دەیگێڕایەوەوبەبەر دەوامی ئەم شێوازە ئیشی پێدەکرا، تا هاتنی ئیسلام[٣] کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ﴾(البقرة:٢٢٩).

ئیسلام ژمارەی تەلاق دانی دیاری کرد، هەلیشی دایە مێرد بۆ ئەوەی فریایی خۆی بکەوێت، دوو جار دەتوانێت هاو سەرەکەی بگێڕێتەوە، بەلام پاش تەلاقی سێیەم پەیوندییەکە بە جارێك: دەبڕێت و، بۆی نییە بیگێڕێتەوە تاکو شوو بە پیاوێکی تر نەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ﴾(البقرة:٢٣٠).

---

١ـ بروانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسولﷺ(ل ٢٤ـ ٢٥)

٢ـ بروانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(٨٨/١)

٣ـ بروانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسولﷺ(ل ٢٥)

(ظهار)یش هەر حیسابی تەلاقی بۆ دەکرا، واتە: کەسێك بە خێزانەی بڵێت: تۆ بۆ من وەکو پشتی دایکم بیت، ئەمەش دەبووە قەدەغەکردنێکی هەتا هەتایی، تا ئەو کاتەی ئیسلام هات ناوی ئەو کارەی نا بە کارێکی ناشیرین ووتەیەکی درۆ، ڕێگاچارەشی بۆ مێرد دەستنیشان کرد، لە ڕێگەی کەففارەتدان[١]، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (المجادلة: ٣ـ٤).

**٦ـ جەنگ و پەلامار و بەسەرادان:**

جەنگیان لە نێوان بەرپا دەبوو لەبەر بچوکترین هۆکار، باکیان نەبوو لە گیرسانی شەڕو کوژرانی خەڵك لە پێناو بەرگریکرن لە بەها کۆمەڵایەتیەکان، کە خوویان پێوەگرتبوو، با چەندیش بێبایەخ بوونایە، مێژوو باسی هەندێکی زۆر لەو شەڕانەمان بۆ دەکات، وەکو بەڵگەیەك لەسەر سووربوونی عەرەب لەسەر ئەو جەنگانە، بۆ نمونە یەکێك لەو جەنگانە جەنگی بەسوس بوو لە نێوان هەردوو هۆزی بەکر و تەغلیب، بە بۆنەی ووشترێکی جەرمی، کە دراوسێ ی سوسی کچی مونقیزی پوری جەسساسی کوڕی مورڕە، بوو ئینجا کولەیب سەرۆکی هۆزی تەغلیب بوو جێگایەکی بۆ ووشترەکانی تەرخان کردبوو تیایدا بلەوڕێن، ئیتر ڕۆژێك ئەو ووشترەی تیادا بینی وتیرێکی تێهاوێشت، جەرمی ئارامی لێبڕاو بەسوسیش بە هەمان شێوە، کاتێك جەسسا ئەمەی بینی لە هەلێك دەگەڕا بۆ کوشتنی کولەیب و ئەو هەلەی بۆ ڕەخساو کوشتی، بەم شێوەیەش شەڕێك لە نێوان هەردوو هۆزکەدا بەرپابوو بۆماوەی چل ساڵ.[٢]

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(٩١/١/١)

٢ـ الكامل في التأريخ لإبن الأثير(٣١٢/١).

بە هەمان شێوە جەنگی داحیس و غەبرا، هۆکارەکەشی پێشبڕکێ یەك بوو لە نێوان داحیس و غەبرا، کە دوو ئەسپی قەیسی کوڕی زوهێر و حوزەیفەی کوڕی بەدربوون، حوزەیفە ئاماژەی کرد بۆ پیاوێك لە دۆڵێك ڕاوەستێت، ئەگەر بینی داحیس پێش کەوت ڕێگای لێبگرێت، ئەو پیاوەش لە ناوچاوی ئەسپەکەی دا تاکو خستیە ناو ئاوەکەوە بەم شێوە غەبرا بردیەوە، دوای ئەوە ئیتر کوشتن و تۆڵە سەندنەوە دەستی پێکرد و شەڕ هەڵگیرسا لەنێوان هەردوو هۆزی عەبس و زوبیان.[١]

هەروەها ئەو شەڕانەی بەر پا دەبوون لە نێوان هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج لە سەردەمی جاهیلیەتدا، کە ئەوان ئامۆزاش بوون، هەمیشە شەڕ بەردەوام بوو لە نێوانیاندا، دواترین شەڕەکانیش ناوی بوعاس بوو، سەرکردەکانی جولەکەش بەڵێنیان بۆ نوێ کردنەوە، کە پشتگیریان لێبکەن، بەم شێوەش ئەو شەڕانە هەمیشە بە ئاژاوە گێڕی جولەکەکان گەرم دەبوو، ئەوەش بە ئامانجی ئەوەی ئەوان لاواز بکەن و سەرگەورەیی بەردەوام هەر بۆ ئەوان بێت، هەر هۆزێکیش لەو دوو هۆزە پەنایان دەبردە بەر هۆزە هاوپەیمانەکانیان، لە پاش شەڕو کوشتارێکی زۆر سەر کەوتن بۆ هۆزی ئەوس بوو.[٢]

ئینجا هەندێ لەو هۆزانە خەریکی هێرش و پەلاماردان دبوون، بە مەبەستی تاڵانی و ئازاد بە کۆیلەکردن و فرۆشتنیان، بەڵام ئیسلام هات و ئەو دیاردەی لە ناوبرد، تاکو وایلێهات پیاو وژن لە نێوان صەنعاو حەزرە موتدا بە پیادە دەڕۆیشتن، ترسی هیچیان نەبوو، مەگەر ترسی خواو، گورگ لە سەر مەڕەکانیان.[٣]

## ٧ـ زانست و خوێندنەوەو نووسین:

عەرەب خاوەنی نووسین و زانست نەبوون وەکو جولەکەو گاورەکان، بەڵکو نەفام و نەخوێندەواربوون بەزۆری، هەمیشە لاسایی باو باپیرانیان دەکردو پێڕەوییان لێدەکردن، ئەگەر لەسەر هەڵەش بووایەن، نەتەوەی عەرەب نەنووسین و

١ـ هەمان سەرچاوە(١/٢٤٢)
٢ـ التأريخ الإسلامي، د. عبدالعزيز الحميدي(١/٥٥)
٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/٩١)

نەژماردنیان نەدەزانی، ئەوەش خەسڵەتێکی زاڵبوو بەسەریاندا، کە سانێکی کەم لەئەوان نووسینو خوێندەنەوەیان دەزانی، بەلام سەرەڕای ئەوەش ئەوان بانگی ژیری و هۆشمەندی و هەست جوانی و ئامادەباشی وەرگرتنی زانستیان هەبوو، بۆیە کاتێك ئیسلام هات ئەوان بوونە زاناو دانا، قوتاریان بوو لە نەخوێندەواری، زانست و زانیاری بوو بە دیارترین تایبەتمەندییەکانیان، ئەوان هەندێکیان لێهەڵکەوتبوو لە زانستی شوێن پێ هەڵگرتندا، هەندێکیشیان پزیشك بوون وەکو حاریسی کوڕی کەعب، پزیشکییان لەسەر بنەمای تاقیرکردنەوەکانی ژیان وژینگە دامەزراندبوو.[1]

## پێنجەم: باری ڕەوشتی

لە ڕاستیدا عەرەب لە ڕووی ڕەوشتەوە خراپ بوون، شەیدای مەی و قومار بوون، زۆرکاتیش خەریکی پەلاماردان و ڕێگە بەکاروان گرتن و و دەمارگیری و ستەم و خوێن ڕشتن و تۆڵە سەندنەوە و ماڵی خەڵك زەوت کردن و ماڵی هەتیو خواردن و مامەڵەکردن بە سوو و دزی و داوێن پیسی بوون، پێویستە ئەوەش بزانرێت، کە زینا لەگەڵ کەنیزەك و ئافرەتە داوێن پیسەکان، کە ئالایان هەبوو، بە دەگمەن ئەوکارە لە گەڵ ئافرەتی ئازاددا ئەنجام دەدرا، بەڵگەیەکی ڕوونیش لەسەر ئەوە، کاتێك پێغەمبەرﷺ بەیعەتی لە ژنان وەرگرت لە پاش فەتحی مەککە لە سەر ئەوەی، کە هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەن و، دزی و داوێن پیسی نەکەن، هیندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبو سوفیان ووتی: ئایا ئافرەتی ئازاد چۆن زینا دەکات؟[2]

ئەمەش مانای ئەوە نیە، کە هەموویان بەو شێوە بوونە، نەخێر زۆرێك لە ئەوان دوور بوون لە داوێن پیسی و مەی خواردنەوە و خوێن ڕشتن و ستەم و ماڵی هەتیو خواردن و مامەڵە کردن بە سوو[3]، هەندێ خەسڵەتی چاکیشیان هەبوو، کە ئامادەی کردن بۆ هەڵگرتنی ئالای ئیسلام، لەوان:

**١ـ ژیری و زرنگی:**

دڵەکانیان پاك و پاراو بوو، فەلسەفەو ئەفسانە وقسەی پڕوپوچ داگیری نەکرد

---

١ـ هەمان سەرچاوە(٩٢/١).

٢ ـ هەمان سەرچاوە(٩٤/١).

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لابي شهبة(٩٣/١)

بوو، وەکو گەلانی هیندو ڕۆمان و یۆنان‌وفارس، وەکو چۆن ئەو دڵانە ئامادە بکرێن بۆ هەڵگرتنی مەزنترین پەیام لە بوونەوەردا، کە بانگەوازی پیرۆزی ئیسلام بوو، بۆیە ئەوان لەو سەردەمە چالاکترین گەل بوون لە لەبەرکردندا، ئیسلامیش ئاراستەی بەهرەی ژیری و لە بەرکردنی تیاندا کرد، بەرەو پاراستنی ئایین، بۆیە ئەوان توانا هزری و بەهرە شاراوەکانیان کول نەبوو بوو لە فەلسەفەو ئەفسانەو مشتومڕی بێزەنتی بێ سوود.[1]

بەرفراوانی زمانەکەیان بەڵگەیە لەسەر بە هێزی لە بەرکردن و بیریان، جا ئەگەر هەنگوین هەشتا ناوی هەبێت و ڕێوی دوو سەد ناو و شێر پێنج سەد ناو وشتر هەزار ناو هەروەها شمشێر... بێگومان لەبەرکردنی ئەم ناوانە پێویستی هەیە بە بیرێکی بەهێزوتیژ.[2]

تەنانەت ئەوەندە ژیربوون هەر بە ئاماژەتێدەگەیشتن سەرەڕای قسەکردن ,نمونەش لەم بارەوە زۆرن.[3]

**٢ـ خەڵکێکی بەخشندە و دەست بڵاوبوون:**

ئەم ڕەوشتە ڕەگ و ڕیشەی هەبوو لە نێو عەرەبەکان، کەسی وایان هەبوو تەنها ئەسپەکەی ژێر خۆیی هەبوو، یان ووشترەکەی کە میوانی دەهات بە پەلە هەڵدەستا بە سەر بڕینی بۆ میوانەکەی، بەڵکو هەندێکیان نەکو تەنها مرۆڤەکان، بەڵکو خۆراکی دەدایە دڕندەو پەلەوەرەکانیش، بەخشندەیی حاتیمی تائیش بۆتە پەندو وەکونموونەباس دەکرێت.[4]

**٣ـ خەڵکێکی نەبەردو خاوەن پیاوەتی و فریاکەوتن بوون:**

وەسفی ئەوکەسەیان دەکرد، کە بەکوشتن گیان لە دەست دەدا، زەمی ئەو کەسەشیان دەکرد، کە لە سەر جێگایی خۆی دەمرێت، یەکێکیان کاتێك هەواڵی

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية، الندوي(ل ١٢)

٢ـ بلوغ الأدب (١/٣٩ـ ٤٠)

٣ـ بڕوانە: مدخل لفقه السيرة(ل ٧٩ـ ٨٠)

٤ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لابي شهبة(١/٩٥)

کوژرانی براکەی پێگەیشت ووتی: ئەگەر ئەو کوژراوە، پێش ئەو باوك و براو مامی کوژراوە، سوێند بە خوا ئێمە لە سەر جێگا نامرین، بەڵکو بە نووکی ڕم لەژێر سێبەری شمشێر دەمرین:

وما مات منا سيد حتف أنفه ولاطلّ منا حيث كان قتيل
تسيل على حد الظباة نفوسنا وليست على غير الظباة تسيل

عەرەب هیچ شتێکیان لە سەر سەروەری پێش نەدەخست، یان لەسەر پاراستنی ناموس و پارێزگاریکرن لە ئافرەت، لە پێناو ئەوەشدا هەموو شتێکیان بەلاوە ئاسان بوو، عەنتەرە دەڵێت:

بكرت تخوفنى الخوف كأننى أصبحت عن غرض الحتوف بمعزل
فأجبتها أن المنية منهل لابد أن أسقى بكأس المنهل
فأقْنى حياءك لا أبالك واعلمي أني أمرؤٌ سأموت أن لم أُقتل.[1]

هەروەها عەنتەرە وتوویەتی:

لا تسقني ماء الحياة بذلة بل فاسقني بالعز كأس الحنظل.
ماء الحياة كجهنم وجهنم بالعز أطيب منزل.[2]

عەرەب هەر بە سروشتیان خاوەن غیرەت و پیاوەتی بوون، جا پێیان ناخۆش بوو بە هێز زیان بگەیەنێت بەلاواز، یان بێ دەسەلات، یان ئافرەت، یان پیر، هەرکەسێکیش پەنای بۆ بهێنایەن فریای دەکەوتن، بە ڕیسوایی و سووکی دەیانڕوانیە کەسێك، کە داڵدەی ئەو کەسە نەدات، کە پەنای بۆ هێناوە.

---

١ـ ديوان عنترة، د. فاروق الطباغ(ل ٢٥٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە.

**٤ـ شەیدای ئازادی بوون، ستەم وسەر شۆڕییان قبوڵ نەدەکرد:**

مرۆڤی عەرەب بە فیترەتی حەزی لە ئازادی دەکرد، لە پێناوی دەژیاو لە ڕێگەشیدا دەمرد، چونکە هەر بە ئازادی پەروەردە بوو بێ ئەوەی کەس توانەیەکی هەبێت بە سەریدا، بۆیە بەسەر شۆڕی ڕازی نەدەبوو، ئامادەش بوو ژیانی دابنێت لە ڕێگایی پاراستنی شەرەف و ئابڕوو،[١] بۆ نمونە:

شا عەمری کوڕی هیند لە گەڵ هاودەمەکانی دانیشت و پرسیاری لێکردن: ئایا ئێوە لە نێو عەرەب شارەزای کەسێکن دایکی لە خۆی نەگرێت خزمەتی دایکم بکات؟ ووتیان: بەڵێ دایکی عەمری کوڕی کەلسوومی شاعیر.

ئینجا عەمر ناردی بەدوای عەمری کوڕی کەلسووم و دایکیدا بە مەبەستی سەردانی کردن، لەگەڵ دایکیشی ڕێککەوت، کە لە پاش نانخواردن بە دایکی عەمری شاعیر بڵێت: ئەو قابلەمەی لای خۆتم بدە دەست، جا کاتێك هاتن ئەوەی پێووت، ئەویش ووتی: ئەو کەسەی کارێکی هەیە با خۆی هەڵسێت بیکات، بەڵام ئەو جارێکی تر هەمان داوای دووبارەکردەوەو سوربوو لە سەری، بەڵام لەیلای دایکی عەمر ئەمجارە هاواریکرد ووتی: ئای لەم سەر شۆڕیەهاوار لە هۆزی تەغلیب... عەمری کوڕی گوێی بە دایکیەوە بوو زۆر تورە بوو، شمشێرێکی مەلیکی بینی هەڵواسرابوو، پەلاماریداو لە گەردنی مەلیکی دا، ئینجا هاواری کرد لە هۆزەکەی خۆی، هاتن هەموو ئەوەی لە هەیوانەکەدا بوو تالأنیان کرد، ئینجا هۆنراوەیەکی هەڵبەست ووتی:

| | |
|---|---|
| بأي مشيئة عمرو بن هند | نكون لقيلكم فيها قطينا |
| بأي مشيئة عمرو بن هند | تطيع بنا الوشاة و تزدرينا |
| تهددنا و توعدنا رويدا | متى كنا لامك مقتوينا |
| إذا ما الملك سام الناس خسفاً | أبينا أن نقرّ الذل فينا.[٢] |

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لابي شهبة(١/٩٥)

٢ـ بڕوانە: شرح المعلقات للحسين الزوزني(ل ١٩٦، ٢٠٤).

**٥ـ بە ئەمەکبوون بۆ پەیمان و خۆشەویستیان بۆ ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی:**

ئەوان خۆیان لە درۆ بە دوور دەگرت و بە عەییبەیان دەزانی، خەڵکێکی بە ئەمەکیش بوون، بۆیە تەنها شایەتمانیان بە زمان بەس بوو بۆ هاتنە نێو ئیسلامەوە، بەڵگەش لە سەرخۆ بەدوورگرتنیان لە درۆکردن، بەسەرهاتی ئەبو سوفیان لەگەڵ هیرەقل کاتێك پرسیاری لێدەکرد دەربارەی پێغەمبەری خواﷺ، لەکاتێکدا هێشتا شەڕ لەنێوانیاندا بەردەوام بوو، ووتی: ئەگەر لەشەرمی ئەوە نەبێت، کە درۆیەکم لێ ببیسرێت درۆم دەکرد لەوەڵامەکانمدا.[١]

سەبارەت بە نوعمانی کوڕی مونزیر بە کیسرای وت دەربارەی ئەمەکی عەرەب: کەسێك لە ئەوان نیگایەك دەکات، یان هێمایەك دەکات ئەوە بەڵێنێکی لاوازەو گرێیەکە نایکاتەوە مەگەر بە دەرچوونی گیانی نەبێت لە جەستەی، کەسێکیش لە ئەوان دارێك لە زەوی بەرز بکاتەوە دەبێتە بارمتە بە دەستیەوە، ئیتر نە بارمتەکەی دادەخرێت و نە گەردنیشی ئازاد دەکرێت، یان کەسێکیان هەواڵی ئەوەی پێدەگات، کە پیاوێك هانای بۆ هێناوە، لەوانەشە دوور بێت لە ماڵ و حاڵی خۆی و تووش بێت، ئیتر ڕازی نەبێت تائەو هۆزەی لێیان داوە لە ناویان نەبات، یان هۆزەکەی خۆی لەناو نەبات لەو پێناوەدا، جاری واش هەیە تاوانبارێك، کە ناشیناسن هاواریان بۆ دەهێنێ بە ماڵ و گیانیان بەرگری لێدەکەن.[٢]

ئەمەك (وەفا) ڕەوشتێکی ڕەگدارە لە نێو عەرەبدا، کاتێك ئیسلام هات بە شێوەیەکی دروست ئاڕاستەی کرد، توند بوو لەگەڵ ئەوکەسەی داڵدەی تاوانبار دەدا، ئیتر با خاوەنی هەر پلەو پایەیەك بێت، پێغەمبەری خواﷺدەفەرمووێت: ((لعن الله من آوى محدثاً))[٣] لەعنەتی خوا لەو کەسە بێت، کە داڵدەی تاوانبارێکی کەتنکەر دەدات، یەکێ لەو بەسەر هاتانەش ئاماژە دەکات بۆ ئەمەکیان.[٤]

حاریسی کوڕی عەبباد سەرکردایەتی هۆزەکانی بەکری دەکرد بۆ جەنگی هۆزی تەغلیب و سەرکردەکەیان کە ناوی موهەلهیل بوو، بکوژی کوڕی حارسیش بوو، لەو

---

١ـ البخاري بدء الوحي( رقم ٧)

٢ـ بلوغ الارب(١/ ١٥٠،١٤٩)

٣ـ رواه مسلم كتاب الأضاحي(١٩٧٨)

٤ـ بڕوانە: مدخل لفهم السيرة(٩٠)

جەنگە دا حاریس موهەلهیلی بەدیل گرت بۆ ئەوەی بزانێت کێ یە، پێی وت: موهەلهیلی کوڕی ڕەبیعەم پێ نیشان بدە و بەرت دەدەم، وتی بەڵێنم پێدەدیت ئەگەر پێت نیشاندەم ئازادم بکەیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی من موهەلهیلم، ئەویش قژی توێڵی بڕی و ئازادی کرد، ئەمەش ئەمەکێکی زۆر کەم وێنەیە، پیاوەتیەکیشە شایستەی باسکردنە.[1]

هەروەها نوعمانی کوڕی مونزیر لە کیسرا دەترسا، چونکە ڕازی نەبوو کچەکەی خۆی لێماره بکات، چەك وخێزانەکانی سپارد بەهانیئی کوڕی مەسعودی شەیبانی و خۆی چوو بۆ لای کیسراو ئەویش نوعمانی کوشت و ئینجا ناردی بۆ لای (هانئ) داوای سپاردەکانی نوعمانی لێکرد، ئەویش ڕازی نەبوو، جا کیسرا سوپایەکی بەڕێخست، بۆیە هانئ هۆزەکەی کۆکردەوەو ووتارێکیدا بۆیان ووتی: ئەی کۆمەڵانی هۆزی بەکر، تیاچووە یەکی خاوەن پاساو چاکترە لە قوتاربوویەکی هەڵاتوو، خۆپاراستن کەس لە قەدەر ناپارێزێت، ئارامگرتن هۆکارێکە بۆ سەرکەوتن، مەرگ چەشتن نەك سەر شۆڕی، ڕووبەڕووی مردن بچیت لەوە چاکترەپشتی لێهەڵکەیت، لێدان لە گەردن چاکترە لە لێدانی پشت و لەدواوە، ئەی هۆزی بەکر، بجەنگن، کەس نیە بتوانێت لەمردن هەڵێت.[2]

ئەو هۆزە توانیان فارسەکان ببەزێنن لە جەنگی (ذی قار) بە بۆنەی ئەم پیاوە، کە ژیانی سەر شۆڕی پێ قبوڵ نەبوو، هیچ باکیشی نەبوو لە مردن لە پێناو بەسەر بردنی پەیمانەکانی.

**٦ــ ئارام گرتن لەسەر ناڕەحەتی و خۆ ڕاگری و ڕازیبوون بەکەم:**

کە لەسەر خواردن هەڵدەستان دەیانووت: زۆرخۆری ژیری نامێڵێ، پیاوی زۆرخۆریشیان بەلاوە عەیبدار بوو، شاعیرەکەیان دەڵێت:

إذا مدت الأيدي إلى الزاد لم اكن بأعجلهم إذا اجشع القوم أعجل.[3]

---

١ــ هەمان سەرچاوە(٩١).

٢ــ تأريخ الطبري، يوم ذي قار(٢/٢٠٧)

٣ــ ــ بلوغ الأرب(١/٢٧٧).

واتــە: کــە دەســت درێــژ دەکــرا بــۆ نــان خــواردن پێــشیان نەدەکــەوتم، کــە زۆرخۆریشیان کردبا پەلەم دەکرد لە دەست هەڵگرتن.

توانایەکی سەرسوڕهێنەریشیان هەبوو بەرامبـەر ناڕەحـەتی و خـۆڕاگر بـوون لـە ڕووی تـەنگ و چـەڵەمە، لەوانـەش ئـەوە لـە سروشـتی وڵاتەکەیانـەوە سەرچـاوەی گرتبێت، کە ناوچەیەکی بیابانی وشك و کەم ئاوو ڕووەکە، جا نەگەرماو نە سـەرماو نـە سـەختی ڕێگاوبـان و دووری مـاوەو، برسـێتی و تینـوێتی، کـار تێنـەکردن، ئـەو کاتەش هاتنە ئاینی ئیسلامەوە بوون بە نمونەی خۆڕاگرتن و ئارامی، چونکە بەکەم ڕازی دەبوون، کەسی وایان هەبوو چەندین ڕۆژ ڕێگـای دەبـڕی بـە توێـشووی چـەند دانە خورمایەك و چەند دڵۆپە ئاوێك جەرگی خۆی پێ تەڕ دەکرد.[١]

**٧ــ هێزی لاشەو گەورەیی دەروون و دڵخۆشبوون لە کاتی بە هێزیداو پاراستنی دراوسێ:**

ئەوان بە تۆکمەیی لاشەو مەزنی دڵ و دەروون دەناسران، خۆ ئەگەر پاڵـەوانێتی دەروونی و لاشەیی لەکەسێکدا کۆبێتەوە شتێ سەیری لێدەردەکەوێت، لـە ڕاسـتیدا ئەوەبوو، کە ڕوویدا پاش موسڵمان بوونیان، هەروەها ئەوان شەڕیان دەکـرد لەگـەڵ ناحەزانیاندا، بەڵام کاتێك دەسـەڵاتیان دەبـوو بەسـەریاندا، لێیـان خـۆش دەبـوون، ئینجا نەدەچـوونە سـەر کەسـی برینـدار لـە شـەڕدا، مـافی هاوسێتیـشیان دەزانـی، بەتایبەت چـاودێری کردنـی ئافرەتـان و، پارێزگـاریکردن لـە ئـابڕوو، شـاعیرەکەیان دەڵێت:

واغض طرفي أن بدت لي جارتي      حتى يواري جارتي مأواها

واتە: ڕوو وەردەگێڕم، کە کچە دراوسێکەم دەربچێت، تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە ناوماڵەکەی خۆی و دیار نامێنێت، ئەگەر کەسێك هانای بۆ بهێنایان داڵدەیان دەدا، لەوانەشە گیان و کوڕ وماڵیشیان بە قوربان بکردایە.

ئاینی ئیسلام هات ئـەم واتـا مەزنانـەی لـە دەروونـی عەرەبەکانـدا گەشـە پێـداو ئاڕاستەی کرد بەرەو هەق و چاکە ، بۆیە هەروەکو فریشتەی پاراو دەرپەڕین و سەر

---

١ــ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/٩٦، ٩٧).

زەویان فەتح کرد و پڕیانکرد لە باوەڕ، پاش ئەوەی، کە پڕبوو لە بێبابەوەڕی، پڕپیشیان کرد لە دادگەری و چاکە دوای ئەوەی، کە پڕکرابوو لە ستەم و خراپە.[١]

ئەمانە هەندێك بوون لە ئاكارەكانی ئەو كۆمەڵگایەی مرۆڤی عەرەبی تیا پەروەردەبوو، بێگومان ئەوە چاكترین كۆمەڵگا بوو، بۆیە هەڵبژێردرا وەكو ژینگەیەكی ناوازەو ناوەندێكی ئاست بەرز ـ بە بەراورد لەگەڵ فارس و ڕۆم و هیندو یۆنان ـ بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوای ﷺ تیا پەروەردەبێت، نەكو لە هیچ كۆمەڵگایەكی وەكو فارەسەكان، كە خاوەنی زانست و زانیاری زۆر بوون، یان هنودەكان، كە خاوەن فەلسەفە بوون، یان لە ڕۆمانییەكان، سەرەڕایی هونەرەكانیان نە لە یۆنانی خاوەن بلیمەتی هۆنراوەو فەلسەفەش، بەڵكو لە كۆمەڵگای عەرەب هەلبژێردرا، چونكە ئەو گەلانە وێڕای ئەو شتانەی كە هەیان بوو لە زانست و هونەر، بەڵام نەگەیشتە ئاستی فیترەت پاكی عەرەب وئازادی ویژدان و بەرزی گیانی ئەوان.[٢]

---

١ـ سەرچاوەی پێشوو(١/٩٧)

٢ـ بڕوانە: نظرات في السيرة لحسن البنا(ل ٤١)

## باسی چوارەم: گرنگترین ڕووداوەکانی پێش لە دایك بوونی پێغەمبەرﷺ.

خوا ویستی بەزەییەکی بە مرۆڤایەتیدا بێتەوەو خەڵاتێکیان بکات، ئیتر کاتی سەرفراز بوون هات بە ناردنی پێغەمبەرﷺ، پێش ئەوەی دەست بکەین بە باسی لە دایك بوونی پێغەمبەری مەزنمان و پەروەردەی سەروەرمان و چاودێری خوای گەورە، بۆ ئەو پێش دابەزینی وەحی بە سەریدا، پێش ئەوەی بچینە نێو ئەو باسە خۆشانەی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ دەمانەوێت باسی هەندێ بەڵگەی مەزن و بەسەرهاتی گەورە بکەین، کە پێش لە دایك بوونی پێغەمبەرﷺ ڕوویانداوە، لە ڕاستیدا پێش لە دایکبوون هەندێك ڕووداو کەوتنەوە ئاماژەیان دەکرد بۆ نزیکی بەرەبەیان.

یەکێك لە یاساکانی خوای گەورە بریتی یە لە کرانەوە لە دوای تەنگەژەو ڕۆشنایی دوای تاریکی و خۆشی دوای ناخۆشی.[١]

### یەکەم: بەسەرهاتی عەبدولموتتەلیبی باپیری پێغەمبەرﷺ سەبارەت بە هەڵکەندنی بیری زەمزەم.

مامۆستا ئیبراهیم عەلی لە کتێبی(صحیح السیرة النبویة) ڕیوایەتێکی ڕاست دەگێڕێتەوە سەبارەت بە هەڵکەندنی بیری زەمزەم، لە فەرموودەیەکی علیﷺ، کە دەفەرموێت: عەبدولموتتەلیب وتی: من لە حیجردا خەوم لێکەوتبوو، کاتێك کەسێك هات و پێی ووتم تەیبە[٢] هەڵکەنە، ووتم: تەیبە چیە؟ ئیتر بە ئاگا هاتمەوە، دەڵێت: ڕۆژی دوای ئەوە لە هەمان جێگادا خەوتم، هەمان کەس هات و وتی: بەڕە[٣] هەڵکەنە، ووتم: بەڕە چیە؟ دەڵێت: دیسان بە ئاگا هاتمەوە، دەڵێت: ڕۆژی دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ هەمان جێگاو خەوتم، کە سەکە هاتەوەو وتی: مەزنونە[٤] هەڵکەنە

---

١ـ بڕوانە: هذا الحبیب، الجزائري(ل ١٥).

٢ـ (طیبة) لە(طیب)ە وە هاتووە شاری مەدینەش هەر بەوە ناو نراوە.

٣ـ (برة) لە (بر)ەوە وەرگیراوە، واتە: چاکە و پاراوی.

٤ـ (المضنونة) واتە: گران بەها، کە کەس لە دڵی نایەت بیدات بەکەس.

وتم: مەزنونە چیە؟ دەڵێت دیسان بەئاگا بوومەوە دەڵێت ڕۆژی دواتر گەڕامەوە جێگاکەم و خەوتم و ئەمجارە کەسەکە وتی: زەمزەم هەڵکەنە وتی: وتم: زەمزەم چیە؟ وتی: هەرگیز ئاوی نە وشك دەکات و نەکۆتایی پێدێت، حاجیانی ژمارە زۆر ئاوی لێدەخۆنەوە، دەشکەوێتە نێوان پیسایی و گۆشتەوە، لە لای دەنوکی قەلەڕشی ڕان سپی، لە لای شاری مێرووله، ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: کاتێك باسەکەی بۆ ئاشکراکراو جێگاکەی پیشاندرا دڵنیاش بوو کە ئەوە ڕاستە، بە پاچێکەوە لەگەڵ حاریسی کوڕی، کە تاقانەبوو دەستیان کرد بە هەڵکەندن، کاتێك لێواری بیرەکە وەدەرکەوت عەبدولموتتەلیب وتی: (الله أكبر) ئەوسا هۆزی قوڕەیش بۆیان دەرکەوت، عەبدولموتتەلیب بە مەرامی خۆی گەیشت، ئەوانەش هاتنە لای و وتیان: ئەی عەبدولموتتەلیب ئەوە بیرەکەی ئیسماعیلی باپیرمانە ئێمەش مافمانی تێدایە، جا هاوبەشمان بکە لەگەڵ خۆت، وتی: کاری وا ناکەم، ئەمە شتێکە تەنها من تایبەت کراوم پێوەی لە نێوان هەمووتاندا، وتیان باشە ئێمە سکاڵات لێدەکەین، ئەویش ووتی: کێتان بێ چاکە بچینە لای؟ وتیان دەچینە لای قەشەی بەنی سەعدی کوڕی هوزەیم، وتی: باشە ئەو قەشەیە لە بەرزاییەکانی شام بوو، عەبدولموتتەلیب و هەندێك لە خزمانی لەگەڵ چەند کەسێك لە هۆزەکەیدا بەڕێکەوتن بە بیاباندا، لە ڕێگە عەبدولموتتەلیب و خزمانی ئاویان لێبڕا، ئەوەندە تینویان بوو تاگەیشتنە حاڵەتی خنکان، داوای ئاویان کرد، بەڵام ڕازی نەبوون، وتیان ئێمە لە بیاباندایین دەترسین ئێمەش وەکو ئێوەمان بەسەربێت، عەبدولموتتەلیب وتی: وا بە باش دەزانم هەر کەسێك چاڵێك بۆ خۆی هەڵکەنێت، تا هێزتان تیا ماوە، ئینجا هەرکەسێکتان مرد ئەوەکانی تر دەخەینە ناو چاڵەکەی و دوایی دای دەپۆشن، تا دەگاتە دواکەس، تاکە کەسێکیش بفەوتێ لەوە چاکترە لاشەی کاروانێك بە جارێ لە نێو بچێت، ووتیان بەڕاستی فەرمانێکی چاکت پێمان کرد.

ئیتر هەرکەسێك لەوان چاڵێکیان بۆخۆیان هەڵکەند و دانیشتن چاوەڕێی مردنیان دەکرد لە تینوان، ئینجا عەبدولموتتەلیب بە هاوڕێکانی وت: سوێند بە خوا ئەم خۆدانە دەستەوەمان بەدەستی مردنەوە بێدەسەڵاتیە، هەڵسن بەڕێکەوین، بەڵکو لە لایەکەوە ئاومان دەست بکەوێت، کە عەبدولموتتەلیب وشترەکەی هەڵسا لە ژێر قاچەکانیەوە کانییەکی ئاو هەڵقولا و هەموویان دەستیان کرد بە(ألله أكبر)و لە ئەو

ئاوەیان خواردەوە و لێشیان پڕکرد، ئینجا بانگی هۆزەکانی قورەیشی کرد ــ کە ئەوان ئاگاداری هەموو ئەم رووداوانە بوون ـ ئەوانیش هەموو ئاویان خواردو وتیان: خوای گەورە حوکمی بۆ تۆ سەپاندە سەرماندا، سوێند بە خوا تازە ناچینە لای کەس سکاڵات لێبەکەین دەربارەی زەمزەم ئەو کەسەی لەم بیابانە ئەم ئاوەی بۆ هەڵقوڵانی، هەر ئەو کەسەیە زەمزەمی پێداوی بۆیە بەسەربەرزی بگەڕێوە بۆ لای ئاوی خۆت و گەڕانەوە بۆ مەککە.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ئەم هەواڵەم پێگەیشتووە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەربارەی زەمزەم[١]، فەرمودەی زۆریش هاتووە دەربارەی فەزڵی ئاوی زەمزەم، لە وانە ئەو فەرموودەی، کە لە صەحیحی موسلمدا هاتووە لە بەسەرهاتی موسڵمان بوونی ئەبو زەڕ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((إنها مباركة، إنها طعام طعم)) واتە: ئەوە ئاوێکی پیرۆزە و بخۆریشی تێر دەبێت، وەکو چۆن خۆراکی خواردبێت.[٢]

هەروەها دارەقوتنی و حاکیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ((ماء زمزم لما شرب له ان شربته لتستشفى شفاك الله وان شربته ليشبعك اشبعك الله، وأن شربته لقطع ظمئك قطعه الله، وهي هزمة جبريل، وسقيا الله إسماعيل)) شێخ موحەممەد ئەبو شەهبەرحمه الله[٣] دەفەرموێت: هەرچۆنێکیش بێت(حافظ)ی دیمیاتی، کە زانایەکی هەرەبەرزە لە دواینەکان لە فەرموودەی (ماء زمزم لما شرب له)ی بە صەحیح زانیوەو(حافظ)ی عێراقیش ڕازی بووە لەسەر ئەو بەڕاست دانانە.[٤]

واتای فەرمودەکە: ئاوی زەمزەم بۆ هەر مەبەستێکە لە پێناویدا بخورێتەوە، ئەگەر بیخۆیتەوە بۆ چاکبوونەوە چاك دەبێتەوە، هەروەها بۆ تێربوون تێر دەبێت،

---

١ـ السيرة النبوية: إبن هشام (١/ ١٤٢ـ ١٤٥) السير والمغازى لابن إسحاق (٢٤ـ ٢٥) تحقيق سهل زكار، البيهقي في الدلائل(١/ ٩٢ـ ٩٥) ، وصرح إبن إسحاق بالتحديث فسنده صحيح، وله شاهد من مرسل الزهري، فالحديث صحيح من طريق البيهقي وإبن هشام.

٢ـ مسلم فضائل الصحابة، باب من فضائل أبي ذر، ورحمة(٢٣ـ ٢٤٧٣).

٣ـ بڕوانە: السيرةالنبوية الصحيحة(١/١٥٨)

٤ـ مقدمة إبن الصلاح و شرحها للحافظ العراقي(ل ١٢).

یان بۆ لای بردنی تینوێتی لادەچێت، هەروەها زەمزەم جێگای لێدانی جبریلە لە زەویداو خواردنەوەی خوایە بۆ ئیسماعیل.

## دووەم: بەسەرهاتی( أصحاب الفيل ):

ئەم بەسەرهاتە لە قورئان و فەرموودەدا باسکراوە، بەشیکراوەیش لە کتێبەکانی مێژوو لێکدەرەوانی قورئاندا هاتووە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾(الفيل)

سەبارەت بە ئاماژەکانی پێغەمبەری خواﷺ بۆ ڕووداوەکە:

کاتێك پێغەمبەری خواﷺ لە حودەیبیە دەرچوو تاکو گەیشتە جێگایەك، وشترەکەی بە چۆکدا هات و خەڵکە وتیان: حەل حەل، واتە: ڕێکە ڕێکە، بەلام وشترەکە هەر خۆی بەزەویدا و ڕێی نەکرد، وتیان: وشتری قەصوا پەکی کەوت: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ما خلأت القصواء، وما ذاك لها بخلق، ولكن حبسها حابس الفيل))[1] واتە: نەخێر قەصوا پەکی نەکەوت و نەئەوەش ڕەوشتی ئەوە، بەڵکو ئەوەی فیلەکانی بەند کرد ئەمیشی بەندکرد.

لە کتێبی (السيرة النبوية)ی ئیبنو ئەبی حاتیم داهاتووە:

سەبارەت بە بەسەرهاتی فیل پادشایەك بوو لە یەمەن، لە بنچینە دا حەبەشی بوو، ئەبرەهەی پێدەوترا، کلێسایەکی دروست کردو ناوی لێنا قوللەیس، بانگەشەی ئەوەی دەکرد وابکات خەڵکی ئیتر بۆ ئەو شوێنە حەج بکەن لە جیاتی ماڵی خوا، بڕیاریشی دا بەڕێکەوێت بۆ ڕوخانی کەعبە، لەو کاتە یەکێك لە پادشاکانی حیمیەر لەوانەی پێشتر لە ژێر دەسەلاتیدا بوون هاتە جەنگ لەگەڵیدا، بەلام ئەبرەهە توانی

١ـ فتح الباري(٥/٢٢٥).

بیبەزێنێت، کاتێك هێنایانە پێش دەستی پێی وت: ئەی پادشا مەمکوژە مانەوەم بۆ تۆ چاکترە، ئیتر ئەبرەهە نەیکوشت و کۆتی کرد، ئینجا درێژەی دا بە بەڕێکردنەکەی بەرەو کەعبە، کاتێك لە ولاتی خەسعەم نزیك بوویەوە، نوفەیلی کوڕی حەبیبی خەسعەمی و ئەو هۆزانەی لەگەڵیدا بوون شەڕیان لەگەڵ ئەبرەهە کرد، بەڵام ئەبرەهە توانی بیانشکێنێ و نوفەیلیشی دیل کرد، نوفەیل وتی: ئەی پادشا مەمکوژە، من شارەزای خاکی عەرەبم و هۆزەکەشم بەقسەم دەکەن، بۆیە نەیکوشت و لەگەڵیدا هات بۆ ئەوەی ببێت بە چاوساغیان، کاتێك گەیشتنە تائیف، مەسعودی کوڕی موعەتتیب هات ووتی: ئەی پاشا ئێمە کۆیلەی تۆین و ناکۆکی نیە لە نێوانماندا، نە لاریشمان هەیە لەوەی بتی لات بڕوخێنێ، بەڵام تۆ مەبەستت ئەو ماڵەیە، کە لەمەککەیە، ئێمە چاوساغێکت لەگەڵ ڕەوانە دەکەین، ئیتر هەڵسان بە ناردنی ئەبو ڕوغال لەگەڵ سوپاکەیدا، کە گەیشتنە ناوچەی موغەممەس[1] ئەبو ڕوغال مردو گۆڕەکەی بەردبارانکرا، ئینجا ئەبرەهە کەسێکی لەموغەممەس نارد وەکو سەرکردەی سوارەکانی و خەڵکانی حەرەمی کۆکردەوەو دوو سەد وشتری عەبدولموتتەلیب لە عەیرولئەراك هێنا، ئینجا ئەبرەهە حوناتەی حیمیەری نارد بۆ لای خەڵکی مەککە و چاوی بە عەبدولموتتەلیبی کەوت وڕاسپاردەکەی پێ وت، عەبدولموتتەلیب وتی: ئێمەش شەڕی لەگەڵ ناکەین، ئەو پادشایەش، کە دیل بوو لای ئەبرەهە بە ناوی(ذو نفر) عەبدولموتتەلیبی دەناسی، بەڵام وتی: من کابرایەکی دیلم هیچم پێناکرێت بۆت، بەڵام ئونەیسی لێخوڕی فیلەکەت لەگەڵ دەنێرم بۆلای ئەبرەهە باست بکات، ئونەیس وتی: ئەوە سەرگەورەی قورەیشە و خاوەنی مەککەیە، نانەدەری خەڵکە لە دەشتایی و دڕندەکانە لە چیاکان دووسەد وشتری گیراوە لای پاشامان، جا ئەگەر بکرێت بیاندەیتەوە وداوای مۆڵەت دەکات بتبینێت، عەبدولموتتەلیب پیاوێکی بالابەرزی کەتەی ڕوخسار جوان بوو، کە ئەبرەهە ڕێزی لێگرت و لە سەرجێگاکەی خۆی دابەزی لەگەڵی دانیشت عەبدولموتتەلیب پێی ووت: ماڵێکی زۆرم لاتان گیراوەو داوا دەکەم بیگێڕنەوە بۆم، ئەبرەهە وتی: کە چاوم پێت کەوت سەرسام بووم پێت، بەڵام لە بەر چاوم کەوتی، وتی: لە بەر چی؟ وتی: من

---

١ـ البخاري كتاب الشروط(٥/٢٨٨ رقمة ٢٧٣١).

هاتووم بۆ ڕوخاندنی ماڵێك، کە ئاینی خۆت وباپیرانتە، باسی ئەوەم لەگەڵ ناکەیت، باسی دوو سەد وشترم لەگەڵ دەکەیت، وتی: من خاوەنی وشترەکانم و ئەو ماڵەش خاوەنی خۆی هەیە پارێزگاری لێبکات، وتی: هەرگیز ناتوانی دەست بهێنێتە ڕێگام، وتی: باشە ئەوەتۆ و ئەوە کەعبە، وتی: وشترەکانی بۆ بگێڕنەو، عەبدولموتتەلیب گەڕایەوەو قورەیشی ئاگادار کردەوە لە بەسەرهاتەکە، داواشی لێکردن بڵاوە بکەن بە چیاکاندا، ئەبرەهەش تەواو ئامادەبوو بۆ ئەنجامدانی ڕوخانی ماڵی خوا، بەڵام فیلەکان دەهاتن بە چۆکدا و تواناى ڕێکردنیان نەدەما، هەرچەندە بە پاچ لێیان دا هەر نەجوڵایەوە، کە بەرەو یەمەن دەکرایەوە گورج دەکەوتە ڕێ، ڕویان دەکردە حەرەم لە شوێن خۆی ڕادەوەستا، فیلەکە بەرەو شاخێك ڕۆیشت و خوای گەورە باڵداری زۆری لە دەریاوە نارد بە شێوەی ڕیشۆڵە، هەموو باڵدارێك سێ بەردی پێبوو، دوو بەرد لە پێکانی و یەکێك لە دەنوکی، کە بەقەد نۆك و نیسك دەبوون، ئەو بەردانە لە هەرکەسێکی بدایە دەیکوشت، سوپاکەش هەموویان بەریان نەکەوت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴿٥﴾﴾(الفيل) خوای گەورە بەڵایەکیشی نارد بۆ لاشەی ئەبرەهە، ئیتر بە تێکشکاوی گەڕانەوەو هەر لێیان دەکەوت، ئەبرەهەش پەنجەکانی بە دوای یەکدا دەوەرین، کاتێك گەیشتەوە یەمەن، وەکو بەچکە چۆلەکەی بەسەر هاتبوو، پاش ماوەیەك مرد.[1]

ئیبنو ئیسحاق رحمه الله دەگێڕێتەوە، وەکو ئیبنو هیشام لێوەی دەگێڕێتەوە عەبدولموتتەلیب کردی بە قوڵفی دەرگای کەعبەدا، کە سانێکیش لە قورەیش لەگەڵیدا لە خوا دەپاڕانەوە داوای سەرکەوتنیان دەکردە سەر ئەبرەهە و سەربازەکانیدا، عەبدولموتتەلیب دەیووت:

لاهم انّ العبد يمنع رحله فـــــامنع حلالـــــك

١ـ السيرة النبوية لأبي حاتم البستي(ل/ ٢٤ـ ٢٩) بڕوانە: السيرة النبوية إبن كثير(١/ ٣٠ـ ٣٧).

لا يغلـــبن صـــليبهم ومحـالهم غـدراً محالـك

إن كنــت تــاركهم وقبــ لتنـا فـامر مـا بـدا لـك

ئینجا دەستی بەردا لە قوفڵەکەی و لەگەڵ خزمەکانیدا دەرچوون بۆ چیاکان، لەوێشەوە سەیریان دەکرد، ئەبرەهە چی دەکات لە کەعبە، ئینجا باسی لە ناوچوونی ئەبرەهەو سوپاکەی کرد.[١]

## چەند پەندو سوودێك لە ڕووداوی فیل:

١ـ دەرکەوتنی مەزنیی کەعبە، یەکەمین ماڵی خوا، کە بتپەرستانی عەرەب مەزن ڕایاندەگرت، بەپیرۆزیان دەزانی و هیچیان پێشی نەدەخست، ئەم پلەو پایەش دەگەڕێتەوە بۆ پاشماوەی ئاینی ئیبراهیم و إسماعیل عليهما السلام.

٢ـ چاوتێبڕینی گەورەکان و کینەیان دژ بەمەککە و عەرەبەکان، کە ئەو ماڵەیان مەزن ڕادەگرت، بۆیە ئەبرەهە ویستی ئەوان دوورخاتەوە لەو کارەو کڵێسای قوللەیسی دروست کرد، ئەو سەرەڕای بەکارهێنانی شێوازی شیرین کردن و ترساندن، بەڵام عەرەبەکان هەر ملیان نەدا، بەڵکو کارگەیشتە ئەوەی، کە یەکێك لە بیابانشینەکان پیسی بکاتە ناو ئەو کڵێسایە، ڕازی رحمه الله دەربارەی ئایەتی: ﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ﴾ فەرموویەتی:﴿کید﴾ ویستی زیان گەیاندنە بەکەسانی تر، بە شێوەیەکی شاراوە، ئەگەر بوترێت: بۆچی ناوی بە﴿کید﴾ بردووە لەکاتێکدا ئەوە کارێکی ئاشکرا بوو، ئەگەر ئەو بەڕاشکاوی دەیویست کەعبە بڕوخێنێ لێین: بەڵێ، ئەو خراپەی لە دڵا ساردبویەوەو چاوی بڕیبوویە عەرەب لە دڵی خۆیدا، هەروەها دەیویست بێبەشیان بکات لە پلەوپایەی کە هەیان بوو بە بۆنەی کەعبەوەو، بۆخۆی و وڵاتەکەی ڕاییکشێت.[٢]

٣ـ خۆبەخت کردن لە پێناو شتە پیرۆزەکاندا: یەکێك لە پادشاکانی حیمیەر هەڵسا لە دژ ئەبرەهەو بەدیلی گیرا، ئینجا نوفەیلی کوڕی حەبیبی خەسعەمی و ئەوانەی لەگەڵی کۆبوونەوە لە هۆزەکانی یەمەن، شەڕیان کرد لەگەڵ ئەبرەهە،

---

١ـ السيرة النبوية ، إبن هشام مع شرح أبي ذر الخشني(١/ ٨٤ـ ٩١).

٢ـ بڕوانە: تفسيرالرازي(٢٤ـ ٩٤).

بەڵام شکستیان هێنا بەرامبەر سوپای گەورەی ئەبرەهە، خوێنی خۆیشیان ڕشت لە پێناو پیرۆزەکانیاندا.

بەرگریکردن لە شتی پیرۆز و قوربانی دان لە پێناویدا کارێکی فترییە لە ناخی مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە.

٤ـ ناپاکان ڕیسوا دەبن: ئەو بەکرێگرتانەی هاوکارییان دەکرد لە گەڵ ئەبرەهە، بوونە چاوساغ و سیخوڕ بۆی، ڕێگەیان پێ پیشان دەدا بۆ ماڵی خوا بۆ ئەوەی بیڕوخێنێ، لە دونیاو ڕۆژی دواییدا نەفرینیان لێکراوە، خوای گەورەو خەڵکیش لەعنەتیان لێدەکەن، گۆڕی ئەبو ڕوغالیش بوو بە هێمای ناپاکی و ئەڵقە لە گوێ کردن، ئەو کەسە بوو بەکەسێکی قێزەون لە دڵی خەڵکیدا، هەر کەسێکیش بەلای گۆڕەکەیدا تێدەپەڕی بەردبارانی دەکرد.

٥ـ ڕاستی جەنگی نێوان خواو دوژمنانی: عەبدولموتتەلیب وتی: ئەوە تۆو ئەوە ماڵی خوا، ئێمە توانای بەرگریمان نیە، ڕوونکردنەوەیەکی ورد بۆ ڕاستی ئەو جەنگەی لە نێوان خواو دوژمنەکانی بەرپایە، هەرچەند بێت هێزی دوژمن، بۆماوەی چرکەیەك ناتواتن خۆیان ڕاگرن بەرامبەر تواناو خەشمی خوا، خوای گەورە خۆی خاوەنی ژیانەو هەر خۆیشی وەریدەگێڕێتەوە، هەرکاتێك بیەوێت.[1]

قاسمیؒ دەڵێت: قاشانیؒ ووتویەتی: بەسەرهاتی (أصحاب الفيل) بەناوبانگە، ڕووداوەکەش نزیك بووە لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ، یەکێکیشە لە نیشانەکانی توانای خوای گەورە، شوێنەوارێکیشە بۆ تورەبوونی خوا لە ئەوانەی کە ملهوڕی دەکەن و هەڵدەکوتنە سەر قەدغەکراوەکانی.

٦ـ مەزنڕاگرتنی خەڵکی بۆ ماڵی خوا و دانیشتوانی حەرەم: مەزن ڕاگرتنی عەرەب زیادی کرد بۆ ماڵی خوای گەورە، کە پاراستنی کەعبەی خستە سەر ئەستۆی خۆی،[2] ئینجا عەرەب قوڕەیشیان بەهەمان شێوە بە مەزن دەزانی و دەیانوت: ئەوانە ئەهلی خوان، خوای گەورە لە جیاتی ئەوان شەڕیکردو دوژمنیانی

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية إبن فارس(١١٢)

٢ـ بڕوانە: محاسن التأويل للقاسمي(٢٦٢/١٧)

سەرکوت کردەوە، ئەوەش بەڵگەیەك بوو لە بەڵگەکانی خوا، پێشەکیەکیش بوو بۆ هـاتنی پێغەمبـەرێك لەمەککـە، کەعبـە لـە بتـەکان پـاك دەکاتـەوە، پلەوپایـە بەرزەیەکەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە.[1]

٧ـ بەسەرهاتی فیل بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی: هەندێ لە زانایـان بەلایانـەوە وایـە، کـە ئـەم بەسـەرهاتە لـە بەڵگـەکانی پێغەمبـەراتی یـە، لەوانـە: ماوەردیرحمه الله، کە دەڵێت: بەڵگەکانی پێغەمبەرایـەتی تیـادا ئاشـکرا سـەرەتایەکانی شـایەتی دەدەن بـۆ درەئەنجامـەکانی، ئـیتر ڕاسـت ودرۆی تیـا تێکـەڵ نابێـت، چەندیش بەهێزبێت و بڵاوبێتەوە ئەوەندە دەبێت مژدەوئاگادارکردنەوەکانی، کاتێك لە دایك بوونی پێغەمبەری نازادار نزیك بوویەوە، بەڵگەکانی وەکو گـوڵاو بـە هـەموو لایەکـدا بـڵاو بوویـەوە، لـە هەمووشـیان دیـارترو شـکۆ دارتـر بەسـەرهاتی(أصـحاب الفيـل)ە تـاکو دەڵێـت: نیـشانەی پێغەمبـەریش لـەو بەسـەر هاتەوەیـە، کـە لـەو سەردەمە پێغەمبەری خوا لە سکی دایکیدا بوو لە مەککە، چـونکە لـە دایـك بـوونی پـیرۆزی لـە پـاش پـەنجا ڕۆژ بـوو لـەو ڕوداوە لـە پـاش مردنـی بـاوکی لـە ڕۆژی دووشەممە (١٢) ربيع الأول، بۆیە نیشانەیەك بوو لە دوو ڕووەوە:

یەکەم: ئەگەر ئەوان سەرکەوتبان، ئافرەتیان بەکۆیلە دەبرد، بۆیە خوای گەورە لە ناوی بردن، وەکو پارێزگاریەك بۆ پێغەمبەرەکەی،کە هێشتا لەسکی دایکدا بوو.

دووەم: قورەیش خـوا پەرسـتێکیان نـەبوو بـە بۆنەیـەوە خـوا قوتاریـان بکـات، ئـەهلی کتـابیش نـەبوون، چـونکە ئـەوان یـان بتپەرسـت بـوون، یـان زنـدیق و بێباوەڕبوون، بەڵام لە بەر ئەوەی ویستی خوا لەسەر هەڵدانی ئیسلام دامەزرانـدنی پێغەمبەرایەتی و مەزن ڕاگرتنی کەعبەبوو، کاتێکیش لە ناو عەرەبـدا بـڵاو بوویـەوە خوای گەورە چی بەسەر سوپایی فیلدا هێناوە، حەرەم ئەوەندەی تر شکۆدارتر بوو لەدڵەکاندا و خەڵکی گوێڕایەڵییان زیادی کـرد بـۆ هـۆزی قـورەیش و وتیـان: ئەوانـە خـەڵکی خـوان و دوژمنـەکانی لـە کۆڵکردونەتـەوە، قورەیـشیش هەڵدەسـتا بـە دروستکردنی خواردن بۆ حاجیانی ماڵی خواو ئـاو پێدانیان لـە ڕۆژانـی مینـا، بۆیـە

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن فارس(١١٢)

ئـەوان بوونـە پێـشەواو سـەرکردە،(أصـحاب الفيـل)یـش بـووە پـەنـدێکی هەمیـشە باسکراو.[١]

إبن تیمیةﷺ دەفەرمووێت: ئەو ڕوداوە لە ساڵی لە دایکبوونی پێغەمبـەرﷺبوو، دراوسێکانی ماڵی خوا بتپەرست بوون ئاینی نەصرانیەکان لـە ئـەوان چاکتر بـوون، بۆیە دەرکەوت، کە ئەو نیشانە بۆ دراوسێکانی ماڵی خوا نەبوو، بەڵکو لەبەر خودی ئەو ماڵە بوو، یان لەبەر پێغەمبەرﷺ، کە لەو ساڵەدا لە پاڵ ماڵی خوا لە دایك بوو، یـان لەبـەر هـەردوو هۆکارەکـە هەرچـۆنێکیش بێـت بەڵگەیەکـە لـە بەڵگـەکانی پێغەمبەرایەتی.[٢]

إبن کثیرﷺ دەربارەی بەسەرهاتی فیل دەڵێت: ئەو ڕوداوە وەکو پێشەکی یـەك بوو بۆ پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ، چونکە لە ئەو ساڵەدا لە دایك بـووە، لـە سـەر پەسەندترین بۆچونەکان، وەکو چۆن خوای گەورە پێی وتن: ئـەی هـۆزی قـورەیش خوای گەورە ئێوەی سەرنەخستە سەر حەبەشەکان لەبەر ئەوەی ئێوە باشترن لـە ئەوان، بەڵکو لە بەر پاراستنی ماڵەکەی، لە پلەو پایەی بەرز دەکاتـەوە بـە ناردنی پێغەمبەری نەخوێندەوار موحەممەدﷺ، کە دوا پێغەمبەرﷺ.[٣]

٨ـ پارێزگاری خوای گەورە لە ماڵەکەی خۆی: خوای گەورە بواری نەدایە ئەهلی کیتاب(ئەبرەهەو سوپاکەی)، کە ماڵەکەی بڕوخێنن، یان ئـەو خاکـە پـیرۆزە داگـیر بکەن، لـە کاتێکـدا کـە بتپەرسـتی گـڵاوی کردبوو، بـۆ ئـەوەی ئـەو ماڵـە هەمیـشە پارێزراو بێت لە پیلانی پیلان گێڕەکان و بە ئازادی بمێنێت تاکو بیروباوەڕی تازەی لێدەڕوێت، بۆئەوەی هیچ ستەمکارێکیشی تیـادا باڵادەسـت نـەبێت بەسـەر ئـایین و بەندەکانی خوای گەورە، ئەمەش بەرێوەبردنێك بوو بۆ ماڵی خواو ئاینەکەی، پـێش ئەوەی کەس بزانێت، پێغەمبەری ئەم ئوممەتە لەم ساڵە لەدایك بووە.[٤]

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي(٩٢).

٢ـ بڕوانە: اعلام النبوة للماوردي(٨٥ـ ١٨٩)

٣ـ بڕوانە: تفسير إبن كثير(٤/٥٤٨ـ ٥٤٩)

٤ـ بڕوانە: السيرة النبوية إبن فارس(١١٢)

ئێمەش ئەمڕۆ لەم سەردەمەدا دڵخۆش دەبین بە ئەم ئامازەیە، کاتێك کە ئاگادار دەبین لەو تەماعە چەپەڵانەی ئەمڕۆ لە لایەن خاچپەرستان و جوولەکانی جیهانەوە لە دەوری ئەو شوێنە پیرۆزانەدا هەیە وکاریش دەکەن بۆ ئەو ویست و نیازە خراپەیان، خوای گەورەش لەهەموو سەردەمێکدا ماڵی خۆی دەپارێزێت و شاری پێغەمبەرەکەشی بە هەمان شێوە پارێزگاری دەکات.[١]

٩ـ ئەم ڕووداوە بوو بە مێژوویەك بۆ عەرەب: لە بەرگەورەیی ئەو ڕووداوەی ڕوویدا لەو ساڵەدا عەرەب ئەوەی کرد بە مێژوو، دەیان ووت: فڵانە ڕووداو لە ساڵی فیل ڕوویدا، یان فڵانە کەس لە ساڵی فیل دا لە دایکبوو، یان ئەوەی لە پاش ئەو ساڵەدا ڕووی دا بە ئەوەندە ساڵ، ساڵی ڕوداوی فیل لە(٥٧٠)ی زاینی بوو.[٢]

---

١ـ في ظلال القرآن(٦/ ٢٩٨٠)

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية للندوي(٨٢)

## باسی پێنجەم: لە لە دایکبوونەوە تاکو( حلف الفضول )

### یەکەم: ڕەچەڵەکی پێغەمبەرﷺ:

پێغەمبەری خواﷺ خاوەنی بەرزترین ڕەچەڵەك و جوانترین ڕوخسار وئاکارە، دەربارەی گرنگی ڕەچەڵەکی هەندێ فەرموودەی صەحیح هاتووە، لەوانە: ئەو فەرموودەی، کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خواوەﷺ، کە دەفەرموێت: ((إن الله اصطفى كنانة من ولد اسماعيل، واصطفى قريشاً من كنانة، واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم))[1] پێشەوا بوخاری باسی ڕەچەڵکی پێغەمبەرﷺ دەکات ودەفەرموێت: موحەممەدی کوڕی عەبدوللای، کوڕی عەبدولموتتەلیب، کوڕی هیشام، کوڕی عەبدومەناف، کوڕی قوصەی، کوڕی کیلاب، کوڕی موڕڕە، کوڕی کەعب، کوڕی لوئەی، کوڕی غالیب، کوڕی فیهر، کوڕی مالیك، کوڕی نەزر، کوڕی کینانە، کوڕی حوزەیفە، کوڕی مودریکە، کوڕی ئیلیاس، کوڕی موزەر، کوڕی نیزار، کوڕی مەعەد، کوڕی عەدنان.[2]

هەروەها بەغەوی لە لێکدانەوەی کتێبی(السنة) لە باسی عەدنان دەڵێت: ئەوەی، کە باسکراوە پاش عەدنان جێگیر نەبووە.[3]

ئیبنولقەییم دەفەرموێت: دوای ئەوەی، کە باسی ڕەچەڵەکی عەدنان دەکات: تائێرە تەواوە بەدڵنیایی، ڕەچەڵەکناسان پێکهاتوونە لە سەری و هیچ ناکۆکیەکیشی لە سەر نیە، بەڵام لە دوای عەدنان ناکۆکی لە سەرە، لە سەر ئەوەش پێکهاتوون، کە عەدنان لە نەوەی ئیسماعیلە عليه السلام.[4]

لە عوروەی کوڕی زوبەیریشەوە هاتووە، کە فەرموویەتی: عەدنان نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە بەکۆی ڕا، بەڵام جیاوازی لە نێوان عەدنان و ئیسماعیل دروست بووە.[5]

---

١ـ رواه مسلم، باب فضل نسب النبي ﷺ (١٧٨٢/٤ ژمارە ٢٢٧٦).

٢ـ البخاري، كتاب مناقب الأنصار، باب مبعث النبي.

٣ـ شرح السنة(١٢/ ١٩٢)

٤ـ إبن سعد(٨٥/١).

٥ـ السيرة النبوية للذهبي(ل ٩٦)

((بەرزی ڕەچەڵك هەردەم پلەوپایەی خۆی هەبووەو ـ هەیەتی ـ لە دڵەکاندا، چونکە خاوەنی ڕەچەڵەکی بەرز نکۆڵی لێناکرێت، کە لە پێشەوە بێت، ئیتر پێغەمبەرایەتی بێت یان پادشایی، بەڵام نکۆڵی دەکرێت لە سەر کەسی ڕەچەڵەك نەناسراو، زۆر کەس پێیان ناخۆشە بچنە ژێر ئاڵایەوە، بۆیە لە بەر ئەوەی موحەممەدﷺ بۆ پێغەمبەرایەتی ئامادەکرا، خوای گەورە ڕەچەڵەکی مەزنی بۆ ئامادەکرد، بۆ ئەوەی یارمەتی ئەوەبدات خەڵکی لە دەور کۆکاتەوە))[1]

سەرچاوەی پێغەمبەرﷺ سەرچاوەیەکی پاکوبەهایە، چونکە لە نەوەی ئیسماعیل و ئیبراهیمە، وەڵامدانەوەیەکیشە بۆ نزای ئیبراهیم و مژدەی عیسای﷩، هەروەکو خۆی فەرموویەتی: من نزای پاڕانەوەی ـ ئیبراهیمی باوکم و مژدەی عیسام.[2]

سەرچاوەی پاك وڕەچەڵەکی بەرز خاوەنەکەی بەرز دەکاتەوە و دووری دەخاتەوە لە هەموو کارێکی نزم، پێغەمبەران و بانگخوازان مەبەستیان بووە، کە پاراوی ڕەچەڵەکیان دەربخەن و بەوەش لە لای خەڵکی بناسرێن، بۆ ئەوەی بناسرێن و ستایش بکرێن[3]، بەم شێوەش بۆمان دەرکەوت لە ڕێگەی ڕەچەڵەکی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ، کە خوای گەورە عەرەبی جیا کردۆتەوە لە هەموو خەڵکانی تر، فەزڵی قورەیشیشی داوەتە سەر هەموو هۆزەکانی تردا، خۆشەویستی پێغەمبەریش ئەوە ئەسەپێنێ، کە ئەو نەتەوەیەشمان خۆشبوێت، کە تیایاندا پەروەردەبووە، نەوەك لە ڕووی تاکە ڕەگەزەوە، بەڵکو لە پێناو ڕاستی پەتی، چونکە عەرەب و قورەیشیش شەرەفمەند بوون بە هەڵکەوتنی پێغەمبەرﷺ لە ناویاندا، ئەم ڕاستیەش ناکۆك نیە لە گەڵ لادانی ئەو عەرەبانە، یان ئەو قورەیشیانە لە ڕێگایی ڕاستی خوای پەروەردگار و ئاستی خۆیانیان داگرت بۆ خوارەوەی ئەو ئاستە ڕێزدارەی خوای گەورە دەستنیشانی کردووە بۆ بەندەکانی.

---

١ـ بڕوانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسول محمدﷺ(ل ٩٦)

٢ـ بڕوانە: الحاكم (٢/٦٠٠)، و صححه الحاكم و الذهبي.

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية إبن فارس(ل ١٠٢).

## دووەم: هاوسەر گیری عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتتەلیب و ئامینەی کچی وەهـب و خەو بینینی ئامینەی دایکی پێغەمبەرﷺ:

عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتتەلیب یەکێك بـوو لـە خۆشەویـسترین براکـانی لـە لای باوکی، جا کاتێك قوتاری بوو لە سەر بڕین، باوکی سـەد حوشـتری بـۆی سـەربڕی وەکو قوربانی، پاشان هاوسەرێکی بۆ هێنا لە شکۆدارترین خێزانەکانی مەککـە، کـە ئەویش ئامینەی کچی وەهبـی کـوڕی عەبدومـەنافی کـوڕی زوهـرەی کـوڕی کـیلاب بوو.[1]

پـاش ماوەیـەکی کـەم عەبـدوڵڵا وەفـاتی کـرد و هێـشتا پێغەمبـەرﷺ لـە سـکی دایکیدا بوو، هەر لە مەدینەش نێژرا لە لای بەنی عەدی کـوڕی نـەججار لـە مەدینـە، چونکە ئەو چوو بوو بۆ بازرگانی لە شام، ئیتر لە گەڕانەوەدا لەلای مەدینـە، گیـانی لە دەستداو، ئەم زاتە پیرۆزەی لە پاش خۆی بـە جێهێـشت، وەکـو چۆن قـەدەری خوای گەورە بە دانایی و بە زەیی و پەروەردەکردن و ئامادەکردنی خـۆی دەیکاتـە هۆکارێك بۆ دەرکردنی مرۆڤایەتی لە تاریکییەوە بۆ روناکی.

هاوسەرگیری عەبدوڵڵا و ئامینە سەرەتای مەسەلەی پێغەمبەرﷺنەبوو، بە پێغەمبەرﷺ وترا چۆن بوو مەسەلەی پێغەمبەرایەتیەکەت[2]، فەرمووی: ((دعوة ابي إبراهيم، وبشرى عيسى، و رأت أمي أنه يخرج منها نور أضاءت منه قصور الشام))[3] واتە: نزای ئیبراهیمی باوکم و مژدەدانی عیساو، دایکیشم خەونێکی بینی، کە ڕۆشنایەکی لێ دێتەدەرەوە تەلارەکانی شامی پێ روناك دەبێتەوە، مەبەست لە نزای ئیبراهیم ئەوەیە، کە لەم ئایەتە دا هاتووە: ﴿رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾(البقرة: ٦)

---

١ـ بڕوانە: وقفات تربوية مع السيرة أحمد فريد(ل ٤٦)

٢ـ هەمان سەرچاوە(ل ٤٦)

٣ـ رواه أحمد (٥/ ٢٦٢ ورقمه ٢٢٢٦)، وقال محققوا طبعة مؤسسة الرسالة: صحيح لغيره، الحاكم (٢/ ٦٠٠) وقال الحاكم: صحيح الإسناد، ولم يخرجاه، و وافقه الذهبي، مجمع الزوائد(٨/ ٢٢٢)، واقال إسناد أحمد حسن، وله شواهد تقويه.

مژدەدانی عیساش لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ﴾(الصف: ٦).

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، کە باسی خەونەکەی دایکی دەکات، ئیبنو ڕەجەبی حەمبەلی دەفەرموێت:دەرچوونی ئەو ڕۆشناییە لە کاتی لە دایکبوونیدا ئاماژەیە بۆ ئەو ڕۆشناییەی هێنای بۆ سەر زەوی ڕێنموێنی خەڵکی کرد و تاریکی بتپەرستی پێ لابرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَـٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَـٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (المائدة: ١٥_ ١٦). (ابن كثير) دەفەرموێت: تایبەت کردنی شام بە دەرکەوتنی ئەو ڕۆشناییە، ئاماژەیەکە بۆ جێگیر بوونی ئاینەکەی و بەرقەراربوونی ئاینەکەی لە وڵاتی شام، بۆیە شام لە کۆتایی دونیا دا دەبێتە قەڵای ئیسلام و موسڵمانان، هەر لە وێش لە دیمەشق عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت، لە منارە سپییەکەی لای ڕۆژهەڵات، بۆیە لەهەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە: ((لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق، لا يضرهم من خذلهم، ولا من خالفهم حتى يأتي أمر الله وهم كذلك)) لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە(وهم بالشام).[١]

واتە: دەستەیەك هەیە لە ئومەتی من هەر لەسەر هەق دەمێننەوە، هەر کەسێك جیاوازیان لەگەڵ بکات، یان پشتیان بەربدات زیانیان پێ ناگەیەنێت تاکو فەرمانی خوا دێت و ئەوان هەر لە سەر ئەو حاڵەن لە بوخاریدا هاتووە، کە ئەو کەسانە لە شامن.

---

١_ بڕوانە: تفسير إبن كثير(١/ ١٨٤) رواه البخاري، كتاب المناقب باب "٢٨" ٢٦٤١.

## سێ یەم: لە دایك بوونی خۆشەویستمان موحەممەدﷺ:

پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی دوو شەمە لە دایکبووە بە یەکدەنگی هەموو ئەوانەی ژیاننامەیان نووسیوە، زۆر بەشیان لە سەر ئەوەن، لە ١٢ی ربیع الأول دابووە.[١]

هەروەها یەکدەنگی هەیە لە سەر ئەوەی لەساڵی بەسەرهاتی فیل[٢] دا لە دایك بووە، لە ماڵی ئەبو تالیبی مامی لە (شعب بني هاشم)[٣].

ئەحمەد شەوقی بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەرﷺ دەڵێت:

ولـد الهـدى فالكائنـات ضـياء ... وفـم الزمـان تبـسم وثنـاء
والـروح والمـلأ الملائـك حولـه ... للـدين والـدينا بـه بـشراء
والعرش يزهـو والحضيرة تزدهي ... والمنتهـى والـسدرة العـصماء
بـك بـشرالله الـسماء فزيّنـت ... و تضوعت مسكاً بك الغبراء

ذعرت عروش الظالمين فزلزت ... وعلـت على تيجـانهم أصداء
والنـار خاويـة الجوانـب حـولهم ... خدمت ذوائبها وغاض الماء
والآي تـترى والخـوارق جمّـة ... جبريـل روّاح بهـا غـدّاء[٤]

هەروەها شاعیری لیبی مامۆستا موحەممەد بەشیر موغەیربی لە یادی دایکبوونی پێغەمبەرﷺ ئەم هۆنراوەی نوسیووە لە ساڵی ١٩٤٧ لە ڕۆژنامەی (الوطن)، کە لە بە نغازی دەردەچێت:

بلـغ الزمـان مـن الحيـاة عتيّـاً ... لكـن يومـاً لا يـزال فتيّـاً
يمـشي علـى الأحقـاب مـشي فـاتح ... في موكـب جعـل الـسنين مطيّا

---

١ـ بروانە: صحيح السيرة النبوية، إبراهيم العلي(ل ٤٧).
٢ـ بروانە: السيرة النبوية، إبن كثير(١/ ٢٠٣)
٣- بروانە: وقفات تربوية مع السيرة النبوية(ل ١٤٧)
٤ـ بروانە: ديوان أحمد شوقى(١/ ٢٤، ٢٥).

تخـذت لـه الأعـوام فى أيّامهـا / عرشـاً فأصـبح تاجهـا الابـديّاً
ومضت بـه الأجيـال خطـوات مـن / بلـغ الرشـاد وكـان قبـل صـبيّا
أعظـم بيـوم جـاء يحمـل لرحمـة / للعـالمين وعـزة ورقيّـا
ولـدت بـة للكائنـات حقيقـة / أضـحى بهـا سـر الحيـاة جليّـا
وأنار فى الأولى الطريق إلى الورى / ليـسير للاخـرى الأنـام تقيّـاً
كـادت بـه الـدنيا تقـول لشمسها / عـنى فقـد رجـع الـضياء إليّـا

هەروەها لە(نادي طرابلس الغرب) لە قاهیرە لـە سـاڵی ١٩٤٩ ئەمـەی خـوارەوەی خوێندۆتەوە:

مـالي ومـابي مـن شمـول / أشـدو علـى رغـم العـذول
إنـى أطـالع فى الـسماء / كأنهـا سـفر جليـل
وأرى النجـوم تمثلـت / لـي كالملائـك فى مثـول
والبـدر خلـت شـعاعه / وحـي الرسـالة فى نـزول
وإذا بـصوت مـن ضـمير / الكـون مبتهجـاً يقـول
فى مثـل هـذي الليلـة / الغـرّاء قـد ولـد الرسـول
واشـعّ نـور محمـد / فـوق الرّوابـي والـسّهول
مـلأ الزمـان وكـان قبـل / يهـيم فى ليـل طويـل

## چوارەم: شیردەرەکانی پێغەمبەرﷺ:

دایەنی پێغەمبەرﷺ ئوممو ئەیمەن بەرەکەی حەبەشی بوو،کەنیزەکی باوکیبوو, یەکەمین کەسیش کە شیری پێدا سوەیبە بوو کە کەنیزەکی ئەبو لەهەبی مامی بوو.[1]

---

١- بڕوانە: وقفات تربوية مع السيرة النبوية(ل ٤٨)

لە فەرموودەی زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەوە هاتووە، کە ئوممو حەبیبەرضي الله عنها وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوشکەکەم مارە بکە، ئەویش فەرمووی: ئایا پێت خۆشە؟ وتم بەڵێ من واز لە تۆ ناهێنم، چاکترین کەسیش حەز بکەم بەشدارم بێت خوشکمە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە بۆ من ڕەوا نییە، وتم: ئەی ئێمە دەبیسین، کە دەتەوێ کچی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی ئەبو سەلەمە؟ ووتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر پەروەردەی باوەشی خۆم نەبوایە ڕەوانە نەدەبوو بۆم، ئەوە برازای شیریمە، چونکە سوەیبە شیری من و ئەبو سەلەمەی داوە، ئیتر ئێوەش کچەکان و خوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆم.[١]

ئوممو ئەیمەنیش، کە دایکی ئوسامەی کوڕی زەید بووە، کەنیزەکی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتتەلیب یش بووە، ئافرەتێکی حەبەشی بوو، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ گەورەبوو ئیتر ئازادی کرد، ئینجا مارەی بڕی لە زەیدی کوڕی حاریسە، بە پێنج مانگ لە پاش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ ئەویش وەفاتی کرد.[٢]

حەلیمەی سەعدیە، شیردەری پێغەمبەرﷺ بوو لە هۆزی بەنی سەعد، ئەم حەلیمەیە بە سەرهاتێکی سەیرمان بۆ دەگێڕێتەوە دەربارەی بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ، کە بە چاوی خۆی بینی لە ماڵ ومناڵیدا.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرﷺ فەرمووی: کاتێك پێغەمبەرﷺلە دایك بوو، حەلیمەو چەند ئافرەتێك لە هۆزی سەعدی کوڕی بەکرەوە هاتن بۆ مەککە، بەدوای منداڵدا دەگەڕان، کە شیریان بدەن، حەلیمە دەڵێت: منیش لەسەرەتای ئەو ئافرەتانەوە بە سواری گوێدرێژ هاتم لە گەڵ حاریسی کوڕی عەبدولعوززای مێردم، قاچەکانی گوێدرێژکەمان خوێناوی بوو بوو، لە کاروانەکە وشترە پیرێکشیمان لەگەڵدا بوو، سوێند بەخوا دڵۆپەیە شیری نەدەدا، ئەوساڵەش ساڵێکی وشك و گرانی بوو، خەڵکی دووچاری برسێتی بوون و تەواو ماندوو بوون، مناڵێکی خۆیشم

---

١ـ البخاري، كتاب النكاح، باب: ((و أمهاتكم التي أرضعنكم)) رقم (٥١٠١).

٢ـ مسلم كتاب الجهاد، باب رد المهاجرين إلى الأنصار، رقم(١٧٧١).

لە فەرموودەی زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەوە هاتووە، کە ئوممو حەبیبەرضي الله عنها وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوشکەکەم مارە بکە، ئەویش فەرمووی: ئایا پێت خۆشە؟ وتم بەڵێ من واز لە تۆ ناهێنم، چاکترین کەسیش حەز بکەم بەشدارم بێت خوشکمە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە بۆ من ڕەوا نییە، وتم: ئەی ئێمە دەبیستین، کە دەتەوێ کچی ئەبو سەلەمە مارە بکەیت، فەرمووی: کچی ئەبو سەلەمە؟ ووتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر پەروەردەی باوەشی خۆم نەبوایە ڕەوانە نەدەبوو بۆم، ئەوە برازای شیریمە، چونکە سوەیبە شیری من و ئەبو سەلەمەی داوە، ئیتر ئێوەش کچەکان و خوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆم.[1]

ئوممو ئەیمەنیش، کە دایکی ئوسامەی کوڕی زەید بووە، کەنیزەکی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتتەلیب یش بووە، ئافرەتێکی حەبەشی بوو، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ گەورەبوو ئیتر ئازادی کرد، ئینجا مارەی بڕی لە زەیدی کوڕی حاریسە، بە پێنج مانگ لە پاش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەرﷺ ئەویش وەفاتی کرد.[2]

حەلیمەی سەعدیە، شیردەری پێغەمبەرﷺ بوو لە هۆزی بەنی سەعد، ئەم حەلیمەیە بە سەرهاتێکی سەیرمان بۆ دەگێڕێتەوە دەربارەی بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ، کە بە چاوی خۆی بینی لە ماڵ ومناڵیدا.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرضي الله عنه فەرمووی: کاتێك پێغەمبەرﷺ لە دایك بوو، حەلیمەو چەند ئافرەتێك لە هۆزی سەعدی کوڕی بەکرەوە هاتن بۆ مەککە، بەدوای منداڵدا دەگەڕان، کە شیریان بدەن، حەلیمە دەڵێت: منیش لەسەرەتای ئەو ئافرەتانەوە بە سواری گوێدرێژ هاتم لە گەڵ حاریسی کوڕی عەبدولعوززای مێردم، قاچەکانی گوێدرێژکەمان خوێناوی بوو بوو، لە کاروانەکە وشترە پیرێکشیمان لەگەڵدا بوو، سوێند بەخوا دڵۆپەیە شیری نەدەدا، ئەوساڵەش ساڵێکی وشك و گرانی بوو، خەڵکی دووچاری برسێتی بوون و تەواو ماندوو بوون، مناڵێکی خۆیشم

---

١ـ البخاري، كتاب النكاح، باب: ((و أمهاتكم التي أرضعنكم)) رقم (٥١٠١).

٢ـ مسلم كتاب الجهاد، باب رد المهاجرين إلى الأنصار، رقم(١٧٧١).

پێبوو شەوانە نە دەخەوت، منیش هیچم بە دەستەوە نەبوو بیخلافێنم، بەلام ئومێدەواری باران بوین، چونکە هەندێ مەڕمان هەبوو.

کاتێك گەیشتینە مەککە پێغەمبەری خواﷺ پێشنیار کرایە سەر هەموو ئەو ئافرەتانە، بەلام کەسیان وەریان نەگرت، وتمان: منالێکی بێ باوکە، دایەنیش لە لایەن باوکی منالەکەوە بەخشیش وەردەگرێت، وتمان: ئەبێت دایکی، یان مامەی، یان باپیری چیمان بۆ بکەن، هاوڕێکانم هەر یەکەو منالێکیان بە دەست کەوت، بەلام من لەو زیاترم دەست نەکەوت، بۆیە وەرمگرت و لەگەڵ خۆم هێنام، سوێند بەخوا لە بەر ئەوەش هێنام کەسم دەست نەکەوت، بە هاوڕێکەم وت: بە خوا ئەبێت ئەم هەتیوەی عەبدولموتتەلیب بهێنم، بەڵکو خوای گەورە سوودمان پێ بگەیێنێت بە هۆی ئەو منالەو، ناشکەڕێمەوە لەنێو هاوڕێکانمدا بەبێ منال، ئەویش وتی: پێکات.

وتی: هێنام بۆلای بارو تفاقەکان، سوێند بەخوا هەر ئەو ڕۆژە مەمکم پڕ لە شیربوو، تاکو تێرم کرد، لەگەڵ براکەشی، ئینجا مێردەکەم هەڵسا بۆلای وشتر پیرەکەمان بینی گوانی لە شیر پڕبووە، ئەویش دۆشی و لێمان خواردەوە، وتی: ئەی حەلیمە، وا دیارە بەخوا منالێکی موبارەکمان دەست کەوت، خوای گەورە شتێکی پێمان داوە، چاوەڕوانی نەبووین، وتی: ئیتر شەوێکی خۆشمان بەسەر برد بە تێری، پێش ئەوەش بە بۆنەی منالەکەمانەوە شەو نەدەخەوتین.

ڕۆژی دوای ئەوە لەگەڵ هاوڕێکانم گەڕاینەوە، سواری گوێدرێژەکە بووم و منالەکەشم پێبوو، سوێند بەو کەسەی گیانی حەلیمەی بەدەستە، پێشی هەموویانی دایەوە، تەنانەت ئافرەتەکان دەیانوت: چاوەڕوانمان بکەن، ئایا ئەمە هەر ئەو گوێدرێژەیە، کە لە سەری هاتیت؟ وتم: بەڵێ، وتیان: چی بەسەر هاتووە؟ وتم منالێ پیرۆزم لە سەر هەڵگرتووە.

دەڵێت: خوای گەورە هەموو ڕۆژێك تووشی چاکەیەکی دەکردین، تا گەڕاینەوە هەواری خۆمان و وشکە ساڵی بوو، شوانەکانمان مەڕەکانیان دەبردو دەیانگێڕایەوە هەر بە برسێتی، بەلام مەڕەکانی من بە تێری دەگەڕانەوە، گوانیان پڕبوون لە شیر،

ئێمەش شیرمان دەدۆشی و دەمان خواردەوە، خەڵکی دەیانووت: ئەوە چی بەسەر مەڕەکانی حاریسی کوڕی عەبدولعوززا دا هاتووە؟ بۆ چی ئەوان بە تێری دەگەڕێنەوە و ئەوانەی ئێمەش بەبرسێتی، بەڵاتان لێکەوێت بیان بەن بۆ ئەو جێگای مەڕەکانی ئەوان تیایدا دەلەوەڕێن، بەڵام سەرە ڕای ئەوەش مەڕەکانمان هەر بە تێری دەگەڕانەوە.

کاتێك دوو ساڵی پڕکردەوە، گەڕانمانەوە بۆ مەککە، من و باوکی وتمان: بە خوا منالّی وا پێ بە خێرمان نەبینیوە، ئینجا ئێمە دەترسین توشی نەخۆشیەك بێت لە نەخۆشیەکانی مەککە، بۆیە ڕێگەمان بدە بیبەینەوە تاکو چاك دەبێتەوە لە نەخۆشیەکەت، هەر لێنەگەڕاین تا ڕازیمان کرد، ئیتر پێی گەڕاینەوە، سێ چوار مانگێکی پێچوو، ڕۆژێکیان لە پشت ماڵەکەمانەوە یاری دەکرد لەگەڵ براکەی لە نزیك هەندێ لەکار و بەرخەکان، ئەوەندەمان زانی براکەی بە شپرزەیی هات و وتی: دوو پیاوی پۆشاك سپی هاتن و برا قوریشییەکەمیان بردو ناو سکیان هەڵدڕی، ئیتر من و باوکی بەهەڵداوان دەرچووین، بینیمان ڕەنگی گۆڕاوە، کاتێك ئێمەی بینی دەستی کرد بەگریان، وتی: ئێمەش باوەشمان پیا کرد، وتی: دوو پیاو هاتن و ڕایانکشاندم، ئینجا سکیان دڕیم و شتێکیان خستە ناوی، دوایی دەریان کرد وەکو خۆی، باوکی وتی: سوێند بە خوا وا ئەزانم کوڕەکەم تووش بوو، بیگەڕێنەوە بۆ لای کەس و کاری، پێش ئەوەی شتێکی خراپی بەسەر بێت، وتی: ئێمەش هەڵمانگرت و گێڕامانەوە بۆ لای دایکی، کە بینیمانی بە لایەوە سەیر بوو، وتی: ئەوە چۆن گەڕانەوە لە کاتێکدا ئێوە سووربوون لە سەر گلدانەوەی، وتیان: هیچ نیە، بەڵام کاتی شیردانی تەواو بوو، ئێمەش پێمان خۆش بوو بیگەڕێنینەوە، وتی: نە خێر ئێوە شتێکتان شاردووەتەوە، وازینەهێنا تا ئاگادارمان کردەوە، ئینجا وتی: نەخێر هەرگیز خوای گەورە خراپە تووشی کوڕەکەم ناکات، ئەم کوڕەی من پلەو پایەیەکی دەبێت، ئایا ئاگادارتان نەکەمەوە لە مەسەلەکەی، بە ئاسانترین شێوە من بەوکوڕەوە بارداربووم، کاتێکیش هێشتا لە سکمدا بوو، خەونم بینی، کە ڕۆشناییەکم لێوە دەرچوو، تەلارەکانی بوصرای پێ روناك بوویەوە، کاتێکیش، کە

لە دایکبوو سوێند بە خوا وەکو مناڵانی تر لە دایك نەبوو هەر دوو دەستی خستە سەر زەوی، سەریشی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، جا ئێوەلێی گەڕێن، ئینجا لێی وەر گرتنەوەو ئێمەش گەڕاینەوە.[١]

## وانەو پەندەکان:

أ- پیرۆزی پێغەمبەرﷺ لەسەر خاتوو حەلیمە: ئەو پیرۆزییە لە هەموو شتێکدا دەرکەوت، لە زۆر بوونی شیر لە مەمکەکانی، کەپێشتر بەشی مناڵەکەی خۆی نەدەکرد، هەر لەبێ دەنگ بوونی منالەکەی کە پێشتر نەیدەهێشت بخەون و جاڕسی کردبوون، بەڵام بە بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ تێر وبێ دەنگ بوو، هەر وەها پیرۆزەییەکەی دەرکەوت لەوەی، کە ئەو مەڕو ماڵاتانەی هەیان بوو هەمووی شیر زایە ناو گوانەکانیان.

ب - ئەم پیرۆزیانە دیارترین دیاردەکانی بەخشندەیی خوای گەورەبوو لەگەڵ پێغەمبەرەکەی لەو تەمەنەدا، نەکو تەنها بۆ حەلیمەکە شیردەری بوو، ئەویش هیچ سەیر نەبوو، چونکەحیکمەتێکی تێدابوو ئەم خێزانە بەم شێوەیە ئەو منالەیان خۆش بوێت و چاکەی لەگەڵ بکەن، لە پەروەردەکردن و بەخێوکردنیدا، بەڕاستی ئەوان لە منالەکانی خۆیان زیاتر بە بەزەیی بوون بۆی.[٢]

ج - هەڵبژاردنی خوا بۆ بەندەکانی پیرۆزترو چاکترە: خوای گەورە ئەو منالەی هەڵبژارد بۆ حەلیمە، لە ناخیشیدا ڕازی نەبوو بە بردنی، بەڵام کەسی تری دەست نەکەوت، بەڵام هەموو خێروو چاکەیەك لەوەدا بوو، کە خوای گەورە هەڵیبژارد، هەر لە سەرەتایشەوە نیشانەکانی ئەو چاکییە دیاریدا، ئەمەش وانەیەکە بۆ هەموو موسڵمانێك بۆ ئەوەی دڵی بەهەڵبژاردنی خوا ڕازی بێت، پەشیمانیش نەبێت لەو شتەی کە تێپەڕبووەو خوا بەبەشی ئەوی نەکردووە.

---

١- مسند أبي يعلى(١٢/ ٩٢ورقمه: ٧١٦٢) والطبراني في الكبير(٢٤/ ٢١٢، و رقمه: ٥٤٥) وذكره الهيثمي في المجمع(٨/ ٢٢١)، وقال: رواه أبو يعلى، والطبراني بنحوه ورجاله ثقات، ورواه الذهبي(ص٢١)في السيرة النبوية له، وقال: هذا حديث جيد الإسناد، وانظر السيرة النبوية بشرح الخشني(١/ ٢١٤) من طريق إبن إسحاق وقد صرح إبن إسحاق بالسماع في رواية السيرة.

٢- فقه السيرة النبوية للبوطي(ل ٤٤)

د ـ کاریگەری بیابان لە ساغبوونی لاشەو پاراوی دڵ و ژیری مێشك:

شێخ موحەممەدی غەزالی دەفەرموێت: پەروەردەکردنی مناڵ لە بیابان بۆ ئەوەی گرِوگاڵ بکەن لە سروشتدا و ڕابوێرن لەو کەش و هەواو تیشکی سروشتە خۆشە، هۆکارێکیشە بۆ پاك بوونەوەی فیترەت و گەشە کردنی هەست و ئەندامەکان و بەربەست لادان لە بەر دەم بیرو عاتیفە.

بەدبەختی یە منداڵەکانمان لە شوقەیەکی تەنگدا بژین، لە چەند ماڵێکی یەك بە یەکەوە لکاو، وەکو مۆمی داخراو، بێبەشیش بن لە هەناسە هەڵمژینی قووڵ و بای دڵ ڕفێن.

بێگومان ئەم گرژی و بێتاقەتیە، کە لەگەڵ شارستانی نوێ دا هات، یەکێ لە هۆکارەکانی دوورییە لە سرووشت و ڕۆچوون لە زۆر لە خۆکردنە، ئێمەش تێدەگەین بۆ خەڵکی مەککە منداڵەکانیان بۆ بیابانەکان ناردووە بۆی ئەوەی ببێتە گۆرەپانێك بۆ منداڵەکانیان، زۆرێکیش لە زانایانی پەروەردە ئومێدەوارن، کە سروشت ببێتە یەکەمین پەیمانگا بۆ منداڵ، بۆ ئەوەی زانیارییەکانی بگونجێن لەگەڵ ڕاستیەکانی بوونەوەردا، واشدەرکەوت ئەوە خەونێکی گرانە بێتە دی.[1]

پێغەمبەری خواﷺ لە بیابانی بەنی سەعد فێری زمانی عەرەبی پاراوبوو، دواتریش بوو بە زمانپاراوترین کەس، کاتێك ئەبو بەکرؓ پێی فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا کەسم نەبینیوە لە تۆ زمانپاراوتر بێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چی ڕێگام لێدەگرێت وابم، کە من لە قورەیشم، شیریشم لە بەنی سەعد خواردووە.[2]

٢ــ سوودەکانی ڕووداوەکانی لە تکردنی سنگی پێغەمبەرﷺ:

ڕووداوەکانی لە تکردنی سنگی پێغەمبەرﷺ لە سەردەمی منداڵی لە هەواری بەنی سەعد، یەکێك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی دەژمێردرێت.[3]

١ــ فقه السيرة محمدالغزالي(ل ٦٠، ٦١)

٢ــ الروض الأنف للسهيلي(٨٨/١)

٣ــ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي(ل ٤٧)

لەم بارەیەوە ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا لە ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە، کە جیبریل هاتە لای پێغەمبەرﷺ لە کاتی یاریکردنی لەگەڵ منداڵەکان، گرتی و دایبەزەویدا، دڵی لە تکردو دەریکردە دەرێ، ئینجا پارچە گۆشتێکی لێ دەرهێناو، وتی: ئەمە بەشی شەیتان بوو، ئینجا لە لەگەنێکدا دڵی شورد بە ئاوی زەمزەم و کۆی کردەوەو خستیە جێگاکەی خۆی، منداڵەکان شپرزەبوون و چوون بۆ لای حەلیمەی دایەنی، وتیان: موحەممەد کوژرا، دوای ئەوە گەڕایەوە لایان و ڕەنگی گۆڕا بوو، ئەنەس دەفەرموێت: من شوێنەواری دوورینەوەکەی سنگیم دەبینی.[1]

بێگومان لابردنی بەشی شەیتان لە دڵی پێغەمبەرﷺ سەرەتایەکی پێشوەختەبوو بۆ پێغەمبەرایەتی، ئامادەکردنیش بۆ پارێزگاریکردنی لە هەر خراپەیەك و، پەرستنی جگە لەخوا، بۆئەوەی دڵی جگە لە یەکتاپەرستی پەتی هیچی تری تیا نەبێت.

ڕوداوەکانی سەرەتای لاوێتیشی ئامارە دەکات بۆ بەدیهێنانی ئەو ڕاستیانە، چونکە هیچ گوناهێکی ئەنجام نەداوەو هەرگیز کڕنوشی بۆ بتەکان نەبردووە[2]، سەرەڕای تەشەنەکردنی ئەو بتپەرستیە لە نێو قورەیشدا.[3]

دکتۆر (بوطی) باسی حیکمەت دەکات لەو ڕدواوە دەڵێت: وا دەردەکەوێت حیکمەت لەو ڕووداوە ڕاگەیاندنی فەرمانی پێغەمبەرﷺو ئامادەکردنێتی بۆ هەڵە نەکردن و پێشوازیکردنی وەحیی خوا، بە هۆکارگەلێکی هەستپێکراو هەر

---

١ـ مسلم کتاب الإیمان (١/ ٤٥رقم ٢٦١ـ ١٦٢)

٢ـ ڕۆژهەلاتناس نیکلسۆن بانگەشەی ئەوە دەکات، کە فەرموودەی لەتکردنی سنگی پێغەمبەرﷺ ئەفسانەی دروستبوونی بە بۆنەی ئەم ئایەتەوە بوو: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾ ئینجا دەڵێت: ئەگەر ئەو ڕووداوە هیچ بنەمایەکی هەبوایە پێویستی دەکرد مەزەندەی ئەوە بکەی، کە ئەوە ئامارەیە بۆ جۆرێك لە پەرکەم، ئەم پەلکوتانە نیکلسۆنی تێکەوتووە، بەهەمان شێوە بەسەر بتپەرستانی قورەیشیشدا هاتووە، کاتێك پێغەمبەرﷺیان بە شێتی تۆمەتبار دەکرد، خوای گەورەش ئەوەی بەر پەرچ داوەتەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا صَاحِبُكُمْ بِمَجْنُونٍ﴾

٣ـ بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة للعمري(١/١٠٤).

لەسەردەمی منالییەوە، بۆ ئەوەی ئەوە ببێتە پەیامەکەی، کەواتە ئەوە پاککردنەوێکی واتایی یە، بەلام بەم شێوازە کردەییە ئەنجامدرا[١]، دەرکردنی ئەو پارچە گۆشتە پاککردنەوەیەك بوو بۆ پێغەمبەری خوا لە ئەو حاڵەتە منالانە، کە لەو سەر دەمەدا لە گەڵ مندالدا دەبێت، وەکو گاڵتەو گەپ وشتی پڕوپوچ، بۆ ئەوەی لە جێگایی ئەوانە خسڵەتی کۆشش و ڕاستی و تەقەلای تیا دروست بێت، هەروەها ئاماژە یەکیش بوو بۆپاراستن و چاودێری خوای گەورە بۆپێغەمبەرەکەی و سەلماندنی ئەوەش کە شەیتان هیچ دەسەلاتێکی نیە لە سەری.[٢]

## پێنجەم: مردنی دایکی و لە ئەستۆگرتنی لە لایەن باپیرو مامی.

پێغەمبەرﷺلە تەمەنی شەش ساڵیدا دایکی وەفاتی کرد، لە ناوچەی(الأبواء) لە نێوان مەککە و مەدینە، لە ڕێگەی گەڕانەوەیان لە لای ماڵی خاڵوانی لە بەنی عەدی کوڕی نەججار[٣]، هەر لەوێش نێژرا، لە پاش کۆچی دوایی دایکی عەبدولموتتەلیب باپیری هەڵسا بە لە ئەستۆگرتنی، فەزڵیشی دەدایە سەر کوڕەکانیدا، باپیرەی پیاوێکی سامدار بوو، کاتێك لەسەر جێگاکەی دادەنیشت، ئیتر هیچ کەس لە منالەکانی دانەدەنیشتن، مامەکانی پێغەمبەرﷺ کەسیان زاتیان نەدەکرد لە سەر جێگای باوکیان دانیشن، بەلام پێغەمبەرﷺ دادەنیشت، مامەکانی هەوڵیان دەدا دووریخەنەوە لە جێگاکە، عەبدولموتتەلیب ڕازی دەبوو لەوێ دانیشێ، دەشیووت: ئەم کوڕەم پلەو پایەیەکی مەزنی دەبێت.[٤]

باپیری زۆری خۆشدەویست، کە دەشی نارد بۆ کارێك ئەنجامی دەدا، جارێك ناردی بۆ دۆزینەوەی هەندێ ووشتر و دواکەوت، [٥] ئیتر عەبدولموتتەلیب دەستی کرد

---

١ـ بڕوانة: فقه السيرة للبوطي(ل ٤٧)

٢ـ السيرة النبوية لإبن فارس(ل١٠٦، ١٠٧)

٣ـ إبن هشام في السيرة(١/٦٨)، وقد صرح إبن إسحاق بالتحديث.

٤ـ بڕوانه: السيرة النبوية لإبن فارس(ل١١٠)

٥ـ صحيح السيرة النبوية للعلي(٥٦)، وقال: أخرجه الحاكم(٢/ ٦٠٢، ٦٠٤)، وصححه و وافقه الذهبي، وقال: الهيثمي في المجمع(٨/ ٢٢٤): رواه أبو يعلى والطبراني وإسناده حسن.

بە سوڕانەوە بە دەوری کەعبەو دەیووت:

رب رد راكبی محمدا ردە لي واصنع عندي يدا

واتە: ئەی خوایە موحەممەدم بۆ بگێڕەوە، بۆم بگێڕەوە چاکەم لە گەڵ بکە.

جا کاتێك گەڕایەوە و وشترەکانی هێناوە پێی وت: ڕۆڵەکەم وەکو ئافرەت بە شێوەیەك غەمگین بووم تا ماوم هەر لەگەڵم دەبێت.[1]

پێغەمبەرﷺ تەمەنی هەشت ساڵ[2] بوو کاتێك باپیری کۆچی دوایی کرد، ڕاسپاردەشی کرد بۆ ئەبو تالیبی کوڕی، کە هەڵسێت بە ئەرکی لە ئەستۆگرتنی، ئەویش چاودێری دەکردو سۆزێکی زۆری هەبوو بۆی.[3]

ویستی خوای گەورە لە سەر ئەوە بوو پێغەمبەرەکەی بە هەتیووی پەروەردەبێت، بۆ ئەوەی تەنها چاودێری خوای گەورەی لە سەر بێت، دوور لەو باڵەی کە نازی پێبدات، یان ئەو پارەی کە بیخاتە بە ختەورییەوە، بۆ ئەوەی دڵی بە لای پارەو پلەو پایەدا نەخورپێ، بۆ ئەمەش کاریگەری دەوروبەری لە سەر نەبێت سەبارەت بە سەرکردەیی و دەم سپێتی، لای خەڵکیش پیرۆزی پێغەمبەرایەتی لەگەڵ پلەوپایەی دونیا تێکەڵ نەبێت، هەروەها بۆ ئەوەی وا نەزانن یەکەم لە خۆی دروست دەکات بۆ ئەوەی بگات بە دووەم[4]! ئەو کارەساتانەش، کە بەسەر پێغەمبەردا هاتن هەر لە سەردەمی منداڵیەوە، وەکو مردنی دایکی و باپیری، دوای ئەوەی کە بێ بەش بوو لە سۆزی باوکی، پەرداخی تاڵیشی یەك بە دوای یەکدا دەچەشت، ئەو هەموو کارەساتانە دڵ و هەستی ناسك کردبوو، چونکە خەمەکان دڵ دەتوێنێتەوەو پاکیشی دەکەنەوە لە پیسی توندی و لە خۆبایی بوون.

---

١ـ صحيح السيرة النبوية للعلي(٥٦)، وقال: أخرجه الحاكم(٢/ ٦٠٢، ٦٠٤)، وصححه و وافقه الذهبي، وقال: الهيثمي في المجمع(٨/ ٢٢٤): رواه أبو يعلى والطبراني وإسناده حسن.

٢ـ السيرة النبوية لإبن فارس(ل ١٠١).

٣ـ بڕوانە: مدخل لفهم السيرة د. اليحى(ل ١١٩)

٤ـ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي(ل٤٦).

## شەشەم: کارکردنی پێغەمبەرﷺ لە شوانی

ئەبو تالیب دەست کورت بوو، بۆیە وەکو یارمەتییەك پێغەمبەرﷺ هەڵدەسا بە کاری شوانی، هەر خۆیشی باسی خۆی و برا پێغەمبەرەکانی کردووە، کە ئەوانیش شوانییان کردووە، بەڵام خۆی مەڕی دەلەوەڕان بۆ خەڵکی مەککە، کە هێشتا لاوبوو، کرێشی وەردەگرت بەرامبەر کارەکەی، لە فەرموودەیەکی صەحیح داهاتووەکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((ما بعث الله نبياً إلا رعى الغنم)) واتە: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نە کردووە شوانی نەکردبێت، هاوەڵەکانی فەرموویان تۆیش، فەرمووی: ((نعم كنت أرعاها على قراريط لأهل مكة))[1] واتە: بەڵێ من شوانیم دەکرد بەرامبەر چەند درهەمێك بۆ خەڵکی مەککە.

لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات سوکنایەکی بۆ پێغەمبەرﷺ دەستەبەر دەکرد، کە دەروونە بێگەردەکەی پێویستی پێبوو، هەروەها بوواری بۆ دەڕەخساند، کە ڕابوێرێت بە جوانی بیابان و نواڕین بۆ دیاردەکانی مەزنی لە دروستکراوەکانی خوای مەزن، هەروەها ڕێگای بۆ هەموار دەکرد لە کپی شەوو، سێبەرەکانی مانگ و شنەی دەمەو بەیان، کە هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی چەندین جۆر لە پەروەردەی دەروونی، وەکو ئارام گرتن و لە سەر خۆیی و بەزەیی و چاودێرکردنی لاواز تاکو بەهێز دەبێت و، بەسەرکردنەوەی ڕێگاکانی چاکەو خۆپاراستن لە خۆتیابردن و جێگاکانی مەترسی و جۆرەکانی بەڕێوەبردنی ئەو ئاژەڵە لاوازە.[2]

چاودێری کردنی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو مەڕانە، ئەو فەرموودانەمان بە یاد دەهێنێتەوە، کە ئاراستەی موسڵمانان دەکات چاکە بکەن لەگەڵ ئاژەڵ[3]، بۆیە شوانیکردن بۆ پێغەمبەرﷺ ڕاهێنانێکی چاك بوو لە سەر بەڕێوەبردنی ئوممەتێك.

---

١ـ البخاري، كتاب الإجارة باب رعي الغنم على قراريط(رقم ٢٢٦٢) القراريط: مەبەستی بەشێکە لە دینارێك، یان چەن درهەمێك.

٢ـ بڕوانە: محمد رسول الله الصادق عرجون(١/ ١٧٧)

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(١/١٠٦).

## هەروەها شوانی چەند خەسڵەتێکی پەروەردەیی بۆ خاوەنەکەی هەمواردەکات

١ـ ئارامگرتن لە سەر شوانی هەر لە هەڵاتنی خۆر تاکو ئاوابوونی، بە بۆنەی خاوی مەڕ لە لەوەڕێنیدا، بۆیە شوانەکە پێویستە خۆی بڕازێنێتەوە بە ئارم و خۆڕاگرتن، بە هەمان شێوە پەروەردەکردنی مرۆڤیش.[١]

لە ڕاستیدا شوان لە تەلارێکدا ناژیت، یان لە نازو نیعەمەتێکدا، بەڵکو لە کەش و هەوایەکی گەرم و سەخت، بە تایبەتی لە دوورگەی عەرەب، پێویستی بە ئاوی زۆر هەیە بۆ ئەوەی تینوێتی خۆی پێ بشکێنێ، ئینجا لە خواردنی زبرو ژیانی وشك زیاتر نابینێت، بۆیە پێویستە لە سەری خۆی ڕابهێنێ لەگەڵ ئەو بارو دۆخە سەختەداو ئارامیش بگرێت لە سەری.[٢]

٢ـ بێ فیزی: سروشتی کاری شوان خزمەتکردنی مەڕەکانیەتی، لە سەر پەرشتی زاوزێیان و پاسەوانیکردنیان و خەوتن بە تەنیشتیانەوە، جاری واش هەیە پرشی میزەکەیان دەیگرێتەوە، یان پشقلەکەیان، ئەوەش قەڵسی ناکات، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، لەو کارەدا،دەرروونی بەتەواوی دووردەکەوێتەوە لەخۆ بەزلزانین و فیز، ئینجا ڕەوشتی بێ فیزی تیا دەچەسپێ.[٣]

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە، کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر)) واتە: کەسێك ئەوەندەی گەردیلە خۆڵێك فیزی هەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، پیاوێك وتی: باشە کەسی وا هەیە حەزدەکات جلەکەی جوان بێت، نەعلەکەی جوان بێت، فەرمووی: ((إن الله جميل يحب الجمال، الكبر بطر الحق وغمط الناس)) [٤] واتە: خوای گەورە جوانە جوانیشی خوش دەوێت، فیز ئەوەیە لە هەق لادەیت و چاکەی کەس لە بەر چاوت نەبێت.

---

١ـ بڕوانە: مدخل لفهم السيرة د. اليحيى(ل ١٢٤)
٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن فارس(ل ١١٤، ١١٥)
٣ـ هەمان سەرچاوە(ل ١١٤)
٤ـ مسلم(رقم ١٤٧ـ ٢٩١)

٣ـ ئازایی: سروشتی کاری شوان پێکدادانە لەگەڵ درِندەی پەلاماردەردا، بۆیە پێویستە ئازاییەکی زۆری تیادا بێت، تاکو بتوانێت ئەو درِدانە لە ناو ببات، کە دەیانەوێت مەڕەکانی بخۆن.[١]

٤ـ بەزەیی و سۆز: شوان بە پێی کارەکەی هەڵدەستێت بە یارمەتی مەڕەکان، کە نەخۆش دەکەوتن، یان جێگایەکیان دەشکێت، حاڵەتی نەخۆشی و ئازاریش وا لەو شوانە دەکات بەزەیی بجولێت بۆ ئەو ئاژەڵەو، چارەسەری بکات و لە ئازارەکانی کەم بکاتەوە، ئەو کەسەش، کە بەزەی بە ئاژەڵ بێتەوە، بەزەی بە مرۆڤدا زیاتر دێتەو، بە تایبەت ئەگەر پێغەمبەرێك بێت خوای گەورە ڕەوانەی کردبێت بۆ فێرکردنی مرۆڤ و ڕێگەپیشاندانی و قوتارکردنی لە ئاگرو بەختەوەرکردنی لە دونیاو دوارۆژ.[٢]

٥ـ دەستکەوتن لە ئارەقی نێوچاوان: خوای گەورە دەیتوانی پێغەمبەرەکەیﷺ بە دوور بگرێت لە شوانی، بەڵام ئەوە پەروەردەبوونێك بوو بۆ خۆی و نەتەوەکەی، کە لە دەستکەوتی خۆیان و ئارەقی نێو چاوانیان بژین، شوانیش جۆرێکە لە جۆرەکانی دەستکەوت.

پێشەوا بوخاری لە میقدادەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((ما أكل أحدٌ طعاماً خيراً من أنه يأكل من عمل يده، وأن نبي الله داود كان يأكل من عمل يده))[٣] واتە: کەس خواردنێکی نەخواردووە، چاکتر لەوەی بەدەستی خۆی دەریدەهێنێ پێغەمبەری خوا داودیش لە داهاتی دەستی خۆی دەیخوارد.

بێگومان پشت بەستن بە داهاتی حەڵاڵ ئازادییەکی تەواو دەبەخشێت بە مرۆڤ، هەروەها توانایشی دەبێت، کە قسەی ڕاست ورەوا لە جێگای خۆی بکات.[٤]

چەندین کەسیش سەری خۆیان شۆڕ دەکەن بۆ زۆرداران و بێدەنگ دەبن لە ئاستی ناڕەواییان، لە ترسی کارو پلەوپایەیان لای ئەوان.[٥]

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن فارس(ل ١١٤)

٢ـ بڕوانە: مدخل لفهم السيرة .(ل ١٢٤)

٣ـ البخاري: كتاب البيوع(رقم ٢٠٧٢).

٤ـ بڕوانە: مدخل لفهم السيرة .(ل ١٢٨)

٥ـ بڕوانە: فقه السيرة للغضبان.

لە ڕاستیدا هەڵسانی پێغەمبەرﷺ بەکاری شوانی بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕۆزی وبژێوی، ئاماژە دەکات بۆ هەندێ هێمای گرنگ لە کەسایەتی پیرۆزی ئەو، لەوانە چەشتنی بەرزو هەستی ورد، کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی پێ ڕازاندەوە.

خۆ ئەبو تالیبی مامی زۆر بەباشی بایەخی پێدەدا، هەروەکو باوکیش سۆزی بۆی هەبوو و خۆشی دەویست، بەڵام هەرکە هەستی کرد توانای ئەوەی هەیە کاسبی بکات دەستی دایە کارکردن، خۆی ماندوو دەکرد بۆ یارمەتی دانی مامەی بۆ دابین کردنی ئازووقەو خەرجی، ئەمەش بێگومان ئاماژە دەکات بۆ جوامێری لە کەسایەتی و، چاکە لە مامەڵەو، هەوڵدان و نەوەستان[1]، ئاماژەیەکی تریش پەیوەندی هەیە بە بەڕووخستنی جۆری ئەو ژیانەی خوای گەورە بە باشی دەزانێت بۆ پیاو چاکان لە دونیادا، ئاسان بوو لە لای خوای گەورە هەموو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانی برەخسێنێ بۆ پێغەمبەرەکەی، بە شێوەیەك ئیتر پێویستی بەکارکردن هەر نەبێت، نە خوازەلا شوانی بکات.

بەڵام دانایی خوای گەورە ویستی ئەوە بزانین، کە باشترین ماڵ ئەوەیە، ئادەمیزاد بەدەستی خۆی دەریبهێنێ، بەرامبەر ئەو خزمەتەی پێشکەشی دەکات بۆ کۆمەڵ و هاوڕەگەزەکانی.[2]

## حەوتەم: پاراستنی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی پێش ئەوەی بیکات بە پێغەمبەر.

خوای گەورە پارێزگاری کرد لە پێغەمبەرەکەی، کە بکەوێتە نێو هاوتا بۆ خوا بڕیاردانی نەفامی و بتپەرستی، پێشەوا ئەحمەد لە موسنەدەکەی دەگێڕێتەوە لە هیشامی کوڕی عوروە لە باوکی یەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: دراوسێیەکی خەدیجە بۆی گێڕامەوە، کە گوێی لێبووە پێغەمبەرﷺ بە خەدیجەی فەرموو: ((أي خديجة والله لا أعبد اللات والله لا أعبد العزى))[3] واتە: ئەی خەدیجە سوێند بە خوا لات

---

١ـ بڕوانە: فقه السيرة للبوطي(ل ٥٠)

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ المسند، ورقمه (٧/ ١٧٩)، وقال: محققوا طبعة الرسالة: إسناده صحيح، وانظر: وقفات تربوية، أحمد فريد(ل/ ٥١)

ناپەرستم، سوێند بە خوا عوززا ناپەرستم، ئینجا پێغەمبەرﷺ لەو سەر بڕاوانەی نەدەخوارد کەبتپەرستان لەسەر بتەکانیان سەریان دەبڕی، هەروەها عەمری کوڕی نوفەیلیش لەم مەسەلە هاو هەڵوێست بوو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ خوای گەورەش لەسەردەمی لاویدا پاراستی تەنانەت لەو حەزو ئارەزوانەی کە هەر گەنجێك بە سروشت حەزی لێدەکات، بەڵام ناگونجێت لەگەڵ مەزنی وشکۆداری ئەوانەی ڕێنوێنی خەڵکی دەکەن.[1]

عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەگێڕێتەوەﷺ گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺدەیفەرموو: ((ما هممت بقبيح مما كان أهل الجاهلية يهمون به، إلامرتين من الدهر كلتاهما يعصمني الله منهما، قلت ليلة لفتى كان معي من قريش بأعلى مكة في أغنام لأهله يرعاها أبصر لي غنمي حتى أسمر هذه الليلة بمكة، كما يسهر الفتيان، قال: نعم، فخرجت، فجئت أدنى دار من دور مكة، سمعت غناء، وضرب دفوف، ومزامير، فقلت: ما هذا؟ قالوا: فلان تزوج فلانة، لرجل من قريش تزوج إمرأة من قريش، فلهوت بذلك الغناء وبذلك الصوت حتى غلبتني عيني، فما أيقظني إلا حر الشمس، فرجعت، فقال: مافعلت؟ فأخبرته ثم قلت له ليلة أخرى مثل ذلك، ففعل، فخرجت فسمعت مثل ذلك، فقيل مثل ما قيل لي، فلهوت بما سمعت حتى غلبتني عيني، فما أيقظني إلا مس الشمس، ثم رجعت إلى صاحبي فقال: ما فعلت؟ فقلت: ما فعلت شيئاً قال رسول اللهﷺ: فوالله ما هممت بعدها بسوء مما يعمل أهل الجاهلية حتى أكرمني الله بنبوته))[2] واتە: توخنی ئەو خراپانە نەدەکەوتمەوە لە سەردەمی نەفامیدا دووجار نەبێت، جارێك بە هاوڕێ شوانەکەم وت: چاوت بە ڕانەکەمەوە بێت تاکو ئەمشەو لەگەڵ گەنجەکانی ناو مەککە بەسەر دەبەم، ئیتر لە ناو مەککەوە هەندێ گوێم گرت و خەو دایگرتمەوە و سبەینێ بە گەرمی خۆر ئاگام بوویەوە ... شەوێکی تریش بە هەمان شێوە هاتمە خوارەوە بۆ ناو مەککە و هەمان بەزم و شایی تیا بوو، بەڵام دووبارە خەوم لێکەوت و خۆری سبەینان هەلیساندم ... دەفەرموێت:

دوای ئەوە من هەرگیز توخنی هیچ خراپەیەك نەکەوتمەوە تاکو ئەو کاتەی

---

١ـ بڕوانە: محمد رسول الله لمحمدالصادق عرجون(١/ ١٩٣)

٢ـ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية، إبراهيم العلي(ل ٥٧)

خوای گەورە پێغەمبەرایەتی پێبەخشیم.

ئەم فەرموودەیە دووڕاستیمان بۆ ڕووندەکاتەوە، هەردووکیان یەکجار گرنگن:

پێغەمبەری خواﷺ هەموو تایبەتمەندییەکانی ئادەمیزادی هەبوو، وەکو هەرلاوێك هەستی بە ئەوحەزو ئارەزووانە دەکرد، کە ویستی خوا وایە هەموان هەستی پێبکەن، بۆیە هەستی دەکرد بەواتای شەو بە خۆشی بەسەر بردن و گاڵتەو گەپ و دڵیشی داوای لێدەکرد، ئەویش وەکو ئەوانی تر ڕابوێرێت.

٢- خوای گەورە پێغەمبەرەکەی پاراستووە لەهەموو دیاردەکانی لەڕێگەی لادان، هەروەها لە هەموو شتێکیش، کە لە گەڵ پێویستیەکانی بانگەواز ناگونجێت، کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی بۆ ئامادە دەکات.[١]

## هەشتەم: چاوپێکەوتنی بەحیرای قەشە بە پێغەمبەرﷺ لە تافی لاویدا.

ئەبو تالیب دەرچوو بەرەو شام، پێغەمبەری خواشﷺ لەگەڵ هەندێ لە ڕیش سپیانی قوڕەیش بوو، کاتێك گەیشتنە لای بەحیرا، دابەزین بارەکانیان کردەوە، ئیتر قەشەکە دەرچوو بۆ لایان، پێشتر بەوێدا ڕێیان بکردایە دەرنەدەچوو بۆ لایان و ئاوڕی لێنەئەدانەوە.

دەڵێت: لە کاتێکدا بارەکانیان دەکردەوە بەحیرا لە نێوانیاندا ڕەتدەبوو، تاکو گەیشتە پێغەمبەرﷺ و دەستی گرت، وتی: ئەمە سەرگەورەی هەموو دونیایە، ئەمە پێغەمبەری خوایە، خوای گەورە وەکو ڕەحمەتێك دەینێرێ بۆ هەمووان، ڕیش سپیانی قوڕەیش پێیان وت: تۆ چوزانی؟ وتی: ئێوە کاتێك نزیك بونەوە هیچ درەخت و بەردێك نەما کڕنوش نەبات، ئەوانەش بۆ پێغەمبەر نەبێت بۆ کەس ناچنە کڕنوشك، ئینجا منیش ئەو دەناسم بە مۆری پێغەمبەرایەتی لە سەر شانی دەڵێی سێوە.

ئینجا گەڕایەوە خواردنێکی بۆیان دروست کرد، کاتێك ئامادەی کردو هێنایە لایان، لەو کاتە پێغەمبەرﷺسەرقاڵی بایەخدان بوو بە وشترەکان، وتی: بنێرن بە

---

١- بڕوانە: فقه السيرة للبوطي(ل ٥٠، ٥١)

دوایـدا، ئـیتر پێغەمبـەرﷺ هـات و پەڵـە هـەورێك سـێبەری بـۆ دەکـرد، کاتێـك نزیکبوویـەوە لـە خەڵکەکـە، بینـی ئـەوان پێشی کـەوتن بـە ڕۆیـشتن بـۆ سـێبەری دارەکە، بەڵام کاتێك دانیشت سـێبەری دارەکـە لار بویـەوە بـە لایـدا، وتـی: بڕوانن چۆن سێبەری دارەکە لار بوو یەوە بە لایدا.

دەڵێت: هێشتا بەحیرا ڕاوەستابوو، سوێندی دەدان، کـە موحەممـەدﷺ نەبەنـە لای ڕۆمەکان، چونکە ڕۆمەکان ئەگەر بیناسن دەیکوژن، ڕووی وەرگێڕا بینی حەوت کەس لەو ڕۆمیانە بەرەو لای هاتن و ئەویش پێشوازی لێکـردن، وتـی: چـۆن هـاتن؟ وتیان: زانیومانە ئەو پێغەمبەرە لەم مانگەدا سەر هەڵدەدا، ئیتر ڕێگە نەماوە چەند کەسێکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت، ئێمەش لە هەواڵی ئاگادار بوینەتـەوە، نێـردراوین بـۆ ئەم ڕێگەیە، وتی: ئایا کەس لە دواتانەوە هەیە، لە ئێو باشتر بێت؟ وتیـان: بـەڵکو ئێمە چاکەکەمان هەڵبـژارد بـۆ ئـەم ڕێگایـەی تـۆ، وتـی: ئایـا ئەگـەر خـوای گـەورە بیەوێت کارێك ئەنجام بدات، کەس دەتوانێت ڕێگای لێبگرێـت؟ وتیـان نـەخێر، وتـی سوێندتان دەدەم بە خوا کامتان خاوەنی ئەو کوڕەیە؟ وتیان ئەبو تالیب، ئیتر هەر سوێندی دەداو قسەی لەگەڵ دەکرد تاکو ئەبو تالیب گەڕاندیەوە.[1]

## لە بەسەرهاتی بەحیرا ئەم سودانە وەردەگرین:

١ـــ ڕاسـتگۆیانی خواناسـان لـە ئـەهلی کتـاب دەزانـن، کـە موحەممـەدﷺ ڕەوانەکراوە بۆ مرۆڤایەتی، ئەوەیان زانیوە بەو بەڵگانەی لە کتێبەکانیاندا بووە.

٢ـ جێگیربـوونی ئـەوەی، کـە داروبـەرد کرنوشـیان بـردووە بـۆ پێغەمبـەرﷺ، هەوریش سێبەری کردووە، سێبەری درەختیش بە لایدا کشاوەتەوە.

٣ـ پێغەمبەری خواﷺ سوودی لە گەشت و گوزارەکەی کردوەلەگـەڵ مـامی بـە تایبەتیو لەگەڵ پیش سپیانی قوڕیشدا، چونکە چاوی کـەوتووە بـە تاقیکردنـەوەو زانیـاری کەسـانی تـرو سـودی لـە بـۆ چـونەکانیان وەرگرتـووە، چـونکە ئـەوان شارەزاییو زانستێك بوون پێغەمبەرﷺ نەیبینیبوو لە تەمەنی خۆیدا.

---

١ـ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية، (ل ٥٨، ٥٩) وما جاء في هامشها.

٤ـ مەترسی بەحیرا لە گاورەکانی ڕۆم، داواشی کردووە لە ئەبو تالیب و ئەوانی تر، کە نەیبەن بۆ ئەوێ، ئەگەر ڕۆمەکان بیناسنەوە دەیکوژن، دیارە ڕۆمەکان دەیانزانی بە هاتنی پێغەمبەرێك، کە دەسەلاتی داگیرکاریانەیان لە ناو دەبات لە ناوچەکەدا، بۆیە ئەوە ئەو دوژمنەیان بووە، کەبەرژەوەندییەکانی دەولەتی ڕۆمان ناهێلێت و دەیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەمەش جێگای مەترسی ئەوان بوو.

## نۆیەم: جەنگی فیجار.

ئەم جەنگە هەلگیرسا لە نێوان قورەیش و هاوپەیمانان لە کینانەو، هۆزی هەوازین، هۆکاریشی ئەوەبوو، کە عوروەی ڕەحالی کوڕی عوتبەی هەوازین پەنای ئەو وشترانەی نوعمانی کوڕی مونزیری دابوو بۆ بازاڕی عوکاز، کەبارکرابوو لە گولاو ئاوریشم و کالای بازرگانی، ئیتر بەڕازی کوڕی قەیسی کوڕی کینانە وتی: ئایا دالدەی دەدەیتە سەر هۆزی کینانە؟ وتی: بەلێ لەسەر هەموو خەلکیش، ئیتر عوروە پێی دەرچووە، بەڕازیش بە دوایدا دەرچووە، ئیتر کۆچیان کرد بێ ئەوەی هەوازین هەستیان پێبکەن، دوای ئەوە ئاگاداری بوونەوەو بەدوایان کەوتن وفریایان کەوتن پێش ئەوەی بگەنە حەرەم، لەوێ بە شەڕ کەوتن تاکو شەو، ئینجا چوونە نێو حەرەمەوە، ئیتر هەوازین وازیان لێیان هێنا، بەلام لە پاش ئەم شەڕە چەندین جار یەکیان گرتەوە لە شەڕی تردا، قورەیشیش لەم شەڕانەدا پشتیوانی هۆزی کینانەیان کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ ئامادەی هەندێ لەو جەنگانە بوو، چونکە مامەکانی لە گەل خۆیان دەیانبرد.

بەناو فیجاریش ناو برا بەهۆی ئەوەی شەڕیان بەڕەوا بینی لەنێو حەرەمی مەککەدا کەپیرۆز بوو بەلای هەموو عەرەبەوە.[١]

لەو سەردەمە پێغەمبەرﷺ تەمەنی چواردە سال بوو، یان پانزە سال، دەشلێن: بیست سالان بووە، بەلام پەسەند ئەوەیە، کە چواردە سالان بووەو، تیری تیایدا کۆکردەوەو دەیدایە دەستی مامەکانی، ئەوەش بەلگەیە لە سەر ئەوەی هێشتا منال بووە.

١ – وقفات تربوية مع السيرة النبوية (ص٥٣) .

پێغەمبەرﷺدەفەرموێت: ((كنت أنبل على أعمامي)) واتە: تیری دوژمنەکانم کۆدەکردەوە، کە تێیان دە هاوێشتین.[١]

بەم شێوەیەش پێغەمبەرﷺ بوێری و ئازای و چاو نەترسی پەیدا کردو، خۆیشی ڕاهێنا لە گەڵ شەڕکردن هەر لە سەرەتای گەنجیەوە، ئەم شەڕە دواتر کۆتایی پێهات، کە زۆر لە شەڕەکانی تری عەرەب دەچوو، تا خوای گەورە دڵەکانیانی یەکخست و قوتاری کردن لە ئەو گومڕایانە بە هاتنی ئیسلام.[٢]

## دەیەم: ( حلف الفضول )

هاو پەیمانێتی(حلف الفضول) لە پاش گەڕانەوەی قورەیش بوو، لە شەڕی فیجار، هۆکەشی ئەوە بوو، پیاوێك لە بەنی زەید لە یەمەن، هاتە مەککە بە هەندێ شتومەك، کە فرۆشتی بە عاصی کوڕی وائیل، بەڵام ئەو پارەکەی پێنەدا و کابرای یەمەنیش داوای مافی خۆی دەکرد لە سەرانی قورەیش، ئەوانیش یارمەتیان نەدا بە هۆی پلەو پایەی عاصەوە لە نێوانیاندا، ئەویش چووە لای کەعبەو هاواری کرد لە ئالی فیهرو خاوەن غیرەتان بە دەنگێکی بەرز ووتی:

| | |
|---|---|
| یاآل فهـر لمظلـوم بضاعته | ببطن مكة نائي الدار والنفر |
| ومحـرم أشعث لم يقض عمرته | يا للرجال وبين الحجر والحجر[٣] |
| ان الحـرام لمـن تمّـت كرامته | ولا حرام لثوب الفاجر الغدر |

ئیتر زوبەیری کوری عەبدولموتتەلیب هەڵساو ووتی: نابێت واز لەم کابرایە بهێنن، بۆیە بەنو هاشیم کۆبوونەوە لە گەڵ زوهرەو نەعیمی کوڕی مورڕە لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جودعان، ئەویش خواردنێکی بۆ دروست کردن، هەموویان

---

١ـ السيرة النبوية لإبن هشام (١٢٧/١ـ ٢٢٤) السيرة الحلبية(١/ ١٢٩ـ ١٢٩).

٢ـ بڕوانە: وقفات تربوية، أحمد فريد(ل/ ٢٥)

٣ـ الروض الأنف للسهيلي (١٥٥، ١٥٦)

هاوپەیمانێتی یان کرد لە(شهر الحرام)دا، لە (ذوالعقدة) بوو، لە نێو خۆیاندا سوێندیان خوارد بەخوا، کە یەك دەست بن لە گەڵ ستەم لێکراودا دژ بە ستەمکار، تا مافەکەی بۆ دەگێڕنەوە، هەتا هەتایە هەر واش بن.

ئینجا پێکەوە چوون بۆ لای عاصی کوڕی وائیل و ماڵی کابرایان لێوەرگرتەوە و بۆیان گەڕاندەوە.

قورەیش ئەمەی ناونا بە هاوپەیمانێتی(الفضول) چونکە وتیان ئەمە کارێکی فەزڵ و چاکەیە، لەم بارەشەوە زوبەیری کوڕی عەبدولموتتەلیب دەڵێت:

أن الفضول تعاقدوا وتحالفوا ... الا يقيم ببطن مكة ظالم

أمر عليه تعاقدوا و تواثقوا ... فالجار والمعتر فيهم سالم.

پێغەمبەری خواﷺ ئامادەی ئەو هاوپەیمانێتی یە بوو، کە تەلاری ستەمیان پێ ڕوخاند، منارەی هەقیانیش پێ بەرزکردەوە، لە ڕاستیدا ئەوە یەکێك بوو لە شانازییەکانی عەرەب و دان نانیان بە مانی مرۆڤ،[1] پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((شهدت حلف المطيبين مع عمومتي وأنا غلام، فما أحب أن لي حمر النعم، وأني أنكثه))[2] واتە: ئامادەی هاوپەیمانێتی موتەیبین بووم، کە هێشتا منداڵ بووم، حەزم نەدەکرد ببم بەخاوەنی ڕەشە وڵاخی زۆر بەرانبەر ئەوەی ئەو پەیمانەم بەسەر نەبردبا هەروەها پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (( لقد شهدت في دار عبدالله بن جدعان حلفاً ما أحب أن لي به حمر النعم، ولو دعيت به في الإسلام لأجبت)).[3]

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة(١/ ٢١٤)

٢ـ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية، إبراهيم العلي(ل ٥٩) وذكر تصحيح الهيثمي لە في المجمع، و تصحيح الساعاتي لە في الفتتح الرباني.

٣ـ السيرة النبوية لإبن هشام(١/ ١٢٤) فقه السيرة للغضبان. ل(١٠٢).

## پەندو وانەكان:

١ـ دادگەریی بەهایەكی ڕەهایە نەك ڕێژەیی، پێغەمبەری خواشﷺ شانازی خۆی دەردەبڕێت بە بەشداری كردن لە بە هێزكردنی بنەمای دادگەری، پێش پێغەمبەرایەتیەكەی بە بیست ساڵ، چونكە بەها چاكەكان شایستەی پیاهەڵدانن با لە سەردەمی نەفامیشدا ڕوویان دابێت.[1]

٢ـ هاوپەیمانێتی (حلف الفضول)مێژ گێك بوو لە بیابانی نەفامیدا، ئاماژەیەكی ئاشكرایشی تیایە، كە بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و خراپە لە كۆمەڵگەیەكدا ئەوە ناگەیەنێت، كە ئەو كۆمەڵگایە چاكەی تیادا نەماوە، مەككە كۆمەڵگایەكی جاهیلی بوو بتپەرستی تیادا باڵا دەست بوو، هەروەها ستەم و ڕەوشتی ناشیرین، وەكو داوێن پیسی و سوو، لە گەڵ هەموو ئەوانەشدا كە سانێك هەبوون خاوەن جوامێریو پیاوەتی، كە ڕقیان لە ستەم بوو، پێی ڕازی نەدەبوون، ئەمەش وانەیەكی مەزنە بۆ بانگخوازەكان لە كۆمەڵگاكانیان، كە كار بە ئیسلام ناكەن، یان دژایەتیشی دەكەن.[2]

٣ـ ستەم قەدەغەیە بە هەر شێوازێك بێت وە لەسەر هەر كەسێك بێت[3]، ئیسلام دژایەتی ستەم دەكات، لەگەڵ ستەم لێكراویشدا دەوەستێ، بەبێ هیچ بایەخدانێك بە ڕەنگ و ئایین ونیشتمان و ڕەگەز.[4]

٤ـ بوار كردنەوە بۆ هاوپەیمانێتی و ڕێكەوتن لە سەركرداری چاكە، وەكو چۆن خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا ۘ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾(المائدة: ٢) لە ئەم حاڵەتەدا بوار دراوە

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية صحيحة للعمري(١/ ١١٢).

٢ـ بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان. (ل ١١)

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن أبن فارس(ل ١٢١)

هاوپەیمانێتی بکرێت، چونکە دوپاتکردنەوەیە بۆ کارێکی شەرعی، بە مەرجێك ئەوە کارێك نەبێت لە مزگەوتی زیرار بچێت، بە شێوەیەك،کە ببێتە جۆرێك لە ڕێککەوتن و حیزبایەتی ئاراستەکراو دژ هەندێ موسڵمانی تر بە ستەم و زیادە ڕەوی، سەبارەت بە ڕێککەوتنی موسڵمان لەگەڵ ئەوانەی موسڵمان نین بە مەبەستی لابردنی ستەم، یان ڕوو بەڕووبونەوەی ستەمکار، ئەوە ڕەوایە، بەڵام لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان، لە ئەمڕۆوداهاتوودا، ئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە[1] لە سەر ئەوە، کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((ما أحب أن لي به حمر النعم))[2] ((لو دعيت في الإسلام لأجبت)).[3]

مادام دەبێتە مایەی بەرپەرچدانەوەی ستەمکارو ستەمەکەی، پێغەمبەری خواﷺ ئامادەی خۆی دەربڕی بۆ بەشداری کردن لە ئاوها هاوپەیمانییەتیەکدا، پاش هاتنی ئیسلامیش.[4]

٥- پێویستە موسڵمان لە کۆمەڵگای خۆیدا کەسێکی گورج و لێهاتو بێت، نەوەك ژمارەیەك بێت لە ژمارەکان، لە پەراوێزی ڕووداوەکانەوەو لە دەوروبەری خۆیدا، پێغەمبەری خوا مایەی ڕوانینی هەموو لایەك بوو، نموونەشیان پێدەهێنایەوە، کە ناو نرا بە دەستپاك، دڵەکان بەرەو لای دەچوون بە گشتی، بە بۆنەی ئەو کارە جوانەی، کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، هەر لەسەر ئەو کارانەش بەردەوام بوو، تاکو دڵەکان هەموویان پێوەی بەسترانەوە، ئەوەش وێنەیەکی ڕاستەقینەمان بۆ دروست دەکات دەربارەی بەهای ڕەوشت لە کۆمەڵگاداو، هەروەها دەربارەی ڕێزی مرۆڤی خاوەن ڕەوشت، ئەگەر چی لە کۆمەڵگایەکی لادەریشدا بێت.[5]

---

١- بڕوانە: الأساس في السنة و فقهها - السيرة النبوية - (١/ ١٧١، ١٧٢)

٢- السيرة النبوية لإبن هشام(١/ ١٣٤)

٣- هەمان سەرچاوە.

٤- بڕوانە: الأساس في السنة(١/١٧٢).

٥- بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان. (ل ١١٠- ١١١)

## باسی شەشەم: بازرگـانی کردنـی وهاوسـەرێتی لەگـەڵ خەدیجـە و، گرنگترین ڕووداوەکان تاکاتی پێغەمبەرایەتی.

### یەکەم: بازرگارنی کردنی لەگەڵ خەدیجە و ئینجا هاوسەرگیریان.

خەدیجەی کچی خوەیلید بێوەژن بوو[١]، خاوەن پلەو پایەو سامان بـوو، پیـاوانی دەگـرت بـە کـرێ بـۆ ئـەوەی بـە پارەکـەی بازرگـانی بـۆ بکـەن، کاتێـك هـەواڵی پێغەمبـەریﷺ پێگەیشت چـەند ڕاسـتگۆ و دەسـت پـاك و ڕەوشـت جوانـە، داوای لێکرد دەربچێت بۆ شام و بازرگانی بۆ بکات، کرێ ی باشتریشی بۆ تەرخان دەکات لـە کەسـانی تـر، ئـەویش ڕازی بـوو، ئینجـا لەگـەڵ مەیسەرەی خـولامی خەدیجـە دەرچـوون بـۆ شـام، موحەممـەدﷺ کاڵاکـانی خـۆی فرۆشـت، کـە لـە مەککـەوە هێنابووی، ئەو شتومەکانەش کە دەیویست لەوێ کڕی و گەڕایەوە بۆ مەککە، ئـیتر خەدیجە ئەوەندە قازانجی کرد تا پارەکەی دووبەرامبەر بوویەوە.

پێغەمبەری خواﷺ لەم گەشتەیدا دەستکەوتی مەزنی دەسـت کـەوت، جگـە لـە قـازانجی ئـەو بەشـەی کـە بەرێکـەوت لـە بازرگانیەکـە، لەوانـە تێپـەڕبوونی بـەناو مەدینەدا، کە دواتر بووە مەڵبەندی بانگەوازەکەی، بە ئەو وڵاتانەیش کە دواتر فەتح کرا و ئایینی ئیسلامی تیـادا بڵاوبوویـەوە، هـەروەها گەشـتەکەی هۆکارێـك بـوو بـۆ هاوسـەرێتی لەگـەڵ خەدیجـەدا، دوای ئـەوەی کـە مەیسـەرە باسـی لێبـوردەیی و ڕاستگۆیی وڕەوشت جوانی پێغەمبەرﷺ بۆکرد[٢]، ئینجا خەدیجە قـازانجێکی چـاکی کـرد لەوبازرگانیـەدا، کـە لـە جارەکـانی تـردا نـەیکردبوو، دوای ئـەوەی ئـەو خەسڵەتانەی بـە دیکـرد لـە پێغەمبـەرداﷺ، خەدیجـە چووە لای نەفیسـەی کـچی مونـەببیهی هـاوڕێی و باسـی بـۆ کـرد، کـە لـە دڵیـدا هەسـتی پێـدەکات بەرامبـەر محمدﷺ، نەفیسەش چـووە لای پێغەمبـەرﷺ باسـی ئـەوەی لەگـەل کـردەوە کـە خەدیجـە مارەبکـات،[٣] ئـەویش ڕازی بـوو و مەسـەلەکەی لای مامـەکانی باسـکرد،

---

١ـ خێزانی عەتیقی کوڕی عائیزبوو، لەپاش مردنی شووی کرد بە ئەبوو هالەو ئەویش هەرکۆچی دوای کرد.

٢ـ بڕوانە: رسالة الأنبياء، عمر أحمد عمر(٢/٢٧)

٣ـ بڕوانە: وقفات تربويه(ل ٢٥٦)

ئەوانیش لای خۆیانەوە ڕازی بوون، ئینجا حەمزەی مامی لەگەڵی چوو بۆ خوازبێنی خەدیجە، ئیتر پێغەمبەرﷺ بە مارەییەك، کە بریتی بوو لە بیست ووشتر خەدیجەی مارەکرد، کە یەکەمین ئافرەتێك بوو بوو بە هاوسەری پێغەمبەرﷺ، ژنی تریشی نەهێناوە سەری تا ئەو کاتەی کۆچی دوای کرد.[١]

دوو کوڕو چوار کچیشی بوو لە لای پێغەمبەری خواﷺ، کوڕەکانیشی ناویان(القاسم) کە پێغەمبەرﷺبە ئەو ناسرا، لەگەڵ (عبدالله) ، کە بە (الطاهر)و (الطيب) دەناسرا (القاسم) کۆچی دوای کرد کاتێك گەیشتە تەمەنێك دەیتوانی سواری ولاغ بێت، (عبدالله)ش هەر لەمناڵی کۆچی دوایی کرد، پێش پێغەمبەرایەتی، سەبارەت بە کچەکانیشی بریتی بوون لە: زەینەب و، روقیەو، ئوممو کولسوم و، فاتیمە، هەمووشیان موسڵمان بوون و کۆچیان کرد بۆ مەدینە و شویانیش کرد،[٢] ئەمەو تەمەنی پێغەمبەرﷺبیست و پێنج ساڵ بوو کاتێك خەدیجەی مارە کرد، بەڵام خەدیجە تەمەنی چل ساڵ بوو.[٣]

## پەندو وانەکان:

١ـ دەست پاکی و ڕاستگۆی سیفەتی بازرگانی سەرکەوتووە، هەر ئەم دوو سیفەتەش بوو، کە وایکرد خەدیجە هەڵسێت بە سپاردنی بازرگانی یەکەی بەپێغەمبەرﷺو سەفەرکردنی بۆ شام.

بازرگانی سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی ڕۆزی، کە خوای گەورە هەمواری کرد بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، ئینجا ڕاهێنانی باشیشی کرد لەسەر هونەرەکانی،پێغەمبەری خواﷺ ڕوونیکردووتەوە،کە بازرگانی ڕاستگۆ و دەست پاك لە ئاینی ئیسلام لەگەڵ ڕاستگۆیان و شەهیدان و پێغەمبەران حەشر دەکرێت، ئەم کارەش گرنگە بۆ موسڵمانان، ئەنجامدەریشی ناکەوێتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی کەسانی دیکەوە، چونکە بێ نیازە لێیان، بەڵکو ئەوان پێویستیان پێیەتی.

---

١ـ بڕوانە: السيره النبويه لإبن أبن فارس(ل ١٢٤)

٢ـ بڕوانە: رسالة الإسلام(٢ـ ٢٨)

٣ـ بڕوانە: السيره النبويه لإبن أبن فارس(ل ١٢٢)

٢ـ هاوسەرێتی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەدیجە، بە قەدەری خوای گەورەبوو، چونکە خوای گەورە هاوسەرێکی شایستەی بۆ پێغەمبەرەکەی هەڵبژارد، بۆ ئەوەی پشتگیری لێبکات و باری سووك بکات و هاوکاری بکات لە سەر هەڵگرتنی ئەرکەکانی پەیام و بژێت لەگەڵ خەم ئازارەکانی.[١]

شێخ موحەممەدی غەزالی دەفەرموێت: خەدیجە نمونەیەکی زۆر چاکە بۆ ئەو ئافرەتەی تەواو کەری ژیانی مێردێکی مەزنە، خاوەن پەیامەکان خاوەن دڵانێکی یەکجار هەستیارن، تووشی چەرمەسەری زۆریش دەبن لە ئەو دەوروبەری دەیانەوێت بیگۆڕن، ناخۆشی زۆریش دێتە ڕێگەیان لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئەو خێرو ڕۆشناییەی کە پێیانە، لە ڕاستیدا ئەوان پێویستیان هەیە بە کەسانێك کە خۆشی بخەنە دەروونیانەوە، خەدیجەش خاوەنی ئەو خەسڵەتانە بوو، بۆیە لە ژیانی پێغەمبەرﷺ کاریگەری زۆری هەبوو.[٢]

٣ـ بینیمان، کە پێغەمبەرﷺ تاڵی منداڵی چەشت، پێشتریش تاڵی باوك و دایك مردنی چەشتبوو، ویستی خوای گەورەش لە سەر ئەوەبوو، کە کوڕی نەمێنێ، بۆ ئەوەی نەبنە هۆکارێك بۆ شەیدابوونی خەڵکی پێیانەوە، یان ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکەن، جا کوڕی پێبەخشی بۆ تەواکردنی فیترەتی وەکو ئادەمیزاد، وەکو تێرکردنیکیش بۆ پێویستیەکانی دەروونی مرۆڤ، ئینجا هەر لە منداڵیەوە بردنییەوە، هەروەها بۆ ئەوەی پێغەمبەرﷺ هۆکارێك بێت بۆ ئارامگرتن بۆ ئەوانەی تر، کە خوای گەورە منداڵی پێنەبەخشیون، یان منداڵیان دەبێت، بەڵام دەمرن، هەروەها شێوەیەکیشە لە شێوەکانی بەلاو ناخۆشی، پێغەمبەرانیش لە هەموو کەسێك بەلایان سەختترە، وەکو چۆن خوای گەورە ویستبێتی ناسکی هەست بەشێك بێت لە ژیانی، چونکە ئەو پیاوانەی گەلان بەڕێوە دەبەن حەز لە جەورو ستەم ناکەن، ئەگەر دڵەکان لە سەر توندو تیژی مۆر کرابێت، یان هەمیشە لە خۆشگوزەرانییەکدا بووبێتن هیچ ناخۆشیەك لێڵی نەکردبێت، بەڵام ئەوانەی ئازارو

---

١ـ بڕوانە: السيرة لأبي شهبه(١/ ١٢٢ـ ١٢٣)

٢ـ فقه السيرة محمدالغزالي(ل٧٥)

ناڕەحتیان چەشتووە، خێراترین کەسانێکن بۆ دڵنەوایی غەمباران و سارێژکردنی برینی برینداران.[١]

٤ـ لە بەسەرهاتی پێغەمبەرﷺو خاتوو خەدیجە ئەوە دەردەکەوێت بۆ موسڵمانان، کە پێغەمبەرﷺ بایەخی نەدەدا بە هۆکارەکانی ڕابواردنی لاشەی و تەواو کەرەکانی، ئەگەر وابوایەوەکو لاوانی تر، دیارە تەماعی کچێکی دەکرد لە خۆی منداڵتر، یان کەسێك، کە هیچ نەبێت لە خۆی گەورەتر نەبێت، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ لە پێناو پلەوپایەو ڕێزی لە ناو خزمەکانی مارەی کرد، چونکە خەدیجە لە سەردەمی نەفامیدا بە داوێنپاکی پاراو دەناسرا.

٥ـ هاوسەرێتی پێغەمبەرﷺو خاتوو خەدیجە، بەڵگەیەکی بێ چەندوچۆنە لە سەر ناڕاستی زمان و پێنووسی ئەوانەی دڵیان پڕلەکینەیە بەرامبەرئیسلام، لە ڕۆژهەڵاتناس و کۆیلە عەلمانی یەکان، کە گومانیان دەبرد کەلێنێك بدۆزنەوە لە مەسەلەی ژیانی پێغەمبەرﷺ، چونکە ئەوان پێغەمبەریان وا دەرخستبوو، کە پیاوێکی وابەستەیە بە حەزو ئارەزووەکانیەوە، بەڵام ئێمە دەبینین، کە پێغەمبەری خواﷺ تاکو تەمەنی گەیشتە تەمەنی بیست و پێنج ساڵ ژنی نەهێنابوو، بێ ئەوەی ئەو هەموو دیاردە نەفامانەی دەوروبەری کاریگەرییان هەبێت لە سەری، ئینجا کاتێکیش ژنی هێنا ئافرەتێکی نزیکەی دوو بەرامبەری تەمەنی خۆی هێنا، لە گەڵیشی ژیا بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە لە هەموو ئەو شتانەی دەوروبەری، ڕێکاشی زۆربوو تاکو گەیشتە تەمەنی گەنجی و کامڵ بوون و چوە ناوپیریشەوە، ئەم هاوسەرێتیی یە بەردەوام بوو تاکو خەدیجە کۆچی دوای کرد لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا، کە لەو کاتە تەمەنی پێغەمبەرﷺگەیشتبووە پەنجا ساڵ، بێ ئەوەی لەو ماوە بیر بکاتەوە لەوەی ژنێکی تر بهێنێت، مرۆڤیش ئارەزووی و حەزی پیاوەتی زیاتر لە نێوان بیست تا پەنجا ساڵیدا دەبزوێت. بەڵام پێغەمبەری خواﷺ لەو ماوە درێژە بیری نەکردەوە ژنێکی تر بهێنێتە پاڵ خەدیجە وەکو خێزان، یان

---

١ـ فقه السيرة لمحمدالغزالي(ل ٧٨)

کەنیزەك، ئەگەر بشیویستایە بە ئاسانی دەستی دەکەوت، سەبارەت بە هاوسەرێتی پێغەمبەریشﷺ لە گەڵ خاتوو خەدیجە و دایکانی تری موسڵمانان، هەریەکێك لەوانە بەسەر هات و حیکمەت و هۆکاری خۆی بووە، هۆکارێکیشە بۆ بتەوبوونی باوەڕی موسڵمانان بە مەزنی پێغەمبەرەکەیﷺ.[1]

## دووەم بەشداریکردنی پێغەمبەرﷺلە دروستکردنی کەعبە.

کاتێك پێغەمبەرﷺ تەمەنی گەیشتە سی وپێنجساڵی، قورەیش کۆبونەوە بە مەبەستی نۆژەنکردنەوەی کەعبە، دوای ئەوەی کە توشی سوتان و لافاوێکی بەهێزبوو، تاکو ئەو کاتە هەر بەو شێوەیە بوو، کە ئیبراهیم دروستی کردبوو، بەرد لەسەر بەردبوو بێ ئەوەی قوڕی لە نێواندا هەبێت، لە بالای پیاوێك بەرزتربوو، بۆیە ویستیان بیڕوخێنن وئینجا بەرزیبکەنەوەو سابیتەی بۆ دروست بکەن، بەڵام دەترسان بیڕوخێنن و، زاتیان نەکرد، وەلیدی کوڕی موغیرە وتی: من دەست ئەکەم بە ڕوخاندنی، پاچێکی هەڵگرت و دەستی بە لێدانی کردوو دەیوت: خوایە لە ڕێگا لامان نەداوە، چاکە نەبێت هیچمان ناوێت.

لە لای هەردوو سوچەکەوە دەستکرا بە ڕوخان، ئینجا ئەو شەو چاوەڕوانیان کرد، وتیان: تەماشا دەکەین، ئەگەر ئەمشەو شتێکی بەسەرهات، وەکو خۆی دەیگەڕێنینەوە، ئەگەریش هیچی بەسەر نەیەت مانای وایە خوا ڕازی بووە لە هەموو کردارەکەمان، ئیتر وەلید دەستی کردە ڕوخاندن، خەڵکیش بە دوایدا، تا گەیشتنە هەندێ بەرد وەکو کۆپارە ووشتر یەکیان گرتووە.

ئەوان کارەکەیان دابەش کردبوو، هەر گۆشەیەك سپێردرا بوو بە هۆزێك،سەران و ریش سپیانی قورەیش بەشداریان کرد لەهەڵگرتنی بەرددا، پێغەمبەری خواﷺو عەباسی مامیشی بەشدارییان کرد لە تازەکردنەوەی کەعبەدا، هەردووکیان خەریکی بەرد گواستنەوە بوون، عەبباس بە پێغەمبەرﷺی وت: پۆشاکەکەت بخەرە سەر گەردنت با لە بەردەکان بتپارێزێت، ئەویش وایکرد و کەوتە سەر زەوی وچاوەکانی

---

١ـ فقه السيرة النبوية البوطي(ل ٥٣ـ ٥٤)

ڕوو لە ئاسمان بوون، کە ئاگای بوویەوە وتی: پۆشاکەکەم پۆشاکەکەم ئینجا خۆی داپۆشی.[١]

کاتێك گەیشتنە بەردە ڕەشەکە ناکۆکی دروست بوو لە نێوانیاندا، هەموو هۆزێك دەیان ویست خۆیان بیخەنە جێگاکەی خۆی، خەریکیش بوو شەڕ دروست بێت لە نێوانیاندا، ئەوە نەبێت، کە ئەبو ئومەییەی کوڕی موغیرە وتی: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش لە نێوان خۆتاندا ڕێککەون، کە یەکەمین کەس لە دەرگای مزگەوتەکەوە هاتە ژورێ دادوەری لە نێوانتان بکات، کاتێك لەسەر ئەوە پێکهاتن، یەکەم کەس لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە موحەممەد بووﷺ، کاتێك کە بینییان وتیان: ئەمە ئەمینە، ئێمە پێی ڕازین، کاتێك ئاگاداریان کردەوە، فەرمووی: پۆشاکێکم بۆ بهێنن، ئەوانیش هێنایان، ئینجا فەرمووی: با هەر هۆزێك گۆشەیەك لەم پۆشاکە بگرێت، ئینجا هە مووتان بەرزیبکەنەوە، ئەوانیش بەرزیان کردەوە، تاکو گەیشتە جێگاکەی خۆی و بەدەستی خۆی بەردەکەی خستە جێگایی خۆی، دوای ئەوە بەرزیی کەعبە گەیشتە هەژدە باڵ، دەرگاکەشی لە زەوی ئەوەندە بەرزکرایەوە، کە پێویستی دەکرد بە پەیژە بۆی سەرکەوی، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك نەتوانێت سەرکەوێت و بچێتە ژوورەوە، هەروەها بۆ بەر بەستکردنی چوونە ژوورەوەی ئاو بۆ ناوەوەی کەعبە، ساپیتەکەشیان لەسەر شەش کۆڵەگە دروستکرد، بەڵام ئەو پارەپاکەی قوڕەیش تەرخانیان کردبوو بەشی نەکرد، کە تەواوبێت لە سەر بنچینەی ئیسماعیل، بۆیە حیجریان لێ دەرکرد و دیوارێکی نزمیان بە دەوریدا دروست کرد، وەکو ئاماژەیەك، کە ئەمە پاشکۆی ماڵەکەیە، چونکە ئەوان مەرجیان لە سەر خۆیان کردبوو، کە خەرجی پاك نەبێت بەکار نەیەت لە دروستکردنەوەکە،نەك لە دەست کەوتی ئافرەتی داوێن پیس و فرۆشتنی سوو، یان هەرکارێکی ناڕەوای تر.[٢]

---

١ـ رواه البخاري، كتاب الحج (رقم ١٥٨٢).

٢ـ بڕوانە: وقفات تربوية(ل ٥٧) بڕوانە: رسالة الأنبياء، عمر احمد عمر(٢/ ٢٩، ٣٠)

## پەندو وانەکان:

ماڵی خوا بە درێژایی مێژوو چوار جار دروست کراوە:

یەکەم: جا ئەوەبوو کە ئیبراهیم عليه السلام هەڵسا بە دروستکردنی، بە یارمەتی ئیسماعیلی کوڕی عليه السلام.

دووەم جار: قوڕەیش پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ دروستیان کرد، خودی پێغەمبەریش بەشدار بوو لە تازەکردنەوەی.

سێ یەم جار: لەو کاتە بوو، کە ماڵی خوا سووتا بە کاریگەری تێهاوێشتنی مەنجەنیق لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە لە کاتی گەمارۆکەدا، کە حوصەینی سکونی خستبویە سەر عبداللە کوڕی زوبەیر بۆ ئەوەی خۆی بدات بە دەستەوە، بۆیە عبداللە کوڕی زوبەیر جارێکی تر دروستی کردەوە.

چوارەم جار: لە سەردەمی عبدالملیکی کوڕی مەروان بوو لە پاش کوژرانی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، بیناکەی وەکو سەردەمی پێغەمبەرﷺ دروستیکردەوە،[1] چونکەعەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دروستی کردبویەوەو ئەویش ئەو شەش باڵەشی زیاد کردبوو کە لێی دەرکرابوو، دەباڵیشی خستبویە سەر بەرزایەکەی، دوو دەرگاشی بۆ دروست کردبوو، یەکێکیان بۆ چۆنە ژوورەوەو ئەویتریشیان بۆ دەرچوون، ئەوەشی کە بوێری ئەوەی پێدا هەڵسێ بەو کارە، ئەو فەرموودەی عائیشە بوو لە پێغەمبەرﷺ، کە فەرموویەتی: ((یا عائشة، لولا أن قومك حدیث عهد بالجاهلیة لأمرت بالبیت، فهدم فأدخلت فیە ماأخرج منە، والزقتە بالأرض، وجعلت لە بابین، باباً شرقیاً، و باباً غربیاً فبلغت بە أساس إبراهیم))[2] واتە: ئەی عائیشە لە ترسی ئەوە نەبێت کەسوکارەکەت تازە لە سەردەمی نەفامی دەرچونە، فەرمانم دەکرد، کە ماڵی خوا جارێکی تر بڕو خێنرێت، ئینجا ئەوەی لێی دەرکرابوو، دەمخستەوە سەری و دەملکاند بەزەوییەوە، دوو دەرگاشم بۆ دەکرد، دەرگایەکی لە ڕۆژهەڵاتەوە یەکێکیش لە ڕۆژئاواوە دەشمگەیاندە هەمان بنچینەی ئیبراهیم.

---

١ـ فقه السیرة النبویة البوطي(ل ٥٧ـ ٥٨) و صحیح مسلم (٤٠٢ ـ١٢٢).

٢ـ البخاري، کتاب الحج (رقم ١٥٨٦)

٢ـ دەسپاکی پێغەمبەرﷺ ئەو ڕەوشتە بوو، کە قورەیشی پاراست لە کارەساتی شەڕ لەناو حەرەمدا، چونکە هەموانی ڕازیکرد، لە بەر ئەوەی ئەو کەسە ئەمین بوو، کە ستەم ناکات، لایەنگیری ناکات، خراپە ناکات، دەستپاك بوو لە سەر ماڵی خواو گیانی خەڵکی.[١]

٣ـ ڕووداوی نۆژەنکردنەوەی کەعبە، کەسایەتی و پلەو پایەی پێغەمبەریﷺ دەرخست[٢]، لەم ڕووداوەدا دوو پایەداری بنەبڕکردنی ناکۆکی و ڕاگرتنی شەڕی چاوەڕوانکراو لە نێوان تیرەکانی قورەیش، هەروەها پایەداری کێبرکێیەك، کە لە نێوان تیرەکاندا دروست بوو، بەڵام خوا بەخشی بە پێغەمبەرەکەی، ئەویش ئەوەبوو، کە بە دەستی پیرۆزی خۆی بەردەکەی خستە جێگایی خۆی.[٣]

٤ـ موسڵمان لە تازەکردنەوەی ماڵی خوا پارێزگاری تەواوی خوا دەبینێ بۆ پێغەمبەرەکەی، هەروها تێبینی ئەوە دەکات، کە چۆن خوای گەورە توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی بەخشیوە بە پێغەمبەرﷺ، بە ئاسانترین ڕێگا، ئەوەش ڕاستیەکە لە هەموو ژیاندا تێبینی دەکرێت، یەکێکیشە لە مەشخەڵانی پەیامەکەی، کە بریتی یە لە گەیاندنی ڕاستیەکان و چارەسەر کردنی کێشەکان بە ئاسانترین شێواز.[٤]

## سێ یەم: ئامادەکردنی خەڵکی بۆ پێشوازیکردنی پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ.

### ١- مژدەدانی پێغەمبەران بەهاتنی پێغەمبەرﷺ:

ویستی خوای گەورە هاتە سەر ئەوەی، کە ئامادە بکرێن بۆ پێشوازیکردن لە پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ، بە چەند مەسەلەیەك، لەوانە:

ئیبراهیمعليه السلام لە خواپاڕایەوە، کە پێغەمبەرێك لە خودی عەرەبەکانەوە بنێرێت

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن فارس(ل١٢٥)

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(١/١١٦).

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن فارس(ل ١٢٥ـ ١٢٦)

٤ـ بڕوانە: الأساس في السنة وفقها السيرة النبوية(١/ ١٧٥)

بۆیان، خوای پەروەردگاریش پارانەوەکەی وەرگرت و موحەممەدیﷺ ڕەوانەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(البقرة: ١٢٩)

لە قورئانی پیرۆزیشدا، کە خوای گەورە مژدەی دابەزاندوە بە ناردنی پێغەمبەرﷺ، لە کتێبە ئاسمانیەکان، کە دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەراندا، خوای بالادەست دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ﴾(الأعراف: ١٥٧)

عیسا عليه السلام بەهەمان شێوەی مژدەی داوە بەهاتنی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾(الصف: ٦)

خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانیشی بەهاتنی ئاگادار کردووەتەوە، فەرمانیشی پێکردوە نەتەوەکانیان ئاگادار بکەنەوە، کە پێویستە باوەڕی پێبهێنن، ئەگەر فریای هاتنی کەوتن[1]، ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ ۚ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي ۖ قَالُوا أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾(آل عمران: ٨١).

شێواندنیش لە نوسخەکانی تەورات و ئینجیلدا ڕویدا، ئەو ئامانژانەی لێ لابراوە، کە بەڕاشکاوی باسی پێغەمبەرﷺ دەکات، تەنها تەوراتی سامیرەو ئینجیلی بەرنابا نەبێت، کە لە پێش ئیسلامیشدا بونیان هەبووە، کلێساش قەدەغەی کردبوو

١ـ بڕوانە: دراسة تحليلية لشخصية الرسول محمدﷺ(ل ١٠١ـ ١٠٢)

دەستاو دەستی پێبکرد، لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی زاینی، ئەو دەست نوسانەش، کە دۆزرانەتەوە لە ناوچەی دەریای مردوو لەم دواییەدا پشتگیری لەوە دەکەن لە ئینجیلی بەڕنابا هەندێ ڕستە هاتووە بەڕاشکاوی ناوی پێغەمبەرﷺ دەهێنێ، وەکو ئەوەی لە ئیصحاحی چلێ ویەکدا هاتووە، دەقی ڕستەکەش ئەمەیە: (٢٩ فاحتجب الله وطردهما الملاك ميخائيل من الفردوس ٣٠ فلما التفت آدم رأى مكتوباً فوق الباب لا إله إلا الله محمد رسول الله)[1] واتە: خوا خۆی لێ شاردنەوەو میخائیلی فریشتە دەریانیکرد لەبەهەشت، کاتێك کە ئادەم ئاوڕی دایەوە بینی لە سەر دەرگاکەی نوسراوە(لاإله إلاالله محمدرسول الله)

ئیبنو تەیمییە دەڵێت: ئەو هەواڵانەی باس لە ئاگاداربوونی ئەهلی کتاب دەکەن لە سیفەتی پێغەمبەرﷺ لە کتێبەکاندا گەیشتوننە(تواتر) هەروەها ووتویەتی: زانینی ئەوەی، کە پێغەمبەرانی پێش موحەممەدﷺ موژدەیان داوە بەهاتنی لە چەند ڕێگەیەکەوە دەزانین:

**یەکەم: ئەوەی، کە ئیمڕۆ لە کتێبەکان ماوەتەوە، کە لە بەردەستاندایە.**

دووەم: باسکردنی ئەوانەی، کە ئەو کتێبانەیان خوێندووەتەوە، لەوانەی کە موسڵمان بوونە، یان ئەوانەی کە هێشتا گاورن، وەکو ئەوەی لە ئەنصارەکانەوە هاتووە بەڕێگەی (تواتر)، کە دراوسێکانیان لە ئەهلی کتاب باسی هاتنی پێغەمبەریانﷺ دەکرد، کە خوای گەورە ڕەوانەی دەکات، ئەوان خۆشیان هەر چاوەڕوان بوون، ئەوەش یەکێك بوو لە هۆکارەکانی موسڵمان بوونی ئەنصارەکان و بەیعەتدان بە پێغەمبەرﷺ.[2]

فەرموودەیەکمان پێگەیشتووە لە سەلەمەی کوڕی سەلامەی کوڕی وەقەشرضي الله عنه، کە یەکێك بوو لە بەشدار بوانی بەدر دەفەرموێت: دراوسێیەکمان هەبوو لە جولەکەکانی عەبدولئەشهەل، دەڵێت: ڕۆژێکیان لە ماڵەکەی خۆی دەرچوو، پێش ئەوەی موحەممەدﷺ ببێتە پێغەمبەرﷺبەماوەیەکی کەم، ئینجا هاتە ناو کۆڕی

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(١ـ١١٨)

٢ـ بڕوانە: الجواب الصحيح لإبن تيمية(١/ ٢٤٠)

عەبدولئەشهەل، سەلەمە دەڵێت: من لەو ڕۆژەدا لە هەموویان منداڵتربوون، پۆشاکێکم لەسەر شان بوو، ڕاکشابووم لەناو حەوشی ماڵەکەماندا، ئیتر ئەوانیش باسی زیندووبوونەوەو قیامەت و حیساب و ترازوو بەهەشت و دۆزەخی دەکرد، ئەو قسانەی بۆ کەسانێك دەکرد، کە بتپەرست بوون، باوەڕیشیان نەبوو بە زیندوبونەوەی پاش مردن، پێیان وت: بەڵات لێکەوێت ئەی فلانەکەس، پێت وایە، کە خەڵکی زیندوو دەکرێنەوەو دەبرێنە جێگایەك لە پاش مردنیان، یان بەهەشتە، یان دۆزەخ، پاداشتیش دەدرێنەوە بەکردەوەکانیان، وتی: بەڵێ، سوێند بەو کەسەی سوێندی پێ دەخورێت، ئاواتیش دەخوازێت لەجیاتی ئەو دۆزەخەی لەدوا ڕۆژدا تەنورێکی هەرە گەورەی ، کە دونیا بۆ گەرم بکرایە و بخرایەتە ناوییەوەو دەمەکەی لە سەر بگیرایە، بەڵام سبەینێ قوتاری بوایە لەدۆزەخ، وتیان: بەڵگەی ئەوە چی یە؟ وتی: پێغەمبەرێك لەو لاوە دێت.

وتیان: جا کەی ئەوە دەبینین؟ وتی: ئەویش تەمەشای منی کرد ـ منیش لە هەموویان منداڵتر بووك ـ ووتی: لەوانەیە ئەم منداڵە، ئەگەر بژێت فریای بکەوێت.

سەلەمە دەڵێت: سوێند بەخوا زۆری نەبرد، تاکو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی نارد، کە ئەو کابراش هێشا هەر زیندوو بووە، ئێمە باوەڕمان پێهێنا، بەڵام ئەو باوەڕی پێنەهێنا، وتمان: ئەی قوڕبەسەر، تۆ نەبووی دەربارەی ئەو قسەت بۆ دەکردین؟ وتی: بەڵێ.[1]

ئیبنو تەیمییەرحمه الله: باس دەکات و دەڵێت: من بۆ خۆم چەند نوسخەیەکی تەوراتم بینیوە بەڕاشکاوی ناوی موحەممەدﷺی تیادایەو ئاماژەی بۆ دەکات وەکو پێغەمبەرﷺ نوسخەی ترم بینی لەزەبوور ئەوەم تیا نەبینی، لەو حاڵەتیشە لە وانەیە سیفەتی پێغەمبەرﷺ لە هەندێکیانا هەبێت و لەوانی تر نەبێت.[2]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسرضي الله عنه باسی سیفەتی پێغەمبەرﷺ کردووە لە تەورات ووتویەتی: سوێند بەخوا لە تەورات وەسف کراوە بە هەندێ لەو وەسفانەی لە

---

١ـ صحيح السيرة النبوية، إبراهيم العلي(ل ٢١)

٢ـ بروانە: الجواب الصحيح لإبن تيمية(١/ ٢٤٠)

قورئاندا هاتووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾(الأحزاب: ٤٥) تۆ پارێزەری بۆ نەخوێندەوارەکان، تۆ بەندەو نێرراوی منی، ناوتم ناوە بە پشت ئەستوور بە خوای خۆت، نە گرژی نەتوندی نە دەنگ بەرز دەکەیتەوە لە بازاڕەکاندا، خراپە بە خراپە وەڵام ناداتەوە، بەڵکو دەبورێ و خۆش دەبێت، خوای گەورەش تا بیباتەوە بۆ لای خۆی تا نەتەوەی لارەی پێ ڕاست نەکاتەوە، بەوەی بڵێن: (لاإله إلا الله) چاوانێکی نابینا، گوێیانێکی کەڕ، دڵانێکی داخراوی پێ دەکاتەوە.[١]

لە فەرمودەیەکی کەعبی ئەحباریشدا هاتووە، کە وتویەتی:

من لە تەوراتدا دەبینم نووسراوە: (محمد رسول الله) نە تووڕەیەو نەتوندە، نە دەنگیش بەرز دەکاتەوە لە بازاڕەکاندا، خراپەش بە خراپ وەڵام ناداتەوە، بەڵکو دەبورێت و خۆشدەبێت، نەتەوەکەی سوپاس گوزارن، سوپاسی خوا دەکەن لە هەموو جێگایەکدا، (الله أكبر) دەکەن لەسەر هەموو بەرزاییەك، جل و بەرگیان تاکو نیوەی قاچیانە، دەستنوێژ بە ئەندامەکانیان دەگرن، ڕیزەکانی نوێژ و شەڕیان وەکو یەکە.

بانگکدەریان بانگ دەکات لە کەشتی ئاسماندا، لە ناو جەرگەی شەودا دەنگیان دێ، وەکو دەنگی مێشەنگ، لە مەککە لە دایك دەبێت و بەرەوە تابە کۆچ دەکات و موڵکی لە شامە.[٢]

**٢ـ مژدەی زانایانی ئەهلی کیتاب بە هاتنی پێغەمبەرﷺ:**

لە سەلمانی فارسی لە بەسەرهاتی بەناوبانگی موسڵمان بوونی دەگێڕێتەوە لە قەشەی عەمورییە کاتێك هاتووتە سەرەمەرگ بە سەلمانی وتووە: سەردەمی پێغەمبەرێك نزیك بووتەوە، دەنێردرێت بە ئاینی ئیبراهیم لە خاکی عەرەب سەرهەڵدەدا، کۆچیش دەکات بۆ خاکێك لە نێوان هەردوو حەڕڕەدا دارخورمایان لەنێواندایە، هەندێ نیشانەی تیادایە شاراوە نییە، لەدیاری دەخوات، بەڵام

١ـ البخاري كتاب البيوع(رقم: ٢١٢٥)، هذا لفظ كتاب البيوع، وأخرجه أيضاً في كتاب التفسير برقم: (٤٨٢٨)

٢ـ صحيح السيرة النبوية(ل: ٣)

صەدەقەش ناخوات، لە نێوان هەردووشانی مۆری پێغەمبەرایەتی هەیە، ئەگەر پێت کرا خۆتی پێ بگەیەنیت لەو وڵاتە دوا مەکەوە.[١]

دوایی سەلمان باسی هاتنی خۆی بۆکردووە بۆ مەدینە چۆن کرا بە کۆیلە، ئینجا چاوی کەوت بە پێغەمبەرﷺ لە کاتی هیجرەتدا، خواردنەکەشی داوە بەپێغەمبەرﷺ لەکاتی هیجرەتدا، خواردنەکەشی داوە بەپێغەمبەرﷺ گوایە صەدەقەیە نەیخواردووە، دوای ئەوە خواردنێکی پێداوە وەکو دیاری خواردوویەتی، ئەنجا تەمەشای مۆری پێغەمبەرایەتی کردووە لە نێو شانی پێغەمبەرﷺ، دوای ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونی.[٢]

هەروەها قەشەو پیاوانی جولەکە شایەتی نزیك بوونەوەی ڕەوانەکردنی ئەو پێغەمبەرەیان داوە بۆ نمونە بەسەرهاتی ئەبو تەیهان، کە لە وڵاتی شامەوە دەرچوو، لە لای بەنو قورەیزە لە مەدینە جێگیر بو، پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ بە دوو ساڵ کۆچی دوای کردووە، ئەو پیاوە لەکاتی سەرەمەرگا بە بەنی قورەیزەی وتووە: ئەی کۆمەڵانی جولەکە، وا دەزانن بۆچی لە خاکی مەی و خۆراکی خۆش دەرچووم بۆ خاکی بەدبەختی و برسێتی(حیجان)؟ وتیان: خۆت ئەزانیت، وتی: من هاتم بۆ ئەو شارە چاوەڕووانی سەر هەڵدانی پێغەمبەرێك دەکەم، کە کاتی هاتنی نزیکبووتەوە، ئومێدەواریش بووم، کە ڕەوانە بکراباو من شوێنی بکەوتبام.

ئەم باسەش بڵاوەی کرد لە ناو جولەکەکان و خەڵکی دیکەش، خودی جولەکەکانیش بە خەڵکی مەدینەیان دەووت: سەردەمی هاتنی پێغەمبەرێك نزیك بووەتەوە، ئەوو ئێوەش دەکوژێ وەکو کوشتنی عاد و ئیرەم،[٣] ئەم باسە بوو بە هۆکارێك بۆ موسڵمان بوونی زۆرێك لە پیاوانی ئەنصار، دەشیان وت: ئەوەی، کە وای لێکردین موسڵمان بین، پاش بەزەیی خواو ڕێنیشاندانی ئەو قسانە بوو، کە دەمان بیست لە زاری پیاوانی جوولەکە، دەڵێت: ئێمە ئەهلی هاوبەش بۆ خوا بڕیاردان، بتپەرستی، ئەوانیش هەندێ شتیان لابوو، کە لای ئێمە نەبوو، هێشتا

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن كثير(١/ ٣٠٠).

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(١ـ ١٢٢)

٣ـ بڕوانە: دراسة تحليلية، د. محمد قلعجي.

شەڕوشۆڕمان هەر لە نێوان مابوو، هەر کاتێکیش قسەیان بکردایە ئەوان دەیان وت: کاتی هاتنی پێغەمبەرێك هاتووە لەگەڵ ئەو پێکەوە دەتانکوژین.

پادشای ڕۆمیش هیرەقل کاتێ نامەکەی پێغەمبەرﷺی وەرگرت، وتی: من دەمزانی لەناو ئێوە دەردەچێت، بەڵام نەمدەزانی هەر لە خۆتانە.

**٣ـ حاڵەتی خەڵکی بەگشتی لەو سەردەمەدا:**

مامۆستا ئەبو حەسەنی نەدەوی حاڵەتی عەرەب و خەڵکی بەگشتی پوختە دەکاتەوەو دەڵێت: بارودۆخەکان ئەوەندە خراپ بوون لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی زایینیدا، کەلە توانای چاکسازو مامۆستایان گەورەتر بوون، مەسەلەکە ئەوەنەبوو بیروباوەڕێك چاکبکرێت، یان عادەتێك لابرێت، یان خواپەرستیەك ئەنجام بدرێت، یان چاکسازی لە کۆمەڵگایەکدا بکرێت، ئەگەر هەر ئەوەندە بووایە لەوانەیە مامۆستاو چاکخوازان، کە هەمیشە هەر بونیان هەبووە، هەڵسان پێی، بەڵام مەسەلەکە بریتی بوو لە لابردنی پاش ماوەی نەفامی و بتپەرستی و وێرانکاری، کەڵەکەی کردبوو بەدرێژای چەندین سەدەو نەوە، ڕێنمایی پێغەمبەرانیش شارابوویەوە لە ژێر ئەو هەموو کەڵەکەیەدا، ئینجا دروست کردنی تەلارێکی بەرزی بەرفراوان، جێگای هەموو نەتەوەکانی تیادا بێتەوە، ئەو مەسەلەی دروستکردنی مرۆڤێکی تازەبوو، جیاکار لە مرۆڤەکەی تر لە هەموو شتێکدا، وەکو چۆن تازە لە دایك بوبێت، یان تازە زیندو بووبێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(الأنعام: ١٢٢).

مەسەلەی بنەبڕکردنی میکرۆبی گەندەڵی و لە ڕەگەوەو دەرکردنی بتپەرستی بە یەکجاری و جێگیرکردنی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی لە ناخی دەرونی مرۆڤایەتیدا بەچاکترین شێوە، ئینجا ئاراستەکردنی حەزەکانی بەرەو لای ڕەزامەندی خواو خزمەتی مرۆڤ و پشتگیری کردنی ڕاستی، بە کورتی بەربەستبوون لە پێش ئەو مرۆڤایەتیەی، کە دەیویست خۆی بهاوێتە نێو دۆزەخەوە، چاکترین باسکردنیش لەم ڕاستیە قسەی خوای گەورەیە، کە دەفەرموێت: ﴿ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا

﴿وَلَا تَفَرَّقُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾(آل عمران: ١٠٢)

**٤ـ سەرەتاو دەست نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی:**

یەکێك لەوانە ئەوەبوو، بەردەکان سەلامیان لە پێغەمبەری خواﷺ دەکرد، پێش ڕەوانەکردنی لە لایەن خوای گەورەوە، لە فەرموودەی جابیری کوڕی سەمورەدا هاتووەﷺ، پێغەمبەرﷺفەموویەتی: ((إني لأعرف بمكة حجراً كانه يسلم علي قبل أن أبعث، أني لا أعرفه الان))[1] واتە: من لە مەککە شارەزای بەردێکم سڵاوی لێ دەکردم پێش ئەوەی ببم بە پێغەمبەر، ئێستاش دەیناسمەوە.

یەکێکی تریش لەو پێشەکی و نیشانانە خەونی ڕاست بوو، یەکەمین جاریش سروشی خوابەوە دەستی پێکرد، هیچ خەونێکی نەدەبینی تاکو وەکوگزنگی بەرەبەیان بەدینەهاتایە،[2] ئینجا تەنهایی بەلای پێغەمبەر ﷺ خۆشەویست بوویەوە، بۆیە بە تەنیا خەریکی خوا پەرستی بوو لە ئەشکەوتی حیرا، کە دەکەوێتە چیاکەوە لەلای باوکوری مەککەوە، چەندین شەو لەوێ دەمایەوە، جاری وابوو دەشەو، جاری بوو زیاتر، تا دەگەیشتە یەك مانگ، ئینجا دەگەڕایەوە ماڵی خۆیان لە مەککەو کەمێك دەمایەوەو دیسان خواردنی لەگەڵ خۆی دەبردو دەگەڕایەوە خەڵوەتگەکەی خۆی لە نێو ئەشکەوتەکە، بەم شێوەیە هەر بەردەوام بوو تاکو خوای گەورە وەحی بۆ نارد لە یەکێ لەو خەڵوەتانەیدا.[3]

---

١ـ مسلم في صحيحه، كتاب فضائل النبي، وتسليم الحجر عليه قبل النبوة(رقم: ٢٢٧٧)

٢ـ البخاري، كتاب بدء الوحي(رقم: ٣٠)

٣ـ فقه السيرة النبوية البوطي(ل٦٠)

# بەشی دووەم

# دابەزینی وەحیی خواو بانگەوازی نهێنی

## باسی یەکەم: دابەزینی وەحیی خوا لەسەر گەورەی هەموان موحەممەدﷺ.

پێغەمبەری خواﷺ تەمەنی گەیشتە چل ساڵ، کە بە تەنیا دەمایەوە لە ئەشەکەوتی حیرا بیری دەکردەوە لە گەردوون و خوای پەروەردگار، پەرستنەکانی لە ئەشکەوت چەندین شەوی دەخایاند، کە توێشووی تەواو دەبوو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی وتوێشووی چەند شەوێکی تری لەگەڵ خۆی دەهێنا،[1] بەڵام لە ڕۆژی دووشەمەی مانگی ڕەمەزان دا، لە ناکاو جیبریل بۆ یەکەمین جار لە نێو ئەشکەوت هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ.[2]

پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا، کەگرنترین کتێبەکانی فەرموودەیەبە ڕەهایی لە عائیشەرضي الله عنها دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی یەکەم جار وەحیی خوا بۆ پێغەمبەرﷺبە خەو بینینی ڕاست دەستی پێکرد، خەونێکی نەدەبینی تاوەکو بەرەبەیان بەدی نەهاتایە، دوای ئەوی خەڵوەتی بەلاوە دڵگیر بوو، لە ئەشکەوتی حیرا دەمایەوە بە چەندین شەو، خوای تێدا دەپەرست ، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای ماڵ و مناڵەکەی و توێشویتر بباتەوە، دیسان دەگەڕایەوە لای خەدیجە و خواردنی دەبردو دەگەڕایەوە ئەشکەوتەکە، ئیتر فریشتەکە هاتە لای، وتی: بخوێنە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ما أنا بقارئٍ)) واتە: خوێندەوار نیم فەرمووی ((فأخذني فغطني حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني، فقال:...[3]))واتە گرتمی و

---

١ـ صحيح السيرة للعلي(ل ٦٧)

٢ ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(١/ ١٢٥)

٣ـ بڕوانە: دەقی فەرمودەکە لە بوخاری کتاب بدءالوحي(رقم: ٢)

گوشیمی تاکو تەواو ناڕەحەت بووم وئینجا بەریدام و وتی بخوێنە، وتم من خوێندەوار نیم، ئینجا بەریدام، وتی: بخوێنە، وتم: خوێندەوار نیم، بۆ جاری سێیەم بەهامان شێوە وایکرد و بەریدام و وتی: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ﴾(العلق: ١ـ ٣)

پێغەمبەری خواﷺ گەڕایەوە ماڵ و دڵی لەو قسانە دەلەرزی، هاتە لای خەدیجەی کچی خوەیلید، فەرموی: دامپۆشن، دامپۆشن، ئەویش دایپۆشی تاکو هاتەوە سەرخۆی، ئیتر ڕوداوەکەی بۆ خەدیجە باسکردو وتی: من لە خۆم دەترسام شتێکم بەسەر بێت، خەدیجە فەرمووی: نەخێر، بەخوا خوای گەورە هەرگیز شەرمەزارت ناکات، تۆ پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەهێنیت ومالیش خەرج دەکەیتەسەر لاوازو نەدارەداو، نانی میوان دەدەیت و، کۆمەکی خەڵکی دەکەیت لە ڕوودانی کارەساتدا، ئینجا خەدیجە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت تاکو چوونە لای وەرەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئوسەیدی کوڕی عەبدولعوززا، کە ئامۆزای خەدیجە بوو، ئەو لەسەردەمی جاهیلیەتدا بوو بەگاور، دەشیزانی بەزمانی عیبری بنوسێت، ئیتر لە ئینجیلەوە تاکو توانای بوایە بە عیبری لێی دەنوسیەوە، کەسێکی بەساڵاچووی نابیناش بوو، خەدیجە پێی ووت: ئەی ئامۆزا، گوێ لە برازاکەت بگرە، وەرەقە پێی وت: ئەی برازاکەم چی دەبینیت؟ پێغەمبەرﷺ ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوە، وەرەقە وتی: خۆزگە زیندوو بوایەم، کە کەس و خزمەکانت دەرت دەکەن لە مەککە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: بۆ ئەوان دەریشم دەکەن؟ وتی: بەڵێ، هەرکەسێك وەکو ئەم قسانەی تۆی کردبێت دژایەتی دەکرێت، ئەگەر فریای ئەو کارەت بکەوم بەباشی پشتگیریت لێ دەکەم، بەڵام ماوەیەکی پێنەچوو وەرەقە وەفاتی کرد، وەحیش لاواز بویەوە.

## یەکەم: خەونی ڕاست.

لەفەرموودەکەی عائیشەﷺ هاتووە، کە سەرتای وەحیی بە خەونی ڕاست دەستی پێکرد، مەبەستیش ئەوەیە پێغەمبەری خواﷺ هەرخەونێکی دەبینی دڵی

پـێ دەگەشـایەوە، گیانیـشی پـێ ئاسـودە دەبـوو،[١] پێدەچـێتیش حیکمـەت لـە دەسـپێکردنی وەحیـی بەخـەون ئـەوەبێت، ئەگـەر فریـشتەکە لـەناکاو بهاتبایـە پێغەمبەرﷺتوشی ترس و پەشێوی دەبوو، نەیـدەتوانی هیـچی لێوەرگرێـت، بۆیـە ویستی خوای گەورە لەسەر ئەوەبوو سـەرەتا بـەو شـێوە بێـت، بـۆ ئـەوەی ببێتـە ڕاهـاتن و ڕاهێنانێـك بـۆی،[٢] خـەونی ڕاسـتیش بەشـێکە لـە چـل وشـەش بەشـی پێغەمبەرایەتی، وەکـو لـە فەرمودەیەکـدا هـاتووە،[٣] زانایـانیش فەرموویانـە: مـاوەی خەونی ڕاست شەش مانگ بوو، بەیەقی باسی ئەمەی کـردووە، قورئـانی پیرۆزیـش هیچی لە خەوندا دانەبەزیوە، بەڵکو هەمووی لە ئاگابوندا دابەزیوە.

خەونی ڕاست مژدەیە لە دونیادا، لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتووە، کە فەرموویـەتی: ((أيها الناس، أنه لم يبق من مبشرات النبوة الّا الرؤيا الصالحة يراها المسلم أو تـرى له)).[٤]

پێغەمبەرﷺپێش دابەزینی جبریل عليه السلام وەحیی لـە ئەشـکەوتی حـیرا، خـەونی خۆشی دەبینی، کە بە ئاگا دەبویەوە دڵی دەگەشایەوە، دەرونیشی دەکرایـەوە بـە هەموو شتێکی جوان لە ژیاندا.[٥]

ڕیوایەتەکانی ئەم فەرمودەیـە کۆکن لەسـەر ئـەوەی، کـە سـەرەتای وەحـی بـۆ پێغەمبەرﷺبەخەونی ڕاست دەستی پێکـرد، کـە دوایـی وەکـو خـۆی دەهاتـە دی، هەروەکو چۆن لە خەونەکەدا دەیبینی هیچیشی لێ لەبیر نەدەچـوو، وەکـو نـەخش لەسـەر دڵ و دەرونـی دەمایـەوە، خـاتو عائیـشەش رضي الله عنها، کـە یەکێکـە لـە زمانپاراوەکـانی عـەرەب خەونـەکانی پێغەمبـەرﷺ بەدرەچـونی گزنگـی بەرەبـەیان نـاوبردووە کاتێـك تـاریکی ڕادەماڵـێ، ئـەوەش شـوبهاندنێکی زۆر بـەهێزە، گـەورە زمانپاراوانی عەرەب ناتوانن لەوەچاکتر دەربڕینی لێبکەن.[٦]

---

١ـ بروانە: طريق النبوة والرسالة، د. حسين مؤنيس (ل: ٢١)

٢ـ بروانە: مقامات الرسولﷺ، عبدالقادر شيخ إبراهيم(ل ٥٧)

٣ـ بروانە: الرؤيا ضوابطها و تفسيرها، هشام الحمص(ل ٧)

٤ـابن ماجه،تعبير الرؤيا(رقم:٢٨٩٩)حسن الإسناد،وصححه الألباني في صحيح سنن إبن ماجة(٢١٦١ـ٢٩٦٨)

٥ـ بروانە: طريق النبوة والرسالة(ل ٢٢)

٦ـ بروانە: محمدرسول الله، لمحمدالصادق عرجون.

## دووەم: خەڵوەتی بەلاوە دڵگیربوو، بەتەنهاش لە ئەشکەوتی حیرا خەریکی خواپەرستن بوو.

پێش پێغەمبەرایەتیەکەی خەڵوەتی بەلاوە دڵگیربوو، بۆ ئەوەی دڵ و هۆش و گیانی یەکلا بێتەوە بۆ ئەوەی بەسەریدا دەدرێت لە بارەی پێغەمبەرایەتەوە، بۆیە ئەشکەوتی حیرای کرد بە پەرستگایەك بۆ ئەوەی دایبڕێت لە سەرقاڵیەکانی ژیان و تێکەڵبونی خەڵکی، وەکو کۆکردنەوەیەکیش بۆ توانا هزری وهەستە گیانی و دەرونی و زانینەکانی، دەست بەتاڵ بوون بۆ نزاو پاڕانەوە لەگەڵ دروستکەری بونەوەرو پەروەردگاری دونیا[1] ئەو ئەشکەوتەش، کە پێغەمبەرﷺ هاموشۆی دەکرد، خۆی لە خۆیدا مایەی تێڕامان و تێفکران بوو، بەولادا سەیر دەکەیت هەتا چاو بڕبکات هەرچیا دەبینی و بەدوای یەکدا دەڵێیت کڕنوشیان بردووە بۆ خوای گەورە، یان ئاسمانێکی بێ گەردی بەر فراوان، یان ئەو کەسەی کە تیایدابێت، پێدەچێت بتوانێت مەککە بەدی بکات.[2]

ئەم خەڵوەتگایە جۆرێك بوو لە ئامادەکردنی تایبەت و، پاڵاوتنی دەروون لەو پەیوندییە مادییانە، ئەمە جگە لەوەی، کە پەروەردەبونێکی خوایی بوو بەهەموو شێوەیەك، پەرستنەکەشی درودو سڵاوی خوای لێ بێت بریتی بوو لە تێڕامان لە دەسەڵاتی خوای گەورە لە ئاسمانەکان و، تەمەشاکردنی بەڵگەکانی گەردوون، کە ئاماژە دەکەن بۆ مەزنی تواناوگەورەیی دروستکردنی دەسەڵاتی و دانایی و داهێنانی خوای گەورە.[3]

بۆیە هەندێك لەوانەی بە ئەهلی (سلوك) دەناسرێن، واتە: ڕێگەی خوا گرتن و خواپەرستن، لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ئەو بەرەو خوا چونەدا، کاردەکەن بە بیرۆکەی خەڵوەت، بۆ ڕۆشناکردنەوەی دڵ و لابردنی تاریکی و دەرهێنانی لە بێئاگایی و حەزو ئارەزوەکان، یەکێك لە سونەتەکانی پێغەمبەریشﷺ سونەتی

---

١ـ هەمان سەرچاوە(١/ ٢٥٤)

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية، لأبي شهبة(١/ ٢٥٦)

٣ـ بڕوانە: محمدرسول الله، محمدالصادق عرجون(١/ ٤٦٩)

ئیعتیکافە لە ڕەمەزان[١]، کە گرنگی هەیە بۆ هەموو موسڵمانێك چی فەرمانڕەوا بێت، یان زانا و سەرکردەو بازرگان، بە مەبەستی پاکردنەوەی دڵ و دەروون لەو پیسی و خەڵەتەکانەی، کە پێوەی دەلکێن، هەروەها بۆ ئەوەش بەسەرهاتی خۆمان ڕاست بکەینەوە لە ڕۆشنایی قورئان و سوننەتداو، لێپرسینەوە لەگەڵ خۆمان بکەین پێش ئەوەی لێپرسینەوەمان لەگەڵ بکرێت.[٢]

ئەوانەش، کە خەریکی فیقهی بانگەوازن دەتوانن ماوەیەك بۆ خۆیان تەرخان بکەن بۆ پێداچونەوەی گشتی و گەڕانەوەو، تێڕامان لە ڕاستی بانگەوازکردن تا چ ڕادەیەك بەهێزە، یان لاوازە، هەروەها دۆزینەوەی خاڵەکانی شکست و زانینی ڕوداوەکان هەمووی بەچاك و خراپ.

شێخ( محمد عبدالله الدراز) دەربارەی وتەی خاتوو عائیشەﷺ((فیتحنث فیه الليالي ذوات العدد)) وتویەتی: ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە ژمارەی ئەو شەوانە نەگەیشتونەتە ئەم سەری کەم، یان ئەو سەری زۆر، تاکو ئەمڕۆش ئەو ڕێنمونیە هەر بەردەوامە، کە پێغەمبەرﷺهەر لەپێش پێغەمبەر بوونی ڕەچاوی کردوە لە ناوەڕاست گرتن لە هەموو کاروبارێکدا وەکو دروشمێك بۆ میللەتی ئیسلام، هێمایەکیشە بۆ ڕێنمونی پێغەمبەرﷺ، دوای ئەوەی، کە خوا وەکو ڕەحمەت ناردی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی.[٣]

## سێیەم: تا ئەوکاتەی ڕاستی و دڵنیایی بۆ هات لە ئەشکەوتی حیرا ئیتر فریشتەکە هات و پێی ووت بخوێنە.

ئەو ئایەتانەی لە ئەشکەوت دابەزیینە سەر پێغەمبەرﷺ، یەکەمین ئایەتەکانی قورئان بوون، کە وریایی ئەوەی تیادراوە مرۆڤ لەپارچە خوێنێکی پیس دروست بووە، لە بەخشندەیی خوای گەورەشە، کە مرۆڤی فێری ئەوشتانەکردوە، کە نایزانێت، ئینجا پایەدارو سەربەرزی کردووە بەزانست، هەروەها زانست ئەو

---

١ــ بڕوانە: الأساس في السنة و فقهها ــ السيرة النبوية سعيد حوى(١/١٩٥)

٢ــ بڕوانە: فقه السيرة للغضبان.

٣ــالمختار من كنوزالسنة(ل ١٩)ط ٢/ ١٩٧٨ دار الأنصار القاهرة.

تایبەتمەندییەبوو، کە خوای گەورە دایە مرۆڤ و فەزڵی دابەسەر فریشتەکان بەهۆیەوە، زانست جاری وا هەیە لە زەیندایە، یان لە زمان، جاری واش هەیە لە نوسیندا هەیە بە پەنجە[١]، بەم ئایەتانە سەرەتایی پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ دەستی پێکرد، لە ڕاستید ئەوە ڕووداوێکی هەرە گەورەبوو، شەهید سەیید قوتب رحمه الله، لە تەفسیرەکەیدا بە جوانی باسیکردووە، بەڵکو چەندین لایەنیشی هەر دەمێنێتەوە لەسەرووی تواناو زانینی ئێمەوە، بەڕاستی ڕووداوێکی گەورەبوو، لە ئامارەکانی و شوێنەواری لە ژیانی مرۆڤایەتی بەگشتی، ئەو ساتەش، کە ئەو ڕووداوەی لە خۆگرت مەزنترین ساتە لە مێژووی سەرزەوی هەمووی.

## بەڵام ڕاستی ئەو ڕووداوە چی یە، کە ڕوویدا؟

ڕاستیەکەی ئەوەیە، کە خوای مەزن و باڵادەست ــ بە بەخشندەیی خۆی ــ ویستی بەزەی بە مرۆڤایەتیدا بێتەوە، کە لە گۆشەیەکی بوونەوەردا کەوتبوون، لە هەموو ئەو مرۆڤایەتیەشدا تاکە کەسێکی لێیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە جێگای ڕۆشنایی ودانایی و وشەکانی خوای گەورە.[٢]

سەرەتای وەحیی ستایش بوو بۆ پێنووس و زانست و پلەوپایەی لە دروستکردنی گەلان و نەتەوەکاندا، هەندێ ئامارەی ڕوونیشی تیادایە، کە زانست یەکێکە لە تایبەتمەندیترین تایبەتیەکانی ئادەمیزاد.[٣]

لەم ڕوداوە مەزنەشدا گەورەیی و پلەو پایەی زانست ئاشکرا دەبێت، یەکەمین وشە لە پێغەمبەرایەتی دەکاتەپێغەمبەرﷺ فەرمانێکە بەخوێندنەوە: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾(العلق:١)

بەردەوام ئاینی ئیسلام هانی زانستی داوەو فەرمانی پێکردوە، پلەی هەڵگرانی بەرزدەکاتەوە، لەکەسانی تریش جیایان دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا

---

١ــ بڕوانە: تفسير إبن كثير(٤/ ٥٢٨).

٢ــ في ظلال القرآن(٦/٢٩٢٦، ٢٩٢٧)

٣ــ بڕوانە: السيرةالنبوية، لأبي شهبة(١/ ٢٦٠)

قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾(المجادلة: ١١) هەروەها خوای پەروەردگار فەمویەتی: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾(الزمر: ٩).

سەرچاوەی زانستی بەسود لە لایەن خواوەیە، چونکە هەرخۆی بە پێنوس فێری کردووە، مرۆڤیشی فێرکردووە لە هیچ نەزانین، هەرکاتێکیش مرۆڤایەتی لەو ڕێبازە لایدابێت زانستەکەشی جیا بووبێتەوە لە ڕێگای خوای گەورە، ئەو زانستەی دەبێتە بەڵایەك و هۆکارێك بۆ لە ناوبردنی.[1]

## چوارەم: ئەو نا ڕەحەتیەی تووشی پێغەمبەرﷺ بوو، هەروەها وەسفی دیاردەی وەحیی.

پێغەمبەرﷺتوشی ماندووبون وناڕەحەتی بوو کاتێك جبریل عليه السلام دەیگوشی و فشاری بۆ دەهێنا، ماوەیەکیش هەر لەو حاڵەدا مایەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴾ (المزمل: ٥) دانابیەکی گەورەش لەوەدا هەبوو ، وەکو ڕونکردنەوەی گرنگی ئەم ئاینە بەتوندی گرتنی و بایەخ پێدانی، ئاگادارکردنەوەیەکیش بوو بۆ ئومەت، کە ئەم ئاینەی پێی شادبووە، بەئاسانی نەگەیشتووە پێی.[2]

دیاردەی وەحیی دیاردەیەکی لە ئاسابەرە بۆ هەموو یاساکانی سروشت، چونکە پێغەمبەرﷺقسەی خوای گەورەی وەرگرت ــ کە قورئان بوو ــ لە ڕێگەی جبریل عليه السلام، ئا لێرەشەوە دەوترێت هیچ پەیوەندیەك نییە لە نێوان (وحي) خوای گەرەو لە نێوان(إلهام)، کە قسەی دڵ و دەروونە، یان تێڕامان و هەستکردن، کە سەرچاوەکەی ناخی مرۆڤە، بەڵکو وەحیی(وحي) شتێك بوو دەربارەی خودی

---

١ــ بڕوانە: الوحي و تبليغ الرسالة. د. يحيى اليحيى(ل ٢٤)

٢ــ هەمان سەر چاوە(ل ٣٠ـ٣١)

پێغەمبەرﷺخۆیەوە دەهات ئەرکەکەشی تەنها بریتیبوو لەکەسی وەحیی بۆهاتوو ئاگادارکردنەوەی، بەڵام ڕوونکردنەوەو ڕاڤە کردنی، ئەوە لەڕێگەی پێغەمبەرﷺ خۆیەوە دەبێت، وەکو دەردەکەوێت لە فەرمودەکانی.[١]

ڕاستەقینەیی وەحی ئەو بنەمایەیە، کە هەموو ڕاستیەکانی ئاینی لەسەر بنیات دەکرێت، بە بیروباوەڕو شەریعەت و ڕەوشت، هەر بۆیە ڕۆژهەڵاتناسەکان و مولحیدەکان لە پێش ئەوان، گرنگییان دا بە ئەم مەسەلەو

لە هەوڵی ئەوەدابوون، کە ڕەخنە بگرن و نکۆڵی بکەن لە ڕاستی وەحی بە لایتردا بیبەن و دووری بخەنەوە لە واتای خۆی، کە لە فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ وەسف کراوە، مێژوونوسەکان بۆیان گێڕاوینەتەوە، هەندێکیان دەڵێن: موحەممەدﷺ قورئان و بنەماکانی ئیسلام لە بەحیرا فێربووە، هەندێکیشان دەڵێن: موحەممەدﷺ کەسێکی تووڕەو نەخۆش بووە بە پەرکەم.[٢]

بەڵام ڕاستی ئەوەیە، کە پێغەمبەرﷺ لەوکاتەی لە ئەشکەوتی حیرابووە لە ناکاو بەچاوی خۆی جبریلی بینی پێیدەوت: بخوێنە، بۆ ئەوەی بزانێت، کە وەحی کارێکی ناوخۆیی نیە دەروون دروستی بکات، بەڵکو ئەوە وەرگرتنە بۆ ڕاستیەك لە دەرەوەی خۆیەوە، هیچ پەیوەندیەکی نییە بە دەروونەوە، هەروەها گوشینی فریشتەکە بۆموحەممەدﷺ سێ جار و لە هەموو جارێکیش پێیدەوت: بخوێنە، ئەودووپاتکردنەوە جەختە لە سەر ئەو وەرگرتنە دەرەکیە، ڕتکردنەوەیەکیشە بە توندی بۆ هەرکەسێك وابزانێت ئەو مەسەلەیە خەیاڵ و قسەی دەروونە.

پێغەمبەری خواﷺ توشی ترس و بیمێکی زۆربوو لەوەی کە بینی و بیستی، بە پەلەش گەڕایەوە بۆ ماڵ و دڵی دەلەرزی، ئەوەش وادەگەینێت، کە پێغەمبەرﷺبە پەرۆش نەبوو بۆ ئەو پەیامەی دەدرێتە سەریدا بۆ ڕاگەیاندنی.[٣]

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(١/ ١٢٩)

٢ـ فقه السيرة النبوية البوطي.

٣ـ هەمان سەر چاوە(ل ٦٤)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴾ (الشوری:٥٢ـ ٥٣).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ ۙ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾(یونس: ١٥ـ١٦)

بۆچوونی گومان بەران لەوەحی هەمووی کەوت و بەرگری نەکرد بەرامبەر ئەو فەرمودەڕاستەی کە عائیشەﷺ دەیگێڕێتەوە، دکتۆر بوطي دەربارەی ئاماژەی وەحی دەڵێت:

١ـ جیاکردنەوەی ئاشکرا لە نێوان قورئان وفەرمودەدا، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی دەکرد بە نوسینی قورئان لە ساتی دابەزینیدا، بەڵام قسەکانی خۆی نەدەنوسرا، بەڵکو هەر لە یادی هاوەڵانیدا بوو، نەک تەنها لەبەر ئەوەی، کە فەرموودەقسەیەکە لە لایەن خۆیەوەو پەیوەندی بە پێغەمبەرایەتیەوە نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی قورئان لە ڕێگەی وەحی یەوە بە هەمان وشەکانی خۆی دابەزیوە لە ڕێگەی جبریلﷺ، بەڵام فەرموودەکان واتاکانی وەحیە لە لایەن خواوە، بەڵام وشەکان و ڕێکخستنی دەربڕینەکە لە لایەن خۆیەتی، بۆیە زۆر وریابوو بۆ تێکەڵ نەبوونی قسەی خواو قسەی خۆی.

٢ـ پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری لێدەکرا دەربارەی هەندێ مەسەلە، بەڵام وەڵامی نەدەدایەوە، جاری واشبووماوەیەکی زۆری دەبرد بێدەنگیەکەی تائەوکاتەی قورئان دەربارەی دادەبەزی، یان جاری وابوو پێغەمبەرﷺ

بەشێوەیەکی دیاریکراو لەگەڵ بابەتێکدا مامەڵەی دەکرد، بەڵام ئایەتەکانی قورئان بەلایەکی تردا ئاڕاستەیان دەکرد بە شێوازێکی تر، بەڵکو جاری وابوو ئایەتەکانی قورئان گلەییشی تیادابووە لێی.

٣ــ پێغەمبەری خواﷺ نەخوێندەواربوو، ناشگونجێ کەسێکی وا لە ڕێگەی ئاشکرابوونی دەروونی ڕاستی یەکانی مێژوو بزانێت، وەکو بەسەرهاتی یوسفعليه السلام و دایکی موسا کاتێك کۆرپەکەی خۆی فڕەدایە نێو دەریاوە، بەسەرهاتی فیرعەون،: خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٨)

٤ــ ڕاستگۆیی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خەڵکی بۆماوەی چل ساڵ، بەناوبانگبوونیشی لە نێوانیاندا، ئەوە دەگەینێ، کە پێش ئەوە لەگەڵ خۆیدا ڕاستگۆ بووە، بۆیە ئەبێت سەرکەوتوو بێتە سەر هەرگومانێك بۆ چاوی، یان بۆ مێشکی دروست بووبێت دەربارەی وەحی، وەکو چۆن ئەم ئایەتەش وەڵامێك بێت بۆ ئەو قسەکردنەی لەگەڵ خۆیدا دەربارەی وەحی: ﴿فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾(يونس: ٩٤).

بۆیە لە پێغەمبەرﷺهاتووە، کە فەرموویەتی: ((لا أشك ولا أسئل))، واتە: نەگومان دەکەم و نەپرسیاریش دەکەم.

## پێنجەم: جۆرەکانی وەحی.

زانایان دەربارەی چەند جۆرێك لە جۆرەکانی وەحی قسەیان کردوە، لەوانە:

**١ــ خەونی ڕاستی:**

ئەوە سەرەتای وەحی بوو بۆ پێغەمبەرﷺ، هەرچ خەونێکی ببینایا، وەکو ڕۆژی ڕووناك بەدیدەهات، لە فەرمودەشدا هاتووە: ((رؤيا الانبياء حق))واتە:خەونی

پێغەمبەران ڕاستە، خوای گەورە دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێت: ﴿يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ﴾(الصافات: ١٠٢)

**٢ـ ئیلهام:**

واتە: فریشتەیەك قسە بخاتە سەر دڵی بێ پێغەمبەرﷺ فریشتەکە ببینێت، وەکو فەرموویەتی: ((أن روح القدس نفث في روعي))[١] واتە:جبریلعليه السلامفووی کرد بەدڵمدا، کە کەس نامرێت تاڕۆزی خۆی بەتەواوی پێنەگات، بۆیە لە خوا بترسن و بەجوانی داوا بکەن.[٢]

**٣ـ وەکو زەڕەی زنجیر:**

واتە: لە توندی و دەنگدانەوەدا، وەکو لە فەرموودەکەی عائیشەداهاتووە: حارسیشرضي الله عنه پرسیاری کرد لە پێغەمبەرﷺ چۆن وەحیت بۆ دێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((أحياناً يأتيني مثل صلصل الجرس و شواده علي فيفصم عني وقد وعيت ماقال، وأحياً يتمثل لي الملك رجلاً فيكلمني، فاعي يقول))[٣] واتە: جاروبار وەکو دەنگدانەوەی ئاسن دێت بۆم، ئەوەیان قورسە لە سەرم، کە تەواو دەبێت ئیتر تێدەگەم چی وتوە، جاری واش هەیە فریشتەکە لە شێوەی پیاوێکدا دێت و قسەم لەگەڵ دەکات ومنیش لێی تێدەگەم.

٤ـ ئەوەی خوای گەورە ڕاستەوخۆ وەحی بۆ کردووە بەبێ ئەوەی لە ڕێگەی فریشتەیکەوە بێت، وەکو چۆن خوای پەروەردگار لەگەڵ موسای کوڕی عمرانعليه السلام کردی، ئەم پلەوپایەش جێگیر بووە بۆ موسا بەدەقی قورئان، بۆ پێغەمبەری خۆمانیش هەرجێگیر بووە لە ڕووداوی ئیسراء دا.[٤]

---

١ـ حديث صحيح بشواهده(زادالمعاد١/ ٧٨) مؤسسة الرسالة

٢ـ هەمان سەرچاوە(زادالمعاد١/ ٧٩)

٣ـ البخاري بدء الوحى(رقم: ٧)

٤ـ بڕوانە: الرؤى والأحلام في النصوص الشرعية، أسامة عبدالقادر(ل ١٠٨)

٥ـ یان ئەوەی کە فریشتەکە دەبینێت لەو شێوەی کە لە سەری دروستکراوە، ئیتر خوای گەورە ئەوەی بیەوێت لە ڕێگەیەوە دەینێرێت.

٦ـ فریشتەکە وەکو پیاوێك دەهاتە لای پێغەمبەرﷺ قسەی لەگەڵ دەکرد، تاکو لێی تێدەگەیشت، لەم جۆرەیاندا، جاری وا هەبوو هاوەڵانیش دەیانبینی،[1] ئەمانە بوون، کە ئیبنو لقەیم دەربارەی جۆرەکانی وەحی باسیکردوە.

لە ڕاستیدا دابەزینی وەحی بەسەر پێغەمبەرﷺ سەرەتای سەردەمێکی نوێ بوو لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، کە ڕێگەی ونکردبوو لە تاریکی نەفامیدا.

ئینجا دابەزینی وەحیش قورس بووە لەسەر پێغەمبەرﷺ وەکو لەم فەرموودەدا دەردەکەوێت: ((لقد خشيت على نفسي)) هەروەها فەرمودەکەی عائیشە رضي الله عنها، کە باسی لەوە کردوە پێغەمبەر دڵی دەلەرزی کاتێك لە ئەشکەوت گەڕایەوە لای خەدیجە وتی: ((زملوني زملوني)) ئیتر دایپۆشی تا بەهۆشی خۆی هاتەوە، هەروەها وەکو بەڵگە لەسەر سەختی دابەزینی وەحی بەسەر پێغەمبەرﷺ.

هەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕەحمەتی خوایان لێبێ، لە عائیشە رضي الله عنها دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: من ئەوم دەبینی ـ مەبەستی پێغەمبەرﷺ ـ لە ڕۆژی زۆر ساردا وەحی لە سەر دابەزی، کە تەواو دەبوو دەمبینی ئارەق لە نێو چاوانی دهاتە خوارێ[2]، هەروەها فەرمودەکەی عوبادەی کوڕی صامت رضي الله عنه، کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خواﷺ، کەوەحی بۆدادەبەزی، تووشی نارەحتی دەبوو، ڕەنگیشی دەگۆڕا.[3]

## شەشەم: کاریگەری ئافرەتی چاك لە خزمەتکردنی بانگەوازدا.

هەڵوێستی خەدیجە لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ لە ئەشکەوتەکە، بەڵگەیە لە سەر دڵقایمی و دامەزراوی، چونکە شپرزە نەبوو بە بیستنی ئەو هەواڵە، بەڵکو بە

---

١ـ بڕوانە: زاد المعاد(١/٣٣ـ٣٤)

٢ـ البخاري، کتاب بدء الوحي(رقم:٢) مسلم کتاب الفضائل(رقم: ٢٣٣٣)

٣ـ مسلم کتاب الفضائل(رقم: ٢٣٣)

لەسەر خۆیی و ئارامیشەوە پێشوازی لێکرد، بەڵگەش ئەوەبوو، کە یەکسەرچوو بۆ لای وەرەقەی کوڕی نوفەل و مەسەلەکەی لا باسکرد.[١]

هەڵوێستی خەدیجە رضي الله عنها ئاماژەی دەکرد بە بیر بڵاوی و هۆشی ئەو، لە بەر ئەوەی هەڵسا بە ئەنجامدانی بە راوردێك لە نێوان ڕوداوەکەو ئەو کارانەی پێغەمبەرﷺ هەیبوون بەوەش گەیشت، کە کەسێك ئەوە ڕەوشتی بێت خوای گەورە پشتی بەرنادات و شەرمەزاری ناکات، بەوە وەسفی موحەممەدی مێردی کردﷺ، کە پەیوەندی خزمایەتی بە جێدەهێنێ و ئەوەش بەڵگەیە لە سەر ئامادەبوونی بۆ ئەنجامدانی چاکە بۆ خەڵکی، خزمانی مرۆڤ ئەو ئاوێنەن، کە کارەکانی خۆی تیایاندا دەبینێتەوە، جا ئەگەر ئەو کەسە سەرکەوتوو بێت لە ڕاکێشانیان بۆ لای خۆی بەکاری چاکە، ئەوە ڕاکێشانی خەڵکانی تر ئاسان تر دەبێت بۆی.[٢]

دایکی ئیماندارانرضي الله عنها بە پەلە هانای بردە بەر باوەڕە فیترییەکەی خۆی شارەزای بە یاسای خوا لە بوونەوەردا، هەروەها بە دڵنیایی تەواوی خۆی بەوەی موحەممەدﷺ خاوەنی هەندێ ڕەوشتی مەزنە، ئینجا بەوەش، کە دەیزانی دەبارەی چاودێری خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی لە چەندین هەڵوێستدا، کە پەیوەندیشی نەبوو بە پێغەمبەرایەتی یان سەرەتاو موعجیزەکانی، بەڵکو هەر لەو هەڵوێستە چاکانەی، کە لە ژیانی خاوەن چاکەو جوامێریدا ڕوودەدات.[٣]

خەدیجە دڵنیابوو لە محمدﷺ، کە ئاکارە جوانەکانی سەرکەوتنی بۆ بەدیدەهێنێت، بە هەندێ وشەی بە هێزو پێز دەربڕینی کرد لە کامڵ بوونی[٤]، خەدیجە بەوەش گەیشت، کە هەڵگری وەها ڕەوشتێك هەرگیز ڕوبەڕووی شەرمەزاری نابێتەوە، چونکە خوای گەورە لەسەر ئەو شێوازە چاکەکارە دروستی کردووە.

---

١ـ بڕوانە: التأريخ الإسلامي للحميدي(١/ ٦١)

٢ـ هەمان سەرچاوە(١/٢٠٧، ٢٠٨)

٣ـ بڕوانە: محمد رسول الله الصادق عرجون.

٤ـ هەمان سەرچاوە(١/٢٠٧ـ٢٠٨)

یاساکانی گەردونیش لە بواری کۆمەڵایەتیدا هیچ کاتێك لەسەر ئەوە نین، کە کەسێك خوای گەورە جوانی بکاتەوە بەو شێوە لە نێو بەندەکانیدا، دوایش شەرمەزاری بچێژێت، پێغەمبەریشﷺکەیشتە چڵەپۆپەی ئاکار ، هەر وەکو فیترەت خوای گەورە تیایدا دروستی کردبوو بە ئەندازەیەك، کە کەسی پیا نەگات .

بەڵام ئەوەشی بەلاوە بەس نەبوو، تاکو خۆی گەیاندە وەرەقەی ئامۆزای، ئەو زانا پایە پەرزە، کە چاوەڕوانی سەر هەڵدانی پێغەمبەری کۆتایی بوو، ئەو قسانەی وەرەقەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بە هێزکردنی پێغەمبەرﷺو دڵدامەزراندنی، چونکە ئەوە موحەممەدیﷺ ئاگادارکردەوە، کە خاوەنی نهێنی مەزنە، کە دبێتە نێردراوی خوای گەورە بۆ لای بەندەکانی،ئەمەش هۆنراوەیەکی وەرەقەیە، کە بەڵگەیە لە سەر چاوەڕوانکردنی بۆ هاتنی پێغەمبەرﷺ:

| | |
|---|---|
| لججت وكنت فى الذكري لجوجاً | لهمّ طالماً بعث النشيجا |
| ووصف من خديجة بعد وصف | فقد طال إنتظاري يا خديجا |
| ببطن المكتين على رجائى | حديثك أن أرى منه خروجاً |
| بما خبّرتنا من قول قس | من الرهبان أكره أن يعوجا[1] |
| بان محمداً سيسود فينا | ويخصم من يكون لة حجيجا |

وەرەقە باوەڕی هێنا بە پێغەمبەرﷺ و ئەویش شایەتی بە هەشتی پێدا، لە ڕیوایەتێکا هاتووە، کە حەکیم بە ئیسنادی خۆی لە عائیشە دەگێڕێتەوە رضي الله عنها ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لا تسبوا ورقة فإني رأيت لە جنة أو جنتين))[2] واتە: جنێو بە وەرەقە مەدەن، چونکە من بەهەشتێك یان دووانم بینی بۆ ئەو بوو.

هەروەها لە عائیشەوە هاتووە، کە خەدیجە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەرﷺ دەربارەی وەرەقە، ئەویش فەرموویەتی: ((قد رأيتە ورأيت عليه ثياباً بيضاً،

---

١ـ بڕوانە: محمد رسول الله لمحمد الصادق عرجون.(١/٢٣٢) .

٢ـ بڕوانە: سيرة إبن هشام (١/ ١٩١-١٩٢)

فأحسبه لو كان من أهل النار لم يكن عليه ثياب بيض)) واتە: من ئەوم بینی پۆشاکێکی سپی لەبەر بوو، پێم وایە ئەگەر دۆزەخیی بوایە پۆشاکی سپی لە بەر نەدەبوو،

هەیسەمی دەڵێت: ئەبو یەعلا ریوایەتی کردووە بە سەنەدێکی (حسن) لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە، کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ((أبصرته في بطنان الجنة وعليه السندس))[1] واتە: من وەرەقەم بینی لە ناوەڕاستی بەهەشتدا، ئاوریشمی پۆشیبوو.

بەڕاستی خەدیجە رضي الله عنها ڕۆڵی مەزنی بینی لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ، بە هۆی ئەو کەسایتیە بە هێزەی، کە هەیبوو لە کۆمەڵگادا، هەروەها بەو لێهاتوویی و توانایەی کە هەیبوو لەبواری دەرونیدا، لە سەر ڕەوشتی بەرزو بەزیی و دانایی بنیاتنرابوو، خوای گەورەش پشتیوانی پێغەمبەرەکەی بوو بۆ دۆزینەوەی ئەو ئافرەتە، چونکە خۆی پێشەنگێك بوو بۆ هەموو کەسێك بە تایبەتی بۆ ئەوانەی بانگەواز دەکەن بۆلای خوا، جا هەڵسانی خەدیجە بە ئەو ڕۆڵە مەزنە، ئاگادارکردنێکە لە خوای پەروەردگارەوە بۆ هەڵگرانی ئاڵای بانگەواز، کەچی ڕێبازێگ گونجاوە بیگرنە بەر لە بواری پەیڕەوی کردن لە پێغەمبەرﷺ، تاکو بگەنە ئەو ئامانجانەی هەوڵ دەدەن بیانگەنێ.[2]

خاتوو خەدیجە رضي الله عنها نمونەو پێشەنگێکی هەرە بەرزە بۆ خێزانی بانگخوازان، چونکە کەسی بانگخواز نابێت وەکو خەڵکانی تر بێت، چونکە ئەو خاوەن پەیامێکە، غەمی ئەوەی هەڵگرتووە، کە نەتەوەکەی گومڕا نەبێت، گەندەڵی بڵاونەبێتەوە، میللەتەکەی بە هێزتربێت، غەمی هەموو ئەو نارەحتیانەش هەڵدەگرێت، کە بە سەر موسڵمانان دێت لە سەرتاسەری دونیا، لە پیلان و ستەم و برسێتی و چەوساندنەوە، پاش هەموو ئەمانەش ئەو پێویستە ئەو کاتانە لە کاتی حەسانەوەی خۆی و ماڵ و منداڵی وەربگرێت، هەروەها پێویستی بەوە هەیە

١ـ المستدرك(٢/ ٦٠٩)، وقال: صحيح على شرط الشيخين، وأقره الذهبي.

٢ـ بڕوانە: التأريخ الإسلامي للحميدي(١/ ٦٩)

قوربانی بدات بەماڵ و کات و هەموو دونیا، ئەگەر پێویست بکات، مادام ئەو شتە لە پێناو خودایە، بۆیە پێویستی بە ئافرەتێکە گرنگی ئەو هەموو ئەرکانە بزانێت، لەگەڵ مێردەکەی ڕاوەستێت ئەو ئەرکەی لە سەر شان سووک بکاتەوە، نەک ببێت بە تەگەرەیەک لە ڕێگەی.[١]

کەواتە ئافرەتی چاک کاریگەری هەیە لەسەرخستنی بانگەواز، ئەوەش لەهەڵوێستی خەدیجەدا رضي الله عنها ڕوون بوویەوە، کاتێك لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ڕاوەستا و هەڵوێستی نواند، بێگومان ئافرەتی چاک دەتوانێ ڕۆڵی بەرچاو ببینێ لە سەرخستنی ئەرکی مێردەکەی، چونکە کاری بانگەواز گرنگترین کارێکە مرۆڤەکان پێی هەڵسن، جا ئەگەر خوای گەورە یارمەتی بانگخوازێکی ڕێگای ئیسلام بدات بە خێزانێکی باش و کارامە، ئەوە نیشانەی سەرکەوتنێتی لە کارەکانیدا،[٢] ڕاستیشی کردووە پێغەمبەری خوا کاتێك فەرموویەتی: ((الدنيا متاع، و خير متاع الدنيا المرأة الصالحة))[٣] واتە: دنیا ڕابواردنە چاکترین ڕابواردنەکانیش ئافرەتێکی چاکە.

## حەوتەم: بە ئەمەك بوونی پێغەمبەرﷺ بەرامبەر خاتوو خەدیجە رضي الله عنها

پێغەری خواﷺ نمونەیەکی زۆر بەرز بوو بۆ ئەمەك و گێڕانەوەی چاکە، چونکە زۆر بە ئەمەك بو بەرامبەر ئەم خێزانە دڵسۆزەی لە ژیانیداو لە پاش کۆچی دوایشی، مژدەی پێدا بە ماڵێك لە ناو بەهەشتدا، سڵاوی خوای گەورەشی پێگەیاند، لەگەڵ سڵاوی جبریل عليه السلام، لە ئەبو هورەیرەوە رضي الله عنه فەرموویەتی: جبریل هاتە لای پێغەمبەرﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە خەدیجەیە ئێستا دێتە لات قاپێکی پێیە، خواردنێك، یان خواردنەوەیەکی تیایە، جا کە گەیشتە لات، سڵاوی خوای گەورەو سڵاوی منیشی پێبگەیەنە، مژدەشی پێبدە بە ماڵێك لە بەهەشتدا لە مرواری دروستکراوە، نە هەراو هوریاو[٤] نە ماندوویەتی تیایە.

---

١ـ بڕوانە: وقفات تربوية مع السيرة النبوية للبلالي(ل ٤)
٢ـ بڕوانە: التأريخ الإسلامي للحميدي(١/ ٦٨)
٣ـ رواه مسلم كتاب الرضاع(رقم: ١٤٦٧ل١٠٩٠)
٤ـ مسلم كتاب فضائل الصحابة(ل ١١٨٨٧رقم: ٢٤٣٢)

هەروەها عائیشە رضي الله عنها باسی ئەمەکی پێغەمبەرﷺ دەکات بۆ خەدیجە پاش مردنی و دەڵێت: جارۆغیرەم بەرامبەر هیچ کام لە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ نەبوو، ئەوەندەی کە هەمبوو بەرامبەر خەدیجە، خۆ من ئەویشم نەدیبوو، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ زۆرجار باسی ئەوی دەکرد، جاری واش بوو مەڕێکی سەردەبڕی و بەش بەشی دەکردە سەر هاوڕێکانی خەدیجە، جاری وابوو منیش پێم دەووت: دەڵێی ئافرەتی تر لە دونیادا نە بوو خەدیجە نەبێت؟ ئەویش دەیفەرموو: ((إنها كانت وكانت، وكان لي منها ولد))[1] واتە: خەدیجە ئاوهاو ئاوهابوو، منداڵیشم لێی بوو.

کاتێك خوشکەکەی خەدیجە هاتە لای و خەدیجەی وەبیری هێنایەوە، بەڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لێکرد، عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: هالەی کچی خوەیلیدی خوشکی خەدیجە داوای ڕێگە پێدانی کرد بچێتە لای پێغەمبەرﷺ ئیتر بە دەنگی و شێوەی قسەکردنی خەدیجەی هاتەوەیاد، بەوە دڵ خۆش بوو، وتی: یاخوا هالەی کچی خوەلید بێت، منیش(واتە: عائیشە) پێم ناخۆش بوو، وتم: بۆچی وا یادی پیرەژنێك لە پیرەژنەکانی قوڕەیش دەکەیت ددانی لە دەمدا نەمابوو، ئەو مردو خوای گەورە لەو چاکتری پێدای[2]، جارێکیش ڕێزی نواند بۆ ئافرەتێك، کە پێشتر لە کاتی خەدیجە دا سەردانی دەکردن و ئەوەی ڕوونکردەوە، کە پاراستنی بەڵێن لە ئیمانەوەیە.[3]

## هەشتەم: بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران

(ياليتني فيها جذعا، ليتني أكون حياً إذ يخرجك قومك قال رسول اللهﷺ: أومخرجي هم؟ قال: نعم، لم يأت رجل قط بمثل ماجئت به إلا عودي، وإن يدركني يومك أنصرك نصراً مؤزراً).[4]

---

١ـ البخاري، (٣٨١٦)ومسلم (٢٤٣٥)

٢ـ مسلم كتاب فضائل الصحابة(١٨٨٩رقم: ٢٤٣٧).

٣ـ بڕوانە: التأريخ الإسلامي للحميدي(١/ ٧١)

٤ـ البخاري، كتاب بدء الوحي(ح:٢) واللفظ له مسلم كتاب الايمان(رقم: ٢/١٩٧ـ ٢٠٤)ح (٢٥٢ـ ١٦٠)

ئەم فەرموودە باسی سوننەتێك لە سوننەکانی نەتەوەکان دەکات لەگەڵ پێغەمبەرانیان کاتێك بانگکراون بۆ لای خوا، ئەویش بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرانیان بووە، وەکو خوای گەورە باسی قەومی(لوط) دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾(النمل: ٥٦)

هەروەها دەربارەی قەومی شوعەیب فەرموویەتی:﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ﴾(الأعراف:٨٨)

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (إبرهيم: ١٣).

## نۆیەم: (وفترالوحي) خاوبوونەوەی وەحیی.

زانایانی سیرە لە کۆن و هاوچەرخەکاندا باسیان کردوە لەم مەسەلە، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی فەرموویەتی: مەبەست ئەوەیە، کە ماوەیەکی دیاری کراو وەحیی دوا کەوت، ئەوەش بۆ ئەوە بوو کاریگەرییەی پێغەمبەرﷺ لە بینینی جبریل بەسەریدا هات لابچێت، هەروەها بۆ ئەوەی پەرۆشی پەیدا بکات بۆ گەڕانەوەی.[1] لە جابیرەوەرضي الله عنه هاتووە، کە باسی ئەو ماوە دەکات و دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواﷺ، کە فەرموویەتی: ((بينا أنا أمشي، إذ سمعت صوتاً من السماء فرفعت بصري، فإذا الملك الذي جاءني بحراء جالس على كرسي بين السماء والأرض، فرعبت منه، فرجعت فقلت: زملوني زملوني، فأنزل الله تعلى﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ﴾((المدثر:١ـ٥ ))

---

١ـ فتح الباري(١/ ٢٦)

مخمي الوحي وتتابع[١] واتە: لەكاتێكدا ڕێمدەكرد، دەنگێكم بیست لەنێوان ئاسمان و زەویدا، منیش زۆر لێی ترسام و گەڕامەوە ماڵ وتم: دامبپۆشن، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ﴾(المدثر:١ـ٥ ) لە دوای ئەوە دابەزینی وحی خێرابوویەوە.

(صفی الرحمن المبارك الفوري) دەڵێت: سەبارەت بەو ماوەی، كە وەحی دانەدەبەزی، زانایان هەندێ جیاوازیان لە نێوان نداهەیە، بۆچوونی پەسەندیش ئەوەیەكە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بووە، ڕیوایەتیش لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە ئەو واتایە دەگەیەنێ ، بەڵام ئەو بۆچوونەی كە دەڵێت: دووساڵ و نیو یان سێ ساڵی خایاندووە ئەوە ڕاست نیە،[٢] سەبارەت بەو هەواڵانەش، كە باسی خەم و خەفەتی پێغەمبەرﷺدەكات، كە ویستوویەتی لە چیا بەرزەكانەوە خۆی بخاتە خوارەوە، بەڵام جارێك جبریل خۆی پێ پیشان داوە و مژدەی پێداوە، كە ئەو پێغەمبەری خوایە، ئەو هەواڵانە لاوازن، هەروەها نەگونجاویشن لەگەڵ پارێزراوی پێغەمبەر[٣]ﷺ.[٤]

---

١ـ البخاري، كتاب بدء الوحي(رقم:٤)

٢ـ بڕوانە: الرحيق المختوم(ل ٧٩ــ ٨٠)

٣ـ بڕوانە: الروض الأنف للسهيلي(٢/ ٤٢٢ـ ٤٣٤)

٤ـ لە سەر ڕۆیشتن: ئەو هەواڵانە كە باس كراوە دەربارەی پەژارەی پێغەمبەرﷺ گوایە ویستویەتی خۆی بخاتە خوارەوە لە چیا بەرزەكانەوە دەكرێت بگەڕێیتەوە بۆ( فتح الباري) بۆ نموونە(ج١/ ٢٧، ج ١٢ـ٣٥٢، ٢٥٩، ٣٦١) هەروەها بۆ ئەو باسكردنەی مامۆستای زانا(: الصادق عرجون) لە كتێبەكەیدا(محمد رسول اللهﷺ) ج١/ ٣٨٥ـ ٤٥٨ بۆ ئەوەی ئاگادار بیت لەو ڕاو بۆچونە چاكانە، كە مەبەستی تەنها گەیشتنە بەوەی، كە ڕێكە لەگەڵ مەزنی ئەم ئایینەو ڕوكنە بە هێزەكانی، ڕەحمەتی خوا لە زانایان و پێشەوایانی ئەم ئایینە(پێداچوەوە)

## باسی دووەم: بانگەوازی نهێنی.

### یەکەم: فەرمانی خوایی بە گەیاندنی پەیام.

پێغەمبەرﷺ تەواو دڵنیابوو لەوەی، کە بوو بە پێغەمبەر بۆخوای بە بەزەیی و بەخشندە، جبریلیش بۆ جاری دووەم هاتەوە لای، خوای گەورەش ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤﴾المدثر:١ـ٤)

ئەم ئایەتانە ئاگادارکردنەوە بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ڕابردوو تەواوبوو، ئەو ئێستا کارێکی مەزنی لە پێشە، پێویستی بەوریایی و قووڵ هەڵماڵین و ئاگادارکردنەوەیە، پێویستە پەیامەکەی هەڵبگرێت و خەڵکی ڕێنموونی بکات و، دڵ بە وەحی خوا خۆش بکات و بە هێزبێت لەسەر نارەحەتیەکانی، چونکە ئەوە سەرچاوەی پەیامەکەی ویارمەتیدەری بانگەوازەکەیەتی.[١]
ئەم ئایەتانە بە یەکەمین فەرمان دەژمێردرێن بۆ گەیاندنی بانگەوازو هەڵسان بە ئەرکەکان، ئەم ئایەتانەش ئاماژەیان تیا بوو بۆ چەند مەسەلەیەك، کە پوختەی بانگەوازی پێغەمبەرو ڕاستیە ئیسلامییەکان و، نەهێشتنی خراپیە لە سەر کۆمەڵ و بە دەستهێنانی سوودو بەرژەوەندی تیابوو.[٢]
ئەم ئایەتانە وروژاندنێك بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ، بۆ ئەوەی هەڵسێت بە هەموو ئەو ئەرکانەی پێی سپێردراوە، هەروەها بۆ ئەوەی ئیتر گوێ نەدات بە تەگەرەو بەربەست، ئەم بانگە نەرم نیانانە﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ﴾ ئەی داپۆشرراو، بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێك بۆ بەرزکردنەوەی هیممەت، ماڵئاوایی لە خەوو حەسانەوە بکات، ئینجا لە پاش ئەوە فەرمانی توند بە هەڵسان﴿قُمۡ﴾ بە توانایەکی ڕاپەڕیو، هێزو وزەیەکیش کە ببزوێت ڕوەو بەدیهێنانی ئەرکەکانی گەیاندن، ئەویش کە فەرمانەکە بۆ تەنها کەسێك هاتووە لە یەکەمین گوتاری دا دوای ڕاوەستانی وەحی، ئاگادارییەك بوو،

---

١ـ بڕوانە: فقه السيرة للغزالي(ل ٩٠)

٢ـ بڕوانە: دولة الرسول من التكوين إلى التمكين، (د.كامل سلامة ل ١٨١)

کە ئەم ئاینە پشت دەبەستێت بە خەباتی دوورو درێژو کۆششی تاڵ، دوای ئەوە ئایەتەکان توندتر بوونەوە لە بەهێزکردنی پێغەمبەر ﷺو دڵبەهێزکردنی، بەمەبەستی بەردەوام بوونی لە سەر ڕێگایی ئیسلام گەیاندنی، بۆ ئەوەی گوێ نەدات بە هیچ کۆسپێك، کە ڕێی لێدەگرێت، بۆیە خوا پێی فەرموو: ﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾واتە: هیچ شتێکی بەندەکانت بەلاوە مەزن و ترسناك نەبێت خوای خۆت نەبێت، ئەو کەسەی کە تۆی لە ئەستۆ گرتووە پێش ئەوەی لە دایك ببێت، پەروەردشتی کردووە بەچاکەو فەزڵی خۆی، تا ئەو کاتەی تۆی کرد بە پێغەمبەرو ڕەوانەکراو، پاش ئەوەی کە ئامادەی کرد لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ هەڵگرتنی ئەو بارە﴿وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾ هەموو مەزن ڕاگرتنێك مافی خوایە، کەسیشی لەگەڵی هاوبەش نییە[1]

دوای ئەوە دەفەرموێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ وەکو چۆن بە پێغەمبەر ﷺوترابێت، تۆ سەرەڕای پاراویت، خۆپاراوکردنەوەت بە فیترەتت، بەوەی کە خوای گەورەتیاتدا دروستی کردوە لە ڕەوشتی جوان و ئەو ئاکارانەی کە بە تایبەت پێی داوی بۆ ئەم ڕۆژە، سەرەڕای هەموو ئەوەش هەر داوای لێکردووی دەروونی خۆت پاراو بکەیتەوە، بۆ ئەوەی هێندەی تر پاراوتر ببێتەوە، لە ژیانی ڕۆژانەنتدا لەگەڵ خەڵکی دا، تۆ ئەمڕۆ پێغەمبەری خوای بۆ هەموو جیهان، تەواوبوونی پەیامیش لە تەواو بوونی ئاکاری کۆمەلایەتیدایە لە ڕووی ئارامی ولە سەرخۆیی ولێبوردەیی و چاکەکردن و لێبراوی، لەگەڵ گەیاندنی بانگەواز بۆلای خوا، هیچ ئازارێکیش ساردت نەکاتەوە، هیچ بەلایەکی سەختیش کۆڵت پێنەدات لە ڕۆیشتنت بەرەو ئامانجت.[2]

دوای ئەوەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾ وەکو چۆن پێغەمبەرﷺبلێت: بامەبەستت لە وازهێنان لەوەی وازت لێهێناوە فیترەت و سروشت بێت،با تۆ پێشەنگێك بیت بۆ ئوممەتەکەت، ناونیشانێکیش بیت بۆ پاکبوونەوایان لە ڕێگەی پەیامەکەت.[3]

---

١ـ بروانە: محمد رسول اللهﷺ الصادق عرجون(١/٥٨٩، ٥٩١، ٥٩٠) بەدەستکاری زۆرەوە.

٢ـ هەمان سەرچاوە(١/٥٩٢، ٥٩٣) بەدەستکاری زۆرەوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە(١/٥٩٢، ٥٩٣) بەدەستکاری زۆرەوە.

## دووەم: دەستپێکردنی بانگەوازی نهێنی.

دوای دابەزینی ئایەتەکانی سورەتی﴿ٱلۡمُدَّثِّرُ﴾ پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە بانگەواز کردن بۆ ئیسلام بە شێوەیەکی نهێنی، بێگومان لە خێزان و هاوڕێ نزیکەکانی یەوە دەستی پێکرد.

**١ــ موسڵمان بوونی خاتوو خەدیجە رضي الله عنها.**

یەکەم کەس لە ئافرەتان باوەڕی هێنا بە پێغەمبەر ﷺ خەدیجە بوو، بەڵکو یەکەمین کەسە لە ئیمانداران بەڕەهایی ڕەزای خوای لێبێت .

یەکەم کەس بوو گوێ بیستی وەحی بوو لەزاری پێغەمبەرﷺ و، یەکەم کەسیش بوو، کە قورئانی خوێندەوە و یەکەم کەس بوو فێری نوێژبوو، چونکە ماڵەکەی یەکەمین ماڵ بوو قورئانی تیا خوێندرایەوە، دوای ئەوەی دابەزیەسەر پێغەمبەرﷺ لە ئەشکەوتی حیرا.[١]

یەکەمین شت خوای گەورە فەرزی کرد لە پاش دانپیانانی یەکخواپەرستی، ئەنجامدانی نوێژ بوو، هەندێ ڕیوایەتیش هاتووە باس لەوە دەکات پێغەمبەر ﷺ خەدیجەی خێزانی فێری دەستنوێژو نوێژ کردووە، ئەوکاتەی فەرزکرایە سەر پێغەمبەر ﷺ، جبریل هاتە لای لەو کاتەی کە لە سەرووی مەککەوە بوو لە لای دۆڵەکەوە، ئیتر کانییەك هەڵقولا، جبریل دەستنوێژی گرت، پێغەمبەریش ﷺ تەماشای دەکرد، دوای ئەو پێغەمبەریش ﷺ دەستونێژی گرت وەکو جبریل، دوای ئەوە جبریل هەڵسا نوێژی کرد، پێغەمبەریش ﷺ بە نوێژەکەی ئەو نوێژی کرد، دوایی جبریل ڕۆیشت و پێغەمبەر ﷺ گەرایەوە و دەست نوێژی گرت بۆ ئەوەی خەدیجە فێربێت و دواتر نوێژی کرد بە هەمان مەبەست.[٢]

---

١ــ بڕوانە: المرأة في العهد النبوي، د.عصمت الدين كركر(٢٦)

٢ــ بڕوانە: إبن إهشام(١/٢٤٤)، من معين السيرة، صالح الشامي(ل ٤١)

**٢ـ موسڵمان بوونی علی کوڕی ئەبی تالیبؓ:**

لە پاش موسڵمان بوونی خاتوو خەدیجە عەلی کوڕی ئەبو تالیب موسڵمان بوو، ئەوە یەکەمین کەس بوولە منداڵان، کە ئیمانی هێنا، ئەو کاتە عەلی تەمەنی دە ساڵان بوو، لە سەرپەسەندترین بۆچوونەکان، کە ئەوە بۆچوونی ئیبنو ئیسحاقە[١]، خوای گەورەش نیعمەتی خۆی بەسەریدا ڕشت کاتێك لە ماڵی پێغەمبەرﷺ پەروەردە بوو پێش ئیسلام، چونکە پێغەمبەر ﷺلەمامی وەرگرتبو و خستبوویە لای خۆی، عەلیؓ سێ یەمین کەس بوو نوێژی کرد لە پاش پێغەمبەر ﷺ وپاش خەدیجە ؓ.[٢]

هەندێ لە زانایانیش باسیان کردووە،کە کاتێك کاتی نوێژ دەهات پێغەمبەرﷺ دەرئەچوو بۆ ڕیگوزاری نێو شاخەکان بۆ نوێژ کردن، لە گەڵ علی کوڕی ئەبو تالیب بێ ئاگاداری باوکی و مامەکانی و خەڵکانی تر، ئیتر لەوێ نوێژەکانیان دەکرد، کە دەبووە ئێوارە دەگەڕانەوە بۆ ئەو ماڵە پڕ لە ئیمان و ڕاستی و ئەمەکە.[٣]

**٣ـ موسڵمان بوونی زەیدی کوڕی حاریسەؓ:**

یەکەمین کەس بوو موسڵمان بوو لە مەوالیەکان، واتە: کۆیلە ئازاد کراوەکان،خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بوو، کردبووشی بە کوڕی خۆی، ناوی زەیدی کوڕی حاریسەی کەلبیە، کاتێك کەس و کاری هاتن بۆ ئەوەی بیکڕن و بیبەنەوە بۆلای خۆیان, پێغەمبەرﷺئەوی سەرپشك کردلە هەڵبژاردن لەنێوان خۆیوئەواندا,زەیدی کوڕی حاریس ووتی: تۆ بۆ من لە جێگەی باوك و دایك و مامەی، لەو کاتەدا باوکی و مامەی وتیان: بەڵات لێکەوێت کۆیلایەتی هەڵدەبژێریتە سەر ئازادیداو، بەسەر باوك و مامەو کەس کارتدا؟ وتی: بەڵێ، من شتی وام لەم پیاوە بینیوە بەخوا کەس بەسەر ئەودا هەڵنابژێرم.[٤]

---

١ـ السيرة النبوية لأبي شهبة(٢٨٤/١)

٢ـ إبن إهشام(٢٨٤/١)

٣ـ عيون الأثر، إبن سيد الناس(١/ ١١٥)

٤ـ بڕوانە: المرأة في العهد النبوي، د.عصمت الدين (٤٢)

٤ـ موسڵمان بوونی کچەکانی پێغەمبەرﷺ :

بەهەمان شێوە کچەکانی پێغەمبەرﷺ هەر یەك لە زەینەب و ئوممو کولسوم و فاتیمە و روقەییە هەموویان موسڵمان بوون، چونکە ئەوان پێش پێغەمبەرایەتی لە ژێر کاریگەری ڕەوشتە جوانەکانی باوکیاندا بوون، لە ڕێك وپێکی و خۆ بەدوور گرتن لەخراپەکانی سەردەمی جاهیلی، وەکو بتپەرستن و گوناهەکانی تر، هەروەها کاریگەری دایکیشیان لە سەربوو، بۆیە هەر زوو ئیمانیان هێنا[١]، بەم شێوەیەش ماڵی پێغەمبەر ﷺ بوو بە یەکەمین ماڵێك ئیمانی بە خوای گەورە هێناو، پابەندی فەرمانەکانی خوا بوون، ئەم خێزانە لە ئیسلام دا خاوەنی پلەوپایەی گەورەیە، بە هۆی ئەو هەموو ئاکارو خەسڵەتانەی پێیان بەخشراوە، هەروەها بە هۆی ئەوەی یەکەمین خێزان بوو باوەڕیان هێناو قورئانیان خوێندو نوێژیان کرد، یەکەمین خێزانیش بوون،کە سێ پێشکەوتوەکانی ئیسلامیان تیا کۆبویەوە، خەدیجەو علی و زەیدی کوری حاریسە، یەکەمین خێزانیش، کە بەلێنی پشتگیریان داو هەرگیز کەسێکیان ــ گەورەو بچوك ــ سستیان نەنواند بەرامبەر پاڵپشتی کردن لە بانگەوازی ئیسلامی،[٢] جێگای خۆیەتی ئەو خێزانە ببنە پێشەنگ، هەروەها ئەو دایکەش ببێتە نمونەیەکی زیندوو بۆ ماڵە موسڵمانەکان بە ژن و پیاوەوە، چونکە کەسێکی باوەڕ پتەو و دڵسۆزو ڕاستگۆ ودەستپاك بوو، ئەو ئامۆزایەش کە لە ئەستۆ گیرابوو، هاودەنگ و پاڵپشت و هاوڕێ بوو، ئەوکەسەش کرابوو بە کوڕی ئەو ماڵە ئیماندار و ڕاستگۆ و یارمەتیدەر بوو، کچەکانیش باوەڕدارو بەدەنگەوە هاتووی گوێڕایەڵ بوون.[٣]

ڕاستییەکی دیار هەیە لە ڕێبازی خوای گەورە ئاماژە دەکات بۆ گرنگی دروستکردنی تاکی باش و خێزانی باش، وەکو یەکەمین ئەڵقەکانی چاکسازی و بنیاتنان، دواتر کۆمەڵگای باش، بایەخدانی ئیسلام بەتاکی موسڵمان بە ئاشکرا

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة(١/٢٨٤)

٢ـ بڕوانە: المرأة في العهد النبوي، د.عصمت الدين (٤٢)

٣ـ بڕوانە: المرأة في العهد النبوي، د.عصمت الدين (٤٥)

دیارە، کە پێویستە بکەوێتە پێش هەموو کارێکی تر، چونکە تاکی موسڵمان بەردی بناغەیە لە هەموو بنیاتێکی کۆمەڵایەتیدا، بۆیە خێزانی موسڵمان، کە پێشوازی تاك دەکات هەر لە کاتی لە دایك بوونەوە، بەردەوامیش دەبێت لەگەڵی بۆ ماوەیەکی درێژ لە ژیاندا، بەڵکو تاکۆتایی ژیانی، هەر ئەوە ئەو باوەشەیە، کە نیشانەکانی کەسایەتی و تایبەتمەندیەکان و خەسڵەتەکانی دیاری دەکات، هەروەها خێزان هۆکارە لە نێوان تاك و کۆمەڵدا، جا ئەگەر ئەم هۆکارە ساغ و سەلامەت بێت، یارمەتی هەردوولا دەدات بە هەمان ئەو هێزو سەلامەتیە.[١]

بۆیە ئیسلام بایەخی داوە بە خێزان و ڕووی تێکردووە، ئەو بنچینانەی بۆ دائەمەزرێنی، کە دروست بون و گەشەکردن و ئاراستەکردنی بەرەوچاکە دابین دەکات، بۆ ئەوەی ببێت بە خشتێکی بە هێز لە دروستکردنی کۆمەڵگای موسڵمان و دەوڵەتی ئیسلامی، کە هەوڵدەدات شارستانیەتی خوایەتی دروست بکات لە دونیای خەڵکیدا.[٢]

**٥ـ موسڵمان بوونی ئەبو بەکرؓ:**

ئەبو بەکرؓ یەکەمین کەس بوو، کە موسڵمان بوو لە نێو پیاوە ئازادەکان و خەڵکە خاوەن پلەوپایەکاندا، ئەو نزیکترین هاوەڵی پێغەمبەربووﷺ پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی فەرموویەتی: ((ما دعوت أحداً إلى الإسلام، إلا كانت عنده كبوة، و تردد ونظر، إلا أبا بكر، ما عكم حين دعوته، ولا تردد فيه))[٣] واتە بانگی هەرکەسێکم کردبێت بۆ ئیسلام، بیرکردنەوەیەك، یان دوو دڵیەکی تیابووە، تەنها ئەبو بەکر نەبێت هیچی پێ نەچوو، کە بانگم کرد، بێ هیچ دوو دڵیەك موسڵمان بوو.

کەواتە ئەبو بەکر هاوەڵی پێغەمبەرەﷺ، چاکەیەکیشە لە چاکەکانی، موسڵمان بوونی ئەبو بەکر وەکو موسڵمان بوونی تەنها پیاوێك نەبوو، بەڵکو وەکوچۆن

---

١ـ بڕوانە: دولة الرسول من التكوين إلى التمكين، د. كامل سلامة(ل ٢٨٤)

٢ـ هەمان سەرچاوە(ل ٢٠٨)

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة(١/٢٨٤)

ئوممەتێك موسڵمان بوبێت، وەکو ئیبنو ئیسحاق دەگێڕێتەوە:

ئەبو بەکر پیاوێکی ڕوح سووك وخۆشەویست بوو بۆ خەڵکی، ڕەچەڵکناس و شارەزابوو لە هەموو چاکەوخراپەی هۆزی قورەیش،بازرگان و خاوەن ئاکاری جوان و بەرزبوو، خەڵکی زۆرجار دەهاتنە لای بۆ ئیش و کار، چونکە زاناو بازرگان و قەسە خۆش بوو.[١]

ئەبو بەکر بەڕاستی گەنجینەیەك بوو، خوای گەورە هەڵیگرتبوو بۆ پێغەمبەرەکەی، خۆشەویسترین کەسیش بوو بەلای قورەیشەوە، ئەو ڕەوشتە بەرزەی خوای گەورە پێی بەخشیبوو، وایکردبوو، کە خەڵکی خۆشیان بوێت، ڕەوشتی جوانیش بەسە بۆ ڕاکێشانی دڵەکان، هەر ئەبو بەکریشە، کە پێغەمبەرﷺدەربارەی فەرموویەتی: ((أرحم أمتي بأمتي أبو بكر))واتە: بە بەزەیی ترین کەس لە ئومەتەکەمدا بە ئومەتەکەم ئەبو بەکرە.[٢]

ڕەچەڵەکناسی و زانستی مێژوو بەلای عەرەبەوە گرنگترین زانستەکان بوو، ئەبوو بەکریش پشکی باشی هەبوو لەو دوو زانستەدا، قورەیش دانیان بەوە دەنا، کە ئەبو بەکر لە هەموویان شارەزاترە لە نەسەب ناسیدا، هەروەها لە زانینی بەسەرهاتەکاندا، چینە ڕۆشنبیرەکان هاتوچۆی کۆڕی ئەبو بەکریان دەکرد بۆ سوود وەرگرتن لە زانستی فراوانی، بۆیە لاوە وریاکان و گەنجە زیرەکەکان سەردانیان دەکرد بە بەردەوامی، ئەوان بژاردەی خاوەن هزرو ڕۆشنبیری بوون، کە دەیان ویست سودمەند بن لە زانستەکانی، هەروەها چینی بازرگان و خاوەن پارەکان لە مەککە ئەوانیش هەر ئامادەییان هەبوو لە کۆڕی ئەبو بەکردا، چونکە ئەگەر یەکەمین بازرگان نەبێت، ئەوایەکێکە لە بەناوبانگترینیان، بۆیە خاوەن بەرژەوندیەکان بەسەریاندەکردەوە، ئینجا ئەبو بەکر میوانداریێتی چاکی بۆ دەکردن، دڵخۆشیش دەبو بە هاتینان، پوختەی قسە ئەوەیە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا لە مەککە بەشێکیان هەبوو لەلای ئەبو بەکر[٣]ؓ، چونکە

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية: إبن هشام(١/٣٧١)

٢ـ الالباني: صحيح الجامع الصغير(جـ١/ ٢٠٨، و رقم: ٩٠٨)

٣ـ التربية القيادية للغضبان(١/ ١١٥)

توانایەکی چاکی هەبوو لەبواری زانستی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای مەزنی مەککە، بۆیە کاتێك دەستی کرد بە جوڵان لە پێناو بانگەوازەکەیدا بژاردەی خەڵکی مەککە بەدەمیەوە هاتن، وەکو:

عوسمانی کوڕی عەففان لە تەمەنی سی وچوار ساڵیدا، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف لە تەمەنی سی ساڵیدا، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا، زوبەیری کوڕی عەوام لە دوانزەساڵیدا، هەروەها تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵا، کە سییانزە ساڵان بوو.[1]

ئەو پێنج پاڵەوانە یەکەمین بەرووبوومی ئەبو بەکر بوون، بانگی کردن بۆئیسلام و ئەوانیش بەدەنگیەوە هاتن، یەك یەك هێنانی بۆ لای پێغەمبەرﷺ، لە بەر دەستی موبارەکیدا موسڵمان بوون، ئەوانە کۆڵەکە سەرتایەکان بوون بۆ بەهێزکردنی پێغەمبەرﷺ، هەر بەهۆی ئەوانیشەوە خوای گەورە سەرکەوتن و پشتگیری خۆی پێبەخشی، ئیتر خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، بە پیاوو بە ژنەوە، هەریەکێ لەو پێشەنگانە بانگخوازێکی ئیسلام بوون، ئینجای ئەوانەی دوای ئەوان هاتن، کە بە (السابقین) ناسران، بە یەك و بەدوو وبەسێ کەس و کۆمەڵی کەم، ئەوان لەگەڵ ئەوەش، کە کەم بوون، بەڵام قەڵایەکی قایم بوون، بۆ پارێزگاری لە پەیامی ئیسلام، کەسیش بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت پێشی ئەوان بداتەوە، یان پێیانبگات.[2]

لە ڕاستیدا بزوتنەوەی ئەبو بەکر لە بانگەواز کردن بۆلای خوا وێنەك لە وێنەکانی ئیمان ڕوون دەکاتەوە بە ئیسلام و گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەرﷺ، وێنەی خاوەن باوەڕێك کە ناسرەوێ و وچان نادات تا ئەوەی کە باوەڕی پێهێنا نەیهێنێتە دی لە دەوروبەری خۆیدا، بێ ئەوەی کە دەربڕینەکەی بە شێوەیەکی عاتیفی و کاتی بێت، کە بە پەلە دابمرکێتەوە، گورجی و توندو تۆڵی ئەبو بەکرؓ هەرمایەوە، تا ئەو کاتەی چووە لای خوای خۆی.

---

١ـ بڕوانە: التربية القيادية(١/ ١١٦)

٢ـ بڕوانە: التربية القيادية(١/ ١١٦)

تێبینی ئەوە دەکرێت خاوەن پلەو پایە کۆمەڵایەتیەکان کاریگەری چاکیان بووە لە پەیداکردنی لایەنگران بۆ بانگەوازی ئیسلامی، هەربۆیە ئەبو بەکرؓ شوێنەواری لە وانی تر زیاتر دیاربوو.[1]

دوای ئەوەی هاورێیەتی ئەبو بەکر بۆ پێغەمبەری خواﷺ، تەنها لە سەر ڕاهاتنی دەروونی و ڕەوشتی بنیاتنرابوو، بوو بەڕاهاتن بۆ خۆشەویستی خوای گەورە بە تەنها، پشتگرتن لەکاتی ناڕەحتیدا، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ سوودی وەرگرت لە پلەوپایەی خۆشەویستی خەڵکی بۆ ئەبو بەکر بۆ بەهێزکردنی بانگەواز، جگە لە پلەو پایەی خۆی درودو سڵاوی خوای لێبێت لەلای خەڵك[2] بانگەوازی ئیسلامی هەر بەردەوام بوو بە شێوەیەکی نهێنی و تاك و هەڵبژاردنی کەسەکان، لەو ڕەگەزانەی دەکرێت کۆمەڵیان لێپێك بهێنرێت، ئەو کۆمەڵە بڕوادارەی کە هەوڵیان دەدا بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی و بانگەوازی خەڵکی بۆ ئاینی خوای گەورە و دامەزراندنی شارستانیەکی بێ وێنە[3].

**٦ـ کۆمەڵی دووەم:**

لەپاش موسڵمان بوونی ئەبو بەکرؓ، کومەڵێك کەسی ئازاد هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە، لەوانە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، ئەبو سەلەمەی پورزای پێغەمبەرﷺ، بەڕەی کچی عەبدولموتەلیب و براشیریەکەی، ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی مەخزوومی، عوسمانی کوڕی مەزعونی جومەحی، عوبەیدی کوڕی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیب، سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل، قودامەو عبدولای کوڕانی مەزعون، فاتیمەی کچی خەتابی کچی نوفەیلی خوشکی عومەری کوڕی خەتاب و خێزانی سەعیدی کوڕی زەید، ئەسمای کچی ئەبو بەکر، خەتتابی کوڕی ئەرەتتی هاوپەیمانی بەنی زوهرە.[4]

---

١ـ بڕوانە: محمد رسول الله الصادق عرجون(١/٥٢٢)

٢ـ بڕوانە: الوحي و تبليغ الرسالة. د. يحيى اليحيى(٦٢)

٣ـ بڕوانە: خاتم النبين لأبي زهرة(٢٩٨)

٤ـ بڕوانە: دولة الرسول من التكوين إلى التمكين، (د.كامل سلامة ل ٢١٢)

**٧ـ کۆمەڵی سێیەم:**

بریتی بوون لە عومەیری کوڕی ئەبی وەقاصی برای سەعد، عەبدوڵای کوڕی مەسعودی کوڕی حاریس، ئیبنو شەمخی کوڕی مەخزوم، مەسعودی کوڕی قاڕی، سوڵەیتی کوڕی عەمر، حاتبی کوڕی عەمر، عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و خێزانەکەی، ئەسمای کچی سەلامە، خونەیسی کوڕی حوزافەی سەهمی، عامیری کوڕی ڕەبیعەی هاوپەیمانی ئالی خەتتاب، ئەسمای کچی عومەیسی خێزانی حاتیبی کوڕی حاریس و فاتیمەی کچی موجەللیلی خێزانی و خەتتابی کوڕی حاریسی برای فوکەیهەی کچی یەساری خێزانی، مەعمەری کوڕی حاریس و سائیبی کوڕی عوسمانی کوری مەزعون، موتتەلیبی کوڕی ئەزهەرو ڕەملەی کچی عەوفی خێزانی، نەحامی کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئوسەید، عامیری کوڕی فوهەیرەی مەولای ئەبو بەکر، فوهەیرەو دایکی، کە کۆیلەیەکی نوفەیلی کوڕی حاریسی کوڕی سەخبەرەبوو، ئیتر ئەبو بەکر کڕی و ئازادی کرد، خالیدی کوڕی سەعدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییەی کچی خەلەفی خێزانی و ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی عەبدوشەمس، واقیدی کوڕی عەبدوناف، خالید و عامیرو عاقیل و ئیاس بەنولبوکەیری کوڕی عەبدویالیل و، عەماری کوڕی یاسری هاوپەیمانی بەنی مەخزومی کوڕی یەقزە، ئیبنو هیشامیش وتوویەتی: عەنسی لە مەزحەجە(مذحج)یەکانە.

هەروەها صوهەیبی کوڕی سینان، کە پێیدەوترا(سابق الروم).

واتە: پێشکەوتوی ڕۆم.

هەروەها پێشکەوتوان بۆ ئیسلام: ئەبو زەڕی غیفاری و ئونەیسی برای و دایکی و[1]، بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی، ئەمانەن، کە (السابقون) یان پێ دەوترێت لە هەموو تیرەکانی قورەیش، ئیبنو هیشام ژماردونی، کە زیاتر لە چل کەس دەبن[2].

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: لە دوای ئەوان خەڵکی پۆل پۆل بەدوای یەکدا موسڵمان

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شيبة (٢٨٧/١)

٢ـ بڕوانە: سيرة إبن هشام(١/٢٤٥ـ ٢٦٢)

دەبوون لە ژنان و پیاوان، تاکو وایلێهات لە ناو مەککە باسی ئیسلام دەکرا.[١]

لە ناوەکان دەردەکەوێت، کە ئەوانەی هاتنە ئاینی ئیسلامەوە بژاردەی ناو قەومەکانی خۆیان بوون، نەوەك کەسانێك بن لە کۆیلەو خەڵکی بێ پلەو پایە، وەکو هەندێ لە توێژەرەکان دەڵێن، ئەو کەسە ڕاستی نەپێکاوە، کە دەربارەی پێشکەوتوانی ئیسلام وتوویەتی: کە زۆربەیان تێکەڵەیەك بوون لە هەژارو کۆیلە... یان هەندێك لەو نوسەرانە وتویانە: دەستمایەی بانگەوازی ئیسلامی لە پاش سێ ساڵ لە دەستپێکردنی چل پیاو وژن بوو، زۆربەیان لە هەژارو بێ نەوایان بوون، یان کۆیلەو مەوالی، لە سەرووی هەمووشیانەوە هەندێ بوون لە عەجەمەکان وەکو صوهەیبی ڕۆمی و بیلالی حەبەشی، لێکۆڵینەوەی ورد ئەوە دەردەخات، کە ئەو کەسانەی ئاماژەیان پێدەکرێت لە هەژارو کۆیلەکان سیانزە کەس بوونە، ئەم ژمارەیەش بەرامبەر ئەوانەی، کە هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە لەو سەردەمە پێی ناوترێت زۆربە.

ئەوانەی موسڵمان دەبوون لەو ڕۆژگارە بەپاڵنەرێکی دونیاییەوە نەدەهاتن، بەڵکو ئیمان پاڵی پێوە دەنان بەو پەیامە ڕاستەی، کە دڵیان بۆ کرایەوە پشتگیریان لێکرد، بەسەرگەورەو کۆیلەیانەوە، دەوڵەمەندو هەژاریانەوە، هەموویان یەکسان بوون پێکەوە ئەبو بەکر و بیلال و عوسمان و صوهەیب.[٢]

مامۆستا (صالح الشامي) دەڵێت: ئێمە نامانەوێت نکوڵی بکەین لە بوونی کۆیلەو لاوازەکان، بەڵام ئەوە ڕەت دەکەینەوە کە زۆرینە بوبێتن، چونکە ئەوە پێچەوانەی ڕاستیەکانە، ئەگەر وابوونایە ئەوە دەبووە بانگەوازێکی چینایەتی، کە کۆیلەو لاوازەکان ڕاپەڕنە سەر دەسەڵاتداراندا، وەکو هەر بزوتنەوەیەکی بەرێوە براو، ئەمە بە زەینی کەسێك لەو موسڵمانەدا نەهاتووە کاتێك موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کردووە، ئەوانە موسڵمان دەبوون لەسەر بنەمای برایەتی لە سایەی بیروباوەڕدا، وەکو بەندە بۆ خوا، بەڕاستی جێگای شانازیشە، کە بانگەوازێك سەرەتاکەی بە

---

١ـ بڕوانە: سيرة إبن هشام(٢٦٢/١)

٢ـ بڕوانە: من معين السيرة صالح الشامي(ل ٤٠)

پیاو ماقوڵان دەست پێبکات، ئەوان لە پێناو بیروباوەڕەکەیاندا خۆیان ڕاگرت بەرامبەر هەموو ناخۆشی و دەردە سەریەك، کە پێشتر تووشی نەبووبوون، بەڵکو بیریشیان لێنەکردبوویەوە.[١]

ئیسلام تەشەنەی دەکرد لە ناو دڵە پاك و ئەقڵە ڕۆشناکان، کە خوای گەورە ئامادەی کردبوون بۆ ئەم کارە مەزنە، لە سەرەتای ئەوانەشەوە خەدیجە و ئەبو بەکر و عەلی وعوسمان و زوبەیر و عەبدڕڕەحمان و ئەبو عوبەیدەو ئەبو سەلەمەو ئەرقەم وعوسمانی کوڕی مەزعون و سەعدی کوڕی زەیدو عەبدولای کوڕی جەحش و جەعفەرو سەعدی کوڕی وەقاص و فاتیمەی کچی خەتتاب و خالیدی کوڕی سەعیدو ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەو کەسانی تر ڕەزای خوایان لێبێت، ئەوانە لەسەر گەورەکانی ناو قەومەکانیان بوون.[٢]

### سێ یەم: بەردەوام بوونی پێغەمبەرﷺ لە بانگەوازدا.

پێغەمبەرﷺ هەر بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازی نهێنی ، بەمەبەستی زیادکردنی شوێنکەوتوو وپشتیوان لە خزم و دۆستان، بە تایبەتی ئەوانە کەدەگونجان بە نهێنی ببننە موسڵمان لەڕاستیشدا چاکترین پاڵپشتێك بوون بۆ پێغەمبەری خواﷺ بۆ بڵاوکردنەوەی بازنەی بانگەوازی نهێنی، ئەم قۆناغە سەختە لە ژیانی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ ناڕەحتی زۆری تیابوو لە جوڵانەوەو پێغەمبەرﷺ و شوێنکەوتوانی، چونکە ئەوان قسەیان تەنها لەگەڵ کەسێك دەکرد، کە متمانەیان پێی بووایە، ئەمەش وادەگەیەنێ، کە هەنگاوەکان بە خاویی و وریایی هەڵدەنران، ئەو قۆناغەش وایدەخواست، کە پێویستیەکانی بانگەوازە لە سەرچاوەوە وەربگیردرێت و جێبەجێکردنیشی هەرگران بوو، چونکە ئەوکەسەی تازە موسڵمان دەبوو یەکسەر داوای نوێژی لێدەکرا، لەگەڵ خوێندەنەوە ئەوەندەی پێی دەکرێت لە قورئان بخوێنێ، بۆیە موسڵمانان خۆیان دەشاردەوەو لەدۆڵ و ڕێگوزارە شاخاویەکان

---

١ـ بڕوانە: من معين السيرة صالح الشامي(ل ٤٠)

٢ـ هەمان سەرچاوە(ل: ٤٠)

هەرکات بیانویستایە نوێژ بکەن.[١]

**١ـ هەستی پاراستن:**

پەنهانی و نهێنی هێمای ئەم قۆناغە بوونە، تەنانەت لەگەڵ نزیکترین کەسدا، فەرمانی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەوەبوو، کە پارێزگاری بکرێت لە نهێنی پەیوەندیەکان، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ هەڵدەستا بەدروستکردنی خێزان (أسرة) لەوانەی کە موسڵمان دەبوون، ئەو خێزانەش خۆیان دەشاردەوە بۆ ئامادەیی و ڕاهاتن نەك لە ترس و هەڵاتندا، بۆیەپێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەڕێکخستنی هاوەڵەکانی لە شێوەی چەند پۆلێکی بچوك، ئیتر کەسێك کە توانای دارایی باش بوایە دووکەسی تری لادەبوو کە موسڵمان دەبوون، لەگەڵی نانیان دەخوارد، ئینجا دەیانکرد بە بازنە بازنە، هەرکەسێکیش هەندێ قورئانی لە بەر بوایە ئەوەی فێردەکرد کە لەبەری نییە ئیتر لەم کۆمەڵانە خێزانی برایەتی وبازنەی فێرکردن پێکدەهات.

ئەو ڕێبازەی، کە پێغەمبەرﷺکاری دەکرد لە پەروەردەکردنی شوێنکەوتوانی بریتی بوو لە قورئانی پیرۆز، پێغەمبەری خواشﷺهاوەڵانی خۆی بەشێوەیەکی گشتگیر پەروەدەکرد، لە بیروباوەڕو عیبادەت و ڕەوشت و هەستی پارێزگاری و هتد....

بۆیە دەبینین لە قورئانی پیرۆزدا هەندێ ئایەت باس لە هەستی هێمنی دەکەن، چونکە ئەوە پێویست بوو دروست بوایە لای هەموو کەسەکان، بە تایبەت لەلای ئەوانەی لە ڕیزی پێشەوە، کە بەرگری دەکەن لە ئیسلام هەوڵدەدەن بۆ چەسپاندنی، بۆیە دەبینی ئەوانەی سەرەتا ئیسلامیان پێکهێنا لە مەککە، هەر لە ئەوانەوە بڵاوەی کرد وگەیشتە دروستکردنی دەوڵەت.

بێگومان موسڵمانان زانیاریان کۆکردووەتەوە دەربارەی ئەو کەسانەی ویستویانە بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، سەرکردەکانیش سەرپەرشتی ئەوەیان کردووە، بۆیەپێغەمبەر ﷺ دەزگایەکی پاراستنی بەرزی پێکهێنا، کە هەڵدەستا بە

---

١ـ بڕوانە: الغرباء الأولون، سلمان العودة.

سەرپەرشتی کردنە سەر پەیوەندی ڕێکخراو لە نێوان سەرکردایەتی و بنچینەدا، بۆ دابین کردنی بنەمای نهێنی پاراستن.

ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ زۆردەوڵەمەندەلەو واتایانەی دەیانبەخشێت، هەر لە پەروەردەکردنی کەسەکانەوە تاکو دامەزراندنی دەوڵەت، لە سەردەمی خۆیشماندا، پێویستی زۆرە بۆ بزوتنەوەی ئیسلامی و دەوڵەتی موسڵمان بۆ دروستکردنی دەزگای پێش کەوتوو بۆ پاراستن، بۆ ئەوەی ئیسلام و موسڵمانان بپارێزن لە دوژمنە جولەکەو گاورە بێباوەڕەکان ، هەروەها کار بکەن بۆ پارێزگاری لە ڕیزی موسڵمانان لەناو خۆوە، کەس نەتوانێت خۆی بخاتە نێوانیانەوە لە دوژمنانیان، هەروەها کار بکات بۆ دەسنیشان کردنی کاری نەیارەکان، بۆ ئەوەی سەرکردایەتی سوود لەو زانیاریانە وەربگرێت، کە بۆی دێت لەو دەزگایانە، پێویستیشە ئەوجۆرە دەزگایانە دابمەزرێت لەسەر بنچینەی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، ڕەوشتی پیاوانیشی چڵەپۆپە بێت لە ئاکارو خەسڵەتی پیاوانی پاراستن لە ئیسلامدا.

بایەخدانی موسڵمان بەم لایەنە دەیانپارێزێت لە دوژمنایەتی کتوپڕ، ئەگەر تۆ دوژمنت ناسی خۆتت ناسی، ئیتر پێویست ناکات بترسیت لەئاکامی سەد جەنگ، ئەگەر خۆت بناسیت ودوژمنەکەت نەناسی، ئەوا لە هەموو جەنگێك شکست دەخۆی.[1]

ئەگەر خۆت بناسیت و دوژمنەکەت نەناسی ئەوا لە هەموو جەنگێکدا شکست دەخۆی، پێغەمبەری خواﷺ بەخۆی هەڵدەستا بە سەرپەرشتی پەروەدەی هاوەڵەکانی لە چەندین لایەنەوە، دابەشیشی دەکردن بەشێوەی خێزان و پۆل، بۆ نمونە فاتیمەی کچی خەتتاب و سەعیدی کوڕی زەیدی مێردی، کە ئامۆزای عومەری کوڕی خەتتابە‌رضي الله عنهم، لە یەك پۆلدا بوون لەگەڵ نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای نەحامی عەدەوی، مامۆستاکەشیان خەتتابی کوڕی ئەرەت بوو، قورئانخوێندنیشیان بریتی نەبوو لە چاکخوێندنەوەو دەرکردنی پیتەکانی لە جێگانی خۆیانەوە، یان

١ـ بڕوانە: الإستخبارت العسكرية في الإسلام(ل ١١١ـ ١١٢)

زۆرخوێندنەوەی و پەلە کردن بەتەنها، بەڵکو لە خەمی لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنیدا بوون، هەروەها زانینی فەرمان و نەهیەکانی و کارپێکردنیان بوون.[١]

پێغەمبەری خواﷺزۆر بایەخی دەدا بە پلاندانانی ورد، هەژماریشی دەکرد بۆ هەموو هەنگاوێك، ئەوەشی بەباشی دەزانی، کە ڕۆژێك دێت بانگەواز ئاشکرا بکرێت و ئەوە قۆناغێکی سەخت دەبێت، بۆیە پێویستی زۆر هەبوو بە چاوپێکەوتنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، هەروەها پێویستیان بە بارەگایەکیش هەبوو بۆ ئەو مەبەستە، چونکەماڵەکەی خەدیجە بەشی ئەو ژمارەی نەدەکرد لەشوێنکەوتووان، بۆیە پێغەمبەرﷺ هەڵسابە هەڵبژاردنی ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم، چونکە بەردەوامی یەکبینینی سەرکردایەتی و بنچینە، باشترین هۆکارە بۆ پەروەردەی کردەیی و بیردۆزەیی و دروستکردنی کەسایەتی سەرکردایەتی بۆ بانگەواز.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ شوێنکەوتوانی ئامادە دەکرد بۆ سازدانی دەوڵەت و هەڵگرتنی بانگەواز، پەرۆشی زۆری لەسەر ڕێکخستنێکی نهێنی ورد بوو، خۆ ئەگەر مەسەلە بانگەوازێکی ئاسایی بووایە پێوستی نەدەبوو بەئەو ڕێکخستنە.

دیسان ئەگەر مەسەلەکە تەنها گەیاندن بووایە ئەوا کەعبە چاکترین جێگابوو، بەڵام مەسەلەکە وانەبوو، بۆیە نیاز هەبوو بەڕێکخستنێکی نهێنی، لەجێگایەك لەگەڵ هاوەڵانی یەکبگرن، کە هەموویان بەشێوەیەکی نهێنی ئامادە دەبوون.[٢]

**٢ــ ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم(بارەگای سەرکردایەتی).**

کتێبەکانی سیرە ڕونیدەکەنەوە، کە ڕاگرتنی ماڵی ئەرقەم وەکو سەرکردایەتی، دوای ئەو ڕووبەڕووبونەوەیەبوو، کە سەعد تیایدا دەرکەوتﷺ، ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، کە نوێژیان بکردایە دەچوونە ڕێگوزاری شاخەکان لە مەککە، جارێکیان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصﷺ لەگەڵ چەند کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺلەوشاخانە بوون نوێژیان دەکرد، لەو کاتە چەند کەسێك لە موشریکەکان ئەوانەیان بینی، ئیتر نکۆڵیان لێکردن و کارەکەیانیان بەشتێکی خراپ

---

١ــ بڕوانە: الدعوة الإسلامية، د. عبدالغفار محمد عزيز.

٢ــ دولةالرسول من التكوين إلى التمكين، (د.كامل سلامة ل ٢٨١)

زانی، جا لەو ڕۆژەدا سەعد بە پارچە ئێسقانی حوشترێك لە یەکێ لەو بتپەرستانەی داو برینداری کرد، ئەوە یەکەم خوێن بوو لە پێناو خوای گەورەدا ڕژێنرا.[١]

## چوارەم: گرنترین تایبە تمەندیـەکانی کۆمـەڵی یەکـەم، کـە لەسـەر دەسـتی پێغەمبەرﷺ پەروەردەبوون.

ئەوان بەهۆی هەندێ تایبەتمەندییەوە پێشکەوتن بەرەو ئاستی ئەو کەسایەتیە موسڵمانەی، کە دەوڵەتی ئیماندارو شارستانی پڕشنگدار دادەمزرێنن، دیارترین ئەو تایبەتمەندیانەیانەش:

### ١ـ گوێڕایەڵی تەواو بۆ قورئان:

زانست و شارەزایی تەواو لە بیروباوەڕ و شەریعەت و ئادابەکان، بەدەست نایـەن لە ڕێگەی وەحی یەوە نەبێت، هەروەها لە ڕێگەی خۆ بەستنەوە بەڕێگەی شـەرعی، ئەوە ڕێبازی ئیمانداری ڕاستەقینە یـە،[٢] خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴾ (الأعراف: ١٨١).

هاوەڵان لە هەموو کەسێك زیاتر سودیان وەرگرت لەوەحی، لە بەر هەندێ هۆ:

أـ پاکی دڵەکانیان و خالی بوونیان لە هەموو ئارەزو و حەزێکی تر، جگە لـەوەی لە دەقەکاندا هەبووە، هەروەها ئامادەیی ئەو دڵانە بۆملکەچی تەواو بۆ ئـەوەی لای خواو پێغەمبەرەکەیەوە دێن، بە بێ هیچ ترسان و یاخود دوو دڵیەك.

ب ـ هاوچەرخ بوونیان لەگەڵ دابەزینی وەحیی و، هاوەڵێتیـان بـۆ پێغەمبـەرﷺ بۆیە ئـەوان شـارەزاترین کـەس بـوون لـەو بارودۆخانـەی قورئانیـان تیـادا دابـەزی، شارەزابوونیش بەو بارودۆخانە گەورەترین هۆکارە بۆ تێگەیشتنی مەبەستەکانیان.

ج ـ دەقەکان قورئان و سوننەت بوون، زۆرجاریش هاتنیان پەیوەندی هەبوو بـە خۆیانەوە ـ چ بە شێوەیەکی تـاك بێـت یـان کۆمـەڵ ـ ڕاسـتەوخۆش گوتـاری بـۆ

---

١ـ بڕوانە: إبن هشام(١/ ٢٣٦)

٢ـ بڕوانە: التربية القيادية

ئاراستەدەکردن و کاریگەری زۆری دەبوو لە سەریان، چونکە چارەسەری هەندێ ڕووداوی واقیعی دەکرد، کە جارێ دڵەکان کاریگەری ئەو ڕوداوەیان لەسەربوو، ئامادەی زۆریشیان تیادابوو بۆ وەڵامدانەوەی هەرفەرمانێك، کە گوێیان لێدەبوو کەسێك بیوتبا: (قال رسول الله) هەموویان تێیان دەڕوانی، وەکو ئیبنو عەباس دەفەرموێت.[١]

**٢ـ کاریگەربوون لە ناخەوە بەوەحی و ئیمان:**

هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت مامەڵەیان دەکرد لەگەڵ زانستی ڕاست، نەك وەکو ڕاستی زانستی پەتی، کە بیرو هۆش مامەڵەی لەگەڵ بکات بەتەنها بێ ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە دڵ و ئەندامەکانەوە ئەوان شارەزاییان بە خوای گەورە ناوەکانی و سیفەتەکانی و خۆشەویستی و پەرۆش بوون بۆ چاوپێکەوتنی و تەماشاکردنی ڕوومەتی پیرۆزی لە بەهەشتدا، هەموو ئەوانە بووە مایەی مەزن تەماشاکردنی خواو لێترسانی و وریابوون لە سزاو تۆڵەی، هەروەها وایلێکردن داوای ئەوە بکەن، کە لەلای خوایە و ئومێدیان هەبێت بچنە بەهەشت و گومانی باش نەبێت بە خوا نەیبەن، بەم شێوەیەش شوێنەواری زانستییان تەواو بوو بە خوای گەورە، ئەم واتا ویژدانیەش مەبەستە بە شێوەیەکی گەورە لەوەرگرتنی زانست، ئەگەر واش نەبێت زانست سودی نابێت، بەڵکو زیانیشی دەبێت.[٢]

هاوەڵان بەڕۆژ سوارو جوامێر بوون، بە شەویش دابڕاو بوون بۆ خواپەرستن، ترس و ملکەچی بۆخواو، زانست و باوەڕیان، ڕێگای لێنەدەگرتن، کە هەڵسن بە ئەنجامدانی کڕین و فرۆشتن و کێڵان و هاوسەرگیری و چاودێریکردنی ماڵ و سامان.

## پێنجەم : کەسایەتی پێغەمبەرﷺ و کاریگەری لەسەر دروستکردنی سەرکردە.

ماڵی ئەرقەم گەورەترین قوتابخانە بوو بۆ پەروەردەکردن و فێرکردن لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، چۆن وا نابێت، کە مامۆستاکەی پێغەمبەرﷺبێت، کە مامۆستای

---

١ـ هەمان سەرچاوە(٩٤)

٢ـ هەمان سەرچاوە(ل ٩٤)

هەموو مرۆڤایەتیە، قوتابیەکانیشی بانگخوازان و ڕێنیشاندەران و خواناسانن، کە مرۆڤایەتیان ڕزگار کرد لە کۆتی کۆیلایەتی و لە تاریکی دەریان کردن بۆ ڕۆشنایی، دوای ئەوەی خوای گەورە خۆی پەروەردەی کرد بە شێوەیەك کە مێژوو هەرگیز نمونەی وای نەبینیوە.[١]

لە ماڵی ئەرقەم دا خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ڕینوێنی کرد بۆ پێکهێنانی یەکەم کۆمەڵ لە هاوەڵان، ئەوانیش هەڵسان بەبڵاوکردنەوەی مەزنترین بانگەواز.

پێغەمبەرﷺ توانایەکی زۆری هەبوو لە هەڵبژاردنی ڕەگەزە سەرەتاکانی بانگەواز، لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی یەکەم لەتەمەنی بانگەوازو پەروەردەکرنیان بۆ وەرگرتنی سەرکردایەتی وهەڵگرتنی پەیام، پەیام و ئامانجە مرۆییە مەزنەکان بۆپیاوانی مەزن نەبێت هەڵناگیرێت.

چاوپێکەوتنی پێغەمبەرﷺ بە ئەو کۆمەڵە بژاردەیە لە ماڵی ئەرقەم ڕاهێنانێکی کردەیی بوو سەربازانی ئەو قوتابخانەیە لە سەر گوێڕایەڵی و سەرکردایەتی و بنچینەکانی، سەرکردەی گشتی هەڵدەستا بە پتەوەکردنی متمانەی شوێنکەوتوان بە خوای گەورە و فێری خۆپاراوکردنەوەو پەروەردەی دەکردن، هەروەها فێری بەخشین و فیداکاری دەکردن.[٢]

خاڵی سەرەتا لە پەروەردە بریتی بوو لە چاو پێکەوتنی بانگکراو بە پێغەمبەرﷺ، ئەو سا کاریگەرییەکی زۆر سەیر دروست دەبوو لە سەر ئەوکەسە، بە تەنها ئەو چاو پێکەوتنە کەسەکە لە تاریکاییەوە دەردەچوو بۆ ڕۆشنایی، پڕدەبوو لە ئیمان و بێباوەڕی فرێدەداو، تواناشی پەیدا دەکرد بۆ خۆڕاگرتن و ئارامگرتن لە پێناو باوەڕی تازە.

کەسایەتی پێغەمبەر ﷺبزوێنەری یەکەم بوو بۆ ئیسلام، چونکە خاڵەکانی ڕاکێشانی تیادابوو، خوای گەورە لە بە ڕچاوی خۆیدا پەروەردەی کرد، بەتەواترین نمونە بۆ مرۆڤ لە مێژووی زەویدا، مەزنیش هەمیشە خۆشەویستەو سەرنجی خەڵکی

---

١ـ دولة الرسول من التكوين إلى التمكين، (د.كامل سلامة ل ٢١٩)

٢ـ هەمان سەرچاوە(٢٢٠)

ڕادەکێشێ و بەدەوریدا کۆدەبنەوە، بەڵام پێغەمبەری خواﷺجگە لەو مەزنیەش، پێغەمبەری خوابوو، وەحی بۆ دەهات و دەیگەیاندە خەڵکی، کەواتە ئەوکەسە تەنها لەبەر خۆی خۆشی ناوێت، بەڵکو لەبەر خوای گەورەش، کە کردوویەتی بە پێغەمبەر، بۆیە لەکۆتاییدا لە کەسایەتی پێغەمبەرﷺ مرۆڤی مەزن وپێغەمبەری مەزن یەکدەگرنەوە و دەبنە یەك واتا لە کۆتاییدا، ئەو خۆشەویستیە دەبێتە خاڵێکی گرنگ لە هەموو هەست و نەستی ئەو کەسەی بانگ دەکرێت، بەو شێوەیەش خۆشەویستی خواو پێغەمبەرﷺیەکدەگرن، هەر ئەو خۆشەویستیەش بوو، کە ئەیجوڵاندن.[١]

## شەشەم: بابەتی خوێندن لە ماڵی ئەرقەم.

بابەتی خوێندن بریتی بوو لە قورئان، کە تاکە سەرچاوەی وەرگرتن بوو، چونکە پێغەمبەرﷺسووربوو لەسەر یەکخستنی ئەو سەرچاوەو، قورئان ببێتە تاکە بەرنامە، کە هاوەڵانی لە سەر پەروەردەبێت، بەتاك و خێزان و کۆمەڵەوە، ئینجا جبریلعليه السلام، بەردەوام ئایەتەکانی دادەبەزانە سەر پێغەمبەرﷺ وەریاندەگرت و، دڵەکانی پێدەگەشایەوە و، دەتووت لە گیان و ڕەنگی خوێنیاندا تەشەنەی دەکرد، ئەوانەش وەکو چۆن نوێ ببنەوە دەبن بەکەسێکی تر جیاواز لەکەسەکەی پێشوو لە هەموو ڕوویەکەوە، پێغەمبەرﷺ گەلێك سووربوو لەسەر ئەوەی جگە لە قورئان شتێکی تر تێکەڵ نەبێت بەو سەرچاوەیە.[٢]

لە ماڵی ئەرقەم فێری ئەوە بوون، کە قورئان وئاراستەکانی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەستوری هەرەبەرزی بانگەواز وژیان و دەوڵەت و شارستانییەتە، قورئان تاکە سەرچاوەبوو، کە لە سەردەستی مەزنترین مامۆستا وەردەگیرا، ئەوە نەوە بێ وێنەیەش لە سەردەستی ئەو پەروەردەبوون وانەکانیان وەرگرت, هاوەڵان قورئانیان بە توندوتۆڵی وەرگرت، بە تێگەیشتن و پەرۆشی زۆر بۆ ئاراستەکانی و

---

١ـ بڕوانە: منهج التربية الإسلامية(ل ٣٤ـ ٣٥)

٢ـ بڕوانە: دولةالرسول من التكوين إلى التمكين، (ل ٢٢٥)

کارکردن بە فەرمانەکانی، هەموو ئایەتێکیش فێری زانست دەبوون بۆ ژیانی ڕۆژانەیان، بۆیە ئەوان بوون بە وێنەیەکی کردەیی بۆ ئەو ئاراستە خواییانە، قورئان ئەو قوتابخانەیە خواییە بوو، کە بانگەوازو سەرکردە خواییەکانی تیا دەرچوون، نەوەیەك بوون مرۆڤایەتی هاوشێوەی نەبینیووە، خوای گەورە قورئانی لە سەر دڵی پێغەمبەرەکەی دابەزاند، بۆ ئەوەی نەتەوەیەکی پێ پەروەدە بکات و کۆمەڵگایەکی پێڕێکبخات، ئەوەی هەڵسێ بە دروستکردنی ویژدانەکان و ڕەوشت و ئەقڵ و بیروباوەڕو ئاکاری پێ دروستکرد، بەوشێوەی کۆمەڵی یەکەم لەو قوتابخانەیە دەرچوون، کە ئەوان پێشی هەموو کۆمەڵگاکان بدەنەوە لە هەموو بوارەکانی بیروباوەڕ و دەروونی و ئاکاری و کۆمەلایەتی و سیاسی و جەنگ دا.[1]

## حەوتەم: هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ماڵی ئەرقەم.

هەڵبژاردنی ماڵی ئەرقەم لەبەر چەند هۆیەك بوو، لەوانە:

١ـ ئەرقەم بەوە نەناسرا بوو کە موسڵمانە، بۆیە بەزەینی کەسدا نەدەهات، کە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەوێ یەکبگرن لەو ماڵە.

٢ـ ئەرقەمرضي الله عنه لەبەنی مەخزومە، کە ئاڵای دژایەتیان بەرزکردوەتەوە دژی بەنی هاشم، جا ئەگەر ئەرقەم بە موسڵمانیش بناسرایە، هەر پێشبینی نەدەکرا، کە کۆبوونەوەکان لە ماڵی ئەو بکرێت، چونکە لەو حاڵەتە ئەوە دەگەینێ، کە لە ناو ماڵی دوژمندا کۆدەبنەوە.

٣ـ ئەرقەم لاوێکی شانزە ساڵی بوو، قورەشیەکانیش هەرکاتێك بیربکەنەوە بۆ گەڕان بەدوای مەڵبەندی کۆبونەوەی ئیسلامی، بۆ ئەوێ ناچن، کە لەماڵی یەکێکدا بێت لە هەرزەکارانی هاوەڵی موحەممەدﷺ، بەڵکو بیردەکەنەوە لە گەورە هاوەڵان، یان ماڵی خودی پێغەمبەرﷺ.

یان زیاتر ئەوە پەسەند بکەن، کە لە ماڵی یەکێك لە بەنی هاشم دابێت، یان ماڵی ئەبو بکررضي الله عنه، بۆیە هەڵبژاردنی ئەو ماڵە لە ئەوپەری داناییدایە لە ڕووی

---

١ـبڕوانە: دولة الرسول من التكوين إلى التمكين، (٣٣٥)

ئاساییشەوە، هەرگیز نەشزانراوە، کە قورەیش هەڵیکوتابێتە سەر ئەو ماڵەو پێیانی زانیبێت.[١]

## هەشتەم: خاسیەتەکانی کۆمەڵی یەکەم.

هەموان ڕۆڵی خۆیان دەزانن، هەموانیش سروشتی بانگەواز و قۆناغەکە دەزانن، کە پێیدا تێپەڕدەبن و ئاگاداری و نهێنی پێویستیان بەکارهێناوە.[٢]

دروستکردنی کۆمەڵی ئیماندار لە قوناغی مەککە بە ئەوپەڕی بێدەنگی و نهێنی بەڕێوە دەچوو، دروشمی ئەم قۆناغەش بریتی بوو لە ئاڕاستەکردنی خوای گەورە کاتێک دەفەرموێت: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ (الكهف: ٢٨)

ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرﷺ،کە ئارام بگرێت لەسەر کەم و کورتی و هەڵەی ئەوانەی هاتوون بەدەمی بانگەوازەکەوە، هەروەها ئارام بگرێت لەسەر زۆرێك لە پرسیارەکانیان، بەتایبەت ئەگەر هەڵەبێت و، دیسان بە ئارام بێت بەرامبەر دوو دڵی ئەوان لەوەرگرتنی ڕێنماییەکانی، کۆشش بکات لەسەر ئەوەی وا لە شوێنکەوتوانی بکات، خۆڕاگرین بەرامبەر ئاشوبی دوژمنانی بانگەوازەکە، هەروەها سروشتی بانگەوازیان بۆ ڕوندەکاتەوە، کە سەختەو، کەسیش ڕێگای بۆ خۆش نەکات لەوانە دوور بکەوێتەوەو، گوێ بۆ هیچ کەسێکیش نەگرێت، کە خراپەیان باس بکات و گوێڕایەڵی هیچ لە خۆبایی یەکیان نەبێت، کە خوای گەورە دڵی ئەوانی بێ ئاگا کردووە لە ڕاستی مەسەلەکان[٣] ئەم چەند ئایەتەی سورەتی کەهف باسی هەندێ لە خاسیەتەکانی کۆمەڵی یەکەمی موسڵمانانمان بۆ دەکات، کە

---

١ـ بڕوانە: المنهج الحركي للغضبان(١/ ٤٩)

٢ـ بڕوانە: دولة الرسول من التكوين إلى التمكين، (ل: ٢٣٧)

٣ـ الطريق إلى جماعة المسلمين.

گرنگتریان:

**أ- ئارامامگرتن** ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ﴾

وشەی(صبر) زۆر جار لە قورئان و فەرموودەدا دووبارە دبێتەوە، خەڵکیش لە نێوخۆیاندا یەکتری ئامۆژگاری دەکەن، کە ئارام بن، ئەوەندەش گرنگە کە بووەتە چواریەکی خاسیەتەکانی کۆمەڵە قوتاربووە لە خەسارەتمەندی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾(العصر)

خوای گەورەو باڵادەست فەرمانی خەسارەتمەندی داوەتە سەر هەموو خەڵکیدا، مەگەر کەسانێك نەبێت ئەم چوار خاسیەتەیان تیادا بێت:

١- باوەڕبوون بە خوای پەروەدگار

٢- کرداری چاکە

٣- یەکتر ڕاسپاردن بەهەق ڕاستی.

٤- یەکتر ڕاسپاردن بەئارامگرتن.

چونکە مرۆڤ قوتاری نابێت تاکو خۆی بە ئیمان وکرداری چاکە تەواو نەکات، هەروەها کەسانی تریش تەواو نەکات بە ئامۆژگاری و ڕێنموونی، بەو شێوەش کۆدەکاتەوە لە نێوان مافی خواو مافی خەڵکدا، هەروەها یەکتر ڕاسپاردن بە ئاراماگرتن، بەهەمان شێوە پێویستە، هەڵسان بە باوەڕهێنان و کاری چاکەو پارێزگاری کردن لە ڕاستی و داد گەری لە گرانترین ئەو شتانەیە دێنە ڕێگای تاك و کۆمەڵ، ڕێگاچارەیەکیش نییە، جگە لە ئارامگرتن لە سەر کۆشش کردن لە گەڵ دەروون و کەسانی ترو، خۆراگری لەسەر ئازارو ئەشکەنجە و خۆ هەڵکێشانی پرووپوچان و سینگ دەرخستنی خراپەکاران، هەروەها ئارامگرتن لە سەر درێژی ڕێگاو خاوی قۆناغەکان و پوکانەوەی مەشخەڵان و دووری شوێنی گەیشتن.[١]

---

١- بڕوانە: الظلال(٦/ ٣٩٦٨)

**ب ـ زۆر پاڕانەوەو جەختكردن لەسەر خوای گەورە:**

ئەمە لەو فەرموودەی خوای گەورە دەردەكەوێت، كە دەفەرموێت ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾ چونكە پاڕانەوە دەروازەیەكی هەرەگەورەیە، ئەگەر بكرێتەوە بەڕووی بەندەدا، چونكە پەیتا پەیتا خێری دەستدەكەوێت و بەرەكەتی بەسەردادەبارێ، بۆیە پێویستە كەسەكان بە شێوازێك پەروەردە بكرێن، كە پەیام هەڵبگرن، ئەسپەردەگێڕەوەبن، پەیوەندی پتەویان لەگەڵ خۆیان هەبێت، پێداگربن لە پاڕانەوەو نزایاندا، چونكە ئەوە بەهێزترین هۆكارەكانی سەركەوتنە.[1]

**ج ـ دڵسۆزی:**

ئەوەش لەفەرموودەی خوای گەورە دەردەكەوێت، كە دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾ پێویستە لەكاتی پەروەدەكردنی كەسەكاندا پەروەردەیەكی خوایی پەروەردە بكرێن، بەشێوەیەك كە وتاروكردار و جیهادیان هەر هەمووی تەنها بۆخوای گەورەبێت و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی وپاداشتی بەبێ سەیركردنی هیچ دەسكەوتێك، یان پلەوپایە و، نازناو و، پێشكەوتن و، دواكەوتنێك، تاكو ببێتە سەربازێك لە پێناوی بیروباوەڕدا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ (الأنعام: ١٦٢ـ ١٦٣)

بێگومان بەبێ دڵسۆزی و نیازپاكی هیچ كردارێك وەرناگیردرێت، هاوكات لە ژێرسایەی فەرمانەكانی سوننەت وشەرعیشدا.

**د ـ جێگیری و بەردەوامی:**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ (الأحزاب: ٢٣) وَمِنْهُم

---

١ـ بڕوانە: فقه التمكين من القرآن الكريم(ل: ٢٢١)

لـەم ئایەتـە پیرۆزانـە دا سـێ خاسـیەت باسـکراوە: بـاوەڕبوون و پیـاوەتی و جوامێری و، ڕاستگۆیی.

ئەم سێ بنەڕەتـە گرنگن بۆجێگیربـوون لەسـەر ڕێبـازی ڕاست، چـونکە ئیمـان دەبێتە مایەی دەست پێوەگرتنی بـەها بـەرزەکان، هـەروەها دەبێتـە مایـەی خۆ بەتوربانی کردن لـە پێنـاو بنـەمای ڕەوادا، جـوامێریش دڵ دەجولێنـێ بـەرەو ئـەم ئامانجە، بێ ئەوەی ئـاوڕ لـە شـتی بـچوك بداتـەوە، ڕاسـتگۆییش ڕێگـرە لـە نێـوان کەسەکەو گۆڕینیدا، ئەمانەش پێکەوە جێگیری دەبەخشنە مـرۆڤ، ئەگـەر بریقـەی شمـشێریش ببینـێ لەسـەر گـەردنی، یـان پـەتی سـێ دارە چـاوەڕوانی بکـات، یـان دەستکەوتێکی لە دونیا دەستکەوێت، یان ئافرەتێك مارەبکات.[1]

## نۆیەم: بڵاوبونەوەی بانگەواز لە تیرەکانی قوڕەیش و ئینجا بەجیهانی بوونی.

بڵاوبوونـەوەی ئیـسلام لـە قونـاغی نهێنـی دا، لـە نێـو هـەموو تیرەکـانی هـۆزی قوڕەیش بە شێوەیەکی هاوتابوو، بێ ئەوەی قورسـایی بکەوێتـە سـەر عەشـیرەتێك جگەلەعەشیرەتەکانی تر، ئەم دیاردەیەش بە پێچەوانەی سروشتی ژیانی هۆزایـەتی یە ئەو سەردەمەدا، ئەگەر چی ئەمە سوود وەرگرتنی تەواوی لە دەسـت ئیـسلام دا لە پێکهاتەی هۆزایەتی و دەماگیری بـۆ پاراسـتنی بانگـەوازی تـازەو بڵاوکردنـەوی، بەڵام لە هەمان کاتـدا هۆزەکـانی تـری لـە دژی نەوروژانـد، لەوانەشـە ئـەم کرانـەوە هاوتایەیش لەسەر هەمووان یارمەتیدا لەبڵاوبوونەوەی ئیسلام لە هۆزە جیاجیاکـانی قوڕەیشدا، چونکە ــ بۆ نمونە ــ ئەبوبەکر لـە تەیمـە، عوسمـانی کـوڕی عـەففان لـە بەنی ئومەییـە، یـە زوبـەیری کـوڕی عـەوام لـە بـەنی ئەسـەدە، موسـعەبی کـوڕی عومەیر لە بەنی عەبدودارە، علی کوڕی ئەبو تالیب لە بەنی هاشمە، عەبدوڕڕحمانی کوڕی عەوف لە بەنی زوهرەیـە، سـەعدی کـوڕی زەیـد لـە بـەنی عەدیـە، عوسمـانی کوڕی مەزعون لە بەنی جومەحە، بـەڵکو هەنـدێ موسـڵمانان لـەم سـەردەمەدا هـەر

---

١ـ بڕوانە: دعوة الله بين التكوين والتمكين، علي جريشة(٩١ـ ٩٢)

قورەیش نەبوون، بۆ نمونە:

عەبدولای کوڕی مەسعود لە هوزەیل بوو، عوتبەی کوڕی غەزوان لە مازین بوو، عەبدولای کوڕی قەیس لەئەشعەرییەکان بوو، عەمماری کوڕی یاسیر لەعەنسی مەزحەج بوو، زەیدی کوڕی حاریسەو توفەیلی کوڕی عەمر لەدەوس بوون، عەمری کوڕی عەبەسە لە سولەیم بوو، صوهەیبی نەمری لە بەنی(النمر بن قاسط) بوو، لە ڕاستیدا شتێکی زۆر ئاشکرابوو کە ئیسلام تایبەت نەبوو تەنها بە مەککەوە.[١]

پێغەمبەری خواﷺ ڕێگای خۆی دەبڕی بە پلاندان و بەو وردی، هۆکارەکانیشی وەرگرت و پشت ئەستور بوو بەخوای خۆی، بۆیە بایەخی دایە داد پەروەری بە پێزو پێکهاتنی ورد وفێرکردنی بەر بلاو دووربینینی لە ڕووی ئەمنیەوەو بلاوەکردنی ئاسایی لە کۆمەڵدا، هەروەها ئامادەکردنی پشتگیری بۆ قوناغی دوای نهێنێنی، چونکە درودوسلاوی خوای لێبێت چاك دەیزانی ئیسلام دانەبەزیوە بۆ ئەوەی لە نهێنی دابمێنێتەوە، بەڵکوبۆیە دابەزیوە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەك لەسەر هەموو جیهان، فریاکەوتنی ئەوانەی ویستی خوای لەسەرە فریایان بکەوێت و دەریان بهێنێ لە تاریکی بتپەرستی و نەفامی، بۆ ڕوناکی ئیسلام و یەکتاپەرستی، بۆیە خوای گەورە هەر لە سەرەتاوە ڕاستی ئەم بانگەوازەو گۆڕەپانەکەی ئاشکرا کردو ئەوەی دەرخست کە ئەم بانگەوازە بۆ هەموو جیهانە.

خوای گەورە دەفەرموێت﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾ (یوسف: ١٠٤) هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾( القلم:١٥٢).

بانگەواز گوتار ئاراستەی هەموو ئادەمیزادەکان دەکات، بۆ ئەوەی فریای ئەوانە بکەوێت، کە خوای گەورە ویستی لەسەرە، هەندێ لە تایبەتمەندییەکانیشی ئەوەیە، کە پێویستە ڕابگەیەنرێت و ئاشکرابکرێت و وریایی پێ بدرێت، لە پێناویشیدا هەموو نارەحەتیەك بەئاسان بزانرێت لەلای گەیەنەرەکەی.

---

١ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري(للعمري/ ١٣٣)

لە ڕاستیدا نهێنی ئەنجامدانی پێغەمبەرﷺ بۆ بانگەواز لە سەرەتادا هەڵاوێژتن بوو لە بارودۆخێکی تایبەتدا، کە بریتی بوو لە لاوازی و نامۆیی بانگەواز لەو سەردەمەدا.

ئەگەر مەسەلەی نهێنی بوون بەرژووەندیەکە وەکو سیاسەت بەکار دێت لە ئیسلامدا، لە کاتی ئاشتی و جەنگدا، ئەوە بە هەمان شێوەیە لە کاتی بانگەوازیشدا، بەڵام بۆ پێویستیەك بوو، کە ڕووداوەکان دەیانسەپاند، چونکە لە بنچینەوە ئاینی خوا پێویستە ئەنجام بدرێت، واتای ئەوەش ناگەینێت، کە ئایین بشراردرێتەوە، یا قسەی ڕەوانەکرێت، بۆ نمونە ژمارەی شوێنکەوتوانی بانگەواز ئەمە مەسەلەیەکە پەیوەندی هەیە بەبەرژەوەندییەوە، ناکۆك نییە لەگەڵ گەیاندنی بانگەواز، کە فەرمانێکە لە کتێبەکانی خوا دا هاتووە، دەکرێت ئەوە بەنهێنی بمێنێتەوە، بۆیە تەنانەت دوای ڕاگەیاندنی بانگەواز و پێغەمبەرایەتیش، زۆر شتی هەر دەشاردەوە، کە کاریگەری نەدەکردە سەر شوێنکەوتوان و جێگای کۆبوونەوەو ئەو پلانەی کەکاری پێدەکرد بەرامبەر تەڵەکەی نەفامەکان.[١]

١ـ بڕوانە: الغرباء الأولون(١٢٤ـ ١٢٦)

## باسی سێیەم: بنیاتنانی بیروباوە لە سەردەمی مەککەدا.

یەکەم: تێگەیشتنی پێغەمبەرﷺ لە مامەڵەکردن لەگەڵ سوننەتەکاندا: لە ڕاستیدا دروستکردنی دەوڵەت و پەروەردەکردنی نەتەوەو، هەڵسان پێیان، ئەوە کارێکە ملکەچی هەندێ یاساو سونەتی گەردوونی دەبن لەکاتی سرنجدانیش لە ژیاننامەی خۆشەویستمان پێغەمبەرﷺ، دەبینین، کە هەندێ مامەڵەی لەگەڵ ئەو یاسایانە کردووە بەو ئەوپەڕی دانایی و تواناوە.

ئەو یاسایانەیش بریتین لە حوکمە جێگیرەکانی خوای گەورە لەگەردونندا و، لەسەر مرۆڤیش لەهەموو شوێن و ساتێکدا، ژمارەشیان زۆرن، بەلام ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە، کە پەیوەندی هەیە بە بزوتنەوەی هەڵسانەوە. ئەو کەسەی کەوردەبێتەوە لەئایەتەکانی خوای گەورە دەبینێت بەزۆری باس لەسوننەتەکانی خوا دەکات لەگەردونندا، کەقابیلی گۆڕان نین، هەروەها بایەخدانێکی زۆر دەبینی لە دەرخستنی ئەو سونەتانە و سەرنج ڕاکێشان بۆلایان و پەند لێدەرهێنانیان و ڕەچاو کردنیان، بۆ پێکهێنانی ئەو کۆمەڵگایەی ئەو یاساو سوننەتانە ڕێکدەکەن، چونکە ئەم ژیانە هەروا بۆ خۆی ڕێ ناکات، بەڵکو بەپێی ئەو یاسایانەی خوای گەورە بەڕێوەدەچێت، ئەگەریش موسڵمان لێیان وردبێتەوە حیکمەت وئامانجەکانی بۆدەردەکەوێت،ڕاستی ڕووداوەکانیشی بۆ ئاشکرا دەبێت و دڵنیا دەبێت بۆ جێگیری ئەو سیستەمەی کە ڕووداوەکان دروست دەکات...[١]

**یەکەم: مەرجەکانی مامەڵە کردنی ڕاست لەگەڵ سونەتەخواییەکاندا.**

سەبارەت بەخەڵکی و کۆمەڵگاکان و نەتەوەکان، ئەوەیە کە زۆر بەباشی لەو سوننەتانە حاڵی ببین و شێوازی کار کردنیشیان بزانین، هەروەها بتوانین ، کە یاسا کۆمەڵایەتی هاوکێشە شارستانیەکانی لێ دەربهێنن[٢]

سەبارەت بەمامەڵە کردن لەگەل ئەوسوننەتانە بەشێوەیەکی بەرنامەیی مامۆستا

---

١ ـ بڕوانە: في ظلال القرآن (١/ ٤٧٨).

٢ ـ بڕوانە: المشروع الاسلامی لنهضة الامة ـ قراءة في فكر البنا (ص ٥٨).

(حسن البنا) دەڵێت: (( پێکدادان مەکەن لەگەڵ سوننەتە گەردوونییەکان، چونکە بەزێنەرن، بەڵکو بەکاریان بهێنن و بیانکەن بەتەوژمێك بەهەندێکیان کۆمەکی خۆتان بکەن لەسەر ئەنجامدانی ئەوانی تر، چاوەڕوانی ساتی سەرکەوتنیش بن، چونکە دوور نیە لێتانەوە)) لێرەدا چەند تێبینیەکی گرنگ هەیە:

١- ئەنجامنەدانی پێکدادان.

٢- هەوڵدان لەگەڵیاندا.

٣- بەکار هێنانیان.

٤- گۆڕینیان.

٥- پەناگرتن بەهەندێکیان لەسە رهەندێکی تریان .

٦- چاوەڕوانکردنی ساتی سەرکەوتن.[١]

ئەمانەی(حسن البنا) پێیان گەیشتووە نیشانەی تەواو تێگەیشتنیەتی لەژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ومێژووی ئیسلامی و، مێژووی گەلان و مێژووی نەتەوەکان، بزوتنەوەی یەکەمی ئیسلامی کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردایەتی دەکرد، بۆ ڕێکخستنی هەوڵەکانی بانگەوازو دامەزراندنی دەوڵەت و دروستکردنی مرۆڤی نمونەیی، هەمووی بەپێ ی ئەو یاساو سونەتە بونەوەریانە بوو، کە هەندێکیانمان باسکرد.

سەرەتایش پێویسە ئەوە بزانیت، کە ئەمە ڕێگایەکی درێژە، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، کە نەفامی جارێکی تر تێدا بالا دەست بووە، ئامادەیی خۆی وەرگرتووە، هەروەها خراپە ڕەگی پەیدا کردووە لەنێو گەلەکاندا، بنەبڕکردنی پێویستی هەیە بەشێوازی کارکردنی یەك بەدوای یەکدا.

کاری ئیسلامیش سەرەتا بەو شێوە دەستی پێکرد، هەنگاو لەدوای هەنگاو، سەرەتا بەهەڵبژاردن و دامەزراندن، ئینجا ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرگری، ئینجا سەرکەوتن و دەسەلات، نەشدەکرا هەموو ئەمانە پێکەوە بوونایە ، ئەگینا سەختی

---

١ - بڕوانە: المشروع الاسلامي لنهضة الامة( ص ٥٨).

و پەککەوتن دروست دەبوو، یان هەنگاوێکی پێش هەنگاوێکی بخرابایە، کەموکورتی و شپرزەیی دروست دەبوو.

ڕەچاوکردنی ئەم ڕاستیە لەئەو پەڕی گرنگیدانە، چونکە هەندێ لەبانگخوازان، وا دەزانن دەسەلات لەیەك دوو ڕۆژێکدا لەوانەیە دەست بخرێت، دەیانەوێت ئوممەت بەڕۆژێك بگۆڕن، بەبێ لێکدانەوەی دەرئەنجامەکان، یان تێگەیشتنی بارو دۆخەکان، بەبێ ئامادەکاری و پێشەکی، یان شێواز و هۆکاری...))[١].

(( ئێمە ئەگەر بەباشی وردبینەوە لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ ئاشکرا دەبێت بۆمان و ڕوون دەبێتەوە، کە بەووردە وردو ڕێکوپێکی گۆڕانکاری ئیسلامی دروستبووە لەولاتی عەرەبداو لەوێشەوە بۆ هەموو جیهان لەسەردەستی پێغەمبەرﷺ کارەکان هەنگاوبەهەنگاو بەڕیوە دەچوون، لەڕێڕەوی سروشتی خۆیاندا بۆ ئەو جێگایەی کە خوای گەورەو ویستی لەسەر بوو..))[٢].

ئەم سوننەتە خواییە لەشێوازی وردە وردە کارکردن، پێویستە خەلکی کاری پێبکەن، بۆیە ئەگەر بمانەوێت کۆمەلگای ئیسلامی دروست بکەین، کەس وا نەزانێ ئەو ئامانجە دێتەدی لەڕێگەی بڕیاری سەرۆکێك یان پادشایەك یان ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی و پەرلەمانی... بەلکو بەڕێگەی وردە وردە کارکردنەوە دێتە دی واتە بەئامادەکردنی لایەنەکانی بیرو هۆش و دەروون و کۆمەلایەتی. ئەوەش هەمان ڕێگەیە، کە پێغەمبەرﷺ گرتیەبەر لەگۆڕاندنی جاهیلیەت، سیانزە سال چاوەڕوانی کرد بۆ پێگەیاندنی نەوەیەکی بڕوادار، کە توانای هەلگرتنی ئەو بارەی هەبێت و هەلسێت بەگەیاندنی بۆ دونیا، بۆیە قۆناغی مەککە زیاتر پەیوەندی هەبوو بەپەروەردەکردن و پێگەیاندنەوە))[٣].

---

١ ـ بڕوانە: التمكين للامة الاسلامية( ص ٢٢٧).

٢ ـ بڕوانە: التمكين للامة الاسلامة(ص ٢٢٩).

٣ ـ بڕوانە: الخصائص العامة للاسلام (ص ١٦٨) بەدەستکاری یەوە .

**دووەم: یاسای گۆڕین و پەیوەندنی بەبنیاتنانی بیروباوەڕ.**

یەکێ لەیاساگرنگەکانی ڕاپەڕین ئەوەیە، کە خوای گەورە باسی کردووە: ﴿لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾ الرعد: ١١.

پەیوەندی ئەو سوننەتە خواییە بەئیسلامەوە یەکجار ڕوونە،چونکە دەسەڵات بەم شێوازەی ئوممەتی ئیسلامی لەسەرە ئێستا هەرگیز نایەت، بەڵکو پێویستە گۆڕانکاری بکرێت، ئینجا هەرگیز دەسەڵات بۆکەسانێك نابێت بەژیانی سەرشۆڕی ڕازی بوونەو هەوڵیش نادەن گۆڕانکاری دروست بکەن و خۆیان لەو دیلیە دەرباز بکەن...[1]

ئەو گۆڕانکاریەی پێغەمبەرﷺ دەستی پێکرد لەدەروونی ئادەمیزادەوە، دەست پێ کردوو پیاوانی مەزنیشی لێ دروستکرد، دوای ئەوە ڕێبەری کردن بۆئەنجامدانی گەورەترین گۆڕانکاری لەکۆمەڵگاداو، خەڵکی گواستەوە لەتاریکی یەوە بۆ ڕشنایی، لەنەفامیەوە بۆ زانست، لەدواکەوتنەوە بۆ پێشکەوتن.[2]

پێغەمبەری خواﷺ لەڕێگەی ڕێبازی قورئانەوە - بیروباوەڕو تێڕوانینەکانی بەجارێ گۆڕی، هەروەها هەست و ڕەوشتەکانی لەدەروندا گۆڕی، بۆیە خەڵکی دەوروبەر هەموویان گۆڕان، مەدینە گۆڕا، مەککە گۆڕا، جەزیرەو وڵاتەکانی فارس و ڕۆم هەموویان گۆڕان، لەخولانەوەیەکی جیهانی یادی خوادا.

قورئان لەسەردەمی مەککەدا بایەخی بەبیروباوەڕ دەدا و، بەچەندین شێواز دەیخستە ڕوو، بۆیە دڵەکان پڕبوون لەئیمان و گۆڕانکارییەکی گەورە دروست بوو، خوای گەورە دەربارەی ئەو گۆڕانکارییە دەفەرموێت: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ الانعام: ١٢٢.

---

١ - بڕوانە: التمكين للامة الاسلامية(ص، ٢١).

٢ - بڕوانە: نفوس و دروس في اطار التصوير القراني، توفيق محمد سبع(ص ٣٦٧).

**سێ یەم: ڕاسکردنەوەی لایەنی بیرو باوەڕ لەلای هاوەڵان.**

لەپێش هاتنی پێغەمبەرﷺ تێڕوانینی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێ بۆ خوای گەورە، کەم و کورتی و نوقسانی تێدا بوو، ئەوانە لەڕاستی ناوو سیفەتەکانی خوا لایان دابوو ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَـٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ الاعراف : ١٨٠.

بۆیە قورئانی پیرۆز هات بۆ چەسپاندنی بیرو باوەڕی ڕاست و چەسپاندنی لەدڵی ئیماندارانداو، ڕوونکردنەوەی بۆ هەموو خەڵکی، لەڕێگەی ڕوونکردنەوەی هەموو ئەو مەسەلانە پەیوەندیان هەیە بەبیرو باوەڕەوە.....[1]

پەروەردەکردنی لەسەر بنەمای یەکتا پەرستی، ئەو بنچینە بوو بنیاتنانی ئیسلامی لەسەر دامەزرا، هەر ئەو ڕێبازە ڕاستەشە، کە پێغەمبەران لەسەری ڕۆیشتوون.

پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ هاوەڵانی بەروبومێکی پیرۆزی هەبوو، بۆیە ئەوانە پاکبوونەوە لەهەمووشتێکی نەگونجاو لە یەکتاپەرستی (الوهیە)و (ربوبیة)و (اسماء وصفات) گوێڕاەڵیشیان تەنها بۆ خوا بوو، تەنها بەخوایش پشتیان دەبەست، تەنها لەخوا دەترسان، کەسیشیان زیاتر لەخوا خۆشندەویست، تەنها ملکەچی فەرمانی خوا دەبوون، پەناشیان تەنها بۆخوا دەهێنا، داوای لێخۆشبوونیان جگەلە خوا لەکەس داوا نەدەکرد، قوربانیشیان تەنها بۆخوا دەکرد...[2]

**چوارەم: باسکردنی بەهەشت لەقورئاندا و کاریگەری لەسەر هاوەڵان:**

قورئانی پیرۆز بایەخی دا بەباسکردنی ڕۆژی دوایی کەم سوڕەتیش هەیە باسی حاڵەتەکانی ڕۆژی دوایی تیا نەکرابێت،وەکو باسی بەهەشتییەکان و دۆزەخیەکان و شێوەی حەشر کردنی خەڵکی و لێپرسینەوەیان، بەشێوەیەك وەکو چۆن بەچاو بیبینێت.

---

١ ـ بڕوانە: اهمية الجهاد في نشر الدعوة، علي العلياني(ص ٤٧).

٢ ـ بڕوانە: اهمية الجهاد في نشر الدعوة(٥٤، ٥٥).

**١ـ بەهەشت هاوشێوەی نییە:**

ئایەتەکانی قورئان بەشێوەیەك باسی بەهەشتیان کردووەکە هاوشێوەی نییە لەبوونەوەردا، ئەویش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هاوەڵان.

خۆشی بەهەشت ئامادەکراوە بۆ بەندە لەخواترسەکان، هەڵقوڵای بەخشندەیی خوایە، کە هەندێ لەوانەی باس کردووەو هەندێکیشیان شاردووەتەوە کەبیرو هۆشەکان تێیان ناگەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ السجده: ١٦ـ ١٧.

**٢ـ چاکترین ئەوشتەی بەهەشتیەکان پێیاندەدرێت:**

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((اذا دخل اهل الجنة الجنة يقول تبارك وتعالى: تريدون شيئا ازيدكم....))[١] واتە: کاتێك بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ئایا شتێکی ترتان دەوێت بتاندەمێ؟ ئەوانیش دەڵێن: ئایا تۆ ڕووت سپی نەکردین، نەتخستینە بەهەشتەوەو لە دۆزەخ قوتارت نەکردین کردین؟ دەفەرموێت: (( فيرفع الحجاب، فينظرون الى وجه الله فما اعطوا شيئا احب من النظر الى ربهم تبارك وتعالى))، واتە: ئینجا پەردە لابراو، سەیری ڕوومەتی خوایان کرد، شتێکیان پێنەدرابوو هەرگیز لەوە چاکتر کە سەیری خوای خۆیان بکەن.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾یونس: ٢٦.

بەبیرهاتنی بەهەشت و باوەڕی پتەو پێی، گەلێك گرنگە بۆ ڕاپەڕینی نەتەوەکەمان، چونکە کاتێك وێنەی بەهەشت زیندوو بێت لەدەروونی کەسەکاندا، بەخێرایی دەڕۆن بەرەو ڕەزامەندی خوای گەورەو، هەڵدەسن بەبەخشینی هەموو

---

١ ـ مشكاة المصابيح للبغوي ( ٣/ ٨٨ ورقمه ٥٦٥٦) رواه مسلم.

شتێك و ترسی مردن دایاننا‌گرێتەوە، هەموو هەوڵ و کوششێکیان ئەوکاتە بۆ ئەوە دەبێت ئایینی خوا سەرنج بدەن.

**پێنجەم: باسی دۆزەخ لەقورئاندا و کاریگەری لەدڵی هاوەڵاندا:**

هاوەڵان ترسی خوایان هەبوو، هیواو ئومێدیشیان پێی هەبوو، ئینجا پەروەردەی پێغەمبەرﷺ کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەردڵەکان، چونکە ئەو ڕێڕەوە قورئانیەی پێغەمبەرﷺ بەرپای کرد لەگەڵیان دەبووە مایەی ئەنجامدانی کاری مەزن، چونکە قورئان باسی ناخۆشیەکانی ڕۆژی قیامەت دەکات، وەکو لوولدانی ئاسمان و تەختکردنی چیاکان و تەقاندنەوەی دەریاکان و هەموو ئەو گۆڕانکاریانەی تر کە دادێن لەئاسمان و ئەستێرەکان، هەروەها قورئانی پیرۆز باسی کردووە لەحاڵی بێباوەڕان و سەرشۆڕی و پەشیمانی و بێ ئومێدی و پووچەل بوونەوەی کارەکانیان وە کۆکردنەوەیان بەرەو دۆزەخ و، تێپەڕبوونی ئیمانداران بەسەرپردی (صراط) و قورتاربوونی ئیمانداران.[1] ئەمانەش ئەوپەڕی کاریگەرییانەن هەبوو لەسەر دەروونی هاوەڵان و دەتووت بەچاو سەیری دەکەن.

**شەشەم: واتای قەزاو قەدەرو کاریگەری لە پەروەردەکردنی هاوەڵاندا.**

قورئان لەقۆناغی مەککەدا گرنگیدا بەباسکردنی قەزاو قەدەر، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ القمر: ٤٩.

پێغەمبەرﷺ ئەو واتایەی جێگیر دەکرد لەدڵی هاوەڵاندا، تێگەیشتنی ڕاستی ئەوانیش بووە مایەی هەندێ بەرووبوومی بەسوود، لەوانە:

١ـ ئەنجامدانی پەرستنی خوای گەورە.

٢ـ باوەڕ بوون بەقەدەر ڕێگای قوتار بوونە لەشیرك چونکە خاوەن باوەڕ لای وایە کە ئەوکەسەی ئەتوانێت سوودو زیان و سەربەرزی و سەر شۆڕی و بەرزبوونەوەو دابەزاندن بکات تەنها خوایە.

---

١ ـ بڕوانە: الوسطية في القرآن الكريم( ص ٤٢).

٣- ئازایی و بوێری: چونکە ئەوان بەبۆنەی باوەڕی تەواویان بەقەزاو قەدەر دڵنیا بوون لەوەی کە ئەجەل بەدەستی خوایە، هەموو کەسێکیش کاتی مردنی دیاری بووە.

٤- ئارامگرتن و ڕووبەڕووبونەوەی ناخۆشییەکان.

٥- ئارامی دڵ و دەروون وبیرو ئاسوودەیی.

٦- سەربەرزی و قەناعەت و ئازارد بوون لەکۆتی ئادەمیزادەکان.

لەڕاستیدا سوودەکانی باوەڕبوون بەقەزاوقەدەر زۆرن، بەلاّم ئەمانە ئاماژەیەك بوون.

پەروەردەی پێغەمبەرﷺ بۆ هاوەڵەکانی لەوە کورت هەڵنەهاتبوو، کە شەش کۆڵەکەی ئیمانیان فێرکات، بەڵکو چەندین واتاو تێڕوانینی هەڵەی بۆ چاککردنەوە، بۆ ئەوەی موسڵمان لەسەر ڕووناکییەك ڕێی بکات لەلای خوای گەورەو بشزانێت ئامانج چییە لەبوونی لەژیاندا و هەڵسێ بەهێنانەدی ئەوەی داوای لێکراوەو لەدرۆو ئەفسانە ڕزگاری ببێت.[١]

**حەوتەم: شارەزایی هاوەڵان لەڕاستی مرۆڤ.**

قورئانی پیرۆز مرۆڤی بەخۆی ناساند، دوای ئەوەی، کە خوا ڕۆژی دوایی پێناساند، هەروەها وەلاّمی ئەو پرسیارە فیتریانەی دانەوە. لەکوێوە بۆ کوێ؟ کەئەم پرسیارانە پێویستە وەلاّم بدرێنەوە، هەموو مرۆڤێکی تەواویش دەیکات و پێویستی بەوەلاّمەکەیەتی.[٢]

هەروەها قورئانی پیرۆز ڕاستی سەرهەڵدانی مرۆڤایەتی ڕوونکردۆتەوە بۆ هاوەلان، لەگەڵ ئەو بنچینانەش کە بۆی دەگەڕێتەوەو، چییان لێداواکراوە لەم ژیانەو چی دەبێت لەدوای مردن؟

---

١ - اهمية الجهاد في نشر الدعوة الاسلامية (٥٩).

٢ - بڕوانە: منهج التربية الاسلامية/ محمد مصطفى(٢/ ٥٤).

**هەشتەم: تێڕوانینی هاوەلان بۆ بەسەرهاتی شەیتان لەگەل ئادەم ﷺ.**

پێغەمبەری خواﷺ بەپێی پێڕەوی قورئان، باسی بەسەرهاتی شەیتانی بۆ دەکردن لەگەل ئامادەم و، ڕاستێتی ململانێی نێوان مرۆڤ و دوژمنەکەی، کە هەولی داوە ئادەمی باوکیان لەخشتە ببات، لەڕێگەی ئایەتەکانی قورئان وەکو: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ الاعراف: ٢٧.

ئەو ئایەتانەی کە باس لەئەم بەسەرهاتە دەکەن، ئەوەی یەکەمی موسڵمانانی فێری زۆر مەسەلەی گەورە کرد لەبواری تێڕوانین و بیروباوەڕو ئاکار، لەوانە:

١ـ ئادەم بنچینەی ئادەمی زادەکانە.

٢ـ ناوەڕۆکی ئیسلام بریتیە لە گوێڕایەڵی ڕەها بۆ خوای گەورە.

٣ـ مرۆڤ دەکەوێتە ناو تاوانەوە.

٤ـ تاوانەکەی ئادەم موسڵمان فێری پێویستی پشت بەخوا بەستن دەکات.

٥ـ پیویستی گەڕانەوەو داوای لێخۆشبوون لەخوا.

٦ـ خۆپاراستن لەچاو تێبڕین لەشتی خەڵکی و خۆ بەزلزانین.

٧ـ ئیبلیس دوژمنی ئادەم و خێزانەکەی و نەوەکانیانە.

٨ـ پێکەوە قسە کردنی هاوەڵان بەجوانترین شێوە هەندێك لە ئەو هۆکارانەی، کە هاوەڵان بەکاریان هێنا بۆ شەڕکردن لەگەل شەیتان، گوێڕایەڵییان بوو بۆ فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٗا مُّبِينٗا ﴾ الاسراء: ٥٣.

**نۆیەم: دیدی هاوەلان بۆ گەردوون و ژیان و هەندێك لەدورستکراوەکان:**

پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە هاوەڵانی فێری قورئانی پیرۆز دەکرد و پەروەردەی دەکردن لەسەر تێڕوانینی ڕاست بۆ کێشەکانی بیرو باوەڕ و تێڕوانینی

تەواو بۆ بوونەوەرو ژیان، لەڕێگەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانەوە، ئیتر سەرەتای بوونەوەرو سەرئەنجامی بۆ ڕووندەکردنەوە.

هەروەها قورئانی پیرۆز باسی ڕاستیەکانی ئاژەڵی بۆ دەکردن، کە هیچی کەم نەبوو لە ڕاستیەکانی تر، کە باسی دەکرد.

بەم شێوەیەش قورئانی پیرۆز بیرۆکە و تێڕوانینی نەوەی یەکەمی موسڵمانانی ڕێکخست سەبارە بەگەردوون و دروستکردوەکان، هەروەها ڕاستی ئەم ژیانە لەناو چووە، پێغەمبەریشﷺ بەردەوام هەر ڕاستی چارەنووس و ڕێگای ڕزگار بوونی لەدل و دەروونی هاوەڵەکانی دەچاند، چونکە دڵنیا بوو لەوەی هەرکەسێك ئەوشتانە بزانێت، بەهەموو توانایەکییەوە هەوڵ دەدات، کە ڕێگەی ڕاست بگرێت و سەرکەوێت، لەم بوارەشدا پێغەمبەرﷺ توندیی دەکرد سەر لایەنێکی گرنگ کەبریتی بوو لەوەی کە ئەم ژیانە هەرچەند درێژ ببێتەوە هەر کۆتایی پێدێت، خۆشییەکانیشی هەرچەندە زۆر بن، هەرکەم و براوەن.

لەڕاستیدا زۆرێك لەکارمەندانی بواری بانگەواز، ئەم ڕاستیە لە دڵەکانیاندا لاواز بووە، چونکە لەخۆشیەکانی ئەم ژیانەدا نگرۆ بوونە و بەدوایدا هەر خەریکی ڕاکردنن، هەر کاتێکیش شتێکیان دەستدەکەوێت داوای زیاتر دەکەن و تێربوونیان نییە، ئەمەیش کارەساتێکی گەورەیە بەڕاستی، بەڵام خۆشگوزەرانی لەو سنوورەی کە شەرعی خوا دەستنیشانی کردووە، کە بێتە هۆکارێك بۆ ڕۆژی دوایی، ئەوە کارێکی چاکە.

## باسی چوارەم: مەسەلەی خواپەرستن لەسەردەمی مەککەدا

### یەکەم: خاوێن کردنی نەوەی یەکەم بەجۆرەها خواپەرستن:

پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵانی خۆی پەروەردەکرد لەسەر خاوێنکردنەوەی دڵەکانیان و، ڕێنمونیشی کردن بۆ ڕێگای بەدیهێنانی ئەوە لەڕێگەی قورئانەوە، وەکو:

١ـ بیرکردنەوە لە بوونەوەرو دروستکراوەکان و فەرموودەکانی خوای گەورە.

٢ـ تێڕامان لە زانستی خوای گەورە و دەورگرتنی بەهەموو شتێك لەگەردووندا، بەڵکو بەهەموو شتێك لەجیهانی نادیاریشدا.

٣ـ خواپەرستن لەگرنگترین هۆکارەکانی پاراوکردنەوەی دڵە، چونکە خواپەرستن ئەو پەڕی ملکەچییە بۆ خوای گەورە، کەکەسێ شایستەی نییە جگە لەخوای گەورە.

ئەو خواپەرستیانەش، کە دڵو گیان پاراو دەکەنەوە، دووجۆرن:

أ ـ جۆری یەکەم: ئەوانەی کە فەرزکراون وەکو: دەستنوێژ و نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج و شتی تر.

ب ـ جۆری دووەم: ئەوانەیە کە بەگشتی هەموو شتێك کە موسڵمانان لەخوا نزیك بکاتەوە، ئەنجامدەری پاداشت دەدرێتەوە و دڵ و گیانی پەروەردە دەکا.[1]

پاراوکردنەوەی دڵ بە قورئان خوێندن و یادی خواو... کارێکی گرنگە، چونکە ئەگەر دەروونی مرۆڤ خۆی ڕزگار نەکات لەپیساییەکانیو پەیوەندی نەکات بەخوای گەورەوە ناتوانێت واجیبەکانی ئیسلام ئەنجام بدات، یا بەبەردەوامی خوای گەورە بپەرستێت, نوێژ لەپێش هەموو ئەو عیبادەتانەوە دێت کە دڵی موسڵمانان خاوێن

---

١ ـ فقه الدعوة، د. علي عبدالحليم محمود( ١/ ٤٧١، ٤٧٢).

دەکاتەوە، لەوانەیە یەکێك لە دیارترین شوێنەوارەکانیشی کەلە سەر هاوەڵان دەرکەوت ئەمانەی خوارەوەبن:

١ـ بەگوێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەو دەربڕینی بەندایەتی: خوای گەورە وەسفی ئەوبەندانەی خۆی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾الشوری: ٣٨.

هاوەلان وایان دەزانی هەموو کارێك لەکارەکانی نوێژ خوا پەرستنێکی تایبەتەو، کاریگەری تایبەتی خۆی هەیە لەسەر خاوێنکردنەوەی دڵ و گیان.

٢ـ گفت و گۆکردنی بەندە لەگەل خوای خۆیدا: پێغەرﷺ بەشێکی لەئەو گفتوگۆیە ڕوونکردۆتەوە، کە دەفەرموێت: (( قال تعالى: قسمت الصلاة بيني وبين عبدي نصفين، ولعبدي ماسأل، فاذا قال الحمد لله رب العالمين...)).[١] واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: نوێژم لەنێوان خۆم و بەندەکەم کردۆتە دووبەشەوە، ئەوەشی داواکات ئەیدەمێ، ئەگەر بلێت ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم سوپاسی کردم، ئەگەریش بلێت: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم مەزن ڕایگرتم، ستایشی کردوم، ئەو کاتەش بلێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾دەفەرموێت: ئەمە لەنێوان خۆم و بەندەکەمدایە، ئەوەشی داوای کرد پێی دەدەم.

ئینجا کە دەلێت: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾دەلێت: ئەمە بۆ بەندەکەمەو، داواکارییەکەشی جێبەجێدەکەم.

٣ـ ئاسودەیی و سوکنایی دڵ: پێغەمبەریخواﷺ کارێکی گرنگ ڕووی تێکردبا[٢] نوێژی دەکرد، ڕۆشنایی چاوەکانی لەنوێژدا دەبینیەوە[٣] ئینجا هاوەڵانیشی

---

١ ـ مسلم، كتاب الصلاة، باب وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة (رقم: ٣٩٢).

٢ ـ ابو داود في الصلاة (رقم: ١٣١٩).

٣ ـ الحاكم(٢/ ١٦٠) وقال: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي.

فێردەکرد چۆن نوێژ بکەنە چەکێکی گرنگ بۆ چارەکردنی کێشەو گرفتەکانیان.

٤ـ نوێـژ پەرژینێکـە لـەپێش تاوانەکانـدا، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴾(العنكبوت:٤٥).

هاوەڵان کە نوێژیان دەکرد دەرونیان شاد دەبوویـەوە، هێزێکـی بـۆ ئەنجامـدانی چـاکەو دوورکەتنـەوە لەخراپـە پێیـان دەبەخـشی، ئـەوەش قـەڵغانێکی چـاك بـوو لەتاوان دەیپاراستن.[1]

## دووەم: پەروەردەی بیرو هۆش.

پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ بـۆ هـاوەڵانی گشتگیر بـوو، چـونکە لەقورئانـەوە وەریدەگرن، کە ئاڕاستەکراوە بۆ مرۆڤ بەگشتی وەکو گیان و لەش و ئەقڵ.

پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ بایەخی دەدا بەگەشە پێکردنی توانای تێـڕوانین و بیرکردنەوە و تێڕامانیان، چونکە هەرئەوەیە ئامادەیان دەکات بـۆ هـەڵگرتنی بـاری بانگەوازکردن بۆ لای خوا.

بۆیە قورئانی پیرۆز ڕێڕەوێکی داناوە بۆ پەروەردەکردنی بیرو هۆش، پێغەمبەری خواﷺ لەسەری دەڕۆیشت بۆ پـەروەردەکردنی هـاوەڵانی،گرنگترین خاڵـەکانی ئـەو ڕێڕەوە:

١ـ پاککردنـەوەی ئـەقڵ لەوشـتە نەگۆڕانـەی، کـە لەسـەر گومـان یـان لاسـایی کردنەوە بنیات نراون.

٢ـ ئەقڵ پێویستە بەدوا داگەڕان ووردبونەوەی هەبێت.

٣ـ هەروەها پێویستە تێڕوانین و بیرکردنەوەی هەبێت لەگەردوندا.

٤ـ تێڕامان لەوحوکمانەی، کە شەرع داینـاون.

٥ـ سەیرکردنی سوننەتی خوای گـەورە سـەبارەت بەخـەڵکی بەدرێـژایی مێـژووی مرۆڤایەتی، بۆ ئەوەی ببێتە پەند و سوود بۆ ئەوکەسەی، کەسەیر دەکات.

---

١ ـ بڕوانە: منهج الاسلام في تزكية النفس(١/ ٢٢٧).

## سێ یەم: پەروەردەی لەش.

پێغەمبەری خواﷺ سوور بوو لەسەر پەروەردەکردنی هاوەڵان لەڕووی جەستەییەوە، بنچینەکانی ئەو پەروەردەیەش لەقورئانی پیرۆز وە وەردەگرت، بەشێوەیەك کە لاشەکارەکانی خۆی ئەنجام بدات، بەبێ زیادەڕەوی یا خود کەمتەرخەمی، یان بەفیرۆدانی توانایەك لەسەر هەژماری توانایەکی تر.

هەر بۆیە قورئانی پیرۆز تواناکانی لاشەی ئادەمیزادی بەم شێوەیە ڕێکخستووە.

١ـ ڕێکخستنی پێداویستیەکانی بۆ خواردن‌وخواردنەوە.

٢ـ ڕێکخستنی پێویستیەکانی بەجل و پۆشاك، بەوەی کە ئەوەندەی عەورەتی پێ بشاردرێتەوە و لەگەرماو سەرما بیپارێزێت پێویستە، جگە لەوانەش بۆ جوانیە وەکو ڕۆیشتن بۆ مزگەوت.

٣ـ ڕێکخستنی پیویستی بەماڵ و خانوو.

٤ـ هەروەها ڕێکخستنی پێویستی بەهاوسەرگیری و خێزان پێکەوەنان بەڕەواکردنی ژن هێنان و، بەڵکو واجب بوونی لەهەندێ کاتداو، قەدەغەکردنی داوێن پیسی بەهەموو شێوازەکانی.

٥ـ ڕێکخستنی پێویستیەکانی بەدارایی و سەروەری، بەڕێگەدان بەماڵداریتی بەپێی ڕیکخەرە شەرعیەکان.

٦ـ هەروەها ئیسلام هەڵساوەبەڕێکخستنی سەرگەورەی بەقەدەغەکردنی ستەم و دوژمنایەتی.

٧ـ هەروەها پێویستی بەکاروسەرکەوتن ڕێکخستووە بەوەی ئەو کەسەی ناچارکردووە

کارەکەی ڕەوا بێت و، زیانیشی بۆ کەس نەبێت، بانگیشی لەخەڵکی کردووە کەلەم دونیایە هەڵسێ بەئەنجامدانی ئەوکارانەی، کە یارمەتیان دەدات هەڵسن بەکارەکانی بانگەواز و ئایین.

٨ـ خوای گەورەش وریایی داوەتە خەڵکی خۆیان بپارێزن لەزۆر خۆشحاڵی و لەخۆبایی بوون و، هەڵخەڵەتان بەدەوڵەمەندی و هوبوونی.

ئەمە هەندێك بوو لەو بنەمايانەی کە پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ لەبواری لاشەکاندا جەختی لەسەر کردووە، تاکو توانای هەڵگرتنی باری جیهادو خەمی بانگەواز و گرانییەکانی ژیانی هەبێت.

## چوارەم: پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر ڕەوشتی جوان و خاوێنکردنەوەيان لەخراپە.

ڕەوشتی جوان بەشێکی گرنگە لەبیرو باوەڕ، چونکە بیروباوەڕی ڕاست نابێت بە بێ ڕەوشت، پێغەمبەری خوايشﷺ هاوەڵانی لەسەر ڕەوشتی جوان پەروەردەکرد، لەڕێگەی چەندين شێوازی جياجيا.

پێغەمبەرﷺ فەرموويەتی: (( ما من شيء اثقل في ميزان المؤمن يوم القيامة من الخلق الحسن وان الله تعالى ليبغض الفاحش البذئ)).[1] واتە: شتێك نييە لەترازووی ئيمانداران قورستر بێت لەڕۆژی دوايی دا ئەوەندەی ڕەوشت جوانی، خوای گەورەش ڕقی لەو کەسەيە قسەی پيس و نابەجێ دەکات, پرسياريش کرا لەپێغەمبەرﷺ دەربارەی ئەو شتەی کە زياتر دەبێتە مايەی چوونە ناو بەهەشتەوە، ئەويش فەرمووی: ((تقوى الله، وحسن الخلق))، واتە: لەخوا ترسان و ڕەوشت جوانی. هەروەها پرسياری لێکراوە دەربارەی ئەوشتەی کە زۆرتر خەڵکی دەباتە دۆزەخەوە فەرمووی: (( الفم والفرج))،[2] واتە: زمان و عەورەت.

ڕەوشت شتێکی لاوەکی نييە لەئەم ئايينەدا، ئابڵۆقەيش نەدراوە بەبازنەيەکی دياری کراو لەبازنەکانی ڕەفتاری ئادەميزادانە، بەڵکو وەرگێڕانی کردەييە بۆ بيروباوەڕی ڕاستەقينە، چونکە ئيمان هەست ونەستێکی شاراوە نييە لەناو ويژداندا بەتەنها؛ بەڵکو کارێکی پەيوەستە بەهەڵس و کەوتەوە، بەشێوەيەك کە بۆمان هەيە ئەگەر لەکەسێکدا نەمانبينی، يان پێچەوانەکەيمان بينی پرسيار بکەين: کەواتە ئيمان لەکوێيە ؟ بايەخيشی چييە ئەگەر نەبێت بەڕەفتار؟.[3]

---

١ ـ الترمذي، كتاب البروالصلة، باب ماجاء في حسن الخلق(رقم: ٢٠٠٢) حسن صحيح.

٢ ـ الترمذي، كتاب البر والصلة، باب ماجاء في حسن الخلق( رقم: ٢٠٠٤).

٣ ـ بڕوانة: دراسات قرآنية، لمحمد قطب( ص ١٣٠).

بۆیە دەبینین قورئان ڕەوشت دەبەستێتەوە بەبیروباوەڕ و، نموونەش لەسە ئەوە زۆرە.[١]

هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت لەسەر ئەوە پەروەردەبوون، کە ڕەوشت جۆرێکە لە خواپەرستن، چونکە ئەمەك بۆ خواو سوپاسگوزاری و، ڕێزگرتن لەخەڵکی ڕێزدار دەگرێتەوە، بۆیە ڕەوشتی هاوەڵان هەڵقوڵاوی باوەڕیان بوو بەخواو ڕۆژی دوایی و مەبەستیش تەنها خوا بوو.[٢]

ڕەوشت لەپەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ کارێکی گشت گیرە، بۆ نموونە ڕەوشتی نوێژ ملکەچ کردنە، ڕەوشتی قسەکردن خۆ دوورگرتنە لەقسەی پڕو پووچ، ئارەزو بازیش ڕەوشتی دورکەوتنەوەیە لەقەدەغە کراوەکانی خوا گەورە، ڕەوشتی مامەڵە کردنیش لەگەڵ خەڵکی میانڕەوییە لەنێوان دەستگرتنەوەو زیادەڕەوی،... بەم شێوەیەش دەردەکەوێت، کە هیچ شتێك نییە لە موسڵماندا ڕەوشتی نەبێت، یان ئاماژەیەکی ڕەوشتی لەگەڵدا نەبێت، خوای گەورە یەکتاپەرستی لەسەروی ڕێبازی ڕەوشتی داناوە، کەلە ئایەتەکانی سورەتی (الاسراء)دا هاتووە(٢٣ـ ٣٨)،چونکە یەکتا پەرستی لایەنێکی ڕەوشتی ڕەسەنی هەیە، چونکە هەڵسان پێی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوشتی دادگەریی و دادپەروەریی و ڕاستگۆیی لەخۆدا، هەروەها پشت هەڵکردن لێی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەوشت ناشیرینی بەپلەی یەکەم، وەکو خۆ بەزلزانین و هەق وەرنەگرتن و، خۆ بەگەورەزانین شوێن نەکەوتنی پێغەمبەران،یان ئارەزووی گومان کردن و مشت و مڕی بەتاڵ بۆ خۆ دەرخستن، یان لاسایی کردنەوەو مانەوە لەسەر قسەی دێرینەکان ئەگەرچی هەڵەش بێت، ئەمانەش هەمووی ڕەوشت ناشیرینیە، کە ڕێگەی لێدەگرێت بگەنە ڕاستی.

---

١ بڕوانە ئایەتەکانی سورەتی ( المؤمنون ١ـ ١١) سورەتی ( الانعام ١٥١ـ ١٥٣)

٢ ـ بڕوانە: الوسطية في القران الكريم(ص ٥١٩).

## پێنجەم: پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر ڕەوشتە جوانەکان لەڕێگەی سەرگوزشتەکانی قورئانەوە.

سەرگوزشتەکانی قورئان پڕن لەئامۆژگاری و دانایی و بنەڕەتی بیرو باوەڕ، ئاراستەکانی ئاکار و، شێوازەکانی ئاکارو، پەند وەرگرتن لەگەل و میللەتان، سەرگوزشتەکانی قورئان بریتی نین لە هەندێ مەسەلەی مێژوویی، تەنها تایبەت بن بەمێژوو نوسەکانەوە، بەڵکو لەوە زۆر گەورەو گرنگترە، چونکە پڕن لەیەکخوا پەرستی و، زانست و، ڕەوشتی جوان و،بەڵگەی ئەقڵی و، بەچاوڕوونی و یادخستنەوەو، گفتوگۆکردنی سەیر.

نموونەی یەکیش دەهێنمەوە لەسوڕەتی یوسفعليه السلام ، بەتێروانین لەلایەنی ڕەوشتی کەئاشکرایە لەدیمەنەکانی ئەو سوڕەتە، زانایانی ڕەوشت و هۆشمەندان دەڵێن: (( کارو باری میللەت هەرگیز ڕاست نابێت، تاکو چاکخوازان و پیاوانی کارگوزارو، ڕێپیشاندەران نەبن، ئەوانە مەرجی دیاریکراوو ڕەوشتی جوانیان هەیە، جا ئەگەر ئەوکەسەی هەڵدەستێ بەئەنجامدانی کارەکە پێغەمبەر بێت چل خاسیەتی پێویستە هەبێت، باسیان کردووە و هەمووی پەیوەندی هەیە بە بەڕێوەبردنی میللەتەکەیەوە، ئەگەر سەرۆکێکی چاکەکار بێت، لەو چل مەرجە هەندێکیان بەپێویست زانیوە بۆی، جا سەرگەورەمان یوسفعليه السلام ، خاسیەتی پێغەمبەرە ڕەوانەکراوەکان و جوانیانی تیادا بووە، لەسەر گوزشتەکەشیدا، ئەوەندە پەندو سوود هاتووە، کە هۆشمەندی میللەتان وەریبگرن بۆ هەڵبژاردنی شایستەکان بۆ کارەکان، چونکە ئەو پاشا و پێغەمبەریش بوو! جا لەبەر بڕانەوەی پێغەمبەرایەتی، بەوە واز دەهێنین، کەباسی دوانزە خاسیەت بکەین، کە پێویستە سەرۆکی چاکەکار لەسەری بێت، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی لێوردبوونەوەی قورئان و ئاگادارییەکیش بێت بۆ فێرخوازانی هەوڵدەر بۆ گەیشتن بەچاکە.[1]

---

١ ـ تفسير القاسمي(٩/ ٣٦٠).

گرنگترین ئەومەرجانەی زانایان دایانناوە بۆ سەرۆکی شاری چاکەکار:

١ـ داوێنپاکی بەرانبەر ئارەزووەکان، بۆ ئەوەی کارامە بێت و هێزی دەروونی هەبێت: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ یوسف: ٢٤.

٢ـ ئارامگرتن لەکاتی توڕەبووندا، بۆئەوەی خۆی بگرێتەوە: ﴿قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾ یوسف: ٧٧.

٣ـ نەرمی لەجێگای خۆی، توندی لەجێگای خۆی: ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِى بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ﴾ یوسف: ٥٩ـ ٦٠، سەرەتای ئایەتەکە نەرم و نیانیەو، کۆتایەکەشی توندییە.

٤ـ پشت بەخۆبەستن لەڕێگەی پشت بەستن بەخوا: ﴿قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ ۖ إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ یوسف: ٥٥.

٥ ـ بیرتیژی بۆ ڕووداوەکانی ساڵانی پێشووی بێتەوە یاد، بۆ کۆنترۆڵ کردنی سیاسەت و لەبەرچاوبوونی کارەکانی خەڵکی: ﴿وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ یوسف: ٥٨.

٦ـ چاکی نیگاکێشان و بیرەوەری بەهێز، بۆ ئەوەی شتەکان بە ڕوونی وەکو خۆیان باس بکات: ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ﴾ یوسف: ٤.

٧ـ ئامادەباشی بۆ زانست، لەگەڵ خۆشەویستی و بەهێزبوون تیایدا، ﴿وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ مِن

فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴾(یوسف: ٣٨)﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾(یوسف:١٠١)

٨ـ بەزەیی هاتنەوەی بە هەژارنداو خۆ بەکەمزانینی، سەرەڕای مەزنی پلەوپایەی قسەی لەگەڵ دوو هاوڕێکەی زیندانی کرد بە ئەوپەڕی بێ فیزیەوە: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴾ (یوسف: ٣٩) هەروەها دەربارەی کاروبارەکانی ئایین و دونیا قسەی لەگەڵ کردن: ﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓ ۚ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾(یوسف: ٢٧) ئەوانیش شایەتیان بۆی دا: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًا ۖ وَقَالَ ٱلْآخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ ۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾(یوسف: ٣٦).

٩- لێخۆشبون لەکاتی دەسەڵاتدا: ﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾(یوسف: ٩٣).

١٠ـ بەخشندەی لەگەڵ عەشیرەتدا: ﴿ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾(یوسف: ٩٣).

١١ـ ڕوونکردنەوەی جوان و زمان پاراوی لە لێکدانەوەی خەونی پادشا، هەروەها تواناشی لە سەرنج ڕاکێشانی دەسەڵاتداران و خەڵکی بەگشتی: ﴿لِنَفْسِي ۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾(یوسف: ٥٤).

١٢ـ ڕێکخستنی جوان: ﴿قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴾ (یوسف: ٤٧).

بێگومان پەیوەندیەکی پتەو هەیە لە نێوان سەرگوزشتەکانی قورئان و ڕەوشت، چونکە یەکێك لە ئامانجەکانی ئەو سەرگوزشتانە یادخستنەوەی ئاکاری جوانە، کە سوودی هەیە بۆ هەمووان، یەکێکی تریش لە ئامانجەکانی خەڵك دوورخستنەوەیە لە ئاکاری ناشیرین، کە دەبێتە هۆکارێك بۆ لەناو چوونی میلەتان.

ئینجا هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی بانگەوازی ئیسلامی و گەیشتنی بە ئاستی دەوڵەت، هەندێك هاندەری ناچار کەپەیدابوو، بریتیبوون لە:

أ ــ یاسادانان: لە پێناو پارێزگاری لە بەها ڕەوشتیەکان بوو، تاوانەکانی تۆڵەکردنەوە لە تاك و کۆمەڵ دەپارێزێ لە دەست درێژی لەسەر گیان و بە فیڕۆدانی هۆش(بەمەی و بێهۆشکەرە جیاجیاکان)

ب ـ دەسەڵاتی کۆمەڵگا: ئەویش دادەمەزرێت لەسەر بنەمای ئەو شتانەی، کە خوای گەورە پێویستی کردووە، وەکو فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپەو، ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا، کە خوا لەگەڵ زەکات و نوێژو گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرﷺ باسی کردووە.

﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(التوبه:٧٠) بەڵکو کر دوویەتی بەڕاگرێکی ڕەسەن بۆ چاکێتی ئەم ئومەتە﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ (آل عمران: ١١٠)

ج ــ دەسەڵاتی دەوڵەت:

کە بەرپابوونی پێویست بوو، دامەزراندنیشی لەسەر چەند بنەمایەکی ڕەوشتی پتەو بوو، ناچاریش بوو کە هەڵسێ بە چاودێریکردنی ئەو ڕەوشتانە و بڵاوکردنەوەی لە نێو کەسەکان و دەزگاکاندا.[1] بەم شێوەیەش ئاکاری ئیسلامی

١ – المنهاج القرآني في التشريع (ص ٤٣٣) .

هۆکارەکانی تەواو بوونی بۆ کۆبوویەوە، کۆمەڵگاش سیستەمێکی واقیعی نمونەی تیابەرپابوو، بە هۆی پابەندبونیەوە بە پێڕەوی خوای گەورە.

ئەمە هەندێك بوو لە هێڵەکانی دامەزراندنی تەلاری ڕەوشت لە قۆناغی مەککە دا، بەڕاستی ئەو پەروەردەش بەرووبومی خۆی هێنا، زیاتر لە بیست کەس لە کۆی پەنجا هاوەڵ لە سەرەتای بانگەوازەوە هەڵسا بە بەرپرسێتی، لە پاش بڵاوبوونەوەی بانگەوازی سەردەمی پێغەمبەرﷺو لە پاش وەفاتی، ئەوان بوون بە سەرکردەگەورەکانی ئوممەتو بیست کەسی تریشیان یان شەهید بوون، یان کۆچی دواییان کرد لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ، لە ئەو کۆمەڵە مەزنترین کەسایەتیەکانی بەڕەهایی هەڵکەوتن، نۆ کەسیان تیابوو لە دەکەسە مژدە پێدراوەکان بە بەهەشت، کە ئەوان چاکترینی ئەم ئوممەتەن لە پاش پێغەمبەرﷺ، ئەوان نموونە بوون دروستکردنی شارستانیەت بەو فیداکاریانەی کە دەیانکرد، وەکو: عەمماری کوڕی یاسر، عەبدوڵای کوڕی مەسعود، ئەبو زەڕ، جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب و کەسانی تر، هەر لەوانیش مەزنترین ئافرەتانی ئەم ئوممەتە هەڵکەوتن، وەکو خەدیجە ، لەگەڵ چەندین نمونەی تر، ئوممولفەزڵی کچی حاریس، ئەسمای کچی ئەبو بەکر، ئەسمای کچی عومەیس.....هتد.

ئەو کۆمەڵە بەڕێزە شانسدار بوون بەبڕێکی زۆر لەپەروەردەی بیرو باوەڕو دڵ و دەروون و بیرو هۆش و ئاکار لەسەر دەستی پەروەردەکاری مرۆڤایەتی موحەممەدﷺ ، بۆیە ئەوان بوون بەڕێنیشاندەری ئوممەت [1]، چونکە پێغەمبەری خواﷺڕێنموونی دەکردن و پەروەردەیدەکردن و خاوێنی دەکردنەوە لەپیسایی و نەفامی و جانەگەر بەختەوەر ئەو کەسە بێت، کە ئەگەر بۆجارێکیش بێت پێغەمبەرﷺ بینیبێت و باوەڕی پێ هێنا بێت، ئەی چۆن بێت بۆ ئەوکەسەی هاوەڵی ڕۆژانەی پێغەمبەری خواﷺ بووەو، شانسدار بووە بەوەرگرتنی زانست و ڕووناکی و گفتو گۆی ئەو پێغەمبەرە.

---

١ - بڕوانە: التربية القيادية للغضبان (٢٠١/١) .

# بەشی سێیەم

# ئاشکراکردنی بانگەوازو شێوازەکانی دژایەتی لەلایەن بتپەرستانەوە

## باسی یەکەم: ئاشکرا کردنی بانگەواز

پاش ئەو ئامادەکاریە گەورەی کەپێغەمبەری خواﷺ ئەنجامیدا بۆ پەروەردە کردنی هاوەڵان و، بنیاتنانی کۆمەڵی موسڵمانی ڕێکخراوی یەکەم، لەسەر بنەمای بیروباوەڕو خوا پەرستی وڕەوشتی بەرز، ئیتر کاتی ئاشکرا کردنی بانگەواز هات، لەدوای دابەزینی ئەم ئایەتە: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ (الشعراء:٢١٤، ٢١٥) .

بۆیە، هەڵسا بەکۆکردنەوەی هۆزو عەشیرەتەکەی و، بەئاشکرا بانگی کردن بۆ باوەڕهێنان بەخوای تاك وتەنیا، ئینجا ترساندنی بەسزای خوا ئەگەر لەقسەی دەرچوون، فەرمانیشی پێکردن بەڕزگارکردنی خۆیان لەدۆزەخ، هەروەها بەرپرسیارێتی هەموو کەسێکی بەرانبەر خۆی ڕاگەیاند .[١]

لەئیبنو عەبباسەوە ڕەزای خوای لێبێت، فەرموویەتی: لەکاتی دابەزینی ئایەتی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ پێغەمبەرﷺ چووە سەر کێوی صەفاو هاواری کرد ((ئەی نەوەی عەدی، ئەی نەوەی فیهر))_مەبەستی تیرەکانی قوڕەیش بوو_ تاکو کۆبوونەوە، کەسێك توانای ئامادەبوونی نەبوایە یەکێکی تری لەجێگەی خۆی دەنارد، ئینجا ئەبو لەهەب وهەموو قوڕەیش هاتن، ئەویش فەرمووی: ئایا ئەگەر پێتان بڵێم هەندێ ئەسپ سوار دەیانەوێت هێرش بهێننە سەرتان لەو دۆڵەوە، باوەڕم پێ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ، درۆمان لێت نەبینیوە، فەرمووی: کەواتە من

---

١- رسالة الانبياء، عمر احمد عمر ٣/٤٦ .

وریاكەرەوەی سزای سەختم بۆتان لەلای خواوە. ئەبو لەهەب وتی: دەستەكانت بشكێ، ئایا بۆ ئەمە ئێمەت كۆكردەوە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزان: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾[1]

لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە_تیرە تیرە بانگیانی دەكرد، بەهەریەكێكیش لەوانەی دەفەرموو: خۆتان لەدۆزەخ ڕزگار بكەن....

ئینجا فەرمووی: ئەی فاتیمە خۆت لەدۆزەخ ڕزگار بكە، من هیچم پێناكرێت بۆتۆ لەلای خوا، بەڵام ئێوە خزمایەتیەكتان هەیە بۆیە من هەڵدەستم بەجێبەجێكردنی مافەكانی .

قورەیشیەكان خەڵكێكی كردەیی بوون، كاتێك بینیان موحەممەدﷺ_كە[2] بە(الصادق الامين) دەناسرا_هاوار دەكات وپێش خۆی وپاش خۆیشی دەبینی، دادپەروەری وژیرییان ڕێگەیان پێی پیشان دان ووتیان: بەڵێ .

جاكاتێك شایەتی ئەوان بۆ ڕاستگۆیەتی پێغەمبەرﷺ بەدیهات، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: من ئاگادار كەرەوەم لەپێش سزایەكی سەخت لەلای خواوە دێت بۆتان، ئەوەیش پێناسەیەك بوو بۆ پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی و، ئەو زانستانەی كەتەنیا هەر خۆی دەیانزانێت، كە هاوێنەی نییە لەلای هیچ كەس وشوێنێك، ڕێگەش نەبوو لەو ڕێگەیە نزیكتر، نەشێوازیش هەبوو بۆ ڕوونكردنەوە لەو شێوازە ڕوونتر، خەڵكەكەهەمووی بێدەنگ بوون[3]، بەڵام ئەبو لەهەب وتی: دەستت بشكێت ئایا تەنها بۆ ئەمە ئێمەت بانگ كردووە ؟

بەم شێوەیش پێغەمبەرﷺ بنچینەكانی ڕاگەیاندنی دامەزراند، چونكە شوێنێكی بەرزی هەڵبژارد بۆ ئەوەی دەنگی بەهەموان بگەیەنێت، هەر ئەم كارەیشە كە كەناڵەكانی ڕاگەیاندن ئەنجامی دەدەن لەم سەردەمەدا، ئینجا بنچینەیەكی پتەوی هەڵبژارد بۆ بانگەوازەكەی ئەویش ڕاستگۆیی بوو، بەم كارەشی پیاوانی ڕاگەیاندن

---

١- البخاری_كتاب التفسير_ سورة الشعراء ورقمه ٤٧٧٠ والاية _من سورة المسد ١، ٢ .

٢- مسلم، كتاب الايمان ٣٤٨_ ٢٠٤ .

٣- بروانە: السيرة النبوية لابي الحسن الندوي لا ١٣٨ .

وبانگەوازی فێرکرد کەپەیوەندیکردن بەخەڵکی پێویستە پشت ئەستوور بێت بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر متمانەی تەواو لەنێوان نێرەرو وەرگردا، یان لەنێوان سەرچاوەی پەیامەکەو جەماوەر، هەروەها ناوەڕۆکیش دەبێت درۆی تیادا نەبێت .[١]

((ئینجا کارێکی ئاساییە کەپێغەمبەری خواﷺ لەبانگەوازی ئاشکرادا لەکەس و کاری خۆیەوە دەست پێبکات، چونکە مەککە شارێك بوو گیانی هۆزایەتی پەڵی تیادا هاوێشتبوو، لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ لەعەشیرەتەوە دەستی پێکرد، بۆ ئەوەی ببنە یارمەتیدەری وپارێزگاری بۆ دابین بکەن، هەروەها هەڵسان بەکاری بانگەواز لەمەککەدا پێویستە شوێنەوارێکی تایبەتی هەبێت، بەهۆی تایبەتمەندی ئەو شارەوە، چونکە ڕاکێشانی بۆ ڕیزی ئیسلام ڕۆڵێکی گەورەی دەبێت، وەکو لەقورئانیش دا دەردەکەوێت، کەقورەیش کراوە بەیەکەم هەنگاو بەرەو جیهانی بوون، ئایەتەکانیش هەر لەسەردەمی مەککەوە باسی لە جیهانێتی [٢] ئیسلام دەکرد، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ (الفرقان:١) .

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ (الانبياء:١٠٧) .

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (سبأ:٢٨) .

دوای ئەوە قۆناغێکی ترهات، ئەویش بریتی بوو لەبانگکردنی هەرکەسێك کەپێی بگەشتایە، بەڵکو بەدوای خەڵکیشدا دەڕۆی بۆ جێگاکانیان و، شوێنی کۆبونەوەکانیان، یان لەکاتی حەج دا، هەموو کەسێکی بانگ دەکرد، کۆیلەو ئازاد، بەهێزو لاوان، دەوڵەمەندو هەژار [٣]، کاتێك کەخوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ

---

١- بڕوانە: الحرب النفسية ضد الاسلام، د. عبدالوهاب كحيل (١٢١ ).

٢- بڕوانە: دراسات في السيرة، عمادالدين خليل لا ٦٦ .

٣- بڕوانە: رسالة الانبياء ٣/٤٨، ٤٩ .

يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴾ (الحجر:٩٤_٩٧) .

ئاکامی ئەم ئاشکراکردنەش ڕووبەڕوو بوونەوەو گاڵتە پێکردن بەدرۆ خستنەوە بوو، ململانێش سەخت بوویەوە لەنێوان پێغەمبەرﷺو نەیارەکانی و، سەرانی بتپەرستان وبێباوەڕاندا، خەڵکیش باسی ئەو ململانێیەیان دەکرد لەهەموو جێگایەك، ئەوەش خۆی لەخۆیدا دەستکەوتنێك بوو بۆ بانگەوازی ئیسلام، سەرسەختترین دوژمنەکانی بەشدارییان تیادا کرد، لەو کەسانەی کەلەنێو هۆزەکاندا قسەی خراپیان بڵاوەپێدەکرد .

هۆکاری ڕاگەیاندن لەو سەردەمە بریتی بوو لەگواستنەوەی هەواڵەکان لەڕێگەی باسکردنیان، بۆیە هەموو کەسێك بەهەواڵی پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ ئاگادار بوو، ئەم باسە گەورەیەیش بوو بەگفتوگۆی نێو کۆڕو دانیشتنەکانی هۆزەکان .[١]

## * گرنگترین ڕخنەی بتپەرستان :

گرنگترین ڕەخنەکانی سەرانی موشریکەکان ئاڕاستەیان دەکرد تاکوتەهنایی خوای گەورەو ڕۆژی دوایی و پەیامی پێغەمبەرﷺو قورئانی پیرۆزبوو. ئێستاش ئەو ڕەخنانە شیدەکەینەوەو بەرپەرچیان دەدەینەوە :

### یەکەم : ڕەخنەکانیان لەسەر یەکتا پەرستی.

بێباوەڕانی مەککە نکۆڵیان لەوە نەدەکرد کەخوای گەورە دروستکەری ئەوان و هەموو شتێکە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (لقمان:٢٥) . بەڵام ئەوان بتیان دەپەرست، بانگەشەی ئەوەشیان دەکرد کەلەخوا نزیکیان دەکەنەوە،

---

١- الغرباء الاولون لا ١٦٧ .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ (الزمر:٣) .

ئەوان بتپەرستیان لەمیللەتەکانی دەوروبەریان بۆ هاتبوو[1]، بۆیە بانگەوازی یەکتاپەرستی ڕووبەڕووی گەورەترین بەرەنگاری بوویەوە وزۆریان بەلاوە سەیر بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَٰذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ﴾ (ص:٤_٧).

ئەوان بۆچوونیشیان هەڵەبوو سەبارەت بەپەیوەندی خوای گەورە بەدروستکراوەکانی، چونکە ئەوان پێیان وابوو کەخوا هاوسەرێکی هەیە لەجنۆکە وفریشتەی دەبێت، فریشتەکانیش کچی خوان_پاکی وبێگەردی بۆ خوای گەورە لەو قسانە_ .

ئیتر ئایەتەکان دادەبەزین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە کەخوای گەورە خۆی جنۆکەی دروست کردووە و، بەهەمان شێوە فریشتەو مرۆڤەکانیش، هەروەها هەرگیز منداڵ وخێزانی نەبووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (الانعام:١٠٠_١٠١) . هەروەها ڕوونیشی دەکردەوە کە جنۆکەکان دان بەوەدا دەنێن کەخوای گەورە پەرستراوە، قسەی بێباوەڕانیش ڕەتدەکەنەوە: ﴿وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ (الصافات:١٥٨) .

---

١– بڕوانە: رسالة الانبياء ٢/٥٢ .

هەروەها داوای لەموشریکەکان دەکرد کە بەدوای ڕاستی بکەونو بەگومان و خەیاڵەوە قسەنەکەن: ﴿وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ (النجم:٢٧_٢٨) .

ئینجا ڕوونیشی دەکردەوە کەکارێکی شیاو نییە کەخوای گەورە کوڕ بەبتپەرستەکان بدات وخۆی کچی هەبێت، لەکاتێکدا کەکچ لەبۆچوونی ئەواندا لەکوڕ کەمترە: ﴿أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنَـٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا﴾ (الاسراء:٤٠) .

هەروەها لێپرسراوێتی دەخستە ئەستۆی بتپەرستەکان سەبارەت بەو قسانەی کەبەبێ بەلگە دەیکەن: ﴿وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ﴾ (الزخرف:١٩) .

## دووەم: باوەڕنەبوونیان بەڕۆژی دوایی.

سەبارەت بەبانگەوازی پێغەمبەرﷺ بۆ باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی، بتپەرستەکان ئەم قسەیان بەگاڵتەجاری وبەدرۆخستنەوە پێشوازی کرد: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۝٧ أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌ ۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ﴾ (سبأ:الایتان ٧، ٨) . ئەوان نکوڵیشیان دەکرد لەزیندوو بوونەوەی پاش مردن: ﴿وَقَالُوٓا۟ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ (الانعام:٢٩) .

سوێندیشیان لەسەر ئەوە دەخوارد: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ ۚ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝٣٨ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰذِبِينَ﴾ (النحل:٣٨_٣٩) .

واشیان دەزانی ژینێکی ترنییە جگە لەژیانی دونیا، داواشیان دەکرد باوباپیرانیان زیندوو ببنەوە تاکو باوەڕ بهێنن بەزیندوو بوونەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ (الجاثية:٢٤_٢٧) .

ئەوەیان نەزانی کەئەو کەسەی یەکەمین جار دروستیکردوون، دەتوانێت لەڕۆژی دواییدا زیندوویان بکاتەوە، موجاهیدو کەسانی تر دەڵێن: ئوبەی کوڕی خەلەف هاتە لای پێغەمبەرﷺ وئێسقانێکی ڕزیوی بەدەستەوە بوو، دەیوەراندو دەیدا بەباداو، دەیووت: ئەی موحەممەد، تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کەخوا ئەمە زیندوو دەکاتەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((نعم يميتك الله‌تعالى، ثم يبعثك ثم يحشرك الى النار)) واتە: بەڵێ خوای گەورە دەتمرێنێ وزیندووت دەکاتەوە ودەتخاتە دۆزەخیشەوە، ئینجا ئەم ئایەتەنەی خوێندەوە: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾(يس:٧٧_٧٩) .

شێوازەکانی قورئان بۆقایلکردنی خەڵکی پشتی دەبەست بەگوتاری بیرو هۆش و گونجان لەگەڵ فیترەتدا، خوای گەورە باسی ئەوەی کردووە کەحیکمەتی وابووە کەبەندەکانی زیندوو بکاتەوە بۆ پاداشت ولێپرسینەوە، چونکە خوای گەورە خەڵکی دروست کردووە بۆ پەرستنی خۆی، پێغەمبەرانیشی ناردووەو، کتێبەکانی دابەزاندووە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگایەی کەلەسەری بڕۆن بۆ پەرستن و گوێڕایەڵی کردنی وهەڵسن بەئەنجامدانی فەرمانەکانی وخۆیان بپارێزن لەقەدەغە کراوەکانی، جاهەندێك لەبەندەکان ڕێگەی ڕاستی ڕەتکردەوەو گوێڕایەڵی خوای

نەکردو ستەمی کرد، ئایا لەپاش مردنی پیاو چاك و پیاو خراپ پێویست نییە پاداشت بدرێنەوە چاکە بەچاکە وخراپە بەخراپە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴾ (القلم:٣٥_٣٨) .

ئەو بێباوەڕانەی کەستەمیان لەخۆیان کرد، هەر ئەوانن کەوا ئەزانن ئەم گەردوونە هەروا بەبێ حیکمەت دروست کراوە، گوایە جیاوازیش نییە لە نێوان سەرئەنجامی چاکەکارو خراپەکاردا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴾ (ص:٢٧_٢٨) .

قورئانی پیرۆزیش نموونەی بۆ خەڵکی هێناوەتەوە، بەزیندووکردنەوەی زەوی بەڕووەك، ئەو کەسەش کەئەو زەوییە زیندوو دەکاتەوە، بەتوانایە کەژیان بگێڕێتەوە بۆ ئەو لاشە بێگیانانە: ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (الروم:٥٠) .

هەروەها خوای گەورە نموونەی بۆ خەڵکی هێناوەتەوە لەقورئاندا بەوەی کەهەندێ مردووی زیندوو کردووەتەوە، وەکو (اصحاب الکهف) کەسێ سەدو نۆساڵ خەواندنی ولەپاش ئەو ماوە دورو درێژە بەئاگای هێنانەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴾ (الکهف:١٩) . ﴿ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴾ (الکهف:٢٥) .

جگـە لەبەڵگـەی تـر کەپێغەمبـەرﷺ بەکاریـدەهێنا لەگـەڵ سـەرانی کـوفرو بتپەرستاندا .

## سێیەم: ڕەخنە گرتنیان لە پێغەمبەرﷺ.

ئەوان ڕەخنەیان هەبوو لەپێغەمبـەری خـواﷺ، چـونکە پێیـان وابـوو پێغەمبـەر نابێت ئادەمیزادێك بێت وەکو خۆیان، بەڵکو پێویستە فریشتە بێت، یـان فریـشتەی لەگـەڵ بێـت: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴾ (الاسراء:٩٤) .

﴿وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴾ (الانعام:٨)

﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾(الانعام:٩)

واتە: ئەگەر پێغەمبەرێکمان لەفریشتەکان بناردایە بۆ خەڵکی لەشێوەی پیاوێکدا دەماننارد، کەبتوانن گفتوگۆی لەگەڵ بکەن وشتی لێوەربگرن، ئەگەر وایش بوایە ئەوا شتەکانیان لێ تێکەڵ دەبوو وەکو چۆن لێیان تێکەڵ بووە لەمەسەلەی وەرگرتنی پەیامی ئادەمیزاد [1]، ئینجا ئەوان پێغەمبەرێکیان دەویست کەپێویستی بەخواردن نەبێت و، لەبازاڕەکان نەگەڕێ: ﴿وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا﴾ (الفرقان:٧_٨) . وەکو چۆن هەرگیز نەیانبیستبێت کەپێغەمبەرانی تر هەموویان خواردنیان خواردووەو خەریکی هەوڵدان وکارکردن بوونە: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴾(الفرقان:٢٠) .

---

١- تفسير ابن كثير ٢/١٢٤ .

ئینجا دەیانەویست پێغەمبەر ماڵی زۆری هەبێت وگەورە بێت لەچاویاندا: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ (الزخرف:۳۱) . مەبەستیان لەوەلیدی کوڕی موغیرە لەمەککەو، عوروەی کوڕی مەسعود بوو لەتائیف .[۱]

هەروەها پێغەمبەری خوایان بەشێتی تۆمەتبار دەکرد: ﴿وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ۝٦ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾ (الحجر:٦_٧) .

﴿أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ۝١٣ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ﴾ (الدخان:۱۳_١٤) .

خوای گەورەیش بەرپەرچی دانەوە: ﴿مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾ (القلم:۲) .

هەروەها قەشەیەتی وهەڵبەستنی هۆنراوەیان دەدایە پاڵ پێغەمبەرﷺ: ﴿فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ۝٢٩ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ﴾ (الطور:۲۹_۳۰) .

خۆیشیان دەیانزانی کەئەو هۆنراوە ڕێکناخات وبیرو هۆشێکی پەسەندی هەیە، ئەوەیش کەئەڵێت دوورە لەقسەی قەشەو جادو گەرەکان .[۲]

بەهەمان شێوە وتیان جادوگەرو درۆزنە: ﴿وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَـٰفِرُونَ هَـٰذَا سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾ (ص:٤) .

﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ۝٤٧ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا﴾(الاسراء:٤٧، ٤٨)، بەڵام ئایەتەکان پەیتا پەیتا دادەبەزین بۆ

---

۱- تفسیر ابن کثیر ١٢٦/٤، ١٢٧ .

۲- بڕوانە: رسالة الانبياء ٥٧/٣ .

بەرپەرچدانەوەی ئەو قسانە، ئەوەشی دەردەخست کە پێغەمبەرانی پێش موحەممەدﷺ گاڵتەیان پێکراوە و دواڕۆژی ئەو گاڵتەکەرانەیش سزای سەختە: ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ (الانعام:١٠) .

هەروەها ئایەتەکان ئەوەشیان باس دەکرد کەئەوان خودی پێغەمبەرﷺ بەدرۆزن نازانن، بەڵکو ئەوان پەیامەکەی بەدرۆدەخەنەوە، ئایەتەکانی خوای گەورەیش بەو قسانە ڕەتدەکەنەوە [١]:

﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ (الانعام:٣٣) .

## چوارەم: هەڵوێستیان لەقورئانی پیرۆز.

هەروەها ئەوان باوەڕیان نەبوو کەقورئان لەلای خواوە دابەزیوە، بەڵکو بەجۆرێك لە هۆنراوەیان دەزانی، سەرەڕای ئەوەی هەرکەسێك بەراوردی بکات لەنێوان قورئان وهۆنراوەدا بەئاشکرا جیاوازی دەبینێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (یس:٦٩_٧٠) . ئینجا قورئان چۆن دەبێت هۆنراوە بێت لەکاتێکدا زەمی شاعیرانی کردووە کەدرۆدەکەن وخەڵکی گومڕادەکەن [٢]، ﴿ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ﴾ (الواقعة:٤٠_٤٣) .

شاعیران پێش خەڵکانی تر دەیانزانی کەقورئان هۆنراوە نییە، [٣] ئینجا لەتەواوی بەدرۆخستنەوەو ملهوڕییان ئەوە بوو دەیانووت: موحەممەد لەکەسێکی ئەعجەمی

---

١- هەمان سەرچاوە ٣/٥٨ .

٢- هەمان سەرچاوە ٣/٥٩ .

٣- بڕوانە: رسالة الانبياء ٣/٥٩ .

یەوە فێری قورئان دەبێت [1] کەگەنجێك بوو لەقورەیش، فرۆشیار بوو لەلای صەفا، کەمێك عەرەبی دەزانی، جاری وابوو پێغەمبەرﷺ لەگەڵی دادەنیشت وقسەی لەگەڵ دەکرد، بەڵام ئەو ئەوەندە عەرەبی دەزانی کەوەڵامی قسە بداتەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ﴾ (النحل:١٠٣) .

هەروەها ڕەخنەیان دەگرت لەچۆنیەتی دابەزینی قورئان و، داوایان کرد هەمووی پێکەوە دابەزێت، سەرەڕای ئەوەی کەبەش بەش دابەزینی مایەی جێگیربوونی دڵی باوەڕدارانە پێی و، ئاسانکارییەکە بۆ تێگەیشتن ولەبەر کردنی وپەیڕەوکردنی: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا﴾ (الفرقان:٣٢) .

جاکاتێك بێباوەڕەکان ڕەخنەیان گرت لەقورئان، خوای گەورە بەرەنگاریان بوویەوە کەیەکێك بتوانێت قورئانێکی لەو جۆرە بهێنێت، ئەوەشی ڕاگەیاند کەهەرچی مرۆڤ وجنۆکە هەیە ئەوەیان پێ ناکرێت: ﴿قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ (الاسراء:٨٨) .

بەڵکو ئەوانە دەسەڵاتی هێنانی چەند سوڕەتێکیان نییە: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا أُنزِلَ بِعِلْمِ اللَّهِ وَأَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (هود:١٣، ١٤) .

تەنانەت یەك سوڕەتیش هەرناتوانن بهێنن: ﴿وَمَا كَانَ هَٰذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ

---

١- بڕوانە: تهذيب السيرة ١/٧٤، ٩٠ هەروەها بڕوانە: سيرة ابن هشام ق ١/٣٩٣ .

﴿٣٧ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾ (یونس:٣٧، ٣٨) .

دەستەوسانی ئەوان، سەرەڕای ئەوە کەئەوان بەسروشت زمانپاراو بوون، هۆنراوەو(معلقات)ە کانیشیان لەچڵەوپۆپەی دەربڕیندا بوون، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەقورئان قسەی خوایە لەهیچ قسەیەکی تر ناچێت.....[١]

---

١- بڕوانە: رسالة الانبياء ٣/٦٦ .

## باسی دووەم: تاقیکردنەوە.

تاقیکردنەوە بەشێوەیەکی گشتی، سوننەتێکی خوایە لەدروستکراوەکاندا، ئەمەیش شتێکی ئاشکرایە لەباسەکانی قورئاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَـٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَـٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ﴾(الانعام:١٦٥) . هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ (الکهف:٧).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾ (الانسان:٢) .

تاقیکردنەوە پەیوەستە بەدەسەڵاتەوە بەشێوەیەکی پتەو، سوننەتی خواوایە کەدەسەڵات بەهیچ میللەتێك نەدرێت تا بەقۆناغەکانی تاقیکردنەوەدا تێنەپەڕێت و، چاك وخراپ لەیەك جیانەبێتەوە، ئەمە سوننەتێکی کاریگەرە لەسەر موسڵمانان دواناکەوێت، خوای گەورە ویستی لەسەر ئەوە بوو کەئیمانداران تاقیبکاتەوە وئینجا دەسەڵاتیان پێببەخشێت، هەر ئەم واتایە لەسەر زاری پێشەوا شافیعی پێمان گەیشتووە کاتێك پرسیاری لێکرا: کامیان باشترە بۆ کەسێك، دەسەڵاتی پێبدرێت یان تاقی بکرێتەوە؟ ئەویش فەرمووی: دەسەڵاتی پێنادرێت تاکو تاقینەکرێتەوە، خوای گەورە ئەوەی کردووە تەنانەت لەگەڵ نوح وئیبراهیم وموساو عیسا و موحەممەد، درودوسڵاوی خوایان لەسەر بێت، جاکاتێك ئارامیان گرت دەسەڵاتیان پێدرا، کەسیش وانەزانێت لەئازار ڕزگاری دەبێت[1] .

١- الفوائد لابن القیم لا ٢٨٣ .

## حیکمەتی تاقیکردنەوەو سودەکانی:

### ١- پاڵاوتنی ڕیزەکان:

خوای گەورە تاقیکردنەوەی کردووەتە هۆکارێك بۆ پاڵاوتنی دڵەکان و جیاکردنەوەی ڕاست وپووچەڵ لەیەکتر، چونکە لەوانەیە کەسێك لەکاتی خۆشگوزەرانی ڕاستیەکەی دەرنەکەوێت، بەڵام ڕۆژانی سەخت دەریدەخات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ (العنکبوت:٢) .

### ٢- پەروەردەکردنی کۆمەڵی موسڵمان :

سەیید قوتب ڕەحمەتی خوای لێبێت لەم بارەوە دەفەرموێت: ((ئینجا ئەو ڕێگەی کەئیتر ڕێگەی جگە لەوە نییە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵ، کەئەم سەر زەوییە هەڵبگرێت وهەڵسێت بەئەرکەکانی، ڕێگەی پەروەردەکردنی کۆمەڵەو، دەرکردنی شاراوەکانی لەچاکەو هێزو خۆڕاگری، هەروەها ئەوە ڕێگەی ئەنجامدانی کردەیی یە بۆ ئەرکەکان و، ناسینی ڕاستیەکانی خەڵکیی وژیانە، بۆ ئەوەی بەهێزترینیان لەسەر ئەم بانگەوازە جێگیربن، چونکە ئەوانە شیاون بۆ هەڵگرتنی، بەئارامگرتنیشیان جێگای متمانەن)) [١].

### ٣- دەرخستنی پەنهانیەکانی دەروون :

لەم بارەشەوە خاوەنی ((في ظلال القرآن)) دەڵێت: ((خوای گەورە ڕاستی دڵەکان دەزانێت پێش ئەوەی تاقیان بکاتەوە، بەڵام تاقیکردنەوە لەجیهانی ڕووداودا ئەوە دەردەخات کەلەلای خوا ئاشکرایەو، بەئادەمیزادەکان نەگەیشتووە، تاکو خەڵکی لەسەر کردارەکانیان لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت نەوەك لەسەر ئەوەی کە لە زانستی خوادا ئاشکرایە، ئەمەیش لە لایەکەوە فەزڵی خوایەو، لەلایەکی تریشەوە پەروەردەیە بۆ خەڵکی، کەکەس سزا نەدرێت بەشتێك نەبێت کەدەرکەوتووە لێی، چونکە کەس لەخوا ئاگادارتر نییە لەڕاستی دڵەکان)) [٢].

---

١- في ظلال القرآن ٢/١٨٠ .

٢- في ظلال القرآن ٦/٣٨٧ او ٥/٢٧٢ .

**٤- ئامادەکردنی ڕاستەقینە بۆ هەڵگرتنی ئەمانەت:**

لەم بارەشەوە خاوەنی (الظلال) دەڵێت: ((حاشا لەخوای پەروەردگار پێویستی بەوە هەبێت سزای ئیمانداران بدات بەتاقیکردنەوە، یان ئازاریان بدات بەو بەڵایەی بەسەریان دەهێنێت، بەڵام ئەوە ئامادەکردنی ڕاستەقینەیە بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەسپەردەیە، چونکە پێویستی بەئامادەکردنێکی تایبەتە، ئەوەیش بەئەنجام ناگات دوای چەشتنی ناڕەحەتی نەبێت، هەروەها بەبەرزبوونەوە بەسەر ئارەزووەکانداو ئارامگرتنی ڕاسەقینە بەسەر ئازارەکانداو، متمانەی تەواو بەسەر خستنی خواو پاداشتی، سەرەڕای سەختی تاقیکرنەوەو درێژی ماوەیەکەی، دەرونیش زەبرو ناڕەحەتی دەیتوێنێتەوەو پیسیەکانی لەسەر لادەدات وهێزە شاراوەکانی دەردەخات، ئیتر ڕادەپەڕێت وکۆدەبێتەوەو ئینجا بەهێزی دەکات، بەهەمان شێوە زەبرو ناخۆشی ئەو کاریگەرییەی هەیە لەسەر کۆمەڵەکان، بۆیە خۆڕاگر نامێنی بەهێزترین وپتەوترینیان نەبێت لەڕووی متمانەیان بەخوای گەورەو یەکێك لەهەردوو چاکەکە، سەرکەوتن یان پاداشت، هەر ئەوانەشن کەلەکۆتاییدا ئاڵاکە وەردەگرن و دەبنە جێگای متمانە لەسەری پاش ئەو تاقیکردنەوانە)) .[١]

**٥- خۆناسینی ڕاستەقینە :**

لەم واتایەشدا سەیید قوتب ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: ((بۆ ئەوەی بانگخوازان ڕاستێتی خۆیان ودەروونی ئادەمیزاد بناسن لەکاتی گوزەراندنی ژیان و جیهاد بە شێوەیەکی کردەیی، ئینجا ڕاستی کۆمەڵ و کۆمەڵگاکان، لە کاتێکدا ئەوان دەبینن چۆن بنەمای بانگەوازەکەیان پێکدادان دەکات لەگەڵ ئارەزووەکانی خۆیان و خەڵکیدا، هەروەها شارەزایی پەیدا دەکەن دەربارەی ئەو شوێنانەی کەشەیتانی لێدەچێتە ژوورەوە بۆ دەروونەکان و، ئەو جێگایانەی خەڵکی تیا دەخلیسکێن و گومڕادەبن )) .[٢]

---

١- في ظلال القران ٣٨٩/٦ او ٢٧٢١/٥ .

٢- هەمان سەرچاوە ١٨١/٢ .

**٦- زانینی قەدەری بانگەواز :**

لەم بارەشەوە خاوەنی (في ظلال القران) دەڵێت: ((ئەوەیش بۆ ئەوەیە ئەم بانگەوازە بەبەهابێت بەلایانەوە، چەندیش بەڵایان بەسەردابێت لەپێناویدا ئەوەندە بەنرختر ببێتەوە لەلایان وفیداکاری بکەن لەڕێگەیدا، دەستیشی لێهەڵنەگرن لەهیچ بارودۆخێکدا .[١]

**٧- بڵاوبوونەوەی بانگەواز :**

ئارامگرتنی موسڵمان لەسەر ناخۆشی تاقیکردنەوە، بانگەوازێکی کپە بۆ ئەم ئایینە، دەبێتە مایەی ئەوەی خەڵکانێك بێنە ئیسلامەوە، ئەگەر بانگخوازەکان لاوازی وسستی دەربڕن کەس بەدەنگیانەوە نایەت، جاری وابوو یەك کەس دەهاتە لای پێغەمبەرﷺو فەرمانی پێدەکرا بگەڕێتەوە لای خزمەکانی، بۆ ئەوەی بانگیان بکات بۆ ئیسلام، ئەویش گوێڕایەڵ دەبوو، ئارامیشی دەگرت لەسەر ئازارو بەدرۆخستنەوەیان، بەردەوام دەبوو هەموو خزمانیشی دەهێنایە ناو ئیسلامەوە،[٢] لەلاپەڕەکانی داهاتوودا ئەوەمان بەرچاو دەکەوێت .

**٨- ڕاکێشانی خەڵکی بەتوانا بۆ بانگەوازی ئیسلام :**

بەرانبەر خۆڕاگری موسڵمانان وفیداکارییان، کەسە بەهێزەکان بەرەو لای بیروباوەڕی ئیسلام دێن، بەبۆنەی ئەو ئازایی وئیمان پتەوییەوە بانگەواز لەلای ئەو کەسانە مەزن دەبێت، بۆیە خەڵکەکە بەبێ دڵە ڕاوکێ بەرەو ئیسلام دێن، مەزنترین ئەو کەسایەتییانەی ئیسلام شانازیان پێوە دەکات لەئەم ڕێگایەوە هاتن .[٣]

**٩- گوناه لابردن وبەرزکردنەوەی پلەوپایە لەلای خوای گەورە :**

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((دڕکێك وبەرەو ژوورتر نایەتە ڕێگای موسڵمان تاکو پلەیەك پێی بەرزنەبێتەوە لەلای خوا، یان گوناهێکی پێ لەسەر

---

١- في ظلال القران ٢/١٨٠ .

٢- بڕوانە: فقه السيرة النبوية لا ١٩٢، ١٩٣ .

٣- بڕوانە: فقه السيرة النبوية لا ١٩٣، ١٩٤ .

لانەبات)) [١] لەوانەیە بەندەیەك پلەیەکی هەبێت بەزانستەکەی پێی نەگات، بۆیە خوای گەورە تاقیدەکاتەوە تاکو بەرزیکاتەوە، هەروەها تاقیکردنەوە ڕێگایەکە بۆ سڕینەوەی گوناهی موسڵمان .

بەهەمان شێوە تاقیکردنەوە سوودی زۆریشی هەیە، لەوانە: پەیبردن بەدەسەڵاتی خوای گەورە و، ملکەچی بەندایەتی و، دڵسۆزی و، گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورەو، نزاو پاڕانەوەو، ئارامگرتن لەڕووداني بەلاو کارەسات و، دەربڕینی دڵخۆشی بەهۆی سوودەکانی و، سوپاسی خوا لەسەری و، یارمەتیدانی خەڵکی و، زانینی بایەخی ساغ وسەلامەتی و، سوپاس کردنی خوای گەورە بەهۆی ئەو پاداشتەی لەسەریان دەیداتەوە لەڕۆژی دواییدا، لەگەڵ چەندین سوودی تر، بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە کتێبی فقه الابتلاء . [٢]

---

١- مسلم بشرح النووي ١٢٧/٦، ١٢٨ کتاب البر والصلة، باب ثواب المؤمن، ورقمه ٢٥٧٢ .

٢- بڕوانە: فقه الابتلاء، محمد ابو صعيليك لا ١٥_٢٨ .

## باسی سێیەم: شێوازەکانی بەرەنگاری بانگەوازی ئیسلام لەلایەن بتپەرستەکانەوە.

بتپەرستان هەموویان کۆك بوون لەسەر دژایەتی بانگەوازی ئیسلام کەڕاستیی نەفامییانی خستە ڕوو، پەرستراوەکانیانی پووچەڵ کردەوەو، هزرو بیرو بۆچوونەکانیانی بەرپەرچ دایەوە، سەبارەت بەخواو ژیان ومرۆڤ وگەردوون، بۆیە ئەوانیش چەندین ڕێگایان گرتە بەر لەپێناو وەستاندنی ئەو بانگەوازەو کپ کردنەوەی دەنگی، یان هیچ نەبێت بچووك کردنەوەو دەستنیشان کردنی بواری بڵاوبوونەوەی .

### یەکەم: هەوڵدانی قورەیش بۆ دوورخستنەوەی ئەبو تالیب لەپشتگیری و پاراستنی پێغەمبەرﷺ:

((قورەیش هاتنە لای ئەبوتالیب و وتیان: ئەو برازایەت ئازارمان دەدا لەشوێن و ڕێ وپەرستگاماندا، پێی بڵێ باوازمان لێبهێنێت....ئینجا ئەبو تالیب بەپێغەمبەرﷺی وت: ((ئەو ئامۆزایانەت دەڵێن کەتۆ ئازاریان دەدەیت، داوات لێدەکەم وازیان لێبهێنیت، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ چاوی بریە ئاسمان و تەماشای دەکرد، فەرمووی: ئایا ئەو خۆرە دەبینن؟ ووتیان بەڵێ، فەرمووی من توانام لەکەسێك زۆرتر نییە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە کەبتوانیت بڵێسەیەك لەو خۆرە بێنێتە خوارەوە .

ئینجا ئەبو تالیب وتی: سوێند بەخوا ئەم برازایەم هەرگیز درۆ ناکات، بۆیە بگەڕێنەوە[1] چەندین جاریش قورەیش هەوڵی دەدا فشار بخاتە سەر پێغەمبەرﷺ لەڕێگەی خزمەکانیەوە بەڵام هیچیان پێنەکرا .

مەسەلەی پارێزگاریکردنی ئەبو تالیب بۆ موحەممەدﷺ وپشتگیری کردنی و پشت بەرنەدانی بڵاوبوویەوە، ئەوەیش زۆر سەخت بوو لەسەر قورەیش، بۆیە

---

١- صحيح السيرة النبوية، ابراهيم العلي لا ٧٨ .

عومارەی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەیان بردە لای ئەبو تالیب و وتیان: ئەوە عومارەی کوڕی وەلیدە، جوانترین ودامەزراوترین لاوە، دەیبەخشین پێت وەکو کوڕی خۆت، ئەگەریش کوژرا خوێنباییەکەی وەردەگریت، تۆیش برازاکەتمان بدە دەست، کەبەرانبەر ئایینی خۆت وباو پیرانت وەستاوەو، کۆمەڵی هۆزەکەتی پەرتەوازە کردووەو بەبێ ئەقڵمان دادەنێ، بۆ ئەوەی بیکوژین و، دەبێتە کوشتنی پیاوێك بەپیاوێك، ئەویش وتی: سوێند بەخوا سەوداگەرییەکی خراپم لەگەڵ دەکەن، کوڕی خۆتانم پێدەدەن بەخێوی بکەم، کوڕی خۆمتان پێبدەم بیکوژن، سوێند بەخوا ئەوە هەرگیز ڕوونادات [1] ئینجا بەڕاستی ئەوە شتێکی سەیرە، مرۆڤ واقیوڕدەمینێ بەرانبەر پیاوەتی وجوامێری ئەبو تالیب لەگەڵ پێغەمبەرﷺ، چونکە چارەنووسی خۆی گرێدایە چارەنووسی برازاکەیەوە، بەڵکو کەڵکی لەوەش وەرگرت کەسەرۆکی بەنی هاشم بوو بۆ هێنانی بەنی هاشم وبەنی عەبدولموتتەلیب بۆ هاوپەیمانییەك لەسەر ژیان ومردن، لەپشتگیری پێغەمبەرﷺ، بەموسڵمان و بێباوەڕیانەوە وەکو یەك [2]، پەنای موحەممەدی برازایدا پەنادانێکی کراوە، بەبێ هیچ ترس ودوودڵییەك، ئەم داب ونەریتە هۆزایەتیە بەکاردەهێنران لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ بۆ خزمەتی ئیسلام، ئەبو تالیبیش کاتێك بینی قورەیش بەو شێوە ئازاری بەنی هاشم دەگات، داوای لەئەوان وعەبدولموتتەلیب کرد بۆ وەرگرتنی هەمان هەڵوێست لەپاراستنی پێغەمبەرﷺ، لەڕاستیدا ئەوانیش بەدەنگییەوە هاتن، جگە لەئەبو لەهەبی لەعنەتی نەبێت .

کاتێك ئەبو تالیب هەڵوێستی خزمانی بینی، ستایشی کردن و، هەروەها باسی چاکەی موحەممەدیشی کردﷺ لەناویاندا، بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەپشتگیریان بۆی، دەیووت:

اذا اجتمعت يوماً قريش لمفخر　　فعبد مناف سرها وصميمها
وان حصلت اشراف عبد منافها　　ففي هاشم اشرافها وقديمها

---

١- البداية والنهاية ٣/٤٨ .

٢- بڕوانە: فقه السيرة النبوية لا ١٨٤ .

وان فخـرت يومـاً فـان محمـداً هو المصطفى من سرها وكريمها
تـداعت قـريش غثهـا وسمينهـا علينا فلم تظفرو طاشت حلومها
وكنـا قـديماً لانقـر ظلامـة اذا مائنوا صعر الخدود نقيمها [1]

ئەو کاتەیش ئەبو جەهل ویستی داڵدەدانی ئەبو تالیب بشکێنێ بۆ پێغەمبەرﷺ حەمزە بەرەنگاری بوویەوەو بەکەوانەکەی لێیداو بریندارێکرد وپێی وت: جنێو بەموحەممەد دەدەیت و من لەسەر ئایینی ئەوم، لێدانەکەم بۆ بگێڕەوە ئەگەر پێت دەکرێت .

دیاردەیەکی تاکە بەڕاستی جاهیلەت هەڵسێت بەپاراستنی ئەو کەسەی جنێوبە خوداکانیان دەدات و، بێ ئەقڵ وگەمژەیان لەقەڵەم دەدات، هەر بەناو ئەو بەهایانەوە گیانیان پێشکەش دەکەن وشەڕ بەرپادەکەن و، موحەممەدﷺ زیانی پێنەگات.

ئەبو تالیب هۆنراوەیەکی هەیە تیایدا پەنادەگرێتە پیرۆزی مەککەو پلەو پایەی، تیایدا ڕوونیشی کردووەتە پیاو ماقوڵانی عەشیرەتەکەی و، دەڵێت کەموحەممەدﷺ ناداتە دەستەوە، وازیشی لێناهێنێت، ئەگەریش تیابچێت لەپێناویدا، لەو هۆنراوەیدا دەڵێت:

ولمـا رأيـت القـوم لاوّد فـيهم وقد قطعوا كل العرى والوسائل
وقـد صـارحونا بالعـداوة والاذى وقد طاوعوا امر العدو المزايل
وقـد حـالفوا قومـاً علينـا اظنّـة يعـضون غيظـاً خلفنـا بالانامـل
صبرت لهم نفسي بسمراء سمحة وابيض عضب من تراث المقاول
واحضرت عن البيت رهطي واخوتي وامسكت مـن اثوابـه بالوصائل

هەروەها پەنای بردە بەر ماڵی خواو هەرچی ئەو شتە پیرۆزانەی کەتیایدان، سوێندی بەو ماڵە خوارد کەبەهیچ شێوەیەك موحەممەد بەدەستەوە نادات ئەگەر

---

[1]- السيرة النبوية لابن هشام ٢٦٩/١ .

خوێن وەکو جۆگەلە ڕێی کردووە :

| | |
|---|---|
| كذبتم وبيت الله نبزى محمدا | ولمـا نطـاعن دونـه ونناضـل |
| ونـسلمه حتـى نـصرع حولـه | ونـذهل عـن ابنائنـا والحلائـل |
| وينهض قوم فى الحديد اليكم | نهوض الروايا تحت ذات الصّلاصل |

تاکو دەگاتە کۆتایی هۆنراوەکەی کەناوی سەرانی قورەیش دەبات وقسەیان پێدەکات [١] ، بەدەستهێنانی پێغەمبەرﷺ بۆ مامی بەمەبەستی پشتیوانی کردن، سەرکەوتنێکی گەورە بوو لەڕاستیدا، سوودیشی وەرگرت لەئەو داب ونەریتە هۆزایەتییانەی هەبوون بۆ پاراستنی خۆی و، ئازادی گەڕانی بۆی دەستەبەر کرد، ئەوەیش ئاماژە دەکات بۆ تێگەیشتنی پێغەمبەرﷺ بۆ ڕووداوەکان، کەئەوە وانەیەکی پڕ واتایە بۆ بانگخوازی ڕێگای خوا، بۆ چۆنیەتی مامەڵە کردنیان لەگەڵ دەوروبەرو کۆمەڵگاکانیان و، سوود وەرگرتن لەیاساو داب ونەریت بۆ خزمەتی ئایینی خوا .

## دووەم: هەوڵدان بۆ ناشیرین کردنی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ.

بتپەرستەکانی مەککە هەڵسان بەشێواندن وناشیرین کردنی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ هەربۆیە قورەیش جەنگێکی ڕاگەیاندیان ڕێکخست لەدژی پێغەمبەرﷺ بەمەبەستی ناشیرینکردنی، بەسەرکردایەتی وەلیدی کوڕی موغیرە، ئەو لەگەڵ چەند کەسانێك لەهۆزەکەی کۆبوونەوە کەخۆی لەهەموویان گەورەتر بوو، کۆبوونەوەشیان لەکاتی حەج دا بوو، پێی وتن: ئەی کومەڵانی قورەیش، واکاتی حەج هاتە پێشێ، نێردەکانی عەرەبیش بەم زووانە دێنە لاتان و، ئەوان ئەم باسی موحەممەدیانە بیستووە، جاپێویستە لەسەر بۆچوونێك ڕێکبکەون، جیاوازیتانیش نەبێت ئەمتان ئەو ترتان بەدرۆبخاتەوە، قسەکانیش بەرپەرچی خۆیان بدەنەوە .

---

١- بڕوانە: فقه السيرة النبوية لا ٢١٢ .

– وتیان: کەواتە خۆت لەسەر بۆچوونێك بمانگیرسێنەوە .

– وتی: بەڵکو ئێوە قسە بکەن وگوێتان لێدەگرم .

– وتیان: دەڵێین قەشەیە .

– وتی: ئەو قەشە نییە، قەشەمان بینیوەو قسەکانی لەورتەورتەکانی ئەوان ناچێت .

– وتیان: دەڵێین شێتە .

– وتی: شێت نییە، شێتمان بینیوەو دەزانین چۆنە، ئەم قسانەی موحەممەد لەفسەو جوڵەو چرپەچرپی شێتان ناچێت .

– وتیان: دەڵێین شاعیرە .

– وتی: ئەو شاعیر نییە، خۆمان شارەزای هەموو جۆرەکانی شیعرین .

– وتیان: دەڵێین جادوبازە .

– وتی: جادوباز نییە، ئێمە شارەزای جادوگەرو جادوو هەین، ئەمەی موحەممەد فووتێرکردن وگرێلێدانی ئەوان نییە .

– وتیان: ئەی ئیتر چی بڵێین ئەی ئەبو عەبدو شەمس .

– وتی: سوێند بەخوا، قسەکانی شیرینن، بنچینەکەی وەکو دارخورمایەو، چڵەکانیشی بەروبوومە، هەرچیەکیش لەم قسانە بکەن دەزانرێت کەڕاست نییە، بەڵام نزیکترین قسە ئەوەیە بڵێن جادو بازە، چونکە کوڕو باوك لەیەکتر دەکات، هەروەها براوبراو، ژن وپیاو.....[١]

خوای گەورە ئەم ئایەتانەی لەسەر وەلید دابەزاند: ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدْتُ لَهُ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ (المدثر:١١_٢٦) .

---

١– السير والمغازي لابن اسحاق لا ١٥٠، ١٥١ تهذيب السيرة ٦٤/١، ٦٥، سيرة ابن هشام ق ٢٧٠/١، ٢٧١ .

لەم بەسەرهاتە ئەوە دەردەکەوێت، کەجەنگی دەروونی دژ بەپێغەمبەرﷺ هەڕەمەکی نەبوو، بەڵکو بەوردی ئامادە دەکرا لەلایەن سەرانی بێباوەڕانەوە، بەپێی بنچینەگەلێکی دیاریکراو، کەهەر هەمان ئەو بنچینانەی ئەمڕۆن کەلەوبوارەدا کاریان پێدەکرێت، وەکو هەڵبژاردنی کاتی گونجاو، ئەوان کاتی حەجیان هەڵبژارد کەخەڵکی تیادا کۆدەبوویەوە، هەروەها ڕێککەوتن وخۆ بەدوورگرتن لەناکۆکی وبنچینەکانی تر کەدەبێتە مایەی کاریگەری هەڵمەتەکەیان و بەئاکام گەیشتنی، هەروەها ئەوان شوێنی گونجاویان هەڵبژارد کەمەککە بوو [1]، ئینجا لەم بەسەرهاتە مەزنی پێغەمبەرﷺ دەردەکەوێت وکاریگەری لەسەر بیسەرانی لەڕێگەی قورئانەوە، چونکە وەلید کەسەرگەورەی قوڕەیش بوو، سەرەڕای خۆبەزلزانینی، قورئان کاری تێکردو دڵی نەرم بوو بۆی، دانیشی نابەمەزنیدا، بەئەو وتانەی کەکردی [2]، هەموو ئەو جەنگە دەرونیانەش نەیانتوانی ئابلۆقەی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ بدەن، بەڵکو پێغەمبەری خواﷺ توانی ئابلۆقەکەیان بشکێنێ، کەئەوان تەنها بەناشیرین کردنی بانگەوازەکە وازیان نەدەهێنا، بەڵکو دەچوونە پێشوازی ئەوانەش کەدەهاتنە مەککەو بیروبۆچوونیان ژاراوی دەکرد، بۆ ئەوەی پەرژینێك دروست بکەن لەنێوان ئەوان وپێغەمبەرداﷺ، چونکە پێغەمبەرﷺ یەکجار سەرکەوتوو بوو لەبانگەوازەکەیدا، قسەکانی کاریگەریان هەبوو لەسەر گوێگری، بەشێوەی شکۆداری کاریدەکردە بەرانبەرەکەی پێش ئەوەی قسە بکات، کەقسەشی دەکرد گوێگرەکانی دیل دەکرد بەوشەکانی کەپڕبوون لەدانایی وسۆزو پاکی و نیازی ڕاستەقینە بۆ ڕێنموونی ئوممەت لەڕێگەی وەحیی خواوە [3]، ئەمانەی خوارەوەیش هەندێکن لەنموونەکانی کاریگەری قسەکانی:

**١- موسڵمان بوونی (ضماد الازدي) ڕەزای خوای لێبێت:**

ئەم هاوەڵە سەرەتا کەهاتە شاری مەککە لەژێر کاریگەری بانگەشەی بتپەرستەکان بوو دەربارەی پێغەمبەرﷺ، تاکو تەواو دڵنیا بوو کەپێغەمبەرﷺ

---

١- بروانە: الحرب النفسية ضد الاسلام، د.عبدالوهاب كحيل .

٢- بروانە: التاريخ الاسلامى للحميدي ١/١٢٣ .

٣- بروانە: التاريخ الاسلامى للحميدي ١/١٢٧، ١٣٧ .

تووشی شێتی بووە وەکو سەرانی مەککە بڵاوی دەکەنەوە، ئەم زیمادە لەئەزدی شەنوئە بوو، چارەسەری شێتیشی دەکرد، جاکاتێک لەبەدڕەوشتەکانی مەککەی بیست کەموحەممەدﷺ شێتە، وتی: خۆزگە ئەو پیاوەم دەبینی بەڵکو خوا لەسەر دەستی من چاکیکردبا. دەڵێت: چاوی بەپێغەمبەرﷺ کەوت وپێی وت: ئەی موحەممەد من چارەسەری ئەوەم پێدەکرێت کەپێوەی دەناڵێنی، خوای گەورەیش بیەوێت هەرکەسێك لەسەر دەستم چاك بكات دەیکات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (( ان الحمدلله نحمده، ونستعينه، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له واشهد الا إله إلا الله وحده لاشريك له، وان محمداً عبده ورسوله....))واتە:سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، پەنای پێدەگرین، کەسێك خوا ڕێپیشاندەری بێت گومڕا نابێت، هەرکەسێکیش خوا ڕێنمونی نەکات ڕێپیشاندەری نییە، شایەتی دەدەم کەجگە لە(الله) هیچ خوایەکی تر نییە، شایەتیش دەدەم کەموحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە)) .

دەڵێت: وتی: ئەو وشانەم بۆ دووبارە بکەرەوە، پێغەمبەریش ﷺ دووبارەی کردەوە سێ جار، ئەویش وتی: من گوێم لەقسەی قەشەو جادوگەرو شاعیران بووە، بەڵام گوێم لەهاو وێنەی قسەکانی تۆ نەبووە، قسەکانت دەگەنە بنی دەریا، ئینجا وتی: دەستت بێنە بەیعەتی موسڵمان بوونت پێبدەم، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئەی کەسوکارەکەت، ووتی: ئەوانیش .

جاکاتێك دەوڵەتی ئیسلام لەمەدینە دامەزرا، پێغەمبەریشﷺ پۆلەکانی دەنارد، جارێکیان بەلای عەشیرەتەکەی (ضماد)دا تێپەڕ بوون، سەرکردەی پۆلە سەربازییەکە ووتی: ئایا هیچتان لەلایان هێنا؟ یەکێکیان وتی: بەڵێ دەستشۆرێکم لایان هێناوە، وتی: بیگێڕنەوە بۆیان، ئەوان عەشیرەتی (ضماد)ن[١] .

---

١- مسلم، كتاب الجمعة، باب تخفيف الصلاة والخطبة رقم ٨٦٨ .

**وانەو سوودەکان:**

أ- پڕوپاگەندەی قورەیش و، ناشیرین کردنیان بۆ کەسایەتی پێغەمبەرﷺو، تۆمەتبارکردنیان بۆی بەشێتی هانی (ضماد)ی دا کەبەرێکەوێت بۆلای پێغەمبەرﷺ بۆ چارەسەرکردنی، واتە ئەو جەنگە ڕاگەیاندنەی قورەیش بوو بەمایەی موسڵمان بوونی ئەو پیاوە لەگەڵ قەومەکەشیدا .

ب- هەردوو سیفەتی ئارامگرتن ولەسەر خۆیی ئاشکرا بوو لەکەسایەتی پێغەمبەرداﷺ، چونکە (ضماد) پێشنیاری کردە سەر پێغەمبەرداﷺ لەشێتی چارەسەری بکات، ئەمەیش هەڵوێستێکە تورەیی دەوروژێنێ، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ ئەم قسەی بەئەو پەڕی لەسەر خۆیی وەرگرت، کەئەمەش بووە مایەی بەدڵبوون ورێزی (ضماد) بۆ پێغەمبەرﷺ .

ج- گرنگی ئەو پێشەکییەی کەپێغەمبەرﷺ ووتارەکانی پێدەست پێدەکات، کەتیایدا وەسپی مەزنی خواو ئاراستە کردنی پەرستش تەنها بۆ ئەو هاتووە، هەربۆیە پێغەمبەرﷺ وتارو قسەکانی زۆر جار بەوە دەست پێدەکرد .

د- کارتێکردنی زمانپاراوی پێغەمبەرﷺ وجوانی دەربڕینی لە(ضماد) چونکە قسەکانی پێغەمبەرﷺ لەدڵێکی پڕ لەباوەڕەوە هەڵدەقولان، هەربۆیە قسەکانی دەگەشتە دڵەکان .

هـ- خێرا موسڵمان بوونی (ضماد) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئیسلام ئایینی فیترەتە، دەرونەکانیش ئەگەر رزگاریان ببێت لەفشارە ناوخۆیی ودەرەکییەکان، ئیتر زۆر جار قسە کاریان تێدەکات .

و- سوور بوونی پێغەمبەرﷺ لەسەر بڵاوکردنەوەی بانگەواز، چونکە ڕاستێتی باوەڕو دڵگەرمی وبەهێزیی قایلبوونی لە(ضماد)دا بینی، بۆیە بەیعەتی لێوەرگرت .

ز- ئەمەش دەرخستنێکی ئاشکرایە بۆ گرنگی بانگەواز بۆلای خوای گەورە، (ضماد) بەیعەتی دا بەپێغەمبەرﷺ لەسەر پەیوەست بوون بەئایینەوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ بەوە قایل نەبوو، بەڵکو بەیعەتی لێوەرگرت لەسەر ئەوەی بانگی قەومەکەشی بکات بۆ ئیسلام .

ح- لەبیرنەچوونی چاکەو، ڕێزگرتن لەخاوەن ڕۆژانی پرشنگدار .[١]

ط- هەندێ هۆکاری پەروەردەیی هاتووە لەفەرموودەکەدا کەپێغەمبەرﷺ بەکاری هێناوە لەگەڵ (ضماد)، وەکو لەسەر خۆیی لەکاتی قسەکردنداو، شێوازی گفتوگۆو، ئاڕاستەکردنی ڕاستەوخۆ، هەندێ سیفەتیش لە کەسایەتی پێغەمبەرﷺ دەردەکەوێت وەکو پەروەرشکارێك، لەوانە لەسەر خۆیی وئارامگرتن وهاندانی کاری چاکە زۆر کردن .

**٢- موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عەبەسە ڕەزای خوای لێبێت:**

عەمری کوڕی عەبەسەی سولەمی دەڵێت: لەسەردەمی جاهیلی وامدەزانی خەڵکی لەسەر گومڕایین و، لەسەر هیچ شتێکی چاك نین، چونکە بتیان دەپەرست، منیش بیستم کەپیاوێك لەمەککە هەندێك هەواڵ دەگێڕێتەوە، ئیتر وڵاخەکەم ئامادەکردو چوومەلای، بینیم ئەو خۆی شاردوەتەوە لەخەڵکی هۆزەکەی، بەهەر حاڵێك بوو خۆم پێی گەیاند، وتم: تۆچیت؟ فەرمووی: من پێغەمبەرم، وتم: پێغەمبەر چییە؟ فەرمووی: خوای گەورە ڕەوانەی کردووم. وتم: بەچی شتێك تۆی ڕەوانە کردووە؟ فەرمووی: بەجێبەجێکردنی پەیوەندی خزمایەتی و، شکاندنی بتەکان و، تەنها خوای گەورە بپەرسترێت وهاوبەشی لەگەڵدانەبێت پێم وت: کێت لەگەڵدایە لەسەر ئەم بیروباوەڕە؟ فەرمووی: ئازادو کۆیلە. وتی: لەو ڕۆژەدا ئەبو بەکرو بیلالی لەگەڵدا بوو لەو کەسانەی باوەڕیان پێ هێنا بوو، وتم: کەواتە شوێنت دەکەوم. فەرمووی: ئالەم ڕۆژەدا ئەوەت پێناکرێت، ئایا حاڵی من وخەڵکەکە نابینی؟ بەڵکو بگەڕێرەوە ماڵی خۆت، هەرکاتێك بیستت کەئایینی ئیسلام ئاشکرا بووە بگەڕێرەوە بۆ لام .

دەڵێت: گەڕامەوەو، دواتر پێغەمبەرﷺ هاتە مەدینەو چوومە لای، پێم وت: ئایا دەمناسی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆ بووی کەلەمەککە هاتیتە لام.[٢]

---

١- بڕوانە: التاريخ الاسلامى للحميدى ١٣٢/١، ١٣٣ ، هەروەها بڕوانە: الوحي وتبليغ الرسالة، د.يحيى اليحيى لا ١١١_١١٣ .

٢- بڕوانە: صحيح مسلم، كتاب المسافرين ٨٣٢ .

**وانەو پەندەکان :**

أ- عەمری کوڕی عەبەسە لەحونەفائەکان بوو کەنکۆڵیان دەکرد لەپەرستنی جگەلە خوا لەسەردەمی جاهیلیەتدا .

ب- ئەو شەڕە ڕاگەیاندنە توندەی قوڕەیش بەرپای دەکرد دژ بەپێغەمبەرﷺ هۆکارێك بوو بۆ گەڕانی عەمر بەدوای پێغەمبەرداﷺ .

ج- توندو تیژی قوڕەیش بەرانبەر پێغەمبەرﷺ، چونکە بینی پێغەمبەرﷺ خۆی شاردوەتەوە .

د- جوانی شێوازی چوونە ژوورەوەی عەمر بۆلای پێغەمبەرﷺ .

هـ- پەیامی پێغەمبەرﷺ لەسەر دوو بنەما دامەزراوە: مافی خواو مافی خەڵکی، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((ارسلنی الله بصلة الارحام وکسر الاوثان)) .

ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر گرنگی بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی، چونکەئەمە لکاوترین ئاکار بوو بەئیسلامەوە، هاوکات لەگەڵ بانگەوازی یەکتاپەرستی، هەروەها بەئاشکرایش دەردەکەوێت چۆن پێغەمبەرﷺ هێرشی کردووەتە سەر بتەکان کەزۆر پیرۆز بوون بەلای قوریشەوە، لەوەشدا گرنگی لادانی دیاردە جاهیلیەتەکان دەردەکەوێت و، بانگەوازی یەکخوا پەرستی جێگیرنابێت وبڵاو نابێتەوە بەلابردنی ئەو دیاردانە نەبێت .

و- لەبایەخدانی پێشوەختی پێغەمبەرﷺ بەلابردنی بتەکان، سەرەڕای ئەوەی کەتوانای هەڵسانی بەو کارەنەبوو، دەردەکەوێت کەکاروبارەکانی ئایین ناکرێت باسکردنی دوابخرێت بۆ خەڵکی، بەبەهانەی ئەوەی ناتوانرێ جێبەجێبکرێت، چونکە تەنها باسی ئەو شتەدەکەن کەقابیلی جێبەجێکردنەو واز لەوەکانی تر دەهێنن، ئەوانە بانگەوازەکەیان نوقسانەو، پەیڕەوییان نەکردووە لەپێغەمبەرﷺ کەڕووبەڕووی نەفامی بوویەوە، سەرەڕای کەمی پشتیوانانی وسەرگەورەیش لەمەککە بۆ دوژمنەکانی بوو .[١]

---

١- بڕوانە: التاریخ الاسلامی للحمیدی ١٠٩/١ .

ز- بەپەرۆشی پێغەمبەرﷺ لەسەر سەلامەتی هاوەڵەکانی ودابین کردنی جێگای دوور لەمەترسی بۆیان، چونکە بەعەمری وت: تۆ ئەمڕۆ ناتوانیت موسڵمان بوونت ئاشکرا بکەیت .

ح- پێغەمبەرﷺ هاوەڵانی خۆی بەیاد دەهاتەوەو لەبیر نەدەچوون .

ط- پێغەمبەرﷺ لیستێکی نەدەدا بەهەموو کەسێك موسڵمان بوایە بەناوی هاوەڵەکانی، چونکە هیچ بەرژەوەندییەك نەبوو لەو کارەدا، بۆیە لەوەڵامی پرسیارەکەی عەمردا بەو شێوە وەڵامی دایەوە. ئەمەیش جۆرێکە لەشاردنەوە وەکو (ابن کثیر) دەڵێت .[١]

ی- لەگەڕاندنەوەی پێغەمبەرﷺ بۆ عەمر وانەیەکی بانگەوازی لێوەردەگرین، ئەویش ئەوەیە کەزۆر کردنی شوێنکەوتوان وئەندامەکان لەکاتی چەرمەسەری و ناڕەحەتیدا چاك نییە، چونکە پێغەمبەری خواﷺ ئاراستەی موسڵمانانی دەکرد بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان، یان کۆچ بکەن، بۆ ئەوەی لەمەترسی دووریان بخاتەوەو، هێزی موسڵمانان بشارێتەوەو هەلێکیش بۆ سەرکردە برەخسێنی تاکو سەرقاڵ نەبێت، سوودێکیش بێت بۆ ئەو شوێنەی بۆی دەچن، هەروەها بۆ دەستەبەر کردنی بەردەوامی وخۆپاراستن لەبنەبڕکردن .[٢]

هەروەها یەکێك لەوانەی موسڵمان بوون بەهۆی شەڕی ڕاگەیاندن دژبەپێغەمبەرﷺ توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی بوو، بەسەرهاتەکەشی بەشیکراوەیی باسکراوە لەکتێبەکانی سیرەدا، بەڵام دکتور (اکرم ضیاء العمري) پێی وایە کەتەنها ئەوەندەی لێی جێگیر بووە کەداوای لەپێغەمبەرﷺ کردووە پەنا بهێنێتەقەڵا قایمەکەی دەوس وپێغەمبەرﷺ ڕازی نەبووە،[٣] ڕیوایەتێکی ڕاستیش هاتووە باس لەوە دەکات کەتوفەیل بانگی قەومەکەی خۆی کردووە بۆ ئیسلام و ئەوانیش ڕازی نەبوونە، تاگەیشتە ئەوەی توفەیل داوای کرد لەپێغەمبەرﷺ دوعایان لێ بکات، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ پاڕایەوە خوا ڕێگەیان پێ پیشان بدات.[٤]

---

١- بڕوانە: الوحي وتبليغ الرسالة ١٠٦، ١٠٩ .

٢- بڕوانە: الاساس في السنة، سعيد حوى ١٢٦/١ .

٣- صحيح مسلم ١٠٩/١ .

٤- صحيح البخاري، فتح الباري ١٠٧/٦ .

### ٣- موسڵمان بوونی حوصەینی باوکی عیمران ڕەزای خوای لێبێت :

قورەیش هاتنە لای حوصەین_چونکە ڕێزی زۆریان لێی دەگرت_ وپێیانووت: قسەبکە لەگەڵ ئەم کابرا،چونکە جنێوبە خوداکانمان دەدات،ئیتر ئەوانیش چوون و لەنزیک دەرگای ماڵ پێغەمبەرﷺ دانیشتن وفەرمووی: ڕێگا بۆ مامەپیرە بکەنەوە، عیمران وهاوڕێکانیشی لەوێ بوون، حوصەین وتی: ئەو قسە چییە لێت دەگێڕنەوە، جنێو بەخوداکانمان دەدەیت و، هەرخەریکی باسکردنیانی، خۆتۆ باوکت پیاوێکی هۆشمەند بوو، لەسەر ئایینی باو باپیرانی بوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی حوصەین باوکم وباوکت لەئاگردان، ئەی حوصەین، چەند خودا دەپەرستی؟ وتی: حەوت لەزەوی ویەك لەئاسمان. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر تووشی ناخۆشی بووی هاوار بەکامیان دەکەیت؟ وتی: ئەوەی کەلەئاسمانە، فەرمووی: ئەگەر ماڵت لەدەستدا هاوار بەکێ دەکەیت؟ وتی: بەوەی کەلەئاسمانە، فەرمووی: هەرتەنها ئەویش دێتە هاناتەوە، تۆ هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەیت، ئایا لەسوپاسکردندا پێی ڕازیت یان دەترسی زاڵ بێتە سەرتدا؟ وتی: هیچیان. فەرمووی: ئەی حوصەین، موسڵمان ببە سەلامەت دەبیت. وتی: من خزم وعەشیرەتم هەیە، چییان پێ بڵێم: فەرمووی پێیان بڵێ: ((اللهم استهديك لارشد امري، وزدني علماً ينفعني)). واتە: خوایە گیان داوای ڕێنموونیت دەکەم بۆ چاکترین کارەکانم، زانستێکیشم بدەرێ بەسوود بێت بۆم، حوصەین ئەوەی وت وهەڵنەسا تاکو موسڵمان بوو، ئیتر عیمران هەڵسا سەری ماچ کرد، ئینجا هەردوو دەستی وقاچەکانی ماچ کرد، جاکاتێك پێغەمبەرﷺ ئەوەی بینی دەستی کرد بەگریان وفەرمووی: ((لەکرداری عیمران گریام، حوصەین هاتە ژوورێ بەبێباوەڕی، عیمران هەڵنەسا لەپێشی، ئاوڕیشی لێنەدایەوە، بەڵام کاتێك موسڵمان بوو. هەڵسا بەپێویست لەگەڵ باوکی، بۆیە گریانم هات. کاتێك حوصەین ویستی دەرچێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەگەڵی بچن تادەیگەیەننە ماڵەکەی. کاتێك دەرچوون لەدەرگاوە، قوریش بینییان ووتیان: ئەویش لەڕێ دەرچوو، ئینجا بڵاوەیان کرد .[1]

---

١- الاصابة في تمييز الصحابة لابن حجر ٣٣٧/١ وعنه نقل الشيخ محمد يوسف في حياة الصحابة ٧٥/١، ٧٦.

لەوانەشە ئەوەی وایکرد باوکی عیمران بەم خێراییە موسڵمان بێت، پاکی فیترەت وئامادەیی بێت لەلایەکەوە، بەهێزی بەڵگەکانی پێغەمبەرو زمانپاروی بێت لەلایەکی ترەوە[1].

تێبینیش دەکرێت کەپێغەمبەرﷺ شێوازی گفتوگۆی ئەنجامدا لەگەڵ حوصەیندا، بۆ چاندنی واتاکانی یەکتاپەرستی لەدەرونیداو، لابردنی ئەو بیرو باوەڕ پوچەڵانەی کەباوەڕی پێیان بوو.

**٤- موسڵمان بوونی ئەبو زەر ڕەزای خوای لێبێت:**

ئەم هاوەڵە ڕەزای خوای لێبێت نکۆڵی دەکرد لەحاڵی جاهیلیەت، ڕازیش نەدەبوو بەبتپەرستی، ڕەخنەشی دەگرت لەکەسێك هاوەڵ لەگەڵ خوا بپەرستێت، پێش موسڵمان بوونیشی بەسێ ساڵ هەر نوێژی دەکرد، بێ ئەوەی ڕووبکاتە قیبلەیەکی دیاریکراو، واشدەردەکەوێت کەلەسەر ڕێبازی ئەحنافەکان بووە، جاکاتێ بەپێغەمبەر ﷺی بیست هات بۆ مەککە، حەزیشی نەکرد پرسیاربکات، تاکو شەوی بەسەردا هات وڕاکشا، ئیتر عەلی ئەوی بینی وزانی بێگانەیە، میوانداری پێکردو پرسیاری لێنەکرد، سەر لەبەیانی ماڵی بەجێهێشت وچوو بۆ (المسجد الحرام) لەوێ مایەوە تاکو ئێوارە، دووبارە عەلی ئەوی بینی ودیسان میوانداری پێکرد، هەمان مەسەلە لەشەوی سێیەمیشدا ڕوویدا، بەڵام ئەمجارە پرسیاری هۆی هاتنی لێکرد بۆ مەککە، کاتێك متمانەی پێکرد وتی هاتووم چاوم بکەوێتە پێغەمبەرﷺ عەلی فەرمووی: بەڵێ ئەو ڕاستە وپێغەمبەری خوایە، کەڕۆژمان لێبوویەوە شوێنم بکەوە، جائەگەر من شتێکم بینی مەترسی هەبوو لەسەر تۆ هەڵدەستم وەکو چۆن بەوێ ئاوبڕێژم، ئەگەریش بەڕێکەوتم شوێنم بکەوە، ئیتر ئەویش دوای عەلی کەوت و پێغەمبەرﷺی بینی وگوێی لەقسەکانی گرت وموسڵمان بوو، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((ارجع الى قومك فاخبرهم حتى يأتيك امرى)) واتە: بگەڕێرەوە ناو خزم و کەسەکانت وئاگاداریان بکەرەوە تافەرمانی منت پێدەگات، ئەویش وتی: سوێند بەخوا بەدەنگێکی بەرزەوە هاواری پێدەکەم لەنێوانیاندا، ڕۆیشت بەرەو مزگەوتەکە

[1]- بڕوانە: فقه الدعوة الفردية، د. سيد محمد نوح لا ١٠٤.

بەهەموو دەنگی بانگی کرد: (اشهد الا الـه الا اللـه واشـهد ان محمداً رسـول اللـه) خەڵکیش هەڵیانکوتایە سەری تاکو خستیانە زەوی، ئینجا عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب هات وترساندنی لەتۆڵەکردنەوەی هۆزی غیفار، کەبازرگانییەکانی قوڕیش بەلایاندا تێدەپەڕی بەرەو شام، ئیتر ڕزگاری کرد لەدەستیان،[1] ئەبو زەڕ پێشتریش براکەی ناردبوو بۆ مەککە بۆ ئەوەی زانیاری دەربارەی پێغەمبەرﷺ بهێنێتەوەو گوێ لەقسەکانی بگرێت، ئیتر گەڕایەوە وتی: بینیم فەرمان دەکات بەڕەوشتی جوان وقسەکانیشی هۆنراوە نییە، ئەبو زەڕ وتی: غەم وپەژارەمت نەڕواندەوە، بۆیە بڕیاری دا بەخۆی بچێتە لای پێغەمبەرﷺو براکەی پێی وت: وریا بەلەخەڵکی مەککە چونکە ئەوان زۆر ڕقیان لەموحەممەدە .[2]

**وانەو پەندو سوودەکان:**

أ- بڵاوبوونەوەی باسی پێغەمبەرﷺ لەنێو هۆزەکاندا، زۆری ئەوانەش بەشداریان تیاکرد لە قورەیش بوون، بەهۆی ئەو وریایی دان وناشیرین کردنی کەسایەتی پێغەمبەرﷺو ئایینەکەی، تاکو باسی گەیشتە هۆزی غیفار.

ب- ئەبو زەڕ پیاوێکی سەر بەخۆ بوو لەبیرو بۆچوونیدا، پڕوپاگەندە کاریتێنەدەکرد، قایلیش نەدەبوو بەو هەواڵانەی قورەیش بڵاویان دەکردەوە، بۆیە براکەی نارد بۆ هێنانەوەی هەواڵی متمانە پێکراو دوور لەکاریگەری ڕاگەیاندن .

ج- بایەخدانی زۆری ئەبو زەڕ بەمەسەلەی پێغەمبەرﷺ، چونکە ڕازی نەبوو بەئەو هەواڵانەی ئونەیسی برای هێنای دەربارەی، بەڵکو ویستی بەچاوی خۆی ڕاستیەکان ببینێت، چونکە مەسەلەکە ئەوە نییە کەکەسێك بێت فەرمان بەچاکە بکات، بەڵکو ئەمە کەسێکە دەڵێت. پێغەمبەرم، بۆیە ناخۆشی چەشت و لەکەسوکاری دوورکەوتەوەو بەخواردنێکی کەمەوە بەرەو مەککە بەڕێکەوت بۆ ئەوەی هەواڵی ئەو پێغەمبەرە بزانێت .[3]

---

١- فتح الباري ١٧٣/٧ .

٢- مسلم ١٩٢٣/٤_ ورقمه٢٤٧٣ .

٣- الوحي وتبليغ الرسالة، د.يحيى اليحيى ٩١_٩٣ .

د- لەسەر خۆیی وپەلەنەکردن لەوەرگرتنی زانیاری، چونکە ئەبو زەڕ بەڕق و کینەی قورەیشی دەزانی بەرانبەر بەموحەممەدﷺ، چونکە ئەگەر پرسیاری بکردایە بەنیازی دەزانراو، لەوانەشە دەریانکردایەو بەئامانجی نەگەیشتایە کەلە پێناویدا دووری وناڕەحەتی چەشتووە .

هـ- دووربینی ووریایی پێش بەدەستدانەوەی هیچ زانیارییەك: کاتێك عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەربارەی خۆی وهۆکاری هاتنی بۆ مەککە وەڵامی نەدایەوە سەرەڕای ئەوەی کەسێ ڕۆژ میوانداریێتی پێیکرد، مەرجیشی لەسەر دانا پێش قسەکردنی کەلای کەس باسی نەکات وڕێگەشی پێی پیشان بدات، ئەوەیش ئەوپەڕی دووربینی بوو .

و- داپۆشینی ئەمنی بۆ کارەکان: عەلی وئەبو زەڕ ڕەزای خوایان لێبێت ڕێککەوتن لەسەر هێمایەك، یان جوولەیەکی دیاریکراو، وەکو چۆن بیەوێت نەعلەکەی چاك بکات، یان ئاو برێژێت، لەکاتێکدا ئەگەر عەلی کەسێکی بینی بەدوایاندا دێت، ئەمە جگە لەوەی کەئەبوزەڕ لەدووری ماوەیەك ڕێی دەکرد لەعەلی، ئەوەیش دوور بینی بوو بۆ ڕوودانی هەرکارێکی لەناکاودا .

ز- ئەم جۆرە هێمایانە ئاماژە دەکەن بۆ کارامەیی هاوەڵان لەبواری پاراستنی خۆیاندا، هەڵسوکەوتەکانیان هەڕەمەکی نەبوو، بەڵکو نەخشە بۆ کێشراو بوو، ئێمەیش ئەمڕۆ پێویستمان بەو جۆرە هەستە هەیە دروست بێت لامان، بەتایبەتی لەپاش ئەوەی ئاسایش واتەیەکی گرنگی پەیدا کردووە لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا سەبارەت بەبەردەوامی شارستانییەکان .[1] بەڵکو قوتابخانەی تایبەتی خۆی هەیە، شێوازو هۆکارو دەزگاو دارایی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵکو وایلێهاتووە، زانیارییەکان بەگشتی بەبەرزترین نرخ دەفرۆشرێت، بەڵکو جاری واهەیە کەسێك خۆی بەخت دەکات لەپێناو هەندێ زانیاریدا، بۆیە پێویستە موسڵمانان بایەخی پێویست بدەنە ئەم بوارە .[2]

---

١- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية، د.ابراهيم العلي لا ٥٨، ٥٩ .

٢- بڕوانە: دروس في الكتمان، محمود شيت خطاب . لا ٩٧ .

ح– ڕاستگۆیی ئەبو زەڕ لەگەڕان بەدوای ڕێگای ڕاستدا، هەروەها پەسەندی ژیری وتێگەیشتنی، چونکە پاش ئەوە ئیسلامی لەسەر پێشنیارکرا یەکسەر موسڵمان بوو .

ط– پەرۆشی پێغەمبەرﷺو بایەخدانی بەپاراستنی هاوەڵانی وساغ و سەلامەتیان: چونکە فەرمانی کردبە ئەبو زەڕ بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی وموسڵمان بوونی باس نەکات تاکو خوا پێغەمبەرەکەی سەردەخات .

ی– ئازایی ئەبو زەڕو بوێری لەوتنی هەقدا: چونکە بەئاشکرا موسڵمان بوونی خۆی لەناو قورەیشدا ڕاگەیاندو بەرەنگاریان بوویەوە .[1]

وەکو چۆن ئەبوزەڕ لەقسەکەی پێغەمبەرﷺ بەوشێوە حاڵی نەبووبێت کەپێویستە لەسەری موسڵمان بوونی بشارێتەوە، بەڵکو بەزەیی پیاهاتبێتەوە بۆیە پێغەمبەریشﷺ ڕازی بوو لەسەر کارەکەی، لەوەش ئەوە وەردەگیردرێت، کەوتنی قسەی ڕەوا ڕەوایە ئەگەر ئازارو زیانیش بۆ بێژەرەکەی بهێنێ، سەرەڕای ئەوەی کەبێدەنگیش هەر جائیزە، واشدەردەکەوێت ئەو مەسەلە بەپێی حاڵەتەکەو کەسەکەیە .[2]

ك– هەڵوێستەکەی ئەبو زەڕ بەسوود بوو بۆ بانگەوازەکە، ڕۆڵیشی بینی لەبەرگریکردن لەو جەنگە دەروونیەی قورەیش بەرپای دەکرد دژبە پێغەمبەرﷺ، گورزێکی سەختیش بوو بەربتپەرستانی مەککە کەوت، بەجوامێری وئازایی ئەبوزەڕ، چونکە خوێن لەلاشەی هاتە خوارێ وهەر بەردەوام بوو لەدووبارەکردنەوەی شایەتماندا .

ل– بەرگریکردنی عەبباس لەموسڵمانان و، هەوڵدانی بۆ ڕزگارکردنی ئەبو زەڕ لەدەستی قورەیش، کەئەوە بەڵگەیە لەسەر هاوسۆزی لەگەڵ موسڵماناندا، شێوەی ڕزگارکردنەکەشی بەڵگەیە لەسەر شارەزایی ئەو بەدەروونی بێباوەڕانی قورەیش، چونکە ترساندنی لەو مەترسییانە کە ئەگەری ڕوودانی هەیە دژ بەبازرگانییەکەیان کەبەناوچەی هۆزی ئەبو زەڕدا تێدەپەڕێت .

---

١– بڕوانە: الوحي وتبليغ الرسالة ٩٥ .

٢– بڕوانە: فتح الباري ٧/١٣٤ .

م- ئەبو زەڕ گوێڕایەڵی پەروەردەی هێمنی بوو، کەپێغەمبەرﷺ پێڕەوی دەکرد لەمەککە، چونکە سەرەڕای خۆشەویستی زۆری ئەبو زەڕ بۆ پێغەمبەرﷺ بەڵام لەسەر فەرمانی پێغەمبەرﷺ مەککەی بەجێهێشت وگەڕایەوە وگرنگی دایە بانگکردنی خزمانی بۆ ئیسلام .

ن- کاریگەری هەڵوێستی ئەبو زەڕ لەسەر خزم وکەسەکانی وموسڵمان بوونیان، سەرەڕای ئەوەیش ئەو کەسێکی گونجاو نەبوو بۆ فەرمانڕەوایەتی، پێشەوا موسلیم دەگێڕێتەوە لەئەبو زەڕ کەفەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا نامکەیت بەفەرمانڕەوا؟ فەرمووی: پێغەمبەرﷺ بەدەستی لەسەر شانمی داو فەرمووی: ((یا ابا ذر انك ضعیف، وانها أمانه، وانها یوم القیامة خزي وندامة، إلا من اخذها بحقها، وادی الذی علیه فیها)) [1] واتە: ئەی ئەبو زەڕ تۆ لاوازی، ئەوەیش ئەسپەردەیە، لەڕۆژی قیامەتیشدا دەبێتە سەرشۆڕی وڕیسوایی، مەگەر کەسێك بەمافی خۆی ئەنجامی دابێت، ئەوەشی لەسەری بێت بەباشی کردبێتی .

هەموو کەسێك بۆ ئەو بوارە باشە کەخوا دروستی کردووە بۆی،ئەگەر لەبوارێکیشدا سەرکەوتوو بوو ئەوە,ئەوە ناگەیەنێت لەهەموو بوارەکاندا سەرکەوتوودەبێت .

س- ئەبوزەڕ پێشنوێژی دایە ئەیمائی کوڕی ڕەخەصە کەسەرۆکی هۆزەکەی بوو، سەرەڕای پلەوپایەی وپێشتر موسڵمان بوونی خۆی، ئەم کردارەیش ئاماژە دەکات بۆ کارامەیی ئەو لەبەڕێوەبردندا، کەهەموو کارەکانی لەدەستی خۆیدا کۆنەکردووەتەوەو، ڕێزی داناوە بۆ خەڵکانی دەوروبەری .

ع- سەرکەوتنی بەرچاوی ئەبو زەڕ لەبانگەوازدا، چونکە نیوەی غیفار موسڵمان بوون و، لەپاش هیجرەتیش ئەو نیوەکەی تری موسڵمان بوون .[2]

لەڕاستیدا هەموو هەوڵەکانی ناشیرین کردن وجەنگی ڕاگەیاندن لەدژی موسڵمانان هەرەسیان هێنا، چونکە دەنگی پێغەمبەرﷺ لەدەنگی ئەوان

---

١- مسلم، کتاب الامارة، باب کراهة الامارة ١٤٥٧/٣ رقم ١٨٢٥ .

٢- بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة للعمري ٤٥/١ .

بەرزتربوو، هۆکارەکانی گەیاندنیشی لەهۆکارەکانی ئەوان چاکتربوو، جێگیربوونیشی لەسەر بنەما پێرۆزەکەی لەوە زیاتر بوو کەپێشبینی دەکرا، چونکە پێغەمبەری خواﷺ لەماڵی خۆیدا دادەنیشت، یان نەچوو لەگۆشەیەکی پاڵ کەعبەدا دانیشێ، بۆ ئەوەی خۆی لەتیرە ژاراوی دوژمنەکانی بپارێزێت، بەڵکو ڕێگای پڕمەترسی گرتەبەر، قورئانی بەدەنگی بەرزدەخوێندەوە لە (مزگەوتی حەرامدا) بۆ ئەوەی ئەوانەی دڵیان زیندووە گوێبیستی بن، وڕووناکی فەرموودەکانی خوای گەورە بگاتە دڵ ودەروونیان [١]، هەندێك لەوانەش ئەمانە بوون باسمان کرد، کەئەوەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر هەرەس هێنانی هەڵمەتەکانی قوڕەیش بۆ ناشیرینکردنی پێغەمبەرﷺ .

## سێیەم: ئەو ئازارو ئەشکە نجانەی پێغەمبەرﷺ تووشی بوون.

بتپەرستان ماندوو نەدەبوون لەئازاردانی پێغەمبەرﷺ، هەر لەوڕۆژەوە کەبانگەوازەکەی ئاشکرا کرد تائەو کاتەی خوای گەورە سەریخستن بەسەریاندا، ئایەتێکی زۆریش ئاماژەدەکەن بۆ ئەندازەی ئەو ئازارانەی بەر پێغەمبەرﷺ دەکەوێت لێیان و، فەرمانیشی دەکرد بەئارامگرتن وهۆکارەکانی پێ پێشان دەداو، داوای دەکرد کەخەم نەخوات ونموونەی پێغەمبەرانی پێش خۆی بۆ باس دەکرد، وەکو فەرموودەیخوای گەورە: ﴿وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهۡجُرۡهُمۡ هَجۡرٗا جَمِيلٗا﴾ (المزمل:١٠) .

﴿فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا﴾ (الانسان:٢٤) .

﴿وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُن فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ﴾ (النمل:٧٠) .

﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ﴾ (فصلت:٤٣) .

---

١- التأريخ الاسلامي للحميدي ١٤٤/١ .

ئەمەیش چەند نموونەیەکە لەئەو ئازارانەی پێغەمبەرﷺ تووشی دەبوو:

١- ئەبو جەهل دەڵێت: ئایا موحەممەد ڕوومەتی خۆی خۆڵاوی دەکات ؟ واتە: ئێوە دەیبینن کڕنووش ببات ؟ وتیان: بەڵێ، وتی: سوێند بەلات وعوززا ئەگەر ببینم بە پێم گەردنی دەشێلم، یاخود خۆڵ دەکەمە ڕوومەتیەوە، وتی: پێغەمبەرﷺ هات ودەستی کرد بەنوێژکردن، بەڵام لەناکاو ئەبو جەهل گەڕایە دواوە، بەدەستی بەرگری لەخۆی دەکرد، ووتیان ئەوە چیتە؟ ووتی: لەنێوان من و ئەودا کەندرێك لەئاگر هەیە، هەروەها باڵ دەبینم و....پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: ((لو دنا مني لاختطفته الملائكة عضواً عضواً)) [1] واتە: ئەگەر لەمن نزیك بوایەتەوە فریشتەکان پارچە پارچەیاندەکرد .

لەفەرموودەیەکی ئیبنو عەبباسیشدا هاتووە، فەرموویەتی: پێغەمبەری خواﷺ نوێژی دەکرد کاتێك ئەبو جەهل هات، ووتی: من ئەمەم لێ قەدەغەنەکردووی، نەموت جارێکی تر نوێژ نەکەیت؟ ئینجا هەندێ قسەی بەپێغەمبەرﷺ کرد ووتی: تۆ چاك دەزانی کەس بەقەد من کەس وکاری نییە، ئیتر خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاندا: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾ (العلق:١٧_١٨) . ئیبنو عەبباس دەفەرمووێت: سوێند بەخوا ئەگەر بانگی کەسەکانی خۆی بکردایە زەبانیەکانی دۆزەخ دەیانبرد .[2]

٢- لەئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خوای لێبێت: لەکاتێکدا پێغەمبەرﷺ نوێژی دەکرد لەلای کەعبە، کۆمەڵێك لەقورەیشیش دانیشتبوون، یەکێکیان وتی: ئایا تەماشای ئەم ڕیابازە دەکەن؟ کامتان دەچێت ڕیخۆڵە وشتری فلانە ماڵ بهێنێت کەسەریان بڕیوەو، چاوەڕوان بکات تاکو دەچێتە سوجدەو بیکاتە نێو هەردوو شانیدا، ئیتر بەدبەخترینیان هەڵسا بەو کارە وڕیخۆڵەو ناو سکەکەی کردە نێو شانی پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی سوجدە بردنیدا، پێغەمبەرﷺ سەری بەرزنەکردەوەو، ئەوانیش دەستیان کرد بەقاقای پێکەنین تاکو خەریك بوو

١- مسلم، كتاب صفات المنافقين، باب قوله ((ان الانسان ليطغى) رقم ٢٧٩٧ .

٢- الترمذي ٣٣٤٩، حسن صحيح غريب .

بەسەریەکدا بکەون، ئینجا کەسێك چوو فاتیمەی کچی ئاگادار کردەوەو ئەویش بەڕاکردن هات وپیسیەکانی لەسەر شانی پیرۆزی باوکی لابرد، ئینجا دەستی کرد بەقسەکردن پێیان، کاتێك پێغەمبەرﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ((اللهم عليك بقريش، اللهم....)) .

واتە: خوایە قوڕەیش لەناو ببەیت_سێ جار_،ئینجا دوعایای لێیان کرد بەناو, خوایە عەمری کوڕی هیشام لەناو ببەیت، خوایە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە لەناو ببەیت، خوایە وەلیدی کوڕی عوتبەو ئومەییەی کوڕی خەلەف وعوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت لەناو بدەیت، ئیبنو مەسعود دەڵێت: سوێند بەخوا هەموو ئەوانەم بینی لەڕۆژی بەدردا بەکوژراوی، دوایی ڕاکێشران بۆ ناو بیرە کۆنەکەی بەدرو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((واتبع اصحاب القليب لعنه)) واتە: ئەوانەی خرانە قولەیبی بەدرەوە لەعنەتیان بەدوادا ڕۆیشت [١].

ڕیوایەتە ڕاستەکانی تر دەریان خستووە کەئەو کەسەی ڕیخۆڵەو ناوسکەکەی فڕەدایە سەر شانی پێغەمبەرﷺ عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت بوو، ئەو کەسەیش کەهانیدا ئەبو جەهل بوو، [٢] هەروەها بێباوەڕەکان دوعای پێغەمبەرﷺ کاریگەری هەبوو لەسەریان وترسان، چونکە پێیان وابوو پاڕانەوە لەکەعبەدا وەردەگیرێت [٣].

**٣- کۆبوونەوەی خەڵکی قوڕەیش ولێدانیان بۆ پێغەمبەرﷺ :**

سەرانی قوڕەیش جارێکیان لەپاڵ کەعبە لەحیجردا کۆبوونەوەو باسی پێغەمبەریان کردﷺو وتیان: هەرگیز خۆمانمان نەبینیوە ئەوەندە بەئارام بین ئەوەندەی کەبەرانبەر ئەم پیاوە ئارامین، بەبێ ئەقڵمان دادەنێ و، جنێو بەخواکانمان دەدات، بەڕاستی ئێمە لەسەر کارێکی زۆر گەورە ئارامی لەسەر دەگرین، ئەوان خەریکی ئەو قسانە بوون پێغەمبەرﷺ هات، ئیتر هەموویان پێکەوە بۆی چوون وگەمارۆیانداو وتیان: تۆی کەڕەخنە لەخواکان وئایینەکەمان دەگری؟

---

١- البخاري واللفظ له رقم ٥٢٠، فتح الباري ٥٩٤/١، مسلم ١٤١٨/٣_١٤٢٠ ورقمه ١٠٧_١٧٩٤ .

٢- صحيح مسلم ١٤٢٠/٣ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري ١٤٩/١ .

فەرمووی: بەڵێ منم وادەڵێم. ئینجا یەکێکیان هات وکردی بەیەقەیدا، لەو کاتەدا ئەبو بەکر پێش پێغەمبەرﷺی لێگرتن وفەرمووی: ئایا کەسێك دەکوژن کەدەڵێت (الله) خوامە؟ .[١]

٤- ئەبو لەهەب کەمامی پێغەمبەرﷺو سەرسەختترین دوژمنەکانیشی بوو، هەروەها ئوممو جەمیلی خێزانیشی دوژمنێکی سەرسەختی پێغەمبەر بووﷺ، هەوڵیدەدا نێوان پێغەمبەری خواو خەڵکی تێکبدات و، دڕکی لەڕێگایدا دادەنا، پیسیشی لەبەر دەرگاکەی دەڕشت، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ﴾ (المسد:١_٥). کاتێك ئوممو جەمیل بیستی ئەم ئایەتانە دابەزیون لەسەر خۆی ومێردەکەی، هاتە لای پێغەمبەرﷺ لەپاڵ کەعبەدا لەگەڵ ئەبو بەکر دانیشتبوو، بەردێکیشی بەدەستەوە بوو، وتی: ئەی ئەبو بەکر کوا هاوڕێکەت؟ بیستوومە قسەی پێکردووم، سوێند بەخوا بیبینم بەم بەردە لەناو دەمی دەدەم! ئینجا ڕۆیشت، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا تۆی نەبینی؟ فەرمووی: ((لقد اخذ الله ببصرها عني)) واتە: خوای گەورە چاوی بەلایەکی تردا برد منی نەبینی، ئوممو جەمیل دەربارەی پێغەمبەرﷺ دەیوت: زەمکراوێکە پێی ڕازی نابین، ئایینەکەیشمان ناوێت، بەفەرمانیشی ناکەین، پێغەمبەرﷺیش پێخۆشحاڵ دەبوو، چونکە بتپەرستەکان جنێویان بە (مذمم) دەدا، دەیفەرموو: ((ئایا سەیرتان لەوە نایەت چۆن خوای گەورە جنێوو نەفرینی قوڕەیشم لێدوور دەخاتەوە، جنێوبە ((مذمم)) دەدەن ومن (محمد)م .[٢]

ئەبو لەهەب تەنانەت شوێن پێغەمبەرﷺ دەکەوێت لەکۆڕو بازەڕەکانداو، لەکاتی حەجداو بەدرۆیدە خستەوە.[٣]

---

١- صحيح السيرة النبوية، ابراهيم العلي من طرق اخرى ٩٦ .

٢- البخاري ورقمه ٣٥٢٣، فتح الباري ٦/٥٥٤_٥٥٥ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية لابى شهبة ١/٢٩٣ .

ئەمانــە هەنــدێك بــوون لەنموونــەی ئــەو ئازارانــەی پێغەمبــەرﷺ چەشــتی لەبتپەرســتەکان، کەکۆتاییــشیان بەهەوڵــدانی کوشــتنی پێهێنــا لــەکۆتایی قۆنــاغی مەککەدا،[١] پێغەمبەرﷺ، باسی ئەو ڕۆژگارانەی دەکرد ودەیفەرموو: ((لقد أخفت في اللــه عزوجــل ومــا يخــاف احــد، ولقــد اوذيــت في اللــه ومــايؤذى احــد....))[٢] واتــە: دەیانترساندم لەکاتێکدا کەس نەدەترسێندرا، ئازار دەدرام وکەسی تر ئازا نەدەدرا، جاری وا بــوو ســێ ڕۆژم بەســەردا تێدەپــەڕی بەشــەوو ڕۆژەوە مــن وبــیلال هیــچمان نەبوو بیخۆین شتێك نەبێت ژێر باڵی بیلال دەیشاردەوە.

ســەرەڕای مــەزنی پلــەو پایــەو ڕێــزی پێغەمبــەرﷺ، تووشــی بــەڵای زۆر و چەرمەسەری بێ ئەندازە بوویەوە، هەر لەیەکەم ڕۆژەوە کەبانگەوازی تیایدا ئاشکرا کــرد، لەگــەوج وگەمــژەکانی قورەیــشەوە ڕووبــەڕووی ئــازارو ئەشــکەنجەی زۆر دەبوویــەوە، کەبــەلای کۆڕێکیانــدا تێپــەڕ دەبــوو لەمەککــە گاڵتــەیان پێــدەکردو، بەتەشقەڵەوە دەیانووت: ئەوە کوڕی ئەبو کەبــشەیە[٣]، لەئاسمانــەوە قــسەی لەگــەڵ دەکرێت، کەسی وایش بوو لەوانە بەلای پێغەمبەرﷺدا تێدەپەڕی ودەیووت: ئەمڕۆ لەئاسمانەوە قسەیان لەگەڵت نەکرد؟!.[٤]

کارەساتەکەش هەر ئەوەندە نەبوو کەگاڵتــەجاڕی بــەو پێغەمبــەرە بکرێــت، یــان ئازاری دەرونی بدەن، بەڵکو ئەشکەنجەی جەستەیشیان دەدا، بەڵکو بەدڕەوشتیان گەیشتە ئەوەی کە ئومەییەی کوڕی خەلەفی دوژمنی خوا تفی لەناو چــاوی پــیرۆزی پێغەمبەرﷺ کرد[٥]، تەنانەت لــەپاش کــۆچ کردنــی پێغەمبــەرﷺ بــۆ مەدینــە، بــەڵاو ئازار لەسەر پێغەمبەرﷺ هەر کۆتایی پێنەهات، بەڵام ڕەوتێکی تازەی وەرگرت، بە سەر هەڵدانی چــەند دوژمنێکــی نــوێ لــەمونافیقان وجوولەکــەو فــارس وڕۆمــەکان و هاوپەیمانەکانیان، ئەگەر پێشتر ئازاردانی مەککە جنێــوو گاڵتــە پێکــردن بــوو، یــان

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١٥٣/١ .

٢- سنن الترمذي ٦٤٥/٤ ورقمه ٢٤٧٢، صححة الالباني_صحيح الجامع ٥٠٠١ .

٣- باوکی پێغەمبەرە ﷺ لەشیردانەوە .

٤- الروض الانف (٣٣/٢) .

٥- هەمان سەرچاوە (٤٨/٢) .

ئابلۆقەو لێدان بوو، ئەمڕۆ بووە ڕووبەڕوو بوونەوەی سەربازی سەخت، هێرش و پاشەکشەی تیادایە، لێدانی شمشێرو ڕمی تیایدایە، بەلای ئەمجارە لەماڵ وگیاندا بوو وەکو یەك [1]، ماوەی پەیامی پێغەمبەر زنجیرەیەك بوو لەچەرمەسەری و تاقیکردنەوە، هەرگیز بێ تاقەتی وسستی ڕووی تێنەکرد لەڕێگای خوادا، بەڵکو ئارامی گرت وداوای پاداشتی خوای دەکرد تا ئەو کاتەی گەیشتە لای خوای خۆی. [2]

هەر لەبەر ئەوانەی کەباسکرا شایستەی ((المقام المحمود والمنزلة الرفيعة)) بوو لەلای خوای خۆی، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێکیش بۆ بانگخواز و چاکسازەکان [3]، چونکە ئەگەر پێغەمبەری خواﷺ دەستدرێژی کراوەتە سەر، ئەوا هیچ کەسێ نییە لەسەرووی بەلاو تاقیکردنەوەوە بێت، لەئەبو سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێبێت، دەفەرموێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کێ لەهەموو کەسێك بەلای گەورەترە فەرمووی: پێغەمبەران، ئەوانەیش کەزیاتر وزیاتر لەئەوان بچن، پیاو بەپێی پتەوی باوەڕەکەی تاقیدەکرێتەوە، ئەگەر لەباوەڕەکەیدا توندبێت، بەلایەکەی سەختتر دەبێت، ئەگەر باوەڕەکەی لاوازبێت بەپێی ئەوە تاقیدەکرێتەوە،تەنانەت ئەوەندە تووشی بەلا دەبێت تاکو لەسەر زەوی ڕێدەکات و هیچ گوناهێکی نەماوە.

## چوارەم: ئەو ئازارو ئەشکە نجانەی تووشی هاوەڵانی پێغەمبەر بوونﷺ .

### ١- ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت:

هاوەڵان ئەوەندەیان لەئازارو ئەشکەنجە بەسەر هات کەچیاکانیش توانای هەلگرتنیان نەبوو، ماڵ وگیانی خۆیان بەخت کرد لەپێناوی خوادا، ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت ئازاری زۆر درا، خۆڵیان بەسەردا کرد، لەلای کەعبەدا بەنەعل لێیانداو، دوایی خرایە ناو پۆشاکێك وبرایەوە بۆ ماڵ لەحاڵەتێکی نزیك لەمەرگدا، [4]

١- زاد اليقين لابي شنب (١٣٧) .
٢- التمكين للامة لاسلامية (٢٤٣) .
٣- بروانە: محنة المسلمين في العهد المكي، د.سليمان السويكت (١٩٧) .
٤- التمكين للامة الاسلامية ٢٤٣ .

عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە، كاتێك هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ كۆبوونەوە، كە سی و هەشت كەس دەبوون، ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێبێت جەختی دەكرد لەسەر ئەوەی كەخۆیان ئاشكرا بكەن، پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: ((یا ابابكر إنا قلیل)) واتە: ئەی ئەبو بەكر هێشتا كەمین. ئەوەندە ئەبو بەكر جەختی دەكرد تاپێغەمبەر ﷺ خۆی ئاشكرا كرد، موسڵمانانیش بەناو مزگەوتەكەدا بلاوەیان كرد، هەریەكەو بۆلای عەشیرەتی خۆی، ئەبو بەكریش دەستی كرد بە وتاردان بۆ خەڵكی، پێغەمبەریش ﷺ دانیشتبوو، بۆیە ئەبو بەكر یەكەمین وتار بێژە كەبانگەوازی كردووە بۆلای خواو پێغەمبەرﷺ، بتپەرستەكان هەڵیان كوتایە سەر موسڵمانان وئەبو بەكریان خستە ژێر پێیان وبەسەختی لێیاندا، ئینجا عوتبەی كوڕی ڕەبیعە بەدوو تاكە نەعلەوە لەئەبو بەكری دەدا، دوای ئەوە خزم وكەسەكانی هاتن لەناو پۆشاكێكدا بردیانەوە، گومانیشیان نەبوو كەمردووە، ئینجا بەنو تەیم گەڕانەوە ناو مزگەوتەكەو وتیان سوێند بەخوا ئەبو بەكر بمرێت، عوتبەی كوڕی ڕەبیعە دەكوژین، ئینجا ئەبو قوحافەی باوكی وخزمانی قسەیان لەگەڵ دەكرد تاوەلامی دایەوەو، وتی: پێغەمبەرﷺ چی بەسەر هات؟ ئەوانیش قسەیان پێ كرد وبەدایكیان وت: خواردنێكی بدەرێ، كاتێك هەر هەردووكیان لەژوورەكەدا مانەوە زۆر جەختی لەسەر زانینی هەواڵی پێغەمبەرﷺ كرد، دایكیشی وتی: سوێند بەخوا ئاگام نییە لەهاوڕێكەت چی بەسەر هاتووە، وتی: بڕۆ بۆلای ئوممو جەمیلی كچی خەتتاب وپرسیاری لێبكە، ئەویش چوو پرسیاری كرد، ئوممو جەمیل وتی: نەئەبوبەكرو نەموحەممەد ناناسم، خۆ ئەگەر پێت خۆشە لەگەڵت دێم بۆلای كوڕەكەت، وتی: بەڵێ كاتێك هات وحاڵی ئەبو بەكری بینی، هاواری كرد وتی: سوێند بەخوا كەسانێك ئەم كوڕەی تۆیان والێكردووە بێباوەڕو بێ ڕەوشتن، خوای گەورە تۆڵەی كوڕەكەت لە ئەوانە بسێنێتەوە، ئەبو بەكر وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ چیكرد؟ وتی: ئەوە دایكت دەبیسێ، وتی: مەترسە لەدایكم، وتی: ساغ وسەلامەتەو لەماڵی ئەرقەمە، وتی: سوێند بەخوا نان وئاو ناخۆم تاپێغەمبەرﷺ نەبینم، ئەوانیش لەكپی شەودا بردیانە لای پێغەمبەرﷺ، لەوێ پێغەمبەری خواﷺو

موسڵمانان باوشیان پیاکردو ماچیان کرد، پێغەمبەرﷺ زۆر دڵی تەنگ بوو بۆ حاڵی، ئەبو بەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا باوك ودایکم بەقوربانت بێت، زۆر باشم هەندێك روومەتم نەبێت، ئەوەیش دایکمە دوعای بۆ بکە، پێغەمبەریشﷺ دوعای بۆ کردو ئەویش موسڵمان بوو .[١]

**وانەو پەندو سوودەکان:**

أ- پەرۆشی ئەبوبەکر بۆ راگەیاندنی ئیسلام و، ئاشکراکردنی بەرانبەر بێباوەڕان، ئەمەیش ئاماژە دەکات بۆ پتەوی باوەڕو ئازایەتی، ئەوەندە ئەشکەنجەی بینی خزمەکانی گومانیان نەدەکرد کەمردووە.

ب- خۆشەویستی ئەبوبەکر بۆ پێغەمبەرﷺ، چونکە لەوکاتە نارەحەتەدا پرسیاری دەکردو دەیووت کەنان وئاو ناخوات تانەیبینێ، لەکاتێکدا توانای هەڵسانی نەبوو.

ج- دەمارگیری هۆزایەتی رۆڵی خۆی هەبوو لەوکاتەدا، هۆزی ئەبوبەکر سەرەڕای ئەوەی بتپەرست بوون هەرەشەیان لەعوتبەدا بیکوژن ئەگەر ئەبوبەکر بمرێت.[٢]

د- هەستی هێمنی لەلای ئوممو جەمیل رەزای خوای لێبێت، کەوا لەچەندین رەفتاردا دەرکەوت، لەوانە:

*** شاردنەوەی کەسایەتی وزانیاری لەڕێگەی نکۆڵی کردن:**

کاتێك ئوممو لخەیر پرسیاری کرد لەئوممو جەمیل دەربارەی جێگای پێغەمبەرﷺ، نکۆڵی کرد لەناسینی ئەبوبەکر وموحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا، ئەمەش وریایی بوو لەئەوەوە، چونکە تائەو کاتە ئوممو لخەیر موسڵمان نەبوو، ئوممو جەمیلیش موسڵمانێتی خۆی دەشاردەوە، جێگای پێغەمبەرﷺیشی باسنەکرد نەوەك ئەو ئافرەتە سیخوڕی قوڕەیش بێت .[٣]

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابن كثير ١/٤٣٩_٤٤١ .

٢- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي ٧٩ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية لا ٥٠ .

*** قۆستنەوەی هەڵوێست بۆ گەیاندنی زانیاری:**

ئوممو جەمیل ویستی خۆی زانیارییەکە بەئەبو بەکر بگەیەنێت ڕەزای خوایان لێبێت، لەکاتێکدا ئەوەی دەرنەخست بۆ دایکی وهەڵوێستەکەشی بۆ بەرژەوەندی خۆی قۆستەوە، بەوەی کە وتی ئەگەر حەزدەکەیت خۆم لەگەڵت دێم، ئینجا بەشێوەیەکی ژیرانەش ئەو پێشنیارەی بەدایکی ئەبو بەکر ووت (ئەگەر حەزدەکەیت)، ئینجا وتی دێم بۆلای کوڕەکەت ونەیووت بۆلای ئەبو بەکر، هەموو ئەمانەش سۆزی دایکایەتی لەلای جوڵاندو ڕازی بوو بەهاتنی وبەخۆی زانیارییەکەی گەیاند.

*** قۆستنەوەی هەڵوێست بۆ بەدەستهێنانی سۆزی دایکی ئەبوبەکر:**

وادیارە ئوممو جەمیل هەوڵیداوە سۆزی دایکی ئەبوبەکر بەدەست بهێنێ، کاتێك کە بینی ئەبوبەکر بەوشێوە ئەشکەنجە دراوە، گریاو دوعای کرد لەئازار دەرانی، بەم شێوەیش خۆشەویستی خۆی کردە دڵی دایکی ئەبو بەکرەوەو بۆ خۆیشی ئاسانتر بوو زانیارییەکە بگەیەنێت .[١]

*** دوور بینی وپەلەنەکردن لەگەیاندنی زانیاری :**

وریایی ودوور بینی ئوممو جەمیل لەوەدا بوو کەدڵنیا نەبوو لەدایکی ئەبوبەکر چونکە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو، بۆیە دوو دڵ بوو لەباسکردنی شوێن وحاڵی پێغەمبەرﷺ، تائەبوبەکر دڵنیای کردەوە لەدایکی .

*** هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ جێبەجێکردنی ڕاسپێری :**

کەئەبوبەکر داوای کرد بچن بۆ ماڵی ئەڕقەم، ئوممو جەمیل یەکسەر ڕازی نەبوو، بەڵکو دواکەوت تاخەڵکی دەنگیان نەما، ئیتر لەکپیی شەوداو بەپاڵپێوەدان بەهەردووکیانەوە ئەبوبەکر بەڕێکەوت بۆ ماڵی ئەڕقەم .[٢]

---

١- هەمان سەرچاوە .

٢- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية ٥٠_٥٢ لەم کتێبەشەو سوودم وەرگرتووە بۆ ئەم باسانە .

د- یاسای بەخشین لەپاش دەردەسەری، چونکە دایکی ئەبوبەکر موسڵمان بوو، بەهۆی حەزکردنی ئەبوبەکر بۆ موسڵمان بوونی دایکی، بۆیە داوای کرد لەپێغەمبەرﷺ دوعای بۆ بکات.[١]

هـ- زۆرترین ئازارو ئەشکەنجە پاش پێغەمبەرﷺ لەناو هاوەڵاندا بۆ ئەبوبەکر بوو ڕەزای خوای لێبێت، ئەویش بەهۆی نزیکی زۆری لەپێغەمبەرﷺو بەشداربوونی لەگەڵیدا لەهەموو ساتە ناخۆشەکانداو، هەمیشە بەرگری لێدەکرد وخۆی بەختدەکرد بۆی، ئەمە لەکاتێکدا کەئەبوبەکر بەیەکێك لەهۆشمەندان وچاکەکارانی قورەیش دەناسرا .[٢]

**٢- بیلال ڕەزای خوای لێبێت:**

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئازاردانی بتپەرستەکان بۆ پێغەمبەرﷺو هاوەڵانی زیادی دەکرد، تاکو گەیشتە چڵەپۆپەکەی وهەموو جۆرەکانی ئەشکەنجەیان بەکار هێنا لەگەڵیان، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەفەرموێت: ((ئەوانەی کەیەکەمین جار موسڵمان بوونیان ئاشکرا بوو حەوت کەس بوون: پێغەمبەرﷺو، عەممارو، سومەییەی دایکی و، صوهەیب و، بیلال و، میقداد، سەبارەت بەپێغەمبەرﷺ خوای گەورە بەئەبو تالیبی مامی پاراستی، ئەبو بەکریشی بەخزمەکانی پاراست، بەڵام ئەوانی تر کەوتنە دەست بتپەرستەکان وقەڵغانی ئاسنینیان لەبەر دەکردن، لەبەر خۆر ڕایاندەگرتن، زۆربەشیان خۆیان ڕانەگرت بیلال نەبێت، کەگیانی خۆی لەلا بێ بایەخ بوو، دایانە دەستی منداڵانەوەو، بەناو کۆڵانەکانی مەککەدا دەیانسوڕانەوەو هەردەیووت: ئەحەد، ئەحەد))[٣] بیلال ڕەزای خوای لێبێت کەسێکی نەبوو پشتی بگرێت، یان عەشیرەتێك بەرگری لێبکات، کەسێکی لەم جۆرەش لەکۆمەڵگای مەککەی ئەو سەردەمە ژمارەیەك بوو لەژمارەکان، ڕۆڵی لەژیاندا تەنها خزمەتکاری بوو، کڕین وفرۆشتنی پێدەکرا وەکو ئاژەڵ، نەدەبوو بیرو بۆچوون وهزری خۆی

---

١- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي لا ٧٩ .

٢- هەمان سەرچاوە لا ٧٥ .

٣- بڕوانە: احمد ١/٤٠٤ ورقمه ٣٨٣٢ باسناد حسن .

هـەبێت، یاخـاوەن بانگـەواز وکێـشەیەك بێـت، ئـەوە تـاوانێکی ڕەش بـوو لـەو کۆمەڵگایە، بەڵام بانگەوازی تازەکە گـەنجانی لـە دەور کۆدەبوویـەوە، بـەرەنگاری داب و نەریتی باوباپیران دەبوونەوە، ئەو بانگەوازە گەیشتە دڵی ئـەم کۆیلـە کـەس بایـەخ پێنـەداوە ومرۆڤێکـی تـازەی لێدروسـت کـردو،[1] خـۆی خـستە پـاڵ موحەممـەدﷺو هـاوەڵانی لەئـەو کـەژاوە ئیمانیـە مەزنـەدا تووشـی ئەشـکەنجەی لەڕادەبـەدەریش بـوو، بـەڵام ئەبوبـەکر ڕەزای خـوای لێبێـت، سازشـی کـرد لەگـەڵ ئومەییـەی کـوڕی خەلـەف وپێـی وت: ئایـا لەخواناترسـی والـەم داماوە دەکـەیت؟ تاکەی! وتی: تۆگەیاندتە ئەم سەرئەنجامە، ئەی بۆ ڕزگـاری ناکـەیت، وتـی بـەڵێ، کۆیلەیـەکی ڕەشـی بـەهێزترم هەیـە لـەبیلال، لەسـەر ئـاییـنی خۆتیـشە، دەتـدەمێ بەرانبەری بیلال ، ووتی: باشە؛ ئینجا بیلالی بردو ئازادی کرد))[2] لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کەکڕییەتی بەحەوت ئوقییە، یان بەچل ئوقییەی ئاڵتوون .[3]

بەڕاستی بیلال سەرەڕای بێکەسی ولاوازی، خاوەن بیرو بـاوەڕێکی پـۆلایین ودڵ پاك بوو، تاکە کەسێکیش بوو کەبەهیچ شێوەیەك بەقسەی بتپەرسـتەکانی نـەکرد و گیانی خۆی بەلاوە سووك بوو .[4]

دوای هەموو دەردی سەرییەك بەخشینێك هەیە، بۆیە بیلال ڕزگاری بوو لـەئازارو ئەشکەنجەو کۆیلایەتیش، ئەو دوایی ژینیـشی لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺدا بەسـەر بـرد، هەتا لەدونیاش دەرچوو ڕازی بوو لێی ومژدەی بەهشتیشی پێدا، جارێك پێیفەرموو: ((....فـاني سمعـت خـشف نعليـك بـين يـدی في الجنـة))[5] واتـە: گـوێم لـەدەنگی نەعلەکانت بوو لەبەردەممدا لەبەهەشت سـەبارەت بـەڕێزو پلەوپایـەی بـیلال لـەلای هاوەڵان، عومەر ڕەزای خوای لێبێت دەیفەرموو: ((ئەبوبەکر سەرگەورەی ئێمەیـە و سەرگەورەکەمانی ئازاد کرد_مەبەستی بیلال بوو_.[6]

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ١/١٣٦ .
٢- السيرة النبوية لابن هشام ١/٢٩٤ .
٣- التربية القيادية ١/١٤٠ .
٤- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي لا ٩٢ .
٥- صحيح مسلم ٢/١٩١٠ رقم الحديث ٢٤٥٨ .
٦- الطبقات الكبرى لابن سعد ٣/٢٣٢ ورجاله ثقات .

ڕێبازی صدديق لەئازادکردنی کۆیلە بوو بەڕێبازێکی کارپێکراو دواتر...

((...ئینجا ئەبو بەکر پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ مەدینە، شەش کۆیلەی تری ئازاد کرد، بیلال حەوتەمیان بوو، عامیری کوڕی فوهەیرە، کەبەشداری بەدرو ئوحودی کردووە، لە ڕۆژی بیری مەعونە شەهید کرا، ئوممو عوبەیس و، زینیرە، کەچاوی لەدەستدا بوو لەکاتی ڕزگارکردنیدا، قورەیش وتیان: لات وعوززا چاوەکانیان لێسەندوەتەوە، وتی: درۆیان کرد سوێند بەماڵی خوا لات وعوززا نەزیان دەبەخشن ونەسوودیان بۆ کەس هەیە، ئیتر خوای گەورە چاوەکانی بۆ گەڕاندەوە)) هەروەها ئەبوبەکرەڵسا بەئازادکردنی نەهدییەو کچەکەی کەکۆیلە بوون لەلای ئافرەتێك لەهۆزی بەنی عەبدوددار، بەلایدا تێپەڕبوو، لەو کاتە ئافرەتەکە ئەو دوو کۆیلەی ناردبوو بۆ هارینی گەنم وهێنانەوەی ئاردەکەی و، دەیووت: سوێند بەخوا هەرگیز ئازادتان ناکەم، ئەبوبەکر فەرمووی: لەو سوێنەت بگەڕێرەوە، ئەویش وتی: تۆ لەڕێگا دەریانت کرد خۆتیش ئازادیان بکە، وتی: بەچەند دەیاندەیت ووتی: ئەوەندە. ئیتر ئەبوبەکر کڕیانی وئازادیانی کرد وتی: ئاردەکەی بۆ بگێڕنەوە.

لێرەشدا جێگای خۆیەتی تێبینی ئەوە بکرێت چۆن ئیسلام یەکسانی کردووە لەنێوان ئەو دوو کۆیلە وئەبو بەکر، کاتێك بەو شێوە قسەیان لەگەڵ ئەبوبەکر کرد سەرەڕای ڕێزو پلەو پایەی لەجاهیلیەت وئیسلامیشدا، سەرەڕای ئەوەی کە ئەبوبەکر چاکەی لەگەڵدا کرد بەئازادکردنیان، ئینجا چۆن ئیسلام بەو شێوە ئەو دوو کۆیلەی دامەزراندبوو کەببنە خاوەن ئەوتۆ ڕەوشتێکی جوان، خۆ ئەوان دەیانتوانی ئاردەکەیان بۆی بەجێهێشتایە وبابیردایە، یان ببوایە بەخۆراك بۆ ئاژەڵ، بەڵام ڕازی نەبوون تاکارەکەیان بەئەنجام نەگەیەنن وبۆی نەگێڕنەوە.[1]

جارێکیش بەلای ئافرەتێکی کۆیلەی بەنی موئەممیلدا تێپەڕ بوو، کەموسڵمان بوو، عومەری کوڕی خەتتابیش ئەشکەنجەی دەدا بۆ ئەوەی واز لەئیسلام بهێنێ، جاکەعومەر بێزار بوو لەلێدانی وتی: داوای لێبوردنت لێدەکەم، من وازم

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة ٣٤٦/١ .

لەئەشکەنجەدانت نەهێنا لەبەر بێزاری نەبێت، ئەویش ئەیووت: خوایش وای بەتۆ کردووە، ئیتر ئەبوبەکر کڕی وئازادی کرد .[١]

بەخشندەی ئازادی بەم شێوە بوو، دەمڕاست وسەرگەورەی شکۆداری ئیسلام کەلەنێو خەڵکدا بەیارمەتیدەری هەژار وبەجێهێنەری پەیوەندی خزمایەتی و بەخشندەیی دەناسرا، هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان نەکەوتە ناو زەلکاوی نەفامیەوە، دڵی لەسۆزو بەزەیی بوو بەرانبەر لاوازو هەژارو کۆیلەکان، زۆرێکی لەماڵەکەشی لەو ڕێگەیەدا خەرج کرد ...[٢]

کۆمەڵگای مەککە گاڵتەیان بەئەبوبەکر دەکرد، چونکە ئەو هەموو ماڵەی خەرج دەکرد لەپێناو ئەو خەڵکە بێ نەواو بێ دەسەڵاتە، بەڵام لەدیدی ئەبوبەکرەوە ئەوان برای بوون لەئاییني تازەدا، یەکێك لەئەو کۆیلانە بەلای ئەبوبەکرەوە بەرانبەر هەموو بتپەرستەکانی سەر زەوی زیاتر بوو، بەم شێوەیەش دەوڵەتی یەکتاپەرستی دروستدەکرێت و، شارستانیەتی ئیسلام بنیاتدەنرێت،...[٣] ئەبوبەکر بەئەم کارانەی، هەرگیز چاوەڕوانی سوپاس وپلەوپایەوپارە نەبوو، بەڵکو تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەی دەویست، جارێکیان باوکی پێی وت: ئەی کوڕەکەم من دەتبینم هەندێ کۆیلەی لاواز ئازاد دەکەیت، خۆ هیچ نەبێت هەندێ پیاوی جەربەزەو بەهێز ئازاد بکەیت بەرگریت لێبکەن باشترە، ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی باوکە، من لەو کارەم مەبەستم خوایە تەنها، بۆیە سەیرنییە کەخوای گەورە ئەم ئایەتانەی لەسەری دابەزاند: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنْذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِنْدَهُ مِنْ نِعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾ (الليل:٥_٢١) .

---

١- السيرة النبوية لابن هشام ٣٩٣/١ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية لابى شهبة .

٣- بڕوانە: التربية القيادية ٣٤٢/١ .

ئەم هاوبەرپرسیارێتی یە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵی موسڵمانی یەکەمدا، چڵەپۆپە بوو لەچاکەو بەخشندەییدا، ئەو کۆیلانەش بەبۆنەی ئیسلامەوە، بوون بەخاوەنی بیروباوەڕو هزر، قسەیان پێدەکردو بەرگرییان لێدەکردو جیهادیان لەپێناویدا دەکرد، بڕیاری کڕینی لەلایەن ئەبوبەکرو ئازادکردنیان بەڵگەبوو لەسەر مەزنی ئایینی ئیسلام وپەلهاوێشتنی لەناو دڵ ودەرونی ئەبوبەکردا، موسڵمانانیش ئەو پەڕی پێویستیان هەیە بەوەی ئەو نموونە زیندوو بکەنەوە، بۆ ئەوەی یەککرتن دروست بێت لەنێوان ڕۆڵەکانی ئوممەتی ئیسلام .

**٣- عەمماری کوڕی یاسیرو باوکی ودایکی :**

باوکی عەممار لەبەنی عەبس بوو لەهۆزەکانی یەمەن، هاتە مەککە لەگەڵ حاریس ومالیکی برایدا، کاتێك بەدوای براکانیدا هاتبوون، حاریس ومالیك گەڕانەوە بۆ یەمەن ویاسر لەمەککە جێگیربوو، لەوێیش بوو بەهاوپەیمانی ئەبو حوزەیفەی کوڕی موغیرەی مەخرومی [١] ئەویش ئافرەتێکی کۆیلەی لێمارەکرد ناوی سومەییەی کچی خەییات بوو، لەپاش لەدایکبوونی عەممار [٢]، ئەبو حوزەیفە پێش مردنی بەماوەیەك سومەییەی ئازادکرد، ئیسلام هات و، یاسر وسومەییە وعەممار موسڵمان بوون، هەروەها عەبدوڵڵای برای عەمماریش، بۆیە خاوەنەکانیان لەبەنی مەخزوم زۆر هەڵویستی توندو تیژیان لێیان وەرگرت و، سزاو ئەشکەنجەی دڕەندانەیان دەدان، کەخۆری نیوەڕۆ گەرم دەبوو، لەسەر بەردەگەرمەکانی مەککە دەریانیان دەکرد بۆ ئەشکەنجەدان، جارێك لەسەر پشت دایاندەنان وجارێك لەسەردەم، [٣] پێغەمبەرﷺ بەلایاندا تێپەڕ دەبوو و، دەیفەرموو: ((صبراً آل یاسر فان موعدکم الجنة)) [٤] واتە: ئارام بگرن ئەی خاوو خێزانی یاسر، جێگای دیاریکراوتان بەهەشتە، ئینجا ئەبو جەهل هاتە لای سومەییەو پێی وت: تۆ باوەڕت بەموحەممەد نەهێناوە

---

١- بڕوانە: انساب الاشراف للبلاذري ١/١٠٠، ١٥٧ .

٢- ابن هشام السيرة النبوية ٢/٦٨ .

٣- بهجة المحافل للعامری .

٤- صحيح السيرة النبوية: ابراهيم العلي ٩٧_٩٨ .

لەبەر ئەوە نەبێت کەپیاوێکی جوانە، ئیتر هەندێ قسەی ڕەقی کردو، ئەبو جەهل بەڕمێك لەشوێنی پاراوی داو کوشتی، بەو شێوەیش سومەییە بوو بەیەکەم شەهید لەئیسلامدا، ڕەزای خوای لێبێت،[١] ئەمەیش هەڵوێستێکی هەرە مەزن بوو، ناویشی بەهەتاهەتایی هەردەمێنێتەوەو، نموونەیەکی پرشنگدارە بۆ هەموو ئافرەتێك کەئاوات بخوازێت وەکو سومەییە خزمەتی ئیسلام بکات، چونکە بەگیانی خۆی فیداکاری بۆ ئیسلام کرد .[٢]

لەفەرموودەی عوسماندا هاتووە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: ((پێغەمبەرﷺ دەستی گرتبووم کاتێك لەبەتحا پێکەوە ڕێمان دەکرد، تاکو نزیك خاوخێزانی عەمماری کوڕی یاسر بووینەوە، باوکی عەممار ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هەر وادەمێنینەوە؟ پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئارام بگرن، ئینجا فەرمووی: ئەی خوایە گیان لەخاوخێزانی یاسر خۆش بە، وایشت کردووە)).[٣]

پێغەمبەری خواﷺ لەتوانایدا نەبوو هیچ پێشکەش بکات بۆ ئەوان، چونکە ئەوان کۆیلە نەبوون تاکو بیانکڕێت وئازادیان بکات، ئەوەندەش هێزی نەبوو تاکو بتوانێت لەژێر دەستیان دەریان بکات، هەر ئەوەندەی پێدەکرێت مژدەی لێخۆشبوون وبەهەشتیان پێبدات و، هانیان بدات لەسەر ئارامگرتن؛ بۆ ئەوەی ئەم خێزانە بەڕێزە ببنە پێشەنگ بۆ نەوەکانی دوای خۆیان و، کەژاوەی بەردەوامی دوای ئەوان بەدرێژایی مێژوو ئەم قسەی لەگوێدا بزرنگێتەوە: ((صبراً آل ياسر، فان موعدكم الجنة)) .[٤]

سەبارەت بەعەمماریش ماوەیەکی زۆر دوای باوك ودایکی دەیناڵاند بەدەست ئازارو ئەشکەنجەوە، چونکە لەکۆمەڵی بێدەسەڵاتەکان پۆلێن دەکرێت کە کەس و عەشیرەتێکی نەبوو لەمەککەدا بەرگری لێبکات، بۆیە قوڕەیش ئەشکەنجەی زۆری ئەوانەی دەدا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە لەئیسلام، عەممار ئەوەندە ئەشکەنجە دەدرا

---

١- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي ٩٩ .
٢- التربية القيادية ٢١٧/١ .
٣- صحيح السيرة النبوية ٩٨ اورده الهيثمي في المجمع ٢٩٣/٩ وقال: رواه احمد ورجاله رجال الصحيح .
٤- التربية القيادية ٢١٧/١، ٢١٨ .

تاکو خۆیشی نەیدەزانی چی دەڵێت،[١] وازیشیان لێنەهێنا تاکو جنێوی بەپێغەمبەرﷺدا وباسی بتەکانیانی کرد بەباشە، کاتێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: چیت پێی یە؟ ووتی: خراپی، سوێند بەخوا بتپەرستەکان وازیان لێنەهێنام تاکو قسەی ناشیرینم پێت کردو باسی خواداکانیانم کرد بەچاکە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دڵت چۆنە؟ وتی: ئاسوودەیە بەئیمان، فەرمووی: ((فان عادوا فعد))[٢] واتە: ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئەشکەنجەدانت دیسان ئەو قسانەت بکەوە، وەحیی خوای گەورەیش دابەزی وشایەتیدا بۆ ئیمانی عەممار، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ (النحل:١٠٦). ئامادەی هەموو شەڕو غەزاکانیش بوو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ .[٣]

**٤- سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ڕەزای خوای لێبێت :**

سەعد لەلایەن دایکە بێباوەڕەکەی تووشی سزاو ئەشکەنجە بوو، دایکی بڕیاریدا هیچ خواردن وخواردنەوەیەك نەخوات تاکو کوڕەکەی لەئیسلام نەگەڕێتەوە، (ابن کثیر) دەڵێت: ((تەبەرانی لەکتێبی ((العشرة)) لەسەعد دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ئەم ئایەتە بەهۆی منەوە دابەزی: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَا﴾ (لقمان:١٥) .

هەروەها دەیفەرموو: من بۆ دایکم کوڕێکی چاکە کاربووم، کاتێك موسڵمان بووم، پێی وتم: ئەو داهێنراوە چییە کردووتە، پێویستە پاشگەزببیتەوە لەو ئایینە، یان ئەوەیە من واز لەخواردن وخواردنەوە دەهێنم تاکو بمرم و، خەڵکی تانەو تەشەرت لێبدەن بەمردنم وپێت بڵێن: ئەی بکوژی دایکی، وتم: ئەی دایکە کاری وانەکەیت، چونکە من لەئایینی خۆم ناگەڕێمەوە بۆ هیچ شتێك، شەوو ڕۆژێك دایکی هیچی

---

١- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي ١٠٠ .

٢- بڕوانە: فقة السيرة، الغزالي ١٠٣ .

٣- هەمان سەرچاوە .

نەخوارد وتەواو ماندوو بوو، ئینجا رۆژو شەوێکی تربە هەمان شێوە، ئینجا ماندووتر بوو، دوای ئەوە شەو رۆژێکی تریش هەر هیچی نەخواردو، تێنوێتی وبرسێتی زۆری بۆی هێنا، کاتێك بەو شێوە بینیم، وتم: دایە گیان، چاك بزانە، سوێند بەخوای گەورە، ئەگەر سەد گیانت هەبێت، یەکد بەدوای یەکدا دەرچن، من واز لەئایینی خۆم ناهێنم، ئیتر ئارەزووی خۆتە خواردن وخواردنەوە بخۆیت یان نا، ئیتر دایکی دەستی کردبە خواردن دوای ئەوە.[١]

هەروەها موسلیم ڕیوایەتی کردووە؛ دایکی سەعد سوێندی خوارد قسە لەگەڵ نەکات تاکو لەئیسلام پاشگەز نەبێتەوەو، نەنان ونەئاویش نەخوات، بەسەعدی دەووت: تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کەخوا ڕاسپاردەی پێ کردووی بەدایك و باوکت، منیش دایکتم، بەوە فەرمانت پێدەکەم، دەڵێت: ئیتر ئەویش سێ ڕۆژ دابڕا لەخواردن وخواردنەوە تاکو بوورایەوە، ئینجا کوڕێکی ناوی عومارە بوو ئاوی پێداو ئەویش دەستی کرد بەدوعاکردن لەسەعد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى﴾ (العنكبوت:٨) . هەروەها: ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ﴾ (لقمان:١٥) .

دەڵێت ئەگەر بیانویستبا خواردنی پێبدەن بەزۆر دەمیان دەکردەوە[٢] خواردنیان تێدەکرد، بۆیە دەردەسەری سەعد گەورە بوو، هەڵویستەکەشی بەڵگەیە لەسەر پەلهاوێشتنی ئیمان لەدڵیدا .[٣]

لەبەدواداچوونی قورئان دەبینین، سەرەڕای نەمانی خۆشەویستی لەنێوان موسڵمانان وکەسەکانیدا، قورئان هەرگیز فەرمانی نەکردووە بەبڕینی پەیوەندییەکان،بەڵکو فەرمانی کردووە چاکەیان لەگەڵدا بکەن،بەڵام خۆشەویستی و پشتگرتن بۆ خواو پێغەمبەرو ئیسلام وباوەڕدارانە .[٤]

---

١- تفسير ابن كثير ٤٤٦/٣ ئایەتی ١٥ لەسورەتی لوقمان، بەدەستکارییەوە .

٢- صحيح مسلم ١٨٧٧/٢، ١٨٧٨ رقم الحديث ٤٣، ٤٤_١٧٤٨ .

٣- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي لا ١٠٦ .

٤- بڕوانە: الولاء والبراء، محمد القحطاني لا ١٧٤، ١٧٥ .

**٥- موصعەبی کوڕی عومەیر ڕەزای خوای لێبێت :**

موصعەبی کوڕی عومەیر خۆشگوزەرانترین و، پۆشاك جوانترین لاو بوو لەشاری مەککە، باوك ودایکی زۆریان خۆشدەویست، دایکی ئافرەتێکی دەوڵەمەند بوو، جوانترین پۆشاکی لەبەر عومەیر دەکرد، هەمیشە بۆنی خۆش بوو، نەعلی حەزرەمی لەپێدەکرد [١]، دایکی بەڕادەیەك خۆشی دەویست کە هەندێ خۆراکی خۆشی لەلای سەری دادەنا بۆ ئەوەی لەخەو هەڵسا بیخوات [٢]، موصعەبی کاتێك کەزانی پێغەمبەری خواﷺ لەماڵی ئەرقەمدا بانگەواز بۆ ئیسلام دەکات چووە لای و موسڵمان بوو، بەڵام سەرەتا ئەوەی ئاشکرا نەکرد، تاکو ڕۆژێك عوسمانی کوڕی تەڵحەی بینی [٣]،نوێژ دەکات ودایکی وخزمەکانی ئاگادار کردەوە، ئەوانیش گرتیان و زیندانیان کرد، تائەو کاتەی دەرچوو بۆ حەبەشە لەکۆچکردنی یەکەمدا . [٤]

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەگێڕێتەوە: من موصعەبم بینی لەدەردی سەرییەکی زۆر ناخۆشدا بوو پاش موسڵمان بوونی، تەنانەت دەمبینی پێستی لەگیانی دەبوویە، وەکو چۆن مار پێستی فڕێدەدا، بەڵکو توانای ڕێکردنی نەمابوو، بۆیە سواری وشترمان دەکرد، پێغەمبەری خواﷺ کەباسی دەکرد، دەیفەرموو: ((مارأيت بمكه احداً احسن لمة ولا ارق حلة ولا انعم نعمة من مصعب بن عمير)) [٥] واتە: لەمەککەدا کەسم نەدەبینی لەموصعەبی کوڕی عومەیر قژجوانترو پۆشاك چاکترو خۆشگوزەرانتر بێت. لەگەڵ هەموو ئەو ناڕەحەتیانەش تووشی دەبوو، هیچ کەمتەر خەمییەکی پێشان نەدا لەئەنجامدانی چاکە وجیهاد لەپێناو خوادا تائەو کاتەی خوای گەورە پلەی شەهیدی پێبەخشی لەشەڕی ئوحود . [٦]

موصعەبی کوڕی عومەیر نموونەیەکە بۆ پەروەردەکردنی ئیسلام بۆ لاوە خۆشگوزەرانەکان وکوڕە دەوڵەمەندەکان وئەوانەی بەخۆیانەوە دەنازن چونکە

---

١- الطبقات الكبرى ٣/١١٦ .
٢- الروض الانف ٢/١٩٥ .
٣- سير اعلام النبلاء للذهبي ٣/١٠_١٢ .
٤- السير والمغازي لابن اسحق ١٩٣ .
٥- الطبقات الكبرى ٣/١١٦ .
٦- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي .

لەپاش موسڵمان بوونی، هیچ لاوازی پیشان نەداو، وەکو چۆن ئەو موصعەبە نەبێت کەلەو حاڵە خۆش وبەختەوەرانەدا بوو .

موصعەب ماڵئاوایی کرد لەژیانی خۆشگوزەرانی، بەهەموو ئەو خۆشیانەی تیایدا بوو، لەپاش ئەوەی کەبەیعەتی دایە پێغەمبەرﷺ، سەرەڕای لەدەستدانی بۆ دەوڵەمەندی و پلەوپایەو خۆشەویستی لای خزم وکەسوکار،ئینجا سەرەڕای هەژاری و برسێتی وئەشکەنجە لەپاش موسڵمان بوونی، دڵی هەر ئاسوودەو پڕ لەباوەڕ بوو[١]، چەند وەستانێکی ترمان دەبێت لەگەڵی لەمەدینە بەپشتیوانی خوای گەورە .

**٦- خەبابی کوڕی ئەرەت ﷺ:**

خەبباب ڕەزای خوای لێبێت ئاسنگەر بوو لەمەککەدا، خوای گەورە ویستی هەر لەکاتێکی زووەوە ڕێگای ئیسلام بدۆزێتەوە، بۆیە ئەو موسڵمان بوو پێش ئەوەی بچێتە ماڵی ئەرقەم،[٢] یەکێکیش بوو لەو چەوساوانەی کەئەشکەنجەدران لەپێناو ئەوەی هەڵگەڕێنەوە لەئیسلام، تەنانەت بتپەرستەکان پشتیان دەبەستە سەر ئەو بەردە گەرمانەی ژێر هەتاوی مەککە بۆ ئەوەی بسوتێ[٣].

پێغەمبەری خواﷺ خەببابی خۆشدەویست وسەردانی دەکرد پاش موسڵمان بوونی، جاکاتێك سەر گەورەکەی بەوەی زانی، ئاسنێکی گەرم کرد وخستیە سەرسەری خەبباب، کەئەویش هاواری بردە لای پێغەمبەرﷺ کەفەرمووی: ((اللهم انصر خباباً)) خوایە خەبباب سەربخەیت، ئیتر ئەو سەر گەورەی خەببابە سەری دەهاتە ئێش وئازارو وەکو سەگ دەوەڕی، پێیان وت سەرت داخ بکە، ئەویش هاتەلای خەبباب وخەبباب ئاسنێکی گەرم دەکردو دەیخستە سەر سەری، لەڕاستیدا ئەوەیش پەندێکە بۆ کەسێك بیەوێت پەند وەربگرێت، کاتێکیش فشاری بتپەرستەکان زیادیکرد لەسەر موسڵمانە چەوساوەکان، خەبباب هاتەلای پێغەمبەرﷺو لەکاتێکدا لەپەنای کەعبەدا سەریخستبویە سەر پۆشاکێکی خۆی،

---

١- بڕوانە: مصعب بن عمير الداعية المجاهد ١٠٥_١٠٧ .

٢- سير اعلام النبلاء ٤٧٩/٢ .

٣- محنة المسلمين في العهد المكي ٩٥ .

پێـی وت: ئایـا داوای سـەرکەوتنمان بـۆ ناکـەیت، ئایـا دوعامـان بـۆ ناکـەیت، پێغەمبەرﷺ دانیشت وڕومەتی سور بوویەوەو فەرمووی: ((کان الرجل فـیمن قـبلکم یحفر له في الارض فیجعل فیه، فیجاء بالمنـشار فیوضـع علـی رأسـه فیـشق اثنـتین ومایـصدّه ذلـك عـن دینـه)) [1] واتـە: کەسـانی پـێش سـەردەمی ئێـوە چـاڵیان بـۆ هەڵدەکەندن لەزەوی ودەخرانە ناوی،ئینجا مشاریان دەهێناو دەیانخستە سەریان و دەکران بەدوولەتەوەو، ئـەوە وایلێنـەدەکردن وازلـە ئایینەکـەیان بهێـنن، بەشـانەی ئاسنیش شانە دەکران تاکو سەر ئێسقانیان وپاشگەز نەدەبوونـەوە، سوێن بـەخوا ئیـسلام سـەردەکەوێت و وایلێـدێت سـوار لەصـەنعاوە دەچـێتە حەزرەمـەوت، هـیچ ترسـێکی نابێـت جگـە لەترسـی خـواو، گـورگ لەسـەر مـەڕەکانی، بـەڵام ئێـوە پەلەدەکەن . [2]

مامۆستا (سلمان العودة) پەراوێزێکی جوانی لەسەر ئەم فەرموودەیـە نووسـیوە، دەڵێـت: سـبحان اللـه، چـی ڕوویـدا تـاکو پێغەمبـەرﷺ بـەو شـێوە ڕوومـەتی سووربێتەوەو لەڕاکشانەکەی ڕاست بێتەوە؟ بەم شێوە توندەیش لەگەڵ هـاوەڵانی قسەبکات وگلەییان لێ بکات لەسەر پەلەکردن .

ئایا بۆ ئەوە بوو کەداوای دوعایان لێ کرد؟

نەخێر، حاشا ئەو پێغەمبەرە بەسۆزو بەزەییە وابێت .

شێوازی داواکردنەکـە: ئایـا دوعامـان بـۆ ناکـەیت، ئایـا داوای سـەرکەوتنمان بـۆ ناکەیت؟ ئەوە دەگەیەنێت کەئەو قـسە لەدڵێکـەوە دەردەچـێت ئەشـکەنجەو بـەڵاو کارەسات هەرەسی پێهێناوە، بۆیە داوای ڕزگـاربوونی بەپەلـە دەکـەن و، وادەزانـن سـەرکەوتن دواکەوتووە،پێغەمبـەری خـواﷺدەیزانـی، کـە مەسـەلەکان بەسـراون بـەکات و هۆکـاری خۆیانـەوەو، تاقیکردنـەوە دەکەوێتـە پـێش سـەرکەوتنەوەو پێغەمبەران تاقیدەکرێنەوەو سەرئەنجام بۆ ئەوانە .

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ (یوسف:١١٠) .

---

١- هەمان سەرچاوە ٩٦ .

٢- البخاری، ك_المناقب، ب_علامات النبوة في الاسلام ورقمه ٣٦١٢ .

پێغەمبەرﷺ هەستی بەوە دەکرد کەهاوەڵەکانی بێزار بوونە لەوەی کەتووشیان دەبێت، چونکە کوفر زاڵبوو بەسەریانداو، هەندێکیشیان لەئەشکەنجەدا دەمردن لەوانەیە ئاسانیش نەبێ کەسێك_تەنها بەخوێندنەوەی دەقەکە_ ڕاستێتی ئەو حاڵە تێبگات کەبۆچی داوای دوعای سەرکەوتنیان لەپێغەمبەرﷺ، کرد هەروەها ڕاستی ئەو هەستانەی کەلەناو دەرونیاندا دەهەژا، مەگەر کەسێك بناڵێنێ بەدەست حاڵێك لەو حاڵانەی ئەوان پێوەی دەیانناڵان لەپێناو خوادا .

پێغەمبەری خواﷺ پەروەردەی دەکردن لەسەر:

أ– پێڕەویکردن لەپێغەمبەرە ڕابوردوەکان وشوێنکەوتوانیان، لەخۆڕاگری بەرانبەر ئازارو ئەشکەنجە لەپێناو خوادا وبەسەرهاتی لەو بارەوە بۆ باس دەکردن .

ب– پەیوەست بوون بەو خۆشیانەی کەخوای گەورە ئامادەی کردووە لەبەهەشتدا بۆ بڕواداره خۆڕاگرەکان، هەروەها هەڵنە خەڵەتان بەو شتانەی کەبەدەستی بێباوەڕانەوەیە .

ج– چاوتێبڕینی دواڕۆژێك کەخوای گەورە ئیسلامی تیادا سەردەخات، دوژمنانی ئیسلامی تیادا سەر شۆڕ دەکات .

مەسەلەیەکی گەورەی تریش هەیە ئەویش بریتی یە لەئەوەی پێغەمبەرﷺ نەخشەی دەکێشا وسوودی وەردەگرت لەهۆکارە هەستپێکراوە گشتیەکان، بۆ لابردنی ئازارو ستەم لەسەر شوێنکەوتوانی و، دامەزراندنی دەوڵەتی کۆشکار لەپێناو خوای گەورەداو، هەلێکیش بۆ هەموو موسڵمانێك برەخسێنێ کەخوای گەورە بپەرستێ وکۆسپەکانی بەردەم بانگەوازی ئیسلامی لابدات .[١]

خەبباب ڕەزای خوای لێبێت باسی هەندێکی لەو چەرمەسەریانە کردووە کەتووشیان دەبوو لەبتپەرستەکان وەکو مامەڵەکردنی ناشیرین و، پێشێل کردنی مافەکانیان تاکو بگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕی ودەڵێت: من ئاسنگەر بووم، قەرزێکم هەبوو بەلای عاصی کوڕی وائیلەوە، چوومە لای بۆ وەرگرتنەوەی، ئەویش وتی:

---

١– بڕوانە: الغرباء الاولون لا ١٤٥، ١٤٦ .

نەبەخوا ناتدەمەوە تاله ئایینی موحەممەد هەڵنەگەڕێیتەوە، وتم: سوێند بەخوا واز لەئیسلام ناهێنم تاکو نەمریت وزیندونەبیتەوە، وتی: ئەی ئەگەر مردم وزیندوو بوومەوەو هاتیتە لام وبینیت لەوێیش کوڕو ماڵم هەیە وقەرزەکەم بۆ گەڕاندیتەوە، خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾ (مريم:٧٧) . تاکو ئەم ئایەتە: ﴿وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾ (مريم:٨٠) .[١]

دەگێڕنەوە عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت پرسیاری کرد لەخەبباب دەربارەی ئەو ئەشکەنجانەی لەپێناو خوادا بەسەریدا هاتووە، ئەویش پشتی هەڵماڵی ودەرکەوت گەڕبووە، عومەر فەرمووی: هەرگیز شتی وام نەبینیوە، خەببابیش ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئاگرێکیان بۆ کردمەوەو، خستمیانە ناوی، پیاوێکیش قاچی خستە سەر سنگم، هیچ ئەو ئاگرەی نەکوژاندەوە بەزی گیانم نەبێت .[٢]

**٧ـ عەبدوڵلای کوڕی مەسعود:**

ڕێبازی پێغەمبەرﷺ لەمامەڵەکردنی خەڵکیدا ژیرانە بوو، بەنەرم ونیانی لەگەڵ سەرکردە و سەرۆك هۆزەکاندا مامەڵەی دەکرد، بە هەمان شێوە لەگەڵ منداڵان و گەنجاندا، باسی چاوپێکەوتنی خۆیمان بۆ دەکات لەگەڵ پێغەمبەرﷺو دەفەرمووێت: گەنجێك بووم شوانیم دەکرد بۆ عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت، جارێك پێغەمبەرﷺو ئەبوبەکر بەلامدا تێپەڕین وپێی فەرموم: شیرت لادەستدەکەوێت؟ وتم: بەڵێ، بەڵام من ئەم مەڕانەم پێی سپێردراوە، وتی: مەڕێکت هەیە بەران بەسەریدا نەپەڕیبێت؟ دەڵێ منیش مەڕێکم بۆی هێنا ودەستی هێنایە سەر گوانەکانیدا وشیریان لێ هاتەخوارەوە، لەقاپێکدا خۆی وئەبوبەکر لێیان خواردەوە، ئینجا بەگوانەکەی وت: بکشێرەوە، ئیتر گوانەکە کشایەوە، دەڵێت دوای ئەوە چوومە لای پێغەمبەرﷺو پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا، لەو قسانەم فێربکە، وتی:

---

١- مسند أحمد ٥/١١١ ورقمه ٢١٠٧٥ واسناده على شرط الشيخين .

٢- الروض الانف ٢/٩٨ .

ئەویش دەستی هێنا بەسەرمداو فەرمووی: ((خوای گەورە ڕەحمت لێبکات تۆ لاوێکی فێر کراوی)) .[١]

بەم شێوە دوو وشە بوون بەمایەی موسڵمان بوونی: یەکەمیان ئەوە بوو کەدەربارەی خۆی وتی من ئەو مەڕانەم پێ سپێردراوە، دووەمیشیان قسەکەی پێغەمبەر بوو ﷺ ((تۆ لاوێکی فێرکراوی)) ئەم وشە کاریگەری گەورەی بوو لەژیانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوددا، کەدواتر بوو بەیەکێك لەسەرانی زانست لەنێو هاوەڵاندا ڕەزای خوایان لێبێت، عەبدوڵلا چووە نێو کاروانی بڕوادارانەوەو، بوو بەیەکێك لەپێشکەوتووەکان، هەر لەسەرەتاوە موسڵمان بوو، هەر دوو کۆچەکەشی کردو، ئامادەی بەدروهەموو جەنگەکانی تر بوو، پەیوەست بوو بەپێغەمبەر ﷺو نەعلەکانی بۆ دادەنا .[٢]

یەکەمین کەس قورئانی بەدەنگی بەرز خوێندەوە:

سەرەڕای ئەوەی کەئیبنو مەسعود هاوپەیمان بوو، هۆزێکیشی نەبوو پارێزگاری لێبکات، سەرەڕای ئەوەی کەزۆر لاوازو قاچ باریك بوو، هەموو ئەوانە ڕێگرنەبوون لەپیشاندانی ئەو پەڕی ئازایەتی ودڵقایمی، چەندین هەڵوێستی جوانیشی هەبوو، لەوانە قورئان خوێندنی بەدەنگێکی بەرزو گەیاندنی بەگوێ ودڵە داخراوەکانیان،[٣] بەم شێوەیش ئەو بووە یەکەم کەس قورئانی بەئاشکرا خوێند پاش پێغەمبەرﷺ لەمەککە، ڕۆژێك هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کۆبوونەوەو وتیان: قورەیش هەرگیز گوێیان لەقورئان نەبووە بدرێتە گوێیاندا، ئایا کێ دەتوانێ ئەو کارە بکات، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود فەرمووی: من! وتیان: دەترسین خراپت بەسەر بهێنن، کەسێکمان دەوێت خاوەن عەشیرەت بێت، بەرگری لێبکرێت، وتی: وازم لێبهێنن، خوای گەورە بەرگریم لێدەکات: ئینجا ئیبنو مەسعود هات تاگەیشتە لای مەقام و قورەیش لەشوێنەکانی خۆیاندا بوون، عەبدوڵلا دەستی کرد بەخوێندنەوە (بسم الله

---

١- البداية والنهاية ٣/٣٢، سير اعلام النبلاء ١/٤٦٥ .

٢- بڕوانە: عبدالله بن مسعود، عبدالستار الشيخ ٤٣ .

٣- بڕوانە: عبدالله بن مسعود ٤٥ .

الـرحمن الـرحيم) ئینجـا دەنگـی بـەرزکردەوە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ (الرحمن:١_٢) سوڕەتەکەی خوێندەوەو، ئەوانیش تێڕادەمان ودەیانوت: ئەوە (ابن ام عبد) وتـی چـی؟ ئینجـا ووتیـان ئـەوە ئـەو شـتانە دەخوێنێتەوەکـە موحەممـەد هێنـاوێتی، ئـیتر ڕۆیشتنە لای لەڕوومـەتیان دەدا تاگەیـشتە ئەوەنـدەی کـەخوای گەورە ویستی، بەڵام دەم وچاوی بریندار بوو، هاوەڵان پێیان وت: لەمە دەترساین، ئـەویش وتـی: دوژمنـانی خـوا ئێـستا بەلامـەوە پـڕو پوچـترن، ئەگـەر پێتـان باشـە سبەینێ یش دەیدەم بەگوێیاندا، وتیان: نەوەڵڵا، بەسە ئـیتر، ئـەوەی کەلەسـەریان ئاستەم بوو دات بەگوێیاندا .[١]

ئەم کارەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بەرەنگارییەکی کردەیی بوو بۆ قـوڕەیش، کەخۆی ڕانەگرت بەرانبەر ئەو هەڵوێستە، چاو نەترسی عەبـدوڵڵا بەئاشـکرا تێبینـی دەکرێت سەرەڕای ئەو ئازارو ئەشکەنجەی کەتووشی بوو .[٢]

**٨- عوسمانی کوڕی مەزعون ﷺ:**

کاتێـك موسـڵمان بـوو، بـەنو جومـەحی عەشـیرەتی، ئومەییـەی کـوڕی خەلـەف لەهەموویان زۆرتر ئازاری دەدا، بۆیە لەدوای دەرچوونی بـۆ حەبەشـە هونراوەیـەکی نووسـی تیایـدا سەرزەنـشتی ئومەییـەی دەکـرد، [٣] عوسمـان ماوەیـەك لەحەبەشـە مایەوە، بەڵام دوایی گەڕایـەوە لەگـەڵ ئـەو موسـڵمانانەی کەگەڕانـەوە، نەشـیتوانی بـچێتە مەککـە بەداڵـدەدانی وەلیـدی کـوڕی مـوغیرە نـەبێت، بـۆ ماوەیـەکیش بـێ مەترسـی وبـەدڵنیایی لەپەنایـدا دەهـات ودەڕۆیـشت، بـەڵام کاتێـك هـاوەڵانی پێغەمبـەرﷺی بینـی چیان بەسـەر دێـت، خۆیـشی لـەچ حـاڵێکی باشدایە، خـۆی لەبەرچاوکەوت و، وتی: سوێند بەخوا ئەم هاتوچۆیەم لەپـەنای پیـاوێکی بتپرسـتدا بەبێ مەترسی و، هاوڕێکـانم ئـەم هـەموو کارەسـات ودەردەسـەریە دەبیـنن، کـەمو کورتیەکی گەورەیە لەدەرونمدا .[٤]

---

١- بڕوانە: ابن هشام ٣١٤/١، ٣١٥ اسد الغابة ٣٨٥/٣_٣٨٦ .

٢- بڕوانە: سير اعلام النبلاء ٢٦٠/١ .

٣- السيرة النبوية للذهبي لا ١١٢ .

٤- السيرة النبوية لابن هشام ١٢٠/٢ .

ئیتر چووە لای وەلیدی کوڕی موغیرە وپێی وت: ئەی ئەبو عەبدوشەمس، گەردەنت ئازاد بوو، دالدەدانەکەت بۆ دەگێڕمەوە، وتی: لەبەرچی ئەی برازا؟ دەترسم ئازار درابیت، وتم: نەخێر، بەلام من پەنای خوام پێ باشە و، پەنا بۆ کەسی تر نابەم، وتی: کەواتە بچۆ لەمزگەوتەکە بەئاشکرا پەنا دانەکەم بگێڕەوە، وەکو چۆن بەئاشکرا دالدەم دای، ئیتر پێکەوە بەڕێکەوتن بەرەو مزگەوتەکەو لەبەر چاو خەڵکیدا ئەوەی ڕاگەیاند، دواى ئەوە عوسمان ڕۆیشت بۆ کۆڕێك لەکۆڕەکانی قورەیش ولەگەڵیان دانیشت، لەبیدی کوڕی ئەبی ڕەبیعەی شاعیریش لەوێ بوو،[1] هۆنراوەی بۆیان دەخوێندەوەو دەیووت: (الا کل شئ ماخلا الله باطل) هەموو شتێك جگە لەخوا بەتاڵە، عوسمان وتی: ڕاستت کرد، ئینجا لەبید بەردەوام بوو لەهۆنراوەکەیدا ووتی: هەموو خۆشییەکیش هەر دەبێت تەواو بێت، عوسمان وتی: درۆت کرد، خۆشی بەهەشت هەرگیز تەواو نابێت، لەبید وتی: ئەی کۆمەڵانی قورەیش، لەکۆڕەکانتاندا کەس ئەزێت نەدەدرا، کەی ئەمەتان تیادا دروست بوو، یەکێك لەدانیشتوان وتی: ئەوە نادانێکە لەنادانەکانمان، لەئاییمنمان هەڵگەڕاونەتەوە، دلگران مەبە لێی، عوسمانیش بەتوندی بەرپەرچیدانەوە، یەکێك لەخەڵکەکە هەڵساو لەعوسمانی دا، لەو کاتە وەلیدی کوڕی موغیرە نزیك بوو سەیری دەکرد، وتی: ئەی برازا، دەتتوانی چاوت بەسەلامەتی بمایەتەوە، تۆ لەپەنایەکی قایم دابووی، عوسمان وتی، سوێند بەخوا حەز دەکەم چاوە ساغەکەشم لەبەرخوا وای لێبێت وجگە لەپەنای خوا لەپەنای کەسی تردا نەبم، ئینجا دووبارە وەلید پێشنیاری دالدەدانی عوسمانی کرد، بەلام ئەو هەر ڕەتیکردەوە.[2] ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئیمانی بەهێزی عوسمان و، چاوەڕوانکردنی بۆ چاکە وپاداشتی لای خوا، بۆیە کاتێك لەدونیا دەرچوو، ئوممو عەلای ئەنصاری لەخەوندا بینی چاوێکی هەیە دەگەڕێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ذلك عمله)) واتە: ئەوە کردەوە کانێتی.[3]

---

١- بروانە: طبقات الشعراء لابن سلام لا ٤٨، ٤٩ .

٢- السیر والمغازی لابن اسحاق لا ١٧٨_١٨٠ .

٣- البخاری ٤/٢٦٥ ورقمە ٧٠٠٤ .

ئاوەهـا دەبیـنین چـۆن ئـەو کۆمەڵـە لاوەی قـوڕەیش بـەپیری بانگـەوازی پێغەمبەرﷺ دەهاتن ودەوورەیان لێدەدا، سـەرەڕای هەڵوێستی توندوتیـژی بـاوك و خزمانیان بەرانبەریان، هەموو ئیمتیـازی خۆیانیـان لەدەست دا کـەپێش موسـڵمان بوونیـان هـەیان بـوو، لـەپێناو ئیـسلامدا، ئـازارو چەرمەسـەری زۆریشیان چەشت، ئەوەیش دەرئەنجامی کارتێکردنی ئیمانە لەدڵەکاندا .

ئەمەو، ئەشکەنجە تەنها کورتهەڵنەهاتبوویە سەر پیاواندا، بەڵکو ژنانیش پشکی زۆریان لەو ئەشـکەنجانە بەرکـەوت، بـەهۆی موسـڵمان بوونیـان، وەکـو سـومەییەی کـچی خـەییات و، فاتیمـەی کـچی خـەتتاب و، لەبیبـەی کـچی بـەنی موئـەممیل و، زننیرەی ڕومیەو، نەهدییەو کچەکەی و، ئوممو عوبەیس و، حەمامەی دایکی بیلال و زۆری تریش .[١]

## پێنجەم: هۆی شەڕنەکردن لەمەککەو، گرنگیدانی پێغەمبـەرﷺ بـەبنیاتنانی ناو خۆیی.

موسـڵمانان حــەزیان دەکــرد بــەرگری لــەخۆیان بکــەن، واشــدەردەکەوێت کەهەڵوێـستی ئاشـتیخوازانە هەنـدێکیانی تـوڕە دەکـرد، بەتایبـەتی گەنجـەکان، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف وهاوڕێکانی لەمەککە هاتنە لای پێغەمبەرﷺو وتیان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئێمـە لەکاتێکدا بتپەرسـت بـووین سـەربەرز بـووین، کاتێـك باوەڕمان هێنا هەست بەسـەرکزی دەکـەین، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ((إنـي اُمـرت بالعفو فلا تقاتلوا القوم)) [٢] واتە: من فەرمانم بەلێخۆشبوون پێکراوە بۆیـە شـەڕیان لەگەڵ مەکەن، لەم بارەوە مامۆستا سەیید قوتب ڕەحمەتی خـوای لێبێـت دەڵێـت: ئەو دەرەنجامەی لەم بارەوە پێی دەگـەین نـاتوانین دڵنیـابین لێـی، چـونکە نابێـت لەخۆمانەوە قسەبکەین وهۆکارو پاڵنـەر دەسنیشان بکەین.

---

١- بڕوانە: محنة المسلمين في العهد المكي لا ١١٦، ١١٧ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١٥٨/١ .

چونکە ئەرکی موسڵمان بەرانبەر هەرداوا لێکردنێك، یان حوکمێکی شەرعی، خۆ بەدەستدانەوەی ڕەهایە، خوای گەورە خۆی زاناو ئاگادارە، بەڵکو ئێمە کۆشش دەکەین کەهۆیەکان بزانین، ئەوە تەنها ئەگەرێکە، ئەگینا ڕاستییەکەی تەنها خوای گەورە، دەیزانێت وئێمەی لێئاگادار نەکردووەتەوە [١]، بەلاّم ئەمە_بەکورتی_ هەندێکە لەو هۆو باعیسانە کەپێی گەیشتووین:

١- لەوانەیە وازهێنان لەشەڕ لەمەککە، لەبەر ئەوە بێت کەقۆناغی مەککە تەرخان کراوە بۆ پەروەردەکردن وئامادەکاری، بۆ دەوروبەرو بارودۆخ و ئامانجی پەروەردەیی دیاریکراو، بۆ نموونە؛ پەروەردەکردنی موسڵمانان لەسەر ئارامگرتن و خۆڕاگرتن بەرانبەر هەندێ ستەم وناخۆشی کەتانەیبینن نازانن چۆنە، هەروەها بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لەکەسایەتی خۆیان، بەیەکەم کارتێکەر هەڵنەچن و، بەیەکەم وروژێنەر نەوروژێن و، ئالێرەشەوە میانە ڕەوی دروست دەبێت لە سروشتی و لە جووڵەیداو، شوێنکەوتووی ڕێنماییەکانی کۆمەڵگای نوێ دەبێت، بەفەرمانەکانی سەرکردایەتی تازە، واتە: هیچ هەڵس وکەوتێك ناکات بەفەرمان نەبێت باچەندەش پێچەوانەی خوو وکەسایەتی خۆی بن .

٢- لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت کەبانگەوازی ئاشتی خوازانە کاریگەرترەو باش تر ڕۆڵی خۆی دەبینی لەکۆمەڵگایەکی وەکو قورەیش دا، کەسیمای خۆ بەزلزانین وزلی پێوە دیاربوو، کەلەوانەیە_لەکاتی شەڕ کردن لەگەڵێدا_ملهوڕی زیاتر بکردایە و، شەڕی تۆڵە سەندن بەرپابوایە، وەکو شەڕەکانی بەسوس وداحیس وغەبرا، ئەو کاتەش ئیسلام دەبووە بانگەوازێکی تۆڵە سەندن، بیرۆکە سەرەکی یەکەی تیادا لەبیر دەچوو .

٣- لەوانەشە بەهۆی خۆپاراستن بێت لەشەڕێك کەهەموو ماڵێك لەماڵەکانی مەککە بگرێتەوە، چونکە دەسەلاتێکی ڕێکخراو نەبوو بۆ ئەشکەنجەدانی موسڵمانان، ڕێگە پێدانی جەنگیش ئەوەی دەگرتەوە کەشەڕ لەهەموو ماڵێکدا

---

١- الظلال ٢/٧١٤ .

بەرپابێت، ئەوساش دەوترا ئەوەیە ئیسلام!! بەڵکو ئەوە وترا تەنانەت لەو کاتەش کەئیسلام شەڕیشی نەدەکرد، چونکە پڕوپاگەندەی قورەیش لەکاتی وەرزە ئایینیەکاندا ئەوە بوو، کەموحەممەد جیاوازی دەخاتە نێوان باوك وکوڕ جگە لەوەی جیاوازی دەخاتە نێوان خۆی وعەشیرەتەکەی، ئەی چۆن دەبوو کەفەرمانی بکردایە کوڕ باوکی خۆی بکوژێ وخزمەتکار سەرگەورەی خۆی بکوژێ .

٤- لەوانەشە هۆی ئەوەبێت کەخوای گەورە زانیویێتی کەزۆرێك لەوانەی ئەمڕۆ ئەشکەنجەی موسڵمانان دەدەن و هەوڵ دەدەن لەئایینەکەیان لایاندەن هەر ئەوان سبەینێ دەبنە سەربازی دڵسۆزی ئیسلام، بەڵکو دەبنە سەرکردەکانی، وەکو عومەری کوڕی خەتتاب .

٥- لەلایەکی تریشەوە، ئەو جوامێری ومردایەتیەی لەناو عەرەبدا هەبوو، رادەپەڕی لەپێناو ستەم لێکراواندا، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ستەمە لەکەسێکی ناودارو بەخشندە بکرایە، بۆ نموونە ئیبنو ددوغوننە [1] ڕازی نەبوو کەواز لەئەبوبەکر بهێنێ_کەپیاوێکی بەخشندە بوو_کەکۆچ بکات ولەمەککە دەربچێت، لەو کارەدا سەر شۆڕییەکی دەبینی لەسەر عەرەبەکان! پێشنیاریشی کردەسەری کەدالدەی بدات وپارێزگاری لێبکات، دواین ئەو دیاردانەش پووچەڵکردنەوەی ڕێککەوتنامەی گەمارۆ دانەکە بوو بۆ بەنی هاشم لەدۆڵی ئەبو تالیب .

٦- ئەگەری ئەوەش هەیە کەبەهۆی کەمی ژمارەی موسڵمانانەوە بێت لەو سەردەمەو، گەمارۆدانیان لەمەککە، چونکە بانگەوازەکە هێشتا نەگەیشتبوویە ئەو پارچەکانی تری دورگەی عەرەب، یان گەیشتبوو بەڵام بەشێوەیەکی پچڕپچڕ، هۆزەکانیش هێشتا بێ لایەن بوون لەشەڕێکدا کەبەرپابووە لەنێو خودی ڕۆڵەکانی قورەیشدا، چونکە لەوانەیە ئەو شەڕە بەتەواو بوونی کۆمەڵی موسڵمانان کۆتایی پێبهاتایە باچەند ئەوەندەی خۆیشیان لەبتپەرستان بکوشتایە، ئیسلامیش جارێکی

---

١- ابن الدغنة: پیاوێکی جاهیلی بوو دالدەی ئەبو بەکری دابوو، کاتێك کەخزمانی دەریانکردوو ویستی کۆچ بکات بۆ حەبەشە بڕوانە: الاصابة ٢/٣٤٤ .

تر هەڵنەسایەتەوە، لەکاتێکدا ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کەببێتە پەیڕەوی ژیان و سیستمی دونیا ودواڕۆژ .

٧- هۆیەکی تر ئەوەیە کەپێویستی یەکی زۆر نەبوو بۆ فەرمانکردن بەشەڕو بەرپەرچدانەوەی ئەشکەنجەدان، چونکە مەسەلە سەرەکییەکە کەبانگەواز بوو بەدیهاتبوو، بوونیشی لەبوونی پێغەمبەردا بوو ﷺ و ئەویش لەژێر پارێزگاری شمشێرەکانی بەنی هاشم دا بوو، هەردەستێکیش درێژ بکرایەتەوە بۆ موحەممەدﷺ سەر ئەنجامی بڕین بوو، بۆیە کەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد ڕاگەیاندنی بانگەوازەکەی لێقەدەغە بکات، لەجێگا گشتی یەکانی قوڕەیشدا لەکەعبەو دەوروبەری، یان لەسەر تەپۆلکەی صەفا، یان لە دانیشتنە گشتی یەکان، کەسیش نەیدەتوانی زیندانی بکات یان بیکوژێت یان قسەیەکی دیاریکراوی بسەپێنێتە سەر .

ئەم هەموو ڕەچاوکردنە_وەکو بۆی دەچین_ هەندێك بوو لەویستی خوای گەورە لەسەر فەرمانکردن بەموسڵمانان لەمەسەلەی شەڕنەکردنداو،ئەنجامدانی نوێژکردن و زەکاتدان، بۆ ئەوەی پەروەردەبوون وئامادەبوونیان بگات بە دەرئەنجامی خۆی، هەروەها بۆ ئەوەی موسڵمانان چاوەڕوانی فەرمانی سەرکردایەتی بن لەکاتی دیاریکراودا، ئینجا بۆ ئەوەی خۆیان بەجارێك لەمەسەلەکە دەربهێنن وهەمووی هەواڵەی خوای گەورە بکەن .[1]

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەقورئانەوە فێری فیقهی بەرژەوەندی وخراپیەکان بوون، هەروەها چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو فیقهەدا لەڕێگەی ڕووداوەکانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (الانعام: ١٠٨).

---

١- الولاء والبراء، محمد القحطانی، چەند خاڵێکی کورت کردووەتەوە لە الظلال ١٩٦٧_ ١٧١ هەروەها لە فی ظلال القران ٧١٤/٢_٧١٥ ، وله معالم في الطريق ٦٩_٧١ .

هاوەڵانی فێری ئەوە بوون کەبەرژەوەندی ئەگەر بوو بەمایەی خراپیەکی گەورەتر پێویستە وازی لێ بهێنێت، ئەمەش پەروەردەیەکی ڕەوشتی و بەرزبوونەوەیەکی ئیمانییە، هەروەها خۆ بەدوور گرتنە لەئەو نەفامانەی بێ ئاگان لەڕاستیەکان ودڵەکانیان خاڵیە لەناسینی خواو مەزن ڕاگرتنی، زانایانیش باسی ئەوەیان کردووە کە حوکمی شەرعی لەناو موسڵماناندا هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە، هەرکاتێك بێ باوەڕ بەهێزبێت وملکەچی دەسەڵاتی ئیسلام وموسڵمانان نەبێت، مەترسیش هەبوو کەجنێوبدات بەئیسلام، یان پێغەمبەر، یان خوای گەورە، لەو حالەتەدا ڕەوانییە بۆ هیچ موسڵمانێك جنێو بدات بەخاچەکانیان یان ئایین و کڵێساکانیان، چونکە ئەو کارە وادێتەوە کەیەکسانە بەهاندانی تاوان ....[1]

ئەو کەسەیش دیقەتی قۆناغی مەککە دەدات کەسیانزە ساڵ بووە، بۆی دەردەکەوێت کەهەمووی لەپەروەردەو ئامادەکردندا بووە، هەروەها جێگیرکردن بووە بۆ چەمکەکانی (لاالەالاالله)، هەروەها ی بۆی دەردەکەوێت ئەم بیروباوەڕە چەند پەلە نەکردنی مەبەستە چونکە بیروباوەڕ پێویستی هەیە بەچاودێری وبایەخ پێدانی بەردەوام، بەشێوەیەك کەپەلەپەل وهەڵەشەیی هیچ پشکێکی تیادا نەبێت، جێگای خۆشێتی بانگخوازەکان بەرانبەر ئەم پەروەردەکردنەی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی وپەندو وانەی لێوەربگرن، چونکە تەنها پیاوێك کەبیروباوەڕ لەدڵیاندا چەسپابێت دەتوانن ڕووبەڕووی جاهیلیەت ببنەوە، لەکۆن ونوێ وداهاتوودا...[2]

پێغەمبەرﷺ فەرمانی بەهاوەڵانی دەکرد کەخۆیان لەسەر ئارامگرتن ڕابهێنن و، بەبەرچاوی خۆیەوە پەروەردەی دەکردن و، ئاڕاستەی دەکردن ڕووەو پتەوکردنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ خوای گەورە ونزیکبوونەوە لێی بەپەرستنی، ئەم ئایەتانەش لەسەردەمی مەککەدا دادەبەزی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ۝٢ نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ۝٣ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا﴾ (المزمل:١_٤).

---

١- بڕوانە: التفسير المنير للزحيلي ٧/٣٢٥ .

٢- بڕوانە: الولاء والبراء .

سورەتی (المزمل) ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد کەشەو نوێژبکەن و، هەمیشە یادی خوا بکەن و، پشت بەخوا ببەستن لە هەموو کاروبارەکانیاندا و، ئارامبگرن و لەگەڵ ئەوەشدا دابڕان ئەنجام بدەن لەگەڵیاندا بەشێوەیەکی جوان و، لەپاش کردەوەی چاکەیش داوای لێخۆش بوون بکەن.

ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی(المزمل) داوای دەکرد لەپێغەمبەر ﷺ کەبەشێك لەشەو تەرخان بکات بۆ شەو نوێژ، خوای گەورەیش هەڵبژاردنی بەپێغەمبەرەکەی دابوو لەنێوان ئەوەی نیوەی شەوەکە تەرخان بکات بۆ شەو نوێژ، یان زیاتری یان کەمتری، بۆ پێغەمبەری خواﷺ وهاوەڵانی نزیکەی ساڵێك بەو شێوە نوێژیان دەکرد تاکو پێیان ئاوسا، دوای ئەوە ئاسانکردن دابەزی وخوای گەورە بەکۆشش و دڵسۆزی ئەوانی زانی کەچەند پەرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، لەبەر ئەوەش سۆزی بەسەردا ڕشاندن وفەرمووی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ ۙ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (المزمل:٢٠).

تاقیکردنەوەکەیان لەڕاوەستانیاندا بوو لەدژی خەوتن وئەو شتانەی خوویان پێوە گرتبوو، بۆ ئەوەی خۆیان لەسەر جیهاد کردنی دەرونیاندا ڕابهێنن و رزگاریشیان ببێت لەملکەچی بۆ ئارەزووەکانیان، وەکو پێشەکێك بۆ وەرگرتنی جڵەوی سەرکردایەتی وئاڕاستە کردن لەجیهاندا، چونکە پێویست بوو ئەوان لەڕووی ڕوحیەوە بەتەواوی ئامادەبن، خوای گەورەیش ئەوانی هەڵبژاردووە وڕاسپاردەی پێیان داوە لەسەر بانگەوازەکەی، هەروەها ئەوانی کردووە بەشایەت لەسەر خەڵکی، دەیان لەباوەڕدارانی ئەو قۆناغە مێژووییە ئەرکی گەورەیان لەپێشدا بوو بۆ بانگکردنی خەڵکی بۆ یەکتاپەرستی و، رزگارکردنیان لەشیرك، ئەوەیش ئەرکێکی

مەزنە ئەوانە دەتوانن پێی هەڵسن کە: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾ (السجدة:١٦).

خوای گەورەیش باسی شەو نوێژو خوێندنەوەی قورئانی تیادا کردووە و فەرموویەتی: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ (المزمل:٦). ئەوە کاریگەرترە لەسەر دەروون لەکاتی بێدەنگی شەوداو، کپی خەڵکدا، چونکە لەوکاتە هیچ ئیش و کارێك نامێنێت وئەو کەسە یەکلادەبێتەوە بۆ پاڕانەوەو یادی خوا، دوور لەسەر قاڵییەکانی دونیا، بەم شێوەیش بەتەواوی ئامادە دەبن بۆ گەیاندنی وەحی خوا: ﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ (المزمل:٥). مەبەستیش لە(القول الثقيل) قورئانە، شوێنەواری ئەم پەروەردەیە لەسەر موسڵمانان لەو قۆناغەدا بەتەواوی دەرکەوت، لەتواناياندا بەرانبەر هەڵگرتنی ئەرکەکانی جیهادو، دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لەشاری مەدینە، هەروەها لەدڵسۆزی بێ سنوریان بۆ ئیسلام و، فیداکارییان لەپێناو گەیاندنی ئیسلام بۆ هەموو جیهان[1].

پێغەمبەری خواﷺ گرنگی دابوو بەبەرەی ناو خۆیی، سوریش بوو لەسەر ئامادەکردنی هاوەڵانی بەبیروباوەڕی پتەو کەبەرانبەر هیچ هێزێك نابەزێت، ئەوەیش مایەی بەخشینی ورەیەکی بەرز بوو سەبارەت بەبەرگریکردن وخۆڕاگرتن لەبەردەم سزاو ئەشکەنجە لەپێناو بانگەوازی ئیسلامی، کۆمەڵی یەکەم بوو بەیەکەیەکی یەکگرتوو، هێرشە دەروونییەکانی دوژمن کاری تێنەدەکردن، چونکە موسڵمانان پەیوەندی برایەتی لەنێوانیاندا بەهێز بوو، فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کاری خۆی دەکرد لەدڵی هاوەڵاندا، کە تیایدا هانی موسڵمانانی دەدا لەسەر برایەتی و، یەکگرتن و، بەهانای یەکچوون و، هەموو ئەوانەش تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بوو، ئەم بنەمایانەش نهێنی بەردەوامی برایەتی ئیسلامی و، یەکگرتوویی کۆمەڵگای ئیسلامییە[2]، هەروەها پێغەمبەری خواﷺ بۆی ڕوونکردنەوە لەڕێگەی

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/١٦٠.

٢- بڕوانە: الحرب النفسية ضد الاسلام، د.عبدالوهاب كحيل لا ١٢٨.

فەرموودەیەکی قودسیەوە کە: ((المتحابون في جلالي، لهم منابر من نور يغبطهم النبيون والشهداء)).[١] واتە: ئەوانەی لەپێناوی خوادا یەکتریان خۆشدەوێت، مینبەریان بۆ دادەنرێت لەڕووناکی دروستکراوە، پێغەمبەران وشەهیدان ئاواتیان پێدەخوازن.

بەم شێوەیش برایەتی ڕاستەقینە بوو بەپێوەری کردارەکان، خۆشەویستیش لەپێناو خوادا بوو بەچاکترین کردەوە وبەرزترین پلەوپایەی بۆ دانرا لەلای خوای گەورەو، پێغەمبەریشﷺ موسڵمانانی ئاگادار کردەوە لەوەی کەمتەرخەمی پیشان بدەن لەم پەیوەندییەدا، هەروەها بنچینەکیشی دانا بۆ پاراستنی، کاتێك پێی فەرموون: خۆتان بەدوور بگرن لەکینەو چاوتێبڕینی ماڵی یەك وپشت لەیەکتر هەڵکردن و، بەڵکو ببنە بەندە بۆ خواو برا بۆ یەکتر .[٢]

لەمەسەلەی پەیوەندی ناوخۆیی کۆمەڵگاو یەکخستنی بەرەکانی بۆ ئەوەی بەهێز بن لەدژی جەنگی دەروونی ئاڕاستە کراو بۆیان، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بردە بەریەکسانی لەنێوان کەسەکانی نێو ئەو بەرانەو ئازادی پێدانیان، چونکە ئەوان ناچنە ناو ئەو کۆمەڵگایە بەئازادی نەبێت، ئینجا ئەوان ئازادی دەربڕین و ڕاوێژکردنیان هەبوو، پێغەمبەرﷺ بڕیاری یەکسانی دا لەنێوان هەموو خەڵکدا، فەرمانڕەواو فەرمانپێکراو، دەوڵەمەندو هەژارو، لەنێوان هەموو چینەکاندا، لەڕاستیشدا ئەم بنەمایە کاریگەری گەورەی هەبوو لەدەروونی شوێنکەوتووانداو، وایلێکردن یەکتریان خۆشبوێت ویەکێتی یان لەنێواندا هەبێت و، بەرگریشی لێبکەن بە هەموو توانایەکیانەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دانی نەناوە بەهیچ جیاوازییەك لەنێوان ئادەمیزادەکاندا بەهۆی نەژاد یان پلەو پایەیان هۆز، یان ڕەنگ یان هەر شتێکی تر. جیاوازیش لەنەژداو ڕەنگ وڕەگەزەکاندا نابێتە مایەی جیاوازی لەماف و ئەرکەکان، یان شێوەکانی خواپەرستن، چونکە هەموان بەرانبەر خوای گەورە یەکسانن، کاتێکیش سەرانی مەککە داوایان کرد لەپێغەمبەرﷺ کۆڕێکیان هەبێت

---

١- اخرجه الترمذي وصححه، كتاب الزهد ٤/٥١٥ رقم ٢٣٩٠ .

٢- البخاري، كتاب الادب ٧/٩٩_رقم ٦٠٧٦ .

جیاواز لەکۆڕی لاوازو کۆیلەکان، بۆ ئەوەی پێکەوە دانەنیشن، پێغەمبەری خواﷺ ڕوونی کردەوە کەهەموان یەکسانن لەوەرگرتنی وەحی وهیدایەت بێباوەڕانی مەککە لەو سەردەمەدا ڕازی نەدەبوون دانیشن لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا کەبەلاوازو سەرشۆڕیانیان دادەنا لەشوێنکەوتوانی پێغەمبەرﷺ، بۆیە قورئان لەم بارەوە دابەزی: ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴾ (الكهف:٢٨، ٢٩).

بەڵکو پێغەمبەرﷺ کاتێك ڕووی وەرگێڕا لەئیبنو ئوممی مەکتوم چونکە سەرقاڵی گفتوگۆ کردن بوو لەگەڵ سەرانی قورەیش، خوای گەورە بەتوندی گلەیی لێکرد .

یەکێك لەئەو هۆکارانەش پێغەمبەرﷺ کۆمەڵگای پێڕێکخست وبەرەی ناوخۆیی پێی پتەو کردن ئەوە بوو کە بانگەوازی کرد بۆ هاوبەرپرسیارێتی کردەیی و واتایی لەنێوان موسڵماناندا، بۆ ئەوەی هێزدار یارمەتی بێ هێز بدات و، دەوڵەمەند مێهرەبان بێت لەگەڵ هەژارداو، پێغەمبەرﷺ کەلێنێکی بەجێنەهێشت جەنگی دەروونی بتوانێت لێیەوە بێتە نێو ڕیزی موسڵمانانەوە، کۆمەڵی یەکەم تاوێرێکی ڕەق وگەورەی پێهات کەهەوڵ وپیلانی سەرکردەکانی قورەیشی لەسەر تێکشکا.[1]

## شەشەم: کاریگەری قورئانی پیرۆز لەبەرزکردنەوەی ورەی هاوەڵاندا.

قورئانی پیرۆز کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەبەرزکردنەوەی ورەی ئیمانداران لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە هەڕەشە کردن لەبێباوەڕان بەسزای سەخت، ئەوەیش ئەوپەڕی سەختی دروست دەکرد لەسەر دەرونیان، بەرگریکردنی قورئان

---

١- بڕوانە: الحرب النفسية ضد الاسلام لا ١٢٥_١٤٠ .

لەهاوەڵان لەدوو خاڵدا خۆی دەبینینەوە:

یەکەم: هاندانی پێغەمبەرﷺ بۆ چاودێری کردنیان و، لەگەڵ دانیشتنیان و، پێشوازیکردنیان و، گلەیی کرد لەسەر هەندێ هەڵوێست کەڕووی لەهاوەڵێك وەرگێڕاوە بەهۆی کاروباری بانگەوازەوە .

دووەم: ئاسانکردنەوە لەسەر هاوەڵان لەڕێگەی نموونە هێنانەوەو باسکردنی بەسەرهاتەکان بۆیان، کەتیایدا باسی پێغەمبەران ونەتەوەکانی ترو، ئەو دەردە سەرییانەی لەمیللەتەکانیان بینیویانە، بۆ ئەوەی ئەوانیش خۆڕاگربن، هەروەها لەڕێگەی ستایشکردنی هەندێك لەکردارەکان، ئینجا بەبەڵێن پێدانی پاداشت و بەهەشت بۆیان، هەروەها بەتانەلێدان لەدوژمنەکانیان کەئازاریان دەدان .[1]

سەبارەت بەخاڵی یەکەم، پێغەمبەرﷺ لەمزگەوتدا دادەنیشت لەگەڵ ئەو هەژارو چەوساوانەی نێو هاوەڵان، وەکو: خەبباب وعەممارو، ئیبنو فوکەیهەی یەساری مەولای صەفوانی کوڕی ئومەییەو، صوهەیب وهاوشێوەکانیان، قوڕەیشەکان گاڵتە جاڕییان دەکرد بەوانەو دەیانوت: ئائەمانەن خوا لەنێوان ئێمەدا ڕێنمونیانی کردوە بۆ ڕێگەی ڕاست وڕەوا، ئەگەر ئەو شتەی موحەممەد هێناویەتی باش بووایە هەرگیز ئەمانە پێش ئێمە نەدەکەوتن، نەخوایش ئەوانی تایبەت دەکرد بەو شتەوە.[2]

خوای گەورەیش بەرپەرچی گاڵتەجاڕی ئەوانی داوەتەوەو ڕوونیکردوەتەوە کەڕەزامەندی خوای گەورە لەسەر کەسانێك پەیوەست نییە بەپلەو پایەیانەوە، یان ڕێزیان لەنێوان خەڵکیدا، هەروەها پێغەمبەریشﷺ جەختی دەکردەوە لەسەر ئەم چەمکە..خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا جَآءَكَ

١- الحرب النفسية ضد الاسلام لا ٢٦٩ .

٢- هەمان سەرچاوە لا. ٢٧، ٢٧١ .

ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾(الانعام:٥٢_٥٤). بەم شێوەيش خوای گەورە بۆ پێغەمبەرﷺ پلەو پايەی هاوەڵانی ڕوونكردەوە، كەبێباوەڕان دەركی پێناكەن، بەڵكو خوای گەورە پێغەمبەر وريادەكاتەوە لەوەی كەئەوان دوور بخاتەوە لەخۆی، هەروەها فەرمانيشی پێدەكات بەباشترين شێوە سڵاويان لێبكات، مژدەيان پێبدات كەخوای گەورە بەڵێنی لێخۆشبوونی پێداون لەدوای تەوبەكردنيان ورەی ئەوانە دەبێت چۆن بێت؟، چۆن ئيتر هەست بەهيچ ئازارێك دەكەن كەتوشيان بێت، بەڵكو پێخۆشحاليش دەبن بەو ئەشكەنجانەی كە ئيمانەكەيان پێی گەياندوون.[١]

ئينجا دەبينين خوای گەورە گلەيی دەكات لەپێغەمبەرەكەی لەچەند ئايەتێكدا، كە تا ڕۆژی قيامەت هەر دەخوێنرێتەوە، ئەم گلەييە دەربارەی پياوێكی هەژاری نابينا بوو لەهاوەڵان، پێغەمبەری خواﷺ ڕووی لێوەرگێڕا يەكجار وەڵامی نەدايەوە، ئەويش بەهۆی سەرقاڵبوونی لەگەڵ هەندێك لەسەرانی قوڕەيش بۆ بانگێشكردنيان بۆ ئيسلام،[٢] خوای گەورە ئەم ئايەتانەی دابەزاند: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ﴾(عبس:١_١٠).

هيچ بوارێك نييە بۆ ئيمتياز لەبانگەوازی ئيسلامدا، بەهۆی نەژادو ماڵ و كەسايەتی دياری ناو كۆمەڵ، چونكە ئەم ئايينە هاتووە بۆ ڕيشەداكوتانی تێڕوانين بۆ مرۆڤ و، دەرخستنی يەكبوونی بنچينە، ئاڵێرەشەوە دەتوانين لە توندی گلەيی خوای گەورە لەپێغەمبەرەكەی بگەين كاتێك كەبايەخی زۆری ئاراستەی ئوبەيی كوڕی خەلەف كرد، هاوكات ڕوويشی لەئيبنو ئوممی مەكتووم وەرگێڕا، چونكە ئەو

---

١- بڕوانە: الحرب النفسية ضد الاسلام لا ٢٧٠، ٢٧١ .

٢-هەمان سەرچاوە ٢٧ .

هاوەڵە نابینایە لەتەرازووی هەقدا لەبلیونە های وەکو ئوبەی چاکترە لەلای خوا.[1]

ئەم بەسەرهاتە پەندو ئامۆژگاری تیایدا بوو، موسڵمانانی سەردەمی یەکەم و ئەوانەش دوای خۆیان هاتن سوودیان لێوەرگرت، گرنگترینی ئەو پەندانەش پێشوازیکردنە لەئیماندارانن، گەیاندنی پێویستە لەسەر بانگخوازان، بەلاَم بەرپرسنین لەوەی ئەو کەسە موسڵمان بێت یان نەبێت، بەسەرهاتی ئەم نابینایە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ، چونکە ئەگەر پێغەمبەرمانﷺ ڕەوانەکراوی خوا نەبوایە، ئەم ڕووداوەی دەشاردەوە، خەڵکی ئاگادار نەدەکردەوە، چونکە جۆرێك لەسەرزەنشتکردنی تێدایە بۆ پێغەمبەرﷺ، خۆ ئەگەر ئەو هیچ شتێکی لەوەحی بشاردایەتەوە ئەم ئایەتانەی دەشاردەوە، یان ئایەتەکانی بەسەرهاتی زەیدو زەینەبی کچی جەحش[2]، بۆیە لەسەر بانگخوازانە کەهەمیشە خەڵکی چاك پێشخەن.[3]

سەبارەت بەخاڵی دووەمیش، گرنگترین هۆکارەکانی ئاسانکردنەوە لەسەر هاوەلاَن ئەوە بوو کەقورئانی پیرۆز ڕوونیدەکردەوە بۆیان کەئەوەی بەسەریاندا دێت، بەزیادەوە بەسەر پێغەمبەراندا هاتووە، وەکو نوح وئیبراهیم وموسا وعیسا درودوسلاوی خوایان لەسەربێت، بۆ جێگیرکردنی موسڵمانان وگیانی فیداکاری و ئارامگرتن لەپێناوی ئیسلامدا، هەروەها پێشەنگی چاکی بۆ دیاری دەکردن، کەلەسەردەمانی پێش ئیسلام باشترین هۆکار بووە لەگۆڕەپانی ڕاگەیاندن و پەروەردەو فێرکردن وپەیوەندی گشتی، چونکە سەرگوزەشتەکانی قورئان پەندو دانایی ونموونەی زۆریان تیادایە.

یەکێکی تریش لەهۆکارەکانی قورئان لەئاسانکردنەوە لەسەر هاوەلاَنەو بەرگریکردن لێیان، ستایشکردنی خۆیان وکردەوەکانیان، خەڵکی تاکو ڕۆژی قیامەت دەیانخوێننەوە، بۆ نموونە ئازادکردنی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت بۆ حەوت لەهاوەلاَن بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکات لەئازارو ئەشکەنجە، لەهەمان کاتدا

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/١٦٧ لەگەڵ دەستکاریکردنی ژمارەکە لەسەدانەوە بۆ بلیونەها.

٢- تفسير ابن عطية ١٥/٣١٦ القاسمي ١٧/٥٤.

٣- بڕوانە: المستفاد من قصص القرآن د.عبدالكريم زيدان ٢/٨٩.

قورئان تانەدەدا لە ئومەییەی کوڕی خەلەف کەئەشکەنجەی بیلالی کوڕی ڕەباحی دەدا، قورئان بەپێڕەوی ڕەوشتی خۆی، بنچینەکانی پاداشت وسزای پێشکەش کرد، ئینجا هانی بڕواداراني داو، هەڕەشەشی لەسەر پێچیکاران کرد، ئەم تانەلێدانە چەمکێکی قووڵی لەخۆگرت، چونکە ڕێگای بۆ هاوەڵان ڕۆشن کردەوە، خەم وپەژارەیەکیش بوو لەدڵی بێباوەڕو ڕاڕاکاندا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى ﴿١٥﴾ الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى ﴿١٧﴾ الَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰ ﴿١٩﴾ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ﴾ (الليل:الايات ١٤_٢١) .

هەروەها قورئان باسی جێگیربوونی نێردەی گاورەکانی کردوە لەسەر ئیسلام، سەرەڕای گاڵتە جاڕی بێباوەڕەکان وهەوڵدانیان بۆ لەخشتە بردنیان، بۆیە ئەم ئایەتانەیان لەسەر دابەزی وەکو هەندێك لەمێژوو نووسەکان دەڵێن [١]، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ (القصص:٥٢_٥٤) .

ئینجا ئایەتەکان لەدوای ئەوە مژدەی پاداشتی زۆری بەهاوەڵان دەداو، هەروەها خۆشگوزەرانی نەبڕاوە لەبەهەشتدا، بەرانبەر بەئارامگرتن وخۆڕاگرییان بەرانبەر ئازارو، وەکو هاندانێکیش لەسەر بەردەوام بوون لەسەر ڕێگای بانگەواز، بێ ئەوەی هیچ ئاوڕێك بدەنە لەوەی کەدەیبیسن ودەیبینن، سەرکەوتن وزاڵبوون لەکۆتاییدا هەر بۆ ئەوانە، لەهەمان کاتیشدا قورئان سەرئەنجامی دوژمنانیانی ئاشکرا دەکرد بۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابن كثير ٢/٤ .

سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ (غافر:٥١_٥٢) .

بەهەمان شێوە چاکەو فەزڵی دەستگردنی بەقورئانەوە بۆ باسدەکردن، وەکو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرۡجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ (فاطر:٢٩، ٣٠).

هەروەها باسی چاکەو فەزڵی سووربوونی کردووە لەسەر خواپەرستن، وێڕای هەموو ئەو ئازارو ئەشکەنجەی بەسەریان دێت و، پاداشتی ئارامگرتنیش لەسەر ئەو نارەحەتیانە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٩﴾ قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٌۗ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٍ﴾ (الزمر:٩، ١٠).

هەربۆیە هەڵمەتەکانی قوڕەیش وهۆکارەکانیان لەئەشکەنجەداندا، کاریگەری نەکردە دڵی هاوەڵان، بەبۆنەی بەرنامەی قورئان وشێوازە ژیرانەکانی پێغەمبەرﷺ، هەموو شێوازەکانی بتپەرستەکانیش لەدژایەتی پێغەمبەرﷺ وهاوەڵانی و بیروباوەڕی ڕاستەقینە تێکشکان و بەرگریان نەگرت .

## حەوتەم: شێوازی دانوستان.

بتپەرستەکان ڕۆژێك کۆبوونەوەو وتیان: شارەزاترین کەس لەجادوو و، قەشەیەتی و، هۆنراوە، بنێرن بۆلای ئەو پیاوەی کەکۆمەڵانی پەرتەوازە کردووەو، کارەکانمانی تێکداوەو، ڕەخنە لەئایینمان دەگرێت، باقسەی لەگەڵ بکات وبزانێت مەبەستی چییە؟ وتیان کەس لەعوتبەی کوڕی ڕەبیعە چاکتر نییە بۆ ئەو مەبەستە، ئەویش چووە لای پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی موحەممەد تۆ باشی یان عەبدولموتتەلیب؟ پێغەمبەرﷺ بێ دەنگ بوو، وتی: ئەگەر دەڵێی ئەوان لەتۆ

باشتر بوون، ئەوانە ئەو خودایانەیان دەپەرست کەتۆ بەخراپی دەزانیت، ئەگەریش دەڵێی من لەئەوان باشترم، بدویٚ تاگوێت لیٚ بگرین، سوێند بەخوا ئێمە کەسمان لەتۆ شوم تر نەبینیوە لەسەر خۆمان، کۆمەڵمانت پەرتەوازەکرد، کاروبارمانت تێکداوەو ئاییمان بەپڕوپوچ دەزانیت، ئابڕوویشمانت بردووە لەناو هۆزەکانی عەرەبدا تاکو ئەوەیان لەناو بڵاوبووەتەوە کەقورەیش جادوگەری تیادایە، قورەیش قەشەی تیاپەیدابووەو، سوێند بەخوا چاوەڕوانی هاوارێکین لەچەشنی ژنی باردار، هەموومان لەدژی یەکتر هەڵسین بەشمشێر تا لەناو دەچین .

کابرا، ئەگەر پێویستیت بەماڵ وپارەیە؛ ئەوەندەت بۆ کۆدەکەینەوە لەماڵەکانمان تادەتکەینە دەوڵەمەندترین کەس لەقورەیشدا، ئەگەریش مەسەلە ئارەزووی ئافرەتە بەمەیلی خۆت هەڵبژێرە ودەئافرەتت لیٚ مارە دەکەین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((فرغت؟)) واتە: قسەکانت تەواو کرد؟ ووتی: بەڵیٚ! پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ﴾ (فصلت:١_٣). تاکو گەیشتە: ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ (فصلت:١٣) . عوتبە وتی: بابەس بێت! لەمانە زیاترت پیٚ نییە؟ فەرمووی: نەخێر، ئەویش گەڕایەوە لای قورەیش وپێیان وت: چیت کرد؟ ووتی: هەموو شتێك کە بەخەیاڵتاندا دێت وتم لەگەڵیدا، وتیان: ئەی وەڵامتی دایەوە؟ وتی: بەڵیٚ،[1] لەڕیوایەتی ئیبنو ئیسحاقدا هاتووە: کاتێك گەڕایەوە لایان وتیان: چیت کرد ئەی ئەبەلوەلید؟ وتی: گوێم لەوتەیەك بوو هەرگیز وتەی لەوشێوەم نەبیستووە، سوێند بەخوا هۆنراوە نییە، جادوو نییە، قەشەیەتی نییە، ئەی کۆمەڵانی قورەیش، بیخەنە سەر ئەستۆی من و، واز لەم پیاوە بهێنن باکاری خۆی بکات ولێی دوورکەونەوە، سوێند بەخوا ئەو قسانەی من لێم بیست هەواڵێکی مەزنی لێدەکەوێتەوە، ئەگەر هۆزەکانی تر شتێك بەسەریدا بهێنن ئەوا ئێوە رزگارتان دەبێت، ئەگەریش سەرکەوێتە سەر هۆزەکانی عەرەبدا، ئەوا موڵك وسەر بەرزی ئەو بۆ ئێوەشە، ئێوەیش دڵشادترین کەس دەبن

---

١- البداية والنهاية لابن كثير ٣/٦٨، ٦٩ .

بەئەو، وتیان: سوێند بەخوا: بەزمانی تۆیشی تووش کرد، وتی: ئەمە بۆچوونی منەو چیتان پێ باشە وابکەن .[١]

**وانەو پەندو سوودەکان :**

أ- پێغەمبەرﷺ نەچووە ناو جەنگێکی لاوەکییەوە، سەبارەت بەچاکێتی خۆی لەسەر باوك وباپیری، یان چاکێتی ئەوان لەسەر خۆی، ئەگەر بچوبایەتە نێو ئەو باسانەوە ئەوە مەسەلەکە دەبڕایەوە بێ ئەوەی عوتبە هیچی لێ ببیسێ.

ب- بەهەمان شێوە نەچووە نێو جەنگێکی لاوەکییەوە سەبارەت بەئەو پێشنیارانەی کرایە سەری، یان تووڕە بوایە بەرانبەر ئەو تۆمەتبار کردنانە، بەڵکو وازی لەهەموو ئەوشتانە هێنا لەپێناو ئامانجێکی دوورتر، بواریشی ڕەخساند بۆ عوتبە هەرچی پێیەباسی بکات، تەنانەت ئەوەندە ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ بەرز، بوو فەرمووی: ئایا قسەکانت تەواو کرد ئەی باوکی وەلید؟ وتی: بەڵێ .[٢]

ج- وەڵامەکەی پێغەمبەرﷺ یەکلا کەرەوە بوو، هەڵبژاردنی بۆ ئەم چەند ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دانایی وژیری پێغەمبەرﷺ ، ئایەتەکان چەند مەسەلەیەکی سەرەکیان باسکرد، لەوانە: ئەم قورئانە لەلای خواوە دابەزیوە، ئاشکرا کردنی هەڵوێستی بێباوەڕان ودورەپەرێزییان، باسکردنی ئەرکی پێغەمبەرﷺ وئەوەیش کەئادەمیزادە، باسکردنی ئەوەی کەیەك پەروەردگار هەیە ئەویش (اللە)یەو، دروستکەری ئاسمانەکان و زەوییە، باسکردنی هەڵوێستی نەتەوەکانی ترو ئەوەی کەتووشیان هاتووە، هەڕەشەکردن لەقوڕەیش بەتریشقەیەکی وێرانکەر وەکو ئەوەی عادو سەمود .[٣]

د- ترسناکی ماڵ وگەورەیی وئافرەت لەسەر بانگخوازان، چەندین بانگخواز خۆیان ڕانەگرت بەرانبەر بریقەی پارە، ئەوانەشی کەخۆڕاگرن بەرانبەر پارەو لەخشتە ناچن هەر ئەوانەن کەبەڕاستەقینە شوێنکەوتووی پێغەمبەرنﷺ، مەترسی

---

١- السيرة النبوية لابن هشام ٢٩٤/١ .

٢- بڕوانە: التحالف السياسي في الاسلام، منير الغضبان لا ٣٣ .

٣- بڕوانە: معين السيرة للشامي لا٧٥ .

سەرگەورەیی ئاشکرایە، چونکە شەیتان لەم بوارەدا ڕازاندنەوە دەکات بەچەندین جۆر، بانگخوازی ڕێی خوایش ئەو کەسەیە کەپێڕەوی بکات لەپێغەمبەرﷺ لەهەموو جوڵەو وتەو کردەوەیەکی، ئەو ئامانجەیشی لەبیر نەچێت کەدەژێ ودەمرێ لەپێناویدا: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ (الانعام:١٦٢_١٦٣) .

سەبارەت بە ئافرەتیش پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ماترکت بعدی فتنة اضر علی الرجال من النساء)) [١] واتە: لەپاش خۆم بەڵایەکم بەجێنەهێشتووە زیاتر لەژنان زیانی هەبێت بۆ پیاوان، ئیتر ئایا خێزانێك بێت ورەی مێردەکەی بڕوخێنێ لەبانگەوازو جیهاد، یان زاڵبوونی هەندێ ئافرەتی بێ ئابڕوو لەسەر کەسی بانگخواز بۆ لەخشتە بردنی، بەهەر شێوەیەك بێت هەر بەڵایەکی گەورەیە، تەنانەت قوڕەیش پێشنیاری دە ئافرەتیان کردە سەر پێغەمبەرﷺ لەجوانترین وچاکترینیان ئەگەر خۆی توانای نییە لەژنێك زیاتری هەبێت، لەڕاستیدا ترسناکی ئافرەت کاتێك کەلادەدات لەڕێگای خوا زۆرترە لەسەر موسڵمانان لەشمشێرێك لەسەر گەردەنی، [٢] پێویستە لەسەر بانگخوازان پەیڕەوی بکەن لەپێغەمبەرﷺ، هەمیشە وتەکەی یوسف علیە السلام یان لەیاد بێت: ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (یوسف:٣٣_٣٤).

هـ- کارتێکردنی هەڵوێستی پێغەمبەرﷺ لەعوتبە، تەنانەت هاوڕێکانی پێش ئەوەی قسە بکات سوێندیان خوارد لەسەر ئەوەی کاریتێکراوە، چونکە دوای ئەوەی ئەو دوژمنە دەیویست بانگەوازەکە لەناو بدات، بەقوڕەیش دەڵێت واز لەموحەممەد بهێنن ئەوەی پێی باشە بائەنجامی بدات . [٣]

---

١- صحیح الجامع الصغیر ١٣٨/٥ ورقمە ٥٤٧٣ .

٢- بڕوانە: فقة السیرة للغضبان لا ١٦٩ .

٣- بڕوانە: في السیرة النبویة قراءة لجوانب الحذر والحمایة ٨٧ .

و- هاوەڵان گوێیان لەو ئاخاوتنە بوو لەنێوان پێغەمبەرﷺ وعوتبەو، چۆن خۆشەویستە کەیان هەموو پێشنیارەکانی عوتبەی ڕەتکردەوە، ئەوەش وانەیەکی پەروەردەیی بوو گەیشتە ناخیان، تیایدا فێری خۆڕاگری بوون لەسەر پێشڕەوو، دەستگرتن بەبیروباوەڕو، ئەو شتانەی کە بانگخوازان پێی فریو دەخۆن .

ز- هاوەڵان لەپێغەمبەرﷺ فێری لەسەر خۆیی وئۆقرەگرتن بوون، چونکە گوێی گرت لەئەو قسە پووچەڵانەی عوتبە دەیوت، ئینجا ئەو قسە نابەجێیانەش کەدەربارەی پێغەمبەرﷺ دەیووت و، ئەویش گوێی پێنەدەدا .

بۆ ئەوەی ڕێگەی لێنەگرێت کەبانگی بکات بۆ ئیسلام کەئەوەی سەرگەورەی بەنی عەبدو شەمس بوو، هەموو وشەیەکیش لەسەر گەورەی بوونەوەرەوە دەردەچوو بنەمایەك بوو کاری پێبکرێت، هەموو هەڵسوکەوتێکیشی ئایین بوو، هەموو چاوپۆشیەکیشی ڕەوشت بوو .[١]

کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ دەگێڕنەوە کەسەرانی مەککە لەپاش ئەم چاو پێکەوتنە دەستیان کرد بەدانوستان لەگەڵ پێغەمبەرﷺو هەندێ تەماعیان پێشنیار کرد کەزۆر دڵی ئادەمیزادەکان ودونیا ویستەکان بۆی نەرم دەبن، بەڵام پێغەمبەرﷺ هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەی نواند لەدژی ناهەقدا، بەبێ هیچ فرتوفێڵ و ڕوپامایییەك، یان چوونە نێو تەڵەکەبازی سیاسی، یاخود نەرمی نواندن بەرانبەر سەرانی قورەیش [٢]، چونکە کێشەی بیروباوەڕ پێویستە لەسەر ڕوونی بنیات بنرێت، دوور لەهیچ ڕووپامایی ودابەزینێك، بۆیە پێغەمبەرﷺ بەم شێوە وەڵامی دایەوە: ((مابی ماتقولون، ماجئت بما جئتكم به اطلب اموالكم ولا الشرف فيكم ولا الملك عليكم ولكن بعثني الله رسولاً وانزل عليّ كتاباً وامرني ان اكون لكم بشيرا ونذيراً, فبلّغتكم رسالة ربي , ونصحت لكم,فان تقبلوا مني ما جئتكم به, فهو حظكم في الدنيا, والاخرة,وان تردّوه عليّ, اصبر لأمر الله حتّى يحكم الله بيني وبينكم)).[٣]

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٣٠٤/١ .

٢- بڕوانە: الوفود في العهد المكي، لعلي الاسطل لا ٣٧ .

٣- السيرة النبوية لابن هشام ٢٩٥/١، ٢٩٦، التربية القيادية ٣٠٥/١ .

واتــە: ئــەو شـتانەی دەیڵـێن لەمنـدا نییـە، مـن ئـەو شـتانەی کـەدەیڵێم لەبـەر دەستکەوتنی ماڵەکانتان، یان سەرگەورەیی لە نێوانتـان، یـان پادشـایی لەسـەرتان نییە، بەڵکو خوای گەورە منی ڕەوانە کردووە بۆلای ئێـوە، کتێبێکیـشی بەسـەرمدا دابەزاندووە، فەرمانی پێکردووم مژدەدەرو ترسێنەریم بۆ ئێوە، مـن پـەیامی خـوای گەورەم پێتـان ڕاگەیانـدو، ئامۆژگـاریم کـردن، ئەگـەر لـێم وەردەگـرن ئـەوە بەشـی ئێوەیە لـەدونیاو دوارۆژدا، ئەگـەریش ڕەتیدەکەنـەوە ئارامـدەگرم لەسـەر فـەرمانی خـوا، تـاکو بەمـەزنی خـۆی نێوانمـان یـەکلا دەکاتـەوە. بـەم هەڵوێـستە ئیمانییـە چەسپاوە، پیلانەکانیان گەڕایەوە سەرخۆیاندا، کێشەیەکیش لەگرنگترین کێشەکانی بیروبـاوەڕی ئیـسلامی جێگیرکـرد کـەبریتی بـوو لـەپوخت بـوونی ئـەو بیروبـاوەڕە لەهـەموو جـۆرە شـتێکی نـامۆ کەتێکـەڵی بێـت، چـی لەناوەڕۆکدا، یـان لـەهۆکاری گەیشتنندا .[١]

﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾

کاتێك بتپەرستان پتەویی موسڵمانانیان بۆ دەرکەوت و، شانازیکردنیان بەئیسلام و، ورە بەرزییان لەدژی ناهەقدا، کاتێکیش کەم کەم بێهیوایی ڕوویکردە دەروونیان کەموسڵمانان لەئایینی خۆیان بگەڕێنەوە، ڕێگایەکی تریان گرتەبەر کەلەڕاستیدا بریتی بوو لەیەکێك لەسەیرو سەمەرەکانیان، هەروەها بەڵگەیش بوو لەسەر لاوازی بیرو هۆشیان، ئەوان هەڵسان بەناردنی ئەسوەدی کوڕی عەبدولموتتەلیب و، وەلیدی کوڕی موغیرەو، ئومەییەی کوڕی خەلەف و، عاصی کوڕی وائیل و وتیان: ئەی موحەممەد، وەرە ئێمە پەرستراوی تۆ بپەرستین و، تۆیش پەرستراوی ئێمە بپرستەو، هەردوو لامان هاوبەش دەبین لەمەسەلەکەدا، ئەگەر پەرستراوەکەی تۆ باشتر بوو، ئەوە ئێمە پشکێکمان لێی بەرکەوتووەو، ئەگەر پەرستراوەکەی ئێمەیش باشتر بوو، ئەوا تۆیش پشکی خۆتت لێی وەرگرتووە، ئیتر خوای گەورە ئەم سوڕەتەی دابەزاند: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ

١- تاريخ صدر الاسلام، لعبدالرحمن الشّجاع ٣٩ .

﴿١﴾ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ﴾ (الكافرون) .

هاوشێوەی ئەم سوڕەتەش، چەندین ئایەتی تر هەیە،حاشا دەکات لەبێباوەڕی و بێباوەڕان، وەکو: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ (یونس:٤١) .

هەروەها: ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهۡوَآءَكُمۡ قَدۡ ضَلَلۡتُ إِذٗا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلۡ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبۡتُم بِهِۦۚ مَا عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦٓۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ يَقُصُّ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰصِلِينَ﴾ (الانعام:٥٦_٥٧) .

سوڕەتی (الكافرون) ئەوەی دەرخست کەڕێگای ڕاستی یەکە، هیچ لارییەکی تیادا نییە، خوا پەرستنێکی پەتییە بۆ خوای گەورە، بۆیە سوڕەتەکە بریتی بوو لەجیاکردنەوەیەکی یەکلاکەرەوە لەنێوان پەرستن وپەرستنێك و، بەرنامەو بەرنامەیەك و، تێڕوانین وتێڕوانینێکی ترو، ڕێبازو ڕێبازێکی تر، بڕیاری یەکجاری ئەوەی تیادابوو کەیەککرتن نییە لەنێوان ڕاستی وبەتاڵدا، یان لەنێوان ڕوناکی وتاریکی دا، چونکە ناکۆکی بنەڕەتی هەیە لەکرۆکیاندا، مەحاڵە ئەو جۆرە یەککرتنە دروست بێت، مەسەلەکەش هیچ پێویستیەکی نییە بەڕوپامایی و فرت و فێڵ، بەڵێ، چونکە مەسەلەکە بریتی نییە لەبەرژەوەندییەکی خودی، یان ئارەزوویەکی پەڕیو، یان ژەهرێك لەهەنگوین دا، ئایینیش_وەکو نەفامیی هاوچەرخ دەڵێت_ بۆ خواو ولات وهەموان نییە، لەڕاستیدا، بەرپەرچدانەوەیەکی یەکلاکەرەوە بوو دژبە سەرانی قوڕەیش، سەوداگەری ولێکچوون وچارەسەری مام ناوەندی و، قایلکردنی کەسایەتی نییە بەهیچ شێوەیەك، نەفامی نەفامیەو ئیسلام ئیسلامە، لەهەموو کات وشوێنێکدا، جیاوازیش لەنێوانیاندا وەکو جیاوازییە لەنێوان ئاڵتوون و خۆڵدا، تاکەڕێگە چارەی ڕزگاربوونیش دەرچوونە لەو نەفامیە هەمووی بەرەو

ئیسلام بەگشتی، ئەگەر ناپێویستە حاشاکردنی تەواو یەکلاکردنەوەی ڕاشکاو دروست بێت لەنێوان هەق وناهەقدا، لەهەموو ساتێکدا ((لکم دینکم ولي دين)).[١]

دوای ئەوەی نێردەیەکی تریان نارد، پێکدەهاتن لە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئومەییەو، وەلیدی کوڕی موغیرەو، موکرەزی کوڕی حەفص و، عەمری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو قەیس و، عاصی کوڕی عامیرو.[٢]

هاتن بۆ پێشکەشکردنی پێشنیارێکی تر سەبارەت بەدابەزین لەهەندێ لەو و تانەی قورئان، داوایان کرد لەپێغەمبەرﷺ، ئەو شتانەی کەقەڵس دەبن پێی وەکو زەمکردنی خوداکانیان لەقورئان لاببات، خوای گەورەیش ئەم ئایەتانەی دابەزاند :

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ ۙ قَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَٰذَا أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ ۖ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (یونس:١٥) .

ئەم دانوستان ونێردانەش دەریدەخات تاچەند سەرانی قوڕەیش تووشی هەرەس بوو بوون، سەبارەت بەدابەزینی موسڵمانان لەهەموو ئیسلام، بۆیە پەنایان بردە بەر داواکاری وازهێنان لەهەندێکی، ئەوەش تێبینی دەکرێت ئەو دابەزینانەی داوایان کرد لەجاری یەکەم زۆر تر بوون لەوانەی داوایان کرد لەجاری دووەم، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان پلەپلە لەداواکارییەکانیان دەستیان هەڵگرت بەهیوای ئەوەی کەگوێیان لێ بگیردرێت لەلایەن پێغەمبەرﷺ، هەروەها ئەوان کەسەکانیان دەگۆڕی کەدەهاتن بۆ دانوستان، چونکە هەردوو نێردەکە _وەلیدی کوڕی موغیرە نەبێت_ ئەگینا هەموویان جیاواز بوون، بۆ ئەوەی کەسەکان دووبارە نەبنەوەو، شێوازی قسەکان ڕەوتێکی دیکە وەربگرێت، ئەوەیش پەندێکە بۆ هەموو بانگخوازەکان تاکو ڕۆژی قیامەت، کەهیچ دابەزینێك نییە لەئیسلام، بابەئەندازەیەکی کەمیش بێت، چونکە ئیسلام بانگەوازێکی خواییە، هیچ بوارێکی تیادا نییە بۆ سەودا کردن، لەژێر هیچ بۆنەو هۆیەکدا، لەم ڕۆژگارەیشدا پێویستە

---

١- بڕوانە: في ظلال القران ٦/٣٩٩١ بەدەستکارییەکی زۆرەوە .

٢- اسباب النزول للواحدي ٢٠٠، ونور اليقين للخضرى ٦١ بەدەستکارییەوە .

بانگخوازان خۆیان بپارێزن لەو جۆرە پێشنیارو فێڵ وتەڵەکانە، کە لەوانەیە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەخرێتە ڕوو، بەڵکو شێوازێکی ناڕاستەوخۆ وەردەگرێت، وەکو پلەو پایەی وەزیفی بەرز، بەڵێننامەی کارکردن، یان گرێبەندی بازرگانی چاك، دەزگا نێو دەوڵەتیە گومان لێکراوەکانیش بۆ ئەوە نەخشە دەکێشن، واتە بۆ دوورخستنەوەی بانگخوازان لەبانگخوازەکەیان، بەتایبەتی کەسە سەرکردەکان، هاوکارییەکی تەواویش هەیە لەنێوان ئەو دەزگایانە کەکاردەکەن بۆ کاولکردنی جیهانی ئیسلامی .[1]

لەو ڕاپۆرتەی کە(ریتشارد ب.میشیل) پێشکەشی کردووە_یەکێکە لەگەورەکارمەندانی بواری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ چاودێری کردنی ڕابوونی ئیسلامی وپێشکەش کردنی ئامۆژگاری بۆ چۆنێتی لێدانی، باسی پیلانێك کراوە بۆ لەناو بردنی بزوتنەوە ئیسلامیەکان، لەنێو برگەکانی ئەو ڕاپۆرتەدا برگەیەکی تایبەت هاتووە سەبارەت بەهەڵخەڵەتاندنی سەرکردەکانی بانگەوازی ئیسلامی، بۆ ئەو مەبەستەش ئەم پێشنیارانەی کردووە :

أ- دەستنیشانکردنی ئەوکەسانەی دەکرێت هەڵخەڵەتێنرێن بەوەزیفەی بەرز، کەئەو کەسانە سەرقاڵبکرێن بەهەندێ پرۆژەی ئیسلامی ناوەڕۆك بەتاڵەوەو، هەندێ کاروباری ترکە توانایان لەکیسیان دەدات، هاوکات لەگەڵ ئاسانکردنی زۆرێك لە ئیش و کارەکانیان، بەم شێوەیەش ئەو کەسانە بەتەواوی سەرقاڵ دەکرێن دادەبڕێن لەبنچینە جەماوەرییەکانیان .

ب- کارکردن بۆ ڕاکێشانی خاوەن ئارەزووە بازرگانی وئابوورییەکان، بۆ بەشداریکردن لەو پرۆژە ئامانج گومان لێکراوانە، کەلەناوچە عەرەبیەکاندا دادەمزرێن بۆ بەرژەوەندی دوژمنانیان .

ج- هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هەلی کارکردن و، گرێبەستی داهاتی چاك لەوڵاتە عەرەبیە دەوڵەمەندەکان، ئەوەش وادەکات دووربکەونەوە لەچالاکی ئیسلامی.[2]

---

١- في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية ٨٩ .

٢- مجلة المجتمع الكويتية، عدد ٤٢٨، ١٧ صفر ١٣٩٩ هـ. نقلاً عن: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية .

ئەو کەسەی وردبێتەوە لەو سێ خاڵەی سەرەوە، تێبینی دەکات کەبریتین لەهەڵخەڵەتاندنی مادی ناڕاستەوخۆ، دووبارە ئەگەر بەوردی دیقەت بدەین دەبینین کەئەو خاڵانە بەکپی جێبەجێدەکرێت، پلەو پایەی بەرز هەندێکی لەبانگخوازەکان سەرقاڵکردووە، هەندێ لەوڵاتە عەرەبیەکانیش توانیویانە زۆرێك لەبانگخوازان لەکاربخەن، هەندێکیشیان بازرگانی سەرقاڵی کردوون.[1]

## هەشتەم: شێوازی مشت ومڕو هەوڵی یەکخستن.

پێغەمبەری خواﷺ بەلگەو سەلماندنی دەخستە ڕوو لەسەر ڕاستێتی بانگەوازەکەی، ئینجا بەجوانی کاتەکانی هەڵدەبژارد، هەل و بۆنەکانی دەقۆستەوە، توانای بەرپەرچدانەوەی گومانەکانیشی هەبوو، هەرچۆنێك بوایەن، لەمشت و مڕەکانیشی دا لەگەڵ بێباوەڕاندا چەندین شێوازی بەکارهێنا، لەقورئان هەڵی دەهێنجا بەمەبەستی ڕاگرتنی بەڵگەی ئەقڵ و بەکارهێنانی پێوەرە مەنتقیەکان و هزرکردن وتێڕامان، لەو شێوازانەش لەگەڵ بێباوەڕانی مەککە بەکارهێنا :

### ١- شێوازی بەراوردکردن:

بەخستنە ڕووی دوو بابەت: یەکێکیان چاکەیەو هانت دەدا بۆ ئەنجامدانی، ئەوی تریش خراپەو دەتترسێنی لەئەنجامدانی، لەڕێگەی وروژاندنی بیرو هۆش، بۆ تێفکران لەهەردوو مەسەلەکە، دەرئەنجامیشی_ پاش بەراورد کردن_ گەیشتن بەهەلبژاردنی چاکەو شوێنکەوتانی .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (الانعام:١٢٢) .

(ابن كثير) لەتەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: ((ئەمە وەکو ئەو نموونەیە کەخوای گەورە باسی کردووە لەسەر کەسی باوەڕدار، کەمردوو بووە، واتە لەگومڕایی وسەر

---

١- بڕوانە: في السيرة النبوية لجوانب الحذر والحماية ٩١ .

لێشێواویدا بووەو، خوای گەورە زیندووی کردووەتەوە، واتە دڵی زیندوو کردووەتەوە بەئیمان ورێنموونی کردووەو، ڕێگەی پێغەمبەرانی پێ پیشان داوە))[1]

**٢- شێوازی جێگیرکردن:**

ئەوەش شێوازێکە لەپاش لێکدانەوەی ئەقڵی، مرۆڤ دەگەیەنێتە جێگیرکردنی داواکراو، کەکرۆکی بانگەوازی ئیسلامیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ (٣٥) أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَلْ لَا يُوقِنُونَ (٣٦) أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ (٣٧) أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ (٣٨) أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ (٣٩) أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ (٤٠) أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ (٤١) أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ (٤٢) أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٤٣) وَإِنْ يَرَوْا كِسْفًا مِنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَرْكُومٌ (٤٤) فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴾ (الطور:٣٥_٤٥).

(ابن كثير) لەتەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: ((ئەمە پلەو پایەی جێگیرکردنی خوایەتی و یەکتا پەرستنە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴾ (الطور:٣٥). واتە: ئایا بەبێ داهێنەر پەیدابوون؟ یان خۆیان خۆیانیان پەیداکرد؟ واتە نەئەمەو نەئەوە، بەڵکو خوای گەورە خۆی ئەوانی پەیدا کردووە لەنەبوونەوە)).[2]

ئەم ئایەتەیش لەئەو پەڕی بەهێزیدایە لەڕووی بەڵگەی ئەقڵی، چونکە بوونیان بەو شێوە بێ ئەوەی داهێنەرێکیان هەبێت مەسەلەیەکە بیرو هۆش ڕەتی دەکاتەوە، هیچ پێویستەکیشی نییە بەمشت ومڕ، یان ئەوەیە خۆیان دروستکەری خۆیان بن، ئەوەیش کەس وای نەوتووە، ئەگەر ئەم دوو ئەگەرەیش بەهیچ شێوەیەك قابیل نەبێت بۆ سەلماندن، کەواتە هیچ نەما ئەو ڕاستیە نەبێت کەقورئان

---

١- تفسير ابن كثير ١٧٢/٢ .

٢- تفسير ابن كثير ٢٤٤/٤ .

باسـی کـردووە، ئـەویش ئەوەیـە هـەموویان دروسـتکراوی خـوای تـاك وتـەنیان کەهاوبەشی نییە)) [١]
دەربڕینیش بەسروشت وفیترەت ناوەڕۆکی ئـەو مەسـەلەیە کەلـەلای بـیرو هـۆش سەلمێنراوە .

**٣- شێوازی تێپەڕاندن وپووچەڵکردنەوە:**

ئەوە شێوازێکی بەهێزە لەسەرکوتکردنەوەی سەرکەشەکان ولەخۆباییبووەکان، بەڕەتکردنی قسەکانیان وناڕەزایی دەرنەبڕین لەسەر هەندێ بەڵگە ناڕەواکانیان، بۆ ئەوەی مشت ومڕوناکۆکی دروست نەبێت، بەمەبەستی گەیشتنی بەبەڵگەی سەلمێنەر کەسەرکوتیان دەکاتەوە، لەبەسەرهاتی موسا علیه السلام لەگەڵ فیرعەوندا، نموونەیەکی دوورو درێژ هەیە بۆ ئەم شێوازە، چونکە موسا علیه السلام ڕووی وەرگێڕا لەهەموو ئەو ڕەخنەو گومانانەی فیرعەون دەیهێنایەوە، بەردەوام هەر خەریکی پووچەڵ کردنەوەی بانگەشەی فیرعەون بوو بۆ خوایەتی، لەڕێگەی چەسپاندنی بەڵگەی ئەقڵی دیار لەسەر خوایەتی وپەروەردگارێتی خوای گەورە، [٢] لەئەم ئایەتانەی سوڕەتی (الشعراء)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ﴾ (الشعراء:٢٣_٢٩).

شـێوازەکانی قورئـانی پـیرۆز بـەم شـێوە بـوو، کۆڵەکـەی مـشت ومڕکردنـی پێغەمبەرﷺ بوو لەگەڵ بتپەرستەکان، کاتێکیش ئەوان سەریان سوڕما لەمەسەلەی پێغەمبەرﷺ ئامادەیش نەبوون بۆ بـاوەڕپێکردنی وەکـو پێغەمبـەرێکی ڕەوانـەکراو لەلایەن خوای گەورەوە، نـەوەك لەبـەر ئـەوەی کـە بـەدرۆزنی بـزانن، بـەڵکو لەبـەر سەرکەشی وبێباوەڕی، وەکو خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى

---

١- في ظلال القران ٦/٣٣٩٩ .

٢- بڕوانە: مقومات الداعية الناجح، د.علی بادحدح ٥٩_٦٨ .

﴿ يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ (الانعام:٣٣) .

بۆیە بۆچوونە لارەکەیان پاڵی پێوەنان کەچەند داواکارییەك ئاراستەی پێغەمبەرﷺ بکەن، مەبەست لێیان دڵنیابوون نییە لەڕاستگۆیی پێغەمبەرﷺ، بەڵکو مەبەست ئازار پێگەیاندن وپەکخستنە، داوایان کرد لەپێغەمبەرﷺ:

أ- کانیەکیان لەزەوی بۆ هەڵقوڵێنێ: واتە ئاو لێیانەوە ڕێبکات.

ب- یان باخێکی هەبێت لەدارخورماو ترێ، ڕوباریان تیادا ڕێبکات.

ج- یان پارچە پارچە لەئاسمان بکەوێنێتە خوارەوە، وەکو چۆن لەڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدا.

د- یان خواو فریشتەکان پێکەوە بهێنێت.

هـ- یان ماڵێکی هەبێت لە ئاڵتوون.

و- یان پەیژەیەکی هەبێت لەسەری سەرکەوێت بەرەو ئاسمان .

ز- دابەزاندنی کتێبێك لەئاسمان بیخوێننەوە، موجاهید دەڵێت: مەبەستیان ئەوە بوو بۆ بۆ هەر یەکێکیان لاپەڕەیەك بهێنێ، ئەمە نوسراوی خوایە بۆ فلانەکەس، لەلای سەری دابنرێت.[1]

ح- داوایان کرد لەپێغەمبەرﷺ بپاڕێتەوە بۆیان بۆ ئەوەی شاخەکان بەڕێ بکەن و، زەوی ببڕێت وباو باپیرانیان زیندوو بکاتەوە.[2]

مەسەلەی داواکردنی کاری لەئاسابەر، نەخشەیەکی ئیش پێکراوە بەدرێژایی مێژوو، ئینجا سەرەڕای پەرۆشبوونی پێغەمبەرﷺ لەسەر باوەڕ هێنانی ئەو خەڵکە بەڵام پەروەردەی خوایی کەلەخوای خۆی وەرگرتبوو، هەروەها ئەدەبی پێغەمبەرایەتی ڕێگای پێنەدەدا کەداوای موعجیزە بکات.[3] بەڵکو بەو شێوە وەڵامی دایەوە، کەخوای گەورە ئەوی نەناردووە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەو، ئەو پێغەمبەرو گەیەنەری وەحیی خوایە.

---

١- بڕوانە: المعوقون للدعوة الاسلامية، د.سميرة محمد ١٧١_١٧٢ .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٣١١/١ .

٣- بڕوانە: التربية القيادية ٣١١/١ .

پێغەمبەری خواﷺ بەخەم وپەژارەوە گەڕایەوە ماڵ، بەهۆی بەدینەهێنانی ئەو مەبەستەی کەقسەی لەگەڵ ئەواندا کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَـٰرَ خِلَـٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَـٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴾ (الاسراء:٩٠_٩٦) .

هەروەها خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَا۟يْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ﴾ (الرعد:٣١) .

حیکمەتی ئەوەیش کەداواکارییەکانیان جێبەجێنەکراوە ئەوە بوو کەئەوان مەبەستیان ڕێگەی ڕاست دۆزینەوە نەبوو، بەڵکو سەرکەش وگاڵتەچی بوون، خوای گەورەیش دەیزانی ئەگەر ئەو شتانەش داوایان کرد بیانبینیایە، هەر باوەڕیان نەدەهێناو، هەر لەناو گومڕایی خۆیاندا دەمانەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ

وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَيْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴾ (الانعام:١٠٩_١١١) .

بۆیە ویستی خوای گەورە لەسەر ئەوە بوو کەداواکارییەکانیان جێبەجێی نەکرێت، چونکە یاسای خوای گەورە ئەوەیە، ئەگەر خەڵکانێك داوای بەڵگەیان کرد لەخواو لەدوای ئەوەش هەر باوەڕیان نەهێنا، خوای گەورە بەسزا بنەبڕیان دەکات، وەکو عادو سەمودو میللەتی فیرعەون.

بەڵگەش لەسەر ئەوە، ئەو خەڵکە سەرکەش بوون وگاڵتەیان دەکردو ڕاستیان نەدەکرد، بۆیە خوای گەورەیش بەم شێوە وڵامیانی داوەتەوە [١]:﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ (العنكبوت:٥٠_٥٢) .

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێت: قوڕەیش بەپێغەمبەرﷺ یان وت: داوا لەخواکەت بکە با تەپۆلکەی صەفا بکات بەئاڵتوون وئێمەش بڕوات پێدەهێنین، فەرمووی: جاوا دەکەن؟ ووتیان: بەڵێ، دەڵێت: ئەویش دەپاڕایەوە، جیبریل هاتە لای پێغەمبەرﷺ وپێی ووت: خوای تۆ سڵاوت لێدەکات ودەفەرموێت: ئەگەر دەتەوێت صەفایان بۆ دەکەمە ئاڵتوون، بەڵام لەپاش ئەوە کەسێکیان گەر بێباوەڕ بێتەوە، سزایەکیان دەدەم سزای کەسی ترم بەو شێوە نەدابێت، ئەگەر دەڵێی دەرگای تەوبەو ڕەحمەتیان لێ دەکەمەوە، ووتی بەڵکو دەرگای تەوبەو ڕەحمەت، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی داگرت: ﴿ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن

---

١– بڕوانە: السيرة النبوية لابى شهبة ٣٢٠/١، ٣٢١ .

﴿كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا﴾ (الاسراء:٥٩) .

ئامانجی سەرانی قورەیش لەئەو داواکاریانە، بەرپاکردنی شەڕێکی ڕاگەیاندن بوو لەدژی بانگەوازو بانگخوازان، بەمەبەستی دوور خستنەوەی هۆزە عەرەبیەکان، چونکە ئەوان داوای هەندێ شتیان دەکرد، خۆیان دەیانزانی لەسروشتی بانگەوازدا نییە، بۆیە جەختیان لەسەری دەکرد، بەڵکو بەڕاشکاویش دەیانووت، ئەگەر ئەو شتانە بەدیش بێن هەرباوەڕ ناهێنن، ئەمانەش هەمووی هەوڵێك بوو لەئەوانەوە بۆ دەرخستنی بێ دەسەڵاتی پێغەمبەرﷺ و، ئەوەش بکرێتە بەهانە بۆ ڕاوەستان لەڕێگەی خەڵکیدا شوێنی ئیسلام نەکەون .[1]

**نۆیەم: ڕۆڵی جولەکە لەسەردەمی مەککەدا و پەنا هێنانی بتپەرستانی مەککە بۆ ئەوان.**

قورئان بەدرێژی باسی بەنی ئیسرائیلی کردووە، لەچەندین سورەتدا، کەدەگاتە پەنجا سورەت لەسەردەمی قۆناغی مەککەدا، هەروەها لەقۆناغی مەدەنیشدا ڕۆڵی جولەکەکان گەورە بوو بۆ هەوڵدانی کوژاندنەوەی ڕوناکی خوای گەورەو لەناوبردنی بانگەوازی ئیسلامی وژیانی خودی پێغەمبەریشﷺ، هیچ میللەتێك یان کەسانێك ئەوەندەی ئەوان باسنەکراون لەقورئاندا، ئینجا باسکردنیانیش بەشێوەیەکی زۆر ورد هاتووە، بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ قۆناغەکانی بانگەوازدا کەئیسلامی پیاتێپەڕ بووە، هەروەها لەئایەتە پیرۆزەکاندا ئاماژە هاتووە کەبێ ئاگایی بتپەرستان لەڕێگای ڕاست کە پێغەمبەرﷺ ڕوونیکردووەتەوە، هەندێ نموونە بووە پێش ئەوانیش لەسەر هەمان ڕێباز وەکو عادو سەمودو فیرعەون وبەنی ئیسرائیل و میللەتی توببەع و،(اصحاب الرس) .[2]

کاتێك قورەیش بێ دەسەڵاتی خۆیانیان بۆ دەرکەوت بەرانبەر بانگەوازی ئیسلام، کەلەسەر زاری نەزری کوڕی حاریسەوە ڕاگەیەنرا، کاتێك وتی: ((ئەی کۆمەڵانی قورەیش، سوێند بەخوا شتێکتان تووش بووە توانای بەرەنگاری

---

١- بڕوانە: الوفود في العهد المكي ٤٠_٥١ .

٢- معالم قرانية في الصراع مع اليهود، مصطفى مسلم ٣٠، ٣١ .

بوونیتان نییە، جائیتر تەماشای کاری خۆتان بکەن،_چونکە سوێند بەخوا_ شتێکی گەورەتان بەسەردا هاتووە)) دوای ئەوە بڕیاریان دا بەناردنی نەزری کوڕی حاریس وعوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت بۆلای زانایانی جولەکە لەمەدینە، بۆ ناسینی ئەم بانگەوازە نەوەك بەمەبەستی شوێنکەوتنی، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان یارمەتیان بدەن بەهەندێ ڕێگە بۆ دەرخستنی بێ دەسەڵاتی پێغەمبەرﷺ، هەروەها بەهۆی شارەزایی سەرانی مەککە بۆ کینەی جولەکان بەرانبەر پێغەمبەران بەگشتی و، ڕێبوارانی ڕێگای ڕاستی لەهەر شوێنێك بن، پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ شڵەقانێکی گەورە بوو بۆ جولەکەکان، چونکە ئەوان لەدورگەی عەرەبدا لەسەر خەونێك دەژیان بەدرێژایی چەندین ساڵ بۆیان مابوویەوە، کەپێغەمبەرێك دێت ورزگاریان دەکات، ئومێدیشیان وابوو کەلەخۆیان بێت، بۆ ئەوەی لەپەرتەوازەیی قوتاریان بکات .[1]

نزیکبوونەی نێوان بێباوەڕی وبتپەرستی لەگەڵ جولەکەکان، هاو ئاهەنگ بوو لەگەڵ ئامانجە هاوبەشەکانیاندا بۆ لەناو بردنی بانگەوازی ئیسلام، هەر بۆیە یارمەتی نێردەی مەککەیاندا بەهەندێك پرسیار بەمەبەستی پەکخستنی پێغەمبەرﷺ لەوەڵامدانەوە، لەئیبنو عەبباسەوە_ڕەزای خوای لێبێت_ فەرموویەتی: قوڕەیش هەڵسان بەناردنی نەزری کوڕی حاریس و، عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت بۆلای زاناکانی جولەکە لەمەدینە، پێیانیان وت: پرسیاریان لێبکەن دەربارەی موحەممەدﷺ و، باسی بکەن و، قسەکانی بخەنە ڕوو بۆیان، ئەوان خاوەنی یەکەم کتێبن، زانستی لەئێمە زۆرتریان هەیە دەربارەی پێغەمبەران، ئیتر ئەوانیش دەرچوون بەرەو مەدینە و پرسیاریان کرد لە ئەوان دەربارەی پێغەمبەرﷺ و، وتیان: ئێوە خاوەن تەوراتن، ئێمەش هاتووین ئاگادارمان بکەن دەربارەی موحەممەد، جولەکەکان وتیان: پرسیاری سێ شتی لێبکەن، ئەگەر وەڵامی دایەوە ئەوە پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراوە، ئەگەریش نەیتوانی وەڵام بداتەوە، کەواتە پێغەمبەر نییە وکاری خۆتانی لەگەڵ ئەنجام بدەن. پرسیاری

---

١- بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة، د.عبدالله الشقاري ١/٨٨ .

هەندێ گەنجی لێبکەن لەسەردەمی ڕابوردوودا ڕۆیشتوون، بەسەرهاتیان چۆن بووە؟ چونکە ئەوان بەسەرهاتێکی سەیریان هەبووە، هەروەها پرسیاری لێبکەن دەربارەی پیاوێکی گەڕۆك کەگەیشتە ڕۆژهەلات وڕۆژئاوای زەوی، هەواڵی ئەو چۆن بووە؟ هەروەها پرسیاری گیانی لێبکەن، ئەگەر وەلامی ئەوانەی دایەوە ئەو پێغەمبەرە شوێنی بکەون، ئەگەر نا ئەو کەسێکی درۆزنە، ئینجا نەزرو عوقبە گەڕانەوە بۆ مەککەو وتیان: ئەی کۆمەلانی قورەیش، هەواڵی یەکلاکەرەوەمان پێیە دەربارەی ئێوەوموحەممەد، زانایانی یەهوود هەندێ پرسیاریان پێ ڕاگەیاندووین لەموحەممەدی بکەین، ئینجا هاتنە لای پێغەمبەرﷺ ووتیان: ئەی موحەممەد، وەلاممان بدەرەوەو، پرسیارەکانیان لێ کرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سبەینێ وەلامتان دەدەمەوەو نەیوت ((انشاء الله))، ئەوانیش بلاوەیان کرد، بەلام پێغەمبەرﷺ پانزە ڕۆژ مایەوە بێ ئەوەی وەحی دابەزێتە سەری و، جیبریلیش (علیه السلام) نەدەهاتە لای، تەنانەت خەلکی مەککە هەژان و وتیان: موحەممەد پێی وتین سبەینێ ووا پانزە ڕۆژ تێپەڕبوو وهیچ وەلامێکی نەبوو بۆ پرسیارەکەمان، پێغەمبەریشﷺ تووشی پەژارە بوو لەدواکەوتنی وەحی، قسەی خەلکی مەککەیش بێ تاقەتی دەکرد، دوای جیبریل لەلای خوای گەورەوە سورەتی (الکهف)ی دابەزاند، کەتیایدا خوای گەورە گلەیی دەکات لەسەر غەمباری پێغەمبەرەکەیﷺ سەبارەت بەوەلامی ئەو پرسیارانەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾(الاسراء:٨٥).

سورەتی (الکهف)یش وەلامی پرسیارەکانی ئەوانی تیادابوو، ئاماژەیەکیش بوو کەئەشکەوتێك لەچاودێری خوای گەورە پەنای هاوەلانی پێغەمبەریش دەدا، وەکو چۆن پێشتر بوو بەجێگای ئەوانەی هەلاتبوون بەئایینەکەیان هەروەها ئاماژەیەکیش بوو بۆ ئەوەی خەلکانێك بەڕووخۆشی پێشوازیدەکەن لەئایینی خوا لەیەسریب، کەئەوان پێشتر پشتگیریان دەکرد لەقورەیش لەگومانەکانیانداو، هەولیان دەدا ئایینی خوا بسڕنەوە، بەڕەچاوکردنی ئەو ڕێبازە لەئاڕاستە کردنی پرسیاری

پەکخەر، ئەوەش ڕێبازێکی لارە، چونکە لەکەیەوە ئەو جۆرە پرسیارانە هۆکارێك بووە بۆ دڵنیابوون لەڕاستێتی پەیام وخاوەنەکەی؟! ئائەوە موسای پێغەمبەری خوایە (علیە السلام)، کەگەورەترین پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیلە، ڕاستی لێکدانەوەی ئەو سێ مەسەلەی لەبەردەمیدا ڕوویاندا نەیزانی، ڕەخنەشی لەخدر گرت سەبارەت بەئەو هەڵسو کەوتانەی، ئەوەش هیچ کاریگەرییەکی نەبوو لەسەر پێغەمبەرایەتی موسا، نەبەنی ئیسرائیلیش گومانیان کرد لەپێغەمبەرایەتیەکەی، ئەم جۆرە پرسیارانەشیان نەکردە چەشنێك بۆ دڵنیابوون لەڕاستێتی پەیامەکەی .[١]

خوای گەورە ئەم بۆنەی کردە هۆکارێك بۆ نزیکی گوشادی بۆ کۆمەڵی باوەڕداران، بۆ ئەوەی ئەوانیش داڵدەیەکیان هەبێت لەچەشنی داڵدەکەی (اصحاب الکهف) هەروەها بۆ ئەوەیش خەڵکی مەدینەش بەڕوویاندا بکەشێنەوە، وەکو چۆن خەڵکی ئەو شارە گەشانەوە بەڕووی یەکێك لەئەو لاوانەو دواتر لەگەڵیاندا ڕۆیشتن بۆ خەڵاتکردنیان ومەزن ڕاگرتنی یادیان .[٢]

## دەیەم: ئابلۆقەی ئابووری وکۆمەڵایەتی لەکۆتایی ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ.

ئازاردانەکانی قوڕەیش لەزیادکردندابوو، لەبەرانبەر ئارامگرتنی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی لەسەر ئەو ناڕەحەتیانەو، سوربوونیان لەسەر بانگەوازەکەیان، هەروەها لەبەرانبەر بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەنێو هۆزەکاندا، گەیشتنی ئازادان بەچڵەپۆپەکەی بەگەمارۆی کردەیی و واتایی، کە قوڕەیش خستبوویە سەر پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی و ئەوانەشی سۆزیان بۆیان دەجولا لەخزمانیان .[٣]

---

١- بڕوانە: مباحث في التفسير الموضوعي، مصطفى مسلم ١٨٩ .

٢- بڕوانە: تأملات في سورة الكهف للشيخ ابى الحسن الندوى ٤٦ .هەروەها بڕوانە: معالم قرانية في الصراع مع اليهود ٦١ .

٣- بڕوانە: ظاهرة الارجاء، د.سفر الحوالى ١/٥٠ .

زوهری دەڵێت: ((بتپەرستەکان زۆر توندوتیژیان بەکارهێنا لەگەڵ موسڵماناندا تاکو بەتەواوەتی شپرزەیان کردن، قورەیش یەکدەنگ بوون لەسەر ئازاردانی موسڵمانان و، کوشتنی پێغەمبەرﷺ بەئاشکرا، کاتێك ئەبو تالیب ئەوەی بینی بنەماڵەی عەبدولموتتەلیبی کۆکردەوەو فەرمانی پێکردن پێغەمبەرﷺ ببەنە لای خۆیان وبیپارێزن لەکوشتن، ئەوانیش بەموسڵمان وبێباوەڕیانەوە ڕازی بوون، هەریەکەو لەڕوانگەیەکەوە، کاتێك قورەیش بەئەم یەکدەنگییەی بەنی هاشمیان زانی، ئەوانیش بەکۆی ڕا بڕیاریاندا لەگەڵیان دانەنیشن وشتیان پێ نەفرۆشن و نەچنە ماڵەکانیان، تاکو پێغەمبەرﷺ نەدەنە دەستەوە بۆ کوشتنی، لەم بارەشەوە هەندێ نوسراوو ڕێککەوتننامەیان نووسی، کەهەرگیز ئاشتەواییان لەگەڵ نەکەن و، هیچ سۆزێکیان بۆیان نەجوڵێ.[1]

لەڕیوایەتی تریشدا هاتووە، زیاد لەمانە، بڕیاریاندا کەئەو لاپەڕەی بڕیارەکانی تیا نووسرا لەناو کەعبەدا هەڵواسرێت، وەکو جەختکردنێك لەسەر خۆیان.[2]

بەنی هاشم لەدۆڵەکەدا سێ ساڵ مانەوە، بەڵاو ماندوو بوونیان لەڕادەبەدەر بوو، چونکە لەبازاڕەکان دابڕابوون، بواریشیان نەدەدا هیچ خواردن وئازووقەیەکیان پێ بگات خۆیان دەیانکڕی، مەبەستیشیان ئەوە بوو بتوانن پێغەمبەرﷺ بکوژن.[3]

کاتێك خەڵکی هەریەکەو دەچووە شوێنی خەوتنی، ئەبو تالیب پێغەمبەریﷺ بانگ دەکرد بۆ ئەوەی لەسەر جێگەکەی بخەوێت وببینرێت لەسەر ئەو جێگایە، بەڵام کاتێك خەڵکی خەویان لێ دەکەوێت، یەکێك لەبراکانی یان کوڕەکانی بانگ دەکرد ولەو جێگەیە دەیخەوان، وپێغەمبەرﷺ لەسەر یەکێ لەجێگەکانی ئەوان دەخەواند.[4]

---

١- وردەکاری ئەو بەسەرهاتە، دلائل النبوة للبيهقي ٢/٨٠_٨٥ السيرة النبوية لابن كثير ٢/٤٣_٧٢ الروض الانف ٢/١٠١_١٢٩.

٢- السيرة النبوية لابن هشام ١/٣٥٠، زاد المعاد ٢/٤٦، الكامل في التاريخ ٢/٨٧ .

٣- بڕوانە: ظاهرة الارجاء ١/٥١ .

٤- بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان لا ١٨٠ .

گەمارۆکە سەخت بوو لەسەر هاوەڵان وبەنی هاشم وبەنی عەبدولموتتەلیب، تەنانەت ناچار بوون گەڵای دار بخون، ژیانیان گەیشتە ئەو پەڕی ناخۆشی وزبری، تائەو ڕادەی کەسی وایان بوو هەڵدەسا بۆ میزکردن، دەنگێکی لەژێر خۆیە دەبیست تەماشای دەکرد پارچەیەکە لەپێستی وشتر، ئەویش دەیشۆری و دەیسوتاندو، ئینجا دەیهاڕی ولەگەڵ ئاودا دەیخوارد، تاکو سێ ڕۆژ خۆی پێ بەهێز دەکرد، تەنانەت قورەیش گوێیان لەدەنگی منالْ دەبوو لەبرسا دەگریان لەڕێچکە ڕێگایی نیو شاخەکان!

لەپاش سێ سالْ، خوای گەورە کەسانێکی لەپیاو ماقوڵانی قورەیش دەستە بەرکرد، کەئەو لاپەڕەیە پووچەڵ بکەنەوە، لەسەروی ئەوانەوە هیشامی کوڕی عەمری هاشمی، چووە لای زوهەیری کوڕی ئەبی ئومەییەی مەخزومی، کەکوڕی عاتیکەی کچی عەبدولموتتەلیب بوو، وتی: ئەی زوهەیر، ئایا چۆن ڕازی دەبێت خۆت خواردن بخۆیت وپۆشاک لەبەرکەیت ولەگەڵ خێزانتدا بیت، خاڵوانیشت لەو حاڵەدان؟ توانای کڕین وفرۆشتن وکچ بەشوودان وژنهێنانیان نییە، سوێند بەخوا ئەگەر خاڵوانی من بوونایەو، بتانویستبا ئەمەیان بەسەردا بهێنن، کەس بەدەنگتانەوە نەدەهات، وتی: بەڵات لێدا، چی بکەم؟ من تاکە کەسێکم، سوێند بەخوا کەسێکی ترم لەگەڵدا بوایە بەو کارە هەڵدەسام؛ وتی: ئەو کەسەت دەستکەوتووە، وتی: کێیە؟ وتم: خۆم: ئینجا زوهەیر وتی: باکەسێکی دیکەش پەیدابکەین .

پاشان چووە لای موتعیمی کوڕی عەدی، پێی وت: ئایا ڕازی بووی دووتیرە لەبەنی عەبدومەناف لەناو بچن و، تۆیش تەماشادەکەیت وڕازیت؟ وتی: بەڵات لێدا چی بکەم؟ من تاکە کەسێکم، وتی: کەسێکی ترم بۆت دۆزیوەتەوە، وتی: بەڵام پێویستمان بەکەسی سێیەمیش دەبێت، وتی: بەڵێ: خۆم ئەو کەسەم. وتی: باشە باکەسێکی چوارەمیش پەیدا بکەین، ئیتر چوونە لای ئەبولبوختوری کوڕی هیشام، هەمان ئەو قسانەی بۆ کرد، بەڵام ئەویش داوای کەسێکی پێنجەمی کرد، ئینجا چوونە لای زەمعەی کوڕی ئەسوەدی کوڕی موتتەلیبی کوڕی ئەسەد وباسی ئەو کەسانەی بۆ کرد کەئامادەن هەڵسن بەو کارە، ئیتر پێکەوە بەڵێنیان دا لەناوچەی

حەجونی لای مەککە بەشەو یەکبگرن، لەوێیش بڕیاریاندا ئەو لاپەڕەیە پووچەڵ بکەنەوە، زوهەیر وتی: من یەکەم کەس قسە دەکەم سبەی، ئینجا لەپاش سوڕانەوەی حەوت جار بەدەوری کەعبەدا، ڕووی کردە خەڵکەکەو وتی: ئایا ڕەوایە خواردن بخۆین وپۆشاك بپۆشین وبەنوهاشمیش لەبرسانا مردوون، توانای کڕین و فرۆشتنیان نییە، سوێند بەخوا دانانیشم تاکو ئەو لاپەڕە پڕ لەستەمە پارچە پارچە نەکرێت، ئەبو جەهل ووتی: درۆت کرد، بەهیچ شێوەیەك نابێت لەناو بدرێت، زەمعەی کوڕی ئەسوەد وتی: سوێند بەخوا تۆ درۆزنتری، ئێمە هەر لەبنچینەوە نارازی بووین لەسەر نووسینی، ئەبولبوحتوری وتی: زەمعە ڕاست دەکات، ئێمە ڕازی نین لەسەر ناوەڕۆکەکەی، دوای ئەوان موتعیمی کوڕی عەدی وتی: ڕاستان کرد، ئەوەی جگە لەو قسانەش بکات درۆ دەکات، لەلای خوا حاشا دەکەین لەو شتانەی تیایدا هاتوون، ئینجا هیشامی کوڕی عەمریش شتێکی لەو جۆرەی وت، ئەبو جەهل وتی: ئەمە کارێکە بەشەو قسەی تیاکراوەو، لەشوێنێکی تر پرس وڕای تیابڕاوەتەوە، ئەبو تالیبیش لەسوچێکی مزگەوتەکەدا دانیشتبوو قسەی نەدەکرد .

ئینجا موتعیمی کوڕی عەدی هەڵسا بۆ ئەوەی لاپەڕەکە پارچە پارچە بکات، بینی مۆرانە خواردویەتی تەنها دوو ووشەی نەبێت ((باسمك اللهم)) [1]، لەڕیواتێکی ئیبنو ئیسحاقدا بەشێویەکی تر باسی ئەم ڕوداوە کراوە بەڵام هەر لەبازنەی ئەم چەمکەدا .[2]

**وانەو پەندو سوودەکان :**

١-بتپەرستانی بەنی هاشم وبەنی عەبدولموتتەلیب هاوکاریان کرد لەگەڵ پێغەمبەرﷺ وپاراستنیان وەکو ڕێ ڕەسمێکی جاهیلی، ئالێرەشەوە ئەوە فێردەبین کەموسڵمان دەتوانێت سوود لەیاساکانی کوفر وەربگرێت لەپێناو خزمەت کردنی ئایینەکەی، بەمەرجێك ئەو کارە بەپێی فەتوایەکی ڕاست بکرێت لەلایەن کەسی زاناوە .[3]

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابن كثير ٢/٣٤_٥/٦٧_٦٩ .

٢- بڕوانە: السير والمغازي لابن اسحاق لا ١٥٦، ١٦٢ .

٣- بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها_ السيرة النبوية، سعيد حوى ١/٢٦٤ .

٢- مافەکانی مرۆڤ لەم سەردەمەدا دەستەبەرکردنە بۆ موسڵمان، ئازادی ئایینیش لەزۆرێك لەوڵاتەکاندا هەل دەداتە موسڵمان، ئەوانیش لەسەریانە سوود وەربگرن لەو یاسانە بەڵام بەپێی هەڵسەنگاندنێکی ورد .[1]

٣- گرنگە بزانیت کەپارێزگاری کردنی بەنی هاشم لەموحەممەدﷺ، بەمەبەستی پاراستنی ئیسلام نەبوو، بەڵکو خودی کەسەکە بوو، ئەگەریش بکرێت سوود لەو جۆرە پەیوەندیانە بکرێت لەم سەردەمەدا ئەوە شتێکی چاکە .[2]

٤- ئەبو تالیب بەهۆنراوەکانی توانی سەرکەوێتە سەر کۆمەڵگای قورەیشدا، چونکە توانی خەڵکی بوروژێنێت ڕووەو لابردنی ئەو لاپەڕەیە، لەوانەش ئەو پێنج کەسە بوون کەلەسەر ئەو مەبەستە ڕێککەوتن وتوانیان ئەو ستەمە لەسەریان لابدەن، لەم بەسەر هاتەشدا ئاماژەیەکی تیایە کەزۆرێك لەو کەسانەی بەڕواڵەت بەکۆڵەکەی حوکمی نەفامی دێنە ئەژمار، لەناخیاندا ڕازی نین بەو ستەم و دەستدرێژیە، هەلی گونجاویش دقۆزتەوە بۆ لابردنی، پێویستە لەسەر ڕۆڵەی موسڵمانان کەگرنگی بدەن بەئەو توێژانەو بگەنە لایان و، ڕاستی قورئانیان بۆ ڕوونبکرێتەوە، هەروەها سوننەتی پێغەمبەرﷺ وسروشتی دژایەتی نێوان ئیسلام وجولەکەو خاچپەرستەکان وعەلمانییەکان، چونکە پێدەچێت بۆ خزمەتکردنی ئیسلام سوودیان لێ وەربگیردرێت .[3]

٥- دیاردەی ئەبو لەهەبیش شایەنی لێکۆڵینەوەیە، چونکە دووبارە دەبێتەوە لەمێژووی ئیسلامدا، لەوانەیە بانگخوازەکان ببینن کەسێکی زۆر نزیکی خۆیان لێیان هەڵگەڕێتەوە، زیادە ڕەویش بکات لەئازاردانی موسڵمانان و...زیاتر لەناحەزە سەرەکییەکان .[4]

٦- ڕێنماییەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ موسڵمانان جەختی دەکرد لەسەر ڕووبەڕوونەبوونەوەو، دان بەخۆ داگرتن، مەزنترین پەروەردەکردنیش لەم قۆناغەدا،

---

١- هەمان سەرچاوە .

٢- بڕوانە: فقه السيرة النبوية، للبوطي ٨٨ .

٣- بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان ١٨٥ .

٤- بڕوانە: فقه السيرة النبوية للغضبان لا ١٨٦ .

ئارامگرتنی ئەو پاڵەوانانەو بەرگری نەکردیان بوو، حەمزەو عومەرو ئەبوبەکر و عوسمان وچەندین پاڵەوانی تر ڕەزای خوایان لێبێت، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون، ڕووبەڕووی ئەو هەموو ئازارو کینە وستەمە دەبوونەوەو ئارامیشیان دەگرت، نەوەك ڕۆژو دووان، بەڵکو سێ ساڵی ڕەبەق، ئەوان ڕێگە نەدەدران تیرێك بهاوێشن یان دەستێك بوەشێنن .[١]

٧- ڕووداوەکان گەورەیی ڕیزی ئیماندارانیانی سەلماند، لەپەیوەست بوونیان بەفەرمانی سەرکردەوەو، خۆ بەدوور گرتنیان لەهەڵسوکەوتی هەرزەکارانە، لەوەش ئاسانتر نەبوو کەسێکیان هەستایە بەکوشتنی ئەبو جەهل، یان هەڵگیرساندنی شەڕێکی نەخشە بۆ نەکێشراو ونابەرانبەر، کەخوای گەورە خۆی ئاگاداری سەرئەنجامەکەی دەبوو .

٨- بانگەوازی ئیسلام سەرکەوتنی ناوازەی بەدەست دەهێنا، لەحەبەشە، لەنەجران، لەئەزدی شەنوئە، لەدەوس، لەغیفار، بەپێی هێڵێکی ڕوونیش ئەنجامدەدرا، کەئەو شوێنانە دەبوونە مەڵبەندی هێزو یارمەتی بانگەواز لەدەرەوەی مەککە بۆ کاتی پێویست .

٩- ئەم سێ ساڵە بۆ نەوەی سەرەتا، توێشوویەکی چاك بوو بۆ پەروەردەو بنیاتنان، چونکە بوو بەمایەی خۆڕاگرتن بەرانبەر ترس وبرسێتی وئارامگرتن لەسەر تاقیکردنەوەو دان بەخۆداگرتن وفشار خستنەسەر دڵ ودەروون .

١٠- هەندێ لەکەسایەتیەکانی ڕیزی بتپەرستان، کەسایەتی پێغەمبەرﷺ کاری تێکردبوون، لەناخی خۆیشیاندا لەگەڵ بنەماکانی ئایینی نوێ دا ئاوێتە دەبوون، بەلام زاڵبوونی پیاو ماقوڵان و سەرگەورەکانیان دەبووە ڕێگر لەبەردەمیاندا، کۆتایی پێهاتنی مەسەلەی لاپەڕەکەش چاکترین بەڵگەیە لەسەر ئەمە .[٢]

١١- بەڵگەی سەلمێنەروکاری لەئاسابەر کاریگەری نییە لەسەر خاوەن ئارەزوو، ئەو کەسانەی بەستراونەتە بەرژەوەندییەکانیانەوە، چونکە ئەوانە ئەقڵی خۆیان

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٣٧١/١ .
٢- سەرچاوەی پێشوو ٣٨٤/١، ٣٨٥ .

لابردووە و، گوێی خۆیان کەڕکردووەو، چاوەکانیشیان بەرانبەر ڕاستی دەنوقێنن، ئەبو تالیب قورەیشی ئاگادارکردەوە لەوەی کەپێغەمبەرﷺ پێی وت: کەوا مۆرانە هەموو لاپەڕەکەی خواردووە ئەو دوو ووشە نەبێت ((باسمك اللهم)) بەلاّم یەك کەسیان باوەڕی نەهێنا، بەهۆی ئارەزووە کانیانەوە.[1]

١٢- پەیوەندی پچڕانی ئابووری وکۆمەلاّیەتی هۆیەك بوو بۆ خزمەتکردنی بانگەوازو بانگەشەیەکیش بۆ ئیسلام لەنێو هۆزەکاندا، چونکە ئەو هەواڵە بەنێو هەموو هۆزو عەشیرەتەکاندا بلاّوەی کرد لەڕێگەی حاجیانەوە، سەرنجی هەموو دانیشتوانی دورگەی عەرەبی بەلای بانگەوازدا ڕاکێشا، ئەو دەردەسەرییەش بەسەریاندا هات کارتێکردنی هەبوو لەسەر دەروونی عەرەب بەگشتی .

١٣- ئەم ئابلۆقەیە بوو بەمایەی تورە بوونی عەرەبەکان لەدژی بێباوەڕانی مەککە، چونکە زۆر بێڕەحمانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بەنی هاشم کرد، هەروەها سۆزی جولاندن بەرانبەر بەپێغەمبەرﷺ وهاوەڵان، هەرکە گەمارۆکە نەما خەڵکی هاتنە پێشوازی ئیسلامەوەو، باسی بانگەواز بلاّوبوویەوە، بەم شێوەیەش چەکی ئابلۆقە بەسەر خۆیاندا شکایەوە، هۆکارێکی بەهێزیش بوو بۆ بلاّوبوونەوەی بانگەوازی ئیسلامی، بەپێچەوانەی ئاواتی سەرانی قورەیش .[2]

١٤- ڕاوەستانی بەنی هاشم وبەنی عەبدولموتتەلیب لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و، خۆڕاگرتنیان بەرانبەر ئابلۆقەی ئابووری وکۆمەلاّیەتی شوێنەوارێکی هەبوو لەسەر فیقهی ئیسلامی، چونکە پشکی (ذوي القربى) لەپێنج یەك دەدرێتە بەنی هاشم و بەنی موتتەلیب، (ابن كثير) ئەم حوکمە ڕوون دەکاتەوە لەکاتی ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتە: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الانفال:٤١) . و دەڵێت: ((پشکی

١- السيرة النبوية لابن فارس لا ١٦٧ .

٢- بڕوانە: الحرب النفسية ضد الاسلام، د.عبدالوهاب كحيل ١٠١ .

خزمـان دەدرێتـە هاشـم وبـەنی عەبدولموتتـەلیب، چـونکە نـەوەکانی موتتـەلیب پـشتگیری نـەوەی هاشمیـان کـردووە لەسـەردەمی جـاهیلی و، سـەرەتای ئیـسلام، لەگەڵیـشیاندا چـوونە دۆڵـی ئـەبو تالیبـەوە وەکـو توڕەبـوون بـۆ پێغەمبـەرﷺ و پارێزگـاری کـردن لێـی، موسـڵمانیان ئـەوەی لەبـەر خـواو پێغەمبـەر دەکـرد، بێباوەڕیشیان وەکو غیرەتێك بۆ عەشیرەت وگوێڕایەڵی بۆ ئەبوتالیب، سەبارەت بـە بەنو عەبدوشەمس و، بەنو نەوفـەل، ئەگـەر چـی ئامۆزایـانن، بـەڵام لـەو مەسـەلەدا نـاکۆك بـوون لەگەڵیانـدا، بـەڵکو شەڕیـشیان لەگـەڵ کـردن ولەگـەڵ دوژمنـانی پێغەمبەرﷺ دەستیان تێکەڵ کرد، بۆیە ئـەبوتالیب لەقەصـیدە لامییەکەیـدا زیـاتر سەرزەنـشتی ئـەوانی کـرد بـەهۆی نزیکـی خزمایەتیانـەوە، لەفەرموودەیەکیـشدا هاتووە: ((ئەوان ئێمەیان بەجێنەهێشتووە نەلـەجاهیلی ونەلەئیـسلامدا))، ئەمـەیش وتەی جومهوری زانایانە کەئەوانە بەنو هاشم وبەنو عەبدولموتتەلیبن)) .[١]

١٥- کاتێك خـوای گـەورە بڕیـاری سەرخستنی ئایینەکـەی وپێغەمبەرەکەیـداو، مەککە فەتحکراو، حەجی ماڵئاوایی تەواو بوو، پێغەمبەرﷺ پێی خۆش بوو لـەدۆڵی بەنی کینانـە لابـدات، بـۆ ئـەوەی یـادی تـەنگی وچەوساندنەوەکەی بیرکەوێتـەوەو سوپاسی خوا بکات لەسەر نیعمەتەکانی، لەفەتحی مەزن و، چوونە ژوورەوەیـان بـۆ مەککـە_پـاش ئـەوەی کـەلێی دەرکـران_ئینجـا بـۆ ئـەوەی جـەخت بکاتـەوە سـەر کێشەی سەرکەوتنی هەق وبەرزبوونەوەی و،دەسەڵاتدانی خوای گەورە بۆ موسڵمانە خۆڕاگرەکان،[٢] لەئوسامەی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێبێـت، فەرموویـەتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا! لەکوێ لادەدەیت سبەینێ (لەکاتی حەجدا بوون) فـەرمووی: ((وهل ترك لنا عقيل منـزلاً)) واتـە: ئایـا عـەقیل جێگایـەکی بۆمـان بەجێهێـشتووە، ئینجا فەرمووی: ئێمە سبەی لەدۆڵی بەنی کینانە لادەدەین، لـەلای (المحـصّب) لـەو شـوێنەی کـەقوڕەیش سـوێندیان لەسـەر بێبـاوەڕی خـوارد، چـونکە بـەنی کینانـە هاوپەیمانێتی هەبوو لەگـەڵ قـوڕەیش دژ بـە بـەنی هاشـم، کەنـەکڕین وفرۆشـتنیان لەگەڵ بکەن ونەداڵدەیان بدەن .[٣]

---

١- تفسير ابن كثير ٣١٢/٢ .

٢- بڕوانە: الغرباء الاولون لا ١٤٩ .

٣- البخاري: كتاب الجهاد ١٨٠، باب اذا اسلم قوم في دار الحرب ٣/٤ ورقمه ٣٠٥٨ .

١٦- لەسەر هەموو گەلێکە لەهەموو کاتێکدا، کەبیەوێت شەرعی خوا بەجێبهێنێت، ئەگەری گەمارۆدان وپەیوەندی پچڕان چاوەڕوانی بکات لەلایەن خەڵکی بێباوەڕو لارووێرەوە، چونکە بێباوەڕان هەموویان یەك میللەتن، بۆیە پێویستە لەسەر سەرکردەکانی نەتەوەی ئیسلام خۆیان وشوێنکەوتوانیان ئامادەبکەن، بۆ وەها بارۆدۆخێك، هەروەها لەسەریانە چارەسەری گونجاو بدۆزنەوە ئەگەر ئەوە ڕوویدا، ئینجا بیریش بکەنەوە لە بەرگریکردنی ئابلۆقەکە بەجێگرەوەی گونجاو، بۆ ئەوەی موسڵمانان بتوانن بەرگری بکەن لەڕووی هەرجۆرێك لەجۆرەکانی گەمارۆدان .[1]

---

١- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية ٩٨ .

# بەشی چوارەم

# کۆچکردنی حەبەشەو، دەردەسەری تائیف و، بەخشینی ئیسراء

## باسی یەکەم: مامەڵەکردنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ سوننەتی کارکردن بەهۆکارەکان.

ئەم سوننەتە لەگەردووندا هەیە بەشێوەیەکی ئاشکرا، چونکە خوای گەورە بوونەوەری دروست کردووە بەدەسەڵاتی خۆی ویاسای وسوننەتەکانی تیادانـاوە، هەروەها ئەو شتانەی کەسەقامگیربوون وبەردەوام بوونی دەستەبەر دەکات، هۆ دروستکرەکانیش_لەپاش دەسەڵاتی خوای گەورە_بەسراون بەهۆکانەوە؛ بۆیە خوای گەورە زەوی ڕاگیر کردووە بەهۆی شاخەکانەوە، ڕووەکیش بەهۆی ئاوەوە دەڕوێنێ .

ئەگەر خوای گەورەیش بیەوێت. هەموو ئەو شتانە_بەدەسەڵاتی ڕەهای خۆی_پێویستیان نابێت بەهۆکان، بەڵام ویستی خوای گەورە بەو شێوە بووە، کەدەیەوێت ئاڕاستەی دروستکراوەکانی بکات بۆ پێویستی ڕەچاوکردنی ئەم سوننەتە، بۆ ئەوەی ژیان بەردەوام بێت بەو چەشنەی کە خۆی دەیەوێت، ئەگەر سوننەتی وەرگرتنی هۆکان بەئاشکرا دیارە لەگەردووندا، ئەوا بەهەمان شێوە بڕیاری لەسەر دراوە لەقورئاندا، لەهەموو کاروبارەکانی ژیان ودواڕۆژیاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ (التوبة:١٠٥) .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ﴾ (الملك:١٥) .

قورئانی پیرۆز ئاگادارمان دەکاتەوە کەخوای گەورە داوای کردووە لەخاتوو مەریەم کەکاربکات بەهۆکان لەسەختترین حاڵەتەکانی لاوازیدا، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا﴾ (مريم:٢٥) .

پێغەمبەری خوایشﷺ ئاگادارترین کەس بوو بەم مەسەلەیە، بۆیە کاتێك خەریکی دامەزراندنی دەوڵەت بوو، ئەوەی کەپێی دەکرا لەو بارەوە دەیکردو، هیچ شتێکی بەجێنەدەهێشت، هەرچەندە بچووکیش بوایە، ئینجا ئامۆژگاری هاوەڵانیشی دەکرد کار بەو سوننەتە خواییە بکەن لەکاروباری دونیاو دواڕۆژیاندا وەکو یەك .[1]

* **پشت بەستن بەخوای گەورە و وەرگرتنی هۆکان :**

پشت بەستن بەخوای گەورە ڕێگر نییە لەبەردەم کارکردن بەو سوننەتە، چونکە موسڵمانی خاوەن باوەڕ هۆکان وەردەگرێت لەڕووی باوەڕبوونی بەخوای گەورەو، گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی،بەڵام واناکات کەهۆکان سەر ئەنجامەکان دروست بکەن و پشتیان پێ ببەستێت .

ئەو کەسەی کەسەر ئەنجامەکان دادەهێنی_وەکو چۆن هۆکان دادەهێنێ_ قەدەری خوایە، هیچ پەیوەندییەکیش نییە لەنێوان هۆکارو سەرئەنجامدا لەهەستی ئیمانداردا، وەرگرتنی هۆکان پەرستنە بۆ خوای گەورە، بەدیهاتنی سەر ئەنجامیش قەدەرێکی خوایە جیا لەهۆکارەکە، تەنها خوای گەورەیش توانای لەسەر ئەوە هەیە، بەم شێوەیش هەستی کەسی ئیماندار ئازاد دەبێت لەپەرستنی هۆیەکان و پەیوەست بوون پێیانەوە، لەهەمان کاتدا بەدەسیشیان دەهێنێ بۆ ئەوەی پاداشتی خوا بەدەست بهێنێ .[2]

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کەپیاوێك هاتەلای پێغەمبەرﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، وشترەکەم ببەستمەوە ئینجا پشت بەخوا ببەستم، یان بەریدەم و

---

١– التمكين للامة الاسلامية لا ٢٤٨_٢٥٠ .

٢– في ظلال القران ١٤٧٦/٣ .

ئینجا پشت بەخوا ببەستم، چونکە وادیارە واحاڵی بوو بوو کەوەرگرتنی هۆکارەکان دژوارە لەگەڵ پشت بەستن بەخوا، پێغەمبەرﷺیش ئاراستەی کرد کەکارکردن بەهۆ مەسەلەیەکی پێویستە، ناکۆکیش نییە لەگەڵ پشت بەستن بەخوای گەورە، جاپێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((اعقلها وتوكل)) .[1] واتە: بیبەسەرەوەو ئینجا پشت بەخوا ببەستە .

کەواتە بەپێی ئەم فەرموودەیە ناکۆکی نییە لەنێوان کارکردن بەهۆکان وپشت بەستن بەخوای گەورە، عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت لەپێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ((لوانكم توكلتم على الله حق توكله لرزقكم كما يرزق الطير تغدو خماصاً وتروح بطانا)) .[2]

واتە: ئەگەر ئێوە بەڕاستی پشت بەخوا ببەستن، خوای گەورە ڕۆزیتان دەدا وەکو چۆن ڕۆزی باڵندەکان دەدا، بەبرسێتی دەردەچن وبەتێری دەگەڕێنەوە.

پێویستە لەسەر ئوممەتی ئیسلامیش ئەوە بزانێت کەوەرگرتنی هۆکان بۆ گەیشتن بەدەسەڵات پێویستە ئەنجام بدات، ئەوەیش بڕیارێکی خوای گەورەیەو سوننەتێکە دواناکەوێت، یەکێ لەنیشانەکانی بەزەیی خوای گەورەیش ئەوەیە کەداوای هیچی نەکردووە لەموسڵمانان لەسەرووی توانایانەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ (الانفال:٦٠) .

وەکو ئەوەیە خوای گەورە پێیان بفەرموێت: ئەو پەڕی تواناتان بەکاربهێنن، بالەتوانای دوژمنەکانتان کەمتریش بێت چونکە (الاستطاعة) لەئایەتەکەدا ئەو پەڕی توانای خۆتان دەگەیەنێت، لەدوای ئەوەیە دەکەوێتە سەر دەسەڵاتی خوای گەورە کەسنووری نییە، چونکە ئەنجامدانی ئەوەی لەئەو پەڕی توانادا هەیە بەڵگەیە

---

١- رواه الترمذي ٥٧٦/٤ كتاب صفة القيامة، باب ٦٠ ورقمه ٢٥١٧ وحسنه الالباني .

٢- رواه احمد في مسنده ٥٢/١ ورقمه ٣٧٠ وقال الشيخ احمد شاكر اسناده صحيح .

لەسەر دڵسۆزی، ئەوەش مەرجێکی پێویستە بۆ دابەزینی یارمەتی خوای گەورە .[١]

ئەمڕۆ بانگەواز ئاراستە دەکرێت بۆ جەماوەری ئوممەتی ئیسلامی، کەخۆیان دەرباز بکەن لەقۆناغی سستی ولاوازی، هەوڵی گەیشتن بدەن بەقۆناغی هێزو بنیاتنان،ماڵئاواییش بکەن لەخەون وئاواتەکان، ڕاشپەڕن بۆ کارکردن بەهۆکان، کەیارمەتیان دەدات لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی وبنیاتنانی شارستانی مرۆڤایەتی بۆ گەیشتن بەخوای گەورە .

---

١- الاسلام في خندق، مصطفى محمود ٦٤ .

## باسی دووەم: کۆچکردن بۆ حەبەشە

### یەکەم: کۆچکردنی یەکەم بۆ خاکی حەبەشە.

#### ١- هۆکارەکنی کۆچەکە:

بەڵاو مەینەت زیادیکرد لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، بێباوەڕانیش دەستیان کرد بەزیندانی کردن وئەشکەنجەدانیان، بەلێدان وبرسێتی و تێنوێتی، بەمەبەستی پاشگەزبوونەوە لەئایینەکەیان، هەندێکیان ئەشکەنجە کاری تێکرد بەڵام دڵی هەر ئاوەدان بوو بەئیمان، هەندێکیشیان لەئەو پەڕی هێزو پتەویدا بوون وخوایش پاراستنی، کاتێك پێغەمبەرﷺ بینی هاوەڵانی بەو شێوە ئەشکەنجە دەدرێن خۆیشی لەحاڵێکی باشدایە بەپاراستنی خوای گەورەو داڵدەی ئەبو تالیبی مامی، ئینجا توانایشی نەبوو بەرگرییان لێ بکات، فەرمووی: ((لوخرجتم الى ارض الحبشة، فان بها ملكاً لايظلم عنده احد، وهي ارض صدق حتى يجعل الله لكم فرجاً)).[١] واتە: باشتروایە بچنە وڵاتی حەبەشە، چونکە پادشایەکی تیایە کەس لەپەنایدا ستەمی لێناکرێت، وڵاتەکەیشی جێگای ڕاستگۆییە، لەوێ بن تاکو خوای گەورە گوشادیتان بۆ دەکاتەوە .

توێژەرەوەکان چەند هۆیەکیان باسکردووە لەمەڕ کۆچکردنی موسڵمانان بۆ حەبەشە، لەوانە:

#### * ئاشکرا بوونی ئیمان:

ئەوانەی کەدەهاتنە ناو ئیسلامەوە ژمارەیان لەزیادبووندا بوو، چونکە باوەڕهێنان ئاشکرا بوو بەشێوەیەك خەڵکی باسی دەکرد، زوهری لەفەرموودەکەی کەگێڕاوێتیەوە لەعوروە، سەبارەت بەهیجرەتی حەبەشە، دەڵێت: کاتێك موسڵمانان زۆر بوونەوە، باوەڕهێنان بەئیسلام بووە باسی نێو خەڵکی، بتپەرستەکان

---

١- الهجرة في القران الكريم، لاحزمي سامعون ٢٩٠ .

ڕووبەڕووی ئەوانە وەستاون کەباوەڕیان هێنا بەئیسلام، بەئەشکەنجەو زیندانی، دەیانەویست پاشگەزیان بکەنەوە لەئایینەکەیان، کاتێك پێغەمبەرﷺ ئەوەی بینی، بەئیمانداراني فەرموو: بەسەر زەویدا بلاوە بکەن، وتیان: بۆ کوێ بچین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بۆ ئەوێ وپەنجەی بەلای حەبەشەدا ڕاکێشا .[1]

## * هەڵهاتن بەئایین :

موسڵمانان هەڵدەهاتن بەئایینەکەیان، ئەوەش هۆیەك بوو لەهۆکانی کۆچ کردن بۆ حەبەشە، ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ((ئیتر هاوەلانی پێغەمبەرﷺ، دەرچوون بەرەو حەبەشە لەترسی ئەوەی بتپەرستان لەئایینەکەیان هەڵیاننەگێڕنەوە)).[2]

## * بلاوکردنەوەی بانگەواز لەدەرەوەی مەککە :

مامۆستا سەیید قوتب_ڕەحمەتی خوای لێبێت_پێی وایە کەپێغەمبەرﷺ بەدوای قاعیدەیەکدا دەگەڕا کەبانگەوازەکە بپارێزێت و ئازادی بۆدەستەبەر بکات و ، لەو بەستنە ڕزگاریان ببێت لەمەککەدا تووشی بوون بوون، هەروەها لەبەر پاراستنی موسڵمانان وئازادی بانگەوازکردن، مەسەلەش ئەوە نەبووەکە خۆیان ڕزگار بکەن وبەس، ئەگەر وابوایە دەبوو لاوازو بێ پشت وپەناکان کۆچیان بکردبا، بەلام خەڵکانێك لەنێو کۆچکەراندا بوون کەخاوەن عەشیرەت بوون وترسی ئەشکەنجە دانیان نەبوو...[3]

مامۆستا (منير الغضبان)یش هەمان بۆ چوونی هەیە ودەڵێت:

((ئەم بۆچوونە جوانە لەمامۆستا سەییدەوە ڕەحمەتی خوای لێبێت زۆر پەسەندەو بەڵگەدارە، یەکێ لەو بەڵگانە مانەوەی بارودۆخی کوچبەرانی حەبەشەیە وەکو خۆی، چونکە نەمانزانیوە پێغەمبەرﷺ ناردبێتی بەدوایاندا، تاکاتی بەسەرچوونی کۆچی یەسریب وبەدروئوحودوخەندەقوحودەیبیە،ویەسریب ماوەی

---

١- المغازي النبوية، للزهري، تحقيق: سهيل زكار ٩٦ .
٢- السيرة النبوية لابن هشام ٣٩٨/١ .
٣- في ظلال القرآن ٢٩/١ .

پێنج ساڵ جێگای مەترسی ئەوە بوو قورەیش هێرشی بکات سەرەڕای ئەوەیکەم هێرشی قەرەیشیش لە شەڕی خەندەقدابوو، تائەو کاتەی کەپێغەمبەرﷺ قاعیدەیەکی دروست کرد بۆ موسڵمانانومەترسی نەما لەسەر یەسریب، پاشان پێغەمبەرﷺ ناردی بەدوایاندا، چونکە هیچ پێویستیەکی بەو قاعیدەیەدەگەیە نەما، کەدەکرا پێغەمبەرﷺ پەنای بۆ ببردایە، ئەگەر مەدینەش بکەوتایەتە دەستی دوژمن .[١]

هەروەها مامۆستا (محمد عزة دروزة) پێی وایە کەبوارکردنەوە بۆ بانگەواز هۆیەك بوو لەهۆکانی کۆچ کردن بۆ حەبەشەو، دەڵێت: ((بەزەیندا دێت کەیەکێك لەهۆکانی هەڵبژاردنی حەبەشەی نەصرانی هیوای دۆزینەوەی بوارێك بێت بۆ بانگەواز، هەروەها هەڵبژاردنی جەعفەر ئامانجەکەی پەیوەندی هەبێت بەم ئاواتەوە)) [٢] دکتۆر (سلیمان بن حمد العودة) هەمان بۆ چوونی هەیە بەبەڵگەی موسڵمان بوونی نەجاشی و چەند کەسێکی تر لەگەڵیدا لەخەڵکی حەبەشە، بەڵکو فەرموودەیەکی لەئیمامی بوخاری هێناوە: کەجەعفەر بەئەشعەرییەکانی وتووە: ((ئێمە پێغەمبەری خوا ناردومانێتی بۆ ئێرە، فەرمانیشی پێکردوین لێرە بمێنینەوە جائێوەش لەگەڵمان بن)) [٣] ئەمەش وادەگەیەنێ کەبۆ ئەرکێکی دیاریکراو چوونە، ئەرکیش نییە لەبانگەواز مەزنتر، ئەو ئەرکەیش بەناردنە شوێنیان لەلایەن پێغەمبەرﷺ کۆتایی پێهات .[٤]

## * گەڕان بەدوای جێگایەکی بێ مەترسی بۆ موسڵمانان :

نەخشەی ئەمنی پێغەمبەرﷺ ئامانجی پاراستنی پالفتەی موسڵمانان بوو، بۆیە پێغەمبەرﷺ وایدانا کەحەبەشە جێگای بێ مەترسییە، تاکو ئیسلام خۆی دەگرێتەوەو گەردەلولەکە دەنیشێتەوە، لەڕاستیدا کۆچکردووەکان لەسەر خاکی حەبەشە لەئاسایش دا بوون، لەو بارەوە ئوممو سەلەمە ڕەزای خوای لێبێت

---

١- المنهج الحركي للسيرة النبوية ٦٧/١، ٦٨ .

٢- سيرة الرسولﷺ ٢٦٥/١ عن الشامي ١١١ .

٣- الصحيح مع الفتح ٢٣٧/٦ .

٤- بڕوانە: الهجرة الاولى في الاسلام، د.سلمان العودة ٣٤ .

دەڵێت: کاتێك چووینە حەبەشە لەپەنای باشترین دراوسێدا بووین کە نەجاشی بوو، دڵنیا بووین لەسەر ئاییینمان وخوامان دەپەرست وکەس ئازاری نەدەداین....[١]

**٢- بۆچی پێغەمبەرﷺ حەبەشەی هەڵبژارد؟**

چەند هۆیەك هەیە یارمەتی توێژەر دەدات بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، لەوانە:

أ- نەجاشی دادپەروەر ب- نەجاشی پیاوچاك

لەپێغەمبەرﷺ هاتووە کەستایشی پادشای حەبەشەی کردووە وفەرموویەتی: ((وکان بالحبشة ملك صالح يقال له النجاشي، لايظلم احد بارضه))[٢] واتە: لەحەبەشە پادشایەکی چاك هەبوو نەجاشی پێدەوترا، کەس لەخاکی ئەودا ستەمی لێ نەدەکرا . ئەو بەخوا پەرست وپیاو باش دەناسرا[٣]، چاکیشی لەوە دەرکەوت کە موسڵمانانی دەپاراست، کاتێکیش قورئانی بیست لەجەعفەرەوە وکاری تێکرد، چونکە ئەو بیرو باوەڕێکی ڕاستی هەبوو دەربارەی عیسا هەروەها فەرموودەی (قد توفيّ اليوم رجل صالح من الحبشة فهلّم فصلّوا عليه) رواه البخاري ومسلم.

ج- حەبەشە شوێنی بازرگانی قوڕەیشە:

حەبەشە ناوەندێکی بازرگانی بوو، هەندێ لە موسڵمانانیش دەیانناسی بەهۆی بازرگانییەوە، یان لەلایەن کەسانێکەوە کەدەچوون بۆ ئەوێ زانیارییان وەردەگرت، تەبەری دەڵێت: حەبەشە جێگای بازرگانی قوڕەیش بوو، چونکە ئاسایش وڕۆزی فراوانی تیادا بوو،...[٤]

د- حەبەشە وڵاتە ئارامەکە:

لەدەرەوەی دورگە وڵاتێك نەبوو لەحەبەشە ئارامتر، ئاشکراشە دووری حەبەشە لەزەبروزەنگی قوڕەیش لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە شوێنکەوتووی قوڕیش نییە

---

١- بڕوانە: الهجرة الاولى في الاسلام، د.سلمان العودة ٣٤ .

٢- السيرة النبوية لابن هشام تحقيق همام ابو صعليك ٤١٣/١ .

٣- بڕوانە: تاريخ الامم والملوك للطبري ٣٢٨/٢ .

٤- مغازي رسول اللهﷺ لعروة بن زبير ١٠٤ .

وەك شوێنانی تر، لەفەرموودەکەی ئیبنو ئیسحاقیشدا هاتووە، کە هۆی هەڵبژاردنی حەبەشە وەك جێگایەك بۆ کۆچکردن بریتـی بـوو لـە وەی کـە: وڵاتێکـە ڕاسـتگۆیی تیادا بڵاوە، پادشایەکی تیایە دادپەروەرە[١]، ئەمانـەش گـرنگترین چاکێکانی وڵاتـی ئارامە .[٢]

هـ- خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بۆ حەبەشە وشارەزایی تیایدا :

لەفـەرموودەی زوهریـدا هـاتووە کەحەبەشـە خۆشەویـسترین وڵات بـوو بـەلای پێغەمبەرەوەﷺ، بۆ ئەوەی کۆچ بکات بۆی [٣] ئەو خۆشەویستیەش هەندێ هۆکاری هەن لەوانە :

- دادپەروەری نەجاشی

- حەبەشیەکان مەسیحی بوون، واتە لەبتپەرستەکان نزیکتربوون بۆ موسڵمانان.

- پێغەمبەرﷺ شارەزایی هەواڵەکانی حەبەشـە بـوو لەڕێگـەی ئوممـو ئەیمـەنی دایـەنی ڕەزای خـوای لێبێـت، ئـەم ئوممـو ئەیمەنـەش جێگیربـووە لەصـەحیحی موسلیمدا کەخەڵکی حەبەشە بووە، هەروەها پێغەمبەرﷺ ئاگاداربووە لەسروشت وباروذۆخی ئەو دەوڵەتەی کەلەسەردەمی خۆیدا بووە .

**٣- کاتی دەرچوونی کۆچەرەکان، بەنهێنی دەرچوون وگەیشتنیان:**

هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەمەککە دەرچوون، لەڕەجـەبی سـاڵی پێنجـەمی ڕەوانـە کردنی پێغەمبەرﷺ، دەپیاوو چوار ئافرەت بوون، دەشـیگێڕنەوە کـەپێنج ئـافرەت بوونـە، قورەیـشیەکانیش هەوڵیانـدا فریایانکـەون وبیانگێڕنـەوە بـۆ مەککـە، بەدوایشیاندا ڕۆیـشتن تاگەیـشتنە دەریـا، بـەلام موسـڵمانان ئـەو کاتـە لـەدەریاوە بەڕێکەوتبوون .[٤]

---

١- بڕوانە: هجرة الرسول واصحابه في القران والسنة، احمد الجمل ٩٧ .

٢- السيرة النبوية لابن هشام ١/٣٩٧ .

٣- مغازي الزهري لا ٩٦ .

٤- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم، احزمي سامعون ٢٩٠، ٢٩١ .

کاتێك ورد دەبیتەوە ڕیوایەتەکان، نهێنی کۆچەرەکانمان بۆ دەردەکەوێت، لەڕیوایەتی واقیدی دا هاتووە: ((ئینجا بەنهێنی دزەیان کردوو دەرچوون)) [١] تەبەریش لەئەو هەمان هەواڵی باسکردووە [٢] هەروەها (ابن سید الناس) [٣] و(ابن القیم) [٤] و(الزرقانی) [٥] بەهەمان شێوە، کاتێك موسڵمانەکان گەیشتنە حەبەشە نەجاشی ڕێزی لێگرتن وپێشوازی جوانی لێکردن، هەستیان بەئارامی وئاسایشێك کرد لەوێ، لەوڵاتەکەی خۆیان هەستیان پێنەدەکرد . [٦]

ئەگەر بێت وسرنجێکی ناوی ئەو هاوەڵانە بدەین کەکۆچیان کردووە، ناوی ئەو کەسانەی تیانابینین کەبەئەشکەنجەی قورەیشەوە دەچەوسانەوە وەکو بیلال و، خەبباب و، عەممار، ڕەزای خوایان لێبێت، بەڵکو زۆربەیان بریتی بوون لەکەسانی خاوەن نەسەب وپلەو پایە لەقورەیشدا، ژمارەیەکیش لەهۆزەکان دەنوێنن، بەڵێ ئەشکەنجە گەیشتە ئەوانیش، بەڵام لەسەر مەوالییەکان سەختتربوو، لەدەوروبەرێکدا کەبایەخی دەدایە هۆزایەتی ورەچەڵەك، بۆیە ئەگەر هەڵهاتن تەنها لەبەر ئەشکەنجە بوایە، لەو حاڵەتە چەوساوەکان مافدارتر دەبوون بەکۆچکردن، ئەوەش پشتگیری دەکات لەئەم ڕاستیە ئەوەیە کەئیبنو ئیسحاق وکەسانی تر باسی دژایەتی بتپەرستەکانیان کردووە بۆ هاوەڵە چەوساوەکان، بەڵام باسی کۆچکردنیان نەکردووە بۆ حەبەشە . [٧]

لەم حالەتەدا توێژەر دەگەیەتە ڕاستیەکی گرنگ ئەویش ئەوەیە هەندێ هۆی تر هەیە جگە لەئازارو ئەشکەنجە لەدوای کۆچکردن، پێغەمبەرﷺ جۆرێکی لەهاوەڵان بۆ هەڵبژارد، کەچەند هۆزێکیان نوێنەرایەتی دەکرد، لەوانەشە ئەوە کاریگەری هەبووبێت لەسەر پارێزگاریکردنیان، ئەگەر لەحاڵەتێکدا قورەیش خەڵکی

---

١- طبقات ابن سعد ١/٢٠٤ .
٢- تاریخ الطبری ٢/٣٢٩ .
٣- عیون الاثر ١/١١٦ .
٤- زاد المعاد ٣/٢٣ .
٥- شرح المواهب ١/٢٧١ .
٦- البدایة والنهایة ٣/٩٦_٩٧، سیرة ابن هشام ١/٣٤٤_٣٥٢ .
٧- الانساب للبلاذري ١/١٥٦_١٩٨، ابن هشام ١/٣٩٢_٣٩٦ .

حەبەشـــەیان قایــل بکردایــە بەگێڕانـــەوەیان لەلایەکــەوە، لەلایــەکی تریــشەوە کۆچکردنیان هۆزەکانی قوڕەیش هـەمووی یـان زۆربـەی دەهـەژێنێت، واتـە مەککـە جێگەی ڕۆڵەکانی تیانەماوەو ناچار بوونە کەلێی دەرچن وبەدوای شوێنێکی ئارامـدا بگـەڕێن، ئینجـا لەلایـەکی تریـشەوە ئەوانـە کۆچـدەکەن بـۆ ئـەوەی ئـایینی خـوا بڵاوبکەنـــەوە لەهــــەموو لایـــەك، لەوانـــەش جێگـــای چـــاکتریان دەســـتکەوێت بـــۆ بڵاوکردنەوەی [1] لـەپاش سـێ مـانگ لـەو کۆچـکردنە، گۆڕانکارییـەکی گـەورە ڕویـدا لەژیانی موسڵمانانـدا، هەندێ بارودۆخ هاتە کایەوە پێشتر نەبوو، کـەهیوای بەخـشی بەموسـڵمانان ئایینەکـەیان بڵاوبکەنـەوە، چـونکە لـەو ماوەیـەدا حـەمزەی مـامی پێغەمبەرﷺ موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند وەکـو خزمایـەتی، بـەڵام دواتـر خـوای گەورە دڵی ئەوی شاد کـرد بەئیسلام ولەسـەری جـێگیر بـوو، حـەمزە جـوامێرترین گەنجەکانی قوڕەیش بووە کاتێك هاتە ناو ئیسلامەوە، قـوڕەیش دڵنیـابوون لـەوەی پێغەمبەرﷺ پارێزەری چاکی بۆ دروست بوو، بۆیـە ئـەوانیش قـسەکردنیان لـەدژی کەم کردەوە [2] ئینجا لەپاش موسـڵمان بـوون حـەمزە، عومـەری کـوڕی خـەتتابیش موسـڵمان بـوو، عومـەر ڕەزای خـوای لێبێـت پیـاوێکی دلێـرو شـکۆدار بـوو، ئـیتر موسڵمانان بەو دوو کەسە سەر بەرزبوون ولەدژی قوڕەیش ڕادەوەستان.[3]

موسڵمان بوونی ئەم دووکەسە لەپاش دەرچوونی موسڵمانان بـوو بـۆ حەبەشـە، بێگومـان مایـەی سـەربەرزی بـوو بـۆ سـەرجەم موسـڵمانان وپـەژارەش بـوو بـۆ بتپەرستەکان، بێجگە لەوەی هانی هاوەڵانیدا بۆ باسکردنی بیروباوەڕیان بەئاشکرا.

ئیبنـــو مەســـعود دەفـــەرموێت: ((موســـڵمان بـــوونی عومـــەر فـــەتح بـــوو ، کۆچکردنیشی سەرکەوتن بوو، فەرمانڕەوایەتیشی سۆزو بەزەیی بوو، ئێمە هـەرگیز نەماندەتوانی لـەپاڵ کەعبـەدا نوێـژ بکـەین تاعومـەر موسـڵمان بـوو، لـەدوای ئـەوە لەگەڵ بتپەرستان شـەڕی کـرد تـاکو لـەلای کەعبـە نوێـژی کـرد وئێمـەیش لەگـەڵی نوێژمان کرد)) [4]

---

١- بڕوانە: الهجرة الاولى في الاسلام ٣٧ .

٢- مختصر سيرة الرسولﷺ، محمد بن عبدالوهاب ٩٠ .

٣- السيرة النبوية ١/٢٩٤ .

٤- السيرة النبوية لابن هشام ١/٣٦٥ .

هەروەها لەئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە کەدەفەرموویت: ((کاتێک عومەر موسڵمان بوو وتی: کێ لەقورەیشدا زوو قسە دەگوێزێتەوە؟ پێیان وت: جەمیلی کوڕی مەعمەری جومەحی، وتی: ئەویش چووە لای وعەبدوڵلا دەڵێت منیش لە شوێنی ڕۆیشتم بزانە چی دەکات؟ وتی: ئەی جەمیل ئایا نەتزانیوە من موسڵمان بووم وچوومە ئاینی موحەممەدەوە؟ وتی: سوێند بەخوا یەکسەر لە جێگاکەی خۆی هەڵساو عومەریش بەدوایدا ڕۆیشت، منیش بەدوای باوکم دا ڕۆیشتم، کەجەمیل گەیشتە دەرگای مزگەوتەکە بەدەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی قورەیش؛ چاك بزانن عومەری کوڕی خەتتاب لەئاینی خۆی هەڵگەڕایەوە، عومەریش لەپشتیەوە دەیوت: درۆ دەکات بەڵکو من موسڵمان بووم و شایەتمانم هێنا، ئەوانیش هەڵچوون لەدژی دەستیان کرد بەشەڕ کردن، تاکو خۆر لەسەر سەریان وەستا، ئینجا باوکم ماندوو بوو و، دانیشت، ئەوانیش لەسەری ڕاوەستان، باوکم دەیوت: هەرچیتان پێ دەکرێ بیکەن....)) کەواتە موسڵمانان گەیشتنە حاڵەتێکی جیاواز لەوەی تیایدا بوون لەپێش هیجرەت بۆ حەبەشە، تەنانەت وایان لێهات لەلای کەعبە نوێژیان دەکردو بەئاشکرا لەماڵی ئەرقەم دەرچوون وتاکو چوونە ناو مزگەوتەکەوە وقورەیشیش وەکو پێشوو نەیاندەتوانی دڕندانە ئەشکەنجەیان بدەن، واتە بارودۆخەکە بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕا، ئایا ئەم ڕاستیە لەکەس شاراوە بوو؟ ئایا ئەم هەواڵانە نەگەیشتە حەبەشە لەڕێگەی دەریاوانەکانەوە کەبەلای جوددەدا تێدەپەڕین؟ بێگومان هەواڵیان زانیوە، بێگومان ئەوانیش زۆر پێخۆشحاڵ بوونە بەو هەواڵانەی مەککە، بێگومان سۆزیانیش جوڵاوە بۆ وڵاتەکەیان، بۆ مەککە، کەکەس وخزم وعەشیرەتیان لەوێیە، ئیتر گەڕانەوە بۆ مەککە لەسایەی ئەو بارودۆخە تازەیەدا ...[١]

کۆچکەرەکان گەڕانەوە بۆ مەککە، بەهۆی موسڵمان بوونی حەمزەو عومەرو، باوەڕیشیان وابوو کەئیتر ئیسلام بەوان سەربەرزو بەهێزدەبێت .

---

١- تاملات في سيرة الرسولﷺ لمحمد سيد الوكيل ٥٩، الهجرة في القران الكريم ٣٠٢ .

بەڵام قورەیش ڕووبەڕووی موسڵمان بوونی ئەو دووکەسە ڕاوەستان وەهەندێ پیلانی تازەیان بەکارهێنا، هاوکات توندوتیژیشیان هەر بەکار دەهێنا، چەکێکی نوێیان زیاد کرد لەسەر چەکەکانی تر، ئەویش پەوەندی پچڕاندنی ئابووری بوو_کەپێشتر باسمان کرد_ لەئەنجامی ئەم هەڵوێستە توندەیشدا موسڵمانان جارێکی تر گەڕانەوە بۆ حەبەشە، ژمارەیەکی زۆریش لەهاوەڵان لەگەڵیان ڕۆیشتن کەپێشتر کۆچیان نەکردبوو.[1]

## دووەم: کۆچی دووەمی موسڵمانان بۆ حەبەشە.

ئیبنو سەعد دەڵێت: وتیان: کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەکۆچی یەکەم گەڕانەوە بۆ مەککە، خزم وعەشیرەتەکانیان ناشیرین پێشوازییان لێکردن و چەرمەسەری زۆریان لێیان بینی، بۆیە پێغەمبەرﷺ ڕێگەی دان جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ حەبەشە، لەم دەرچوونەی دووەمیاندا تووشی ناخۆشی زۆر بوون و، قورەیش زەبرو زەنگیان لەگەڵیاندا بەکارهێنا بەهۆی ئەو هەواڵانەی کەباسی لەڕێزگرتنی نەجاشی دەکرد لەئەو هاوەڵانە، عوسمانی کوڕی عەففان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە کۆچی دووەممانەو هەرتۆ لەگەڵمان نیت، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ((انتم مهاجرون الى الله والىّ لكم هاتان الهجرتان جميعاً)) واتە: ئێوە کۆچتان کردووە بۆ لای خواو بۆ لای من بەڵام هەردوو کۆچەکە هەر بۆ ئێوەیە، ئینجا عوسمان وتی: کەواتە ئەوە بەسمانە ئەی پێغەمبەری خوا.[2]

کەسانێکی تریش کەژمارەیان لەخۆیان زۆرتر بوون لەگەڵیان کۆچیان کرد، ژمارەشیان وەکو ئیبنو ئیسحاق وکەسانی تر وتوویانە، هەشتاو سێ کەس بوون ئەگەر عەمماری کوڕی یاسریان لەگەڵ بووبێت، ئەگەر ناهەشتاو دوو کەس بوونە، سوهەیلی دەڵێت: ئەم هەواڵەیش ڕاستترە بەلای نووسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ وەکو واقیدی وئیبنو عوقبەو کەسانی تر[3] هەژدە ئافرەتیشیان لەگەڵدابوون،

---

١- بڕوانە: القول المبين في سيرة سيد المرسلين، د. محمد النجار ١١١، الهجرة في القرآن الكريم ٣٠٢.

٢- طبقات ابن سعد ٢٠٧/١ ط.بيروت الهجرة في القران الكريم لا ٣٠٣.

٣- بڕوانە: الروض الانف للسهيلي ٢٢٨/٣.

یانزەیان قورەیشی بوون، ئەمە جگە لەمناڵەکانیان کەلەگەڵیاندا بوون و، ئەو مناڵانەش لەوێ لەدایك دەبوون .[١]

**١- هەوڵدانی قورەیش لەلای نەجاشی بۆ گێڕانەوەی کۆچەرەکان:**

کاتێك قورەیش بینیان هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەئارامید دەژیان لەحەبەشەو، مامەڵەی باشیان لەگەڵ دەکرا، لەنێو خۆیاندا پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە نێردەیەك بنێرنە لای نەجاشی بەڵکو ئەو موسڵمانانە بگێڕنەوە بۆ مەککە، دوای ئەوەی کەپادشای حەبەشیان لێ بوروژێنن، بەڵام ئەو نێردەیە خزمەتی ئیسلام وموسڵمانیان کرد بێ ئەوەی بزانن، چونکە ئەم پیلانەیان بووە مایەی وتووێژێکی ئامانجدار لەنێوان یەکێك لەکۆچەرەکان کەجەعفەری کوڕی ئەبو تالیب بوو، لەگەڵ پادشای حەبەشە، کەلەئەنجامی ئەم ئاخاوتنەدا موسڵمان بوو،[٢]

لەئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەرﷺ هاتووە کەفەرموویەتی: کاتێك گەیشتینە حەبەشە لەپەنای باشترین دراوسێ دا بوون کەنەجاشی بوو، دڵنیابووین لەسەر ئایینەکەمان و، خوای گەورەمان دەپەرست و، کەس ئازاری نەدەداین، کاتێك قورەیش بەمەیان زانی، بڕیاری ناردنی دووکەسی بەتواناییاندا بۆ لای نەجاشی، باشترین دیاریش لەگەڵ خۆیان ببەن بۆی، نەجاشی خۆیشی حەزی لەپێستی خۆشە کراو دەکرد، ئەوانیش زۆریان بۆ هێنا لەو جۆرە پێستەو، دیاریشیان هێنا بۆ هەموو دارو دەسەکەی، نێردەکە بریتی بوون لەعەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعەی کوڕی موغیرەی مەخزومی لەگەڵ، عەمری کوڕی عاصی کوڕی وائیلی سەهمی وپێیانیان وت: پێش ئەوەی قسە لەگەڵ نەجاشی بکەن دیاری بدەن بەهەموو دارو دەستەکانی، کاتێك ئەوان هاتن ئێمە لەچاکترین حاڵدا بووین، ئەوان بەهەموو کەسێکیان دەوت لەیارمەتیدەرانی نەجاشی کەئەمانە خەڵکانێکی گەمژەن لەئایینەکەمان دەرچوونەو هاتوونەتە لای ئێوە وئایینی ئێوەشیان پێ باش نییە، ئێمەیش نێردەی سەرانی کەسەکانی ئەوانین بۆلای پادشا، بۆ ئەوەی بیانگێڕینەوە،

---

١- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٣٠٣ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم لا ٤٠٤ .

جائەگەر قسەمان لەگەڵ پادشا کرد لەو بارەوە، ئێوەیش هانی بدەن بیانگێڕێتەوە چونکە کەس وخزمەکانی خۆیان ئەوان باشتر دەناسن، ئەوانیش وتیان: بەڵێ باشە . ئینجا دیارییەکانیان دایە نەجاشی وقبوڵی کرد لێیان، ئینجا قسەیان لەگەڵ کردوو وتیان: ئەی پادشا، هەندێك لەلاوە نادانەکانمان هاتوونەتە وڵاتەکەت، لەئایینی میللەتەکەیان هەڵگەڕاونەتەوە، نەهاتوونەتە ئایینی تۆیشەوە، ئاینێکی داهێنراویان هێناوە نەئێمەو نەتۆ نایناسین، ئێمەیش نێردەی سەرانی کەس وعەشیرەتی ئەوانین لەباوك ومامەکانیان، بۆ ئەوەی بیانگێڕیتەوە لەگەڵمان، چونکە ئەوان چاکتریان دەناسن وشارەزاترن لەو شتانەی ئەمانە بەخراپی دەزانن .

دەڵێت: عەبدوڵڵاو عەمر زۆریان پێناخۆش بوو نەجاشی گوێ لەقسەی ئەوان بگرێت، یاریدەدەرەکانی وتیان: ڕاست دەکەن ئەی پادشا، میللەتەکەیان باش دەیانناسن، بیاندەبە دەستیانەوە بابیانبەنەوە .

دەڵێت: نەجاشی توڕە بوو وتی: نەبەخوا هەرگیز نایاندەم بەدەستیانەوە، ئەوانە منیان هەڵبژاردووە لەوڵاتەکەم بژین، بەڵام بانگیان دەکەم وپرسیاریان لێ دەکەم، ئەگەر وابوون، دەیانگەڕێنمەوە لای کەسەکانیان، ئەگەریش وانەبوون، هەر چاکەیان لەگەڵ دەکەم هەرچەنێك حەزبکەن لەلام بمێننەوە .[١]

**٢- ئاخاوتنی نێوان جەعفەرو نەجاشی:**

ئینجا نەجاشی ناردی بەشوێن هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، کاتێك نێردەی نەجاشی هاتە لایان کۆبوونەوەو بەیەکیان وت چی بڵێین، وتیان هەرچی پێغەمبەرﷺ فێری کردووین ئەوە دەڵێین، ئینجا نەجاشی ناردی بەدوای زاناکانی ئایینەکەیدا، ئەوانیش ئینجیلەکانیان هێناو کردیانەوە، نەجاشی پرسیاری کرد ئەم ئایینە چییە کەخۆیان پێ جیاکردووەتەوە لەمیللەتەکەتان و، نایەنە ئایینەکەی منیشەوەو، هیچ ئاینێکی تر .

دەڵێت: ئیتر جەعفەر وەڵامی دایەوەو، وتی: ئەی پادشا، ئێمە خەڵکانێکی نەفام بووین، بتمان دەپەرست، مردارەوە بوومان دەخوارد، خراپەمان دەکرد، پەیوەندی

---

١- اخرجه احمد ٥/٢٩٠، ورقمه ٢٢٤٩٨ اسناده صحيح اوحسن .

خزمایەتیمان دەبڕیەوە، بۆ دراوسێ خراپ بووین، بەهێز بێ هێزی دەخوارد لە ناوماندا، ئێمە بەو شێوە بووین، تاکو خوای گەورە پێغەمبەرێکی لەخۆمان نارد نەسەب وڕاستگۆیی شارەزاین، هەروەها دەسپاکی وداوێنپاکی، بانگەوازی ئێمەی کرد بۆ ئەوەی یەك خوا بناسین و بپەرستین، پەرستراوەکانی تریش واز لێبهێنین وەکو بەردودار، ئینجا فەرمانی پێکردین بەڕاستگۆیی لەقسەکردنداو، ئەسپەردە پاراستن و، پەیوەندی خزمایەتی بەجێهێنان و، چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ و، خۆپاراستن لەقەدەغەکراوەکان وخوێن و هەموو خراپەیەك وەکو درۆو ماڵی هەتیو خواردن وبوختان کردن و، فەرمانی پێکردین تەنها وتەنها خوای گەورە بپەرستین و هاوبەشی بۆ بڕیارنەدین، هەروەها فەرمانیشی پێکردین بە نوێژو زەکات وڕۆژوو .

دەڵێت: دوای ئەوە کارو ئەرکەکانی ئیسلامی بۆ ژمارد وتی: ئێمەیش باوەڕمان پێکردو شوێنی کەوتین، بەڵام میللەتەکەمان ئەشکەنجەیان داین وهاتن لەئایینەکەمان بمانگێڕنەوە بۆ بتپەرستی، کاتێك کەزۆریان لێکردین وئازاریان داین و ڕێگەی دینداریان لێگرتین دەرچووین بۆ وڵاتەکەت وتۆیشمان لەهەموو کەسێك پێباشتر بوو، ئومێدیشمان وابوو ستەممان لێنەکرێت لەلات .

نەجاشی پێی وت: هیچ شتێکت پێ یە لەوانەی کەهێناویێتی؟ وتی: بەڵێ ئینجا دەستی کرد بە خوێندنەوەی سەرەتایی سورەتی مەریەم، جانەجاشی دەستی کردەگریان تاریشی تەڕ بوو، زاناکانیش هەر دەستیان کرد بەگریان، ئینجا نەجاشی وتی: ئەمەو ئەوەی موساو تووییەتی لەیەك چراوە دەردەچن، بڕۆن ئازادبن، سوێند بەخوا هەرگیز ناتاندەم بەدەستیانەوە .

**٣- هەوڵێکی تر بۆ ئاژاوەگێڕان لەنێوان موهاجیران ونەجاشیدا :**

ئوممو سەلەمە دەڵێت: کاتێك عەمری کوڕی عاص وعەبدللای کوڕی ئەبی ڕەبیعە لەلای نەجاشی دەرچوون، عەمر وتی: بەخوا سبەی دەبێت عەیبەیان باس بکەم و بەجارێك لەناویان ببەم [١] بەڵام عەبدوللا_لەعەمر لەخواترس تر بوو_ وتی: ئەو کارە مەکە، ئەوانە هەرچۆنێك بن هەرخزمن. وتی: سوێند بەخوا سبەی دەڵێم ئەوان

---

١- الهجرة في القران الكريم ٣٠٧ .

بەعیسا دەڵێن بەندەیە، بەڕۆژی دواییدا ڕۆیشت و وتی ئەی پاشا ئەمانە قسەیەکی زۆر گەورە دەکەن دەربارەی عیسا، ئەویش ناردی بەدوایانداو ئەوانیش لەنێو خۆیاندا وتیان: ئەگەر پرسیاری عیسای کرد چۆن وەڵامی دەدەنەوە؟ وتیان: ئەوەی کەخوای گەورە وپێغەمبەرەکەی فەرموویانە ئەوە دەڵێین .

نەجاشی پرسیاری لێ کردن: چی دەڵێن دەربارەی عیسا؟ جەعفەری وتی ئەوە دەڵێین کە خوای گەورە فەرموویەتی: بەندەو ڕەوانە کراوو ڕوحی خوایە، وشەیەکیشە دایەتی بەسەر مەریەمی عازەبی بێ نیاز لەپیاواندا .

دەڵێت: ئینجا نەجاشی چیلکەیەکی لەزەوی هەڵگرت وتی: ئەوەی عیسا وتوویەتی ئەوەندەی ئەو چیلکەیە جیاوازی نییە لەگەڵ ئەم قسانەدا، لەم کاتەدا زاناکان بەیەکدا دەهاتن وتوڕە بوون، بەڵام نەجاشی وتی: بڕۆن ئازادبن لەسەر خاکی من، کەسێك قسەتان پێبکات زیانانەی لێوەردەگیردرێت، حەز ناکەم شاخێکم هەبێت لەئاڵتون ویەکێکم لەئەوانە ئازار بدایە، دیارییەکانیان بۆ بگێڕنەوە، پێویستیمان پێیان نییە، خوای گەورە بەرتیلی لێم وەرنەگرت کاتێك موڵکەکەی بۆ گەڕاندمەوە، تاکو منیش وەریبگرم، خەڵکیش گوێڕایەڵی من نەبوونە تاکو گوێڕایەڵی ئەوان بم، ئیتر بەڕوو زەردی دەرچوون وئێمەیش هەر ماینەوە لەحەبەشە لەباشترین بارودۆخدا .[١]

## ٤- موسڵمان بوونی نەجاشی :

نەجاشی موسڵمان بوو، باوەڕیشی هێنا بەپێغەمبەرایەتی موحوممەدﷺ، ئەگەر چی ئەوەی لەمیللەتەکەی شاردەوە، بەهۆی شارەزایی لەجێگیربوونی ئەوان لەسەر ناهەق وسوربوونیان لەسەر گومڕایی ومانەوەیان لەسەر بیروباوەڕ لارەکانیان...[٢]

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێ هاتووە: ((کەپێغەمبەرﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی گەیاندووە لەو ڕۆژەی کەتیایدا لەدنیا دەرچووە، موسڵمانانیشی دەرکرد بۆ نوێژگا وڕیزیکردن وچوار جار (الله اکبر)ی لەسەر کرد))[١]

---

١- مسند الامام أحمد ورجاله رجال الصحيح، وحسن اسناده محققاً طبقة مؤسسة الرسالة ورقمه ١٧٤٠ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٣٠٩ .

هەروەها لەجابیرەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی: کاتێك نەجاشی لەدونیا دەرچوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((مات اليوم رجل صالح فقوموا فصلوا على اخيكم اصحمة)) [٢] واتە: ئەمڕۆ پیاو چاکێك مرد، بۆیە هەڵسن بانوێژی جەنازەبکەین لەسەر ئەصحەمەی براتان. [٣]

**وانەو پەندو سوودەکان :**

١- سەقامگیربوونی ئیمانداران لەسەر بیرو باوەڕیان، لەپاش چەشتنیان بۆ سزاو چەوساندنەوەی هەمە جۆر، بەڵگەیە لەسەر ڕاستێتی ئیمانەکەیان و، دڵسۆزییان تیایداو، بەرزی دەرون وگیانیان، بەشێوەیەك کەلەویژدان ئاسوودەیی ودڵدامەزراندا بوون، چاوەڕوانی ڕەزامەندی خوای گەورەش بوون، ئەوانە بەلایانەوە مەزنتر بوو لەئەشکەنجەو چەوساندنەوە، چونکە خۆڕاگری لەلای خاوەن باوەڕان وبانگخوازە دڵسۆزەکاندا، هەمیشە بۆ گیانیانە نەك جەستەیان، هەمیشە لەهەوڵی داواکاری گیانیاندان نەوەك جەستەیان، بەم شێوەیش بانگەوازەکان سەردەکەون و، جەماوەر ڕزگاریان دەبێت لەتاریکی ونەفامی. [٤]

٢- لەم کۆچکردنە مەزنەدا، تێبینی دەکرێت پێغەمبەرﷺ بەسۆزو بەزەیی بووە بەرانبەر هاوەڵانی، چەندیش بەپەرۆش بووە ئاسایشیان بۆ دەستەبەربکات، بۆیە پێشنیاری کرد بچنە لای ئەو پادشا دادپەروەرە، کەکەس لەلای ستەمی لێناکرێت، چۆنیشی وت هەروا بوو درودوسڵاوی خوای لەسەر بێت [٥] پێغەمبەرﷺ خۆی سەرنجی هاوەڵانی ڕاکێشابەرەو حەبەشە، خۆیشی ئەو جێگا ئارامەی بۆیان دۆزیەوە، بۆ ئەوەی بیانپارێزێت لە لەناوچوون، ئەمەیشە پەروەردەکردنێکی پێغەمبەرانەیە بۆ هەموو سەرکردەکانی کاری ئیسلامی لەهەموو سەردەمێکدا، پێویستە بەجوانی نەخشە بکێشن ودووربین بن و، بگەڕێن بەدوای جێگای ئارامدا

---

١- البخاري، كتاب الجنائز، باب التكبير على الجنازة ٥/٦٤ ورقمه ١٣٣٣ .

٢- البخاري، كتاب مناقب الانصار، باب موت النجاشي، حديث رقم ٣٨٧٧ .

٣- اسد الغابة ١/٩٩، الاصابة ١/١٠٩ .

٤- السيرة النبوية للدكتور مصطفى السباعي ٥٧ .

٥- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٣١٢ .

کەببێتە پایتەختێکی یەدەك ۆ بانگەوازو، مەڵبەندێك بۆ دەرپەڕین، ئەگەر لەحاڵەتێکدا مەڵبەندە سەرەکییەکە تووشی مەترسی بوو، یان ئەگەری داگیرکردنی هەبوو، سەربازانی بانگەواز سەروەتی ڕاستەقینەن کەپێویستە هەموو هەوڵەکان بخرێتە گەڕ بۆ پاراستنیان، بێ ئەوەی هیچ کەمتەرخەمییەك ئەنجامبدرێت لەو بوارەدا، یەك موسڵمانیش بەرانبەر هەموو ئادەمیزادەکانی سەر زەوییە لەوانەی لەئایینی خوا دەرچوونە .[1]

٣- ئامانجەکان لەکۆچکردنی حەبەشە جیاجیا بوون، بۆیە پێغەمبەرﷺ پەرۆش بوو لەسەر هەڵبژاردنی چەند جۆرێکی دیاریکراو بەمەبەستی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە، وەکو باسکردنی کێشەی ئیسلام و، هەڵوێستی قورەیش لەئەوان و، قایلکردنی ڕای گشتی بەکێشەی موسڵمانان، لەچەشنی ئەو جموجۆڵانەی دەوڵەتە هاوچەرخەکان پێی هەڵدەستن لەڕووی سیاسی وباسکردنی کێشەکان و بەدەستهێنانی لایەنگری ڕای گشتی بۆلای خۆیان[2]و، دەستەبەر کردنی خاکێکی نوێ بۆ بانگەواز، بۆیە سەرانی هاوەڵان کۆچیان کرد لەسەرەتاوە، ئینجا ژمارەیەکی زۆر لەهاوەڵان دوایانکەوتن، مەسەلەکەش بەجەعفەر سپێردرا .[3]

٤- بوونی جەعفەری ئامۆزای پێغەمبەرﷺو، عوسمانی زاوای و، روقەییەی کچی ڕەزای خوایان لێبێت لەپێشەوەی موهاجیرەکاندا، ئاماژەیەکی گرنگە بۆ ئەو ناڕەحەتیانەی پێویستە کەسە نزیکەکانی سەرکردە بیچەشن، بەڵام ئەگەر کەسە نزیکەکان دوورخراوەنەوە لەمەترسی و، لەبەرانبەردا کەسە دوور وبێ پلەوپایەکان پاڵنرانە نێویەوە، ئەوە کارێکی دوورە لەبەرنامەی پێغەمبەرﷺ .[4]

٥- ڕەوایی دەرچوون لەنیشتمان، ئەگەر ئەو نیشتمانە مەککەیش بێت، سەرەڕای پلەو پایەی، ئەگەر ئەو دەرچوونە هەڵهاتن بێت بەئایین، بابۆ جێگایەکی خەڵك موسڵمانیش نەبێت، چونکە حەبەشییەکان گاور بوون ومەسیحیان دەپەرست

---

١- بڕوانە: التربية القيادية للغضبان ١/٣٣٣ .

٢- اضواء على الهجرة، توفيق محمد سبع ٤٢٧ .

٣- بڕوانە: التربية القيادية ١/٣٣٣ .

٤- هەمان سەرچاوە ١/٣٣٣ .

و نەیاندەوت: بەندەی خوایە، ئینجا ئەو موسڵمانانە_وەکو لەفەرموودەکەی ئوممو سەلەمەدا هاتووە_ خاوەن دوو کۆچەکەن کەستایش کراون بە پێشکەوتن، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾ (التوبة:١٠٠) .

لەتەفسیریشدا هاتووە کەئەوانە بوون ئامادەی بەیعەتی (رضوان) بوون [١] جاتەماشاکە چۆن خوای گەورە ستایشی کردوون بەهۆی کۆچکردنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەماڵی خواوە دەرچوونە بۆ ماڵی بێباوەڕی، چونکە ئەو کردەوەیان دوور بینیەك بوو بۆ ئایینەکەیان، بۆ بواریان بۆ بکرێتەوە خوا بپەرستن، ئەمەیش حوکمێکی بەردەوامە هەرکاتێك خراپە زاڵبێتە سەر ولاتێکدا، یان بڕواداریك لەپێناو ڕاستی دا ئازار بدرێت، یان کاتێك ناهەق بەسەر هەقدا زاڵ بێت، لەم حاڵەتانەدا، دەرچوون ڕەوایە بۆ موسڵمان وئەمە هیجرەتێکە تاهاتنی قیامەت نابڕێتەوە: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:١١٥) .

٦- دەکرێ موسڵمانان بچنە ژێر پارێزگاری کەسانی ناموسڵمانەوە، ئەگەر پێویستیەك هەبوو بۆ ئەوە، ئیتر ئەو دالدەدەرە چی لەئەهلی کیتاب بێت وەکو نەجاشی، یان بتپەرست بێت وەکو ئەوانەی موسڵمانان گەڕانەوە پەنایان پاش گەڕانەوەیان لەحەبەشە، وەکو ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەرﷺو موتعیمی کوڕی عەدی کەپێغەمبەرﷺ پاش گەڕانەوەی لەتائیف بەدالدەدانی ئەو هاتە شاری مەککەوە .[٢]

بێگومان ئەم مەسەلەیش پەیوەستە بەوەی کەئەو دالدەدانە زیانی نەبێت بۆ بانگەوازەکە، یان نەبێتە مایەی گۆڕینی هەندێ حوکمی شەرعی، یان بێدەنگ بوون لەسەر کاری ناشەرعی، ئەگەرنا ڕەوانییە بۆ موسڵمانان ئەنجامدانی کاری لەو جۆرە؛ بەلگەی ئەوەش هەڵوێستی پێغەمبەرەﷺ کاتێك ئەبو تالیب داوای لێ کرد باسی خوداکانی قوڕەیش بەخراپە نەکات بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت، لەوکاتەدا

---

١- تفسیر الطبري ٦/١١ تفسیر ابن کثیر .

٢- الهجرة في القران الکریم لا ١٣١٦ .

خۆی ئامادەکرد کەوازبهێنێ لەدالدەدانی مامی و، هەرگیز ڕازی نەبوو بێ دەنگ بێت لەهیچ مەسەلەیەك لەوانەی کەپێویستە ئاشکرا بکرێت.[١]

٧- هەڵبـژاردنی پێغەمبـەرﷺ بـۆ حەبەشـە وەکـو جێگایـەك بـۆ کۆچـکردن، ئاماژەدەکات بۆ خاڵێکی ئیستراتیژی گرنگ، کەبریتی یە لەناسینی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو دەوڵەت ومیرنیـشنانەی دەوروبـەر، بۆیـە شـارەزای چـاك وخـراپ ودادپـەروەرو ستەمکاریان بـوو، کەئەمـەیش بـووە مایـەی یارمەتیـدانی بـۆ دۆزینـەوەی ئـارام بـۆ کۆچکردنی هاوەڵانی، پێویـستە سـەرکردەی بانگـەواز بـەو شـێوەیە بێـت، لـەڕووی ئاگەداربوون لەبارودۆخی دەورەوبەرو، نەتەوەو حکومەتەکان.[٢]

٨- هەستی هێمنی لەلای نەوەی یەکەم دەردەکەوێت لەکۆچکردنی یەکەمیاندا و لە چۆنیەتی دەرچوونیان، چونکە ئەوان بەدزەو خۆشاردنەوە دەرچوون، بۆ ئەوەی قوڕەیش پێیان نـەزانن ونەخـشەکەیان تێکنـەدەن، هـەروەها لەبازنەیـەکی تەسـکدا ئەنجامدرا، چونکە ژمارەیان لەشانزە کـەس تێنەدەپـەڕی، ئـەم ژمارەیـەیش سـرنج ڕاناکێـشێت لـەکاتی دەرچـوونیاندا، لەهـەمان کاتـدا هۆکـارێکی یارمەتیـدەربوو ڕێکردنیان بەپەلە، بارودۆخەکـەیش ئـەوە دەخـوازێ، چـونکە کاروانەکـە پێـشبینی ڕاونـان دەکـات لەهـەر سـاتێکدا، واشـدەردەکەوێت ئـەم شـێوازە لەپەنهانیـدا، ئـەو هەلەی لەدەست قوڕەیشدا کەپێیان بزانن تاکاتێکی درەنگ، بۆیـە کاتێـك شـوێنیان هـەڵگرت تاسـەر دەریـا کەسـیان نـەدی لـەوێ، ئەمـەیش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی پێویـستە بـاوەڕدار وریابێـت، لەجموجۆڵەکانیـدا ونابێـت هـەمووی ئاشـکرابێت بـۆ دوژمن، بەشێوەیەك زیان بەبانگەواز بگەیەنێت.[٣]

٩- قوڕەیش ڕازی نەبوون بەدەرچوونی موسڵمانان بۆ حەبەشـەو، هەسـتی کـرد بەمەترسی لەسەر بەرژەوەندییەکانی، چونکە لەوانەیە ژمارەی ئاوارەکان لەوێ زیاد بکەن وببنە مەترسییەك، هەر بۆیە بتپەرستـەکان هـەوڵیان دا بیانگێڕنـەوە، بـەپێی نەخـــشەیەکی داڕێـــژراو، چـــونکە دیاریـــان ئامـــادەکرد بـــۆ نەجاشـــی و، بـــۆ

---

١- فقه السيرة للبوطي لا ٢٦ الهجرة في القران الكريم لا ٣١٧ .

٢- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية ١٠١ .

٣- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب والحماية لا ١٠١ .

یارمەتیدەرەکانی، شێوازی قسەکردنیان لەگەڵیان دەسنیشان کردو، چۆنیەتی دابەش کردنی دیارییەکان وئەو قسانە هاوکات لەگەڵیدا دەکرێت وهەڵبژاردنی نێردەکان، چونکە عەمر هاوڕێ ی نەجاشی بوو بەداناییش دەناسرا، ئەمڕۆیش ئێمە پێویستمان بەوە هەیە دوژمنەکەمان بەکەم نەزانین وبێ ئاگانەبین لەپیلانەکانی و قەبارەی ڕاستی خۆی بدەینێ و، لێکۆڵینەوەی جموجلاڵەکانی بکەین وئامادەبین بۆ بەرەنگاریکردنی پیلانەکانی.[١]

١٠- نەخشەکەی قورەیش بەتەواوی جێبەجێ کرا، بەڵام سەری نەگرت، چونکە نەجاشی ڕازی نەبوو بیانداتەدەسەوە تاگوێیان لێنەگرێت، ئەمەیش هەلێکی ڕەخساند بۆ موسڵمانان کێشەکەیان وئایینەکەیان بخەنە ڕوو .

١١- هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کۆبوونە کاتێك نێردەی نەجاشی گەیشتە لایان و، داوای ئامادەبوونیان کرد، ئینجا مەسەلەکەیان تاوتوێ کرد لەنێوان خۆیاندا بەڕاوێژ، هەموو مەسەلەیەکیش بەڕاوێژ ئەنجام بدرێت چاوەڕوانی سەرکەوتنی لێدەکرێت، چونکە بیرو هۆشەکان پێکەوە بڕیاری تیادەدەن، مەزنی لایەنی پەروەردە لەوەدا دەرکەوت لای هاوەڵان کەناکۆکی یان تیا دروست نەبوو لەسەر ئەو مەسەلەو، بڕیاریشیاندا ئیسلام وەکو خۆی باس بکەن ئەگەر ببێتە مایەی لەناو چونیشیان .[٢]

١٢- سەرکردایەتی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئاستی ڕووداوەکان بوو، بۆیە جەعفەر کرایە ئەمیری موسڵمانان لەو کۆچەدا، هەروەها لەحەبەشەیش موسڵمانان هەڵیانبژارد بۆ ئەوەی بەناویانەوە قسەبکات لەلای پادشا، بۆ ئەوەی بتوانێ عەمر ببەزێنێ، لەڕاستیشدا کەسایەتی جەعفەر چەند سیفەتێکی گونجاوی چاکی تیابوو، لەوانە:

* جەعفەر نزیکترین کەس بوو لەپێغەمبەری خواوەﷺ، لەیەك ماڵدا پێکەوە ژیان، کەواتە ئەو شارەزاترین کەسە بەسەرکردەی بانگەوازەکە لەهەموو ئەوانەی کەکۆچیان کردووە بۆ حەبەشە .

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٣١٧/١ .

٢- بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي .

* هەڵوێستێکی لەوشێوەش پێویستی بەکەسێکی قسەزان وزمان پاراو بوو، ئەوەی هاشمیش چڵەپۆپەی قورەیش بوون لەڕووی نەسەب وچاکەوە، جەعفەر خۆیشی لەسەرووی بەنی هاشیمەوەیە، خوای گەورەیش هاشیمی لەناو کینانەدا هەڵبژاردووە وپێغەمبەرەکەشی لەنێو بەنی هاشمدا هەڵبژاردووە.

* ئینجا جەعفەر ئامۆزای پێغەمبەرﷺ بوو، ئەمەیش وایدەکرد نەجاشی دڵنیابێت لێی، متمانەیشی هەبێت بەزانیارییەکانی.[1]

* ڕەوشتی جەعفەر کەڕوناکی لەچرای پێغەمبەرایەتی وەردەگرت، پێغەمبەرﷺ پێی دەفەرمووێت: ((اشبهت خلقي وخلقي))[2] واتە: لەخۆم دەچیت بەڕواڵەت و ڕەوشت ئەو باڵیۆزەی لەبەر دەستی نەجاشی قسەی کرد پێشەنگ بوو بۆ هەموو باڵوێزەکانی موسڵمان بەدرێژایی سەردەمەکان، چونکە خاسیەتی نێردراوی تیا بوو، وەکو پەیوەست بوون بەئیسلام و، زمانپاراوی و، زانست و، ڕەوشت جوانی و، ئارامگرتن و، بوێری و، دانایی و، زۆرزانی و، ڕوواڵەتی سرنج ڕاکێش.[3]

١٣- عەمری کوڕی عاص ڕەزای خوای لێبێت_کەلەو قۆناغەدا دوژمنی خواو پێغەمبەر بووﷺ، لەسەر ئاستێکی بەرز بوو لە ژیری تەڵەکەبازیدا، پێش هاتنی جەعفەریش ئەو هەموو بەڵگەکانی لەلای نەجاشی خستبوویە ڕوو، لەبارنەی ئەم خاڵانەی خوارەوە :

- باسی شڵەژانی نێو مەککەی کرد، هەروەها خراپی پەیوەندییەکان بەبۆنەی بانگەوازی موحەممەدﷺ کەخۆی یەکێکە لەدانیشتوانی ئەو شارەو، قسەکانی جێگای متمانە بوون بەلای نەجاشییەوە .

- باسی مەترسی شوێنکەوتوانی موحەممەدی ﷺ کردو، لەوانەیە بتوانن زەمین بلەرزێنن لەژێر پێی نەجاشیدا، وەکو چۆن بارودۆخی مەککەیان تێکداوە، ئەگەر

١- بڕوانە: التربية القيادية ١/٣٣٥ .
٢- هەمان سەرچاوە ١/٣٣٦ .
٣- بڕوانە: سفراء النبيﷺلمحمود شيت خطاب ٢/٢٥٢ _٣١٧ .

ڕێزو خۆشەویستی نەجاشی بەلای قورەیشەوە گەورە نەبوایە، هەرگیز ئەوەندە خۆیان ماندوو نەدەکرد بۆ ئامۆژگاریکردن، بۆیە ئەوان چاکە دەگێڕنەوە بەچاکە، وەکو ئەمەکیش بۆ دراوسێتی نێوان مەککەو حەبەشەو ووریاکردنەوەیان لەم ئاشووبە ترسێنەرە .

– مەترسیدارترین کاریشیان ئەوەیە لەئایین وبیروباوەڕی نەجاشی دەرچوونە، چونکە ئەوان شایەتی نادەن کەعیسای کوڕی مەریەم خوایە، ئەوانە نەلەسەر ئایینی میللەتەکەی خۆیانن ونەلەسەر ئایینی تۆن، ئەوانە داهێنەرن وبانگەواز دەکەن بۆ گێچەڵ .

– بەڵگەش لەسەر بەکەم سەیرکردنیان بۆ پادشاو گوێنەدانیان پێی، هەموو کەسێك کڕنوش دەبات بۆ پادشا، بەڵام ئەوان نایبەن، کەواتە چۆن ئەبێت داڵدەبدرێن، ئەمەیش دووبارە ووروژاندنی ترس بوو لەدەروونی نەجاشیدا، کەئەوانە ڕێزی لێناگرن، بۆیە پێویست بوو لەسەر جەعفەر هەموو ئەم تۆمەتانە بەرپەرچ بداتەوە، کەباڵوێزی قورەیش دەیداتە پاڵ موهاجیران.[١]

١٤– وەڵامدانەوەکانی جەعفەر بۆ نەجاشی لەئەو پەڕی ژیری وچڵەپۆپەی شارەزایی سیاسی وڕاگەیاندنوبانگەوازدا بوو، چونکە هەڵسا بەمانەی لای خوارەوە:

* شوورەیی وکەموکورتیەکانی جاهیلیەتی ژمارد، بەشێوەیەکیش باسی کرد گوێگر پێی قەڵس بێت، مەبەستیش لەوە ناشیرینکردنی قورەیش بوو لەلای پادشا، جەختیشی دەکرد لەسەر ئەو خاڵانەی کەبنەبڕناکرێن بەپێغەمبەرێك نەبێت .

* باسکردنی کەسایەتی پێغەمبەرﷺ، ناسراویش بووە بەنەسەب وڕاستگۆیی، دەسپاکی و، داوێن پاکی، کەواتە ئەو شیاوترین کەس بووە بۆ پێغەمبەرایەتی .

* جەعفەر باسی ڕەوشت وچاکییەکانی ئیسلامی کرد، کەلەگەڵ ڕەوشتی بانگەوازی پێغەمبەرەکانی تردا دەگونجێت؛ وەکو وازلێهێنانی بتپەرستی و،

---

١– بڕوانە: التربية القيادية ١/٣١٩، ٣٤٠ .

ڕاستگۆیی و، بەجێهێنانی ئەسپەردەو، بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی، چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ و، دوورکەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکان و خەڵك کوشتن و،... ئینجا لەبەر ئەوەی نەجاشی وزاناکانی شارەزایی زۆریان هەبوو دەربارەی نەصرانیەت، بۆیە ئەوان دەرکیان کرد بەوەی ئەو قسانە دەگونجێت لەگەڵ پەیامی پێغەمبەراندا .

* پەردە هەڵماڵین لەسەر ئەوەی قورەیش بەسەر ئەوانیدا هێناوە، بەهۆی ڕازینە بوونیان بۆ پەرستنی بتەکانیان و، باوەڕهێنانیان بەپەیامی موحەممەد ﷺ .

* ستایش کردنی نەجاشی بەو سیفەتانەی کەتیایدا بوو، وەکو ئەوەی ستەم لەکەس ناکات ودادپەروەرە لەگەڵ میللەتەکەیدا .

* ئەوەشی ڕوونکردەوە کەئەوان نەجاشیان هەڵبژاردووە لەنێو هەموو پادشاکانداو، هەڵهاتوون لەستەمی ئەوانەی ئەشکەنجەیان دەدان، بەم هەنگاوانەیش جەعفەر توانی ڕەوانبێژی وزمانپاراوی عەمر تێکشکێنێ و، بیرو هۆشی نەجاشی بۆلای خۆی ڕاکێشێت، بەهەمان شێوە توانی سرنجی زاناو قەشەکانیش بۆلای خۆی ڕاکێشێت .

* کاتێك نەجاشی داوای شتێکی کرد لەوانەی دادەبەزێتە سەرموحەممەد ﷺ، ئەو سەرەتای سورەتی مەریەمی بۆ خوێندەوە کەلە ئەوپەڕی ناوازەیی و کارتێکرندایە، تەنانەت نەجاشی ویارمەتیدەرەکانی گریان وریش وپەڕەکانی بەردەستیان تەڕبوون بە فرمێسکەکانیان هەڵبژاردنی جەعفەر بۆ سوورەتی مەریەم، ژیری نوێنەری کۆچکردووەکان دەردەخات چونکە سوورەتی مەریەم باسی مەریەموعیسا علیە السلام دەکات.

* بلیمەتی جەعفەر ڕەزای خوای لێبێت لەهەڵبژاردنی باس و گونجاوی کات و دڵکراوەیی ، بووبە مایەی بەدەستهێنانی پادشا بۆلای خۆیان.[1]

---

١- بڕوانە: التربیة القیادیة ١/٣٣٧ .

* وەڵامدانەوەی لەمەسەلەی عیسا علیە السلام بەڵگەبوو لەسەر ژیری و دانایییەکی کەم وێنە، چونکە ئەو ووتی بەڵێ عیسا بە خوا نازانن، بەڵام دەربارەی مەریەم هیچ قسەیەکی خراپ ناکەن، بەڵکو دەڵێن عیسا کوڕی مەریەمەو وشەو ڕوحی خوایە دایەتی بەسەر مەریەمی عازەبی داوێنپاکدا، نەجاشیش لەو قسانە زیاتری نەدەکرد لەو بارەوە.

* ئەوان سوجدە نابەن بۆ نەجاشی، حاشا ئەوان هەرگیز نەجاشی نابەنە ئاستی خوا، سوجدەش تەنها بۆ خوا ڕەوایە، بەڵام لەهەمان کاتدا سوکایەتی ناکەن بەپادشاو، ڕێزی لێدەگرن و، سڵاوی لێدەکەن، وەکو چۆن سڵاو لەپێغەمبەرەکەیان دەکەن، هەمان ئەو سڵاوەشە کەخەڵکی بەهەشت لەیەکتری دەکەن .[1]

* مەسەلەکە بەوە کۆتایی هات کەنەجاشی باوەڕی پێکردن وبۆی دەرکەوت ئەوان ڕاستگۆن، بڕیاریشی دا کە لەخزمەت پێغەمبەرﷺدا بێت کەجیبریل هاتووەتە لای وەکو چۆن چووەتە لای موسا، خۆیشی لەخوا نزیك بکاتەوە بەپاراستنی هاوەڵەکانی، دوپاتیشی کردەوە بۆ عەمر کەئەو هیچ ئاوڕێك ناداتەوە لەبازرگانی ودارایی قوڕەیش، ئەگەر ئەو پەیوەندییەش ببڕێتەوە لەکۆتاییدا .[2]

١٥- بەم شێوەیش قوڕەیش لەم بەرەیەدا بەزێنرا لەڕووی سیاسی و واتایی و ڕاگەیاندنەوە، بەرانبەر بەرگری موسڵمانان .

١٦- هەڵوێستی جەعفەر وبراکانی نموونەیەکی جێبەجێکراو بوو بۆ وتەی پێغەمبەرﷺ: ((من التمس رضا الله بسخط الناس، كفاه الله مؤونة الناس، ومن التمس رضا الناس بسخط الله وكله الله الى الناس))[3] واتە: هەر کەسێك ڕەزامەندی خوا بە تورە بوونی خەڵکی بەدەست بهێنێ، خوای گەورە ئەرکی خەڵکی لەسەر لادەبات، هەرکەسێکیش ڕەزامەندی خەڵکی بەتوڕەبوونی خوای گەورە بەدەست بهێنێ، ئەوا خوای گەورە وازی لێدەهێنێ. ئەو هاوەڵە ئازیزانەش ڕەزای خوایان لێبێت، داوای

---

١- هەمان سەرچاوە ٣٤٢/١ .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٣٤٢/١ .

٣- سنن الترمذي، كتاب الزهد، تحفة الاحوذي ٩٧/٧ ورقمه ٢٤١٤ وصححه الالباني في صحيح سنن الترمذي.

ڕەزامەندی خوایان کرد، سەرەڕای ئەوەی ئەو ڕەزامەندی بەڕواڵەت دەبووە مایەی توڕەبوونی ئەو گاورانە، کەئەوان خاوەن دەسەڵات بوون، بەڵام سەرئەنجام خوای گەورە دڵی پادشاکەی بۆ نەرمکردن، تاکو ئاخاوتنی کرد بە قسەی ڕاست وڕەوای هاوئاهەنگ لەگەڵ بانگەوازی ئیسلامدا، وێڕای ئەوەی کە لەگەڵ بیروباوەڕی لاری خۆیشیاندا ناکۆك بوو، کەجێگای مەترسی بوو نەصرانییەکان هەڵگەڕێنەوە لێی .[١]

١٧- لەلای هەندێ لەو نەصرانییانە باوەڕێکی ڕاست هەبوو بەئایینەکەیان، بەڵام دەیانشاردەوە، لەبەر ئەوەی دەسەڵات لەلای خاوەن بیروباوەڕی ناڕاست بوو، یەکێ لەوانەش کەلەسەر بیروباوەڕی ڕاست بوون، پادشای حەبەشە بوو، بەڵام دەرینەدەخست، بۆ ڕەزامەندی خواو ئاسودەیی ویژدانی خۆی وپشتگرتنێکیش بۆ کۆمەڵی ئیمانداری سەربەخۆا، بەم هەڵوێستە بوو بەیەکێك لەمەزنانی مێژوو .[٢]

١٨- یەکێکی تر لەوانەکانی هیجرەتی حەبەشە ئەوەیە، نەشارەزایی بەهەندێ لەحوکمەکانی ئیسلام لەبەر بەرژەوەندییەکی ئاشکرا زیانی نییە، ئیبنو تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێت سەبارەت بە(العذر بالجهل) دەڵێت: ((کاتێك نوێژی نیوماڵ وحاڵ واتە لەسەفەردا نەبێت زیادی لەوکاتەی پێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوانەی کەدوور بوون وەکو ئەوانە بوون لەمەککە مانەوە، ئەوانەش لەحەبەشە بوون هەردوو ڕکاتیان دەکرد، پێغەمبەریشﷺ فەرمانی پێنەکردن بەدووبارە کردنەوەی نوێژەکانیان .[٣]

هەروەها (الذهبي) دەڵێت: ((کەس گوناهبار نابێت تاکو زانست وبەڵگەی پێنەگات، سەرانی هاوەڵانیش لەحەبەشە بوون، واجب وقەدەغەکردن دادەبەزییە سەر پێغەمبەرﷺ، لەپاش چەند مانگێك دەگەشتە ئەوان لەو جۆرە فەرمان و حوکمە شەرعیانە پۆزشی دووریان هەبوو، تادەقەکەیان پێدەگات ...)) [٤]

---

١- بڕوانە: التاريخ الاسلامى للحميدي ٢/١٠٥ .
٢- هەمان سەرچاوە ٢/١٠٦ .
٣- الفتاوى ٢٢/٤٣ .
٤- الكبائر ١٢ .

١٩- لەوانەکانی تری کۆچی حەبەشە، پاداشت دانەوەی جیهاد بوو بەگوێرەی پێویست، جائەگەر کۆچکردن بۆ مەدینە جیهاد بوو، خوای گەورە جیایانی کردەوەو، پاداشتی زۆری بۆیان دەسنیشانکرد، هەمان ئەو پاداشت وچاکەبەر کۆچکردوانی حەبەشەیش کەوت، ئەگەر چی درەنگتر گەیشتنە مەدینە لەکاتی فەتحکردنی خەیبەر، لەبەر پێویستی مانەوەیان لەوێ، پێغەمبەرﷺ ئەوەی دووپات کردەوە بۆ ئەوانەی لەناو هەردوو کەشتییەکەدا سواربوو بوون .[1]

لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕەزای خوای لێبێت هاتووە کەفەرموویەتی: ئەسمائی کچی عومەیس_کەیەکێ بوو لەوانەی لەگەڵمان هاتن _ چووە لای حەفصەی خێزانی پێغەمبەرﷺ بەمیوانی، لەو کاتە عومەر هاتە لای حەفصە، فەرمووی: ئەو ئافرەتە کێ یە؟ حەفصە وتی: ئەسمائی کچی عومەیسە، عومەر وتی: ئەو حەبەشیە دەریایی یە، ئەسماء وتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: ئێمە پێشتاننکەوتین لەکۆچکردندا، بۆیە ئێمە مافدارترین لەئێوە بەپێغەمبەرﷺ، ئەسماء لەو قسە توڕە بوو، ووتی: نەسوێند بەخوا وانییە، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بوونﷺ، برسیتانی تێردەکرد، نەفامتانی ئامۆژگاری دەکرد، ئێمەیش لەخاکێکی دوورو ناحەزدا بووین لەحەبەشە، هەموو ئەوەش لەپێناو خواو پێغەمبەردا بووﷺ، سوێند بەخوا خواردن وخواردنەوە ناخۆم، تائەم قسەت نەگەیەنم بەپێغەمبەرﷺ، ئێمە لەوێ ئازارمان دەبینی ودەترساین، پێویستە ئەم قسەت وەکو خۆی باس بکەم، کاتێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا عومەر ئاوەهاوئاوەها دەڵێت، فەرمووی: ئەی تۆ چیت پێ وت، وتی: ئاوەهاوئاوەهام پێی وت، فەرمووی: ئەو لەئێوە مافدارتر نییە بەمن، خۆی وهاوڕێکانی یەك جار کۆچیان کردووە، بەلام ئێوە کۆمەڵی کەشتیەکە، دووجار کوچتان بۆ نوسراوە، ئەسماء دەڵێت: ئەبو موسا وهەموو ئەوانەی سواری کەشتیەکە بوو بوون، دەستە دەستە دەهاتنە لام پرسیاری ئەم فەرمودەیان لێدەکردم، شتێك نەبوو لەدونیا ئەوەندەی ئەو فەرموودە بەلایانەوە خۆش بێت.[2]

---

١- بڕوانە: الهجرة الاولى في الاسلام ٢٠٥ .

٢- البخارى، كتاب المغازي، باب غزوة خيبر ٨/٥ ورقمه ٤٢٣٠، ٤٢٣١ .

٢٠- سەرەتای موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص لەحەبەشە بوو، ئەمەیش بێگومان یەکێکە لەشوێنەوارەکانی کۆچی حەبەشەو، بەڵگەیەکە لەسەر ئەو دەستکەوتانەی ئەوان بۆ بانگەواز بەدەستیان هێنا، لەماوەی مانەوەیان لەحەبەشە، ئەگەر چی زۆرێك لەگێڕاوەکان بەئاڕاستەی ئەوەن کەسەرەتای موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص، لەسەر دەستی نەجاشی بووە، ئەم هەواڵەیش زیاتر بەناوبانگە وەکو ئیبنو حەجەر دەڵێت،[١] ئەمەیش ڕووداوێکی سەیرو خۆشە کەهاوەڵێك لەسەر دەستی تابیعییەك موسڵمان بێت، وەکو زەرقانی دەڵێت[٢]، هەندێ هەواڵی تریش هەیە ئەوە دەگەیەنێ کەعەمر لەسەر دەستی جەعفەر ڕەزای خوای لێبێت موسڵمان بووە.

٢١- هاوسەرێتی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئوممو حەبیبە پەیوەندییەکی ڕاستەو خۆی هەیە لەگەڵ ئەم کۆچەدا، ئەم هاوسەر گیرییەش لەگەڵ یەکێك لەئافرەتە موهاجیرەکاندا واتایەکی گەورەی هەیە، مارەبڕینەکەش هەر لەو کاتەبووە کە ئوممو حەبیبە لەحەبەشە بووە، ئەبو داود بەسەنەدێکی (صحیح) لەئوممو حەبیبە دەگێڕێتەوە ڕەزای خوای لێبێت: کەخێزانی عوبەیدوڵڵای کوڕی جەحش بووەو مێردەکەی لەوێ مردووە، ئیتر نەجاشی لەحەبەشەوە مارەی کرد لەپێغەمبەرﷺو چوار هەزاریش مارەیی لەجیاتی پێغەمبەرﷺ پێداو، لەگەڵ شورەحبیلی کوڕی حەسەنە ناردی بۆ پێغەمبەرﷺ...[٣]

توێژەر لەئاماژەکانی ئەم فەرموودەیە دەگاتە ئەو ئەنجامەی پێغەمبەری خواﷺ بەدواداچوونی دەکرد بۆ هەواڵی کۆچکردوانی حەبەشەو، دڵنەوایی ئەوانەی دەکرد کەئارامیان گرتووە، ئوممو حەبیبەیش تاکە ئافرەتێك نەبوو پێغەمبەرﷺ گرنگی پێداو دڵنەوایی بکات لەکارەساتەکەیدا، بەڵکو پێشتر هەمان کاری ئەنجامدا لەگەڵ سەودە ڕەزای خوای لێبێت،[٤] چونکە کاتێك گەڕایەوە لەحەبەشە سەکرانی کوڕی

---

١- بڕوانە: الهجرة الاولى في الاسلام لا ١٦٧ .

٢- بڕوانە: شرح المواهب ٢٧١/١ .

٣- صحیح سنن ابی داود للالباني ٣٩٦/٢ ورقمە ٢١٠٧ .

٤- بڕوانە: الهجرة الاولى في الاسلام ١٨٨ .

عەمری مێردی وەفاتی کرد، لەپاش تێپەڕ بوونی ماوەی شەرعی، پێغەمبەرﷺ کەسێکی نارد بۆ خوازبێنی وئەویش وتی: هەرچی کارم هەیە بابەدەست تۆ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باکەسێك لەخزمانت بتدات بەشوو، ئیتر ئەویش داوای کرد لەحاتیبی کوڕی عەمری کوڕی عەبدوشەمس هەڵسێ بەو کارە، بەم شێوەیەش سەودە بوو بەیەکەم ئافرەت پێغەمبەرﷺ مارەی بکات دوای خەدیجە .[١]

ئەم دوو ڕووداوە ئاماژە دەکەن بۆ حیکمەت لەفرە ژنهێنانی پێغەمبەرﷺ هەروەها بەڵگەن لەسەر بایەخدان بەخێزانی ئەو موجاهیدانەی دەمرن یان دەکوژرێن، ئەمە جگە لەوەی کەدەکرێت کەسێ بڵێت هاوسەرێتی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئوممو حەبیبە، کەمکردنەوە بووە بۆ دوژمنایەتی بەنی ئومەییە، بەشێوەیەکی گشتی و، دوژمنایەتی سەرکردەکەیان ئەبو سوفیان بەشێوەیەکی تایبەت، لەدژی ئیسلام وموسڵمانان[٢]، کەئەوەیش کارێکی چاك وڕەوایەو پێغەمبەرﷺ پەرۆش بووە بۆهەموو خەڵکی بۆ ئیسلام بانگ بکات، کە لەگەڵ بەهاکانی خودی ئیسلام داناکۆك نەبێت .[٣]

٢٢- هەندێ لەتوێژەران پێیان وایە هەندێك هۆکار بووە لەدوای کۆچ نەکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ حەبەشە، لەوانە:

- جێگیر بووە کەپێغەمبەرﷺ لەخەوندا ئەو جێگایەی بینیوە کەکۆچی بۆ دەکات، پڕی لەدار خورمایە دەکەوێتە نێوان دوو ناوچەی پڕ لە بەردی ڕەشەوە، گومانیشی دەبرد (هەجەر) بێت .[٤]

- سروشتی جوگرافی حەبەشە، کەتەگەرە دروست دەکات لەبەردەم بڵاوبوونەوەی بانگەوازدا و، پانبوونەوەی دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا .

---

١- الطبقات ٨/٣ .

٢- السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية، د. مهدى رزق الله ٧٠٦، ٧٠٧ .

٣- بڕوانە: الهجرة الاولى ٨٨ .

٤- مەبەست لەهەجەر شاری ئەحسائە .

- هەڵبـژاردنی دورگـەی عـەرەب-بەتایبـەتیش مەککـە وئینجـا مەدینـە- بـۆ دابەزینی وەحی و، دەستپێکردنی ئیسلام بەڕێکـەوت نـەبوو، بـەڵکو ئـەوە لـەپێناو چەندین خاسیەتی تایبەت بوو کەلەو جێگایەدا هەیە.[1]

- کەشی (بیئە) حەبەشە ڕێگای نەدەدا بەئەم ئایینە پەنا هێنەرە گەشـە بکـات لەتەنیشت مەسیحیەتدا، نەڕۆمانەکانیش ئەوەیان قبوڵ دەکرد لـەخاوەن دەسـەڵات بوون بەسەر حەبەشەدا.[2]

٢٣- کۆچکردن بۆ حەبەشـە کاریگـەری هـەبوو بـۆ کەمکردنـەوەی پلـەو پایـەی قـوڕەیش لـەلای هـەموو هۆزەکـانی عـەرەب ومـەحکومکردنی هەڵوێـستیان لـەدژی ئیـسلام وموسـڵمانان، چـونکە کەشـی عەرەبـەکان شـانازیان دەکـرد بەداڵـدەدانی بێگانــەو چـاکەکردن لەگـەڵ دراوســێ و، پێـشبڕکێ یـان دەکـرد لـەو بـوارەدا، بەپێـچەوانەشەوە لـەڕووزەردی وئـابڕوو چـوون دەترسـان، حەبەشـییەکانیش لـەو مەسەلە پێشی قوڕەیشیان دایەوەو، دەرکراوەکانیانی لای ئەوانیان داڵدەدا، لـەپیاو ماقوڵان وچەوساوەو بێگانەکانیان.[3]

---

١- بڕوانە: الغرباء الاولون ١٦٩، ١٧٠.

٢- بڕوانە: اضواء على الهجرة ل ١٥٦_١٦١، الهجرة في القران الكريم لا ٣٢٠.

٣- بڕوانە: الغرباء الاولون ١٧٠، ١٧١.

## باسی دووەم: ساڵی خەم ودەردەسەری تائیف.

### یەکەم: ساڵی خەم.

#### ١- کۆچی دوایی ئەبوتالیب:

مردنی ئەبو تالیب لەپاش گەڕانەوەی بەنی هاشیم بوو لەدۆڵەکەدا، لەکۆتایی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی [١]، ئەبو تالیب ((پارێزگاری لەپێغەمبەرﷺ دەکرد و لەسەری بەقسە دەهات)) [٢] و((پشتگیری لێدەکرد)) [٣] وپیاوێکی بەڕێز بوو بەلای قورەیشەوە، کاتێك سەرەمەرگی نزیك بوویەوە، سەرانی قورەیش هاتنەلای و هانیاندا بەردەوام بێت لەسەر ئایینی خۆی و، نەچێتە ئایینی ئیسلامەوە، پێیان وت: ئایا لەئاییینی باوکت لادەدەیت؟ پێغەمبەرﷺ لەو کاتە پێشنیاری ئیسلامەتی بۆ کرد وپێی فەرموو: ((قل لا اله الا الله اشهد لك بها يوم القيامة)) واتە: بڵێ (لا الە الا الله) تالەڕۆژی دوایی داشایەتیت بۆ بدەم، ئەبو تالیب وتی: ئەگەر لە ترسی تانەلێدانی قورەیش نەبوایە بڵێن لەترسی مەرگدا وتی، بەوتنی ئاسوودەوشادمانم دەکریت، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ (القصص:٥٦).

بیرۆکەکانی جاهیلیەت ڕەگی داکوتا بوو لەهۆشی ئەبو تالیبدا ونەیتوانی بیانگۆڕێ، ئەو کەسێکی پیر بوو ئاستەم بوو بەلایەوە گۆڕانکاری لەبیرو بۆچوونەکانیدا بکات، ئینجا هاوتەمەنەکانی لەو کاتەدا ئامادەبوون، بۆیە کاریگەریان لەسەری دروستکرد لەبەر مەترسی بڵاو بوونەوەی موسڵمان بوونی وکارتێکردنی لەسەر خەڵکی. [٤]

---

١- فتح الباری ١٩٤/٧ .

٢- صحيح البخاری فتح الباري ١٩٣/٧ ورقمه ٣٨٨٣ .

٣- صحيح مسلم ١٩٥/١ ورقمه ٣٥٨_٢٠٩ .

٤- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري ٨٤/١ .

### ٢- کۆچی دوایی خەدیجە ڕەزای خوای لێبێت:

خاتوو خەدیجە ڕەزای خوای لێبێت، پێش کۆچکردن بۆ مەدینە بەسێ ساڵ[١]، لەهەمان ئەو ساڵەی تیایدا ئەبوتالیب وەفاتی کرد[٢].

بەمردنی ئەبو تالیب و، ئینجا خەدیجەیش ڕەزای خوای لێبێت بەدوایدا، خەم و پەژارە زیادی کرد لەسەر پێغەمبەرﷺ بەمردنی ئەو دوو خۆشەویستە، کەدوو کۆڵەکەی بەهێزی ئیسلام بوون، ئەبو تالیب پشتیوانی دەرەکی بوو، بەرگری لێدەکرد لەڕووی خەڵکیدا، خەدیجەیش پشتیوانی ناو خۆیی بوو، کەچەرمەسەری و کۆسپەکانی لەبەردەمدا ئاساندەکردەوە، بۆیە بێباوەڕانی قورەیش سەخت بوونەوە لەسەر پێغەمبەرﷺو ئەوەندەیان ئازاردا کەلەژیانی ئەبو تالیبدا هەرگیز توانای ئەوەیان نەبوو،[٣] قۆناغێکی ناهەموار دەستی پێکرد لەژیانی پێغەمبەرﷺ کەتیایدا ڕووبەڕووی گیروگرفت و ناخۆشی زۆر بوویەوە، چونکە تەنیا مایەوە خوا نەبێت پشتیوانی نەما، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەر بەردەوام بوو لەگەیاندنی ئایینی خوای گەورە، تووشی ئەوەندە ئازارو ئەشکەنجەدرابوو کەلەتوانای کەسدا نەبوو هەڵیگرێت، کاتێك ناخۆشییەکان پەیتا پەیتا دەهاتنە سەری، لەو شارەی کەتیایدا لەدایکبوو، لەکەسانێکیشەوە کەهەموو شتێکی بچووك وگەورە دەربارەی دەزانن، لەم کاتەدا بڕیاریدا دەربچێت بۆ جێگایەکی تر، بۆ ئەوەی بانگەوازەکەی بخاتە ڕوو بۆیان وداوای پشتگیری کردنیان بکات، بۆیە بەرەو تائیف بەڕێکەوت، کەنزیکترین جێگابوو لەمەککە.[٤]

## دووەم: گەشتەکەی پێغەمبەرﷺ بۆ تائیف.

پێغەمبەری خواﷺ شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی پیشێ خۆی بوو لەبانگەواز کردن بۆلای خوای گەورە، ئەوە نوحە (علیه السلام) بانگەوازی میللەتەکەی کرد: ﴿

---

١- هەمان سەرچاوە ١/١٨٥ .
٢- هەمان سەرچاوە ١/١٨٥ .
٣- بڕوانە: محنة المسلمین في العهد المكي ٣٤ .
٤- بڕوانە: هەمان سەرچاوە ٣٦_٤٥ .

﴿أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا﴾ (العنكبوت:١٤) . ئەم ساڵە درێژانە پڕبوون لەکاری بەردەوام وجۆراو جۆر: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝١ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ۝٢ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ۝٣ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٤ قَالَ رَبِّ إِنِّى دَعَوْتُ قَوْمِى لَيْلًا وَنَهَارًا ۝٥ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا فِرَارًا ۝٦ وَإِنِّى كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ٱسْتِكْبَارًا ۝٧ ثُمَّ إِنِّى دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ۝٨ ثُمَّ إِنِّىٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ (نوح:١_٩) .

بەدرێژایی ئەو ساڵانەش هەرگیز لەبانگەواز نەکەوت، لاواز نەبوو تیایداو، شێوازەکانی دەگۆڕی، ئالوسی لەتەفسیرەکەیدا دەربارەی ((لیلاً ونهاراً)) دەڵێت: واتە هەمیشە بێ وچان وبێ ساردبوونەوە بانگی دەکردن بۆ باوەڕهێنان و گوێڕایەڵی، ئینجا خوای گەورە باسی بەرەنگاربوونەوەی توندی ئەوانی کردووە، دوای ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ إِنِّىٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا﴾ واتە: بانگیانم کرد جار لەدوای جار، بەچەندین شێوازو لەهەموو کاتەکاندا، ئینجا دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ إِنِّى دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا﴾ واتاکەی وادەردەکەوێت کەقۆناغێکی نهێنی بووە پێش ئاشکرا کردن، ئەمەیش گونجاوترە[١] .

پێغەمبەرﷺ داهێنانی دەکرد لەشێوازەکانی بانگکردنی خەڵکی، بەنهێنی وئاشکرا، بەئاشتی وشەڕ، بەکۆوتاک، بەدەرچوون ومانەوە، هەروەها پێغەمبەری خواﷺ سەرگوزشتەی دەگێڕایەوەو نموونەی دەهێنایەوەو، شێوازەکانی ڕوونکردنەوەی بەکاردەهێنا، وەکو هێڵڕاکێشان لەسەر زەوی وشێوازی تر، هەروەها مژدەی دەدانێ ودەیترساندن، لەهەموو باروساتێکدا بانگی دەکردن، ئینجا دەرچوو بەرەو تائیف و سەردانی هۆزەکانی دەکردو، کۆچی کرد.

---

١- بڕوانە: تفسير الالوسى ٨٩/١٠ .

پێغەمبەرﷺ هەوڵی دەدا مەڵبەندێکی نوێ بۆ بانگەواز بدۆزێتەوە، داوای پشتیوانی کرد لەهۆزی سەقیف، بەڵام ئەوان بەدەنگییەوە نەهاتن، منداڵ و لاوەکانیان هان دا وپێغەمبەرﷺ یان بەر بەرد، لەڕێگەی گەڕانەوەشی بۆ مەککە، چاوی کەوت بەعەدداس، کە گاور بوو، موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاند، واقیدی کاتی ئەو گەشتەی بەشەووالی ساڵی دە لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرﷺ داناوە، بەدوای لەدونیا دەرچوونی ئەبو تالیب و خەدیجە، ئەوەشی گێڕاوەتەوە کە دەڕۆژ ماوەتەوە لەتائیف.[1]

١- بۆچی پێغەمبەرﷺ تائیفی هەڵبژارد؟

تائیف بریتی بوو لەقوڵایی ئیستراتیژی سەرانی قورەیش، بەڵکو قورەیش تەماعیان هەبوو تیایدا، لەڕابوردویشدا هەوڵیان دابوو تائیف بخەنە پاڵ خۆیان و چوونە دۆڵی(وج)یش، بەهۆی چڕی دارو ڕووەکەکانی، تاکو ترسیان خستە دڵی سەقیف ەوەو هاوپەیمانێتیان لەگەڵ کردن وبەنی دەوسیشیان بەشدار کرد[2] زۆرێکیش لە دەوڵەمەندەکانی مەککە موڵکیان هەبوو لەتائیف و، لەوێ وەرزی هاوینیان بەسەر دەبرد، هەردوو هۆزی بەنی هاشم وعەبدوشەمس پەیوەندی بەردەوامیان هەبوو لەگەڵ تائیفدا، بەهەمان شێوە مەخزومیش هەندێ پەیوەندی دارایی هەبوو لەگەڵ سەقیف دا، بۆیە ڕووکردنە تائیف لەلایەن پێغەمبەرﷺ ئاڕاستەیەکی نەخشە بۆ کێشراو بوو، ئەگەریش بیتوانیبا جێگە پێیەکی بۆ خۆی دەستەبەر بکردبا، ئەوە دەبووە مایەی شڵەژانی قورەیش وهەڕەشە کردن لەئاسایش وبەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بەڵکو لەوانەیە ببوایەتە مایەی دابڕینی لەدەرەوە، ئەم جموجوڵە سیاسیە ئیستراتیژییەی پێغەمبەرﷺ ئاماژە دەکات بۆ پەرۆشی وەرگرتنی هۆکارەکان لەپێناو دروستکردنی دەوڵەتێکی موسڵمان یان هێزێکی نوێ کەبتوانێ ڕۆڵ ببینێ لەململانێکاندا، چونکە دەوڵەت یان هێز هۆکارێکی یەکجار پێویستە بۆ گەیاندنی بانگەوازی خوا بۆ خەڵکی .

---

١- طبقات ابن سعد ٢٢١/١ نقلاً عن السيرة النبوية الصحيحة ١٨٥/١ .

٢- بڕوانە: فتح الباری، کتاب الکفالة ٣٧٣/٤ شرح _ ح _ رقم ٢٢٩٤ .

کاتێك پێغەمبەرﷺ گەیشتە تائیف ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ مەڵبەندی دەسەڵات و بڕیاری سیاسی لەتائیف .[١]

**٢- جێگای دەسەڵات لەکوێ بوو لەتائیف ؟**

بەنی مالیك وهاوپەیمانەکان بەپێی دانیشتوانی دێرینی ناوچەکە بوون، خاوەن دەسەڵات بوون بەسەر تائیف دا، کاروبارە ئایینەکانیش هەر بەدەست ئەوان بوو؛ وەکو چاودێریکردنی مزگەوت، وێڕای سەرکردایەتی سیاسی گشتی و، پەیوەندی دەرەکی و، دەسەڵاتی ئابووری، لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، ئەوان لەئاستێکدا نەبوون بتوانن بەرگری بکەن لەناوچەی تائیف، کەبژوێنترین خاکی عەرەب بوو، جێگای تەماع وسەرنجی زۆر لایەن بوو، بۆ نموونە لەهۆزی هەوزان دەترسان، بەهەمان شێوە مەترسیان هەبوو لەقورەیش وبەنی عامیر، کەهەموویان هۆزگەلی بەهێزبوون و توانای هێرش و داگیرکردنیان هەبوو، بۆیە سەرانی تائیف ڕەچاوی سیاسەتی ڕێککەوتن ئاشتیان دەکرد، سەقامگیربوونی سیاسیان دەپاراست لەڕێگەی ڕێککەوتن نامەوەو هاوسەنگی، ئەمەش هەمان سیاسەت بوو کەقورەیش ڕەچاوی دەکرد، جابەنی مالیك پەیوەندییەکانیان پتەو دەکرد لەگەڵ هەوازن بۆ ئەوەی دووربن لەزیانیان، هاوپەیمانەکانیش پەیوەندییان هەبوو لەگەڵ قورەیشدا بۆ دڵنیابوون لێیان.[٢]

ئەمەو، پێغەمبەرﷺ بێ ئاگانەبوو لەئەم تۆڕە هاوپەیمانیتی وڕێککەوتننامانە، کاتێك کەبەرەو تائیف دەچوو، بەڵکو ئەوەشی دەزانی کەتائیف دەسەڵاتێکی مەرکەزی تیادا نییە، بەڵکو دەسەڵات بەدەستی دوو تیرەوەیە لەعەرەب، بەپێی ڕێککەوتننامەیەکی ناوخۆیی، هەریەکێکیش لەو دوو هێزە لەبازنەی هۆزێکی دەرەکی گەورەدا بوو، بۆیە ئەگەر لایەنگری یەکێك لەو دوو هێزەی بەدەست بهێنایە، کاریگەری گەورەی دەبوو لەسەر هاوسەنگی هێزە سیاسیەکان، ئەمە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەت ئەگەر بیتوانیبا هاوپەیمانەکانی

١- بڕوانە: اصول الفكر السياسي في القرآن المكي ١٧٤ .

٢- هەمان سەرچاوە لا ١٧٤ .

بکردایـە بـە لایـەنگری خـۆی، کەئـەوان لەگـەڵ قوڕەیـشدا ڕێککـەوتبوون، ئـەوا نەخشەکەی دەگەشتە کۆتایی، بـەڵام مـەحاڵ بـوو، چـونکە پێغەمبـەرﷺ دەیزانـی پەیوەندی ئەم هێزە لەگەڵ قوڕەیشدا بنیات نەنراوە لەسەر قایلبوون وڕەزامەنـدی، بەڵکو لەسەر بنەمای ترس دروست بووە، بۆیە پێغەمبەرﷺ یەکسەر ڕوویکردە لای بەنی عەمری کوڕی عومەیری سەرانی هاوپەیمانەکان کەلەگـەڵ قوڕەیـشدا بـوون و، نەچوو بۆلای بەنی مالیك لەگەڵ هەوازن دا بوون.[١]

ئیبنو هیشام لە(السیرة) دەڵێت: ((کاتێك پێغەمبـەرﷺ گەیـشتە تـائیف، چـووە لای کەسانێك لەهۆزی سەقیف، ئەوان لەو ڕۆژگارە سەرکردە بوون، سێ کەس بوون هەرسێکیان برا بوون عەبدویالیل ومەسـعودو حـەبیبی کـوڕانی عـەمر، یەکێکیـشیان خێزانەکەی لەقوڕەیش بوو لەبەنی جومەح،[٢] بەڵام کـوڕانی عـەمر زۆریـان وریاییـان دەکردو دەترسان، بۆیە نەهاتنە پێشوازی پێغەمبەرﷺ وە، بـەڵکو زیادە ڕەوییـان کرد لەبێڕەوشتی لەگەڵیداو پێغەمبەرﷺ لەلایان هەڵـسا بـەبێ هیـوایی، بـەڵام پێـی فـەرموون: ((اذا فعلـتم مـافعلتم فـاکتموا عنـی)) واتـە: ئەگـەر چـی واتـان کـردووە بەرانبەرم بەڵام ئەمە باس مەکەن، چونکە پێغەمبەرﷺ حەزی نەدەکرد ئـەم باسـە بگاتەوە مەککەو، پێی خۆش بوو ئەو پەیوەندییانەی لەکەشـێکی نهێنـی دا ئـەنجام بدرێت، زۆریش گرنگی دەدا بەدووربینی و وریایی، بۆ نموونە:

أ- بەپیادە لەمەککە دەرچوو، بۆ ئەوەی قوڕەیش وانەزانن بەتەمای دەرچـوونە لەمەککە، چونکە ئەگـەر بەسـواری دەربـچوایە، گومـان لـەدەوری دروسـت دەبـوو، کەدەیەوێت بەرەو لایەك گەشت بکات، ئەو کاتەش ئەگەری ڕێگە لێگرتنی دەبوو.

ب- ئینجا هەڵبژاردنی زەید بۆ هـاودەمی، چـەند لایـەنێکی ئاسایشیی تیادایـە، چـونکە زەیـد کـوڕی پێغەمبـەرەﷺ بەڕێگـەی بـەکوڕکردن (التبنّـي)، واتـە کـەس گومانی بۆ دروست نابێت، بەهۆی پتەوی پەیوەندی نێوانیان، ئینجا پێغەمبـەرﷺ شارەزای زەید بوو لـەڕووی ڕاسـتگۆیی ودڵـسۆزی ودەسـتپاکی یـەوە، کەواتـە ئـەو

---

١- بڕوانە: اصول الفكر السياسي في القران المكي ١٧٥ .

٢- سيرة ابن هشام ٢/٧٨ .

نهێنی نادرکێنیٚ و، پشتی پێدەبەسترێت، هەروەاش دەرچوو، چونکە زەید خۆی دەدایە بەر ئەو بەردانەی بۆ پێغەمبەرﷺ، دەهاوێژرا تەنانەت سەری شکا.

ج- کاتێك سەرانی تائیف بەو شێوە ناشیرینە وەلامی پێغەمبەرﷺ یان دایەوە، ئەوە واینەکرد پێغەمبەری خواﷺ تووشی تورەیی وهەلچوون بێت، بەلکو تەنها داوای لێکردن ئەو مەسەلە بشارنەوە، چونکە ئەگەر قورەیش بەمەبزانیٚ نەك هەر گالتە جاڕی پێدەکەن، بەلکو لەوانەیە ئەشکەنجەشی زیاد بکەن و، هەولبدەن چاودێری جموجۆلەکانی بکەن لەناوو دەرەوەی مەککە.[1]

٣- نزاو پاڕانەوەیەك :

بەنی عەمر خەلکێکی خراپ بوون، ئەم دەنگ و باسەی پێغەمبەرﷺ یان نەشاردەوە، بەلکو گێل وگەمژەو کۆیلەکانیان هاندا جنێو بەپێغەمبەرﷺ بدەن و بەردبارانی بکەن، تاکو پاژنەکانی خوێنیان پیاهاتە خوارەوەو نەعلەکانی خوێناوی بوون، خوێنی موبارەکی رژایە سەر خاکی تائیف، هەر بەدوایانەوە بوون تاکو گەیاندیانە لای باخێکی عوتبەوشەیبەی کوڕی ڕەبیعەوهەردوکیشیان لە ناو باخەکەدا بوون ئیتر ئەو منالیٚ وکوێلانەش گەڕانەدواوە، لەم کاتەدا خۆی وزەید هاتنە سێبەری دار مێوێك، تاکو هەندیٚ پشوو بدەن، هەردوو خاوەنی باخەکەش سەیریان دەکردو، دەیانبینی چی بەسەر هاتووە بەدەست خەلکی تائیف، بیٚ ئەوەی لەشوێن خۆیان بجولێنەوە، لەگەرمەی ئەم خەم وئازاری دەرونی و جەستەییەدا، ڕویکردە خوای بەئەم پاڕانەوەیە:

((اللهم اليك اشكو ضعف قوتي، وقلة حيلتي، وهواني على الناس، ياارحم الراحمين انت رب المستضعفين وانت ربي، الى من تكلني؟ الى بعيد يتجهمني ام الى عدو ملكته امري، ان لم يكن بك علي غضب فلا ابالي، ولكن عافيتك اوسع لي. اعوذ بنور وجهك الذى اشرقت له الظلمات وصلح عليه امر الدنيا والاخرة، من ان تنزل بي غضبك، او يحل علي سخطك، لك العتبى حتى ترضى، ولاحول ولاقوة الابالله))[2]

---

١- في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية ١٠٩، ١١٠ .

٢- دکتور (أكرم ضياء العمري) ئەم فەرموودەی بەلاواز داناوە لەکتێبی (السيرة النبوية الصحيحة) ١٨٦/١، بەلام (ابراهيم العلي) بە(صحيح)ی داناوەو وتویەتی شاهیدێکی هەیە بەهێزی دەکاتەوە، بۆیە وەکو

واتە: خوایەگیان سکاڵای بێ هێزی وکەمی ڕێگە چارەو سووک بوونم لەلای خەڵك بۆ تۆ دەکەم، تۆلەهەموو بەبەزییەك بەبەزەیی تری، تۆ خوای لاوازەکان وخوای منی، بۆکێ بەجێم دێڵی؟ بۆ بێگانەیەك ڕووی گرژم پیشانبدات یان بۆ خزمێك کاری منت داوە بەدەستیەوە، ئەگەر تۆ لێم تورە نەبیت بێباکم، بەڵام سەلامەتیت بۆ من چاکترە، پەنادەبەمە بەر ڕووناکی ڕومەتت کەهەموو تاریکییەکانی بۆ ڕۆشن بووەتەوەو کاروباری دونیاو دواڕۆژیشی ڕاست کردوەتەوە، کەخەشم وتوڕەیی خۆت دابەزێنێت بەسەرمدا، یان بەر ناڕەزاییت بکەوم، ڕازیت دەکەم تاڕازی دەبیت، هیچ پەناو هێزێك نییە جگە لەتۆ.

٤- سۆزو بەزەیی پێغەمبەرایەتی :

سۆزو بەزەیی پێغەمبەرﷺ، لەهەڵوێستە سەختەکاندا زاڵدەبوو، لەکاتێکدا کەپێغەمبەرﷺ لەناخۆشترین حاڵدا بوو، لەو کاتانەی دەرونی مرۆڤ حەز لەتوندی وتۆڵە دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەرونە گەورەکەی وسۆزو بەزەییەکەی هەر زاڵدەبوو.[1]

عائیشە ڕەزای خوای لێبێت پرسیاری کرد لەپێغەمبەرﷺ: ئایا ڕۆژێکت لەڕۆژی ئوحود سەختتر بەسەر هاتووە؟ فەرمووی: ((لقد لقيت من قومك مالقيت، وكان اشد مالقيت منهم يوم عقبة...)).[2]

واتە: من لەمیللەتەکەی تۆ ئەوەی بینیم بینیم، بەڵام لەهەمووی سەختتر ڕۆژی عەقەبە بوو، چوومە لای ئیبنو عەبدویالیلی کوڕی عەبدوکولال، هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، ئیتر بەپەژارەوە لەلای دەرچووم وئاگام لەخۆ نەبوو تاگەیشتمە (قرن الثعالب) سەرم بەرزکردەوە بینیم پەڵە هەورێك سێبەرم بۆ دەکات، تەماشام کرد ئەوە جیبریلە، بانگی کردم و وتی: خوای گەورە وتەی میللەتەکەتی بیست وزانی

فەرموودەیەکی ڕاست باسی کردووە لەکتێبی(صحيح السيرة النبوية )١٣٦، هەروەها دکتور(عبدالرحمن عبدالحميد البر) مامۆستای فەرموودەو زانستەکانی لەزانکۆی ئەزهەر وتوویەتی فەرموودەکە بەهەردوو ڕێگەکەیەوە ڕاستەو وەرگیراوە، جابڕوانە چی وتووە لەکتێبی (الهجرة النبوية المباركه) ٣٨ .

١- بڕوانە: مقومات الداعية الناجح ٧٦ .

٢- صحيح البخاري رقم ٣٢٣١ .

چۆن وەڵامیان دایەوە، خوای گەورەیش (ملك الجبال)ی ناردووەو فەرمانی پێکردووە گوێڕایەڵیت بکات بۆ هەر فەرمانێك پێت خۆشە، (ملك الجبال) بانگی کردمو‌سڵاوی لێکردم ووتی: ئەی موحەممەد ئەگەر دەتەوێت هەردوو شاخەکەیان بەسەردا دەدەم.

ئیتر پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((بل ارجو ان يخرج الله من اصلابهم من يعبد الله وحده لايشرك به شيئاً)) واتە: بەڵکو ئومێدەوارم خوای گەورە لەوەچەکانی ئەمانە کەسانێك بهێنێ تەنها خوای گەورە بپەرسن وهاوەڵی بۆ پەیدا نەکەن.

بەڵێ لەڕۆژی ئوحود برینی جەستەی سەخت بوو، بەڵام لەڕووی دەرونیەوە ڕۆژی تائیف سەختتر بوو، چونکە دەرونی موبارەکی زۆر ماندوو بوو، بەشێوەیەك تاکو گەیشتە (قرن الثعالب) هەر بیری دەکردەوە.

لەم پاڕانەوەدا تێبینی قوڵبونەوەی پێغەمبەر ﷺ دەکرێت لەیەکتاپەرستیدا، دەردەکەوێت چۆن پێغەمبەرﷺ تەنها مەبەستی ڕەزامەندی خوا بووە، ئەگەریش ناخۆشی وبەڵا لەلای خواوە بێت لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورە، بەڵا لەو حاڵەتەدا نیعمەتەو بابەخێربێت .

پاڕانەوەکەشی بەوشێویە کۆتایی پێدەهێنێ کەهاوەڵانیشی فێر کردووە لەکاتی ناخۆشیدا بیڵێن ((ولاحول ولاقوة إلا بك)).

چونکە هیچی پێناکرێت بەبێ یارمەتی خوای گەورە .[١]

پاڕانەوە لەمەزنترین پەرستنەکانە، چەکێکی کاریگەریشە لەبواری پاراستنی مرۆڤداو، بەدیهێنانی ئارامی بۆی، بیرو هۆشیش هەرچەندە ئاستی بەرزبێتەوە، هەر قابیلی هەڵەوشکستە، موسڵمانیش کاتی وای بەسەردا دێت توانای بیرکردنەوەو بەڕێوەبردنی نامێنێ، ڕێگە چارەیەکیشی نامێنی تەنها پاڕانەوە نەبێت بۆلای خوای گەورە، پێغەمبەرﷺ کەلەپاڕانەوەکەی بوویەوە، یەکسەر خوای گەورە، وەڵامی پاڕانەوەکەی دایەوەو، جیبریل و(ملك الجبال)ی بۆ نارد .[٢]

---

١- التاريخ الاسلامي للحميدي ٣/٢٦، ٢٧ .

٢- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية .

**٥- لەبەرنامەکانی گۆڕانکاری :**

پێشنیاری (ملك الجبال) ئەوە بوو هەردوو چیاکە بدات بەسەریاندا ، ئەمەیش شێوازی بنەبڕکردن دەگرێتەوە، کەپێشتر لەسەر میللەتانی نوح و، عادو، سەمودو، نەتەوەی (لوط) جێبەجێ کراوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِۦ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ (العنكبوت:٤٠) .

پێشنیارێکی تر هەبوو لەلایەن زەیدەوە، کەبەردەوام بێت لەکۆچەکەیداو دوورکەوێتەوە لەمەککەو لەتائیفی بێباوەڕ؛ چونکە یەکەمیان دەریکردووەو، دووەمیان وازیلێهێناوە، ئیبنو لقەییم دەڵێت (پێغەمبەری خواﷺ لەپاش ئەوەی هیچ پشتیوانێکی دەستنەکەوت لەتائیف، گەڕایەوە بۆ مەککە لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسە بەخەمباری، دەپاڕایەوە بەنزای بەناوبانگی تائیف، ئیتر پەروەردگاری فریشتەی چیاکانی بۆ نارد، کەهەردوو شاخەکە بەسەر خەڵکی مەککەدا بخات، بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((لا، بل استأني بهم، لعل الله يخرج من اصلابهم من يعبده، ولايشرك به شيئاً)) واتە: نەخێر، بەڵکو هەر چاوەڕوانیان دەکەم، بەڵکو خوای گەورە لە وەچەکانیان کەسێك دەربکات، کە خوا پەرست بێت و هاوبەش پەیدا نەکات، ئینجا چەند ڕۆژێك لەنەخلە مایەوە، جا زەید پێی ووت: چۆن دەگەڕێیتەوە ناویان لەکاتێکدا ئەوان تۆیان دەرکردووە، فەرمووی: ((یازید: ان الله جاعل لماتری فرجاً و مخرجاً، وان الله ناصر دينه ومظهر نبيه))[١] واتە: خوای گەورە گوشادییەك دەکاتەوە لەم دۆخەی کەدەیبینیوخوا ئاینی خۆی سەردەخاتوپێغەمبەرەکەشی سەردەخات.

پێغەمبەری خواﷺبەرنامەی بنەبڕکردنی ڕەتکردەوە،هەروەها بیرۆکەی دابڕان و کۆچی بەردەوامی پێ پەسەند نەبوو، بەڕۆناکی باوەڕ تەماشای ئایندەی دەکرد،

---

١- بڕوانە: زاد المعاد ٤٦/٢، ٤٧ طبعة مؤسسة الرسالة رقم ١٥ ج ٣١/٣_٣٤ .

بۆیە بڕیاریدا دوو بارە بچێتەوە نێو شاری مەککەی بێباوەڕ، بۆ ئەوەی درێژەبدات بەجیهادە پیرۆزەکەی، هەموو هەلێکیش بقۆستێتەوە لەپێناو بانگەوازەکەیدا، پێغەمبەرﷺ هیچ ڕێگا چارەیەکی لەوانە هەڵنەبژارد، بەڵکو ڕێگایەکی تری هەڵبژارد، ئەویش ئەوە بوو بڕیاری چوونە ژوورەوەی مەککەیدا، بۆ ئەوەی لەنەوەی ئەوان خەڵکانێك ببنە پشتیوان بۆ ئایینی یەکتاپەرستی وجیهاد لەپێناوی ئیسلامدا، نەکو پاشەکشە بکات لەڕووداوەکان [1] پێغەمبەرﷺ ئەو بڕیارەی دابوو، بەڵام جێبەجێکردنیشی کارێکی ئەستەم بوو، ئەگەری زۆریش هەبوو ڕووبەڕووی غەدر لێکردن بوایەتەوە، یان کوژرانی لەلایەن قورەیشەوە، کە چیتر توانای ئارام گرتنی نەمابوو لەسەر موحەمەد ﷺ، کەپەنایشی دەبردە بەر هۆزەکانی تر، ئینجا ئەگەر مەترسیش لەسەر ژیانی نەبوایە، گەڕانەوە پاش شکستی تائیف وایدەکرد خەڵکی مەککە ئەوە بەتێشکانێکی گەورە بژمێرن، کەتووشی موسڵمانان بووەو، ببێتە مایەی توندتربوونیان بەرانبەر موسڵمانان، بۆیە ئەمجارە پێغەمبەرﷺ بڕیاری ووژاندنی بارودۆخەکەی دا لەناو خۆی مەککەوە، لەجیاتی ئەوەی دەوری بدات لەدەرەوە، واتە ویستی بچێتە نێو تیرەو هۆزەکانی قورەیش وهاوپەیمان لەنێوێندا بۆ خۆی پەیدابکات.[2]

ئیبنو هیشام لەکتێبی (السیرة)ە کەیدا سەبارەت بەداڵدەدانی موتعیمی کوڕی عەدی دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەرﷺ لەتائیف گەڕایەوە بەبێ ئەوەی باوەڕی پێ بکەن، یان پشتگیری بکەن، ڕۆیشت بۆ ئەشکەوتی حیرا، لەوێیشەوە ناردی بەدوای ئەخنەسی کوڕی شەریقدا بۆ ئەوەی داڵدەی بدات، بەڵام ئەو وتی: من خۆم هاوپەیمانم وداڵدەدانی کەسم پێناکرێت، ئینجا ناردی بەشوێن سوهەیلی کوڕی عەمردا، ئەویش وتی: بەنی عامر هەرگیز کەس داڵدەنادەن لەدژی بەنی کەعب؛ ئینجا ناردی بەشوێن موتعیمی کوڕی عەدی _سەرگەورەی بەنی نەوفەلی کوڕی عەبدو مەناف_ داوای لێکرد داڵدەی بدات، ئەویش ڕازی بوو، کوڕو خزمەکانی

---

١- بڕوانە: اصول الفكر السياسي في القران المكي ١٧٦ .
٢- هەمان سەرچاوە ١٧٨،٧٧ .

کۆکردەوەو وتی: چەکەکانتان لەشانبکەن ولەلای گۆشەکانی مالّی خوا ڕاوەستن، چونکە من دالّدەی موحەمەدم داوە، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەلّ زەیددا هاتە مەککەوە، تاکو گەیشتە ناومزگەوتی حەرام؛ موتعیمی کوڕی عەدی ش هەلّساو هاواریکرد: ئەی کۆمەلّانی قورەیش من پەنای موحەمەدم داوە و باکەس بێزاری نەکات، ئینجا پێغەمبەرﷺ چووە ڕوکن ودەستی پێوەگرت و دوو ڕکات نوێژی کردو ڕۆیشتەوە بۆ مالّەکەی، موتعیمی کوڕی عەدی وکوڕەکانی تەماشایان دەکرد و شمشێرەکانیان لەدەست بوو تاکو چووە مالّەکەی خۆیەوە.[١]

بارودۆخ گۆڕانکاری زۆری بەخۆیەوە بینی بەهۆی کارکردن بەپێی بەرنامەی تازەی پێغەمبەرﷺ ، لەجیاتی ئەوەی بەخۆشاردنەوەو شکستەوە بێتە ناو مەککەو، ئەمجارە بەپارێزگاری یەکێك لەسەرانی قورەیش هاتە ناو مەککەوە، تێبینیش دەکرێت کە پێغەمبەرﷺ ، پیاوێکی لەهۆزی خوزاعە نارد بۆ لای موتعیم، لەم دوو هەلبژاردنەشدا شارەزایی سیاسی وتێگەیشتنی مێژووی قوولّی تیا بەدیدەکرێت، چونکە نەوفل کە باپیرە گەورەی بەنی نەوفەلەو لەو کاتە موتعیم سەرۆکی بوو، ناحەزی عەبدولموتەلیبی باپیرەی پێغەمبەربووﷺ لەسەردەمی جاهیلیدا، چونکە هەندێ شوێن وڕێ ی عەبدولموتەلیبی داگیر کردبوو، ئەویش داوای لەکەسەکانی کرد هەلّسن لەدژیان، بەلّام بەدەنگی یەوە نەهاتن، بۆیە ناچار بوو ناردی بەشوێن خالّۆکانیدا لەبەنی نەجاری خەزرەج، لەڕێگەی هۆنراوەیەکەوە بۆ ئەو مەبەستە هەلّیبەست، ئیتر خەلّکانێکی زۆر لەئەوان هاتن بۆ هاواری عەبدولموتەلیب و، لەلای کەعبە لایاندا، کاتێك نەوفل ئەوانەی بەچەلّك و قەلّغانەوە بینی ترساو هەموو ئەو شتانەی داگیر کردبوو گێڕایەوە بۆ عەبدولموتەلیب، دوای ئەوە خوزاعە وتیان، کەسمان نەبینیوە لەمەککەدا، جوانترو بەڕەوشتترو بەئارام تر لەعەبدولموتەلیب، ئەوا خالّوانیشی پشتیان گرت، خۆ ئەگەر ئێمە پشتمان بگرتایەوە یارمەتیمان بدایە سودمان لەخۆی وخزمەکانی دەبینی، ئینجا پیاو ماقولّانیان هاتن ووتیان: ئەی باوکی حاریس تۆ کوڕی ئێمەی وەکو چۆن کوڕی

---

١ –سيرة ابن هاشم ٣٨١/١ ثم زاد المعاد٤٧/٢ .

ئـەوانی، ئینجـا ئێمـە هاوشـان پێکـەوە دەژیـن، ڕۆژگـاریش ئـەو کینـەی لەدڵمانـدا نەهێشتووە دژبەقورەیش، جاوەرە بابپین بەهاوپەیمان، عەبدولموتەلیب ئەو قسەی پێ باش بوو، بەپەلەیش ئـەو پێـشنیازەی قبـوڵ کـرد، کەسـیش لەبـەنی نەوفـەل و عەبدو شەمس ئامادەی نەبوون.[١]

ئەم دەقە ئاماژە دەکات بـۆ ڕەگـی ململانـێ لـەڕووە مێژووییەکەیـەوە، لـەنێوان خوزاعەو قورەیش، کاتێـك قوصـەی کـوڕی کـیلاب قورەیـشی کۆکردەوە لەشـوێنە جیاجیاکانداو، شەڕی خوزاعەیان کرد کەخاوەن سـەرۆکایەتی ودەمڕاسـتی عـەرەب بوو، خوزاعـەیان لـەماڵی خـوا دەرکـردو مەککـەیان کـرد بەچـوار بەشـەوە لـەنێوان قورەیـشدا، ئـیتر خوزاعەهـەر لـەو ڕۆژگـارەوە ڕقیـان لـەقورەیش بـوو، کـاتێکیش ڕووداوەکـان ئـاڵۆزبوون لـەنێوان قـورەیش وعەبدولموتتەلیبـدا، خوزاعـە لەگـەڵ عەبدولموتتـەلیب هاوپـەیمانێتیان کـردو لـەدژی قـورەیش وەسـتان بـۆلاوازکردنی، پەیوەندییەکانی نێوان خوزاعەو قـورەیش هەمیـشە هـەرخراپ بـووە. بۆیـە ناردنی پێغەمبـەرﷺ بـۆ پیـاوێکی خوزاعـەیی بـۆلای سـەر گـەورەی هـۆزی بـەنی نـەوفل ئاماژەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەو ڕووداوە، وەبیرخستنەوەیەکیشە بۆ ئەو هاوپەیمانێتیە کۆنـە، داڵـدەدانی مـوتعیمی کـوڕی عـەدی بـۆ پێغەمبـەرﷺ تـەنها هەڵوێـستێکی جوامێرانە نەبوو، بەڵکو چاودێرییەك بوو بـۆ بەرژەوەندییـەکانی خـۆی، بـێ دەنگـی قورەیشیش لەداڵدە دانی مـوتعیم بـۆ پێغەمبـەرﷺ، لەترسـی چـەك نـەبوو، بـەڵکو لەترسی چەکەکانی هەموو خوزاعەو خەزرەج بوو.[٢]

هەروەها لەیادمان نەچێت کەموتعیم یەکێ بوو لەوانەی لاپـەڕەی ستەمکاری دژبە بەنی هاشم لابرد، پاش ئەوەی لەهەڵبەستێکدا ئەبو تالیب گلەیی لێکردبوو.

پێغەمبەرﷺ یش ئەم چـاکەی موتعیمـەی هـەر لەبـەر چـاوبوو، کـەخۆی وکـوڕو خزمەکانی خستە مەترسیەوە لەپێناویدا، بۆیە دەربارەی دیلەکانی بەدر فـەرمووی: ((لو كان المطعم بن عدی حياً ثم كلمنی في هؤلاء النتنى لتركتهم له)).[٣] واتە: ئەگەر

---

١- بڕوانە: انساب الاشراف للبلاذری، تحقيق محمد حميد الله ٧١/١ .

٢- بڕوانە: اصول الفكر السياسي في القران الكريم لا،١٨ .

٣- البخاری، كتاب ٦٤ باب ١٢ ورقمه ٤٠٢٤ .

موتعیمی کوڕی عەدی لەژیاندا بوایە وقسەی لەگەڵم بکردایە دەربارەی ئەو بۆگەنانە وازم لێیان دەهێنا لەبەر خاتری ئەو، کەواتە پێغەمبەرﷺ سەرەڕای دوژمنایەتی بیروباوەڕ جیاوازی دەخاتە نێوان ئەوانەی لەڕووی ئیسلام ڕاوەستان وئەوانەی پشتگیریان کردو چاکەیان لەگەڵ کرد، چونکە لەڕەوشتی پێغەمبەرایەتیدا نییە کەچاکە لەبیر بکات.[1]

بەم شێوە پێغەمبەرﷺ ڕێ ورەسمی لەکۆمەڵگاکەی بەکاردەهێنا بۆ بەرژەوەندی ئیسلام، بۆیە تەماشای بونیاتی کۆمەڵایەتی دەکرد وەکو ڕاستیەکی مێژوویی، تەماشای مرۆڤی بێباوەڕی نەدەکرد وەکو ژمارەیەك لەناو ژمارەکاندا، بەڵکو وەکو تاکێك لەنێو تۆڕێکی کۆمەڵایەتی بەیەکداچوودا، مرۆڤیش توانای هەیە کەبەخۆی ببێتە هێزێکی کۆمەڵایەتی کاریگەر، موتعیمی کوڕی عەدی ش تاکەکەسێك نەبوو، بەڵکو دامەزراوەیەك بوو، بەلەدایکبوونی خۆی لەدایك نەبوو، بەڵکو لەدایکبونی دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی کۆن بۆکاتی ململانێی یەکتاپەرستی و بتپەرستی، جا ئەگەر ئێستا بووەتە دامەزراوەیەکی پەتی بۆ بێباوەڕان، ئەوە ناگەیەنێت کەسوودی نەمابێت و بەکارنەهێنرێت بۆ هەوڵدانی گێڕانەوەی بۆ ئیسلام.

٦- گەشتەکەی پێغەمبەرﷺ هەندێ سەرکەوتنی چاکی لەبواری بانگەوازدا بەدیهێنا، یەکێ لەوانە کاریگەربوونی لاوێکی نەصرانی (عەدداس)بە پێغەمبەرﷺ و موسڵمان بوونی، هەروەها موسڵمان بوونی هەندێ لەجنۆکەکان، کەگەڕانەوە لای کۆمەڵانی خۆیان وئاگاداریان کردنەوە.

**أ-بەسەرهاتی عەدداس :**

کاتێك پێغەمبەرﷺ تووشی ئێش و زیان بوو لەخەڵکی تائیف ەوەو، ناچاریان کرد پەناببات باخێکی عوتبە وشەیبەی کوڕانی ڕەبیعە، کەهەردووکیان لەو کاتە لەناو باخەکەدا بوون و، بەزییان پیاداهات و، لاوێکی نەصرانی کارکوزار لەلایان هەبوو، ناوی عەدداس بوو، بەبۆڵێك تری ناردیانە لای پێغەمبەرﷺ، عەدداسیش ترێکەی لەبەردەم پێغەمبەرداﷺ داناو پێی وت: بخۆ. پێغەمبەرﷺ کاتێك دەستی

---

١- بڕوانە: التحالف السیاسی ٤٤.

بۆ برد فەرمووی: ((بسم اللـه)) وئینجا خواردی، عەدداس تەماشای نێو چاوانی پێغەمبەرﷺ ی کرد ووتی: سوێند بەخوا خەڵکی ئەم وڵاتە قسەی لەو شێوە ناکەن، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی وت: ((ومن اهل اي البلاد انت ياعداس؟ وما دينك؟)) واتە: ئەی خەڵکی کام وڵاتی عەدداس؟ ئەی لەسەر چی ئایینێکی؟ وتی: من نەصرانیم وخەڵکی نەینەوام. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەلادێکەی یونسی پیاوی خواناس، عەدداس ووتی: ئەی تۆ چوزانی یونس کێیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ذاك اخي كان نبيا وانا نبي)) واتە: ئەو برامە، ئەو پێغەمبەربوو، منیش پێغەمبەرم. ئیتر عەدداس دەستی کرد بەماچ کردنی سەری و دەست و قاچی، کوڕانی ڕەبیعە یەکێکیان بەوی تریان وت: کارگوزارەکەتی تێکدا، کاتێك عەدداس گەڕایەوە لایان پێیان وت: ئەوە چی بوو دەست و قاچیت ماچ دەکرد؟ وتی: گەورەم لەسەر زەویدا کەسی تر نییە لەئەو چاکتر، شتێکی پێوتم پێغەمبەر نەبێت کەس نایزانێت، وتیان: بەڵات لێکەوێت ئەی عەدداس، لەئایینەکەت هەڵتنەگێڕێتەوە چونکە ئایینی تۆ لەئایینی ئەو چاکترە.[1]

*(بسم اللـه) کردنی پێغەمبەر ﷺ پێش خواردن، جێبەجێکردن بوو بۆ سوننەتێك لە سوننەتەکانی ئیسلام، چاکەی ئەوەشی تیابوو کەئەم لاوە نەصرانییەی بۆ ئیسلام ڕاکێشا، لەگەڵ پێغەمبەر ناوی خوای برد پێش خواردنەکە، ئەم لاوە هەموو هەست ونەستی هاتە جۆش و خرۆش وسەرسوڕمانی خۆی ڕاگەیان لەکارەکەی، چونکە خەڵکی ئەو وڵاتە ناوی خوا ناهێنن پێش خواردن.

*(بسم اللـه) کردن لەپێش خواردن وەکو هەموو سوننەتە دیارەکانی تر، لەهۆکانی جیابوونەوەی موسڵمانە لەدەوروبەرە بتپەرستەکە، ئەم جیابوونەوەش سەرنجی بێباوەڕان ڕادەکێشێت و، پاڵیشیان پێوە دەنێ پرسیار بکەن ولەئیسلام حاڵی بن ولێی نزیك ببنەوە.[2]

*عەدداس دڵنیابوونی تەواوی هەبوو بەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ. بەبەڵگەی هەڵوێستی لەهەردوو سەرگەورەکەی، کاتێك فەرمانیان پێکرد لەگەڵیان دەرچێت بۆ

---

١- صحيح السيرة النبوية ١٣٧،١٣٦ .

٢- بروانە: التاريخ الاسلامي ٢٢/٣ .

جەنگی بەدر، وتی: دەتانەوێت بچم بۆ شەڕی ئەو پیاوەی لەباخەکەتاندا بوو؟ سوێند بەخوا چیاکان خۆیان ناگرن لەبەردەمیدا، وتیان: بەڵات لێکەوێت ئەی عەدداس، بەزمانی جادووی لێکردی[١].

*ئەو وتەیەی عەدداس ((لەسەر زەویدا کەس نییە لەئەو چاکتر)) دڵنەواییەکی گەورەبوو بۆ پێغەمبەرﷺ، چونکە ئەگەر چی کەسەکانی خۆی ئێش وئازاری دەدەن، ئەوە بێگانەیەکە لەنەینەواوە دەست وقاچی ماچ دەکات و، شایەتی پێغەمبەرایەتی بۆ دەدات، ئەمەیش قەدەرێکی خوایەتی یە، کەسێك لەنەینەواوە پاڵدەنێت بۆ ئەوەی باوەڕبەخواو پێغەمبەرەکەی بهێنێت[٢].

**ب_ موسڵمان بوونی جنۆکە:**

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەتائیف گەڕایەوە بۆ مەککە و لەسەقیف بێ هیوا بوو، کەگەیشتە ناوچەی نەخلە، لەشەودا دەستی کرد بەشەو نوێژ، لەو ساتەدا کەسانێك لەجنۆکەکان گوێیان لێ گرت، حەوت کەس بوون لەجنۆکەکانی نەصیبین، کەخوای گەورە لەقورئاندا باسیکردوون، ئەوان گوێیان گرت لەخوێندنەوەکەی پێغەمبەرﷺ تاکو لێی بوویەوە، ئەو کاتە گەڕانەوە بۆلای کۆمەڵانی خۆیان ووریاییان پێدان و ئەوانیش موسڵمان بوون، خوای گەورەیش سەرگوزشتەکەیانی باس کرد لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی ﷺ ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (الاحقاف: ٢٩،٣٠).

ئەو جنۆکانە دابەزینە سەر پێغەمبەر ﷺ، لەکاتێکدا ئەو خەریکی خوێندنەوەی قورئان بوو، کەگوێیان لێبوو، وتیان: ﴿أَنصِتُوا۟﴾ واتە: بێدەنگ بن وگوێ ڕاگرن.

---

١- بڕوانە: سبل الهدى والرشاد ٥٧٨/٢ .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٤٣٧/١ .

ئـەم بانگـەوازە بـوو کەبتپەرسـتەکان لـەتائیف ڕەتیـان کـردەوە، هـەمان ئـەو بانگەوازە دەگوێزرێتەوە بۆ جیهانێکی تر، کەجیهانی جنۆکەکان بـوو، ئـەوان هـاتن بەدەنگی بانگەوازەکەیەوە وبەمیللەتەکەی خۆیشیانیان گەیانـد، وەکـو چـۆن ئـەبو زەڕی غیفاری وتوفەیلی کوڕی عەمرو زیمادی ئەزدی گەیاندیان بەخزم وکەسەکانی خۆیان، بەهەمان شێوە لـەجیهانی جنۆکەشدا کەسـانێك پەیدا بـوون ئـایینی خـوا بگەیـــــەنن ﴿ يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾ (الاحقاف: ٣١).

ناوی موحەمەد ﷺ وای لێهات دڵی جنۆکەکانیش بۆی دەگەشایەوە، نەوەك دڵی باوەڕدارانی مرۆڤەکان بەتەنها، کەسانێك لەئەوانیش ئالآی یەکتاپەرستیان بەرزکردەوە، خۆیانیان یەکلاکردەوە بۆ بانگەواز کردن بۆ لای خوا، خوای گەورەیش بەشێوەیەك باسی ئەوانەی کردووە تاکو ڕۆژی دوایی هەر بەسەر هاتنەکەیان بخوێنرێتەوە خوای پەروەرگار دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴿١﴾ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةٗ وَلَا وَلَدٗا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطٗا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٞ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٖ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقٗا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمۡ ظَنُّواْ كَمَا ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ أَحَدٗا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدۡنَٰهَا مُلِئَتۡ حَرَسٗا شَدِيدٗا وَشُهُبٗا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقۡعُدُ مِنۡهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمۡعِۖ فَمَن يَسۡتَمِعِ ٱلۡأٓنَ يَجِدۡ لَهُۥ شِهَابٗا رَّصَدٗا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدۡرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ أَرَادَ بِهِمۡ رَبُّهُمۡ رَشَدٗا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدٗا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعۡجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَن نُّعۡجِزَهُۥ هَرَبٗا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦۖ فَمَن يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخۡسٗا وَلَا رَهَقٗا ﴾ (الجن: ١_١٣).

ئەوە فەتحێکی خوایی بوو لەبواری بانگەوازدا، لەکاتێکدا بوو کەپێغەمبەر ﷺ لەناوچەی نەخلەدا بوو، توانای ئەوەی نەبوو کەبێتە ناو مەککەوە، ئایا سەرکەشەکانی قوڕەیش دەیانتوانی باوەڕدارانی جنۆکەکان بەدیل بگرن جۆرەها ئەشکەنجەیان بدەن؟.[1]

کاتێك پێغەمبەرﷺ هاتە مەککەوە لەپەنای موتعیم دا، سورەتی (الجن)ی بەسەر هاوەڵاندا دەخوێندەوە، دڵەکانی ئەوانیش بەجارێ دەخرۆشا بۆ قسەکانی خوای گەورە، چونکە دەرکەوت تەنها خۆیان نین لەم شەڕەدا، بەڵکو ئەوە برا جنۆکەکانیان هەمان شەڕیان بەرپاکردووە دژ بە بتپەرستی.

لەپاش یەکەم چاوپێکەوتنی نێردەی جنۆکان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دا بەچەند مانگێك، نێردەی دووەمیان هاتە خزمە پێغەمبەری خۆشەویست موحەمەد ﷺ، بۆ ئەوەی گوێ بگرن لەقسەی خوای گەورە.[2]

لەعەلقەمەوە هاتووە کەپرسیاری کردووە لەئیبنو مەسعودو ووتویەتی: ئایا کەسێك لەئێوە ئامادەبوون لەو شەوەی نێردەی جنۆکەکان هاتن؟ وتی: نەخێر، بەڵام شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بووین ولەپڕدیارنەما، ئێمەش لە دۆڵ و بەرزاییەکاندا بۆی گەڕاین، وتمان ڕەشەکوژ کراوە، دەڵێت: ئەو شەوە ناخۆشترین شەو بوو بەسەرماندا تێپەڕی، سەر لەبەیانی بینیمان لەلای ئەشکەوتی حیراوەهات، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، لێمان ونبوویت وبۆت گەڕاین ونەماندۆزیتەوە، شەوێکی یەکجار ناخۆشیشمان بەسەر برد، فەرمووی: ((اتاني داعي الجن، فذهبت معه، فقرأت عليهم القران)) واتە: نێردەی جنۆکە هاتنە لام ومنیش قورئانم بۆ خوێندنەوە دەڵێت: بردینی وشوێنەوارەکانیان وشوێنەواری ئاگرەکانیانی پێنیشانداین، پرسیاری خواردنیشیان لێ کرد، فەرمووی: ((نعم كل عظم ذكر اسم الله عليه يقع في ايديكم اوفر مايكون لحماً، وكل بعرة علف لدوا بكم)) واتە: هەموو ئێسقانێك ناوی خوای لەسەر هێنرابێت وەکو ئەوەیە زۆر گۆشتن بێت، هەموو

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٤٤٣/١ .

٢- هەمان سەرچاوە ٤٤٥/١ .

پشقلێکیش ئالیکە بۆ ئاژەلەکانتان. دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فلا تستنجوا بها فانها طعام إخوانکم)).[١] واتە: خۆتانی پێپاك مەکەونەوە چونکە خواردنی براکانتانە.

ئەم سەرکەوتنە گەورەیە لەجیهانی جنۆکە، پێشەکییەك بوو، بۆ زنجیرەیەك سەرکەوتنی گەورە لەجیهانی مرۆڤەکاندا، چونکە چاوپێکەوتن لەگەڵ نێردەی ئەنصارەکاندا پاش چەند مانگێك روویدا.[٢]

١- مسلم، کتاب الصلاة ١/٣٣٢ رقم ١٥٠_٤٥٠ .
٢- بڕوانە: التربیة القیادیة ١/٤٤٥ .

## باسی چوارەم: ئیسراو میعراج..... ئەوپەڕی ڕێزلێنان

پێمان وایە ئەم کارە لە ئاسابەرە مەزنە، چەند ئامانجێکی تیادابوو: خوای گەورە دەیەویست هەلێك بڕەخسێنی بۆ پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی چاوی بکەوێتە دیاردە گەورەکانی دەسەلاتی، تاکو دڵی پڕبێت لەسوکنایی ومتمانەو، بەهێزتربێت لە هێرش بردنە سەر دەسەلاتی بێباوەڕان لەسەر زەوی، وەکو ئەوەی لەگەڵ موسا ڕوویدا، کاتێك خوای گەورە ویستی دەسەلاتی مەزنی خۆی پێ پیشان بدات، پێی فەرموو: ﴿قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى﴾ (طه: ١٩_٢٣)

لەگەشتی ئیسراو میعراجدا خوای گەورە نیشانەی گەورەی بەپێغەمبەرەکەی نیشاندا، وەکو پێشەکی یەك بۆ کۆچکردن و، بۆ گەورەترین ڕووبەڕووبوونەوە_بەدرێژایی مێژوو_ لەدژی بێباوەڕی وگومڕایی وخراپەکاری، نیشانەکانیش زۆر بوون: ڕۆیشتن بۆ بەیتولمەقدیس، بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان، بینینی ئەو نادیارانەی پێغەمبەران بانگەوازیان بۆ کردووە؛ وەکو: فریشتەو ئاسمانەکان و بەهەشت و دۆزەخ وەچەندین نموونە لە خۆشگوزەرانی و ئەشکەنجە.

ئاخاوتنی قورئان دەربارەی ئیسرا، لەسورەتی (الاسراء)دا بوو، هەروەها دەربارەی میعراج لەسورەتی(النجم)دا بوو، خوای گەورە باسی ئیسرائی کردووە و فەرموویەتی: ﴿لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ﴾ (الاسراء:١) لەسورەتی (النجم)یش دا دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾ ئینجا لەڕووداوی ئیسراو میعراجدا چەندین زانست ونهێنی ووردەکاری و وانەوپەندی تیادایە.[1]

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٤٤٥/١ .

مامۆستا(ابو الحسن الندوي) دەڵێت: ئیسرا هەروا ڕووداوێکی ئاسان نەبوو، پێغەمبەر ﷺ چەند بەڵگەیەکی گەورەی تیادا ببینێ، یان بەڵگەکانی ئاسمان و زەوی بەچاوی خۆی ببینێ، بەڵکو زیاتریش لەوانە، ئەم گەشتە پێغەمبەرایەتیە چەندین واتای گرنگ و ئاماژەیەی دانایی دووری تیادا بوو: هەردوو ئەو سوڕەتەی دابەزین لەمەڕ ئەم ڕووداوە، ڕایانگەیاند کەپێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری هەردوو قیبلەو،پێشەوای هەردوو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو،میراتگری پێغەمبەرانی پێش خۆی و، پێشەوای نەوەکانی داهاتووی دوای خۆیەتی، لەکەسایەتی پێغەمبەر ﷺ و لە ئیسرائەکەیدا مەککە گەیشت بەقودس و، بەیتولحەرام گەیشتە مەسجیدو لئەقصا، نوێژی بەپێغەمبەران کرد، ئەمەیش ئاگادارییەك بوو بۆ گشتگیری پەیامەکەی و هەمیشەیی پێشەوایەتی بۆ مرۆڤایەتی، بەکەڵك هاتنی ئایینەکەی بۆ هەموو کات و شوێنێك، هەروەها ئەم سوڕەتە پیرۆزە هەڵسا بەدەسنیشانکردنی کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ وباسکردنی پێشەوایەتی وسەرکردایەتی کردنی و، پلەوپایەی ئەو ئوممەتەی کەبۆی ڕەوانە کراوە، باوەڕی پێدەهێنێ و، ئەو ڕۆڵەی کەدەیگێڕێت لەجیهانداو، لەنێو گەل و نەتەوەکاندا.[1]

یەکەم: سەرگوزشتەی ئیسراو میعراج لەڕوانگەی فەرموودەکانەوە: لەئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أتيت بالبراق– وهو دابة ابيض طويل فوق الحمار ودون البغل ...)).[2]

واتە: بوراقیان بۆ هێنام– ولاغێکی سپی بەرزتر لەگوێ درێژو نزمتر لەهێستر، سمی دادەنێ لەئەو شوێنەی چاوی پێی دەگات، دەفەرموێت: سواری بووم وتاکو هاتمە(بيت المقدس)، دەفەرموێت: بەستم بەقوڵفی دەرگای(بيت المقدس)ەوە، کەپێغەمبەران پێش من ولاغەکانیان پێوەی بەستووە، دەفەرموێت: ئینجا چوومەناو مزگەوتەکەوەو، دووڕکات نوێژم تیاکرد، دوای ئەوە دەرچووم وجیبریل قاپێك مەی، قاپێ شیری بۆ هێنام، منیش قاپە شیرەکەم هەڵبژارد، جیبریل وتی: فیترەتت هەڵبژارد .

---

١– بڕوانە: الاساس في السنة ٢٩٢/١ .

٢– مسلم: كتاب الايمان، باب الاسراء برسول الله ﷺ رقم: ٢٥٩_١٦٢.

لەفەرموودەی مالیکی کوڕی صەعصەعەشدا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی شەوی ئیسرائی بۆ کردوون وفەرموویەتی: ((بینما انا في الحطيم))...............

لەکاتێکدا ڕاکشابووم لەنێوان ڕوکن ومەقامی ئیبراهیم_ یان لەحیجردا_ جیبریل هاتە لام ولەچاڵی قوڕگمەوە تاکو خواری ناوکمی دڕی ودڵی دەرکردم، دوایی تەشتێکی ئاڵتونینی هێنا پڕی بوو لەباوەڕ دڵی تیا شۆردمەوە، ئینجا پڕکرایەوە و گێڕدرایەوە جێگای خۆی، ئینجا وڵاغێکیان بۆ هێنام سپی بوو لەهێستر نزمترو لەگوێ درێژ بەرزتر، هەنگاوی لەئەو پەڕی جێگای بینینی دادەنا، لەسەر ئەوە سوار کرام و لەگەڵ جیبریل چووین تاکو گەیشتینە ئاسمانی یەکەم، داوای کرد دەرگاکە بکرێتەوە، ووتیان ئەوە کێیە؟ ووتی جیبریل، وتیان: کێت لەگەڵدایە، وتی: موحەمەد، وتیان: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، وتیان: بەخێربێت، ئینجا دەرگاکە کرایەوە وئادەم لەوێ بوو، وتی: ئەوە ئادەمی باوکتە، سڵاوی لێ بکە، منیش سڵاوم لێ کرد ووەڵامی دامەوەو وتی: بەخێر بێ ی ئەی کوڕی باش و، پێغەمبەری چاك، دوای ئەوە بەرزی کردمەوە تاگەیشتینە ئاسمانی دووەم وداوای کرد دەرگاکە بکرێتەوە، وتیان: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان: کێت لەگەڵ دایە؟ وتی: موحەممەد، وتیان نێردراوە بەشوێندا؟ وتی: بەڵێ، وتیان: بەخێربێت، دەرگاکە کرایەوە، بینیم عیساو یەحیا لەوێن، وتی: ئەوە یەحیاو عیسایە، سڵاویان لێ بکەو منیش سڵاوم لێکردن و وەڵامیان دامەوە، وتیان: بەخێر بێت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك، ئینجا بەرزیکردمەوە بۆ ئاسمانی سێیەم وداوای کرد بکرێتەوە وتیان: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان: ئەی کێت لەگەڵدایە؟ وتی: موحەممەد، ووتیان: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، ووتیان: بەخێربێت و، دەرگاکە کرایەوە بینیم یوسف لەوێیە، وتی: ئەوە یوسف ە سڵاوی لێ بکە وسڵاوم لێکرد، ئەویش وەڵامی دامەوە وتی: بەخێربێیت ئەی برای چاك وپێغەمبەری چاك.

ئینجا بەرزکرامەوە تاگەیشتینە ئاسمانی چوارەم وداوای کرد بکرێتەوە، وتیان: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان: ئەی کێت لەگەڵدایە. وتی: موحەممەد، وتیان: ئایا نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، وتیان: بەخێربێیت ودەرگاکە کرایەوە، بینیم

ئیدریس لەوێیە، وتی: ئەوە ئیدریسە، سڵاوی لێ بکە، منیش سڵاوم لێکرد وەڵامی دامەوە وتی: بەخێربێت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك .

ئینجا بەرزی کردمەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم وداوای کرد بکرێتەوە. وتیان: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: موحەممەد، وتیان: ئایا نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، وتیان: بەخێربێت ودەرگاکە کرایەوە، بینیم هارون لەوێیە، وتی: ئەوە هارونە سڵاوی لێ بکەو سڵاوم لێکردو، وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە ووتی: بەخێربێت ئەی برای چاك وپێغەمبەری چاك.

ئینجا بەرزی کردمەوە تاگەیشتینە ئاسمانی شەشەم وداوای کرد بکرێتەوە، وتیان: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتیان: کێت لە گەڵدایە؟ وتی: موحەممەد، وتیان: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، وتیان: بەخێربێت، بینیم موسا لەوێیە، وتی ئەوە موسایە سڵاوی لێبکە، منیش سڵاوم لێکردو وەڵامی دامەوە، وتی: بەخێربێت ئەی برای چاك وپێغەمبەری چاك؛ کاتێك بەجێم هێشت گریا، وتیان: بۆ دەگریت؟ وتی: دەگریم چونکە لاوێك دوای من ڕەوانە کراوە، ئوممەتەکەی ئەو زۆرتر دەچنە بەهەشتەوە لەئوممەتی من.

ئینجا بەرزیکردمەوەبۆ ئاسمانی حەوتەم وداوای کرد بکرێتەوە، وتیان: ئەوە کێیە؟ وتی: جیبریل، وتی: ئەی کێت لەگەڵدایە؟ وتی: موحەممەد، وتیان: نێردراوە بەشوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، وتی: بەخێربێت، بینیم ئیبراهیمە، وتی: ئەوە باوکتە سڵاوی لێ بکە، وتی: منیش سڵاوم لێکرد، ئینجا وتی: بەخێربێت ئەی کوڕی چاك و پێغەمبەری چاك، ئینجا (سدرة المنتهى)م بۆ نزیك کرایەوە، بینیم بەرەکەی وەکو گۆزەکانی هەجەر .[1]

گەورەیە، گەڵاکانیشی وەکو گوێی فیل بوون، وتی: ئەوە (سدرة المنتهى)یە، ئینجا چوار ڕوبارم بینی، دووانی لەناوەوەو دووانیشی ئاشکرابوون، وتی: ئەوە چییە جیبریل؟ وتی: دوو نادیارەکە لەبەهەشتن، دوو ئاشکراکەش نیل وفوڕاتن، ئینجا (البيت المعمور)م لێ نزیککرایەوە.

---

١- هەجەر لادێیەکە لەبەحرەین .

ئینجا قاپێکی مەی وقاپێ شیر و، قاپێ هەنگوینیان بۆ هێنام، منیش شیرەکەم هەڵبژارد وتی: ئەوە فیترەتە (واتە: ئاییینی ئیسلام)کە خۆت وئوممەتەکەت لەسەرین.

ئینجا نوێژم لەسەر فەرزکرا پەنجا نوێژ لەهەموو ڕۆژێکدا، ئیتر گەڕامەوەو بەلای موسا تێپەڕیم وتی: فەرمانی چیت پێکرا؟ وتم: پەنجانوێژ هەموو ڕۆژێك، وتی: ئوممەتی تۆ پەنجا نوێژی پێناکرێت هەموو ڕۆژێك، سوێند بەخوا من خەڵکیم تاقیکردوەتەوە پێش تۆ، لەگەڵ بەنی ئیسرائیل دەردی سەری زۆرم بینیوە، جابگەڕێرەوە بۆلای خوای خۆت وداوای لێبکە ئاسانی بکاتەوە لەسەر ئوممەتەکەت، منیش گەڕامەوەودە نوێژم بۆ کەمکردەوە، گەڕامەوە لای موسا هەمان قسەی بۆ کردمەوە، منیش گەڕامەوە لای خواو دەنوێژی تری بۆ کەم کردمەوە، ئینجا گەڕامەوە لای موسا هەمان قسەی بۆ کردمەوە، منیش گەڕامەوە وفەرمانم پێکرا بەدەنوێژ لەڕۆژێکدا، گەڕامەوە وهەمان قسەی بۆکردم، گەڕامەوەو فەرمانم پێکرا بەپێنج نوێژ لەڕۆژێکدا، گەڕامەوە لای موسا، وتی چی فەرمانت پێکراوە؟ وتم: بەپێنج نوێژ لەڕۆژێکدا، وتی: ئوممەتی تۆ پێنج نوێژی بۆ ناکرێت لەڕۆژێکدا، من ئەزمونم لەگەڵ خەڵکی هەیەو زۆرم لەبەنی ئیسرائیل بینیوە، بۆیە بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت باکەمتری بکاتەوە.

وتم: ئەوەندەم لەخوا داوا کرد تاشەرمم کرد، بەڵکو ڕازی دەبم، دەفەرموێت: کاتێك تێپەڕیم بانگکەرێك بانگی کرد: فەرزی خۆمم بەرێخست وئاسانکاریم بۆ بەندەکانم کرد.[١]

ڕووداوی ئیسراو میعراج پێش هیجرەت بەساڵێك بووە، وەکو (القاضی عیاض) دەڵێت: لەکتابی (الشفا).[٢]

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەو گەشتە پیرۆزەی گەڕایەوە باسی ئەم ڕووداوەی کرد بۆ خەڵکی، لەکۆڕێکدا کەموتعیمی کوڕی عەدی وعەمری کوڕی هیشام و وەلیدی کوڕی

---

١- البخاري، مناقب الانصار، باب في المعراج رقم ٣٨٨٧ .

٢- الشفا بتعريف حقوق المصطفى ١٠٨/١ .

موغیرەی تیا دانیشتبوو، فەرمووی: ((انی صليت الليلة العشاء في هذا المسجد، وصليت به الغداة، وأتيت فيما دون ذلك بيت المقدس، فنشر لي رهط من الانبياء منهم ابراهيم، وموسى وعيسى، وصليت بهم وكلمتهم)) واتە: من ئەم شەو نوێژی عیشام لەئەم مزگەوتە کردو دوای ئەو چووم بۆ بەیتولمەقدس، لەوێ کۆمەڵێك لەپێغەمبەرانم بینی، لەوانە: ئیبراهیم وموسا وعیساو، پێش نوێژیم بۆ کردن وقسەم لەگەڵ کردن، عەمری کوڕی هیشام وەکو گاڵتە جاڕی وتی: باسیان بکە بۆم، فەرمووی: ((أما عيسى ففوق الربعة، و دون الطول و...)).[1] واتە: سەبارەت بەعیسا لەنێوان مام ناوەندو باڵا بەرزدا بوو، سنگ پان، پێست ناسك، قژ لوول، سوروسپی، دەتوت عورووەی کوڕی مەسعودە، سەبارەت بەموسایش، گەورەو باڵابەرز بوو، دەتوت یەکێکە لەهۆزی شەنوئە،ددانەکانی لەسەریەك بوون و، لێوی گرژبوویەوە و، پووکی دەبینرا، ڕووی گرژبوو، بەڵام ئیبراهیم سوێند بەخوا بەڕواڵەت وئاکار هەر لەخۆمدەچوو.

وتیان: ئەی موحەممەد! باسی بەیتولمەقدیس مان بۆ بکە، فەرمووی: ((بەشەو چوومە ناو شارەکەوەو بەشەویش دەرچووم)) ئینجا جبریل لەسەر شێوەکەی خۆی هات بەباڵەکانی یەوەو، دەیوت: ((دەرگایەکی وایە، لەفلانە جێگا، دەرگایەکی تری وایە، لەفلانە جێگا، ئینجا پرسیاری تریان لێکرد، ئەویش فەرمووی: لەڕەوحا بەلای فلانە کارواندا ڕۆیشتم، وشترێکیان لێبزربوو بوو، بەدوایدا دەگەڕان، کەگەیشتنە جێگاکانیان، کەسی لێ نەبوو، پەرداخێکی ئاو دانرابوو، هەندێکم لێخوارد، پرسیاریان لێبکەن. وتیان سوێند بەخوا ئەمە بەڵگەیە. ئینجا گەیشتنە لای فلانە کاروان، وشترەکان لەمن هەڵهاتن، بەڵام دانەیەکی سوریان لەسەر ئەژنۆ دانیشت، کەژاوەیەکی لەسەر بوو، هێڵی سپی تیادا بوو،... پرسیاریان لێبکەن. وتیان: سوێند بەخوا ئەمەیشە بەڵگەیە_ئینجا لەلای تەنعیم گەیشتمە لای فلانە کاروان، وشترێکی ڕەش وسپی پێشیان کەوتبوو، ئیستایش لەو ڕێگە شاخاوییەوە بەرەو ڕوتان دێت، ئینجا وەلیدی کوڕی موغیرە وتی: جادوبازە، ئەوانیش ڕۆشتن،

---

١- بڕوانە: التاريخ الاسلامی للحمیدي ٣/٣٨،٣٩.

تەماشایان کرد چۆنی وت وابوو، ئیتر تۆمەت باریان کرد بەجادوگەری ووتیان: وەلیدی کوڕی موغیرە ڕاستی کرد.

ئەم ڕووداوە تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ خەڵکی، بۆیە خەڵکانێك لەوانەی باوەڕیان هێنا بوو پاشگەزبوونەوەو، ڕۆیشتن بۆ لای ئەبوبەکری صەدیق ڕەزای خوای لێبێت، وتیان: ئایا هەواڵی هاوڕێکەت دەزانیت، بانگەشەی ئەوە دەکات کەئەمشەو براوە بۆ(بيت المقدس) وتی: ئایا ڕاستە وای وتوە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەگەر وای وتبێت ڕاست دەکات، وتیان: ئایا باوەڕی پێدەکەیت بەشەو بردوویانە بۆ بەیتولمەقدیس پێش سپێدە گەڕابێتەوە؟ وتی: بەڵێ لەوەش زیاتر، باوەڕی پێدەکەم لەهەواڵەکانی ئاسماندا، بۆیە ناونرابە (صديق).[١]

## دووەم: سوودو وانەو پەندەکان.

١- دوای هەموو دەردەسەرییەك بەخشینێك هەیە، پێغەمبەریش ﷺ تووشی دەردەسەری زۆر بوویەوە، ئەوە قوڕەیشە دەرگای داخستووە بەڕووی بانگەوازدا لەمەککەو، سەقیف و، هۆزەکانی عەرەب، گەمارۆشی توندکردووە لەدژی ئیسلام وموسڵمانان لەهەموو لایەکەوە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەپاش کۆچی دوایی ئەبو تالیبی مامی کەوتە بارێکی ترسناکەوە، بەڵام هەربەردەوام بوو لەسەر ڕێگای خۆی، ئارامی دەگرت وئاوڕی لەلۆمەی لۆمەکاران وشەڕی شەڕگێڕان وپیلانی پیلانگێڕان نەدەدایەوە، بۆیە کاتی ئەوە هاتبوو بەخشینێکی گەورەی پێبدرێت وڕووداوی ئیسراو میعراج بە پێی قەدەرێکی خوای گەورە هات و، پێغەمبەری خوا لەنێو هەموو دروستکراوەکاندا بەرز کرایەوە بۆ ئاسمانەکان، وەکو پاداشتێك لەسەر ئارامگرتن وجیهادی، ڕاستەوخۆ خوای گەورە پێشوازی لێکرد وجیهانە نادیارەکانی پێ پیشاندا و، لەگەڵ پێغەمبەرانی برایدا لەسەریەك ڕاستایی کۆیکردنەوە وبوو بەپێشەواو پێشەنگ ودوایینیان.[٢]

---

١- المستدرك ٦٢/٣ قال الحاكم: هذا الحديث صحيح الاسناد واقره.

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٤٤٧/١ .

٢- پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕووی قۆناغێکی تازە دەبوویەوە، قۆناغی هیجرەت وبەرێدەکەوت بۆ بنیاتنانی دەوڵەت، خوای گەورە دەیەویست خشتەیەکەمەکانی ئەو بنیاتە یەککگرتوو وبەهێزو ڕێزکراوبێت، بۆیە ئەم تاقیکردنەوەی هێنایە پێشیٚ، بۆ پاراوکردنەوەی ڕیز لەلاوازو دوودڵەکان وبڕوادارە بەهێزەکان جێگیربکات، ئەوانەی بەدڵنیایی باوەڕیان هەبوو بەپێغەمبەر ﷺ ، چی بەختەوەرییەك دەورەی دەدان کاتێك لەدەوری پێغەمبەر ﷺ دەبوون وباوەڕیان پێدەهێناو ژیانیان دەکردە قوربانی بۆی، چەند باوەڕ لەدڵەکانیاندا پتر دەبوو بەرانبەر ئەم ڕووداوەی کە لەدوای ناخۆشی تائیف دێت ولەدوای هاتنەژوورەوەی مەککە بەداڵدەی کەسێك .[١]

٣- ئازایی پێغەمبەر ﷺ لەوەدا بوو کەبەرەنگاری بتپەرستان بوویەوە بە مەسەلەیەك کەئەقڵیان ڕەتی دەکردەوەو لێی تێنەدەگەیشتن، ترسیش بەربەستی بۆ دروست نەکرد کە ئەوان باوەڕی پێناکەن وگاڵتەی پێدەکەن، بەم شێوەیەش خۆی کرد بەنموونە بۆ ئوممەتەکەی لەئاشکرا کردنی هەق بەرانبەر بەناهەق، باهێزەکانیشیان کۆبکەنەوە بۆ جەنگی موسڵمانان، پێغەمبەر کەباسی ئیسرائی بۆ دەکردن، خوای گەورە هەندیٚ نیشانەی دەرخست کەبێباوەڕەکان ناچاربکات بۆ باوەڕکردن، لەوانە:

- وەسفکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ(بیت المقدس)، ئەوانیش قایل بوون بەباسکردنەکەی،

- وەسفکردنی کاروانەکەی (الروحاك).

- وەسفکردنی بۆ کاروانەکەی تر .

- وەسفکردنی بۆ کاروانی سیٚ یەم لە(الابواء)، بێباوەڕەکانیش دڵنیابوون لەڕاستگۆیی پێغەمبەر ﷺ ، چونکە بەڵگەکان ناچاریدەکردن باوەڕبکەن، ئەم گەشتە مەزنە، پەروەردەکردنێکی خوایی بوو لە ئاستێکی بەرزدا، چونکە پێغەمبەرﷺ هەموو سەرزەوی بەدروستکراوەکانەوە دەبینی، وەکو خاڵێکی بچووك لەگەردونی گەورەدا، ئینجا جێگای بێباوەڕەکانی دەبینی لە ناو ئەو خاڵەدا،

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٤٥١/١ .

ئەوانە بەشێکی یەکجار بچووکن لەگەردونی فراواندا، ئایا ئەوانە چیان پێدەکرێت لەدژ کەسێك، کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە لەنێو هەموو ئادەمیزادەکانداو، تایبەتمەندی کردووە بەئەو گەشتە بەرزە پیرۆزەوە، فریشتەکان و پێغەمبەرانی بۆ کۆکردووەتەوەو، ئاسمانەکان و(السدرة المنتهی) و(البیت المعمور)ی پیشانداو قسەی لەگەڵداکرد.[1]

٤- باوەڕی بەهێزی ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێبێت بەئەم ڕووداوە مەزنە، وەڵامی بێباوەڕانی دایەوە بەئەو پەڕی متمانەوە: ئەگەر وای وتووە ڕاست دەکات، ئینجا وتی: من لەوەش زیاتر باوەڕی پێدەکەم، بۆیە ناونرا (الصدیق)، ئەو پەڕی زانایی و دانایی ئەویشی دەرخست، کاتێك بەراوردی کرد لەنێوان ئەو هەواڵەو هەواڵی دابەزینی وەحی لەئاسمان، ئاشکرای کرد کەئەگەر ئەوە شتێکی سەیرە بۆ مرۆڤی ئاسایی، بەڵام زۆر کارێکی ڕێدارە بۆ پێغەمبەر ﷺ.[2]

٥- خواردنەوەی پێغەمبەرﷺ بۆ شیر کاتێك سەرپشك کرا لەنێوان شیرو مەی، ئینجا مژدەدانی جیبریل_علیه الصلاه والسلام_ بۆ پێغەمبەرﷺ لەهەڵبژاردنەکەی دگونجێت لەگەڵ فیترەت دا ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (الروم: ٣٠)

٦- پێش نوێژی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێغەمبەران بەڵگەیە لەسەر قایلبونیان بەسەرکردایەتی وپێشەوایەتی پێغەمبەر ﷺ ولابردنی شەریعەتی ئیسلام بۆ هەموو شەریعەتەکانی پێش خۆی، ئەوەی کەپێغەمبەرانیش پێی هەڵسان بەرانبەر موحەممەد ﷺ پێویستە شوێنکەوتوانیشیان هەمان کار بکەن بەرانبەر ئەو پێغەمبەرەو شوێنکەوتووی پەیامەکەی بن.

---

١- التاریخ الاسلامی للحمیدي ٣/٤٢،٤١.

٢- هەمان سەرچاوە ٣/٤٣.

پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کۆنگرەی نزیکبوونەوە لەنێو ئاینەکاندا دەگرن ئەم ڕاستیە چاك بزانن وبانگەوازی بۆ بکەن وبەجارێك هەڵکەنرێن لەو ئایینە بەتاڵانەوە باوەڕ بەپێغەمبەر ﷺ وپەیامەکەی بهێنن، ئینجا پێویستە لەسەریان ڕاستی ئەم بانگەوازە گومان لێکراوانە بکەن کە زۆر جار خزمەتی سیستمێك لەسیستمەکان دەکات.

٧- چەندین ئاماژەو سوود هەیە لەبەستنەوەی (المسجد الاقصی) بە(المسجد الحرام)ەوە، لەوانە:

* گرنگی(المسجد الاقصی) بۆموسڵمانان، کەبەو بەشەوڕەوی پێغەمبەرەکەیان و جێگای بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمانە بەرزەکان، بەدرێژایی قۆناغی مەککیش قیبلەیان بووە، ئەوەیش ڕێنمایی وئامۆژگارییەکە بۆ موسڵمان کە ئەو مزگەوتەیان خۆش بوێت، هەروەها فەلەستین بەگشتی چونکە جێگایەکی پیرۆزە.

* ئاماژەیەکی تریشی تیادایە کەبریتی یە لەهەستپێکردنی موسڵمانان بەلێپرسراوێتی بەرانبەر(المسجد الاقصی)، لەڕووی ئازادکردنی وپاککردنەوەی لەپیسی بتپەرستان وبیروباوەڕی خاچ پەرستان.

* هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کەهەر هەڕەشەیەك لەمزگەوتی یەکەم هەڕەشەیە لەمزگەوتی دووەم، هەر جۆرە دەستدرێژییەکیش لەسەر مزگەوتی ئەقصا دەستدرێژییە لەسەر (المسجد الحرام)، داگیر کردنی جولەکەیش بۆ (المسجد الاقصی) ئەوە دەگەیەنێت ئاسایشی (مزگەوتی حەرام) هەڕەشەی لێدەکرێت و دوژمنان چاوی تێدەبڕن بۆ داگیر کردنی.

مێژوو لەکۆن وتوێدا ئەوە دووپات دەکاتەوە، مێژوو جەنگە صەلیبیەکانیش بۆمان دەگێڕێتەوە کە(ئەرنات)ی خاچپەرستی خاوەنی شانشینی کەرەك نێردەیەکی نارد بۆحیجاز بەمەبەستی دەستدرێژی کردنە سەرقەبری پێغەمبەرﷺ و تەرمی پیرۆزی لەمزگەوتەکەی، بەهەمان شێوە بورتوغالیەکان کەکاسۆلیك بوون، لەسەرەتای چاخەنوێکانەوە هەوڵیان داوە بگەنە هەردوو حەرەمی پیرۆز،

بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەوەی کەباوباپیرانیان نەیانتوانی جێبەجێی بکەن، بەڵام بەرگری سەختی مەمالیکەکان، هەروەها عوسمانییەکان، ڕێگربوو لە پێش ئەو پرۆژە گڵاوەیان، لەپاش جەنگی (١٩٦٧)کە تیادا جولەکە قودسیان داگیرکرد، سەرکردەکانیان ئەوەیان ڕاگەیاند کە ئامانج لەپاش قودس حیجازەو، لەپێش هەمووشیەوە مەدینەو خەیبەر.[١]

(بن گۆریۆن)ی سەرکردەی جولەکە، لەپاش چوونە ژوورەوەی سوپاکەی بۆ ناو قودس، لەنزیك مزگەوتی ئەقصا، گوتارێکی خوێندەوە بۆ هەندێك سەربازو لاوانی جولەکە، تیایدا وتی: وادەستمان گرتە سەر قودسدا، بەڕێگەیشەوەین بۆ یەسریب.[٢]

ئینجا گوڵدامائیریش بەهەمان شێوە لەو بۆنەیەدا دەیوت بۆنی باوباپیرانم لەمەدینەو حیجازەوە دێت ودەبێت بیگێڕنەوە. جولەکەکان نەخشەی دەوڵەتە چاوەڕوانکراوەکەیان بڵاو کردەوە لەپاش ئەوە، کەلەفوراتەوە دەگرێتەوە تاکو نیل بەدورگەی عەرەب وئوردن وسوریەو عێراق ومیصرو یەمەن وکوەیت وهەموو کەنداوی عەرەبی، ئەم نەخشەیانە لەپاش شەڕی ١٩٦٧ لە ئەوروپا بڵاو کردەوە.[٣]

٨- گرنگی نوێژو مەزنی پلەوپایەی: جێگیربووە لەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ دا کە نوێژ لەشەوی میعراجدا فەرز بووە، لەم بارەوە(ابن کثیر) دەڵێت: گرنگی دانێکی گەورەیە بەنوێژو پلەوپایەی.[٤] بۆیە پێویستە لەسەر بانگخوازان جەخت بکەنەوە لەسەر گرنگی نوێژکردن وپارێزگاری کردنی وباسی گرنگی وپلەو پایەو کاتی فەرزبوونی بکەن بۆ خەڵکی ورونیشی بکەنەوە کەئەوە دوا ڕاسپاردەی پێغەمبەر ﷺ بووە لەپێش کۆچی دوایی.[٥]

٩- پێغەمبەر ﷺ باسی ترسناکی نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەکانی کردووەو،

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابى فارس لا٢١٤ .

٢- جريدة الدستور الاردنية العدد ٤٦١٣ بقلم: اميل الخورى. نقلاً عن السيرة النبوية لابى فارس لا ٢١٤ .

٣- السيرة النبوية لابى فارس لا ٢١٥ .

٤- تفسير ابن كثير ٢٣/٣ .

٥- المستفاد من قصص القران للدعوة والدعاة ٩٣/٢ .

سزاکەشی ڕوونکردووەتەوە، وەکو چاوی پێکەوتووە لەو شەوەدا، لەوانە:

* سزای تاوانی غەیبەت کردن وئەوانەش کەپێی هەڵدەسن، پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێکی بینی لاشەی بۆگەن دەخۆن، جیبریل یش پێی وتووە ئەوانەن کەگوشتی خەڵکی دەخۆن .[١]

* سزای خواردنی ماڵی هەتیو، پێغەمبەر ﷺ پیاوانێکی بینی دەم ولێویان گەورەیە وەکو وشتر، پارچە بەردی گەورەی ئاگرینیان بەدەستەوەیە فڕێی دەدەنە ناو دەمیانەوەو لەپاشیانەوە دەردەچێت. جیبریل پێی وت: ئەوانەن کەماڵی هەتیو بەناهەق دەخۆن .[٢]

* سوو خۆران، پێغەمبەر ﷺ کەسانێکی بینی ناو سکیان وەکو خانووی گەورە بوو، ماری تیادا بوو، لەدەرەوە دەبینران، جیبریل ووتی: ئەوانە سوو خۆرانن .[٣]

* ڕیوایەتەکە بەهەمان شێوە باسی سزای داوێن پیسان وزەکات نەدەران و وتاربێژە گومڕاکەرەکان و بایەخنەدەران بەئەمانەتی کردووە .[٤]

* پاداشتی موجاهیدان، لەو شەوەدا پێغەمبەرﷺ بەلای خەڵکانێکدا تێپەڕ بوو کەکشت وکاڵ دەکەن ولەهەمان ڕۆژدا بەروبوومەکەی دەدورنەوە، لەپاش هەموو دورینەوەیەکیش وەکو خۆی دەگەڕێتەوە، جیبریل فەرمووی: ئەوانە موجاهیدانن کەلەپێناو خوادا جیهاد دەکەن، پاداشتەکانیان تا حەوت سەد بەرانبەر بۆ زیاد دەکرێت..[٥]

١٠- پەیبردنی هاوەڵان بەبایەخ وگرنگی مزگەوتی( الاقصی) ولێپرسراوێتیان بەرانبەری چونکە دیل بوو بەدەستی ڕۆمانەوەو، لەسەردەمی عومەر ڕەزای خوای

---

١- الفتح الربانی للساعاتي ٢٠/٢٥٥ وقال: صحح اسناده الحافظ ابن كثير .

٢- فتح الباری بشرح صحيح البخاري ٨/٢٠٠ .

٣- تفسير ابن كثير ٤/٢٧٤ .

٤- تفسير الطبری ١٥/٧ والفتح الرباني٢٠/٢٥٧ .

٥- بروانە: الخصائص الكبری ١/١٧١ والسيرة النبوية لابی فارس ٢٢٠ .

لێبێت ئازادیان کرد، تاکو پێنج سەد ساڵیش هەر بەدەست موسڵمانانەوە بوو لەئەو پەڕی ئارامی وئاسایشدا تاخاچپەرستان داگیریان کردووە دواتر صەلاحەددینی ئەییوبی رزگاری کرد، وائەمجارەیش لەژێر دەستی جولەکەدایە، جا رێگای رزگارکردنی چۆن بێت؟.[١]

ڕێگای رزگارکردنی بەجیهاد کردن دەبێت لەپێناو خوادا، لەسەر هەمان ڕێبازی هاوەڵان کەلەسەری ڕۆیشتوون.

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابی فارس ٢٢٠ .

# بەشی پێنجەم

## گەڕان بەسەر هۆزەکانداو کۆچکردنی هاوەڵانی بۆ مەدینە

### باسی یەکەم: گەڕان بەسەر هۆزەکاندا بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری.

لەپاش گەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ لەتائیف، دەستی کرد بەقسە کردن لەگەڵ خەڵکیداو، بانگەوازی هۆزەکانی دەرکردو داوای لێکردن کەداڵدەی بدەن وپشتگیری لێبکەن، بۆ ئەوەی قسەی خوای گەورە بگەیەنێت، پێغەمبەرﷺ لەوەرزە بازرگانییەکاندا جموجوڵی دەکرد، هەروەها لەوەرزی حەجدا کەهۆزو عەشیرەتەکانی تیادا کۆدەبێتەوە، بەپێی پلانێکی سیاسی بانگخوازانەی ڕوون و ئامانج دیاریکراو، لەم کارەدا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت هاوەڵی بوو، ئەو پیاوەی کەپسپۆڕبوو لەڕەچەڵەکناسی ومێژووی عەرەبدا، ئینجا هەردوکیان دەچوونە لای پیاوە ناودارەکانی هۆزەکان، ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ دەستی بکردایە بەخستنە ڕووی بانگەوازەکەی، پرسیاری لێدەکردن: ژمارەتان چەندە؟ هێزتان چۆنە؟ توانای جەنگتان چۆنە؟ [١]

مەقریزی دەڵێت: ((ئینجا پێغەمبەرﷺ باسی خۆی وبانگەوازەکەی دەکرد لەلای هۆزەکان، لەبۆنەکاندا وبانگی دەکردن بۆ ئیسلام، ئەوانەش بەنوعامیرو، غەسسان و، بەنو فەزارەو، بەنو مورڕەو، بەنو حەنیفەو، بەنو سولەیم و، بەنو عەبس و، بەنو نەصرو، بەنو سەعلەبەی کوڕی عوکابەو، کیندەو، کەلب و، بەنو حارس و،بەنو عوزرەو، قەیسی کوڕی خوتەیم و، ئەبولیوسر ئەنەسی کوڕی ئەبی ڕافیع)) واقیدی بەدوادا چوونەوەی کردووە بۆ ئەم هۆزانە هۆزبەهۆز، دەشڵێن کەبەهۆزی کیندە دەستی پێکردووەو بانگیانی کردووە بۆ ئیسلام، دوای ئەوە چووە لای هۆزی کەلب وبەنی حەنیفە وبەنی عامیرو دەیوت: کێ دەمباتە لای هۆزەکەی خۆی وبەرگریم لێبکات، بۆ ئەوەی پەیامی خوا بگەیەنم، چونکە قورەیش

---

١- بڕوانە: الانساب للسمعانی ٣٦/١ .

ڕێگەم پێ نادەن بیگەیەنم، ئەبو لەهەبیش لەپشت پێغەمبەرﷺ . وەستابوو دەیوت: گوێی لێمەگرن درۆزنە.[١]

بەوەندەش ڕانەوەستا، بەڵکو پێغەمبەر ڕووبەڕووی توندوتیژی زۆر تربوویەوە، پێشەوا بوخاری لەمێژووەکەیداو، تەبەرانی لە(الکبیر)دا، لەمودریکی کوڕی مونیب دەگێڕنەوە، ئەویش لەباوك وباپیریەوە دەگێڕێتەوە ڕەزای خوای لێبێت، وتوویەتی: لەجاهیلیەتدا پێغەمبەری خوام بینی ﷺ دەیفەرموو: ((یا أیها الناس قولوا لا إله الا الله تفلحوا)) واتە: خەڵکینە بڵێن (لاإله الاالله) سەرفراز دەبن، کەسی وابوو تفی لەناو چاوی دەکرد، کەسی وابوو خۆڵی دەکرد بەسەریدا، هەندێکیشیان جنێویان پێدەدا، تاکو کات گەیشتە نیوەڕۆ، کچێك هەندێك ئاوی هێناو دەست وڕومەتی پێغەمبەرﷺ ی شۆردو، ئەویش پێی فەرموو: کچەکەم مەترسە باوکت ببەزێت یان سەرشۆڕ بێت، وتم: ئەو کچە کێ یە؟ وتیان: زەینەی کچی پێغەمبەرﷺ بوو.[٢]

ئەبو جەهل وئەبو لەهەبیش لەعنەتی خوایان لەسەر بێت، بەتۆرە عەزێتی پێغەمبەرﷺ یان دەدا، کاتێك لەبازاڕو بۆنەکاندا بانگەوازی دەکرد بۆلای خوای گەورەو، ئەو دوو کەسە ئازاری زۆری پێغەمبەریان دەداﷺ . سەرباری ئەو ئازارانەی کەلەلایەن بانگکراوەکانەوە تووشی دەبوو.[٣]

## یەکەم: هەندێك لەشێوازەکانی پێغەمبەرﷺ لەبەرپەرچدانەوەی ئەبو جەهل و بتپەرستان لەکاتی گەڕانی بەناو هۆزەکاندا.

١-سەردان وچاوپێکەوتنی هۆزەکان بەشەو: لەتەواوی دانایی پێغەمبەرﷺ ئەوە بوو کەلەتاریکی شەودا دەردەچوو بۆ چاوپێکەوتنی هۆزەکان، تاکو هیچ کەسێك لەبتپەرستان نەبێتە کۆسپ لەنێوان ئەوو هۆزەکاندا.[٤] ئەمەیش کارێکی سەرکەوتوو بوو لەپووچەڵ کردنەوەی پڕوپاگەندەی بتپەرستان لەدژی

---

١- بڕوانە: امتاع الاسماع للمقریزی ١/٣١،٣٠ .

٢- بڕوانە: المحنة في العهد المكي لا ٥٣ .

٣- هەمان سەرچاوە ٥٣ .

٤- بڕوانە: تاریخ الاسلام للنجیب ابادی ١/١٢٩ نقلاً عن الرحیق المختوم .

پێغەمبەرﷺ ، کاتێك پەیوەندی دەکرد لەگەڵ هەر هۆزێك لەهۆزەکان، بەڵگەش لەسەر سەرکەوتوویی ئەم شێوازە چاوپێکەوتنی پێغەمبەرﷺ بوو لەگەڵ ئەوس و خەزرەج، هەر لەوێیشەوە، دروستبوونی عەقەبەی یەکەم ودووەم کەهەربەشەو بوو.[1]

٢-ڕۆیشتنی پێغەمبەرﷺ بۆ لای هۆزەکان لەنێو ماڵەکانیاندا،[2] بۆ نموونە چوو بۆلای هۆزی کەلب وبەنی حەنیفەو بەنی عامیر لەنێو ماڵەکانیاندا، بەو شێوەیش دەیویست بەدوور بێت لەڕاونانی قورەیش و، بتوانێت دانوستان بکات لەگەڵ هۆزەکاندا بەشێوازی گونجاو، بەبێ هیچ تێکدان وئاژاوەیەك لەقورەیشەوە.

٣-یاریدەدەر لەگەڵ خۆبردن: ئەبو بەکر وعەلی ڕەزای خوایان لێبێت هاوەڵێتی پێغەمبەرﷺ یان دەکرد لەهەندێك لەدانوستانەکانی لەگەڵ هۆزەکاندا، لەوانەشە ئەم هاوەڵبردنە لەبەر ئەوە بووە کەبانگکراوەکان وانەزانن تەنیایەو پشتیوانی نییە لەناودارانی خزم و کەسەکانی، ئێمە بێجگە لەشارەزایی ئەبوبەکر بەڕەچەڵەکی عەرەب ،[3] کەئەوە یارمەتیدەری پێغەمبەر بووﷺ بۆ ناسینی بنچینەی هۆزەکان بەمەبەستی هەلبژاردنی باشترینیان، بۆ هەڵگرتنی باری بانگەواز.

٤-دڵنیابوون لەپارێزگاریکردنی هۆزەکان: یەکێك لەلایەنگرەکانی ئاسایش، پرسیارکردنی پێغەمبەرﷺ دەربارەی هێزی ئەو عەشیرەتانەی قسەی لەگەڵ دەکردن، پێش ئەوەی بانگەوازیان بکات و داوای پارێزگاریان لێ بکات، چونکە ئەوە مەسەلەیەکی گرنگ بوو، پێویستیش بوو بزانرایە ئایا ئەو هۆزە توانای بەرەنگاری بوونەوەی هەیە لەگەڵ دوژمنانی ئیسلام لەڕووی ورە بەرزی وخۆ ئامادەکردن، کەدوژمنان بترسێنێ و بانگەواز پارێزگاری بکات...[4]

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام ٢/٥٢،٤٤ في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية .

٢- بڕوانە: البداية والنهاية لابن كثير ٣/١٤٠ .

٣- في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية ١١٦ .

٤- هەمان سەرچاوە ١١٦، ١١٧ .

## دووەم: دانوستان لەگەڵ بەنی عامیر.

پێغەمبەرﷺ وئەبو بەکر، دەیانزانی کە بەنی عامیر هۆزێکی جەنگاوەرو ژمارە زۆرن، بەڵکو یەکێکە لەو پێنج هۆزەی کەهەرگیز ئافرەتیان بەکۆیلە نەبراوەو، شوێنکەوتووی هیچ پادشایەك نەبوونەو، سەرانەیان بەکەس نەداوە،[1] حاڵی حاڵی قورەیش و خوزاعەبوو ،[2] هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەوەی دەزانی کەدژایەتیەك هەیە لەنێوان بەنی عامیر وسەقیف دا، جائەگەر سەقیف لەڕووی وەستان لەناو خۆوە، ئەی بۆچی هەوڵی گەمارۆدانیان نەکات لەدەرەوەو سوود لەبەنی عامیر وەرنەگرێت، جائەگەر پێغەمبەرﷺ توانی هاوپەیمانێتیەك ببەستێت لەگەڵ بەنی عامیر؛ لەو حاڵەتە هەڵوێستی سەقیف لەمەترسیدا دەبێت ،[3] مێژوونووسان دەگێڕنەوە کەپێغەمبەرﷺ ئەو کاتەی هاتە لای بەنی عامیری کوڕی صەعصەعە وبانگی کردن بۆ لای خوا، خۆی پێشنیار کردە سەریاندا، یەکێك لەوان کەناوی بەیحەرەی کوڕی فیراس بوو، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەم لاوە لەژێر دەستمدا بووایە عەرەبم پێدەخوارد، ئینجا پێی ووت: ئەگەر ئێمە پەیمانمان پێتدا لەسەر ئەم باسەی کەدەیکەیت و دوای خوا سەریخستیتە سەر نەیارەکانت، ئایا سەرۆکایەتی لەدوای تۆ بۆ ئێمە دەبێت؟ فەرمووی: ((الامر لله یصنعه حیث یشاء)) واتە: فەرمان بۆ خوایە، ئەم مەسەلەیە لەهەر کوێ بیەوێت دایدەنێت، ووتیان: ئایا گەردنمان بکەین بەنیشان بۆ عەرەبەکان ئەگەر خوایش سەری خستی سەرۆکایەتی بۆ کەسانی تربێت؟ پێویستمان بەم قسەو باسەی تۆ نییە وئیتر وازیان لێهێنا .[4]

## سێیەم: دانوستان لەگەڵ بەنی شەیبان.

لەڕیوایەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبدا هاتووە ڕەزای خوای لێبێت کەفەرمویەتی: کاتێك خوای گەورە فەرمانی کردە پێغەمبەرەکەیﷺ خۆی بخاتە ڕووی هۆزەکان، دەرچوومنیش لەگەڵی بووم... تاکو دەفەرموێت: دوای ئەوە چووینە کۆڕێکی تر،

---

١- بڕوانە: اصول الفكر السياسي ١٨٢ .

٢- هەمان سەرچاوە ١٨٢ .

٣- هەمان سەرچاوە ١٨٢ .

٤- بڕوانە: سيرة ابن هشام ٣٨/٢ .

ڕێزو سەنگینی پێوە دیاربوو، ئەبو بەکر چووە پێشێ وسڵاوی کرد ووتی: ئێوە کێن؟ ووتیان: شەیبانی کوڕی سەعلەبە، ئینجا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت ئاوڕی دایەوە لە پێغەمبەرﷺ وفەرمووی: دایك وبابم بەقوربانت بێت، ئەوانە سەرانی خەڵکین، مەفروقیان تیادایە کەئەوانی بەزاندووە لەزمان جوانیدا، دوو پەلکی هەبوو بەسەر شانیدا دەهاتنە خوارێ، لەهەمووشیانەوە نزیکتربوو لەئەبو بەکر، ئینجا ئەبو بەکر پێی ووت: ژمارەتان چەندە؟ مەفروق ووتی: ئێمە پتر لەهەزار کەسین، هەزارکەسیش بەهۆی کەمی یەوە نابەزێت، ئینجا ئەبو بەکر فەرمووی: توانای بەرگریتان چۆنە؟ مەفروق ووتی: ئێمە لەکاتی دەستەویەخە بوون زۆر توندین، لەکاتی توڕەییشماندا زیاتر ڕووبەڕوو دەبینەوە، ئێمە ئەسپەکانمان بەلاوە خۆشەویستترە لەکوڕەکانمان، چەکەکانیشمان بەلاوە چاکترە لەوشترەکانمان و، سەرکەوتنیش لەلای خواوەیە، جارێك سەردەکەوین وجارێك ژێر دەکەوین، لەوانەشە تۆ قوڕەیش بیت، ئەبو بەکر فەرمووی: ئەگەر باسی پێغەمبەرﷺ تان بیستووە ئەوە خۆیەتی. مەفروق ووتی: بۆچی شتێك بانگمان دەکەیت ئەی برای قوڕەیش، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بانگتان دەکەم بۆ شایەتی دان بەوەی کەهیچ خوایەك نییە جگە لەخوای تاك وتەنیاو، منیش بەندەو پێغەمبەری خوای گەورەم، هەروەها داواتان لێدەکەم کەدالدەم بدەن وپشتگیریم بکەن، چونکە هۆزی قوڕەیش لەدژی خوا وەستاون و،پێغەمبەرەکەیان بەدرۆ خستووەتەوە، ناهەقی هەڵبژاردووەو بێ منەتە لە وەرگرتنی ڕاستی، مەفروق ووتی: ئیتر داوای چی دەکەیت ئەی برای قوڕەیش؟ سوێند بەخوا قسەی لەمە خۆشترم نەبیستووە، ئیتر پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتانەی خوێندەوە﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ۖ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُم مِّنْ إِمْلَاقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ (الانعام: ١٥١).

مەفروق ووتی: سوێند بەخوا تۆ بانگەواز دەکەیت بۆ ڕەوشتی جوان وکردەوەی چاك، بەڕاستی کەسانێك تۆ بەدرۆبخەن خۆیان درۆزنن، ئینجا فەرمانی گێڕایەوە بۆ

لای هانیئی کوڕی قەبیصە ووتی: ئەوە هانیئی سەر گەورەمانە وخاوەن ئاییمانە، ئەویش ووتی: ئەی برای قورەیش من گوێم لەقسەکانت بوو، وایش دەزانم کارێکی نابەجێیە لەیەکەم دانیشتن لەگەڵ تۆ واز لەئاییني خۆماڵەبهێنن، پەلە ناکەین وبیردەکەینەوە، ئینجا حەزی کرد موسەننای کوڕی حاریسەیش قسەیەك بکات، موسەننا_کەدواتر موسڵمان بوو_ ووتی: ئەی برای قورەیش گوێم لەقسەکانت بوو، وەڵاممانیش وەڵامی هانیئە، ئینجا ئێمە کەوتینەتە نێوان ڕوبارەکانی کیسراو ئاوەکانی عەرەب، سەبارەت بە کیسرایش هەرکەسێك تاوانێك بکات لێی خۆش نابێت و پۆزشی لێ وەرناگرێت، ئێمەش پەیمانمان پێداوە هیچ ڕوداوێك لەلای ئێمەوە ڕونەدات وهیچ تاوانبارێك دالدەنەدەین، منیش وادەزانم ئەمەی بانگمان دەکەی بۆی پادشاکان حەزی لێ ناکەن، جائەگەر دەتەوێت دالدەتبدەین وپشتگیریت لێبکەین لەم دیو ئاوەکانی عەرەبەوە وادەکەین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وەڵامەکەتان ناشرین نەبوو، چونکە قسەی ڕاستان کرد، ئاییني خوایش کەسانێك دەتوانن سەری بخەن لەهەموو لایەکەوە هەر بیپارێزن، بۆ چوونتان چۆنە ئەگەر پاش ماوەیەکی کەم خوای گەورە هەرچی خاك ومالیان هەیە بیدا بەئێوەو ئافرەتەکانیشیانتان بداتێ، ئایا ملکەچی فەرمانی خوا دەبن؟ نوعمانی کوڕی شورەیك ووتی: خوایە ئەوە بابۆ تۆبێت.[١]

## چوارەم: سوودو وانەو پەند.

ئەو پشتیوانی لێکردنەی پێغەمبەرﷺ داوای کرد، شێوازێکی تایبەتی هەبوو بەم شێوەی لای خوارەوە:

١-داواکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ پشتیوانی کردنی لەدەرەوەی مەککەبوو، ئەو کاتە گورج بوویەوە کەئازارو ئەشکەنجەی لەسەر زۆربوو، لەپاش کۆچی دوایی ئەبو تالیب کەلەقورەیش دەیپاراست، چونکە ئەو کەسەی کەباری بانگەواز هەڵدەگرێت ناتوانێت بەباشی هەڵسێتبەکارەکەی لەکەشێکی توندو تیژیدا.

---

١- بروانە: البداية والنهاية ٣/١٤٢، ١٤٣، ١٤٥ وفيها زيادات ليست عند الصالحي في سبل الرشاد ٢/٥٩٦_٥٩٧.

٢-ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ پێی هەڵسا بەفەرمانی خوا بوو، نەك هەر بۆچوونێکی کەسایەتی خۆی بێت.

٣-پێغەمبەرﷺ تەنها لەسەرکردەی هۆزەکان داوای پشتگیری دەکرد، لەوکەسانەی کەخەڵکانێك شوێنیان دەکەون، چونکە ئەوانەی دەتوانن بانگەواز بپارێزن.

٤-ڕەتکردنەوەی پێغەمبەرﷺ بۆ پێدانی هیچ دەستەبەرییەك بۆ کەسانێك هیچ دەسەڵاتێکیان بدرێتی وەکو پاداشت، یان بەرانبەر بەپشتگیری کردنیان لەئایینی خوا، پێویستە ئەو کەسە لەپێناوی خوادا ئەو کارە ئەنجام بدات ونیازی بۆ ئەو مەبەستە پاك بکاتەوە، بێ ئەوەی چاوبڕێتە هیچ بەرژەوەندییەك وهەمیشە ئامادەبێت فیداکاری بکات بۆ ئیسلام.....[١]

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو کەسێك کەبانگەواز دەکات بۆ لای خوا، هیچ مەرجێك دەستنیشان نەکات پێشتر، چونکە بانگەواز بانگەوازی خوایە وهەرخۆیشی خاوەن فەرمانە، هەرموسڵمانێکیش پێویستە سەرەتا تەنها مەبەستی خوای گەورە بێت، چونکە ئەگەر بیری لەلای پلەو پایەبێت، ئەوە نیشانەیەکی مەترسیدارەو، گوزارش دەدات لەخراپەیەك لەنیەتی خاوەنەکەیدا .[٢] بۆیە یەحیای کوڕی موعازی ڕازی دەڵێت: ئەو کەسەی حەزی لەسەرۆکایەتی بێت سوودی لێ وەرناگیردرێت .[٣]

٥-هەروەها پێغەمبەرﷺ داوای پشتگیری لەکەسانێك دەکرد کەپەیوەست نەبن بەڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتیەوە، کەناکۆکی دروست بکات لەگەڵ بانگەوازداو، نەتوانن لێی دەربچن، چونکە لەو حاڵەتەدا بانگەواز تووشی مەترسی لەناوچوون دەکات، لەلایەن ئەو دەوڵەتەی کەپەیوەندییان هەیە لەگەڵی، چونکە ئەوانیش لەبانگەوازی ئیسلامدا مەترسیەك دەبینن لەسەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان.[٤]

---

١- بڕوانە: الجهاد والقتال في السياسة الشرعية، محمد خير ١/٤١١ .

٢- وقفات تربوية في السيرة النبوية، عبدالحميد البلالي ٧٢ .

٣- بڕوانە: صفة الصفوة ٤/٩٤ .

٤- بڕوانە: الجهاد والقتال في السياسة الشرعية ١/٤٢١ .

پارێزگاریکردنی مەرجدار، یان ناتەواو، ئامانج بەدی نەکات، چونکە بەنو شەیبان شەڕیان پێ بەرپا ناکرێت لەدژی کیسرا، ئەگەر بیەوێت پێغەمبەرﷺ دەستگیر بکات یان هێرش بکاتە سەر خۆی وشوێنکەوتوانی، بەم شێوەیش وتووێژەکان هەرەسی هێنا.[1]

٦-ئایین کەسێك دەتوانێت پارێزگاری لێبکات لەهەموو روویەکەوە پابەندی بێت، ئەمە وەڵامی پێغەمبەرﷺ بوو بۆ موسەننای کوڕی حاریسە کاتێك پێشنیاری پاراستنی پێغەمبەرﷺ ی کرد لەسەر ئاوەکانی عەرەب، دوور لە ئاوەکانی فارس، ئەو کەسەیش لەسیاسەت حاڵی بێت، دوور بینی پێغەمبەرﷺ ی بۆ دەردەکەوێت.[2]

٧-هەڵوێستی بەنی شەیبان ڕەوشتی جوان وپیاوەتی پێوە دیار بوو، هەروەها ڕێزگرتنی زۆر لەپێغەمبەرﷺ و، بەڕاشکاوی باسکردنی ئەندازەی هێزی خۆیان، خوای گەورەیش قەدەری وابوو کەپاش زیاتر لەدەساڵ بەنو شەیبان هەڵسن بەدژایەتی کردنی پادشاکان، پاش ئەوەی ڕوناکی ئیسلام دڵەکانیانی گرتەوە، موسەننایش لێپرسراوی جەنگ وپاڵەوانی بەهێزی ئەوان بوو، کەسەرکردایەتی فتوحاتی کرد لەسەر خاکی عێراق، لەسەردەمی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت.[3] لەکاتێکدا ئەوان نەیاندەتوانی بیربکەنەوە لە شەڕکردن لەگەڵ فارسەکان، بوونە یەکەمین کەسانێك جەنگیان لەگەڵ کردن و لەڕوویانە وەستان، بەمەش مەزنی ئەم ئایینەمان بۆ دەردەکەوێت، کەموسڵمانانی کرد بەسەرکردەکانی سەرزەوی، ئەمە جگە لەپاداشتی نەبڕاوەی دواڕۆژ کەچاوەڕوانیان دەکات.[4]

---

١- بڕوانە: التحالف السياسی فی الاسلام، منیر الغضبان ٥٣ .

٢- هەمان سەرچاوە ٦٤ .

٣- بڕوانە: التربیة القیادیة ٢/٢٠ .

٤- بڕوانە: التاریخ الاسلامی للحمیدی ٣/٦٩ .

## باسی دووەم: کەژاوەی چاکەو پێشەنگی ڕوناکی

جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری دەڵێ:

پێغەمبەرﷺ دەساڵ لەمەککە مایەوە، بەدوای خەڵکیدا دەگەڕا بەماڵەکانیاندا، لەعوکازو میجەننەو، بۆنەو وەرزەکانی مینا، دەیفەرموو: ((من یؤوینی؟ من ینصرنی، حتی ابلغ رسالة ربی، وله الجنة)) واتە: کێ داڵدەم دەدا؟ کێ پشتگیریم دەکات، تاکو بانگەوازی خوای گەورە بگەیەنم وبچێتە بەهەشت تەنانەت جاری وابوو کەسێك لەیەمەن ومیصر دەردەچوو، کەس وکارەکەی پێیان دەوت: وریابە لاوێك سەری هەڵداوە لەقورەیش لەڕێگە دەرتنەکات، کاتێك بەنێو خەڵکیشدا ڕێی دەکرد، بەپەنجە ئاماژەیان بۆ دەکرد، تاکو خوای گەورە ئێمەی بۆ نارد وباوەڕمان پێهێنا وداڵدەماندا، کەسی وامان بوو دەردەچوو بۆلای وباوەڕی پێدەهێنا وقورئانی پێدەخوێند، ئینجا دەگەڕایەوە لای کەس وخزمەکانی ئەوانیش موسڵمان دەبوون، تاکو وای لێهات ماڵێك نەما لەماڵەکانی ئەنصار موسڵمانیان تیادا نەبێت.[1]

### یەکەم: پەیوەندیە سەرەتاییەکان بەئەنصارەکان لەکاتی حەج وعومرە.

#### ١- موسڵمان بوونی سوەیدی کوڕی صامیت:

پێغەمبەری خواﷺ کەدەیبیست پیاو ماقوڵێك، یان ناودارێکی عەرەب دێتە مەککە، یەکسەر دەچووە لای وبانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام، جاکاتێك سوەیدی کوڕی صامیت_لە بەنی عەمری کوڕی عەوف_ هاتە مەککە بۆ حەج یان بۆ عومرە، سوەید لەناو خەڵکی خۆیدا بەکامل ناودەبرا، بەهۆی ئازایی وهەڵبەست وڕەچەڵەك وناوداری، کاتێك پێغەمبەر بەهاتنی زانی، هاتە لای وبانگی کرد بۆ ئیسلام، سوەید ووتی: لەوانەیە ئەوەی لای تۆیە وەکو ئەوەی لای من بێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆچیت لایە؟ وتی:دانایی لوقمان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پیشانم بدە، ئینجا فەرمووی: ئەمانە قسەی چاکن، بەڵام لەوە چاکترم لایە، قورئان کەخوای

---

١- مسند احمد ٣٣٢،٣٢٢/٣ .(( اسناده صحيح على شرط مسلم)) قاله محفوظ طبعة مؤسسة الرسالة .

گەورە دایبەزاندووەتە سەرم، رینمونی ورووناکی یە، ئیتر پێغەمبەرﷺ قورئانی خوێندەوە بۆی وبانگی کرد بۆ ئیسلام بوون، ئەویش ووتی: ئەمە قسە گەلێکی چاکن ولەلای هەڵساو گەڕایەوە بۆ مەدینە وزۆری پێنەچوو خەزرەج کوشتیان، هەندێ لەخزمانی دەیانوت: وادەزانین لەبەر ئەوە کوژراوە موسڵمان بوو، لەرۆژی بوعاسدا کوژرا،[١] بەهەر حاڵ بەڵگە لەبەر دەستماندا نییە کەسوەید هەڵسابێت بەبانگی کردنی خەڵکی بۆ ئیسلام.[٢]

٢- موسڵمان بوونی ئیاسی کوڕی موعاز: کاتێك ئەبو لحەیسەری کوڕی رافیع هاتە مەککە، لەگەڵ هەندێك لەلاوانی بەنی عەبدولئەشهەل، کەئیاسی کوڕی موعازیان لەگەڵ بوو، بەدوای هاوپەیمانێتی دەگەڕان لەدژی خزمەکانی خۆیان لە خەزرەج، پێغەمبەرﷺ ئەوەی بیست وهاتە لایان ودانیشت لەگەلیان، فەرمووی: ((انا رسول الله الی العباد، ادعوهم الی ان یعبدوا الله، ولایشرکوا بة شیئاً، وانزل عليّ الكتاب)) واتە: من رەوانە کراوی خوام بۆلای بەندەکان، بانگیان دەکەم بۆ پەرستنی خوای گەورەو، هاوتای بۆ بڕیارمەدەن و، قورئانیشم بەسەردا دابەزیوە، ئینجا باسی ئیسلامی بۆ کردن وقورئانی بۆ خوێندنەوە، ئیاس کەلاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو، ووتی: سوێند بەخوا ئەمە لەوە چاکترە کەبۆی هاتوون، جالەو کاتەدا ئەبولحەیسەر مشتێك خۆڵی هەڵگرت وکردنی روومەتی پێغەمبەرﷺ داو گەڕانەوە بۆ مەدینە، شەڕی بوعاسیش لەنێوان ئەوس وخەزرەجدا روویداو زۆری پێنەچوو، ئیاس لەو شەڕەدا تیاچوو، ئەوانەی کەبینیان لەو کاتەدا دەیانوت تاکو مرد هەر (سبحان اللە) و(لاالەالااللە)و (اللە اکبر)ی دەکرد، بۆیە گومانیان لەوە نەبوو کەبە موسڵمانێتی مردووە، چونکە هەر لەو دانیشتنە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ خۆشەویستی ئیسلام چوو بەدڵی یەوە .[٣]

---

١- سیرة ابن هشام ٢/٤٠ باسناد حسن .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/١٩٥ .

٣- بڕوانە: سیرة ابن هشام ٢/٤١ باسناد حسن .

## دووەم: سەرەتای موسڵمان بوونی ئەنصارەکان.

سەرەتای بەرهەمدار لەگەڵ نێردەی خەزرەج بوو لەکاتی حەجدا، لەلای عەقەبەی مینا، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون: ئێوە کێن؟ وتیان: کەسانێکین لەخەزرەج.

فەرمووی: ئایا لەمەوالییەکانی جولەکەن؟

وتیان: بەڵێ

فەرمووی: ئایا دانانیشن قسەتان لەگەڵ بکەم؟

وتیان: بەڵێ و، دانیشتن لەگەڵی و بانگی کردن بۆ ئیسلام وقورئانی بۆ خوێندنەوە.[1]

لەنێوان یەکدا وتیان: ئەی خزمان ئەوە بزانن کەئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کەجولەکەکان باسیان دەکرد، بۆیە ڕێگە نەدەن ئەوان پێشتان نەکەون لەپێ گەیشتنیدا، بۆیە ڕازی بوون بەو قسانەی کەپێغەمبەرﷺ کردی و وتیان: ئێمە کەسەکانی خۆمانمان بەجێهێشتووە، کەسیش نییە ئەوەندەی ئەوان نێوانیان ناکۆک بێت، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی تۆوە کۆیانبکاتەوە، ئێمەیش دەگەڕێینەوە لایان ئەم باسانەی تۆیان بۆ دەکەین، ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ کۆیانی کردەوە، ئەوا کەس نییە لەتۆ پشت ئەستورتر، ئینجا گەڕانەوە بۆ مەدینە دوای ئەوەی باوەڕیان ،[2] هێنا بەپێغەمبەرﷺ ، ئەوان شەش کەس بوون: ئەبو ئومامەی ئەسعدی کوڕی زورارەو، عەوفی کوڕی حاریس لەبەنی نەجارو، ڕافیعی کوڕی مالیك و، قوتبەی کوڕی عامیرو، عوقبەی کوڕی عامیرو، جابیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕیئاب [3] ، کاتێك گەڕانەوە باسی پێغەمبەرﷺ یان بۆ کردن وبانگیان کرد بۆ ئیسلام، تاکو بڵاوبوویە لەنێوانیاندا،ماڵێکیش نەما لەماڵەکانی ئەنصار باسی پێغەمبەرﷺ ی تیادا نەبێت .[4]

---

١- هەمان سەرچاوە ٢/٤١، ٤٢ .

٢- البداية والنهاية ٣/١٤٩،١٤٨ .

٣- بڕوانە: شرح المواهب للزرقاني ١/٣٦٢ .

٤- البداية والنهاية ٣/١٤٧ .

ئەوە یەکەمین کەژاوە بوو لەکەژاوەکانی خێرو چاکە، بەوە ڕانەوەستان کەباوەڕبهێنن بەڵکو پەیمانیان بەخۆیاندا کەبانگی کەسەکانیشیان بکەن، هەمووشیان بەڕاستی بەئەمەك بوون بۆ ئایینەکەیان، چونکە پاش گەڕانەوەیان گورج وگۆل بوون لەبانگەوازدا، چاو پێکەوتنی ئەوانە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەبێ هیچ کات دیاریکردنێك بوو، بەڵام چاوپێکەوتنێك بوو خوای پەروەردگار ڕێکیخستبوو، بۆ ئەوەی ببێتە کانییەکی هەمیشە هەڵقوڵاوی چاکە وساتی ڕزگاربوون لەبتپەرستی، بەڵکو ساتێکی یەکلاکەرەوە بۆ چارەنووسی جیهان هەمووی، ئایا ئاسان بوو ئەو هەموو بتپەرستانە ببنە پشتیوان بۆ بانگەوازی خوا، بگەڕێنەوە بۆلای میللەتەکەیان بەڕوناکی ئیسلامەوە؟ ئەوە ویستی خوای گەورە بوو، کەئەو بوارە لەبارەی بۆ بانگەواز ئامادەکرد.

ئەو ساڵەو شکانەیش کەپێغەمبەرﷺ بەکۆشش کردن بەسەری بردو بەگەڕان بەسەر هۆزەکانداو بەدوای پشتیوان گەڕاندا، وا ڕۆیشت وناگەڕێتەوە، لەمەودا ئیسلام هێزی خۆی دەبێت کەدەستەو یەخە دەبێتەوە لەگەڵ ناهەق دا، هەر لەئەمڕۆشەوە کەژاوەکانی چاکە وپێشنگی ڕوناکی یەك بەدوای یەکدا بەرەو مەککە دێن، بۆ ئەوەی لەدەریای چاکە وەربگرن وبگەڕێنەوە یەسریب وڕوناکی بڵاوبکەنەوە.[1]

شایەنی باسیشە کەئەم چاوپێکەوتنە کەلەلای عەقەبە ڕوویدا، بەیعەتی تیادا نەبوو، چونکە ئەوان کەسانێکی کەم بوون مافیان بەخۆیان نەدەدا هیچ ڕیککەوتننامەیەك ئەنجام بدەن بێ ئەوەی بگەڕێنەوە لای هۆزەکانیان لەمەدینە .

## سێیەم: بەیعەتی عەقەبەی دووەم.

پاش ساڵێك لەچاوپێکەوتنی یەکەم لەلای عەقەبە، دوانزە کەس لەپیاوانی ئەنصار هاتن و پێغەمبەرﷺ یان بینی لەعەقەبەو، بەیعەتی یەکەمیان پێدا (دەکەس لەخەزرەج و، دووکەس لەئەوس) ئەوەش ئاماژە دەکات بۆ گورج وگۆڵی

---

١- بڕوانە: اضواء على الهجرة لتوفيق محمد سبع ٢٧٣، ٢٧٤ .

نێـردەی خەزرەجـەکان کەلەسـاڵی پێـشوودا موسـڵمان بـوو بـوون و، توانیـشیان پیاوانێك لەئەوسیش ڕاکێشن بۆ ئیسلام، ئەوەیش سەرەتای کۆبونەوەیان بوو لەژێر ئاڵای ئیسلامدا .[١]

عوبادەی کوڕی صامیتی خەزرەجی دەربارەی بەیعەتی عەقەبەی یەکەم دەڵێت: ((من یەکێ بووم لەوکەسانەی ئامادەی عەقەبەی یەکەم بـووم، ئێمـە دوانـزە کـەس بووین، بەیعـەتمان دایـە پێغەمبـەرﷺ لەسـەر بەیعـەتی ئافرەتـان_ پـێش ئـەوەی جەنگمان لەسەر فەرزبێت_: کەهاوەڵ بۆ خوا بڕیارنەدەین و، دزی نەکـەین و، زینـا نەکەین و، منداڵەکانمان نەکوژین و، بوختان بۆ کەس نەکەین و، لەچاکەدا لەقـسەی دەرنەچین، ئەگەر بەئەمـەك بـوون بەرانبـەر ئـەم ڕێنماییانـە بەهەشـت بـۆ ئێوەیـە، ئەگـەریش هەنـدێکیتان ئەنجامـدا فـەرمانتان بەدەسـت خواوەیـە، ئەگـەر بیـەوێت سزاتان دەدات، ئەگەریش بیەوێت لێتان خۆش دەبێت .[٢]

برگەکانی ئەم بەیعەتە هەمان ئەو بڕگانە بوو کەپێغەمبـەرﷺ بەیعـەتی لەسـەر وەرگرت لەئافرەتان هەر بۆیە ناونرا بە بەیعەتی ئافرەتان،[٣]

ئینجا پێغەمبەرﷺ موصعەبی کوڕی عومەیری نارد لەگەڵ ئەوانەی بەیعەتیاندا، بۆ ئەوەی کاروباری ئاینەکەیان فێربکات و، قورئانیان پـێ بخـوێنێ بۆیـە لەمەدینـە پێی دەواترا (قورئانخوێن)، ئینجا پێش نوێژیشی بۆ دەکردن، پێغەمبـەرﷺ ئـەوی لەسەر بنەمای شارەزایی لەکەسایەتی هەڵبژاردبوو، لەلایەکەوە، لەلایەکی تریـشەوە لەسەر بنەمای شارەزابوونی لەبارودۆخی ناومەدینە، چونکە موصعەب ڕەزای خوای لێبێت جگە لەوەی قورئانی لەبەر بوو، کەسێکی ڕوخۆش وهێمن بوو، ڕەوشت جوان ودانـا بـوو، جگـە لـەوەی کەسـێکی بـاوەڕ بـەهێزو دڵگـەرم بـوو بـۆ ئیـسلام، بۆیـە لـەماوەی چـەند مانگێکـدا تـوانی ئیـسلام بڵاوبکاتـەوە لـەنێو ماڵـەکانی مەدینـەدا، چەندین پشتیوان لەسەر گەورەکانی ئەنصار ڕاکێشێت بۆ ڕیـزی موسـڵمانان وەکـو،

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/١٩٧ .

٢- مسند الامام احمد ٢٢٧٥٤ ط .م. الرسالة ، وقـال محققـوه: حـديث صـحيح وهـذا اسـناد حـسن، وانظـر صحيح مسلم ٤١_ ١٧,٩ .

٣- بڕوانە: الغرباء الاولون ١٨٥ .

سەعدی کوڕی موعازو، ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو، بەموسڵمان بوونی ئەو دوو کەسەش خەڵکانێکی زۆر موسڵمان بوون.[١]

موصعەب وەکو باڵوێزێك سەرکەوتوو بوو لەکارەکەیدا، لەڕونکردنەوەی ڕینماییەکانی ئایین وفێرکردنی قورئان و، ڕاڤەکردنی و، پتەوکردنی پەیوەندی برایەتی لەنێوان هۆزە باوەڕدارەکان لەلایەکەوە، لەنێوان پێغەمبەرﷺ و هاوەڵەکانی لەمەککە لەلایەکی ترەوە، بۆ دۆزینەوەی بنکەیەکی ئارام بۆ بەڕێکەوتنی بانگەواز.

موصعەبی کوڕی عومەیر _ڕەزای خوای لێبێت_ لەیەسریب چووە ماڵی ئەسعەدی کوڕی زورارە ڕەزای خوای لێبێت.[٢] موسڵمانانیش چالاك بوونەوە لەبانگەواز کردن بۆ لای خوای گەورە، بەسەرکردایەتی موصعەب، کەپەیڕەوی دەکرد لەڕێبازی قورئان وئەو ووشانەی لەمامۆستاکەیەوە موحەممەدﷺ فێربوو، هەندێ لەئایەتە مەککیەکانی بەشێوەیەکی کردەیی لێکدەدایەوە، وەکو فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾(النحل: ١٢٥).

## چوارەم: بەسەرهاتی ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو، سەعدی کوڕی موعاز ڕەزای خوای لێبێت.

ئەو دووپیاوە سەرکردەی کۆمەڵەکەیان بوون، لەبەنی عەبدولئەشهەل، هەردوکیانیش بتپەرست بوون لەسەر ئایینی میللەتەکەیان، کاتێك کە ناوی موصعەبیان بیست وچالاکی لەبانگەوازدا، سەعد بەئوسەیدی ووت: بۆلای ماڵەکانمان هاتوونە لاوازەکانمان لەخشتەبەرن، قسەی ڕەقیان لەگەڵ بکەو بیانترسێنە لەوەی بێنە ماڵەکانمان، ئەگەر لەبەر ئەسعەدی کوڕی زورارەیش نەبوایە

١- بڕوانە: الغرباء الاولون ١٨٦، ١٨٧ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء القران والسنة ١/٤٤١ .

خۆم بەوکارە هەڵدەسام، چونکە پوورزای منە(دایکیان خوشك بوون) وناتوانم بچمە سەری، ئیتر ئوسەید ڕمێکی هەڵگرت بەرەولایان چوو، کاتێك ئەسعەدی کوڕی زورارە بینی ووتی: ئەوە سەر گەورەی کۆمەڵی خۆیەتی، واهاتووەتەلات و قسەی ڕاستی بۆبکە، موصعەب ووتی: ئەگەر دانیشتی گفتوگۆی لەگەڵ دەکەم، ئەویش لەسەریان ڕاوەستاو قسەی ناشیرینی دەکرد وداوای دەکرد کە دەرچن وئەوان هیچ پێویستیان پێیان نییە، بەڵام موصعەب بەزمانی ئیمانداری بەئارام ووتی: ئایا بۆ دانانیشیێ وگوێ بگرێت، ئەگەر پێت باش بوو قسەکان وەردەگرێت، ئەگەر نائەوەت پێناخۆش بێت ئێمەیش وازی لێدەهێنین.

ئوسەید ووتی: قسەکەت جوانە، ئینجا ڕمەکەی داگرت ودانیشت، موصعەبیش باسی ئیسلامی بۆ کردو قورئانی بۆ خوێندەوە، هەردووکیان دەیانوت: سوێند بەخوا پێش ئەوەی قسەبکات موسڵمانێتیمان بینی لەنێو چاوانی دەگەشایەوە، دوایی ووتی: ئەو قسانە چەند جوان وڕێکوپێکن، کەسێك چی بکات بۆ ئەوەی بێتە ناو ئەم ئایینەوە؟ ووتیان: خۆت دەشۆری وخۆت خاوێن دەکەی وجل وبەرگەکانت پاك دەکەیتەوەو، شایەتیمان دەهێنیت بەڕاستی و، نوێژ دەکەیت، ئوسەید هەڵساو خۆی شۆردو جلەکانی پاك کردەوە وشایەتمانی هێنا، دوایی هەڵسا دووڕکات نوێژی کردو، پێیانی ووت: من پیاوێکم لەدوای خۆم بەجێهێشتووە، ئەگەر ئەویش شوێنتان بکەوێت، کەس نامێنێتەوە لەشوێنکەوتوانی موسڵمان نەبن، ئێستاش من دەینێرم بۆ لاتان.

ئینجا ڕمەکەی هەڵگرت وڕۆیشت بۆلای سەعدو شوێنکەوتوانی، کاتێك سەعد بینی هات ووتی: سوێند بەخوا ئوسەید بەشێوەیەکی تر گەڕایەوە بۆ لاتان، سەعد پێی ووت: چیت کرد؟ ووتی: قسەم لەگەڵیان کرد وسوێند بەخوا قسەکانیان عەیبی تیادانییە، وتیشیان: ئەوە دەکەین کەتۆ حەزی لێدەکەیت، هەواڵیشم پێگەیشتووە کەبەنی حاریسە دەرچوونە بۆ کوشتنی ئەسعەدی کوڕی زورارە چونکە پوورزای تۆیە بۆ ئەوەی سەر شۆڕت بکەن.[١]

---

١- السيرة النبوية لأبي شهبة ١/٤٤٢ .

سەعد بەتوڕەیی هەڵسا پاش ئەوەی کەبیستی دەربارەی بەنی حاریسە، ڕمەکەی گرتە دەستەوەو ووتی: سوێند بەخوا وانازانم هیچت کردبێت، ئینجا سەعد بەرەو لای هەردووکیان چوو، بینی بەهێمنی دانیشتوونە، ئەوکاتە زانی ئوسەید ویستوویەتی گوێیان لێ بگرێت، ئەویش ڕاوەستاو قسەی ناشرینی دەکرد، ئینجا بەئەسعەدی کوڕی زورارەی ووت: سوێند بەخوا ئەی باوکی ئومامە لەبەر خزمایەتی نێوانمان نەبوایە، ئەمەت لێمان داوا نەدەکرد، ئایا وادەبێت لەماڵی خۆماندا بێزارمان بکەیت، ئەسعەد بەموصعەبی وتبوو: ئەوە سەر گەورەکەیە هات، ئەگەر موسڵمان بێت هەموو شوێنکەوتوانی موسڵمان دەبن، موصعەب پێی وت: ئایا دادەنیشی وگوێ بگریت؟ ئەگەر پێت باش بوو ڕازی دەبیت، ئەگەر نا ئەوەی پێت ناخۆشە وازی لێ دەهێنین، سەعد ووتی: قسەیەکی جوانت کرد، ئینجا ڕمەکەی داگرت ودانیشت، موصعەب ئیسلامی بۆ باسکرد وقورئانی بۆ خوێندەوە، موسای کوڕی عوقبە دەگێڕێتەوە کەسەرەتای سوڕەتی زوخروفی بۆ خوێندووەتەوە، ووتیان: _سوێند بەخوا_هەر لەڕوومەتی زانیمان موسڵمان دەبێت پێش ئەوەی قسەبکات.

ئینجا پێیانی ووت: ئەگەر کەسێك بیەوێت موسڵمان بێت چی دەکات؟ ووتیان: خۆت بشۆرەو جلەکەت خاوێن بکەرەوەو شایەتمانی ڕاستی بهێنەو، دوو ڕکات نوێژبکە، ئەوەیش وایکردو ڕمەکەی هەڵگرت وگەڕایەوە لای کۆمەڵەکەی، لەگەڵ ئوسەیدی کوڕی حوزەیردا، خەڵکەکە ووتیان سوێند بەخوا بەدەم وچاوێکی ترەوە گەڕایەوە، کاتێك پێیان گەیشت ئەی بەنی عەبدولئەشهەل من چۆن دەبینن؟ ووتیان: سەرگەورەمانی وچاك ترین بیرو بۆچوونت هەیە لەنێوانماندا، وتی: کەواتە قسە کردنم لەگەڵ ژن وپیاوتان قەدەغەیە تاکو باوەڕنەهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی، دەڵێت: سوێند بەخوا لەبەنی عەبدولئەشهەل نەپیاو نەژن نەما هەموویان موسڵمان بوون.

ئەسعەدو موصعەب گەڕانەوە ماڵی ئەسعەدی کوڕی زورارەو، هەر لەوێیش مایەوە، بانگی خەڵکی دەکرد بۆ ئیسلام، تاکو گەیشتە ئەوەی ماڵێك لەماڵەکانی

ئەنصار نەما موسڵمانی تیادا نەبێت، تەنها ئوصەیرەم نەبێت موسڵمان بوونی دواكەوت تا ڕۆژی ئوحود وەهەر لەوێش شەهید بوو، بێ ئەوەی سوجدەیەك بۆ خوا ببات، پێغەمبەرﷺ یش فەرمووی: ئەوە لەئەهلی بەهەشتە ئیبنو ئیسحاق بەئیسنادێكی حەسەن دەگێڕێتەوە لەئەبو هورەیرەوە كە فەرموویەتی: باسی كەسێكم بۆ بكەن موسڵمان بووبێت وركاتێك نوێژی بۆ خوا نەكردبێت، جائەگەر خەڵكەكە نەیانزانیبا، دەیفەرموو: ئەوە ئوصەیرمی بەنی عەبدولئەشهەلە .[١]

## پێنجەم: سوودو وانەو پەندەكان.

١-نەخشە كێشانی پێغەمبەرﷺ زیاتر بایەخی دەدابە یەسریب، ئەو شەش كەسەیش كەموسڵمان بوون ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لەبڵاوكردنەوەی بانگەوازی ئیسلام لەماوەی ئەو ساڵەدا.

٢- هەندێك هۆكار هەبوو یارمەتی بڵاوبوونەوەی ئیسلامیدا لەمەدینە، لەوانە: _سروشتی نەرم ونیانی هەردوو هۆزی ئەوس وخەزرەج، كەزیادەڕەویان نەبوو لەڕەتكردنەوەی هەڵوێستی ڕاست ورەوا، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاماژەی پێغەمبەرﷺ كە فەرموویەتی: ((اتاكم اهل اليمن، هم ارق افئدة والين قلوباً)) .[٢]

واتە: وا خەڵكی یەمەن هاتنە لاتان، ئەوان لە هەموو كەس هەستناسكترو دڵنەرمترن، ئەو دوو هۆزەیش بەبنچینە دەگەڕێنەوە سەر یەمەن، باوباپیرانیان لەسەردەمێكی كۆنەوە هاتوونەتە ئەوێ،[٣] خوای گەورە ستایشیان دەكات ودەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ (الحشر: ٩).

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لأبی شهبة ١/٤٤٤ صحيح السيرة النبوية ٢٩١ .

٢- البخاری، كتاب المغازی، باب قدوم الاشعريين رقم ٤٣٨٨ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية لابی الحسن الندوی ١٥٤ .

– ناکۆکی نێوان ئەوس وخەزرەج وهەڵگیرسانی شەڕ لەنێوانیاندا، کە زۆرێك لەسەرانیان تیاچوون لەو شەڕانەدا، کەکۆسپ بوونە لەڕێگەی ئیسلامدا، تەنها سەرکردە لاوەکان مابوون کەئامادە بوون ڕاستی وەربگرن، جگە لەوەی کەسی زۆر ناودار نەمابوو هەر هەموویان لەقسەی دەرنەچن، ئەوان پێویستیان بەسەرکردەیەك بوو بەدەوریدا کۆببنەوە، عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: ((شەڕی بوعاس خوای گەورە پێشکەشی کرد بەپێغەمبەرەکەی چونکە ئەو شەڕە ئەوانی پەرتەوازە کردبوو، پیاو ماقوڵانیشیان تیایدا لەناو چووبوون وبریندار بوو بوون، بۆیە خوای گەورە موسڵمان بوونیانی پێشکەش بە پێغەمبەرﷺکرد)) .[١]

– نزیکیان لەجولەکەکان، ئەوەیش وایکرد شارەزاییان هەبێت دەربارەی پەیامە ئاسمانییەکان ولەژیانی ڕۆژانەیان ئەو قسانەیان دەبیست، وەکو قورەیش نەبوون کە هیچ خاوەن ئاینێکیان لەنێودا نەدەژیا، بەڵکو هەندێ هەواڵی لێرەو لەوێیان دەبیست دەربارەی پێغەمبەران و وەحی، ئینجا جولەکەکان ئاگەداری ئەو دوو هۆزەیان دەکردەوە کەکاتی سەر هەڵدانی پێغەمبەرێك نزیك بووەتەوە، بانگەشەی ئەوەشیان دەکرد کەشوێنی دەکەون وئەوانی تری پێ دەکوژن، وێڕای ئەوەی ئەوان لەجولەکە زۆر تربوون ،[٢] خوای گەورەیش ئەمەی لەقورئاندا گێڕاوەتەوە: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾(البقرة:٨٩)

ئەوس وخەزرەج سەردەمانێك بوو لەجاهیلیەتدا لەجولەکە بەهێزترو زۆرتر بوون، کەئەوان بتپەرست بوون و، ئەمان ئەهلی کتاب بوون، بۆیە هەڕەشەی لێدەدان بەپێغەمبەرێك کەدێت وشوێنی دەکەون وبەهۆی ئەو پێغەمبەرەوە ئەوان لەناو دەبەن وەکو عادو ئیرەم .[٣]

---

١– البخاري: كتاب مناقب الانصار، باب مناقب الانصار ٤/٢٦٧ رقم ٣٧٧٧ .

٢– بڕوانە: الغرباء الاولون ١٨٣ .

٣– الدر المنثور للسيوطي ١/٢١٦ .

تاکو خوای گەورە ویستی لەڕێگەی ئەو شەش کەسەوە ئایینی خۆی سەربخات لەمەدینەو، چاویان کەوت بەپێغەمبەرﷺ لەعەقەبەو موسڵمان بوون لەسەر دەستی ودڵنیابوون ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کەجولەکەکان باسی دەکەن، ئەوانیش گەڕانەوە باسەکەیان بڵاوکردەوەو، ئەوە سەرەتای موسڵمان بوونیان بوو.[١]

٣- بەیعەتی عەقەبەی یەکەم دووانی تیادا ئامادە بوو لەخەزرەج، ئەوەیش پێشکەوتنێکی گرنگ بوو لەبەرژەوەندی ئیسلام، چونکە لەپاش شەڕی لەناو بەری بوعاس، ئەو شەش کەسە توانیان بەسەر هاتی ململانێی خۆیان پشتگوێ بخەن و، حەوت کەسی تریش لەگەڵ خۆیان بهێنن، دوو کەسیان لەئەوس بوون، ئەوەش وادەردەخات کەئەوان لەهەوڵدانی چارە سەرکردنی ئەو قلیشانەوەن کەلەنێوانیاندا ڕوویداوەو، ئاڕاستە کردنی تەوژمی ئیسلامی بۆ مەدینە بەئەوس وخەزرەجی یەوەو، لەبیرکردنی شەڕەکانی نێوان خۆیان.

٤- پێغەمبەرﷺ هەموو هەوڵێکی دا، بۆ ئامادەکردنی توانای موسڵمانان لەمەدینە، هیچ کەم وکورییەك نەبوو سەبارەت بەبنیاتنانی ئەو بنەما بەهێزەی کەدەوڵەتی تازەی لەسەر دروست دەبێت، ئەم هەوڵەیش دووساڵی تەواوی خایاند.[٢]

٥- کۆکردنەوەی ئیمانی سەرکەوتوو بوو لەدڵی ئەنصارەکاندا، هەستیشیان دەکرد کە کاتی ئەوە هاتووە دەوڵەت پێکبهێنن، وەکو جابیر ڕەزای خوای لێبێت، دەفەرمووێت: تاکەی واز لەپێغەمبەرﷺ بهێنین بەناو هۆزەکاندا بگەڕێ ودەربکرێت لەچیاکانی مەککەو بترسێت ..[٣]

٦- موصعەب ڕەزای خوای لێبێت گەیشتە مەککە، پێش کاتی حەج لەساڵی سیانزەی ڕەوانەکردنی پێغەمبەرﷺ، وێنەی تەواوی بارودۆخی موسڵمانانی باس کرد وەکو خۆی، لەڕووی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە هەموو بەشەکانی ئەوس و خەزرەج و، ئەوان ئامادەن کەبەیعەتێکی تر بدەن بۆ پاراستنی پێغەمبەرﷺ.[٤]

---

١- بڕوانە: الدار المنثور ١/٢١٦ , ابن هشام ١/٤٤ .

٢- هەمان سەرچاوە ١/٣٩، ٤٤ .

٣- بڕوانە: التحالف السياسی ٧١ .

٤- هەمان سەرچاوە ٧٢ .

٧- ئینجا ئەو چاوپێکەوتنە ڕوویدا کەڕەوڕەوەی مێژووی گۆڕی، لەکاتی حەجدا لەسالّی سیانزەمین لەپێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ ، لەو سالّەدا زیاتر لەحەفتا کەس هاتن بۆ بەجێهێنانی حەج لەخەلّکی یەسریب، کاتێك گەیشتنە مەککە، هەندێ پەیوەندی نهێنی ڕوویدا لەنێوان ئەوان وپێغەمبەرﷺ دا، سەر ئەنجام بڕیاردرا لەناوەڕاستی (ایام التشریق) هەردوو لایەکتر ببینن، لەلای ئەو ڕێچکە ڕێگا شاخاوییەی عەقەبە، لەنزیك جەمرەی یەکەمی مینا، هەروەها بڕیاردرا ئەو چاپێکەوتنە لەئەو پەڕی نهێنیدا بێت .[١]

١- هەمان سەرچاوە ٧٢ .

## بەیعەتی عەقەبەی دووەم

جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: (...ووتمان: تاکەی واز لەپێغەمبەری خوا بهێنینﷺ دەرکرێت بۆ شاخەکانی مەککە وبترسێت، بۆیە حەفتا کەسمان ڕۆیشتین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و، لەکاتی حەجدا، کاتمان دیاری کرد لەلای عەقەبە یەکبگرین، یەك یەك ودوو دوو هەموومان کۆبووینەوەو، ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر چی بەیعەتت پێ بدەین؟ فەرمووی: ((تبايعوني على السمع والطاعة في النشاط والكسل، والنفقة في العسر واليسر، وعلى الامر بالمعروف.......)) واتە: بەیعەتم پێبدەن لەسەر گوێڕایەڵی لەچالاکی وخاوبوونەوەتاندا، هەروەها خەرج کردن لەبوونەو نەبوونەداو، فەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپەو، هەموو قسەیەك لەپێناو خوادا بێت بیکەن و، ترستان نەبێت لەلۆمەی لۆمەکاران و، پشتگیریم بکەن وپارێزگاریم بکەن کاتێك دێم بۆ لاتان، لەهەموو شتێك کەپارێزگاری خۆتان وخێزان ومناڵەکانتانی لێ دەکەنو هەشت بۆ ئێوەیە .

دەڵێت: ئێمەیش هەڵساین وبەیعەتمان پێدا، ئەسعەد_کەلەهەموویان مناڵتر بوو_ دەستی پێغەمبەر ﷺ ی گرت ووتی: لەسەرخۆتان ئەی خەڵکی یەسریب، ئێمە ئەم هەموو ڕێگەمان نەبڕیوە تاکو دڵنیا نەبووینە کەمەحەممەد پێغەمبەری خوایە، دەرکردنیشی ئەمڕۆ جیابوونەوە دەگەیەنێت لەگەڵ هەموو عەرەب و، کوژرانی چاکەکانتان وگەیشتنی شمشێر بۆ ئێوە، ئیتر یان ئەوە ئارام دەگرن لەسەر ئەوەو، پاداشتتان لای خوایە، یان ئەوەیە کەدەترسن وناوێرن، بۆیە هەڵوێستتان ڕوونبکەنەوە، دەبێتە پۆزش بۆ ئێوە لەلای خوا، ووتیان: سوێند بەخوا ئەی ئەسعەد هەرگیز واز لەئەم بەیعەتە ناهێنین ودەستی لێ هەڵناگرین، دەڵێت: ئیتر هەڵساین وبەیعەتمان پێدا، پێغەمبەر ﷺ یش مەرجی لەسەرمان دادەناو بەڵێنی بەهەشتی پێدەداین .[1]

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ٩٩/١ ، واخرجه الامام احمد، وهذا لفظه ، ورقمه ١٤٤٥٦ ط.م. الرسالة: وقال محققوه: اسناده صحيح على شرط مسلم .

بەم شێوە ئەنصارەکان بەیعەتیان دایە پێغەمبەر ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و پشتگیری و جەنگ کردن، بۆیە عوبادەی کوڕی صامیت ناوی نا (بیعة الحرب) [1] سەبارت بەڕیوایەتی کەعبی کوڕی مالیکی ئەنصاری_کەخۆی یەکێك بووە لەوانەی بەیعەتی عەقەبەی دووەمیان داوە_ هەندێ وردەکاری زیاتری تیادایە، دەفەرمووێت: ((لەگەڵ حاجیە بتپەرستەکانی خزمانماندا دەرچووین، نوێژمان دەکرد ولەئایین تێگەیشتبووین، کاتی یەکتربینیمان دەسنیشان کرد لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لەعەقەبە، لەناو ڕاستی ڕۆژانی تەشریقدا، ئەم باسەمان لەبتپەرستەکان دەشاردەوە، ئەو شەوە لەگەلیان خەوتین، لەدوای نیوەشەو لەجێگەکانی خۆمان دەرچووین بەرەو شوێنی دیاریکراو بۆ بینینی پێغەمبەرﷺ ، وەکو قەتێ خۆماندەشاردەوە، تاکو گەیشتینەیەك لەلای عەقەبە، حەفتا پیاو بووین، دووژنیشمان لەگەڵدا بوو، نوسیبەی کچی کەعب و، ئەسمانی کچی عەمر، لەوێ کۆبووینەوە تاکو پێغەمبەر ﷺ هات وعەبباسی مامی لەگەڵدا بوو، کەئەو هێشتا بتپەرست بوو، یەکەم کەسیش عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب قسەی کرد؛ ئیتر ئەوەی ڕوونکردەوە کەپێغەمبەرﷺ لەپارێزگاری بەنی هاشیمدایە، بەڵام دەیەوێت کۆچ بکات بۆ مەدینە، بۆیە عەبباس دەیەویست دڵنیابێت لەپارێزگاری کردنی ئەنصارەکان لەبرازاکەی و، بەجێی نەهێڵن، ئەوانیش داوایان کرد پێغەمبەرﷺ خۆی قسە بکات وچی پێ باشە لەمەرجدانان بۆ خۆی وخوای گەورە لێیان وەربگرێت.

فەرمووی: بەیعەتتان لێ وەردەگرم بمپارێزن لەوەی کە ئافرەت ومناڵەکانی خۆتانی لێ دەپارێزن، بەرائی کوڕی مەعرور کردی بەدەستیداو ووتی: بەڵێ سوێند بەوکەسەی تۆی بەڕاستی ناردووە، وادەکەین، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی لێوەرگرتین، ئێمەیش خەڵکێکی خاوەن ئەزموون بووین لەجەنگدا، لەباوباپیرانمانەوە بۆمان مابوویەوە، ئەبولهەیسەمی کوڕی تیهان قسەکەی پێ بڕی وپرسیاری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، لەنێوان ئێمەو جولەکەکاندا هەندێ

---

١- مسند الامام أحمد ٣١٦/٥ ورقمه ٢٢٧٠٠ باسناد صحيح لغيره .

پەیوەندی هەیەو ئێمە دەیبڕین، ئایا ئەگەر ئێمە وامان کرد وخوای گەورە تۆی سەرخست وگەڕایتەوە مەککەو ئێمەت بەجێهێشت چی بکەین؟ پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: ((بل الدم الدم، والهدم الهدم، انا منكم، وانتم مني، احارب من حاربتم واسالم من سالمتم)) واتە: خوێن وخوێن، وێرانکردن وێرانکردن، من لەئێوەم، ئێوەش لەمنن، هەرکیەسێك ئێوە شەڕی لەگەڵ بکەن شەڕی لەگەڵ دەکەم، ئاشتیش لەگەڵ هەرکەسێك بکەن ئاشتی لەگەڵ دەکەم.

ئینجا فەرمووی: ((اخرجوا اليّ منكم اثنى عشر نقيباً ليكونوا على قومهم بما فيهم)) واتە: دوانزەکەس لەخۆتان دەرکەن بابینە فەرماندە لەسەر ئەوانی تر، ئیتر ئەوانیش دوانزەیان دەرهێنا، نۆکەسیان لەخەزرەج و، سێ کەس لەئەوس. ئینجا پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردن بگەڕێنەوەبۆ شوێنەکانی خۆیان، گوێیان لەشەیتان بوو قوڕەیشی ئاگادار دەکردەوە، عەبباسی کوڕ عوبادەی کوڕی نەزلە ووتی: سوێند بەوکەسەی تۆی کردووە بەپێغەمبەر، ئەگەر دەتەوێت سبەی بەشمشێرەکانمان دێین بەخەڵکی مینادا .

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((لم نؤمر بذلك ولكن ارجعوا الى رحالكم)) واتە: فەرمانمان بەوە پێ نەکراوە، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆتان، ئەوانیش گەڕانەوە، سەر لەبەیانی هەندێك لەسەرانی قوڕەیش هاتنە لایان، سەبارەت بەوەی بیستیان لەپەیماندانیان بەپێغەمبەرﷺ و بانگهێشت کردنیان بۆ ئەوەی کۆچ بکات بۆ لایان، ئیتر بتپەرستانی ئەوس وخەزرەج سوێندیان خوارد کەکاری وایان ئەنجام نەداوە، موسڵمانەکانیش سەیری یەکتریان دەکرد [1] ئینجا هەڵسان و حاریسی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزومیان تیادا بوو، جوتێ نەعلی تازەی لەپێکردبوو، منیش ووتم: ئەی ئەبو جابیر ئایا تۆیش ناتوانی جوتێ نەعل وەکو ئەلاوە قوڕەیشیە لەپێ بکەیت؟ حاریس قسەکەی بیست ونەعلەکانی لەپێی خۆی داکەند وفڕێیانیداو ووتی: سوێند بەخوا ئەبێ لەپێی بکەیت، ووتی: ئەبو جابیر دەڵێت: نەعلەکانی بۆ بگێڕەوە. دەڵێ: ووتم: نەبەخوا نایگێڕمەوە [2].

---

١- بڕوانە: ابن هشام ٦١/٢ ، باسناد حسن، وانظر: السيرة النبوية الصحيحة للعمري ٢٠١/١ .

٢- بڕوانە: مجمع الزوائد ٤٢/٦_٤٦ وقال الالباني في تحقيق فقه السيرة للغزالي: وهذا سند صحيح. وصححه ابن حبان ، في الفتح ٤٧٥/٧ .

**وانەو ئامۆژگارییەکان:**

١- ئەم بەیعەتە بەهەموو پاڵنەرو شوێنەوارەکانی سەرکەوتنێکی هەرە گەورە بوو، چونکە ئەڵقەی یەکەم بوو لەزنجیرەی فتوحاتی ئیسلامی کەیەك بەدوای یەکدا هاتن، لە سەرئەنجامی ئەم بەیعەتەوە، پاش ئەو مەرج وپەیمانانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوان وەریگرت، لەسەر بەهێزترین پێشەنگ لەپیشتیوانانی خوای گەورە، کەئەوانیش بەئەمەك ترین کەسانێك بوون بۆ ئەو پەیمانە کەپەیمانی پشتگیریکردن بوو لەڕێگای ڕاستی ئیسلام و، چاکیش دەیانزانی چی دەگەیەنێ، هەموو هەوڵێکیشیاندا لەپێناو بەرزکردنەوەی ووشەی(الله) لەهەموو شوێنێکدا، بۆ ئەوەی ئایین تەنها بۆ خوای گەورە بێت......[1]

٢- ڕاستێتی باوەڕو شوێنەواری لەپەروەردەکردنی دڵ ودەروندا، شوێنەوارەکانی دەردەکەوێت لەئامادەیی سەرکردە گەورەکان، کەگیانیان بەخت بکەن لەپێناو خوای گەورەو پێغەمبەر ﷺ دا، پاداشتی لەسەر زەویش لەدەستکەوت وپلەو پایەدا نییە، کەپێشتر ئەوان دەیان ساڵیان لەتەمەنیان بەسەر دەبرد لەپێناویدا، ئەوە شوێنەواری باوەڕە بەخواو ڕاستی ئەم ئیسلامە کاتێك پەلدەهاویشێ لەدڵەکاندا .[2]

٣- گرنگی نەخشەکێشان لەبەیعەتی عەقەبەدا، ئەوە بوو کەلەبارودۆخێکی ناهەموارو سەختدا بوو، ئینجا بریتی بوو لەبەرنگارییەکی بەهێزو ترسناك لەدژی بتپەرستی، لەو سەردەمەدا، بۆیە نەخشەکێشانی پێغەمبەر ﷺ بۆی لەئەو پەڕی تۆکمەییدا بوو بەم شێوەی لای خوارەوە:

أ- نهێنی جموجۆڵ وگواستنەوەی کۆمەڵی پەیماندەران، بۆ ئەوەی کارەکە ئاشکرا نەبێت، چونکە نێردەکە حەفتا پیاوو دووژن بوون، لەنێو یەسریبەییەکان کە هاتبوون بۆ مەککە ونزیکەی پێنج سەد کەس دەبوون، کاتی یەکتر بینینیش دووەم

---

١- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون ٢/٤٠٠ .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٠٣ .

ڕۆژانی تەشریف بوو پاش نیوە شەو، لەکاتی خەوتنی خەڵکی و کپی شەودا، هەروەها لەجێگایەکیشدا بوو دوور لەوەی کەسێك بۆ کارێکی لەخەو بەئاگابێتەوە بیانبینێت .[١]

ب- دەرچوون بە شێوەیەکی ڕێك وپێك لەلایەن کۆمەڵانی پەیماندەرەوە، بۆ کات و جێگای کۆبوونەوە، بەپەنهانی ودزیەوە دەردەچوون، یەك یەك و، دوو دوو.

ج- کات وجێگای کۆبوونەوە دەور درا بەئەو پەڕی نهێنی، بەشێوەیك تەنها عەبباس پێی زانی کەلەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاتبوو، بۆ ئەوەی دڵنیابێت لەمەسەلەکە،[٢] بەڵام ئەو دوای موسڵمانان نەیاندەزانی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد، دەنگیان بەرز نەکەنەوەو، قسە درێژ نەکەنەوە، نەکوکەسێك گوێی پێیانەوە بێت، یان هەست بەجموجوڵیان بکات .[٣]

د- بەدواداچوونی شاردنەوەو نهێنی، کاتێك شەیتان مەسەلەی بەیعەتەکەی ئاشکرا کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن بگەڕێنەوە بۆ ناو شوێنەکانی خۆیان، پەلەیشی نەکرد لەڕووبەڕوو بوونەوەی سەربازی، کەهێشتا کاتی نەهاتووە، ئەوکاتەی قوڕەیشیش هاتن بۆ دڵنیا بوون لەو هەواڵە، موسڵمانان سەریان لێ تێکدان بەبێ دەنگییان، یان بەبەشداریکردن بەقسەیەك کەباسەکە لەبیر بباتەوە .[٤]

هـ- هەڵبژاردنی شەوی کۆتایی لەشەوانی حەج، کەشەوی سیانزەی زیلحیجەیە، نزیك ئەو کاتەی حاجیان دەگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان لەڕۆژی دواییدا، کە کات ئەوەندە نامێنێتەوە بەدەست قوڕەیشەوە کەڕەخنە بگرن یان کۆسپوتەگەرە دروست بکەن، کە ئەوەش کارێکی چاوەڕوان کراوەو[٥] هەرواش بوو.

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٦١ .
٢- هەمان سەرچاوە ٦٢ .
٣- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٦٢ .
٤- هەمان سەرچاوە ٦٥ .
٥- هەمان سەرچاوە ٦٧ .

٤- پێنج بڕگەکەی پەیمانەکە زۆر ڕوون وئاشکرابوو، گوێڕایەڵی لەچالاکی و لاوازیدا و، خەرجکردنی ماڵ لەتوانین ودەستکورتیداو، فەرمانکردن بەچاکەو، قەدەغە کردنی خراپەو، کارکردن بۆ خوا بێ هیچ ترسێك لەلۆمەکردن .. هەروەها پشتگیرو پارێزگاریکردنی پێغەمبەر ﷺ کاتێك دێتە مەدینە .[1]

٥- بەرائی کوڕی مەعرور_ سەرکردەی ئەنصار_ یەکسەر ڕازی بوو و، ووتی: سوێند بەو کەسەی تۆی ڕەوانە کردووە، وەکو منداڵ وخێزانەکانمان بەرگریت لێدەکەین و، باسی توانای خۆیانی کرد لەشەڕکردندا، ئەمە سەرکردەکە بوو پێشنیاری تواناکانی دەکردە سەر پێغەمبەر ﷺ .[2] ئەوەی شایەنی باسە بوەترێت دەربارەی بەرائی کوڕی مەعرور ئەوەیە کاتێك لەگەڵ خەڵکەکە هات پێی ووتن: من بۆچوونێکم هەیە نازانم لەسەری ڕازی دەبن یان نە؟ ووتیان: چی بۆ چوونێك؟ ووتی: من حەز ناکەم لەنوێژدا پشت لەکەعبە بکەم، بەڵکو پێم خۆشە ڕووی لێ بکەم، ووتیان: ئەوەی بیستومانە پێغەمبەر ﷺ هەر ڕوو لەشام دەکات _واتە بەیتولمەقدیس_ ئێمەیش حەز ناکەین لەقسەی دەرچین، کەکاتی نوێژ دەهات ئەوان ڕوویان دەکردە بەیتولمەقدیس و ئەو ڕووی دەرکردە کەعبە، هەر بەوشێوەیە مانەوە تاکو گەیشتنە مەککەو، پێغەمبەر ﷺ یان ناسی لەگەڵ عەبباسی مامیدا لەناو مزگەوتەکەدا دانیشتبوون، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لەعەبباسی کرد و فەرمووی: ئەی باوکی فەزڵ ئەو دووپیاوە دەناسی؟ ووتی: بەڵێ ئەوە بەرائی کوڕی مەعروری سەرۆکی عەشیرەتەکەی خۆیەتی ئەوەش کەعبی کوڕی مالیکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەعبی شاعیر؟ ووتی: بەڵێ، ئیتر بەرائیش باسی ئەوەی بۆ کرد کەڕوویدا لەگەشتەکەدا، سەبارەت بە ڕووکردنە کەعبە لەنوێژدا، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی دەڵێت. فەرمووی: (قد كنت على قبلة لو صبرت عليها)[3] واتە: تۆ لەسەر قیبلەیەك بوویت ئەگەر ئارامت بگرتایە، کەعب ووتی: ئینجا (براء) گەڕایەوە سەر قیبلەکەی پێغەمبەر ﷺ ولەگەڵمان ڕووەو بەیتولمەقدیس نوێژی دەکرد، بەڵام لەکاتی سەرە مەرگیدا فەرمانی کرد بەکەسوکارەکەی ڕووەو کەعبەی

---

١- بڕوانە: التحالف السياسي ٨٢ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة ١/٤٤٤ .

٣- هەمان سەرچاوە ١/٤٤٥ .

بکەنەوە، لەمانگی صەفەر وەفاتی کرد پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ بەمانگێك، ڕاسپاردەشی کرد سێ یەکی ماڵەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ بێت، ئەویش قبوڵی کردو دوبارە گەڕایەوە بۆ منداڵەکانی، ئەو یەکەمین کەسیشە بەسێ یەکی ماڵەکەی ڕاسپاردەی کردووە، لەم هەواڵەدا چەند ڕاوەستانێکمان هەیە:

أ- پەیوەست بوون لەگەڵ موسڵماناندا بەڕەوشت وفەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەرپێشنیارێکیش سەرچاوەکەی هەرچییەك بێت، ناکۆك بێت لەگەڵی، ڕەتدەکرێتەوە .

ب- سەرگەورەیی بۆ هیچ کەسێك نەمایەوە جگە لەپێغەمبەر ﷺ ، ڕێزگرتنیش لەهەر مرۆڤێك ئەبێت ڕەنگدانەوە بێت بەپیوەست بوون بەفەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیش هەندێ داب ونەریتی جاهیلی لادەچوو، بۆ ئەوەی بەهای ئیمانی بێتە جێگای، ئەوانەش پێوەری ڕاستەقینەن کەدەکرێت حوکمیان پێ بدرێتە سەر خەڵکیدا لەڕووی پۆلێن کردن [١].

٦- ئەبولهەیسەم بەڕاشکاوی بەپێغەمبەر ﷺ ی ووت: کەئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ جولەکە دەبڕین، ئایا پاش سەرکەوتنت بەجێمان ناهێڵێ، پێغەمبەر ﷺ یش بەوشێوە وەڵامی دایەوە کەبینیمان، ئەو ڕەخنە گرتنەش ئاماژەدەکات بۆ ئازادییەکی زۆر، کەئیسلام دەیدا بەموسڵمانان، چونکە ئەو بەئەو پەڕی ئازادی [٢]، دەربڕینی کرد لەوەی کەلەناخیدایە، وەڵامەکەی سەروەری مرۆڤایەتیش زۆر مەزن بوو، کاتێك خۆی بەبەشێك لەئەنصارو ئەنصاری بەبەشێك لەخۆی زانی [٣].

٧- لەهەڵبژاردنی فەرماندەکاندا هەندێ پەندو وانە بەدی دەکرێن، لەوانە:

أ- پێغەمبەر ﷺ خۆی هەڵینەبژاردن، بەڵکو مەسەلەی هەڵبژاردنی بۆ خۆیان بەجێهێشت، واتە کردی بەڕاوێژ لەنێوانیاندا، بۆ ئەوەی ڕایان بهێنێ لەگەڵ ڕاوێژکردندا .

---

١- بڕوانە: معين السيرة النبوية للشامى ١٣٥ .
٢- بڕوانە: التاريخ الاسلامى للحميدى ٩٧/٣ .
٣- بڕوانە: التربية القيادية ٦٧/٢ .

ب- نوێنەرایەتی بەپێی ڕێژە لەهەلبژاردندا، ئاشکرایە کەئامادەبوان لە خەزرەج زۆرتر بوون لەئامادەبوانی ئەوس، سێ بەرانبەر زیاتر بوون لەئەوان، بۆیە ئەو فەرماندانە سێی لەئەوس بوون و، نۆی لەخەزرەج .[١]

ج- پێغەمبەر ﷺ ئەوکەسانەی کرد بەسەر پەرشتیار لەسەر بەڕێوە چوونی بانگەواز لەیەسریب، چونکە ئیسلام باری باش بوو لەوێ، زۆر کەس موسڵمانێتی خۆی ڕادەگەیاند، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ویستی ئەوەیان پێ ڕابگەیەنێت کەئەوان نامۆنین وپێویست ناکات کەسیان لەدەرەوەی خۆیان بۆ بنێرێ، بەڵکو خۆیان خاوەن ئیسلام وپارێزەرانین .[٢]

٨- سەرانی مەککە دڵنیا بوون لەڕاستی ئەو مامەڵەیەی کەپێکهات لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و ئەنصارەکان، بۆیە دەرچوون بەدوایاندا و، فریای سەعدی کوڕی عوبادەکەوتن لەئەزاخیر، هەروەها مونزیری کوڕی عەمری کەهەردوکیان لەنەقیبە هەڵبژێردراوەکان بوون، مونزیر لەدەستیان دەرچوو، بەڵام سەعدیان گرت، هەردوو دەستیان بەستە گەردەنیەوە بەپەتی بارەکەی، ئینجا بردیانەوە بۆ مەککە، بەلێدان وڕاکێشانی بەقژی،_چونکە قژی درێژ بوو_ [٣] بەڵام لەڕێگەی حاریسی کوڕی حەرب وجوبەیری کوڕی موتعیم توانی ڕزگاری بێت لەقوڕەیش، چونکە ئەو بازرگانی ئەو دوو پیاوەی دەپاراست لەلای خۆیان، لەوێشدا داب ونەریتی جاهیلی فریای کەوت نەك شمشێری موسڵمانان، هیچ سەر شۆڕییەکی لەو نەدەبینی، چونکە ئەو دەیزانی کەموسڵمانان ڕاو دەنرێن لەمەککەو توانایان نییە خۆیشیان بپارێزن .[٤]

٩- وتەی عەبباسی کوڕی عەبباد و وەڵامەکەی پێغەمبەر ﷺ ، وانەیەکی پەروەردەیەیی کاریگەرە، ئەویش بریتی یە لەوەی بەرگریکردن لەئیسلام ومامەڵەکردن لەگەڵ دوژمنانی ئەم ئایینە پەیوەست نیە بەبۆ چوونی

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابى فارس ٢٠٩ .

٢- بڕوانە: دراسات في السيرة النبوية، د.عمادالدين خليل ١٣٢ .

٣- بڕوانە: التاريخ الاسلامى للحميدى ١٠٧/٣ .

٤- بڕوانە: التربية القيادية ١١٦/٢ .

موسڵمانانەوە، بەڵکو پەیوەستە بەملکەچی بەفەرمانەکانی خوای گەورە، هەرکاتێکیش ڕێگە درا بەجیهاد کردن ئەوکاتە مەسەلەی چوونە پێشەوەو پاشەکشە کردن دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونی کوششکاران پاش ڕاوێژکردن ولێکۆڵینەوەی مەسەلەکە لەهەموو ڕوانگەیەکەوە .[1]

چەندەش لێهاتوویی نەخشەکێشانی سیاسی بەهێز تر بێت زیاتر دەبێتە مایەی سەرکەوتنی کارەکان، شاردنەوەی پلانەکانیش سەرکەوتن دەستەبەر دەکات بەپشتیوانی خوای گەورە .[2]

١-بەیعەتەکە بۆ پیاوان بەتەوقە کردن بوو لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ، سەبارەت بەو دوو ئافرەتەی کەئامادەبوون بەیعەتەکەیان بەقسە بوو، پێغەمبەرﷺ هیچ کاتێك لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەم تەوقەی نەکردووە، هیچ کەسێکیش لەو بەیعەتە دوانەکەوت تەنانەت دوو ئافرەتەکەیش، بەیعەتی جەنگیاندا، بەئەمەکیش بوون بەرانبەر ئەو بەیعەتە، نوسەیبەی کچی کەعب (ئوممو عومارە) لەجەنگی ئوحددا کەوت ودوانزە برینی پێوە بوو، لەجەنگی ئوحود لەگەڵ مێردەکەی دەرچوو بوو، ئاوی دەدایە موسڵمانان، جاکاتێك موسڵمانان تێکشکان، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مایەوەو، شەڕی دەکرد وبەشمشێر بەرگریدەکرد لەپێغەمبەرﷺ ، بەسەختی بریندار بوو، ئامادەی بەیعەتی (رضوان)یش بوو،[3] موسەیلەمەی درۆزنیش کوڕەکەی پارچە پارچە کرد، بەڵام نوسەیبە تووشی لاوازی وبێ ورەیی نەبوو[4]، هەروەها ئامادەی جەنگی یەمامەیش بوو، لەکاتی شەڕەکانی پاشگەزبوونەوەدا لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید، هەر بەردەوامیش بوو لەشەڕ کردن تاکو دەستی بڕاو دوانزە برینی پێوە بوو، سەبارەت بەئەسمائی کچی عەمر، لەبەنی سەلەمە بوو، دەگێڕنەوە دایکی موعازی کوڕی جەبەل بووە، دەشگێڕنەوە کەئامۆزای موعازی کوڕی جەبەل بووە .[5]

---

١- بڕوانە: التاریخ الاسلامی للحمیدی .

٢- بڕوانە: التحالف السیاسی فی الاسلام ٩٦ .

٣- بڕوانە: المرأة فی العهد النبوی، د. عصمة الدین کرکر ١٠٨ .

٤- بڕوانە: التحالف السیاسی ٨٧ .

٥- ابن هشام ٢/٨٠، اسد الغابة ٥/٣٩٥ ، البدایة النهایة ٣/١٥٨_١٦٦ ، الاصابة ٨/٨_رقم ٤٨،٤٩ نقلاً عن المرأة فی العهد النبوی ١٠٨ .

١١- کاتێك ژیاننامەی بەشداربووانی عەقەبەی دووەم دەخوێنینەوە، دەبینین نزیکەی سێ یەکی ئەوانە لەسەردەمی خودی پێغەمبەرﷺ و دوای ئەو شەهید بوونە، هەروەها دەبینین نزیکەی نیوەیان ئامادەی هەموو جەنگەکان بوونە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ، سی وسێ کەسیان بەتەنیشت پێغەمبەرﷺ بوونە لەهەموو غەزاکاندا، ئەوانەش کەئامادەی جەنگی بەدر بوون نزیکەی حەفتاکەس دەبوون.

بەڕاستی ئەو پشتیوانانە ڕاستیان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرﷺ ، لێیان بوو شەهید بوو، هەندێکیشیان مانەوە تاکو بەشدارییان کرد لە سەرکردایەتی کردنی دەوڵەت و، ڕووداوە مەزنەکانی دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ ، هەربەوجۆرە کەسانەیش بوو کەدەوڵەتی ئیسلام بەرپابوو، ئەو نمونانەی کەهەمیشە لەبەخشیندان وهیچ پاداشتیان ناوێ بەهەشت نەبێت، مێژوویش لەوە بچوکتر لەهەموو سەردەمەکانیدا، بتوانێت کەسانی وەکو ئەوانە لەخۆبگرێت .[١]

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٤٠ .

## باسی چوارەم: کۆچ کردن بۆ مەدینە

### یەکەم: پێشەکی وئامادەکاری بۆ کۆچکردن.

ئامادەکارییەکانی پێش کۆچ بەقـەدەری خـوای گـەورە بـەڕێوە دەچـوو، لـەدوو ئاڕاستەیشدا خۆی دەبینیەوە:

**١- ئامادەکردنی ئەوانەی کۆچدەکەن:**

کۆچکردن گەشت وسەیرانێك نـەبوو، کەسـێك بـێ تاقـەتی خـۆی پـێ دەربکـات، بەڵکو بەجێهێشتنی خاك وکەس وکارەو خزمان ودۆستان وهۆیەکانی بژێوی، لەپێناو عەقیدەدا، بۆیە ئەو کارە پێویستی هـەبوو بەکۆشـشێکی مـەزن، تـاکو موسـڵمانان گەیـشتنە ئـەو قەناعەتـەی کۆچـبکەن، ئـەویش بەکاریگـەری چـەند هۆکارێـك بـوو، لەوانە:

- پەروەردەی بیروباوەڕی پتەو کە پێشتر باسمان کرد.
- ئەو چەوساندنەوەی تووشی موسڵمانان بوو، تاکو قایل بوون بـەوەی کـەژیان بەسەر بردن لەگەڵ بێباوەڕاندا مەحاڵە .
- قورئان لەمەککە ئاماژەی تیادا بوو بەکۆچکردن وسرنج ڕاکێشان بۆ ئەوەی زەوی خوا فراوانە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ (الزمر: ١٠)

لەدوای ئەوەش سورەتی (الکهف) دابەزی، کەباسـی ئـەو کۆمەڵـە لاوانـە دەکـات کـەباوەڕیان بـەخوای گـەورە هێنـاوەو، مـاڵ وحـاڵی خۆیـان بەجێهێـشتووە بـەرەو ئەشکەوتێك، ئەوەش دیمەنێکی ئیمان گرنگ بوو بۆ هاوەڵان.

ئینجا لەپاش ئەوەش هەندێ ئایەت دابەزی بەڕاشکاوی باسی لەکۆچکردن دەکرد لەسورەتی (النحل) خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾

ﭐلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ (النحل: ٤١_٤٢)

**هەروەها لەکۆتاییەکانی ئەو سوڕەتە هەمان واتە دووپات دەبێتەوە: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ (النحل: ١١٠).**

**کۆچکردنیش بۆحەبەشە ڕاهێنانێکی کردەییبوو لەسەر بەجێهێشتنی نیشتمان و میللەت .[1]**

**٢- ئامادەکاری لەیەسریب :**

**تێبینی دەکەین کەپێغەمبەرﷺ بەپەلە ولەڕۆژەکانی سەرەتادا نەڕۆیشت بۆ یەسریب، بەڵکو زیاتر لەدوو ساڵ دواکەوت، تاکو دڵنیابوو لەبوونی بنکەیەکی فراوان لەوێ، لەهەمانکاتدا ئامادەکاری دەکرا لەیەسریب لەکەشێکی قورئانیدا لەپاش ڕۆیشتنی موصعەب بۆ ئەوێ.**

**پێغەمبەرﷺ تەواو دڵنیا بوو کەئەنصارەکان بەتەواوی ئامادەن، چونکە داوای کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ یان کرد بۆ لای خۆیان، هەروەها وتووێژەکانی عەقەبەی دووەم سوور بوونی ئەوانی دوپات دەکردەوە لەسەر بەیعەت ومتمانە بەخشین بەپێغەمبەرﷺ سەبارەت بەخۆیان، ئینجا ئەوان هەر ئەو کاتە حەزیان کرد هێرش ببەنە سەر خەڵکی مینا، لەو کەسانەی کەئەشکەنجەی پێغەمبەرﷺ یان داوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێنەدان.**

**بەم شێوە ئەوان ئامادەکران بۆ ئەوەی پێشوازی بکەن لەموسڵمانان .[2]**

## دووەم: پێشەنگی موسڵمانان.

**کاتێك ئەنصارەکان بەیعەتیان دایە پێغەمبەرﷺ لەسەر ئیسلام و بەرگریکردن لێی، بتپەرستەکان زۆر بەوە قەڵس بوون و ئەشکەنجەیان زیادی کر بۆ موسڵمانان،**

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية تربية امة وبناء دولة، صالح الشامی ١١٨ .

٢- بڕوانە: هەمان سەرچاوە ١٢٠_١٢١ .

بۆیە پێغەمبەر ڕێگای دایە موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ مەدینە، مەبەستیش لەو کۆچە پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، کەهەڵسێ بەکاروباری بانگەوازو جیهاد، بۆ ئەوەی ئایین تەنها بۆ خوا بێت [١] عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت: ((کاتێك حەفتا کەسەکە لەلای پێغەمبەرﷺ گەڕانەوە، پێخۆشحاڵ بوو، خوای گەورەیش خەڵکانێکی خاوەن ئەزموون لەجەنگ وفریاکەوتن کردبە پێشتیوانی پێغەمبەرەکەی، لەهەمان کاتدا ئازارو ئەشکەنجە ڕۆژ تابێ پتر دەبوو لەسەر موسڵمانان، بەشێوەیەك ستەمیان لێکردن کەپێشتر وایان نەکردووە، بۆیە هاوەڵان داوایان کرد پێغەمبەر ﷺ ڕیگەیان بدات کۆچ بکەن، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون: کوچگەی ئێوەم پێ پیشان دراوە، زەوییەکی شۆرەداری پڕ دارخورمایە، دەکەوێتە نێوان دوو ناوچە بەردی ڕەشیان تیادایە، ئەگەر سەراتیش دارخورمای تیا بوایە دەمووت خۆیەتی، لەپاش چەند ڕۆژێك بەخۆشحاڵی یەوە دەرچووەلای هاوەڵان و فەرمووی: ئاگادار کرامەوە لەجێگای کۆچتان، یەسریبە، هەرکەسێك دەیەوێت بابڕوات.

ئیتر ئەوانیش ڕێکدەکەوتن لەنێوان خۆیانداو بەپەنهایی دەردەچوون، یەکەم کەسیش لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە، ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد بوو، لەدوای ئەویش عامیری کوڕی ڕەبیعە لەگەڵ لەیلەی کچی ئەبی حەسمە کەیەکەم ئافرەت بوو گەیشتە مەدینە، ئینجا هاوەڵان بەدوای یەکدا گەیشتنە مەدینە، دەچوونە ماڵەکانی ئەنصار،ئەوانیش جێگایان بۆئامادەدەکردن و دڵنەواییان دەکردن، سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە پێش نوێژی موهاجیرانی دەکرد لە(قبّاء) پێش گەیشتنی پێغەمبەرﷺ ، کاتێك موسڵمان هاتن بۆ مەدینە، قوڕەیش توڕە بوون لێیان، چەند کەسێکیش لەوانەی بەیعەتیان دابووە پێغەمبەرﷺ لەدوا جاردا وگەڕابوونەوە مەدینە، کەیەکەمین موهاجیر گەیشتە مەدینە، ئەوان گەڕانەوە لای پێغەمبەرﷺ لەمەککە، تاکو دوایی لەگەڵ هاوەڵاندا گەڕانەوە بۆ مەدینە، ئەوانە موهاجیری ئەنصارین، ئەوان بریتی بوون لە: زەکوانی کوڕی عەبدولقەیس و،

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٣٣،٣٤ .

عوقبەی کوڕی وەهبی کوڕی کیلدەوە، عەبباسی کوڕی عوبادەوەو، زیادی کوڕی لەبید، ئینجا موسڵمانان هەموویان دەرچوون بۆ مەدینە، کەس لەمەککە نەمایەوە جگە لەپێغەمبەرﷺ وئەبو بەکرو عەلی، یان کەسێکی نەخۆشی لاواز کەناتوانێت کۆچ بکات .[1]

## سێیەم: جۆرەکانی دژایەتیکردنی قورەیش بۆ موهاجیرەکان.

سەرانی قورەیش هەموو هەوڵێکیان خستە گەڕ بۆ بەربەست دروستکردن لەبەردەم موسڵماناندا بۆئەوەی کۆچ نەکەن، بەچەند شێوازێك:

١- شێوازی جیاکردنەوەی پیاو لەگەڵ ژن ومناڵیدا: لەم بارەوە ئوممو سەلەمە دەگێڕێتەوە چۆن خۆی وئەبو سەلەمەی مێردی کۆچیان کردووەو دەفەرمووێت: کاتێك ئەبو سەلەمە بڕیاریدا کۆچ بکەین بۆ مەدینە، وشترەکەی خۆی ئامادەکردو و منی لەسەری سوار کرد وسەلەمەی کوڕیشم بەباوشەوە بوو، ئینجا دەریکردین و وشترەکەی ڕادەکێشا، کاتێك پیاوانێك لەبەنی موغیرە چاویان پێیان کەوت وتیان: ئەوە خۆت ئارەزوی خۆتە چی دەکەیت، بەڵام بۆچی ڕێگەبدەین ئەو ئافرەتە کەلەئێمەیە لەگەڵ خۆتی ببەیت؟

دەفەرمووێت: هاتن ڕەشمەی وشترەکەیان لەدەستی وەرگرت ومنیشیان لێی سەند.

ئیتر لەو کاتە عەشیرەتی بەنو عەبدولئەسەد وتیان: نەبەخوا کوڕی خۆمان ناهێڵین لەلای ئەو ئافرەتە بێت، مادام لەیەکیانتان کرد، دەفەرمووێت: سەلەمەی کوڕی هەریەکەو بەلایەکدا ڕایاندەکێشا تاکو باڵیان دەرکردو، بەنوعەبدولئەسەد بردیان، بەنو موغیرەیش منیان لەلای خۆیان گلدایەوەو، ئەبو سەلەمەی مێردیشم ڕۆیشت بۆ مەدینە وهەموومانیان لەیەکتر کرد.

دەفەرمووێت: هەموو بەیانیانێك دەردەچووم ولەئەبتەح دادەنیشتم وتاکو ئێوارە دەگریام نزیکەی ساڵێك ئەوە حاڵم بووە تاڕۆژێك ئامۆزایەکم لەبەنی موغیرە منی

---

١- بڕوانە: طبقات ابن سعد ٣٢٥/١ .

بینی وبەزەیی بەمندا هاتەوەو، بەبەنی موغیرەی ووت: ئایا ئەم بەستەزمانە دەرناکەن جیاتان کردووەتەوە لەمێردەکەی وکوڕەکەی؟ ئیتر پێیان ووتم: بڕۆ بۆ لای پیاوەکەت ئەگەر حەز دەکەیت، ئینجا بەنو عەبدولئەسەدیش کوڕەکەیان بۆ گێڕامەوەو، بەباوەشمەوە گرت وسواری وشتر بووم وبەتەنیا بەڕێکەوتم بۆ مەدینە، کەگەیشتمە تەنعیم، عوسمانی کوڕی تەڵحەم تووشی بوو، پێی وتم: بۆ کوێ ئەی کچی ئومەییە؟ ووتم: بۆلای مێردەکەم لەمەدینە. ووتی: کەست لەگەڵ نییە؟ ووتم: تەنها خواو، ئەم کوڕە. ووتی: سوێند بەخوا بەجێتناهێڵم. ئیتر ڕشمەی وشترەکەی گرت وڕایدەکێشا، سوێند بەخوا لە نێو عەرەبان کەسم نەبینیوە لەئەو بەخشندەتر، کەدەگەیشتینە جێگایەك وشترەکەی دادەنیشانم وخۆی دوور دەکەوتەوە پاش ئەوەی دەیبەستەدارێکەوە خۆیشی لەژێر سێبەری دارێکی تر ڕادەکشا، کەکاتی ڕۆیشتن دەهات ووشترەکەی هەڵدەساندمەوەو خۆی دوادەخست ودەیوت سواربە، کەسواردەبووم دیسان ڕەشمەکەی دەگرت وڕایدەکێشا تاکو دەگەیشتینە شوێنێکی تر، تاکو گەیشتینە مەدینە، کەچاوی کەوتە لادێکەی عەمری کوڕی عەوف لە(قبّاء)، ووتی: مێردەکەت لەو لادێیەیەو، خۆی گەڕایەوە بۆ مەککە. دوای ئەوە دەیفەرموو: سوێند بەخوا هیچماڵێك وەکو ماڵی ئەبو سەلەمەی پێ نەهات و، هیچ کەسێکیشم نەدی لەعوسمانی کوڕی تەڵحە بەخشندەو چاکتر [1].

ئەمە نموونەیەك بوو، تێبینی دەکەین کاتێك موسڵمان بیروباوەڕ لەدڵیدا جێگیربێت، هیچ شتێك ناخاتە پێشی تەنانەت جگەر گۆشەکەشی، یان خێزانەکەی، بۆیە ئەبو سەلەمە ڕەزای خوای لێبێت ڕۆیشت بۆ مەدینە وئاوڕی لەهیچ نەدایەوە، ئەو شێوازەش لەدژایەتی بێ بەرهەم بوو لەگەڵ ئەبو سەلەمە [2].

ئاوهایە شوێنەواری بیروباوەڕ، ئەوە خێزانێکە پەرتەوازە بووە، ئافرەتێکیشە دەگرێت، منداڵێکیشە باڵی دەرچووەو لەدایك وباوکی جیاکراوەتەوە، ئایا کوفرو سەرانی کوفر دەبێ چییان دەست کەوێت لەو جۆرە کەسانە؟

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ٢٠٢/١، ٢٠٣ .

٢- بڕوانە: في السيرة النبوية، د.ابراهيم علي محمد ١٣٠، ١٣١ دابەشکردنی شێوازەکان لەم کتێبە وەرگیراوەو، دیمەنە مەزنەکانیش لە الهجرة النبوية المباركة وەرگیراوە .

کردەوەی عوسمانی کوڕی تەڵحەیش ڕەزای خوای لێبێت، ئەو لەو ڕۆژەدا بێ باوەڕ بوو، (لەدوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو) سەرەڕای ئەوەش ئومموسەلەمە شایەتی چاکەی بۆ دەدا، ئەوەیش ئاماژەیەکی ڕاستە لەسەر پاکی ڕەسەنایەتیو تەواوی جوامێری وپارێزگاریکردن بۆ بێ دەسەڵات [١] غیرەتی ڕیگەی نەدا ئافرەتێك ببینێ بەتەنها خۆی بێت لەو بیابانە ڕێ بکات، بالەسەر ئایینی خۆیشی نەبێت، بەڵام بۆ خوا ئەی میللەتی موسڵمان تەماشای ئەو ڕەوشتەو، ڕەوشتی شارستانی سەدەی بیستەم بکە، چۆن هێرش دەکرێتە سەر ئازادییەکانداو، دەستدرێژی دەکرێتە سەر ئابڕو وناموسدا، لەڕۆژی ڕوناکدا، ئینجا تەماشاکەن هۆکارەکانی ڕاگەیاندن چیمان پێ پیشان دەدەن لەفێرکردنی هەموو جۆرو شێوازەکانی خراپە.

ئەم بەسەر هاتە شایەتی دەدات کەعەرەب خاوەنی ڕەوشت وئاکاری بەرزبوونە وبۆیە خوای گەورە پێغەمبەری لەنێو ئەواندا هەڵبژاردووە، بەڕاستی هەر ئەوانیش شایستە بوون کەئەو بارە هەڵبگرن ورایگەیەنن بەهەموو خەڵکی [٢].

هەروەها چاودێری کردنی خوای گەورە بۆ دۆستانی بەجوانی بەدیدەکرێت، چونکە هەر خوای گەورە بوو کەدڵی عوسمانی نەرم کرد بۆ بەزەیی هاتنەوەی بەئومموسەلەمەداو، کات وەهەوڵی بۆی خستە گەڕ [٣]، هەروەها سروشت پاکی عوسمان دەردەکەوێت، کەدواتر هێنای بۆلای ئیسلام لەپاش صولحی حودەیبیە، لەوانەشە هەر لەو ساتەوە دڵی روناك بوبێتەوە [٤].

**٢- شێوازی ڕفاندن:**

سەرانی مەککە بەڕێگرتن لەموسڵمانان ڕانەوەستان، بەڵکو هەولیشیان دەدا لەمەدینەیش بیانگێڕنەوە. ئەم هەوڵانەیشیان سەربگرێت و توانیان یەکێك لەموهاجیران لەمەدینە بگێڕنەوە بۆ مەککە [٥]، سەبارەت بە ئەم شێوازە عومەر

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ١٢٤ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية في ضوء القران والسنة، د.محمد ابو شهبة ٤٦١/١ .

٣- التاريخ الاسلامی للحميدی ١٢٨/٣ .

٤- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ٢٠٤/١ .

٥- بڕوانە: في السيرة النبوية ١٣٢ .

ڕەزای خوای لێبێت بۆمانی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: کاتێك ویستمان هیجرەت بکەین، من وعەییاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعەو، هیشامی کوڕی عاصی کوڕی وائیلی سەهمی بەڵێن یەکتر ببینین لەلای دارەکانی بەنی غیفار لەنزیك مەککە لەلای یەکێك لەدۆڵەکانی و، ووتمان: هەریەك لەئێمە دواکەوت دوانەکەی تر دەڕۆن و چاوەڕێی ناکەن.

دەفەرموێت: من وعەییاش لەجێگای دیاریکراو یەکترمان بینی بەڵام هیشام نەهات ولەخشتە برا .[1]

کاتێك هاتینە مەدینە چووینە لای خێڵی بەنی عەمری کوڕی عەوف لە(قبّاء)، ئەبو جەهلی کوڕی هیشام وحاریسی کوڕی هیشام هاتن بۆ لای عەییاش، کەئامۆزایان بوو، برایشیان بوو لەدایکیانەوە، ئەو کاتە هێشتا پێغەمبەرﷺ لەمەککە بوو، بەعەییاشیان ووت: دایکت نەزری کردەوە سەری نەشۆرێت ولەبەر خۆر دابنیشێ تاکو دەتبینێ، ئەویش بەزەیی بەدایکیدا هاتەوەو، پێم ووت: ئەی عەییاش، سوێند بەخوا ئەوان دەیانەوێت لەئایینەکەت هەڵتگێڕنەوە، وریایان بە، سوێند بەخوا دایکت ئەسپێ ئازاری بدات سەری خۆی پاك دەکاتەوە، ئەگەر گەرمایشی ببێت دەچێتە بەر سێبەر .

ووتی: سوێندی دایکم ناشکێنم، هەندێك پارەیشم لەوێیە دەیگێڕمەوە.

فەرمووی: پێم ووت: بەخوا تۆ دەزانیت کەمن یەکێکم لەدەوڵەمەندەکانی قورەیش، نیوەی ماڵی خۆمت پێدەدەم ولەگەڵیان مەڕۆ، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو ووتی: هەردەبێت بڕۆم، ووتم: کەهەر سووری لەسەر ڕۆیشتن، وشترەکەی من ببە وشترێکی چاك وخێرایە، سواری ببە، ئەگەر گومانت لێیان کرد خۆت ڕزگار بکە، لەڕێگا ئەبو جەهل ووتی: ئەی برا، وشترەکەم خاوبۆتەوەولەڕێکردندا، ڕێگام دەدەی هەندێك سواری وشترەکەت بم؟ ووتی: بەڵێ، ئیتر ئەوانیش دایان بەزەویداو بەپەتێك عەییاشیان بەستەوەو بردیانەوە بۆ مەککەو لەخشتەیان برد .[2]

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ١٢٩ .

٢- السيرة النبوية الصحيحة ١/٢٠٥ .

دەفەرموێت: ئێمە دەمانووت: هەرکەسێك پاشگەزببێتەوە جارێکی تر خوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ ناکات، خۆیشیان هەروایان دەزانی، بەڵام کاتێك پێغەمبەرﷺ هاتە مەدینە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ (الزمر: ٥٣_٥٥).

عومەر دەفەرموێت: منیش ئەو ئایەتەم لەلاپەڕەیەکدا نووسی وناردم بۆ هیشامی کوڕی عاص، ئەویش دەڵێت: کاتێك پێم گەیشت لەدۆڵێك لەدۆڵەکانی مەککە، هەر دەم هێناو دەمبردو لێی حاڵی نەدەبووم، ئەی خوایە حاڵیم بکە لێی، دەڵێت: ئیتر خوای گەورە خستیە دڵم کەبۆئێمەومانان دابەزیوە، دەڵێت: منیش گەڕامەوە لای حوشترەکەم وفریای پێغەمبەرﷺ کەوتم لەمەدینە .[١]

ئەم ڕوداوە بۆمان دەردەخات چۆن عومەر ڕەزای خوای لێبێت پیلانی کۆچکردنی ئامادە کردووە، بۆ خۆی وهاوڕێکانی، کەهەریەکێکیان لەهۆزێك بوون، جێگای یەکتربینینیان دوور بوو لەمەککەوە، لەسەر ڕێگەی مەدینە، بەشێوەیەك ئەگەر کەسێکیان دواکەوتن لەکاتی خۆیان، دووانەکەی تر بڕۆن .[٢]

بەڵام قوڕەیش هەر سوور بوون لەسەر بەدواداچوونیان وبەفرۆفێڵ توانیان عەییاش بگێڕنەوە، بەسەر هاتەکە هەستی بەرزی ئاسایشی لەلای عومەر دەردەخات ڕەزای خوای لێبێت، چونکە فیراسەتەکەی تەواو دەرچوو سەبارەت بەڕفاندنی عەییاش .[٣]

---

١– بڕوانە: المجمع للهيثمي ٦/٦١ وقال: رواه البزار ورجاله ثقات، الهجرة النبوية المباركة ١٣١ .

٢– بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٥٩ .

٣– بڕوانە: في السيرة النبوية ١٣٤ .

هەروەها ئاستی بەرزی برایەتی ئاشکرا دەکات کەئیسلام لەدڵەکاندا دروستی کرد، عومەر ڕەزای خوای لێبێت ئامادەبوو نیوەی ماڵەکەی ببەخشێت لەپێناو سەلامەتی براکەیداو، لەترسی ئەوەی بتپەرستەکان پاشگەزی نەکەنەوە لەئیسلام، بەڵام سۆزی دایك زاڵ بووە سەر عەییاشدا، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەی داو، دەرونی ڕێگەینەداپارەی عومەر وەربگرێت لەکاتێکدا خۆی ماڵی هەیە لەمەککە، وەکو چۆن بەبەرچاوی عومەرەوە بێت کەئەگەر بگەڕێتەوە مەککە لەخشتە دەبرێت، کاتێکیش بێ ئومێد بوو لەقایلکردنی وشترەکەی خۆی پێداو، ئەوەی عومەر پێشبینی کرد ڕوویدا لەگەڵ عەییاشدا.[١]

کاتێکیش ئەوە بڵاو بوویەوە کەخوای گەڕانەوە وچاکەی ئەو جۆرە کەسانە وەرناگیرێت ئەم ئایەتە دابەزی ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾ (الزمر: ٥٣) .عومەریش ڕەزای خوای لێبێت بەپەلە ئایەتەکانی نووسی وناردی بۆیان، چی دڵسۆزی ومەزنیەکە بەلای عومەرەوە ڕەزای خوای لێبێت ....[٢]

**٣- شێوازی زیندانی کردن :**

قورەیش پەنای بردە بەر زیندانی کردن، وەکو شێوازێك بۆ قەدەغەکردنی کۆچکردن، هەرکەسێك بیویستبا کۆچ بکاتودەستیان بکەوتبا زیندانیان دەکرد لەیەکێك لەماڵەکانیاندا، دەستو پێیشیان دەخستە کۆتەوەو پاسەوانیەکی توندیان لەسەری دادەنا، بۆ ئەوەی نەتوانێت هەڵبێت، جاری واش بوو دەخرانە نێو خانووی سەرنەگیراو[٣]، وەکو ئەوەی ڕوویدا لەگەڵ عەییاش وهیشام، بۆ ئەوەی گەرمای زۆر بیانگرێتەوە، وێڕای ئەوەی کەزیندانی کراون.

سەرکردایەتی قورەیش لەم کارەی دوو ئامانجی لەبەر چاو گرتبوو: یەکەمیان/ قەدەغەکردنی کۆچکردن لەسەریان، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو بەندیخانەیە ببێتە

---

١- بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٦٠ .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٦٠ .

٣- بڕوانە: في السيرة النبوية ١٣٢ .

ئامۆژگارییەك بۆ هەر کەسێك بیەوێت کۆچ بکات لەوانەی کەهاتونەتەوە لەمەککە، بەڵام ئەم شێوازەش هەر بێ سوودبوو چونکە هەندێکیان هەر دەیانتوانی دەربچن بگەنە مەدینە، وەکو عەییاش وهیشام ڕەزای خوایان لێبێت [١]، پێغەمبەرﷺ لەپاش کۆچکردنی بۆ مەدینە قونوتی دەخوێندو دەپاڕایەوە بۆ ئەو موسڵمانە چەوساوانەی مەککە، ناوی هەندێکیشیانی دەبرد بەتایبەت، لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت هاتووە، کەپێغەمبەرﷺ کەهەڵدەسایەوە بۆ ڕکاتی کۆتایی دەیفەرموو: ((اللهم اخ عياش بن ابى ربيعه، اللهم اخ سلمة بن هشام، اللهم اخ الوليد بن الوليد، اللهم اخ المستضعفين من المؤمنين، اللهم اشد وطأتك على مضر، اللهم اجعلها سنين كسنين يوسف)) [٢] واتە: پێغەمبەرﷺ ناوی ئەو کەسانەی دەبرد ودەپاڕایەوە خوای گەورە ئەوان و هەموو چەوساوەکانی باوەڕداران ڕزگار بکات، دوعایشی دەکرد لەدژی ئەشکەنجە دەرانیان لەبتپەرستان .

موسڵمانان ڕفاندنی عەییاشیان پشت گوێ نەخست، بەڵکو پێغەمبەرﷺ کەسێکی نارد بۆ مەککە، بەپێی پلانێکی نەخشە بۆ کێشراو توانی ئەو دوو هاوەڵە ڕزگار بکات . [٣]

**٤- شێوازی ڕوتکردنەوە لەماڵ:**

صوهەیبی کوڕی سینانی نەمری، لەهۆزی نەمری کوڕی قاسیط بوو، ڕۆمەکان هێرشیان هێنا بوویە سەریان وئەویش هەر بەمناڵی بەکۆیلەیی برابوو، فێری زمانی ئەوانیش بوو بوو، سەردەمانێکی زۆر هەر لە کۆیلایەتیدا بوو، تاکو عەبدوڵڵای کوڕی جودعان کڕی وئازادی کرد، خۆی وعەممار لەیەك ڕۆژدا موسڵمان بوو. [٤]

کۆچکردنی صوهەیب کارێك بوو، ئینجا تیادا بەدیدەکرا، چونکە هەرچی هەبوو لەپێناوی خوای گەورە وپێغەمبەر کردی بەقوربانی وخۆی گەیاندە کاروانی

١- هەمان سەرچاوە ١٣٢ .

٢- البخاری، ٢/٣٣ رقم ١٠٠٦ .

٣- بڕوانە: في السيرة النبوية ١٣٥ .

٤- الهجرة النبوية المباركة ١١٩ .

یەکتاپەرستی وباوەڕ [١]، ئەبو عوسمانی نوهـەدی ڕەحمـەتی خـوای لێبێت دەڵێت: هەواڵمان پێگەیشتووە کەکاتێك صوهەیب ویستی کـۆچ بکـات بـۆ مەدینـە، خـەڵکی مەککە پێیان ووت: هاتیتە لامان بەرسوایی وهەژاری، دەوڵەمەند بوویت وگەیشتیتە ئەم ئاستە، ئنجا دەتـەوێت خـۆت ومالـت رزگارتـان ببێـت؟ سـوێند بـەخوا شـتی وا نابێت، ووتی: ئەگەر ماڵەکەم بەجێبهێڵم بۆتان ڕێگەم دەدەن بڕۆم؟ ووتیان: بـەڵێ، ئەویش هەرچی ماڵی هەیە بەجێی هێشت، ئەم هەواڵە کاتێك گەیـشتە پێغەمبـەرﷺ فەرمووی: ((ربح صهیب، ربح صهیب)) [٢] واتە: صـوهەیب قـازانجی کـرد، صـوهەیب قازانجی کرد، هەروەها عیکریمە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە: کاتێـك صـوهەیب دەرچـوو کـۆچ بکـات، خـەڵکی مەککـە شـوێنی کـەوتن، ئـەویش هـەموو تیرەکـانی دەرهێنا، چل تیری پێ بوو، ووتی: پێم ناگەن تاکو یەکەو تیرێکتان تـێ نەهاوێشم، دوایـیش ئاسـاییە بەلامـەوە بکـوژرێم، ئێـوە دەزانـن مـن پیـاوم، لەمەککـەیش دوو کەنیزەکم [٣] بەجێهێشتووە بیانبەن بـۆ خۆتـان، عیکریمـە دەڵێـت: ئـیتر ئـەم ئایەتـە دابەزییە سـەر پێغەمبـەرﷺ ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ (البقرة: ٢٠٧) کاتێك پێغەمبـەر(ﷺ) صـوهەیبی بینـی فـەرمووی ئـەی ابـا یحیـی فرۆشـتنەکەت قـازانجی کـرد و، ئینجـا ئایەتەکـەی بـۆ خوێندەوە. [٤]

صـوهەیب بەڵگـەی سـەلمێنراوی پێـشکەش کـرد لەسـەر بـێ ئـەقڵی ئـەو جـۆرە کەسانە، کەڕوداوو جموجوڵەکانی مێژوو بەتەرازووی مـاددە دەکێـشن، کەواتـە کـوا ئەو ماڵەی کەصوهەیب لەکۆچەکەیدا دەستی دەکەوێت؟ ئایا چاوەڕوانی ئـەوە بـوو موحەممـەدﷺ پلـەو پایەیـەکی بـداتێ لـەبری ئـەو ماڵانـەی لەدەسـتی دەرچـوون، صوهەیب ئەوەی تەنها لـەپێناو ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە کـرد، بـۆ ئـەوەی ببێتـە

---

١- هەمان سەرچاوە ١٢٠ .

٢- بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام ٤٧٧/١ .

٣- اخرجه الحاکم ٣٩٨/٣ وقال: صحیح علی شرط مسلم، وسکت عنه الذهبی .

٤- اخرجه الحاکم ٣٩٨/٣ وقال: صحیح علی شرط مسلم، ولم یخرجاه.

نموونە بۆ لاوانی موسڵمان لەفیداکاریدا، بەڵکو ئەوانیش هەمان ڕێگا بگرنەبەر [١].

ئەم هەڵوێستە ناوازانە هەموو شتێك نەبوون لەو کۆچە پیرۆزەدا، بەڵکو ئەو ڕوداوە مەزنە پڕ بوو لەچەندین دیمەنی شکۆدارو، یەکلابوونەوەو، فیداکاری تر، کەوانە گەلێکی کاریگەر دەبەخشنە موسڵمانان لەسەروەری و سەربەرزیدا [٢].

## چوارەم: ماڵە لەئامێزگرەکان وکاریگەری لەسەر دڵەکان.

لەدەرئەنجامەکانی باوەڕهێنان وبەیعەتدانی ئەنصارەکان ئەوە بوو، پێغەمبەرﷺ هەڵسا بەبانگهێشتکردنی موسڵمانان بۆ کۆچکردنی بۆ مەدینە، هەروەها دروستبوونی هاوبەر پرسیارێتی لەنێوان موسڵمانان دا، بۆیە دەرگای ماڵەکانی ئەنصارو دڵەکانیان کرایەوە بۆ برا موهاجیرەکانیان و، هەموویان ئامادەبوون بۆ لەئامێزگرتنیان و، دابەشکردنی ماڵ و خواردن وهەموو شتێك لەگەڵیاندا... ئەمەیش ناوی هەندێ لەو ماڵانەیە:

١- ماڵی موبەششیری کوڕی عەبدولمونزیری کوڕی زەنبەر لە قوبا: کۆمەڵێك لەئافرەتان وپیاوانی موهاجیرانی لەخۆگرت لەوانە عومەری کوڕی خەتتاب وهەندێ لەخێزانەکەی وخزمانی وحەفصەی کچی ومێردەکەی وعەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە.

٢- ماڵی خوبەیبی کوڕی ئیسافی سەربە بەنی حاریسی کوڕی خەزرەج لە سونوح [٣]، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ودایکی و صوهەیبی کوڕی سینانی تیابوون.

٣- ماڵی ئەسعەدی کوڕی زورارە لەبەنی نەججار، دەگێڕنەوە: حەمزە چووتە ناوی.

٤- ماڵی سەعدی کوڕی خەیسەمە لەبەنی نەججار، بەماڵی ڕەبەنەکان دەناسرا، چونکە بێ ژن ومناڵەکانی موهاجیرانی تیا نیشتەجێبوون.

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة، د. عبدالرحمن ١٢١.

٢- هەمان سەرچاوە ١١٩.

٣- بڕوانە: المرأة في العهد النبوي ١١٦.

٥- مالّی عەبدوڵلای کوڕی سەلەمەی بەلعەجانی لە قوبا: عوبەیدەی کوڕی حاریس وسوفەیلەی دایکی ومیستەحی کوڕی ئەساسە وتوفەیلی کوڕی حاریس و، تولەیبی کوڕی عومەیرو، حوصەینی کوڕی حاریس، هەموو ئەوانە تیا نیشتەجێ بوون.

٦- مالّی بەنی جەحجەبا، کەخاوەنەکەی مونزیری کوڕی موحەممەدی کوڕی عوقبە بوون، ئەوانەی کەچوونە ناوی زوبەیری کوڕی عەووام و، ئەسمائی کچی ئەبو بەکری خێزانی و، ئەبو سەبرەی کوڕی ئەبی ڕوهم و ئومو کولسومی خێزانی.[1]

٧- مالّی بەنی عەبدولئەشهەل، کەخاوەنەکەی سەعدی کوڕی موعازی کوڕی نوعمان بوو لەبەنی عەبدولئەشهەل، موصعەبی کوڕی عومەیرو حەمنەی کچی جەحشی خێزانی تیا نیشتەجێ بوون.

٨- مالّی بەنی نەجار، خاوەنەکەیشی ئەوسی کوڕی سابیتی کوڕی مونزیر، عوسمانی کوڕی عەففان و ڕوقەییەی خێزانی تیا نیشتەجێ بوون.[2]

ئەم مالّ بەشکردن وهاوبەر پرسیارێتی یە سەرەکی ترین ئەو هۆکارانەبوون کە پێشەکییەکی دروست کرد بۆ مانەوەی پێغەمبەرﷺ و، هاوەڵە کۆچکردووەکانی بەشێوەیەکی ئاسوودە لەنێوانیاندا.[3]

برایەتی وپێکەوە گونجان دروست بوو لەنێوان موهاجیرو ئەنصارەکاندا، لەڕێگەی بیروباوەڕی پتەوو، ڕاستی لەمامەڵەکردن، لەوانەشە کەسێك پرسیار بکات ئایا بۆچی سەرچاوە مێژووییەکان باسی هیچ دەمەقاڵەو مشت ومڕێکیان نەکردووە لەنێوان ئەو مالاّنەدا، تەنانەت لەنێو ژنانیشدا کەبەوە دەناسرێن. ئەوە ئایینی ڕاستەقینەیە کەخواناسی دەکاتە بنچینەی هەڵسوکەوتی هەموو کەسێك، ڕەوشتی بەرزیشە کەبرایەتی نێو موسڵمانان وپشتگیریکردنی بانگەواز دەسەپێنێ، ئەوە کاریگەری بەیعەت وڕاستگۆیی وکارکردن لەپێناو کۆمەڵدا، لەترسی سزاو،

---

١- هەمان سەرچاوە ١١٧.

٢- بڕوانە: السيرة النبوية ضوء القران والسنة لابی شهبة ١/٤٦٨،٤٦٩.

٣- بڕوانە: المرأة في العهد النبوی ١١٨.

چاوەڕوانی پاداشتەوە، هەموو کەسێك موسڵمان بووە هەڵدەستێ بەئەنجامدانی ئەوەی لەسەرێتی، بەدڵسۆزی لەئاشکراو نهێنی دا، لەبەر ئەوەی ئیماندار بوون، هەموان لەپێناو بەرژەوەندی گشتی دا کاریان دەکرد، تەنانەت کەسی وابوو دەترسا کەئەنصارییەکان بەهەموو پاداشتەکانەوە بڕۆن .[١]

لایەنی بەخشندەیی ئاشکرایە وپێویستمان بەوە هەیە هەمیشە باسی بکەین، ئێمە لەڕۆژگاری ئەمڕۆداو، لەڕێزی ئیسلامیدا، لەگەشتێکی چەند ڕۆژیدا دەرونەکان ئاشکرا دەبن و، کەموکورتیەکان دەردەکەون، بەڵام ئەوە کۆمەڵگایەکە هێشتا لە قۆناغی دروستکردندایە وجارێ پێغەمبەرﷺ نەگەیشتووەتە ناوی، سەرەڕای ئەوەش دەرگایماڵەکان لەسەر پشتە بۆ هاتووەکان، نەك لەسەر ئاستی تاك، بەڵکو لەسەر ئاستی کۆمەڵ، موهاجیرەکان چەندین مانگ لەماڵی ئەنصارەکان مانەوە، پێکەوە دەژیان، ماڵیان بۆ خەرج دەکردن وخزمەتیان دەکردن، بەڵام موهاجیرەکانیش هەرپێشەنگ بوون بۆ ئەوان چونکە ئەوان بێ ماڵ وسامان نەبوون، بەڵکو هەموویان بەجێهێشتبوو لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە، ئەوان بەوشێوە بوون کە قورئان ستایشی دەکردن: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ﴾ (الحشر: ٨).

ئەم کۆمەڵگا تازەیە لەسەر واتاکانی بیروباوەڕو خواناسین پەروەردە دەبوو، کەهێشتا پێغەریشﷺ نەگەشتبوو، بەڵام لەژێر چاودێری نەقیبەکانیان کەئەوان وەکو حەوارییەکانی عیسا بوون، هەروەها لەژێر چاودێری سەرانی موهاجیرو ئەنصارەکان، کەهەموویان لەسەرچاوەی سازگاری پێغەمبەرایەتی وەریاندەگرت .[٢]

دەمارگیریش بەجارێ لەم کۆمەڵگایە توایەوە، ئەوەی پێشەوایەتی نوێژی دەکرد، سالیم بوو کەمەولای ئەبو حوزەیفە بوو ڕەزای خوای لێبێت، لەبەر ئەوەی لەهەموویان قورئانی زۆرتر لەبەر بوو، ڕێزو تەقدیری زۆر بۆ هەڵگری قورئانە،

---

١- بڕوانە: المرأة في العهد النبوي ١٣٢ .

٢- بڕوانە: المرأة في العهد النبوي ١٣٢ .

هەرخۆیشی سبەینێ هەڵگری ئاڵای شەڕیشە، ئەو جیاوازییەنییەلە نێوانیاندا وەکو ئەمڕۆ دەیبینین، لەنێوان موجاهیدو ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە، هەڵگری ئاڵای موهاجیران لەشەڕی یەمامە سالیمی مەولای ئەبو حوزەیفەیە، دەیفەرموو: خراپترین قورئان خوێنم ئەگەر هەڵبێم، دەستی ڕاستی بڕا لەو شەڕەدا، ئاڵاکەی بەدەستی چەپی گرت، ئەویش هەر بڕا، ئینجا باوشی پیاکرد تاکو شەهید بوو لەپێناوی خوای گەورەدا[١].

هەروەها ئازادی بانگەواز بۆلای خوا بەئاشکراو، یەکێك بوو لەهێماکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، چونکە گومانی تێدا نەما کەزۆربەی سەرانی یەسریب هاتوونەتە ئایینی ئیسلامەوە، گەنجان وئافرەتان وپیاوان هەموویان چالاك بوونەوە بۆ بانگەواز کردن بۆلای خواو، مژدەدان بەهاتنی پێغەمبەرﷺ.

پێویستە بەراوردیش بکەین لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵگایەی لەحەبەشەو، لەیەسریب بەرپابوون، حەبەشە مۆرکی پەناهەندەیی پێوە دیاربوو، زیاتر لەوەی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی تەواو بێت، ڕاستە موسڵمانان ئازادی خواپەرستنیان هەبوو، بەڵام لەکۆمەڵگای نەصرانی دابڕابوون وکاریگەرییان نەبوو لەسەری هەرچەند خۆی لەخۆیدا پلەیەك لەسەرووی کۆمەڵگای مەککەوە بوو، بۆیە بە بیستنی هەواڵی کۆچکردن بۆ مەدینە، هەموویان گەڕانەوە، ئەوانە نەبێت سەرکردایەتی داوای مانەوەی لێکردن بمێننەوە لەحەبەشە, گەشەکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی هەرلەو ساتەوە دەستی پێکرد کەدوانزە هاوەڵەکە گەڕانەوە لەبەیعەتی یەکەم، کەبەسەرۆکایەتی ئەسعەدی کوڕی زورارە بوو، تەنها لێپرسراوێتی بانگەوازی هەڵگرت، نەکو سیاسی، بەگەڕانەوەی حەفتا کەسەکەیش گەیشتە ئەو پەڕی فراوانبوونەوەو بونیاتنان، بڕیاریشیاندا کەشارەکەیان ببێتە یەکەمین پایتەخت بۆ ئیسلام لەسەر زەویدا، ئامادەیش بوون کەبەرەنگاری هەموو دوژمنێکی دەرەکی بکەن، کەبیەوێت دەستدرێژی بکاتە سەر سەروەریاندا پێش گەیشتنی پێغەمبەرﷺ.

---

١- التربية القيادية ٢/١٧٤،١٧٥ .

ئەو بنە كۆڵەكەی پێغەمبەرﷺ كات وتواناى بۆ خەرجكرد بۆ پەروەردەكردنى، باشتر بەروبوومى دەركەوت لەپاش يەككگرتن لەگەڵ كۆمەڵگاى مەدەنى نوێ، هەردوولا لەواتاكانى بيروباوەڕو برايەتى توانەوە.

پێغەمبەرﷺ موسڵمانانى ئامادە دەكرد بۆ يەكخستنى تواناكانيان وپێكهێنانى بنكەو بنچينەيەكى قايم، ئەو كۆمەڵگايەش كەدەوڵەتى ئيسلامى لەسەر دابمەزرێت بەرپانەبوو دواى بەيعەتدانى جەنگ نەبێت، واتە ئەو كۆمەڵگايە پێكنەهات تاكو هێزى پێويست نەبوو بۆ پارێزگاريكردن.[١]

بەم شێوەيش كۆمەڵى موسڵمانانى بەهێز گوێزرايەوە بۆ مەدينەو، يەكيانگرت لەگەڵ ئەنصارەكانداو، لەدايك بوونى دەوڵەتى ئيسلامى ڕاگەيەندرا، كەدواتر شارستانيەكى دروست كرد هاو وێنەى لەمێژوودا نييە .

## پێنجەم: بۆچى مەدينە وەكو پايتەخت هەڵبژێردرا.

نهێنى زۆر هەيە لەو هەڵبژاردنەدا_جگە لەياداشت دانەوەى خەڵكەكەى_ تەنها خواى گەورە خۆى دەيزانێ، ئينجا مەدينە ناوچەيەكى سروشتى جەنگى قايمە، لەلاى خۆرئاواوە ناوچەيەى پڕ لەبەردى وەبرە دەيگرێتەوەو، لەلاى ڕۆژ هەڵاتيشەوە ناوچەى بەرداوى واقم دەيگرێتەوە، لاى باكوور تاكە جێگابوو كە كراوە بوو، ئەويش پێغەمبەرﷺ قايمى كرد بەدروستكردنى كەندڕەكە لەساڵى پێنجى كۆچى لەغەزاى ئەحزابدا، ئەو لاكەى تريش بەدار خورماو درەختى چڕ بەرى گيرابوو، سوپا لێيەوە ڕەتنەدەبوو لەجێگايەكى تەنگەوە نەبێت .

هێزێكى كەم بەس بوو بۆ تێكدانى سيستمى سەربازى وڕێگە لێگرتنيان لە پێشكەوتن، ئيبنو ئيسحاق دەڵێت: لايەكى مەدينە سەخت بوو، لايەكانى تريش پڕ لەخانووبەرەو دارخورما بوو، دوژمن نەيدەتوانى لێيەوە تێپەڕێت.[٢]

---

١– بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٤٦،١٤٧ .

٢– بڕوانە: السيرة النبوية للندوى .

پێغەمبەرﷺ ئاماژەی کرد بۆ ئەم لایەنە کاتێك فەرمووی: من جێگای کۆچتانم پێ پێشاندراوە، ناوچەیەکی پڕ لەدارخورما لەنێوان دوو ناوچەی بەرداوی [١].

خەڵکی مەدینە لەئەوس وخەزرەج بەغیرەت ودلێرو سوارچاك بوون، ئازاد بوون بەسەر شۆڕی ڕازی نەدەبوون، هەرگیز سەرانەیان بەهیچ لایەنێك نەداوە، ئیبنو خەلدون دەڵێت: ئەم دووهۆزە خاوەن دەسەڵات بوون بەسەر یەسریبدا، بەشانازی و بەهێز دەناسران، هەندێ لەهۆزەکانی موزەریش هەر سەر بەئەوان بوون.

بەنو عەدی کوڕی نەججاریش خاڵوانی پێغەمبەر بوونﷺ، دایکی عەبدولموتتەلیبیش یەکێك بوو لەوان، یەکێ لەوانەش ئەبو ئەییوبی ئەنصاری بوو کەپێغەمبەرﷺ چووە ماڵی ئەوان لەمەدینە.

ئەوس و خەزرەجیش لەقەحتان بوون، ئەوانەیش کەزووتر لەمەککەو دەوروبەری موسڵمان بوون لەعەدنان بوون، کە پێغەمبەرﷺ یش کۆچی کرد بۆ مەدینە، عەدنان و قەحتان یەکیان گرت لەژێر ئاڵای ئیسلامدا، ئەوان پێشتر ناکۆکی هەبوو لەنێواندا، بەڵام شەیتان هیچ ڕێگەیەکی نەما بۆ تێکدانیان بەبەهانەی قەحتانی و عەدنانی، بۆیە مەدینە چاکترین جێگایەك بوو بۆ کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی بۆ ئەوەی بەهێزبوونی ئیسلام دەستەبەر بێت [٢].

**١- خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە وپاڕانەوەی بۆی :**

پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە پاڕاوەتەوەو فەرموویەتی: ((اللهم حبب الینا المدینة کحبنا مکة او اشد)) [٣] واتە: خوایە گیان مەدینەمان لاخۆشەویست بکە وەکو مەککەو زیاتر. ئەنەسیش ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەرﷺ کاتێك لەگەشتێك دەگەڕایەوە وڕێگەکانی مەدینەی بەرچاودەکەوت، پەلەی دەکرد لەوشترەکەی بۆ ئەوەی زوو بگات.

---

١- بڕوانە: الهجرة النبویة المبارکة ٥٢.
٢- بڕوانە: الاساس في السنة ١/٣٣٣.
٣- بڕوانە: الهجرة النبویة المبارکة ١٥٧.

**٢- پاڕانەوەی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە کەدوو بەرانبەر مەککە پیرۆزتربێت:**

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە: خەڵکی کەسەرەتای بەروبوومیان دەبینی، دەیانهێنا بۆ پێغەمبەرﷺ ، ئەویش وەریدەگرت ودەپاڕایەوە لەخوا: خوایە گیان بەروبووم وبەرهەممان زۆر بکەیت، شارەکەمان پڕ لەپیرۆزی و چاکە بکەیت، خوایە بەرەکەت بخەیتە پێوانەکانمانەوە، خوایە گیان ئیبراهیم بەندەو خۆشەویستی تۆ بوو، منیش بەندەو پێغەمبەری تۆم، ئەو نزای کرد لەلات بۆ مەککە، منیش دەپاڕێمەوە لێت بۆ مەدینە بەوەی ئیبراهیم داوای لێکردی بۆ مەککەو، ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا، فەرمووی: ئینجا مالیکی بانگ دەکرد وئەو بەرهەمەی پێدەدا .[1]

**٣- پارێزراوی مەدینە لەدەجال وتاعون بەهۆی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ :**

خوای گەورە فریشتەی بۆ تەرخان کردووە دەیپارێزن، بۆیە دەجال هیچ ڕێگەیەکی نییە بۆ مەدینە، هەروەها پێغەمبەرﷺ پاڕاوەتەوە بۆیان لەشیان ساغ بێت دووربن لەپەتاو نەخۆشی خراپ .[2]

**٤- چاکەی ئەو کەسەی کە ئارام دەگرێت لەسەر تەنگانەی مەدینە:**

پێغەمبەری خواﷺ بەڵێنی بەو کەسانە داوە کەشەفاعەتیان بۆ بکات لەڕۆژی قیامەتدا [3]، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس دەگێڕێتەوەو، دەفەرمووێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((المدينة خير لهم لوكانوا يعلمون،.......))[4] واتە: مەدینە چاکترە بۆ ئەوان ئەگەر بیانزانیبا، کەس مەدینە بەجێناهێڵێ کە پشتی لێ هەڵبکات، تاکو خوای گەورە لەئەو چاکتری بۆ نەهێنێ، کەسیش نییە لەسەر تەنگانەو زەبرو زەنگی مەدینە ئارام بگرێت، تاکو من نەبمە شەفاعەتکاری یان شایەت بۆی لەڕۆژی قیامەتدا .

---

١- مسلم، كتاب الحج، باب فضل المدينه ٢/١٠٠٠ ورقمه ٤٧٢_١٣٧٣ .

٢- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ١٥٨ .

٣- هەمان سەرچاوە ١٦٠ .

٤- مسلم، كتاب الحج، باب فضل المدينة ٢/٩٩٢ رقم ١٣٦٣ .

**٥- فەزڵی مردن لەمەدینە:**

ئیبنو عومەر دەگێڕێتەوە ڕەزای خوای لێبێت، کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((من استطاع إن یموت بالمدینة فلیمت، فانی اشفع لمن یموت بها))[١] واتە: ئەگەر کەسێك لەئێوە بتوانی لەمەدینە بمرێت، باشترە، چونکە من شەفاعەت دەکەم بۆ هەرکەسێك لەمەدینە بمرێت. عومەری کوڕی خەتتابیش ڕەزای خوای لێبێت دەپاڕایەوە، دەیفەرموو: خوایە گیان شەهیدیم پێ ببەخشە لەپێناوتدا، مەرگیشم بخەرە شاری پێغەمبەرەکەت.[٢]

خوای گەورەیش نزاکەی فاروقی وەرگرت ولەمیحرابی پێغەمبەرﷺ شەهید بوو، لەکاتێکدا پێش نوێژی موسڵمانانی دەکرد لەنوێژی بەیانیدا.

**٦- پەناى ئیمانەوە، پیسی لەخۆی دوور دەخاتەوە:**

ئیمان هەر دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، خراپەکارانیش جێگەیان نابێتەوە تیایدا، هەرکەسێکیش بەمەدینە ڕازی نەبێت ولێی دەربچێت خوای گەورە لەو کەسە باشتری بۆ دەهێنی لەئیماندارانی ڕاستەقینە،[٣] ئەبو هورەیرە دەگێڕیتەوە لەپێغەمبەرﷺ کەفەرموویەتی: ((ان الایمان لیأرز الی المدینة کما تأرز الحیة الی حجرها)).[٤]

واتە: ئیمان خۆی کۆدەکاتەوە لەمەدینەدا، وەکو چۆن مارخۆی کۆدەکاتەوە لەکونەکەیدا.....هەروەها فەرموویەتی:.....مەدینە پیسی لەخۆی دووردەخاتەوە، ڕۆژی قیامەت نایەت تاکو مەدینە هەموو پیاو خراپانی دەرنەهێنێت، وەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لادەبات.[٥]

---

١- اخرجه احمد ٢/٧٤،١٠٤ ولفظه برقم ٥٨١٨ باسناد صحیح، وصححه ابن حبان رقم ٣٧٤١.

٢- البخاری، کتاب فضائل المدینة ٤/١٠ رقم ١٨٩٠.

٣- بروانە: الهجرة النبویة المبارکة ١٦١.

٤- البخاری، کتاب فضائل المدینة ٤/٩٣ رقم ١٨٧٦.

٥- مسلم، کتاب الحج، باب المدینة تنفی شرارها ٢/١٠٠٥ رقم ١٣٨١.

**٧- گوناه وتاوان لادەبات .**

زەیدی کوڕی سابیت ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((انها طيبة تنفي الذنوب، كما تنفي النار خبث الفضة)) [١] واتە: ئەوە تەیبەیە، گوناه لادەبات، وەکو چۆن ئاگر پیسی زیو لادەبات .

**٨- پاراستنی خوای گەورە بۆ مەدینە لەهەموو کەسێك کەنیازی خراپی هەبێت بەرانبەری؛**

خوای گەورە پارێزگاری بۆی دەستە بەر کردووە بەرانبەر هەموو کەسێك نیازی خراپەی هەبێت بەرانبەری، پێغەمبەری خوایشﷺ هەڕەشەی کردووە لەهەر کەسێك کارێکی خراپی تیادا ئەنجام بدات، یان داڵدەی تاوانبارێکی تیادا بدا، یان خەڵکەکەی بترسێنی، هەڕەشەی لەوانە داوە بەنەفرین وسزاو، لەناو بردنی بەپەلە. [٢]

لەسەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە ڕەزای خوای لێبێت، کەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((لايكيد اهل المدينة احد الا انماع كما ينماع الملح في الماء)) [٣] واتە: هەرکەسێك پیلان بگێڕێت بۆ خەڵکی مەدینە، دەتوێتەوە وەکو خوێ چۆن دەتوێتەوە لەناو ئاودا .

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((المدينة حرم، فمن احدث فيها حدثاً اوآوى محدثاً، فعليه لعنة الله، والملائكة، والناس اجمعين، لايقبل منه يوم القيامة عدل ولاصرف )) [٤] واتە: مەدینە قەدەغەکراوە، هەرکەسێك تاوانێك یان کارێکی خراپی تیادا ئەنجام بدات، یان پەنای خراپەکارێك بدات، ئەوە لەعنەتی خواو، فریشتەکان وەهەموو خەڵکی لەسەر بێت، خوای گەورەیش لەڕۆژی قیامەتدا هیچ چاکەو دادگەرییەکی لێ وەرناگرێت .

---

١- البخاري، كتاب المغازي، باب غزوة احمد ٣٥٦/٧ رقم ٤٠٥٠ .

٢- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ١٦٢ .

٣- البخاري، كتاب فضائل المدينة، باب اثم من كاد اهل المدينة .

٤- مسلم، كتاب الحج، باب فضل المدينة ٩٩٩/٢ رقم ١٣٧١ .

**٩- قەدەغەکردنی :**

پێغەمبەرﷺ لەڕێگەی وەحیەوە قەدەغەی کردبوو کەخوێنی تیادا بڕێژرێت وچەکی تیا هەڵبگیردرێت، یان هیچ کەسێکی تیادا بتوقێنرێت، یان دارو درەختی تیاببڕدرێت، یان شتی ونبووی تیا هەڵبگیردرێت، مەگەر کەسێك ئاشکرای بکات، لەگەڵ چەندین شتی ترو، پێغەمبەرﷺدەفەرموێت : ئیبراهیم مەککەی قەدەغەکرد ودوعای بۆ کرد، منیش مەدینەم قەدەغەکرد و، لەخوای گەورەیش پاڕاومەتەوە کەبەرەکەت بخاتە پێوەرەکانیان وەکو چۆن ئیبراهیم بۆ مەککە پاڕایەوە[١] .

ئەم هەموو فەزڵ وچاکێتی یە، وای لەهاوەڵان کرد کەببەستێن بەمەدینەوەو، سووربن لەسەر کۆچکردن بۆی ومانەوە تیایدا، بەم شێوەیش هەرچی تواناکانی ئوممەت هەیە لەوێ کۆببێتەوەو بەئاڕاستەی لەناو بردنی بتپەرستی وبێباوەڕی بەرێ بکەون، ڕۆژهەلات وڕۆژئاوایش فەتح بکەن .

---

١- البخاري، كتاب البيوع، باب بركة الصاع النبي ومده ٣٤٦/٤ رقم ٢١٢٩ .

# بەشی شەشەم

# کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر رضي الله عنه

## باسی یەکەم: تێکشکانی پلانی بتپەرستان بۆ تیرۆرکردنی پێغەمبەرﷺ.

پاش ئەوەی قورەیش دۆڕان لەڕێگرتن لەکۆچکردنی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت وێڕای هەموو شێوازە ناشیرینەکان، بەڵام قورەیش هەستیان کرد بەمەترسی هەڵوێستەکە و، دەترسان لەهەڵوێستە ئابوری وقەبارە کۆمەڵایەتییەکەیان لە نێوان هۆزەکانی عەرەبدا، بۆیە سەرانیان لە(دار الندوة) کۆبوونەوە، بۆ ڕاوێژکردن دەربارەی لەناوبردنی پێغەمبەری ئیسلام، ئیبنو عەبباس لەلێکدانەوەی بۆ ئەم ئایەتە: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴾ (الانفال: ٣٠) دەفەرموێت: قورەیش لەنێو خۆیاندا پرس وڕایان کرد ووتیان: سبەی بیگرن وبیبەسنەوە، مەبەستیان پێغەمبەر بووﷺ ، هەندێکیان ووتیان: بەڵکو بیکوژن، هەندێکیشیان ووتیان: وەدەری بنەن، خوای گەورەیش پێغەمبەرەکەی ئاگادارکردەوە وئەو شەوە عەلی لەسەر جێگای پێغەمبەرﷺ خەوت،[1] وپێغەمبەرﷺ یش دەرچوو، کاتێک عەلی یان بینی ووتیان کوا هاوڕێکەت؟ ووتی: نازانم، ئیتر ئەوانیش بەدوایان کەوتن وکاتێک گەیشتنە شاخەکە، ڕێگەیان لێ تێکچوو، ئینجا سەرکەوتن وبەلای ئەشکەوتەکەدا تێپەڕین و بینیان جاڵجاڵوکە هێلانەی کردووە لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا، ووتیان: ئەگەر لەژورەوە بووایەن جاڵجاڵوکە هێلانەی نەدەکرد لێرەدا، پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر ڕەزای خوایان لێبێت سێ ڕۆژ لەئەشکەوتەکەدا مانەوە .

---

١- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة الجوانب الحذر والحماية ١٣٥ .

مامۆستا سەیید قوتب ڕەحمەتی خوای لێبێت دەربارەی ئەم ئایەتە فەرموویەتی: کەئەوە وەبیرخستنەوەیەك بوو بەوەی کەلە مەککە بوو پێش ئەوەی بارودۆخ بگۆڕێت، ئاگاداریيەکیش لەسەر ویست وفەرمانی خوای گەورە، موسڵمانان جیاوازی نێوان ئەو دوو حاڵەیان دەزانی، دواتریش نەك خوای گەورە هەر رزگاریکردن لەدەستیان، بەڵکو سەریشی خستنە سەریان، ئەوان هەوڵیان دەدا پێغەمبەرﷺ بەند بکەن یان بیکوژن، یان دەریبکەن لەمەککە، لەپاش کۆبوونەوەشیان چەند لاوێکیان هەلبژارد لەهەموو هۆزەکان بۆ کوشتنی بۆ ئەوەی خوێنی وونبێت لەنێو هۆزەکانداو، بەنو هاشمیش توانای جەنگ کردنیان نییە دژبە هەموو عەرەب .

دیمەنێکی سەیرە، لەهەمان کاتدا ترسناکیشە، ئەو ئادەمیزادە لاوازە بێ دەسەڵاتانە لەکوێ ودەسەڵاتی خوا لەکوێ؟ ئەو دەسەڵاتەی کەزاڵ دەبێتە سەر هەموو شتێکدا .[١]

## دووەم: ڕێکخستنی پێغەمبەرﷺ بۆ کۆچکردن.

عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە: ڕۆژ نەبوو پێغەمبەرﷺ یەك جار نەیەتە ماڵ ئەبو بەکر، یان بەسبەینان، یان بەئێواران، بەڵام ئەو ڕۆژەی کەخوای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی پێدا، لەگەرمای نیوەڕۆدا هات، کەئەو لەڕۆژەکانی تر لەو کاتە نەدەهات، کاتێك ئەبوبەکر پێغەمبەرﷺ بینی، ووتی: ئەگەر لەبەر ڕوداوێك نەبێت پێغەمبەرﷺ لەم کاتەدا نەدەهات .

عائیشە دەڵێت: ئەبو بەکر جێگاکەی خۆی بۆ چۆڵ کردو پێغەمبەرﷺ دانیشت، کەسیش لەوێ نەبوو من وئەسمائی خوشکم نەبێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باکەس لێرە نەمێنێ، ئەویش ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تەنها دوو کچەکەمە، چی بووە، باوك ودایکم بکەم بەقوربانت! فەرمووی: ((إنه قد اذن لي في الخروج والهجرة)) واتە: ڕێگەم دراوە بۆ درچوون وکۆچکردن، ئەبو بەکر ووتی: کەواتە مەبەستت

---

١- بڕوانە: في ظلال القرآن ٣/١٥٠١ .

هاوڕێتیمە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. عائیشە دەڵێت: سوێند بەخوا نەمزانیوە پێش ئەو ڕۆژە کەسێك لەخۆشیدا بگریێت، تاکو ئەبوبەکرم بینی لەو ڕۆژەدا، ئینجا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دوو وشتری بارهەڵگری بەهێزم ئامادە کردووە بۆ ئەم ڕۆژە، ئیتر عەبدوڵلای کوڕی ئورەیقیت کەپیاوێك بوو لەبەنی دەیلی کوڕی بەکر یان بەکرێ گرت وەکو چاوساغ، هەردوو وشترەکەشی لابوو بەخێویانی دەکرد بۆ کاتی دیاریکراوە .[1]

عائیشە دەڵێت: بەپەلەترین شێوە ئامادەکاریمان بۆیان ئەنجامدا، خواردەمەنیمان بۆ کردنە ناو کیسەیەك ونەسمائی خوشکم پارچەیەکی لەپشتوێنەکەی خۆی بڕی ودەمی کیسەکەی پێبەست، هەربۆیە ناونرا (ذات النطاقین)، ئینجا پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر ڕۆیشتن بۆ ئەشکەوتەکەی کێوی سەورو خۆیان شاردەوە سێ ڕۆژ لەوێبوون، عەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکریش لایان دەمایەوە، لاوێکی ژیرو گوێڕایەڵ بوو، پارشێوان بەجێیانی دەهێشتوبەرەبەیان دەگەڕایەوە ناو مەککە وەکوئەوەی شەو لە مەککە بوو بێت، ئیتر هەر قسەو باسێك لەدژی ئەوان بکرایە وەریدەگرت وشەو پێیانی دەگەیاند، عامیری کوڕی فوهەیرەیش کەمەولای ئەبو بەکر بوو لەنزیکیان هەندێ مەڕی دەلەوەڕاند لەشیرەکەی بۆ دەبردن، لەهەرسێ ئەو شەوانە وای لەگەڵ دەکردن، ئینجا پێغەمبەرﷺ پیاوێکی بەکرێ گرت لەبەنی عەبدی کوڕی عەدی_وەکو چاوساغ_ کەمتمانەیان پێی بوو سەرەڕای ئەوەش کەلەسەر ئایینی قورەیش بوو، کەدڵنیابوون لێی هەردوو وشترەکەیان پێداوبەڵێنیان دوای سێ ڕۆژ یەکتر ببینن لەلای ئەشکەوتی سەور عامیری کوڕی فوهیرەو ڕێپیشاندەرەکەیش لەگەڵیان ڕۆیشتن ورێگەی کەنارەکانی (السّواحل) پێگرتن .[2]

---

١- السيرة النبوية لابن كثير ٢/٢٣٣_٢٣٤ .

٢- البخاري، كتاب مناقب، باب هجرة النبي رقم ٣٩٠٥ .

## سێیەم: دەرچوونی پێغەمبەرﷺ و گەیشتنی بەئەشکەوتەکە.

کەس بەدەرچوونی پێغەمبەرﷺ ی نەزانی تەنها عەلی وئەبو بەکرو خێزانی نەبێت سەبارەت بەعلی، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد بمێنێتەوە تاکو ئەو ئەسپەردانەی لەلای پێغەمبەرﷺ بوون بیانگێڕێتەوە لەجیاتی پێغەمبەرﷺ ، چونکە هەرکەسێك لەمەککە شتێکی هەبوایە لێی بترسایە لەلای پێغەمبەرﷺ دایدەنا، بەهۆی ناوبانگی پێغەمبەرﷺ بەڕاستگۆیی ودەست پاکی، لەوکاتەی کەلەنێوان پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر دەستنیشان کرابوو، هەردوکیان لەپەنچەرەیەکی پشتی ماڵ ئەبو بەکرەوە دەرچوون، بۆ ئەوەی قوڕەیش پێیان نەزانن وکۆسپ دروست نەکەن لەپێش ئەو گەشتە پێرۆزەدا، کاتیشیان دیاری کرد لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی ئورەیقیت یەکبگرن پاش سێ شەو لەئەشکەوتی سەور .[١]

## چوارەم: دڵ ناسکی پێغەمبەرﷺ لەکاتی دەرچوونی لەمەککە.

پێغەمبەرﷺ لەکاتی دەرچوونیدا لەلای بازاڕی مەککەدا لەحەزوەر ڕاوەستاو فەرمووی: ((والله انك لخير ارض الله واحبّ ارض الله الى الله، ولولا انى اُخرجت منك ماخرجت))[٢]

واتە: سوێند بەخوا چاکترین وخۆشەویسترین خاکی خوای بەلای خواوە، ئەگەربێت ودەریشنەکرابام دەرنەدەچووم لێت، دوای ئەوە ئیتر کەوتنە ڕێ و خوای گەورە لەزەبرو زەنگی بتپەرستان پاراستنی .

پێشەوا ئەحمەد لەئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە: بتپەرستەکان شوێن پێی پێغەمبەرﷺ یان هەڵگرت وگەیشتنە ئەشکەوتەکە وهێلانەی جاڵجاڵۆکەیان لەدەرگاکەی بینی...[٣] ئەوەیش لەسەربازەکانی خوا بوون کەناهەقەکانی پێ ڕسوا دەکات، سەربازەکانی خوا جۆراو جۆرن وبەگەورەییش نین، چونکە جاری واهەیە

---

١- خاتم النبيين لابي زهرة ١/٦٥٩ ، السيرة النبوية لابن كثير ٢/٢٣٤ .

٢- الترمذي: كتاب المناقب، باب فضل مكه ٥/٧٢٢ وصححه الالباني صحيح سنن الترمذي .

٣- مسند الامام احمد ١/٣٤٨ ،ورقمه ٣٢٥١ وقال محققوه اسناده ضعيف...، وقال: ابن كثير في تاريخه ٢/٢٣٩ وهذا اسناد حسن! وهو من اجود ماروى في قصة نسج العنكبوت في الغار.

میکرۆبێك کەچاو نایبینێت سوپایەکی بەهێز دەبەزێنێ: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ (المدثر: ٣١).

سەربازەکانی خوای گەورە لەتەواو بوون نایەن، هیچ توانایەکیش نییە بتوانێت سەر ژمێریان بکات یان ژمارەو چۆنیتیان بەتەواوی بزانێت .

## پێنچەم: چاودێرکردنی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرﷺ.

سەرەڕای هەموو ئەو دوور بینیانەی کەپێغەمبەرﷺ ئەنجامی دا، بەڵام بەتەواوی پشتی پێیان نەبێت، بەڵکو متمانەو دڵنیایی ڕەهای بەخوای گەورە بوو، هەمیشە بەو شێوەی کەخوای گەورە فێری کردبوو هەردوعای دەکرد: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴾(الاسراء: ٨٠) .

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پاڕانەوەیەك هەیە خوای گەورە فێری پێغەمبەرەکەی دەکردو، بۆ ئەوەی ئوممەتەکەشی لێیەوە فێربن، چۆن ڕوو بکەنە خوا، پاڕانەوەی ئەوەی خوای گەورە ڕاستگۆیی ببەخشێت پێیان لەسەرەتاو کۆتاییدا ولەنێوان ئەو دوانەشدا، ڕاستگۆیش لێرەدا بایەخی خۆی هەیە، چونکە بتپەرستان هەوڵیان دەدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لەخشتەی ببەن... خاوەن بانگەواز تواناووزە لەکەس وەرناگرێت جگە لەخوای مەزن نەبێت، هەر لەو ڕێگەشەوە شکۆدار دەبێت، هەرگیز نابێت خۆی بداتە پاڵ پادشایەك یان خاوەن دەسەڵاتێك بۆ ئەوەی سەریبخات)) لەوانەیە بانگەواز دڵی خاوەن دەسەڵات داگیر بکات، بەڵام ئەگەر خۆی سەرباز بێت بۆ خاوەن دەسەڵاتەکان بەهیچ شێوەیەك سەرکەوتوو نابێت...[١]

کاتێك بتپەرستان لەدەرگای ئەشکەوتەکە ڕاوەستان وبەچاو دەیانبینن، پێغەمبەرﷺ دڵنەوایی ئەبو بەکری کرد ڕەزای خوای لێبێت کەخوایان لەگەڵدایە، ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت: بەپێغەمبەرم ووتﷺ کاتێك

---

١– بڕوانە: في ظلال القرآن ٤/٢٢٤٧ .

لەئەشکەوتەکە بووین: ئەگەر یەکێك لەوان سەیری لای پێی خۆی بکات دەمانبینێ، فەرمووی: ((ما ظنك يا ابابكر باثنين الله ثالثهما)) [١] واتە: گومانت چۆنە ئەی ئەبو بەکر بەدوو کەس سێ یەمیان خوا بێت، لەڕیوایەتێکی تر هاتووە ((اسكت يا ابابكر، اثنان الله ثالثها)) واتە: بێ دەنگ بەئەی ئەبو بەکر دوو کەس وسێ یەمیان خوایە.

خوای گەورەیش ئەم ڕووداوەی تۆمار کردووە لەقورئاندا ودەفەرمووێت: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبه: ٤٠).

## شەشەم: ڕەشماڵی ئوممومەعبەد لەڕێگای کۆچدا.

لەپاش سێ شەو مانەوە لەئەشکەوتدا، پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت لەئەشکەوتەکە دەرچوون، پاش ئەوەی بتپەرستان بێ ئومێد بووم لە گەیشتن بەپێغەمبەرﷺ ، ئەو کابرای کەبەکرێ گرتبوویان لەکاتی خوێدا ئامادە بوو، لەڕێگەیەکی تایبەتەوە بردنی بۆ ئەوەی مەسەلەکەیان ئاشکرا نەبێت، [٢]

لە ڕێگا بەلای ئوممو مەعبەددا تێپەڕین لەجێگەیەك پێی دەوترێت قودەید [٣]، لەلای ماڵەکانی خوزاعە، بەسەر هاتەکەیشی لەلایەن مێژوو نووسەکانەوە باسکراوە، (ابن كثير) دەڵێت: بەسەرهاتەکەی بەناوبانگەو لەچەندین ڕێگەوە پێمان گەیشتووە کەیەکتر بەهێز دەکەنەوە [٤]، لەخالیدی کوڕی خونەیسی خوزاعیەوە ڕەزای خوای

---

١- البخاري، كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب المهاجرين ٣٦٥٣ .

٢- بڕوانە: المستفاد من قصص القران ٢/١٠١ .

٣- جێگایەکە هەشت کیلومەتر دوورە لەمەککەوە .

٤- البداية والنهاية ٣/١٨٨ .

لێبێت، کەهاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە هاتووە، فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەمەککە دەرچوو بەرەو مەدینە، لەگەڵ ئەبو بەکرو عامیرو عەبدوڵڵا، بەلای دوو رەشماڵەکەی ئوممو مەعبەددا تێپەڕین، کەئافرەتێکی بەتەمەن وهۆشمەند بوو، دانیشتبوو هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆکانی بوو، ئینجا نان وئاوی پێشکەش کردن، لەدوای ئەوە داوای گۆشت وخورمایان لێکرد بۆ ئەوەی لێی بکڕن، بەلام هیچی لانەبوو، چونکە ئەوان ئازوقەیان نەمابوو، لەساڵێکی گرانیشدا بوون، پێغەمبەر ﷺ تەماشای مەڕێکی کرد لەلای ڕەشماڵەکەوە، وتی ئەو مەڕە چی یە ئەی ئوممو مەعبەد؟ وتی: ماندوێتی دوای خستووە لەوەی لەگەڵ ڕان بڕوات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا شیری هەیە؟ وتی: ئەوەندە لاوازە شیری نییە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((اتأذنين ان احلبها)) واتە: ڕێگەم دەدەیت بیدۆشم؟ وتی: بەڵێ باوك ودایکم بەقوربانت بێت، بەڵێ ئەگەر شیر لەگوانیدا هەیە بیدۆشە .

ئینجا پێغەمبەرﷺ دەستی هێنا بەگوانیداو ناوی خوای هێنا، دوعای کرد بۆ ئەو مەڕە، مەڕەکە قاچەکانی لەیەکتر دوور خستەوەو گوانەکانی پڕ لەشیر بوون، پێغەمبەرﷺ داوای قاپێکی کرد ئەوەندە گەورەبێت هەموویان لێی بخۆن، ئیتر شیرێکی زۆری لێدۆشی تاکو قاپە گەورەکە پڕبوو، دوایی ئوممو مەعبەد لێی خوارد تاکو تێر بوو، لەپاش هەموویان ئینجا پێغەمبەرﷺ لێی خوارد وئەوانی تریش چەند جارێکیتر لێیان خواردو، جارێکی تر بۆی پڕکردەوەو، بۆی بەجێ هێشت و بەیعەتیشی لێ وەرگرت زۆری پێ نەچوو تاکو ئەبو مەعبەد بەبزنە لاوازەکانیانەوە گەڕایەوە پێش نیوەڕۆ، کاتێك ئەبو مەعبەد ئەو شیرەی بینی سەری سوڕما وتی: ئەو شیرەت لەکوێ وەهێنا، لەکاتێکدا ئەو مەڕە تەنها شەو دەگەڕێتەوە ماڵ وئاوسیش نییە؟ وتی: پیلوێکی پیرۆز بەلاماندا تێپەڕ بوو، وتی: وەسفی بکە بۆم، وتی: جوانییەکی ئاشکرای هەبوو، ڕوومەتی گەش بوو، ڕەوشتی جوان بوو، لاواز نەبوو، گلێنەی چاوی زۆر ڕەش بوو لەناو سپیەتیدا، برژانەکانی درێژ بوون، دەنگیشی تیژنەبوو، گەردەن درێژ بوو، ڕیش پڕبوو، برۆکانی باریك ودرێژ بوو، برۆکانی بەدەم یەکەوە بوون، کەبێ دەنگ دەبێت شکۆدارە، کەگفتوگۆیش دەکات

سەری بەرز دەکاتەوەو دەگەشێتەوە لەدوورەوەو، لەنزیکەوە تاکو بڵێیٚ جوانە، قسەخۆش وقسە زانە، قسەکانی دەڵێی دەنکە مرواریە ڕێکخراون، نەکورتە ونەباڵا بەرزە نەئەوەندە درێژە دیار بێت، نەئەوەندەش کورتە چاوی سەیرکەر پڕنەکات، چڵێکە لەنێو دووچڵداو لەهەموشیان جوانترە، هاوەڵی هەیە دەوریان داوە، کەقسەدەکات گوێ ی بۆ دەگرن، کەفەرمانیش دەکات بەپەلە جێ بەجێی دەکەن، خزمەتکراوەو خەڵکی بەدەورایە، نەمۆن ونە نەزانە.

ئەبو مەعبەد ووتی: سوێند بەخوا، ئەوە ئەو کەسەیە کەدەڵێن لەقورەیش سەریهەڵداوە، من دەم ویست ببم بەهاوەڵی، ئەگەریش بۆم بلوێ هەر وادەکەم.

## حەوتەم: ڕاونانی سوراقەی کوڕی مالیك بۆ پێغەمبەر ﷺ.

قورەیش ڕایانگەیاند لەناو هەموو مەککەدا، کەهەرکەسێك پێغەمبەرﷺ ئامادەبکات، بەزیندووی یان بەمردوویی، سەد وشتری پێدەدەرێت، ئەم هەواڵە لەلای عەرەبە بیابان نشینەکانی دەوروبەری مەککەیش بڵاوبوویەوە، سوراقەی کوڕی مالیك تەماعی بوو ئەو پاداشتە بەدەست بهێنی، بۆیە هەوڵی زۆری دا بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام خوای گەورە بەدەسەڵاتی بێ سنوری خۆی، وایکرد سوراقەی ببێتە کەسێك بەرگری بکات لەپێغەمبەر ﷺ نەك دەستگیری بکات.

ئیبنو شیهاب دەڵێت: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مالیکی مودلەجی، کەبرازای سوراقەی کوڕی مالیکە بۆی گێڕامەتەوە کەباوکی بۆ گێڕاوەتەوە، گوێی لەسوراقە بووە وتوویەتی: بێباوەڕانی قورەیش هاتنە لامان ووتیان خوێنبایی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر بۆ کەسێك بیانکوژێت یان بەدیل بیانگرێت ئەوەندەیە، زۆری نەبرد، دانیشتبووم لەکۆڕی عەشیرەتەکەمدا، پیاوێك هات، ووتی: ئەی سوراقە، من تارماییەکم بینی لە ڕۆخی دەریا وابزانم موحەممەدو هاوەڵەکانیەتی، سوراقە دەڵێت: زانیم ئەوانن، بەڵام پێم ووت: نەخێر ئەوانە ئەوان نین، بەڵکو تۆ فلان و فلانت بینیوە، بە بەرچاوی ئێمەوە بەڕێکەوتن، کەمێك لەناو کۆڕەکە مامەوە و دوایی دەرچووم و، فەرمانم کرد بەکچەکەم، ئەسپەکەم دەربکات ولەپشت

بەرزاییەکەوە بۆم ئامادە بکات، منیش ڕمەکەم هەڵگرت وپێی دەرچووم لەپشتی ماڵەوە وئاسنی خوارەوەیم بەزەویدا ڕاکێشا، ڕمەکەم ڕوو لەخوار کرد تاگەیشتمە ئەسپەکەم وسواری بووم، کەپێیان گەیشتم پێی ئەسپەکەم هەڵکەوت ولەسەری کەوتمە خوارێ، هەڵسام دەستم برد بۆ تیردانەکەم ئەزلامەکانم [1] تیایدا دەرکرد، تیرێکم ڕاکێشا ئایا زیانیان پێ بگەیەنم یان نە، ئەوەم بۆ دەرچوو کەحەز ناکەم، دووبارە سواری ئەسپەکەم بووم وبەقسەی ئەزلامەکانم نەکرد، ئینجا نزیك بوومەوە لەپێغەمبەر ﷺ و ئاوڕی لێم نەدایەوە، بەڵام ئەبو بەکر هەر ئاوڕی دەدایەوە، لەپڕ هەردوو دەستی ئەسپەکەم هەتا ئەژنۆی چوو بەزەویدا ولەسەری کەوتم، تێم خوڕی وهەڵسامەوە لەگەڵ دەستی دەرکرد وهەڵسایەوە، لەشوێنەواری دەستەکانیەوە دوکەڵێکم بینی چووە ئاسماندا، دووبارە ئەزلامەکانم ڕاکێشاو ئەوە دەرچووکە حەزی لێناکەم، ئیتر منیش بانگم لێکردن وداوای ئاشتیم لێکردن، ئەوانیش وەستان ومنیش سواری ئەسپەکەم بووم تاپێیان گەیشتم، بەدڵمدا هات دوای ئەوەی کەبینیم کەخوای گەورە ئەم پێغەمبەرە سەردەخات، بۆیە پێم ووت: میللەتەکەت خوێنباییان لەسەرت داناوە، باسی ئەوەشم بۆ کرد کەخەڵکی بەدوایانەوەن، توێیشوو کەلوپەلیشم بۆ پێشنیار کردن بەڵام لێیان وەرنەگرتم وداوای هیچیان لێم نەکرد، تەنها ووتی: ئەم مەسەلە باس مەکە، بەڵام من داوام لێکرد نوسراوێکم بۆ بنوسێ کەکەس زیانم پێ نەگەیەنێ، ئەویش فەرمانی کرد، عامیری کوڕی فوهەیرە لەسەر پارچەیەکی پێست شتێکم بۆ بنوسێ، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێ کەوت.

ئیبنو عەبدولبەڕ دەڵێت: سوفیانی کوڕی عویەینە دەگێڕێتەوە لەئەبو موساوە، لەحەسەنەوە، کەپێغەمبەرﷺ بەسوراقەی وتووە: ((کیف بك اذا لبست سواری کسری؟)) واتە: پێت چۆنە ئەگەر هەردوو دەستەوانەکەی کیسرا لەدەست بکەیت؟ دەڵێت: کاتێك دوو دەستەوانە وتاجی کیسرایان هێنا بۆ عومەر ڕەزای خوای لێبێت، سوراقەی کوڕی مالیکی بانگکردو لەدەستی کرد، سوراقە پیاوێکی توکن بوو، توکی

---

١- ئەو تیرانەیە کەلەسەر دەنوسرا: وابکە، وامەکە .

باڵی چرببوو، پێی ووت: هەردوو دەستت بەرزبکەرەوە، ووتی: (الله اکبر) سوپاس بۆ ئەو خوای ئەمەی لەکیسرا وەرگرتەوە کەئەو دەیووت من خوای خەڵکیم، عومەر پاش ئەوەی دەستەوانەکانی بەسوراقەدا، دەنگی بەرز کردەوەو[1] سوراقەی سوار کرد وبەناو مەدینەدا گێڕایان وخەڵکیش دەوریان دابوو، ئەویش هەرقسەکەی عومەری دوپات دەکردەوە: سوپاس بۆ ئەو خوای ئەمانەی لەکیسرا وەرگرتەوەو دای بەسوراقەی عەرەبی بیابان نشین .[2]

## هەشتەم: پاکی بۆ ئەو خوایەی کەدڵەکان دەگۆڕێ.

سەرەتا سوراقە دەیەویست پێغەمبەر ﷺ دەستگیر بکات وبیدا بەدەستی سەرانی مەککەوە، بۆ ئەوەی سەد وشتری دەستکەوێت، بەڵام لەناکاو هەموو مەسەلەکان سەروژێر دەبنەوە، چونکە سوراقە وای لێهات خەڵکی لەپێغەمبەرﷺ دوور دەخستەوە، لەهەر کوێ وەدەیانبینی دەیووت: بەم لادا مەڕۆن چونکە من گەڕاوم ولەوێ نییە، بەڵام پاش دڵنیابوونی لەگەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بەمەدینە، بەسەرهاتەکەی باسکردو، خەڵکیش دەیانگێڕایەوە تاکو هەموو یانەکانی مەککە بیستیان، بۆیە سەرانی مەککە ترسان ئەو بەسەر هاتە ببێتە هۆی موسڵمان بوونی هەندێك لەخەڵکی مەککە، تەنانەت هەندێ شەڕە هەڵبەستیش لەو بارەوە دروست بوو لەنێوان سوراقەو ئەبو جەهلدا .

## نۆیەم: پێشوازیکردنی ئەنصارەکان لە پێغەمبەر ﷺ.

کاتێك موسڵمانان لەمەدینە بیستیان پێغەمبەر ﷺ لەمەککەوە دەرچووە بەرەو مەدینە، هەموو سبەینانێك دەچوونە لای حەڕەو چاوەڕوانیان دەکرد تا گەرمای نیوەڕۆ دەیانیگەڕانەوە، ڕۆژێکیان پاش چاوەڕوانێکی زۆر گەڕانەوە ماڵەکانیان، پیاوێکی جولەکە لەسەر یەکێك لەقەڵاکانیانەوە سەیری ئیشێکی خۆی دەکرد،

---

١- بڕوانە: الروض الانف ٤/٢١٨، الهجرة في القرآن ٣٤٦ .
٢- بڕوانە: السيرة النبوية لابى شهبة ١/٤٩٥ .

پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی بەرچاو کەوت جلی سپیان لەبەردابوو، ئیتر جولەکەکە بەدەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی عەرەب، ئەوە ئەو کەسەیە کەچاوەڕوانی دەکەن، ئیتر موسڵمانان چەکەکانیان هەڵگرت وچوونە پێشوازی پێغەمبەرﷺ لەلای حەڕەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەلای ڕاستدا لایماڵەکانی بەنی عەمری کوڕی عەوف لایدا، ڕۆژی دووشەممە [١]، لەمانگی ڕەبیعولئەوەلدا [٢]، ئینجا ئەبوبەکر هەڵسا بۆلای خەڵکەکەو پێغەمبەرﷺ بەبێ دەنگی دانیشتبوو، ئینجا ئەوانەی کەهێشتا پێغەمبەرﷺ یان نەبینیبوو دەهاتن وبەخێرهاتنی ئەبو بەکریان دەکرد، تاکو خۆر پێغەمبەرﷺ ی گرتەوە وئەبو بەکر بەجلەکانی خۆی سێبەری بۆ دەکرد، ئەو کاتە خەڵکەکە زانیان ئەوە پێغەمبەرەﷺ، پێغەمبەری خوا درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت زیاتر لەدەشەو لەبەنی عەمری کوڕی عەوف مایەوە [٣]، مزگەوتی تەقوای لەوێ دروست کرد ونوێژی تیاکردو، ئینجا سواری وشترەکەی بوو [٤].

لەپاش ئەو ماوەی کەلەقوبا مایەوەو، ویستی بچێتە ناو مەدینەوە، ((ناردی بەدوای ئەنصارەکانداو، ئەوانیش هاتن وسەلاویان کرد لەپێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت، ووتیان: سواربن لەئارامی وفەرمان بەجێهێنراویدا، ئیتر هەردوکیان سوار بوون وئەوانیش بەچەکەوە دەورەیاندا)) [٥]

کە گەیشتە مەدینە، خەڵکی دەیانووت: پێغەمبەری خوا هات، پێغەمبەری خوا هات، دەرچوونە بەرزاییەکان تەماشایان دەکرد، هەر دەیانووت: پێغەمبەری خوا هات. [٦]

---

١- ئیبنو حەجەر وتوویەتی: ئەم بۆچوونە جێگیرە، نەك ئەوەی کەدەڵێت ڕۆژی هەینی گەیشتووە، الفتح ٥٤٤/٧ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٣٥١ .

٣- هەمان سەرچاوە ٣٥٢ .

٤- صحيح البخاري، كتاب مناقب الانصار، باب هجرة النبي ٧٧،٧٨/٥ ورقمه ٣٩٠٦ .

٥- هەمان سەرچاوە ٣٩١١ .

٦- هەمان سەرچاوە ٣٩١١ .

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی خۆشـی وشـادی بـوو، ڕۆژی وا هـەرگیز نـەبینرابوو لەمەدینـە، خەڵکی جـوانترین جلـەکانیان پۆشـی وەکـو ڕۆژی جـەژن، بەڕاسـتیش جـەژن بـوو، چونکە لەو ڕۆژەدا ئیسلام لەئاستەنگی مەککەوە، گوێزرایەوە بۆ فراوانـی جموجـۆڵ وکارکردن وبڵاوبوونەوەی لەم جێگە پیرۆزەدا، لەوێشەوە بۆ هەموو شوێنەکانی سەر گۆی زەوی، خەڵکی مەدینـە هەسـتیان بـەو چاکە دەکـرد خـوای گـەورە لەگـەڵیان ئەنجامیدا، چونکە شارەکەیان بوو بەشوێنێك پێغەمبەر ﷺ ی لەخۆ گرت، هەروەها هاوەڵە بەڕێزەکانی ودەوڵەتی ئیسلام، بۆیە خەڵکی مەدینە لەئەو پـەڕی شـادمانیدا دەردەچوون ودەیانووت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئـەی موحەممـەد ئـەی پێغەمبـەری خوا .[1]

پاش ئەم پێشوازیکردنە جەماوەرییە تاکە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، پێغەمبەر ﷺ بەڕێکـەوت تـاکو گەیـشتە مـاڵی ئـەبو ئـەیوبی ئەنـصاری ڕەزای خـوای لێبێـت، ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەرﷺ ڕێی دەکرد تاکو گەیشتە ماڵی ئـەبو ئـەیوب لـەو کاتـە ماڵـەویان قـسەی دەکـرد، کەبیـستی عەبـدوڵڵای کـوڕی سـەلام لـەناو دارخورماکانیـدا بەرهەکەمـەی دەچـنی بـۆ مناڵـەکانی، بـەڵام بەپەلـە هاتـە لای پێغەمبەرﷺو گوێی لێ بـوو وگەڕایـەوە لای خێزانەکـەی، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ((ای بیوت اهلنا اقرب؟)) واتە: کـام لـەماڵی کەسـەکانمان نـزیکترە؟ ئـەبو ئـەیوب ووتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئـەوە ماڵەکەمـە وئـەوە دەرگاکەیـەتی، فـەرمووی: کەواتـە بـڕۆ جێگایـەکمان بـۆ ئامـادە بکـە....[2] ئـیتر پێغەمبـەرﷺچـووە لای ئـەبو ئەییوب تادروست کردنی مزگەوت وماڵەکانی .

بـەم شـێوەیەش کۆچـی پـیرۆزی پێغەمبـەرﷺو هـاوەڵانی بەئـەنجام گەیـشت و ئامانجەکانیشی بەوە کۆتـایی پێنـەهات، بـەڵکو پـاش گەیشتنی دەسـتی پێکـردو، گەشتی دەردی سـەری وبـەرەنگاریکردن دەسـتی پێکـرد، کەپێغەمبـەرﷺ زاڵبویـە سـەریاندا بـۆ گەیـشتن بـەدوا ڕۆژی پرشـنگدار بـۆ ئوممـەتی ئیـسلام ودەوڵـەتی

---

١– بڕوانە: الهجرة في القرآن ٣٥٣ .

٢– البخاري، كتاب مناقب الانصار، باب هجرة النبي الى المدينة ٧٩/٥ ورقمه ٣٩١١ .

ئیسلامی، کەتوانی شارستانیەك دروست بکات بۆ مرۆڤایەتی، لەسەر بنچینەی بیروباوەڕو لەخواترسان و، چاکەو، دادگەری، پاش ئەوەی زاڵبوویە سەر بەهێزترین دوو دەوڵەت کەحوکمی جیهانیان دەکرد لەو سەردەمە؛ دەوڵەتی فارسەکان و دەوڵەتی ڕۆمەکان.[1]

## دەیەم: پەندەو ئامۆژگاری.

١- ململانێ لەنێوان هەق وناهەق: ململانێیەکی کۆنە ودرێژخایەنە، یەکێکیشە لەسوننەتەکانی خوا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾ (الحج:٤٠).

بەڵام ئەم ململانێیە ئاکامەکەی ئاشکرایە: ﴿ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾ (المجادلة: ٢١).

٢- پیلانگێڕانی ناحەزانی بانگەواز بەبانگەواز: ئەوەیش کارێکی بەردەوامەو هەمیشە دووبارە دەبێتەوە، لەڕێگەی زیندانی کردن وکوشتن ودەرکردن و دوورخستنەوە، پێویستە لەسەر بانگەواز پەنابگرێتە خواو متمانەی پێی هەبێت وپشتی پێ ببەستێت وئەوە بزانێت کەپیلانی خراپ بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴾ (الانفال: ٣٠).

یەکێك لەپیلانەکانی تری دوژمنانی بانگەواز، بەکارهێنانی چەکی ماڵ وسامان بوو بۆ هەڵخەڵەتاندنی خاوەن نەفس نزمەکان، بەمەبەستی لەناوبردنی بانگەوازو

---

١- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٣٥٥ .

بانگخوازن، بۆیە ئەوان سەد وشتریان وەکو خەڵات دەستنیشان کرد بۆ هەرکەسێك یەکێك لەکۆچکردووەکان بهێنێت بەزیندوویی یان مردوویی، بۆیە تەماعکاران دەستیان کرد بەجموجۆڵ، یەکێك لەو کەسانەش سوراقە بوو، کەلەپاش ملهوڕییەکی بێ ئەنجام، گەڕایەوە بەقازانجێکی پاکترو چاکترو، بەڵکو ڕێگەی تێکدەدا لەوانەی شوێن پێغەمبەرﷺ دەکەوتن بۆ دەستگیر کردنی، بەم شێوەیەش خوای گەورەخۆشەویستمانی خۆی دەپاراست [1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴾ (الانفال:٣٦) .

٣- ووردبینی لە پلاندانان‌وکارکردن بە هۆکارەکان:ئەو کەسەی وردبێتەوە لەڕوداوی کۆچکردن ووردی پلاندانان تیایداو، کارکردن بەهۆکان لەسەرەتاوە تاکو کۆتایی، بۆی ئاشکرا دەبێت، کە پلاندانانی پشت ئەستور بەوەحی، هەمیشە بوونی هەبووە لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ ، نەخشە کێشانیش بەشێکە لەسوننەتی پێغەمبەرایەتی وداواکارییەکانی خوای گەورە لەموسڵمانان، ئەوانەش کەکاری هەڕەمەکی دەکەن، بەپاساوی ئەوەی کەنەخشە کێشان وکارقایمی لەسوننەتدا نەهاتووە، ئەوانە بە هەڵەدا چوون و، تاوانیش دەکەن لەدژی خۆیان وموسڵمانان . [2]

کاتێك کاتی کۆچکردن هاتە پێشێ و، پێغەمبەرﷺ دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی ئەمانەی خوارەوە تێبینی دەکەین:

*هەبوونی ڕێکخستنی ورد بۆ کۆچکردن تاکو سەری گرت، سەرەڕای هەموو کۆسپ و تەگەرەکان؛ چونکە هەموو هەنگاوەکانی کۆچکردن بەشێوەیەکی چاك ئامادەکاری بۆ کرابوو، بۆ نموونە:

أ- هاتنی پێغەمبەرﷺ لەگەرمای نیوەڕۆدا، لەو کاتەی کەکەس دەرناچێت، بەڵکو خۆیشی لەکاتی وەها سەردانی نەدەکرد، بۆچی؟ بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ .

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٢٠٠.

٢- بڕوانە: الاساس في السنة، سعيد حوى ٣٥٧/١ .

ب- شاردنەوەی کەسایەتی خۆی لەوکاتەی سەردانی ئەبو بەکری کردو، چونکە دەمی خۆی هەلپێکابوو، بۆ ئەوەی ناسینەوەی ئاسان نەبێت .[١]

ج- فەرمانی پێغەمبەرﷺ بەئەبو بەکر کە هەرکیەسێك لەژورەکەدایە دەرچێت، کاتێکیش قسەی کرد باسی ئاڕاستەی کۆچەکەی نەکرد .

د- دەرچوونیشیان بەشەو بوو، لەدەرگای پشتەوەی ماڵی ئەبوبەکر .[٢]

هـ- تەنانەت دووربینی گەیشتە ئەوەی کەهەندێ ڕێگەی ناباویان گرتەبەرو، پەنایان بردە بەر شارەزایەك کەڕێگەکانی بیابان شارەزا بێت، با ئەو شارەزایە بتپەرستیش بێت مادام خاوەن ڕەوشت وسەنگین بێت، بەڵگەی ئەوەشی تیادایە کەپێغەمبەرﷺ ، سوود لەتواناو بەهرەکان وەردەگرێت بەدەر لەتەماشاکردنی سەرچاوەکەی .[٣]

* هەلبژاردنی هەندێك کەسایەتی هۆشمەند بۆ یارمەتیدانی کاروباری کۆچکردن، تێبینیش دەکرێت ئەو کەسانە بەسراونەتەوە بەپەیوەندی خزمایەتی، یان پەیوەندی کارکردن، بۆ ئەوەی ببنە یەکەیەکی هاوکار لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجی گەورە .

* دانانی هەرکەسێك لەو کەسانە لەجێگای گونجاوی خۆی، کەتیایدا کارامەیە، بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە ئەنجامی بدات .

* بیرۆکەی خەوتنی عەلی ڕەزای خوای لێبێت لەجێگای پێغەمبەرﷺ ، بیرۆکەیەکی سەرکەوتوو بوو، چونکە سەری لێیان تێکداو، دووریانی خستەوە لەپێغەمبەرﷺ ، تاکو لەتاریکی شەودا دەرچوو بەچاودێریکردنی خوای گەورە، چاوەکانی ئەوان هەر لەسەر جێگای پێغەمبەرﷺ بوو، چونکە گومانیان نەبوو کەپێغەمبەر لەجێگاکەی خەوتووەو داپۆشراوە، لەکاتێکدا خەوتووەکە عەلی بووؓ ئینجا دەبینین پێویستیەکانی گەشتەکە بەشێوەیەکی چاك دابین کرابوو:

---

١- بڕوانە: في السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحماية، لا١٤١ .

٢- بڕوانە: معين السيرة ١٤٧ .

٣- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٣٦١ .

أ- عـەلی ڕەزای خـوای لێبێـت: لـەجێگای پێغەمبـەرﷺ دەخـەوێت بـۆ چەواشـەکردنی ئـەوان، بـۆ ئـەوەی دوای پێغەمبـەرﷺ سـپاردەکان بگێڕێتـەوە بـۆ خاوەنەکانیان .

ب- عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـەبو بـەکر: هـەواڵ هێنـەری ڕاسـتگۆو، دەرخـەری جموجوڵەکانی دوژمن .

ج- ئەسمای (ذات النطاقين): ئازوقەبەر لەمەککەوە بۆ ئەشکەوت، لەنێو شێت و هاربوونی بتپەرستاندا بەدوای پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی بیکوژن .

د- عامیری کوڕی فوهەیرە: شوانی ساکار کەگۆشت وشیری پێشکەش دەکردە پێغەمبەرﷺ و ئـەبو بـەکر ڕەزای خوایـان لێبێـت، بەڕانـە مەڕەکەشـی شـوێن پێـی کاروانە مێژوویەکەی دەسڕییەوە، بۆ ئەوەی بتپەرستەکان ئەوانی پێ نەدۆزنەوە ! ! ئەم شوانە هەڵدەستا بەبینینی ڕۆڵی یارمەتیدەرو بەخێوکەر .

هـ- عەبدوڵڵای کوڕی ئورەیقیت: ڕابەری سەر ڕاستی کۆچ و، شارەزای چاوساغی بیابـان، لەئـەو پـەڕی وریـایی دا چـاوەڕوانی هێمـای دەسـت پێکـردن بـوو لـە پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوەی بەڕێکەون لەئەشکەوتەوە بۆ یەسریب.

ئەمانــە ڕاپەڕانـدن بـوون بـۆ کارەکـان بەشـێوەیەکی نـاوازەو، دوور بینـی بەشێوازێکی ئاقڵانەو، دانانی هەرکەسێك لـەو کەسـانە لـەجێگای گونجاوی خۆیـدا، داخستنیش بوو بۆ هەموو کەلێنەکان وداپۆشـین بـوو بـۆ پێویستیەکانی کۆچـەکە، تەنها ئەوەندەکەسیش بەکارهێنرا کەپێویست بـوو پێغەمبـەرﷺ ئـەوەی لەتوانایـدا بوو ئەنجامیدا، ئینجا چاوەڕوانی چاودێر کردنی خوای گەورەی دەکرد .[1]

٤- کـارکردن بـەهۆکارەکانن پێویـستن: بـەڵام ئـەوە ناگەیـەنێت کەهەمیـشە دەرەنجامی هەبێت، چونکە ئەوە مەسەلەیەکە پەیوەستە بەفەرمانوویستی خـوای گەورەوە ، ئالێرەشەوە مەسەلەی پشتبەستن بەخوای گەورە پێویستە، وەکو تەواو کەرێك بۆ کارکردن بەهۆکارەکان .

---

١- بڕوانە: اضواء على الهجرة، لتوفيق محمد ٣٩٣_٣٩٧ .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هۆکارەکانی ئامادەکردو هەموو هۆکارێکیشی وەرگرت، بەڵام هاوکات هەر دەپاڕایەوە لەخواو داوای سەرکەوتنی لێدەکرد، کەهاوڵەکانی سەر بخات و، نزاو پاڕانەوەی قبوڵ بکات و، ئەوانەی کە لەدەرگای ئەشکەوتەکە ڕاوەستان بگەڕێنەوەو، پێی ئەسپەکەی سوراقە بچەقێتە ناو زەویداو....[1]

٥- باوەڕ بەموعجیزە هەست پێکراوەکان: لەکۆچی پێغەمبەرﷺ هەندێ کارتی لەئاسابەری هەست پێکراو ڕویدا، کەبەڵگەن لەسەر چاودێری کردن وپاراستنی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی، لەوانە، هێلانەی جاڵجاڵۆکەکە لەدەرگای ئەشکەوتەکەداو، ڕوداوی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئوممو مەعبەددا، هەروەها ئەوەی کەڕویدا لەگەڵ سوراقە وبەڵێن دانی پێغەمبەرﷺ بەئەو کەدەستەوانەکانی کیسرا لەدەست بکات، پێویستە لەسەر بانگخوازان خۆیان بێ ئاگا نەکەن لەئەو کارە لەئاسابەرانە، بەڵکو باسی بکەن ئەگەر جێگیر بوو بێت لەسوننەتدا، بەمەرجێك، باسی ئەوە بکەن کەئەو موعجیزانە بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ.[2]

٦- ڕەوایی پەنابردنە بەر بێباوەڕی متمانە پێکراو: ئەگەر متمانەیان پێبکەن، چونکە ئێمە بینیمان کەپێغەمبەرﷺو ئەبو بەکر کەسێکی بتپەرستیان بەکرێ گرت بۆ ئەوەی ببێتە چاوساغیان لەڕێگەی کۆچەکەیاندا، هەردوو وشترەکەشیان پێداو بەڵێنیان لێ وەرگرت لەلای ئەشکەوتی سەور یەکبگرن، ئەوەش چەند زانیارییەکی ترسناك بوو کەخستیانە بەردەستی، بێگومان کەپێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر متمانەی تەواویان پێکرد، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو جۆرە کەسانە دەشێت متمانەیان پێبکرێت ئەگەر خۆیان جێگای متمانە بن، وەکو ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی هەبێت لەنێوانیاندا، یان ناسراوییەکی دێرین، یان دراوسێتی، یان کاری چاکە کەپێشتر بانگخوازەکە پێشکەشی کردبێت بۆی، یان خاوەن ڕەوشت و دەستپاکی بێت... مەسەلەکەش پەیوەستە بەهەڵسەنگاندنەوەو، هەروەها بەژێری بانگخوازەوەو، ناسینی کەسەکە.[3]

---

١- بڕوانە: من معين السيرة ١٤٨ .

٢- بڕوانە: المستفاد من قصص القران ٢/١٠٨ .

٣- بڕوانە: المستفاد من قصص القران ١٠٨ .

٧- ڕۆڵی ئافرەت لەکۆچکردنەکەدا: لەئاسمانی کۆچکردندا هەندێ ناو درەوشایەوە، خاوەنی فەزڵ وچاکەی زۆرو، پشکی چاك بوون لەجیهاددا، لەوانە: عائیشەی کچی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت، کەبەسەر هاتەکەی بۆمان گێڕاوەتەوە، هەروەها ئوممو سەلەمەی کۆچکردووی بەئارام و، ئەسمائی (ذات النطاقين) [1] کەبەشداری کرد لەگەیاندنی ئازوقە بەپێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت، هەروەها چۆن ئازاری لەپێناو خوادا هەڵگرت، خۆی باسی دەکات ودەفەرموێت: ((کاتێك پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر دەرچوون، کەسانێك لەقورەیش هاتن بۆ لام، ئەبو جەهلیان تیابوو، لەدەرگای ماڵی ئەبو بەکر ڕاوەستان، منیش دەرچووم بۆ لایان، وتیان: باوکت لەکوێیە ئەی کچی ئەبو بەکر؟ دەڵێت: وتم: سوێند بەخوا نازانم باوکم لەکوێیە! ئیتر ئەبوجەهل دەستی بەرزکردەوە_خۆیشی کەسێکی خراپەکارو بەدڕەوشت بوو_و شەپازلەیەکی لێمدا گوارەکەم کەوتە خوارەوە، دەڵێت: دوای ئەوە ڕۆیشتن... [2] ئەمە وانەیەکە لەئەسمائەوە فێری ئافرەتانی موسڵمانی دەکات، نەوە لەدوای نەوە، چۆن نهێنی موسڵمانان بشارێتەوە لەدوژمنان، چۆنیش بە سەربەرزی ڕاوەستێت بەرانبەر هێزەکانی ستەم وزۆرداری! وانەی دووەمیشی ئەوە بوو کاتێك ئەبو قوحافەی باپیرەی هاتەلای وئەکاتە چاوی نابینا بوو بوو، وتی: سوێند بەخوا وادەزانم ئەبو بەکر هیچی بۆ بەجێ نەهێشتوون وتی: نەخێر باپیرە، دەستت بخەرە سەر ئەو پارانە. دەڵێت: ئەویش دەستی خستە سەری وتی خراپ نییە، ئەگەر ئەوەندەی بۆ بەجێهێشتبن، کارێکی باشی کردووەو، بەشتان دەکات، دەڵێت: سوێند بەخوا هیچی بۆ بەجێ نەهێشتبووین، بەڵام بۆ ئەوەی باپیرەم هێدی بکەمەوە . [3]

بەم ژیری ولێزانینەی خۆی ئەسما توانی هەواڵی باوکی بشارێتەوەو، دڵی باپیرە نابیناکەی ئاسوودە بکات، بێ ئەوەی درۆیش بکات، چونکە بەڕاستی باوکی ئەو

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٢٠٦ .

٢- هەمان سەرچاوە ١٢٦ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام ١٠٢/٢ اسناده صحيح .

بەردانەی بەجێهێشت بەڵام ئەوە بۆ ئەوە بوو دڵی ئەو پیاوە پیرەی پێ داخوریت، بەڵام ئەبوبەکر بیروباوەڕێکی بۆ بەجێهێشتن چیاکان نایجوڵێنن وزریانیش کاری تێناکات، نەکەمی وزۆریش هیچ کاریگەرییەکی لەسەر هەیە، دڵنیاییشی بەمیراتی بۆ بەجێهێشتن و، بەو شێوەیش بوو بەنموونەیەك دووبارەی نابێتەوە بۆ خێزانی موسڵمان، ئەسمائیش بوو بەچاکترین نموونە بۆ ئافرەتانی موسڵمان بەگشتی، لەگەڵ خوشکەکانیشی لەمەککە مایەوە، بێ ئەوەی سکاڵایەك بکات لەناڕەحەتی، یان نەبوونە، تاکو پێغەمبەرﷺ زەیدی کوڕی حاریسەو ئەبو رافیعی مەولای نارد بۆ مەککەو دوو وشترو پێنج سەد درهەمی پێدا لەگەڵ ناردن، ئەوانیش فاتیمەو ئوممو کولسومی کچی وسەودەی کچی زەمعەی خێزانی ئوسامەی کوڕی زەیدو وبەرەکەی دایکی کەبەئوممو ئەیمەن دەناسرا، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکریش منداڵەکانی ئەبو بەکری هێنا کەئەسمائو عائیشەیان تیادا بوو، پاش ئەوەی گەیشتنە مەدینە چوونە ماڵی حاریسەی کوڕی نوعمان .[1]

٨- ئەسپەردەی بتپەرستان لای پێغەمبەرﷺ : بتپەرستان سەرەڕای دژایەتی کردنیان بۆ پێغەمبەرﷺ ئەسپەردەکانیان دەخستە لای ئەو، کەئەوە بەڵگە لەسەر دژە یەکبوونی هەڵوێستەکانیان، چونکە ئەوان لەکاتێکدا بەپێغەمبەرﷺ دەیانوت: درۆزن وجادوبازو شێت، کەسی تریشیان دەسنەدەکەوت لەئەو ڕاستگۆو دەستپاکتر، وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ (الانعام: ٣٣) .

ئینجا سەرەڕای ئەوەی پێغەمبەرﷺ لەبارودۆخی گرانی کۆچکردندا بوو، هەرگیز ئەو ئەسپەردانەی لەبیر نەکرد، بەڵکو فەرمانی کرد بەعەلی بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان .[2]

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ١٢٨ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القرآن الكريم ٣٦٤ .

٩- وشتر بەنرخی خۆی : پێغەمبەرﷺ ڕازی نەبوو سواری وشترەکە بێت تاکو بەنرخی خۆی نەیکڕی لەئەبو بەکر ڕەزای خاوی لێبێت وکردی بەقەرز بەسەر خۆیەوە، ئەمەیش وانەیەکی ئاشکرایە کەبانگخوازان نەبنە بار بەسەر کەسەوە، لەهیچ کاتێکدا، چونکە ئەوان ئەبێت سەرچاوەی بەخشینی بن .

ئەگەر بەخشندەیش نەبن، نابێت داواکار بن، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ (الشعراء: ١٠٩).

هەڵگرانی بیروباوەڕ نابێت دەست لەکەس پان بکەنەوە_لەخوای گەورە نەبێت_ چونکە خەڵکی وافێربوونە تەماشای زمانی ڕەفتار بکەن نەکو گوفتار، دواکەوتنی موسڵمانانیش کاتێك ڕویدا کەهۆکارەکانی بانگەوازو هەڵگرانی ملکەچی ماددە بوون، چونکە بۆ نموونە هەندێکیان چاوەڕوانی مووچە دەکەن وکاری بانگەوازیش لەو حاڵەتەدا وەکو هەرکارێکی تری پێدێت وجوانی ودرخشاوەی خۆی لەدەست دەدات.

ئەو دەنگەی بەرز دەبێتەوە لەترسی خواو هیوای ڕەزامەندی، جیاوازە لەئەو دەنگەی لەپێناو بڕێکی پارەی دیاریکراودا بەرزدەبێتەوە، چونکە ئەگەر پارەکە ڕاوەستێت دەنگەکە ڕادەوەستێت، هەر لەکۆنیشەوە وتراوە: ئەو کەسەی لەماتەمینی شین دەکات وەکو ئەو ئافرەتە نییە کەجگەر گۆشەکەی لەدەست داوە..بۆیە لەم ڕۆژگارە دەبینین کاریگەری کەم بووەتەوەو، خەڵکی لەڕێگای ڕاست لایانداوە .[1]

١٠- بانگخواز خۆی بەدوور دەگرێت لەماڵی خەڵکی: کاتێك پێغەمبەرﷺ خۆشبوو لەسوراقە: سوراقە پێشنیاری یارمەتی کردە سەر پێغەمبەرﷺ و، ووتی: ئەوە تیردانە کەمە وتیرێکی لێ دەرهێنە، چونکە تۆ لای وشترو مەڕی مندا تێدەپەڕێت لەجێگای فلان وفلان، چەندت پێویستە لێی ببە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((لاحاجةَ لی فيها))[2] واتە: پێویستم پێی نییە .

---

١- بڕوانە: معين السيرة ١٤٨، ١٤٩ .

٢-المسند ٣/١ ورقمە ٣ تحقيق احمد محمد شاكر، وقال محققو طبعة الرسالة. اسناده صحيح على شرط مسلم.

کەبانگخوازان بیٚ نیاز دەبن لەوەی لای خەڵکیە، خەڵکیش ئەوانیان خۆشدەوێت، کاتێکیش تەماعیان هەبێت پێیان، خەڵکی هەڵدێن لێیان و ئەمەیش وانەیەکی گرنگە بۆ بانگخوازان .[1]

١١- سەربازێتی پایەبەرزوگریان لەخۆشیدا: کاریگەری پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەبو بەکر وعەلی دەردەکەوێت، لەوەی کاتێك ئەبو بەکر ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە وپێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: پەلەمەکە، بەڵکو خوای گەورە هاوڕێیەکت بۆ تەرخان بکات، هەرلەو ڕۆژە دەستی کردە نەخشەکێشان بۆ کۆچکردن ودوو وشتری کڕی ولەماڵی خۆیدا بەخێویانی دەکرد بۆ ئەو مەبەستە، لەڕیوایەتەکەی بوخاریدا هاتووە کە چوار مانگ بەخێوی کردن لەماڵدا، چونکە دەیزانی کاتی کۆچکردن کاتێکی سەختە ولەوانەیە لەناکاوبێت، بۆیە ئامڕازەکەی ئامادەکردو، پێویستەکانی تری ئەنجامدا، کاتێکیش پێغەمبەرﷺ هاتە لای وفەرمووی خوای گەورە ڕێگای داوم کۆچ بکەم، ئەبو بەکر لەخۆشیدا گریا، عائیشە ڕەزای خوای لێبێت لەم بارەوە فەرموویەتی: سوێند بەخوا هەستم نەدەکرد کەس لەخۆشیدا بگری تاکو باوکم نەبینی لەو ڕۆژەدا .

صدیق دەیزانی مانای ئەم هاوڕێیەتیە،ئەوەیکە لە خزمەتی پێغەمبەری پەروەرگاری هەموو جیهاندا دەبێت، هیچ نەبێت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك وخۆی ئامادەیە گیانی ببەخشێت بەهاوڕێ وسەرگەورەکەی، چ سەرکەوتنێك هەیە لەمە گەورەتر، کەئەبو بەکر لەنێو هەموو هاوەڵاندا شادبێت بەئەم هاوڕێتی یە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە،[2] واتاکانی خۆشەویستی لەپێناو خوادا لەپەژارەی ئەبو بەکر دەردەکەوێت نەوەکو بتپەرستەکان بیانبینن، بۆ ئەوەی ئەبو بەکر ببێتە نموونەی سەربازی بانگەوازی ڕاستگۆ لەگەڵ سەرکردەی خۆی، لەو ساتەدا ئەبو بەکر لەژیانی خۆی نەدەترسا، چونکە ئەگەر وابوایە هاوڕێتی پێغەمبەرﷺ ی نەدەکرد لەئەم کۆچکردنە ترسناکەدا، کەکەمترین سزای کوشتن بوو لەلای بتپەرستەکان،

١- بڕوانە: في ظلال الهجرة النبوية ٥٨ .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٢/١٩١، ١٩٢ .

بەڵام ئەو ترسی هەبوو لەژیانی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ و دواڕۆژی ئیسلام، ئەگەر پێغەمبەرﷺ بکەوێتە دەستی قورەیش [١]، هەروەها هەستی لایەنی ئاسایش لەلای ئەبو بەکر دەردەکەوێت، لەزۆر هەڵوێستدا، لەوانە: کاتێك پرسیاری لێکرا: ئەوە کێیە لەگەڵتدا؟ ووتی: ئەوە چاوساغە ڕێم پیشان دەدا، ئەو کەسەی پرسیاری کرد واتێگەیشت مەبەستی ڕێگایە، بەڵام ئەبو بەکر مەبەستی ڕێگای چاکە بوو، بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت لەدرۆکردن [٢]، چونکە کۆچکردنەکە نهێنی بوو، پێغەمبەریشﷺ ڕازی بوو لەسەر ئەو کردارەی [٣].

هەروەها هەڵوێستی عەلی کوڕی ئەبو تالیب نموونەی سەربازی ڕاستگۆ بوو، کەدڵسۆز بێت بۆ بانگەوازی ئیسلام، چونکە ژیانی خۆی کرد بەقوربانی پێغەمبەرﷺ، چونکە ساغ وسەلامەتی سەرکردە مانەوەی بانگەواز دەگەیەنێت، لەتیاچوونیشدا لاوازی وشکستی بانگەوازی تیادایە، ئەوەی کەعەلی ئەنجامیدا لەشەوی کۆچکردنداو، خەوت لەسەر جێگای پێغەمبەرﷺ ئەگەری ئەوەی تیا بوو ئەو لاوانەی قورەیش بەشمشێرەکانیان بەعەلیدا بهاتایەن، بەڵام عەلی بێباك بوو لەوە، بەسەکە پێغەمبەرﷺ سەلامەت بێت [٤].

١٢- هونەری بەڕێوەبردنی گیانەکان ومامەڵەکردن لەگەڵ دەرونەکاندا: خۆشەویستی بێ ئەندازەی ئەبو بەکر وهاوەڵان بۆ پێغەمبەرﷺ بەئاشکرا دەردەکەوێت لەکاتی کۆچکردندا,هەروەهاخۆشەویستی هاوەڵانیش لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ دەردەکەوێت، ئەو خۆشەویستیەیش هەڵقوڵاوی نێو دڵەکانەو، سەرچاوەی نەگرتووە لەهیچ بەرژەوەندییەکی تر، یەکێ لەهۆکانی ئەو خۆشەویستیەیش ئەو سیفەتەسەرکردەییەی پێغەمبەری خوابووﷺ، چونکە خۆی شەونخونی دەکرد بۆ ئەوەی ئەوان بخەون، ماندویش دەبوو بۆ ئەوەی ئەوان بحەسێنەوە، خۆی برسی دەکرد بۆ ئەوەی ئەوان تێربن، دڵخۆش دەبوو

---

١- السيرة النبوية دروس وعبر للسباعي ٧١ .

٢- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٢٠٤ .

٣- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٢٥٤ .

٤- بڕوانە: السيرة النبوية للسباعي ٦٨ .

بەدڵخۆشییان، خەمباریش دەبوو بە پەژارەیان، کارەکەشی هەمووی لەپێناوی خوادا بوو، .....[1]

سەرکردایەتی سەرکەوتوو ئەوەیە کەبتوانێت گیانەکان بەڕێوەببات پێش هەموو شتێك، مامەڵەیش لەگەڵ دەروونەکان بکات پێش هەموو شتێك، چەندیش سەرکردایەتی چاك بێت ئەوەندە سەربازەکان چاك دەبن، چەندیش بەخشندە و لێبوردە بێت ئەوانیش وادەبن، پێغەمبەرﷺ بەسۆز بوو بۆ سەربازەکانی وشوێنکەوتوانی، کۆچیشی نەکرد تاکو زۆربەی هاوەڵانی کۆچیان کرد، کەس نەما جگەلە چەوساوەو لەخشتە چووەکان ولەساتێك کەهەندێ کاروباری تایبەتیان هەبوو دەربارەی کۆچ .[2]

١٣- لەڕێگا بورەیدەی ئەسلەمی ڕەزای خوای لێبێت موسڵمان بوو، لەگەڵ کاروانی خزمانیدا موسڵمان بوون: ئەو موسڵمانەی کەبانگەواز پەلی هاوێشتووەتە ناخی دڵی، هیچ کاتێك هەست بە سستی ناکات لەبانگ کردنی خەڵکی بۆ ئایینی خوا، باهەر چەند بارودۆخ نالەبار بێت وئاسایش لەدەست درابێت، بەڵکو هەموو هەلێك دەقۆزێتەوە بۆ گەیاندنی ئایینی خوای گەورە، ئەوە پێغەمبەری خوایە علیه السلام، کاتێك خرایە تاریکی زیندانەوەو، زیندانیەکان لەدەوری کۆبوونەوە، دەستی نەکرد بۆ لەو گلەیی کردن لەچارەنوسی خۆی، ئەو ژیانە تاریکەیش سەرقاڵی نەکرد لەهەڵسان بەئەرکی خۆی لەبانگەواز کردن بۆ یەکتاپەرستی و، دژایەتی کردنی بتپەرستی، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَىٰحِبَىِ ٱلسِّجْنِ ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لابی فارس ٥٤ .

٢- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٢٠٥ .

ٱلْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف:٣٧_٤٠).

سوڕەتی یوسف، سوڕەتێکی مەککیە، خوای گەورەیش فەرمانی کردووە بەپێغەمبەرەکەی کەپەیڕەوی بکات لەپێغەمبەران، بۆیە دەبینین لەکاتی کۆچەکەیدا ڕشتنی خوێنی ڕەوا کرابوو، خەڵاتی زۆریشیان دەستنیشان کردبوو بۆ کەسێك ئامادەی بکات بەزیندویی یان مردویی، لەگەڵ ئەوەشدا پەیام وئەرکەکانی خۆی لەبیر نەچووە لەڕێگاش پیاوێکی تووش بوو ناوی بورەیدەی کوڕی حوصەیبی ئەسلەمی بوو ڕەزای خوای لێبێت، لەنێو کاروانێکدا بوو لەخزمەکانیدا، بانگیانی کرد بۆ ئیسلام وئەوانیش موسڵمان بوون [1].

ئیبنو حەجەری عەسقەلانیش دەگێڕێتەوە کە: پێغەمبەرﷺ لەڕێگای کۆچکردنیدا بۆ مەدینە، بورەیدەی کوڕی حوصەیبی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حارسی تووش بوو، بانگی کرد بۆ ئیسلام، بەشداری شانزە غەزای کردووە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ [2]، لەپاش ئەوە بورەیدە بوو بەیەکێك لەبانگخوازانی ئیسلام، خزمانیشی لەسەر دەستی ئەو ڕێنمونیان وەرگرت وبەرەو پیری ئیسلام هاتن، سەرفرازیش بوون بەوەرگرتنی نیشانەی پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((اسلم سالمها الله، وغفار غفر الله لها، اما انی لم اقلها ولكن قالها الله عزوجل)) [3] واتە: ئەسلەم خوا سەلامەتی بکات، غیفاریش خوا لێی خۆش بێت، من ئەم قسەم نەکردووە، بەڵکو خوای گەورە فەرموویەتی.

١٤- لەڕێگەی کۆچکردنەکە دوو دز لەسەر دەستی پێغەمبەرﷺ موسڵمان بوون، لەڕێگەی پێغەمبەرﷺ لەنزیك مەدینە تووشی دوو دز بوو، دوو ڕسواکەیان پێ دەوتن، ئیتر پێغەمبەرﷺ چووە لایان وداوای لێکردن موسڵمان بن، ئەوانیش

١- بڕوانە: الهجرة النبوية لأبي فارس ٥٩ شرح المواهب ٤٠٥/١.

٢- بڕوانە: الاصالة ١٤٦/١.

٣- صحيح الجامع الصغير ٣٢٨/١، رقم ٩٨٦ مسلم، واللفظ له، ورقمه ١٨٥_٢٥١٦.

موسڵمان بوون، ئینجا پرسیاری لێکردن دەربارەی ناویان، ووتیان: ئێمە دوو ڕسواکەین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵکو ئێوە دوو ڕێزلێگیراوەکەن، داواشی لێکردن بێنەلای بۆ مەدینە، [١] لەم هەواڵەدا گرنگیدانی پێغەمبەرﷺ بەبانگەواز دەردەکەوێت، چونکە لەڕێگادا ئەو هەلەی قۆستەوەو، ئەو دوو دزەی بانگ کرد بۆ ئیسلام وموسڵمان بوون، موسڵمان بوونی ئەم دوو دزەیش بەڵگەیە لەسەر خێرایی بە شوێنکەوتنی دڵەکان بەدوای هەقدا، ئەگەر ئەو دڵە یەکلا ببێتەوە بۆ وەرگرتنی ڕاستی، گۆڕینی ناوەکانیشیان لەلایەن پێغەمبەر ﷺ ، بەڵگەیە لەسەر بایەخدانی پێغەمبەر ﷺ بەناو بانگی موسڵمانان وڕاگرتنی هەستەکانیان وبەرزکردنەوەی ورەکانیان. ئەوەیش بەرزکردنەوەیەکە بۆ کەسایەتی، بۆ ئەوەی تواناکانی بەگڕبخات لەپێناوی چاکەدا . [٢]

١٥- چاوپێکەوتنی زوبەیرو تەڵحە ڕەزای خوایان لێبێت لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەڕێگای کۆچکردندا : هەروەها، یەکێك لەڕوداوەکانی ڕێگای مەدینە، ئەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ زوبەیری کوڕی عەووامی بینی لەڕێگا، لەنێو کاروانێکی موسڵماناندا کەچوو بوون بۆ بازرگانی بۆ شام، ئیتر زوبەیر هەندێ پۆشاکی سپی لەبەر پێغەمبەر ﷺ وئەبو بەکر کرد [٣]، هەروەها نوسەرانی سیرە گێڕاویانەتەوە، کەتووشی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلایش بوونە، کەلەشام دەگەڕایەوەو، هەندێك پۆشاکی پێدان . [٤]

١٦- گرنگی بیروباوەڕو ئایین لەنەهێشتنی کینەو دوژمنایەتی : بیروباوەڕی ڕاست وتەواو، بایەخێکی زۆری هەیە لەنەهێشتنی کینەو دوژمنایەتیدا، هەروەها لەئاشتبوونەوەی دڵەکاندا، ئەوەیش ڕۆڵێکە تەنها بیروباوەڕ دەتوانێت بیگێڕێت، ئاشکرایشە بیروباوەڕی ئیسلامی چۆن هەردوو هۆزی ئەوس وخەزرەج ی

---

١- الفتح الربانی للساعاتی ٢٠/٢٨٩ ورقمه في المسند_ط الرسالة _١٦٦٩١، واورده الهيثمي في المجمع ٥٨/٦، ٥٩ وقال: وابن سعد اسمه عبدالله ولم اعرفه، وبقية رجاله ثقات .

٢- بڕوانە: التاريخ الاسلامی للحمیدی ١٧٨/٣ .

٣- بڕوانە: السیرة النبویة لأبی شهبة ٤٩٥/١، البخاری ورقمه ٣٩٠٦ .

٤- السیرة النبویة لأبی شهبة ٤٩٥/١، صحیح السیرة النبویة ١٨١ .

کۆکردەوەو، شوێنەواری ئەو جەنگانەی نێوانیانی سڕییەوە کەچەندین ساڵ بەردەوام بوو، دۆستێی تۆڵەسەندنێکی زۆری لەنێوانیاندا داخست، لەماوەیەکی کەمدا، ئینجا بینیمان بیروباوەڕ چیکرد لەدڵ ودەرونی ئەنصارەکاندا، کەبەدڵێکی فراوانەوە پێشوازییان کرد لەبراکانیان، تاکو ئەمڕۆیش هەر ئەوان نموونەیەکی ناوازەو بێ وێنەن لەبرایەتیدا، ئالێرەشەوە پەی دەبەین بەهەوڵدانی دوژمنان بۆ لاوازکردنی بیروباوەڕ لەدڵی موسڵمانانداو، هەوڵدانی بێ وچانیان بۆ دروستکردنی دەمارگیری بۆ نیشتمان ورەگەزو شتی تر، لەجیاتی بیروباوەڕی ڕاست[1].

١٧- خۆشحاڵی موهاجیرین و ئەنصارەکان بەگەیشتنی پێغەمبەر ﷺ:

پێخۆشبوونی بڕواداران لەدانیشتوانی یەسریب بەئەنصارو موهاجیرەکانەوە، بەشێوازێك بوو کەئافرەت ومناڵەکانیش لەماڵەکانیان دەرچوو، پیاوەکانیش دەستیان لەکارەکانیان هەڵگرت، هەڵوێستی جولەکەکانیش بەشداریکردنی خۆشحاڵی خەڵکی مەدینە بوو بەڕواڵەت، بەڵام لەناخەوە ناڕەحەت بوون بەململانێی سەرکردایەتی تازە، خۆشحاڵی خەڵکی مەدینە بەچاوپێکەوتنی پێغەمبەرەکەیان کارێکی سەیر نەبوو، چونکە ئەو ڕزگاریکردن لەتاریکی بەرەو روناکی، هەروەها هەڵوێستی جولەکەکانیش هەر سەیر نەبوو، چونکە ئەوان کەبەدوو ڕوویی دەناسران، دەسەڵاتیان لێ وەرگیرایەوە لەسەر مەدینەو شوێنەکانی تر، ئەوان ماڵی خەڵکیان دەخوارد بەناو قەرز، خوێنیان دەڕشتن بەناو ئامۆژگاری وڕاوێژەوە، هەتاکو ئەمڕۆیش ئەوان ڕقیان لەهەرکەسێکە گەلان لەژێر ڕکێفیان دەربکات، بەڕق لێبونیش ناوەستن بەڵکو پیلانی بۆ دەگێڕن وڕەشە کوژی دەکەن ئەگەر بتوانن، ئەوە ئاییانەو، بەو شێوەیش ڕاهاتوون[2].

لەپێشوازیکردنی پێغەمبەریش ﷺ لەلایەن خەڵکی مەدینەوە ئەوە وەردەگیرێت، کەڕەوایە پێشوازیکردن لەسەرکردەو زانایان ودەربڕینی خۆشحاڵی بەهاتنیان، ڕێزلێنانی پێغەمبەر ﷺ هەڵقوڵاوی خۆشەویستی بوو، بەپێچەوانەی

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٤٠٥ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية للسباعى ٤٣، الهجرة في القران الكريم ٣٦٧ .

پێشوازیکردن لەسەرکردەکانی ئەم ڕۆژگارە لەجیهانی هاوچەرخدا، هەروەها ڕەوا بوونی کێبڕکێ لەچاکە لەو ڕوداوە وەردەگیردرێت، چونکە هەموو عەشیرەتێك پەرۆش بوو میوانداری بکات بەپێغەمبەرﷺ و، حەزیان دەکرد پاسەوانێتی بکەن .[1]

١٨- ڕوونبوونەوەی سوننەتی سەرکەوتنی پلە بەپلە: چونکە تێبینی دەکەین کەپێغەمبەری خوا ﷺ یەکەمین جارکە چاوی کەوتە ئەنصارەکان، تەنها هانی دان بۆ ئیسلام و،قورئانی بۆ خوێندنەوە، بەڵام کاتێك لەساڵی داهاتوودا هاتن، بەیعەتی ئافرەتانی لێوەرگرتن، لەسەر خوا پەرستن ورەوشتی چاکە، ساڵێك دوای ئەو بەیعەتەیش ئینجا بەیعەتی عەقەبەی دووەمی لێوەرگرتن لەسەر جیهادو پشتگیری کردن ودالدەدان .[2]

شایەنی باسیشە کەبەیعەتی شەڕکردن وەرنەگیرا دوای دوو ساڵ نەبێت، واتە پاش دووساڵ لەئامادەکردن، ئەم شێوازەیش دەگونجێت لەگەڵ ڕێبازی پەروەردەکردن کەبانگەواز لەسەری ڕۆیشت لەیەکەمین ڕۆژەوە .[3]

ئەوە ئەو ڕێبازە بوو کەخوای گەورە ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی کرد بۆی، لەبەیعەتی یەکەم ئەنصارەکان بەیعەتی دا لەسەر ئیسلام وەکو بیروباوەڕو پەروەردە، لە بەیعەتی دووەمیش ئەنصارەکان بەیعەتیاندا لەسەر پاراستنی بانگەوازو لەئامێزگرتنی کۆمەڵگەی ئیسلامی کەبەروبومەکانی پێگەیشتبوو، بنچینەو بنەماکانیشی پتەو بوو بوو .

ئەو دوو بەیعەتە تەواوکەری یەکبوون، لەنێو ڕێبازی پەروەردەیی بۆ بانگەوازی ئیسلامی، یەکەمیان ناوەڕۆکەکە بوو، دووەمیشیان پەیمانی جەنگ بوو، کەبریتی یە لەو پەرژینەی ناوەڕۆکەکە دەپارێزێت، بەڵێ، بەیعەتی شەڕکردن پاش دوو ساڵ بوو لەڕاگەیاندنی موسڵمانێتی نەك کتوپڕبووبێت .

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية لأبي فارس ٣٥٨، ٣٥٩ .

٢- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ٢٠٢ .

٣- بڕوانە: بناء المجتمع الاسلامي في عصر النبوة، محمد توفيق ١١٩ .

لەپاش دوو ساڵ ئامادەکردن، بوونە جێگای متمانەو شایستە بوون بۆ ئەو بەیعەتە، تێبینی ئەوەش دەکرێت کەئەوە یەکەم بەیعەت بوو لەموسڵمانێك وەربگیرێت، کاتێکیش بەئەنجام گەیشت بانگەوازی ئەو پشتیوانانەی دەست کەوت، لەو خاکەی کەتیایدا دەژیان، جێگای گونجاو بۆ دەرپەڕێنی جەنگاوەران، چونکە مەککە لەو سەردەمە بەهیچ شێوەیەك گونجاو نەبوو بۆ ئەو مەبەستە.[1]

سۆزی خوایش بەبەندەکانی ئەوەی ویست ((کەئەرکی جەنگ وایان لێنەکات جێگایەکیان نەبێت بۆ ئیسلام وەکو قەڵایەك هانای بۆ بهێنن، مەدینەیش ئەو جێگایە بوو بۆ ئیسلام ))[2]

بەیعەتی یەکەم لەسەر باوەڕ بوون بەخواو پێغەمبەر ﷺ بنیات نرا بوو، بەیعەتی دووەمیش لەسەر کۆچکردن وجیهاد، بەم سێ بنەمایە، باوەڕ بەخواو کۆچکردن و جیهاد، بوونی ئیسلام دێتە دی، کۆچکردنیش ئەنجام نەدەدرا ئەگەر دەستەیەك نەبوایە ئامادەبێت بۆ داڵدەدان، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴾ (الانفال:٧٥).

بەیعەتی شەڕکردنیش کۆتا ڕێخۆشکەربوو بۆ کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بۆ مەدینە، بەو شێوەیەش ئیسلام ئەو جێگای دەستکەوت کەبانگخوازانی ڕاستی وڕینمونیکردن لێوەی دەربچن، هەروەها هێزەکانی جیهاد بۆ یەکەمین جار بەڕێکەون ودەوڵەتی ئیسلام دامەزرا.[3]

١٩- کۆچکردن فیداکارییەکی مەزنە لەپێناو خوادا: کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بۆ مەدینە فیداکارییەکی گەورە بوو، پێغەمبەر ﷺ خۆی دەربارەی فەرموویەتی ((والله انك لخير ارض الله واحب ارض الله الى الله ولولا انى اخرجت منك

---

١- هەمان سەرچاوە ١٢٢، ١٢٣ .

٢- بڕوانە: فقة السيرة للبوطي ١٧٢ .

٣- بڕوانە: الغرباء الاولون ١٩٨، ١٩٩ .

ماخرجت))

لەعائیشەوە ڕەزای خوای لێبێت، فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەرﷺ هات بۆ مەدینە خاکێکی پڕ لەدەردو نەخۆشی بوو، دۆڵەکەشی ئاوێکی پیسی پیا دەڕۆیشت، بۆیە هاوەڵان تووشی نەخۆشی بوون، بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکە سەلامەت کرد، عائیشە دەڵێت: ئەبوبەکرو، عامیری کوڕی فوهەیرەو، بیلال لەیەك ماڵدا بوون، تووشی تایەکی زۆر بوون، منیش داوای مۆڵەتم کرد لەپێغەمبەرﷺ سەردانیان بکەم وئەویش ڕێگای دام، پێش ئەوەی کەئایەتی حیجاب دابەزیت، کەچووم لەحاڵێکی خراپدا ئەوانم بینی، لەئەبو بەکر نزیك بوومەوەو وتم: چۆنی باوەگیان؟ ووتی:

كل امرئ مصبح فى اهله      والموت ادنى من شراك نعله

واتە: هەمو کەسێك ڕۆژی لێدەبێتەوە لەماڵی خۆیدا، مردن لەپەتی نەعلەکەی نزیکترە لێی .

ووتم: سوێند بەخوا باوکم نازانێت چی دەڵێت، دەڵێت ئینجا لەعامیر نزیك بوومەوەو ووتم: ئەی عامیر چۆنی؟ ووتی:

لقد وجدت الموت قبل ذوقه      انه الجبان حتفه من فوقه

كل امرئ مجاهد بطوقـــــه      كالثور يحمى جلده بروقه

واتە: مردنم پێش بینینی چەشت، کەسی ترسنۆك مردنی لەسەرەوەی بۆ دێت، هەرکەسێك هەوڵدەدات بەگوێرەی توانای خۆی، وەکو گا پێستی بەشاخی دەخورێنێ.

دەڵێت: ووتم: سوێند بەخوا عامیر نازانێت چی دەڵێت، دەڵێت: بیلال کەتاکەی هەندێك باش دەبوو، لەناو حەوشەی ماڵەکەدا ڕادکشاو، دەیوت:

الا ليتَ شعرى هل ابيتنّ ليلة      بواد وحولى اذخر وجليـــل

وهل اردن يوماً مياه مجنّــة      وهل يبدون لى شامة وطفيل

واتە: شوێن وبازارو شاخەکانی مەککەی بەبیردا دەهات وسۆزی بۆیان دەجوڵا .

دەڵێت: منیش باسی ئەوەم کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ((اللهم حبب الينا المدينه، كما حببت الينا مكة، او اشد، وانقل حماها الى الجحفة، اللهم بارك لنا في مدنا وصاعنا)) [١]

واتــە: خوایــە مەدینــەمان لاخۆشەویــست بکــە، وەکــو چــۆن مەککــەت لامــان خۆشەویست کردو، زیاتر، نەخۆشیەکەشی بگوێزەرەوە بۆ جوحفە، خوایـە فراوانـی بخەرە پێوانەکانمانەوە. خوای گەورەیش پاڕانەوەی پێغەمبەرەکەی وەرگرت وئـەو نەخۆشیەیان لەناو دەرچوو، مەدینەیش بوو بەجێگایەکی چاك بـۆ هـەموو ئەوانـەی کۆچیان بۆ دەکرد لەهەموو لایەکەوە . [٢]

٢٠- خــەڵاتی پێغەمبــەرﷺ بـۆ ئوممومەعبــەد : دەگێڕنــەوە کەمــەڕەکانی زۆر بوونەتەوە، بەئەندازەیەك کەلێیانی هێناوە بۆ مەدینە، کوڕەکەی ئەبو بەکری بینـی وناسیەوە، ووتی: دایە ئەوە ئەو پیاوەیە کەلەگەڵ پیاوە پیرۆزەکـەدا بـوو، ئـەویش هەڵساو چووە لای‌و ووتی: ئـەی بەنـدەی خـوا ئـەو پیـاوە کـێ بـوو لەگەڵتـدا بـوو؟ ووتــی: بــۆ نازانیــت؟ ئــەوە پێغەمبــەری خــوا بــوو ﷺ و ئینجــا بــردی بــۆ لای، پێغەمبەریشﷺ خواردنی بۆ دروست کرد وخەڵاتی پێدا، لەڕیوایەتێکی تر هاتووە، لەگەڵمـدا هـات تـاکو چـووینە لای پێغەمبــەر ﷺ و هەنـدێك کەشـك‌و شـتی بیابـان نشینەکانی بەدیاری پێدا، ئـەویش پۆشـاك ودیـاری پێـدا، دەڵێـت: وا دەزانم ووتـی: موسـڵمانیش بـوو، خـاوەنی (الوفـاء)گێڕاوێتیـەوە کـەئوممو مەعبـەد ومێردەکـەی کۆچیان کرد وخونەیسی برای موسڵمان بوو، لەڕۆژی(فتح)یش دا شەهید بوو . [٣]

٢١- ئەبو ئـەییوبی ئەنـصاری ڕەزای خـوای لێبێـت وهەنـدێك هەڵوێـستی لـەیاد نەچوو : ئـەبوو ئـەییوب ڕەزای خـوای لێبێـت دەفـەرموێت: کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ هاتە ماڵمان هاتە نهۆمی خوارەوە، من ودایکی ئەییوبیش لەنهۆمی سەرەوە بـووین، پێم ووت: ئەی پێغەمبەری خوا_باوك ودایکم بـەقوربانت بێـت_ مـن پـێم ناخۆشـەو

---

١- البخاری، رقم (١٨٨٩)ومسلم (١٣٧٦) .

٢- بڕوانە: التربية القيادية ٢/٣١٠ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية لأبی شهبة ٤٨٩/١، ٤٩٠ .

قورسە بەلامەوە لەسەرەوەت بم و، تۆ لەخوارەوە بیت، بۆیە داواکارم بچیتە سەرەوە ئێمە بێینە خوارەوە، فەرمووی: ((یا ابا ایوب: ان ارفق بنا وبمن یغشانا ان نکون في سفل البیت)) واتە: ئەی ئەبو ئەییوب: باشترە بۆ ئێمە وئەوانەی دێنە لامان لەخوارەوە بین .

دەڵێت: ڕۆژێك گۆزەیەکی گەورەمان شکا ئاوی تیابوو، ئیتر من وئوم ئەییوب بەقەیفەیەك کەهەر ئەوەمان بوو خۆمانی پێدا بپۆشین دەستمان کرد بە وشك کردنەوەی ئاوەکەی بۆ ئەوەی تکەنەکاتە سەر پێغەمبەرﷺ و ناڕەحەتی بکات.[1]

٢٢- کۆچکردنی عەلی خوا لێی ڕازی بێت و فەرمانکردنی بەچاکەو قەدەغەکردنی لە خراپە لەکۆمەڵگای نوێ : لەپاش گێڕانەوەی ئەسپەردەکان بۆ خاوەنەکانیان لەمەککە، عەلی گەیشتە پێغەمبەر ﷺ پاش گەیشتنی بەقوبابە دوویان سێ شەو، ئیتر دوو شەو لەقوبا مایەوەو، ڕۆژی جومعە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەرچوو بۆ مەدینە .[2]

عەلی ڕەزای خوای لێبێت لەو ماوەی لە قوبا بوو، تێبینی کرد ئافرەتێکی بێوەژنی موسڵمان هەیە، هەموو شەوێك پیاوێك دێت لەدەرگایان دەدات وئەویش دێتە دەرەوەو، پیاوەکە شتێکی پێدەدات وئافرەتەکە لێی وەردەگرێت، دەڵێت: منیش کەوتمە گومانەوەو، بەئافرەتەکەم ووت: ئەو پیاوە کێیە هەموو شەوێك لەدەرگاکەت دەدا.....ووتی: ئەوە سەهلی کوڕی حونەیفە، دەزانێت من ئافرەتێکم کەسم نییە، کەشەو دێت هەڵدەکوتێتە سەر بتی خزمەکانی ودەیانشکێنێ ودەمداتێ وەکو سوتەمەنی، جا عەلی ڕەزای خوای لێبێت ئەوەی سەهلی لەبیر نەدەکرد تائەو کاتەی لەعێراق لەلای خۆی تیا چوو .[3]

٢٣- کۆچکردن وەرچەرخانێك بوو لەمێژووی ژیاندا: لەڕاستیدا ئەو کۆچە ڕوداوێکی مەزن بوو، ڕەوڕەوەی مێژووی بەجارێك گۆڕی، هەروەها کاروانی ژیان و

---

١- بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة للعمری ١/٢٢٠ .

٢- بڕوانە: السیرة النبویة أبی شهبة .

٣- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون ٢/٤٢١ .

بەرنامەکانی گۆڕی، کەخۆی دەبێتەوە لەیاساو داب ونەریت وڕەوشت وڕەفتاری تاك وکۆمەڵەکان هەروەها بیروباوەڕو پەرستنەکان وزانست و.....[١]

٢٤- کۆچکردن لەسوننەتی پێغەمبەرانە: کۆچکردن سوننەتێکی دێرینە، کۆچی پێغەمبەریشمان ﷺ داهێنراوێك نەبوو لەژیانی پێغەمبەراندا، ئەگەر لەنیشتمان وشوێنی لەدایکبوونیەوە کۆچی کردووە لەپێناو پاراستنی بانگەوازداو دۆزینەوەی کەشێکی گونجاو، کە بەرگری لێبکرێت، ئەوا ژمارەیەك لەبرا پێغەمبەرەکانی پێش خۆی کۆچیان کردووە ونیشتمانەکانیان بەجێهێشتووە لەبەر هەمان ئەو هۆیانە .

چونکە مانەوەی بانگەواز لەکەشێکی نالەباردا خزمەتی ناکات و، تەگەرەی بۆ دروست دەکات و، تووشی گرژبوونەوەی دەکات لەبازنەیەکی تەسکدا، قورئانیش باسی چەند نموونەیەکی بۆمان کردووە لەکۆچکردنی پێغەمبەران وشوێنکەوتوانیان لەنەتەوە ڕابوردوەکان، بۆ ئەوەی ڕێبازی خوای گەورەمان بۆ ڕونبێتەوە لەبواری بانگەوازداو، ببێتە پێشەنگیش بۆ هەموو خاوەن باوەڕێك دوای خۆیان دێت، کاتێك کەسێك سوکایەتی بەقەوارەو بوونی دەکات، دەستدرێژی دەکاتە سەر .[٢]

ئەمە چەند پەندو ئامۆژگارییەك بوو، خوێنەریش بەجێدەهێڵم خۆی پەندی تری لێدەربهێنێ و، سوودی لێوەربگرێت .

---

١- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون ٤٢٣/٢ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ١٧٥ .

## باسی دووەم: ستایش کردنی موهاجیرەکان و، هەڕەشەکردن لەدواکەوتوەکان.

کۆچکردن لەمەککەوە بۆ مەدینە، گرنگترین ڕوداوە لەمێژووی بانگەوازی ئیسلامیدا، چونکە خاڵێکی وەرچەرخان بوو لەمێژووی موسڵماناندا، موسڵمانان پێش ئەوەی کۆچبکەن ئوممەتی بانگەواز بوون، ئاینی خوایان دەگەیان بێ ئەوەی قەوارەیەکی سیاسیان هەبێت، بانگەواز بپارێزێت، یان بەرگریان لێبکات، بەڵام لەپاش کۆچکردن دەوڵەتی ئیسلام دروست بوو، کەبڵاوکردنەوەی ئیسلامی گرتە ئەستۆلە ناوەوەی دورگەو دەرەوەی، بانگخوازان دەردەچوون بۆ شارو شوێنەکان، دەوڵەتیش بەرگری لێدەکردن دژ بەهەر دەستدرێژییەك ئەگەر بەرپاکردنی جەنگیشی تیا بووایە .[1]

جگە لەوەش، کۆچکردن گرنگی خۆی هەیە لەپێگەیشتنی قورئان وزانستەکانی، چونکە زانایان جیاوازیان کردووە لەنێوان مەککی ومەدەنی، یەکەمیان ئەوەیە پێش کۆچکردن دابەزیوە، بالەدەرەوەی مەککەیش بێت، دووەمیشیان ئەوەیە کەدوای کۆچکردن دابەزیوە، بالەدەرەوەی مەدینەش بێت، بەپێی ئەوەش هەندێ سوود دروست دەبێت:

١- چەشتنی شێوازەکانی قورئان وسوود لێوەرگرتنی بۆ شێوازی بانگەواز کردن بۆ لای خوای پەروەردگار .

٢- حاڵی بوون لەژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ لەڕێگەی ئایەتە قورئانییەکانەوە.[2]

لەبەر گرنگی کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ ، دەبینین کەقورئانی پیرۆز هانی موسڵمانان دەدات لەسەر کۆچکردن لەپێناوی خوادا، بەشێوازی جیاجیا، جارێك بەستایشکردنی کۆچکردووان بەخەسڵەتی چاك، جارێکی تر بەهەڕەشە کردن لەدواکەوتوان لەکۆچ، یان بەڵێن پێدانی بەوانەی کۆچیان کردووە .[3]

---

١- بڕوانە: الهجرة النبوية، د.محمد ابو فارس ١٣ .

٢- بڕوانە: مباحث في علوم القران للقطان ٥٩ .

٣- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ٨٤ ئەم خاڵانەم لەئەم کتێبە وەرگرتووە بەدەستکارییەوە .

## یەکەم: وەسف کردنی موهاجیران بەخسڵەتی چاك .

**گرنگترین ئەو خسڵەتانەش موهاجیرەکان جیادەکاتەوە:**

**١- دڵسۆزی:**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ (الحشر:٨)، (( يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ))ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی ئەوان ماڵ وحاڵی خۆیان بەجێ نەهێشتووە ئەگەر لەبەر دڵسۆزی نەبێت بۆ خواو بەدوای ڕەزامەندی ئەودا نەچوبێتن .[١]

**٢- ئارامگرتن :**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ (النحل:٤١_٤٢).

**٣- ڕاستگۆیی :**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴾ (الحشر:٨).

بەغەوی لەتەفسیرەکەیدا دەڵێت: ((اولئك هم الصادقون))واتە: لەبیروباوەڕیاندا.[٢]

**٤- جیهادو قوربانیدان :**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ (التوبة:٢٠).

---

١- هەمان سەرچاوە ٨٦ .

٢- بڕوانە: تفسیر البغوی ٣١٨/٤ .

لەوانەش ئەو تێبینیەی پێویستە باسکرێت ئەوەیە بێت کەقوربانیدان هەمیشە لەگەڵ جیهاد باسکراوە، چونکە جیهاد نییە بەبێ قوربانیدان .[١]

**٥- پشتگیری کردنیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی :**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ (الحشر:٨).

**٦- پشتبەستن بەخوای گەورە :**

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ (النحل:٤٢).

**٧- ئومێد بوون بەخوا :**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ (البقرة:٢١٨).

(يرجون) وەکو ستایش‌و وەسفکردن هاتووە، چونکە کەس دڵنیا نییە لەوەی بچێتە بەهەشتەوە، هەر چەندە خوایشی پەرستبێت، لەبەر دوو هۆ: یەکەم نازانێت بەچی کۆتایی بە کردەوەکانی دەهێنرێت. دووەمیش نەوەکو پشت بەکردەوەکانی ببەستێت، ئەوانە خوای گەورە لێیان خۆش بووە، بەڵام هەر ئومێدەوارن بەخوای گەورە .[٢]

**٨- شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ لەناخۆشیدا :**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ

---

١- بڕوانە: الهجرة في القرآن الكريم ١٠٦ .

٢- الجامع لاحكام القران ٣/٥٠ تفسير ابى السعود ١/٢١٨ .

فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ (التوبة: ١١٧).

ئەم ئایەتەیش لەتەبوك دابەزی .

قەتاد دەڵێت: لەساڵی تەبوك، لەئەو پەڕی گەرمادا، دەرچوون بۆ شام، تووشی ئازارو ناڕەحەتیەکی زۆر بوون، تەنانەت پێمان گەیشتووە کەخورمایەکیان دەکردە دوو لەتەوە، یان چەند کەسێکیان پێکەوە خورمایەکیان لەنێو خۆیاندا دەگێڕا، دەیانمژی و، ئاویان لەسەری دەخوارد، خوای گەورەیش لێیان خۆش بوو و، گەڕاینەوە بەساغ وسەلامەتی .[1]

**٩- مافی پێشدانەوە لەبیروباوەڕدا، دەبێتە مایەی بە پێشەوا بوون وسەروەری :**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ (التوبة: ١٠٠).

ڕازی دەڵێت: پێشدانەوە دەبێتە مایەی چاکە، هەڵسانیشیان بەو کارانە، وادەکات ئەوانی تر پەیڕەویان بکەن بۆیە موهاجیرەکان سەرگەورەی موسڵمانانن .[2]

**١٠- سەرکەوتن :**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴾ (التوبة:٢٠).

ئەبو سعود لەتەفسیرەکەیدا دەڵێت: (هم الفائزون) واتە: تایبەتمەندن بەسەرکەوتنی گەورە یان ڕەها، وەکو ئەوەی سەرکەوتنی کەسانی تر لەچاو ئەوان سەرکەوتنی نەبێت .[3]

---

١- تفسير ابن كثير ٣٩٧/٢ .

٢- بڕوانە: تفسير الرازي ٢٠٨/١٥ .

٣- تفسير ابي السعود ٥٣/٤ .

**١١- باوەڕ :**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّاۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٞ وَرِزْقٞ كَرِيمٞ ﴾ (الانفال:٧٤) .

## دووەم: بەڵێن بەموهاجیران.

خـوای گـەورە باسـی هەنـدێك لـەو نیعمەتانـەی کـردووە کەبـەڵێنی داوە بەکۆچکردووەکان بیانداتێ لەدونیاو دوارِۆژدا، لەوانە:

**١- فراوانی ڕۆزی لەدونیادا :**

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ (النساء:١٠٠).

بۆ نموونە خوای گەورە ماڵی (فيء)ی بۆ تەرخان کردوون، چونکە لەماڵەکانیان دەرچوون وئەوان مافدارترن پێی .[١]

**٢- سڕینەوەی خراپەکان ولێخۆشبوونی گوناهەکان :**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٖۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٖ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ﴾ (آل عمران: ١٩٥).

چەندین فەرمودەیش هاتووە لەپێغەمبەر ﷺ باسی ئەوە دەکات کە کۆچکردن دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکان .

---

١- بڕوانە: تفسیر ابن کثیر ٤/٢٩٥، وتفسیر ابی السعود ٨/٢٢٨، وتفسیر فتح القدیر ٥/٢٠٠، والهجرة في القران الکریم لا،١٣٠ .

**٣- بەرزبوونەوەی پلەو پایەیان لەلای خوای پەروەردگار :**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ (التوبة:٢٠) .

ئەوانەی فەزڵی کۆچکردن وجیهادیان بەدەست هێنا، لەڕووی دەرونی ولەڕووی ماڵەوە، پلەو پایەو ڕێزیان زۆرترە لەکەسێك ئەوانەشی بەدەست هێنابێت. تەنانەت ئەوانەش هەڵدەستان بەئاودانی حاجیان وبۆژەن کردنەوەی ماڵی خوا .[١]

**٤- مژدەپێدانی بەهەشت وهەمیشە مانەوەیان تیایدا :**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ (التوبة:٢٠_٢٢).

ئەمە هەندێك بوو لەو بەڵێنانەی خوای گەورە بەموهاجیرانی داوە، بەهۆی چەشتنی تاڵیەکانی جیهادەوە .

هەمان ئەو کەسانەی کۆچیان کردووە لەمەککەوە، نەیانهێشت نەفامەکان بانگەواز ئیسلام زیندە بەچاڵ بکەن، کەهێشتا لەسەرەتای ژیانیدا بوو، ئەوان بەتوندی دەستیان گرتە قورئانەوە، ملهوڕی قورەیشیش زیاتر پەیوەستی دەکردن بەئیسلامەوە، کاتێك بتپەرستەکان زیادەڕەوییان کرد، موسڵمانان شایستەی نیعمەتەکانی خوای گەورە بوون لەدونیاو، پاداشتی گەورەیش لەدواڕۆژدا .[٢]

## سێیەم: هەڕەشە کردن لەوانەی دواکەوتن لەکۆچکردن.

یەکێ لەو سزایانەی خوای گەورە دایناوە بۆ ئەو کەسانە، دواڕۆژ خراپیە، پەنا بەخوا، وەکو فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ

---

١- تفسير المراغي ١٠/٧٨، تفسير الرازي ١٦/١٣، ١٤ .

٢- بڕوانە: هجرة الرسول وصحابته في القران والسنة للجمل ٣٣٢، ٣٣٣ .

﴿قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾ (النساء:٩٧) .

لەئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێت هاتووە کەفەرموویەتی: کەسانێك لەخەڵکی

مەککە، موسڵمان بوو بوون بەپەنهانی، بتپەرستەکانیش لەڕۆژی بەدردا ئەوانیان دەرکرد لەگەڵ خۆیان، جا تیریان بەردەکەوت ,هەندێك لەوانە بریندار دەبوون‌و هەندێکیشان دەکوژران، موسڵمانان دەیانوت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ﴾ ئیتر ئەوانیش ئەم ئایەتەیان نووسی ونادریان بۆ ئەو موسڵمانانەی لەمەککە ماونەتەوەو پاساویان نییە، دەڵێت: ئەوانیش لەمەککە دەرچوون وبتپەرستەکان بەدوایاندا ڕۆیشتن وئوانیش وایان پیشاندا کەبۆلای موسڵمانان ناچن‌وگەڕانەوەلەگەڵیان ئیتر ئەم ئایەتە لەسەریان دابەزی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ۚ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (العنكبوت:١٠).

کاتێك موسڵمانان ئەم ئایەتەیان بۆ ناردن، ئەوان بێ هیوا بوون لەهەموو چاکەیەك، دوایی خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (النحل:١١٠) [1]

خوای گەورە ناوی ئەو جۆرە کەسانەی بە(ستەم لە خۆکەر ) ناو بردووە، مەبەست لەستەمیش ئەوەیە ئەوانەی کەموسڵمان بوون هەر لەمەککە مانەوەو کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە، ستەمیان لەخۆیان کرد بەکۆچنەکردنیان.[2]

---

١- زاد المسير لابن الجوزي ٩٧/٢، تفسير القاسمي ٣٩٩/٣ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ١٦١.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا هەڕەشەی چارەنووسی خراپی هاتووە، بۆیە هاوەڵان پەیوەست بوون بەفەرمانی خوای گەورەوەو پەیوەندییان کرد بەکۆمەڵگای مەدینەوە وفەرمانی خوایان جێ بەجێ کرد، ئەم هەڕەشەیەیش کاریگەری خۆی بوو، لەدڵ ودەرونی هاوەڵاندا ڕەزای خوایان لێبێت، ئەوە زەمورەی کوڕی جوندوبە کاتی پێیگەیشت خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندووە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ (النساء:٩٧). خۆی لەمەککە بوو، بەکوڕەکانی ووت: هەڵمگرن من لەچەوساوەکان نیم، من ڕێگە دەناسم وئەمشەو لەمەککەدا بەسەر نابەم، ئیتر لەسەر جێگایەك هەڵیانگرت بەرەو مەدینە، پیاوێکی پیرو بەساڵاچوویش بوو، بۆیە لەڕێگاکە خەریك بوو بمرێت، دەستی ڕاستی دا بەدەستی چەپیداو، دەیوت: خوایەگیان ئەمە بۆ تۆیە وئەمەش بۆ پێغەمبەرەکەت، بەیعەتت پێ ئەدەم، لەسەر ئەوەی پێغەمبەرەکەت بەیعەتی وەرگرتووەو، ئینجا وەفاتی کرد، کاتێك هەواڵی مردنی گەیشتە هاوەڵان، ووتیان: خۆزگە لەمەدینە بمردایە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند [1]: ﴿إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ (النساء:٩٨_٩٩).

ئەم هەڵوێستە خێرایی جێبەجێکردنی فەرمانەکان پیشان دەدات لەنەوەی هاوەڵان، لەهەموو بارەکانی ژیانیاندا، هیچ کاتێك پاساویان نەدەهێنایەوە بۆ خۆیان.[2]

ئەم هاوەڵە_بەپێی هەندێك ڕیوایەت_ نەخۆش بوو،[3] بەڵام پێی وابوو مادام ئەوەندە ماڵی هەیە پشتی پێ ببەستێت وبتوانێت بگاتە مەدینە، ئەوا هیچ پاساوێکی نییە، ئەمە پێگەیشتنە پاڵنەرەکەی بیروباوەڕ بوو.[1]

---

١- روح المعانی ١٢٨/٥، ١٢٩ للالوسی، اسباب النزول للواحدی ١٨١ .

٢- بڕوانە: الهجرة النبوية المباركة ١٢٤ .

٣- هەمان سەرچاوە ١٢٥ .

پاش ئەوەی خوای گەورە هەڕەشەی کرد لەئەوانەی دواکەوتن لەکۆچکردن، ئەوانەی جیاکردەوە کەهیچ ڕێگە چارەیەکیان بۆ دەرچوون وبێ بەش بوونە لەژیانی (دار الاسلام) لەمەدینە، مەسەلەی ئەو جۆرە کەسانە لەپیرو پەککەوتەو ژن ومناڵ، هەڵواسراوە بەئومێدی خوای گەورە لەلێخۆشبوون لێیان بەهۆی پاساوەکانیان ونەتوانینیان بۆ خۆدەرباز کردن[٢]، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾(النساء:٩٨_٩٩).

١- هەمان سەرچاوە ١٢٦ .

٢- بڕوانە: الهجرة في القران الكريم ١٦٧ .

# بەشی حەوتەم

## کۆڵەکەکانی دەوڵەتی ئیسلام لەمەدینە

پێغەمبەرﷺ هەر لەسەرەتای گەیشتنی بەمەدینە، دەستی کرد بەقایمکردنی کۆڵەکەکانی دەوڵەتی نوێ، لەسەر هەندێك لەبنەماو بنچینەی پتەو، هەنگاوە سەرەتاکانیشی بەبایەخدان بەکۆڵەکەی ئوممەت دەستی پێکرد، وەکو دروستکردنی مزگەوتی گەورە لەمەدینەو، چەسپاندنی برایەتی لەنێو موهاجیران وئەنصارەکان لەسەر بنەمای خۆشەویستی لەپێناو خوادا، هەروەها دەرکردنی صحیفە، یان دەستوری ئیسلامی لەمەدینە، کەپەیوەندی نێوان موسڵمانان لەگەڵ جولەکەو بتپەرستان لەمەدینە ڕێکدەخات و، ئامادەکردنی سوپا بۆ پاراستنی دەوڵەت و، هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی وکارکردن لەپێناو چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کۆمەڵگای تازەو، پەروەردەکردنی لەسەر ڕێبازی خوایی لەهەموو کاروبارەکانی ژیاندا، بنیاتنانی پەروەردەیی وفێرکردن هەر بەردەوام بوو، قورئانیش لەو سەردەمەدا هەر باسی مەزنی خوای گەورەو، ڕاستی گەردون و، بەهەشت و دۆزەخ و، حوکمە شەرعییەکانی دەکرد .

کاروانی زانستی وپەروەردەیی ئوممەتیش گەشەی دەکرد لەگەڵ پێشکەوتنی قۆناغەکانی پەروەردەو دروستکردنی کۆمەڵگاو دامەزراندنی دەوڵەت .

ئینجا پێغەمبەرﷺ هەڵسا بەچارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری لەمەدینە لەڕێگەی ڕێبازی خوایی و، پەروەردەکردنیش هەر بەردەوام بوو، ئینجا ڕۆژو وزەکات فەرز کرا، کۆمەڵگایش گەشەی دەکرد ودەوڵەت بەهێز دەبوو لەسەر بنەماگەلێکی بەهێزو جێگیر .

# باسی یەکەم

## کۆڵەکەی یەکەم: دروستکردنی مزگەوت لەمەدینە.

((یەکەمین کار کەپێغەمبەر ﷺ ئەنجامیدا لەمەدینە دروستکردنی مزگەوت بوو، بۆ ئەوەی دروشمەکانی ئیسلام تیایدا دەرکەوێت ونوێژەکانی تیا بکرێت ودڵەکان پاك بکاتەوە لەپیسی سەر زەوی وچەپەڵی ژیانی دونیا))[1]

بوخاری بەسەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ کاتێك چووەتە مەدینە بەسواری وشترەکەی، ڕێی دەکردو خەڵکیش لەگەڵیدا ڕێیان دەکرد، تاکو وشترەکەی لەلای مزگەوتەکەدا چۆکی دادا، لەوکاتەدا کەسانێك نوێژیان دەکرد لەناو مزگەوتەکەدا، کەخۆی شوێنی خورماو وشککردنەوە بوو، موڵکی دوو لاوی هەتیو بوو بەناوی سەهل وسوهەیل لەپەنای ئەسعەدی کوڕی زورارە دەژیان، کاتێك وشترەکە چۆکی دادا لەوێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هذا ان شاء الله المنزل)) واتە: ئەمە جێگای دابەزین دەبێت بەویستی خوا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بانگی ئەو دوو لاوەی کردو، سەودای لەگەڵ کردن بۆ ئەوەی مزگەوتێکی لەسەر دروست بکات، وتیان: نەخێر، بەڵکو دەیبەخشین پێت ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو بەدیاری وەریبگرێت لێیان، تاکو لێیانی کڕی .[2]

لە ڕیوایەتی ئەنەسی کوڕی مالیکیش دا هاتووە: کە دارخورما و گۆڕی بتپەرستان و کەلاوەی تیابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەبڕینی دارخورماکان و، تەختکردنی گۆڕەکان ولابردنی کەلاوەکان، دەڵێت: لە لای قیبلەوە دارخوارماکانیان ڕیز کرد ,لاکانیشیان بە بەرد هەڵچنی، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان بوو، ئەوانیش لەشێوەی هەلبەستدا دەیانوت :

اللهم!انة لاخير الا خير الاخرة فانصر الانصار والمهاجرة .[3]

واتە:خوایە ! چاکە هەر چاکەی دواڕۆژە، خوایە ئەنصارو موهاجیران سەرخەیت.

---

١- بڕوانە: فقه السيرة للغزالى ١٩١ وفقه السيرة للبوطي ٥١ بەدەستکارییەوە .

٢- البخارى: كتاب مناقب الانصار، باب هجرة النبي ﷺ واصحابه الى المدينة ورقمه ٣٩٠٦ .

٣- مسلم، كتاب المساجد، باب ابتناء مسجد النبى ﷺ ورقمه ٥٢٤ .

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا کاری دەکرد، یەکەمین پاچیشی بۆ هەڵکەندنی بنچینەکە وەشاند کەسێ باڵ قووڵ بوو، دوای ئەوە موسڵمان دەستیان کردە دروستکردنی ئەو بنچینەیە بەبەرد، دیوارەکانیشی کەکەمێك لەبالای پیاو بەرزتر بوو، بەخشتی قوڕ دروست کرا [١]، لەلای باکوریشەوە سێبەرێك لەگەلای دارخورما دروست کرا خرایە سەر داری دارخورما، پێی دەوترا صوففە، بەڵام بەشەکانی تری مزگەوتەکە هەر بەکراوەیی مایەوە [٢].

سێ دەرگایشی هەبوو: یەکەمیان لەکۆتایی لای باشورەوە، دەرگایەکیش لەلای ڕۆژ هەڵاتەوە، پێغەمبەر ﷺ لێی دەهاتە ژورەوە لەلایماڵەکەی عائیشەوە، دەرگایەکیش لەلای ڕۆژ ئاواوە، دەرگای ڕەحمەی پێ دەوترا، یان دەرگای عاتیکە. [٣]

**یەکەم: ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بەدەوری مزگەوتەکەدا .**

هەندێ ژور بەدەوری مزگەوتەکەدا دروست کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ وخێزانەکانی، ماڵەکانیشی وەکو ماڵی پادشاو قەیصەرەکان نەبوو، بەڵکو ماڵی کەسێك بوو هیچ بایەخێك نەدات بەدونیاو خۆشیەکانی، ماڵەکانی هەروەکو مزگەوتەکەی لە خشت و قوڕو بەرد دروستکرا بوو، سابیتەکانیشی لەدارخورماو گەڵاکانی، ڕوبەرەکانیشی کەم بوو، دیواری حەوشەکەی ئەوەندە نزم بوو گەنجێکی بالا بەرز دەستی پێدەگەیشت، حەسەنی بەصری_لاوێك بوو لەگەڵ خەیرەی دایکی کەکەنیزەکی ئوممو سەلەمە بوو_ دەڵێت: ((دەستم دەگەیشتە سابیتەی هەندێ لەژورەکانی پێغەمبەر ﷺ )) [٤]

خانووەکانی پێغەمبەرﷺبەو شێوە سادە بوو،لەکاتێکدا مەدینە ناوبانگی هەبوو لە قەڵای بەرزدا، کە پیاو ماقووڵانی تیا دەژیا، وەکو خۆهەڵنان لەکاتی ئاشتی و

---

١– بڕوانە: البداية والنهاية ٣/٣٠٣، التاريخ السياسي والعسكري لدولة المدينة، د.علي معطي ١٥٦ .

٢– بڕوانە: البداية والنهاية ٣/٣٠٣، محمد رسول الله ﷺ لمحمد رضا ١٤٣ .

٣– بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري لدولة المدينة، د. علي معطي ١٥٧ .

٤– بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة ٢/٣٦ .

خۆپاراستن لەکاتی شەڕ، ئەوەندەش شانازییان پێوەی دەکرد ناویان دەنا، وەکو چۆن تەلاری عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەللول ناوی موزاحیم بوو، هەروەها تەلاری حەسانی کوڕی سابیتیش ناوی فاریع بوو .

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکانی بەو شێوە سادە بوو، دەیشیتوانی بۆ خۆی کۆشکی بەرز وخۆش دروست بکات، ئەگەر تەنها ئاماژەیەکی بکردایە، ئەنصارەکان بۆیان دروست دەکرد، یان دەیتوانی لەماڵە گشتی یەکانی داهات دروستی بکردایە، بەڵام ئەوەی نەکرد بۆ ئەوەی ببێتە نموونەیەکی بەرزو، پێشەنگێکی مەزن لەخۆ بەکەمزانین ودونیا بەکەم گرتن، هەموو توانایەکیشی کۆ دەکردەوە بۆ کارکردن بۆ دوای مردن .[1]

### دووەم: بانگدان لەمەدینە.

پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بەڕاوێژکردن لەگەڵ هاوەڵانی بۆ دۆزینەوەی کارێك خەوتوو ئاگا بکاتەوەو، بێ ئاگا وریا بکاتەوەو، خەڵکی ئاگادار بکاتەوە بەکاتی نوێژەکان، هەندێکیان ووتیان: ئالایەك بەرزبکرێتەوە لەکاتی نوێژەکان بۆ ئەوەی خەڵکی بیبینن، ئەمەیش ڕەخنەی لێگیرا بەوەی کەخەوتوو هەڵناستێت، بێ ئاگایش ئاگادار ناکاتەوە، هەندێکی تر ووتیان: ئاگرێك دەکەینەوە لەسەر بەرزاییەك، ئەم بۆ چوونەیش هەر ڕەتکرایەوە، هەندێکیشیان ئاماژەیان کرد بۆ شەیپور (ئەویش ئەوە بوو لەجولەکەکان بەکاریان دەهێنا بۆ نوێژەکانیان) بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێی باش نەبوو چونکە پێی خۆش بوو جیاوازی بکات لەگەڵ کردەوەکانی ئەهلی کیتابدا، هەندێ تریان ئاماژەیان کرد بۆ زەنگ (وەکو گاورەکان) پێغەمبەر ﷺ بەهەمان شێوە ئەمەشی پێ باش نەبوو، هەندێکی تر پێیان باش بوو لەکاتی نوێژەکاندا بانگ بکرێت بۆ نوێژ، ئەم بۆ چوونە قبوڵ کرا، یەکێك لەبانگدەرەکانیش عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری بوو، جارێکیان لەنێوان خەوو ئاگابووندا بوو، کەسێك پێی ووت: ئایا فێری چەند وشەیەکت بکەم بیڵێیت لەکاتی نوێژەکاندا؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: بڵێ ((الله اکبر)) دووجار، شایەتمانیش بهێنە دووجار، دوای ئەوە بڵێ: (حي

---

[1] - بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدى ١٣/٤ .

على الصلاة) دووجار، ئینجا بڵێ (حي على الفلاح) دووجار، دوای ئەوەش دووجار بڵێ (اللـەاكبر)و دواتر بڵێ (لاإلـه الا اللـه)، کاتێك ئاگاداربوویەوە، چووە لای پێغەمبەرﷺ و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((انها لرؤيا حق)) واتە: ئەوە خەوێکی ڕاستە، دوای ئەوە فەرمووی: ((لقن بلالاً فانـه اندی صوتاً منك)) واتە: ئەوە بخەرە سەر زمانی بیلال چونکە دەنگی لەتۆ خۆشترە، لەکاتێك بیلال بانگی دەدا بەم وشانە، عومەری کوڕی خەتتاب هات وکراسەکەی دەکردە کێش، ووتی: سوێند بەخوا ئەم ووشانەم بینیوە لەخەونمدا، بیلال یەکێ بوو لەبانگدەران لەمەدینە، ئەوەکەی تریش عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم بوو، بیلال لەپاش (حي على الفلاح) لەنوێژی بەیانیدا دەیوت: ((الصلاة خير من النوم)) پێغەمبەریش ﷺ قایل بوو لەسەر ئەوە [١]، سەرەتایش لەجێگایەکی بەرزەوە بانگی دەدا، بەڵام دواتر منارەیان داهێنا .

**سێیەم: یەکەمین ووتاری پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە.**

یەکەمین ووتاری پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو سوپاسی خوای کردو ستایشی کرد بەوەی کەشایستەیەتی وئینجا فەرمووی: ((اما بعد: ايها الناس فقدموا لانفسكم، تعلمن والله ليصعقن احدكم، ثم ليدعن غنمه ليس لها راع،ثم ليقولن له ربه، وليس له ترجمان، ولا حاجب يحجبه دونـه: الم يأتـك رسـولى فبلغـك؟!وآتيتـك مالاً,وافضلت عليك,فما قدّمت لنفسك؟فلينظرن يميناً,وشمالا,فلا يرى غير جهنّم,فمن استطاع ان يقي وجهه من النار ولو بشق تمرة فليفعل ,ومن لم يجد, فبكلمة طيّبة,فان بها تجزى الحسنة عشر امثالها ,الى سبعمئة ضعف والسلام عليكم ورحمة الله)) واتە: ئەی خەڵکینە، کاری چاکە بخەنە پێش خۆتان، کەسێك لەئێوە چاك دەزانێ مردنی لەڕێدایەو، ئینجا مەڕەکانی بەبێ شوان بەجێدەهێڵێت، دوای ئەوە خوای گەورە بەبێ ئەوەی وەرگێڕێك لەنێوانیدا هەبێت، یان پاسەوانێك بپارێزێت، پێی دەفەرموێت: ئایا پێغەمبەرەکەم نەهاتە لات وئاگاداری نەکردیتەوە، ئایاماڵم پێ نەدایت و، چاکەم لەگەڵدا نەکردی، ئەی تۆ چیت لەپێش خۆتەوە نارد؟ یەکێك

---

١- بڕوانە: نور اليقين للخضرى، تحقيق احمد عبداللطيف ٩٥، وتاريخ خليفة بن خياط ٥٦ نقلا عن تاريخ دولة الاسلام الاولى د. فايد حماد عاشور، سليمان ابو عزب ١٠٨ .

لەئێوە بەلای ڕاست وچەپیدا تەماشا دەکات وهیچ نابینێت، ئینجا تەماشای پێشەوەی خۆی دەکات دۆزەخ نەبێت هیچ نابینێت، جائەگەر کەسێك لەئێوە توانی ڕومەتی خۆی لەئاگر بپارێزێت، ئەگەر بەلەتە خورمایەکیش بێت، بابیکات، ئەگەر کەسێکیش هیچی لەژێر دەستدا نەبوو، بابە قسەیەکی باش ئەوە بکات، چونکە چاکەیەك بەدەبەرانبەرە تاکو حەوت سەد بەرانبەر ((والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته)) .

جارێکی تر تاریکی تری وتەوە ئەمە واتاکەیەتی :

((سوپاس وستایش بۆ خوای گەورە وپشتی پێدەبەستم، پەنایش دەگرم بە خوای گەورە لەخراپیەکانی درون وکردەوەکانمان، هەرکەسێك خوای گەورە ڕێنمویی بکات کەس ناتوانێت گومڕای بکات، هەرکەسێکیش گومڕا بکات، کەس ناتوانێت ڕێنمونی بکات، شایەتیش دەدەم کەهیچ خوایەك نییە جگە لەخوای بێ هاوتا نەبێت، باشترین قسە کیتابی خوای گەورەیە، سەرفرازە ئەو کەسەی خوای گەورە لەدڵیدا ڕازاندویەتیەوەو هێناوێتیەوە نێو ئیسلامەوە لەپاش بێباوەڕی، هەڵیشیبژاردووە لەسەر هەموو قسەیەك لەقسەکانی خەڵکی، قورئان چاکترین و بەهێزترین وتەیە، هەرکەسێك خوای خۆشدەوێت ئێوەیش خۆشتان بوێت، خواتان لەهەموو دڵتانەوە خۆش بوێت، بێزاریش مەبن لەقسەی خوای گەورەو یادکردنەوەی، دڵەکانتانیش باڕەق نەبێت لەبەرانبەری، چونکە خوای گەورە لەهەموو دروستکراوەکانی، تیایاندا هەڵدەبژێرێت، خوای گەورەیش چاکترین کردەوەی دەستنیشان کردووەو، چاکترین بەندەی هەڵبژاردووە وهەروەها چاکترین قسەیش، حەڵاڵ وحەرامیشی دیاری کردووە، ئێوەیش خوای گەورە بپەرستن و هاوتای بۆ بڕیار مەدەن وبەڕاستی لێی بترسن، لەگەڵ خوایش ڕاست بکەن لەوەی کەلەزارتانەوە دەردەچێت وبەناوی خواوە یەکترتان خۆش بوێت، خوای گەورەیش ڕقی دەبێتەوە لەوەی پەیمانەکانی بشکێنرێت، (والسلام عليكم) .[1]

---

١– وشەکانی ئەم دوو ووتارە بەم شێوە هاتووە لە(ابن اسحق) بڕوانە (السيرة النبوية لابن هشام) ق١/٥٠١، ٥٠٢ ، هەروەها بڕوانە: لێکدانەوەی پێشەوا سوهەیلی بۆ هەندێ ووشەکانی ووتارەکە بۆ ئەوەی بەباشی لێی حاڵی ببێت (الروض الانف ٢/٢٥٠ .

**چوارەم: صوففەی پاشكوی مزگەوتی مەدينە.**

كاتێك قيبلـە گـۆڕدرا لەبەيتولمەقديـسەوە بـەرەو كەعبـەی پلـەو پايەبـەرز بەفـەرمانی خـوای گـەورە، لـەپاش شـانزە مـانگ لەكۆچـكردنی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدينە، [١] بەڵام ديواری قيبلـەی يەكـەم جـار لـەكۆتايی مزگەوتەكـەوە هەرمايـەوە، سێبەری بۆ دروستكرا، يـان سـابيتەی بـۆ كـراو، نـاونرا (الـصفّة)يـان(الظلـة) [٢] هـيچ دەورو بەريشی دانەدە پۆشی . [٣]

قازی عەيياز دەڵێت: صوففە سێبەرێك بوو لەكۆتايی مزگەوتەكەی پێغەمبەرﷺ هەژاران پەنايان بۆی دەبرد، ئەهلی صوففەيش هەربـەوە ناسـران [٤] ئيبنـو تەيمييـە دەڵێـت: صـوففە لـەكۆتايی مزگـەوتی پێغەمبـەر ﷺ دابـوو، لـەباكوری مزگـەوتی مەدينە. [٥]

ئيبنـو حەجـەريش دەڵێـت: صـوففە لـەكۆتايی مزگـەوتی پێغەمبـەر ﷺ بـوو، كەپرێك بوو بۆ ئەو بێگانانەی جێگای كەس وكاريان نييە . [٦]

**١ـ ئەهلی صوففە:**

ئەبو هورەيرە دەفەرموێت: (ئەهلی صـوففە ميوانانی ئيسلام بـوون، نەدەچـوونە لای ماڵ وخێزان وكەسەوە) [٧]

ئەو موهاجيرانەی پێش پێغەمبەر ﷺ ، يان لەگەڵ خۆی كۆچيان كرد تاكۆتـايی مـاوەی يەكـەم پـێش غـەزای بـەدر، ئەنـصارەكان توانيـان لەماڵـەكانی خۆيـان ميواندارييان پێبكەن وخەرجيەكانيان دابەش بكـەن لەگـەڵيان، بـەڵام لـەپاش ئـەوە ژمارەی موهاجيران زۆر بوويەوە وئەنصارەكان توانايان نەما بيانگرنە خۆيان . [٨]

---

١– بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمری، ٢٥٧/١ .

٢– بڕوانە: وفاء الوفا للسمهودی ٣٢١/١ .

٣– بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ٢٥٨/١ .

٤– بڕوانە: نظام الحكومة النبوية المسمی: التراتيب الادارية، لعبد الحی الكتانی ٤٧٤/١ .

٥– الفتاوی: ٣٨/١١ .

٦– بڕوانە: فتح الباری ٥٣٥/١، ٥٩٥/٦ .

٧– البخاری، رقم ٦٤٥٢ .

٨– بڕوانە: السيرة النبوية تربية امة وبناء دولة للشامی ١٧٥ .

چونکە ((موهاجیران ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادیان دەکردو، ئیسلام بڵاو دەبوویەوەو، خەڵکی تازە موسڵمان دەبوون، نەدارو دەوڵەمەندو خێزاندارو ڕەبەن بەزۆری کۆچیان دەکرد بۆ مەدینە ولەتوانای ئەنصارەکان نەما داڵدەیان بدەن، کەسێکیش شوێنێکی دەست نەکەوتایە دەچووە صوففە لەمزگەوتەکەدا)) [1]

وایش دەردەکەوێت کەکۆچبار یەکەمین جار دەهاتە مەدینە چاوی دەکەوتە پێغەمبەر ﷺ و ئەویش ئاراستەی شوێنێکی دەکرد بۆ داڵدەدانی، ئەگەر کەسێکی لەو جۆرە نەبوایە، بەشێوەکی کاتی لەصوففە جێگیر دەبوو، تاکو ڕێگایەك بدۆزرایەتەوە . [2]

لەموسنەددا ڕیوایەت کراوە لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە فەرموویەتی:

کاتێك کەسێك کۆچی دەکرد، دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش دەینارده لای کەسێکمان فێری قورئانی بکەین، جارێك پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی ناردە لام، لەگەڵمدا دەبوو، لەشێوەی ماڵ ومنداڵەکەی خۆمم پێدەداو، قورئانم پێی دەخوێند، [3] یەکەمین کەسانێکیش چوونە صوففە موهاجیرەکان بوون، [4] بۆیە هەر بەئەوانەوە ناسراو پێی دەوترا صوففەی موهاجیرەکان. [5]

هەروەها ئەو نێردانەی دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ موسڵمانێتی خۆیان ڕادەگەیاند بەهەمان شێوە دەچوونە ئەو شوێنە، [6] ئەگەر کەسێك بهاتایەتە لای پێغەمبەر ﷺ و ناسراوێکی بوایە دەچووە لای، ئەگەر کەسی نەبوایە دەچووە لای ئەهلی صوففە، [7] ئەبو هورەیرە هەموو جێگیر بوانی صوففەی دەناسی، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بیویستبا بانگی بکردنایە، بەئەبو هورەیرەی دەوت، چونکە ئەو

١- الفتاوی: ١١/٤٠، ٤١ .

٢- بروانە: السیرة النبویة تربیة امة وبناء دولة للشامی ١٧٥ .

٣- المسند: ٥/٣٢٤ .

٤- بروانە: وفاء الوفا للسمهودی ١/٣٢٣ .

٥- سنن ابی داود ٢/٣٦١ .

٦- بروانە: السیرة النبویة الصحیحة ١/٢٥٨ .

٧- هەمان سەرچاوە ١/٢٥٩ .

دەیناسین وئاگاداری پلەو پایەکانیان بوو لەجیهادو خوا پەرستندا،[١] هەندێك لەئەنصارەکانیش هەر چوونە صوففە چونکە ئارەزوویان بوو گوێ بەدونیا نەدەن ولەوێ بژین، لەکاتێکدا ناچاری ئەوەش نەبوون ومالّیان لەمەدینە بوو، وەکو کەعبی کوڕی مالیکی ئەنصاری وحەنزەلەی کوڕی ئەبو عامیری ئەنصاری (شۆردراوی فریشتەکان)و، حاریسەی کوڕی نوعمانی ئەنصاری وکەسانی تر .[٢]

**٢- خەرجی ئەهلی صوففەو بایەخپێدانیان لەلایەن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانەوە:**

پێغەمبەر ﷺ بەخۆی ئەوانی بەسەر دەکردەوەو سەردانی نەخۆشەکانیانی دەکرد، زۆر جاریش لەگەڵیان دادەنیشت، ئامۆژگاری ودڵنەوایی وبیرخستنەوەو ئاڕاستەی دەکردن بۆ خوێندنەوەی قورئان ویادکردنی خواو چاوبڕینە ڕۆژی دوایی،[٣] پێغەمبەر ﷺ خەرجی ئەوانی دەستەبەر دەکرد بەچەندین ڕێگە، لەوانە:

أ- ئەگەر صەدەقەی بۆ بهاتبا، دەینارد بۆ ئەوان بێ ئەوەی خۆی هیچی لێوەرگرێت، بەڵام ئەگەر دیاری بۆ بهاتبا دەینارد بۆ ئەوان وخۆیشی لێی دەبرد .

ب- زۆر جار لێیانی بانگ دەکرد بۆ نان خواردن لەیەکێك لەماڵەکانی دایکانی بڕواداران ڕەزای خوایان لێبێت، هیچ کاتێکیش بێ ئاگا نەدەبوو لێیان، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت و ووتویەتی: ئەوانەی لەصوففە بوون خەڵکانێکی هەژاربوون، جارێك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((من كان عنده طعام اثنين فليذهب بثالث، ومن كان عنده طعام اربعة فليذهب بخامس او سادس _او كما قال_ وان ابابكر جاء بثلاثة و، ثێغەمبەر ﷺ دەکەسی بردەوە....)).[٤]

واتە: هەرکەسێك خواردنی دوو کەسی هەیە یەکێك لەگەڵ خۆی ببات، هەرکەسێك خواردنی چوارکەسی هەیە بایەکێك یان دوو کەس لەگەڵ خۆی ببات،

---

١- هەمان سەرچاوە .

٢- هەمان سەرچاوە .

٣- هەمان سەرچاوە ٢٦٦/١ .

٤- البخاری برقم ٣٥٨١، واللفظ له، ومسلم برقم ٢٠٥٧ .

جائەبوبەکر سێ کەسی هێنایەوەو، پێغەمبەر ﷺ دەکەسی بردەوە...

ج- ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێویستیەکانی ئەوانی دەخستە پێش پێویستیەکانیتر، جارێکیان کۆیلەیان هێنا، فاتیمە ڕەزای خوای لێبێت، داوای خزمەتکارێکی لێکرد، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((سوێند بەخوا هیچتان پێنادەم وئەوانەی لەصوففەن هیچیان نییە بیخۆن، بەڵکو دەیانفرۆشم ونرخەکەیان خەرج دەکەمە سەر ئەواندا .[1]

**٣- لێبڕانی ئەوان بۆ خوا پەرستن وجیهاد :**

ئەوان خەریکی خواپەرستن بوون لەمزگەوتداو، ڕاهاتبوون لەگەڵ هەژاری ودونیا بەکەم زانیندا، لەخەڵوەتەکانیاندا نوێژیان دەکرد وقورئانیان دەخوێندو ئایەتەکانیان لێکدەدایەوەو یادی خوایان دەکرد، هەندێکیشیان فێری نووسین دەبوون، تەنانەت یەکێکیان کەوانەکەی خۆی پێشکەش کردە عوبادەی کوڕی صامیت ڕەزای خوای لێبێت چونکە فێری قورئان ونووسینی دەکردن،[2] خەڵکی صوففە بەشداریان دەکرد لەجیهاددا، بەڵکو شەهیدیشیان هەبوو، ئەوان خواپەرستی شەوو سوارچاکی ڕۆژ بوون.[3] هەندێ لەهاوەڵانیش خۆیان ژیانی ئەو شوێنەیان هەڵبژاردبوو، نەك لەڕووی ناچارییەوە، وەکو ئەبو هورەیرە، ڕەزای خوای لێبێت، حەزی دەکرد وابەستەی پێغەمبەربێت ﷺ قەرەبووی ئەو زانست وچاکە بکات کەلەدەستی دەرچووە، ئەمەیش بەدیانیەت ئەگەر بەو شێوە نزیك نەبێت لەماڵی پێغەمبەر ﷺ ، ئەبو هورەیرە دەڵێت: ((ئێوە دەڵێن ئەبو هورەیرە فەرموودە زۆر دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەر ﷺ ، دەیشڵێن: بۆچی موهاجیرو ئەنصارەکان ئەوەندە فەرمودە ناگێڕنەوە وەکو ئەبو هورەیرە، برا موهاجیرەکانم سەرقاڵی بازرگانی بوون لەبازاڕەکاندا، بەڵام من هەمیشە لەگەڵ پێغەمبەر بووم ﷺ، بەنانەسك، حازر دەبووم کەئەوان دوادەکەوتن، ئەگەر ئەوان لەبیریان بچوبا من لەبەرم بوو، هەروەها برا ئەنصارەکانیشم سەرقاڵی ماڵەکانیان بوون، منیش کەسێك بووم لەهەژارانی صوففە، ئەگەر ئەوان بیریان بچوایە من لەبیرم دەما)).[4]

---

١- اصل الحديث في البخاري برقم ٣١١٣، وهذا لفظ المسند ١٠٦/١ برقم ٨٣٨ .

٢- سنن ابى داود: ٢٣٧/٢، وابن ماجه: ٧٣٠/٢ .

٣- السيرة النبوية الصحيحة ٢٦٤/١ .

٤- البخارى رقم ٢٠٤٧ واللفظ له، مسلم رقم ٢٤٩٢ .

بەم شێوە ڕەزای خوای لێبێت ڕوونیدەکاتەوە کە ئەو لەپێناو ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەردا بێت ﷺ ئەو کارەی کردووە، چونکە ئەبو هورەیرە ماڵی هەبوو لەمەدینە، ئەو جێگایە بوو کەدایکی تیایدا دەژیا، کەداواشی کرد لەپێغەمبەر ﷺ خوا ڕێگای ئیسلامی پێ پیشان بدات [١]، ئینجا ئەبو هورەیرە هەژار نەبوو، یەکەمینی ڕۆژ کە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ لەخەیبەر پشکی لەدەستکەوتەکان بۆ دەسنیشان کردو کۆیەلەیەکیشی لەگەڵدا بوو خزمەتی دەکرد .[٢]

کەواتە ئەوەی کەئەبو هورەیرەی هەژار کرد پەیوەست بوونی بوو بەپێغەمبەرﷺ و گوێگرتنی لەفەرموودەکانی، دەشیتوانی پێویستی نەبێت بەمانەوە لەصوففە ئەگەر بیویستبا .[٣]

خەڵکی صوففە زیادو کەمیان دەکرد بەگوێرەی گۆڕانکاری لەبارودۆخی خودی کەسەکان، وەکو گەڕانەوەی منداڵ وخێزان و، یان خۆشگوزەرانی پاش تەنگانە، یان شەهید بوون لەپێناو خوادا .

هەژاری ئەوان لەبەر کارکردن نەبوو، چونکە_وەکو زەمەخشەری دەگێڕێتەوە_ بەڕۆژ ناوکی خورمایان دەهاڕی، بۆ ئالیکی ئاژەل، چونکە خۆیان خاوەن مەڕو ماڵات نەبوون، کەواتە ئەوان کاریان دەکرد بۆ بەدەستهێنانی ڕۆزی .[٤]

**٤- ژمارەو ناوەکانیان :**

ژمارەیان بەپێی کاتەکان دەگۆڕا، لەکاتی هاتنی نێردەکان بۆ مەدینە زیادیان دەکرد، کەمیشیان دەکرد کاتێك ئەو کەسانە نەهاتایەن، بەڵام ژمارەیان لەکاتی ئاساییدا لەدەوروبەری حەفتا کەسدا بوو، [٥] جاری واش بوو ژمارەیان زۆر زیادی دەکرد، تاکو جارێکیان سەعدی کوڕی عوبادە تەنها خۆی مێوانداری بەهەشتا کەس

---

١- مسلم برقم ٢٤٩١ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية تربية امة وبناء دولة ١٨٤ .

٣- هەمان سەرچاوە ١٨٤ .

٤- بڕوانە: المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدى، لشُراب ٢٢٢/١ .

٥- بڕوانە: الحلية ابو نعيم ٣٣٩/١، ٣٤١ .

کـرد لەئــەوان، جگــە لەوانــەی کەدابــەش بوونــە ســەرماڵی هاوەڵانــدا، [1] ئەمانــەی خوارەوەش ناوی هەندێك لەو هاوەڵانەی ئەهلی صوففەیە:

١-ئەبو هورەیرە خۆی بە یەکێك لەواندەزانی
٢-ئەبو زەڕی غیفاری خۆی بە یەکێك لەوان دەزانی
٣-واسیلەی کوڕی الاسقع
٤-قەیسی کوڕی تەهفە
٥-کعبی کوڕی مالیکی ئەنصاری
٦-سعیدی کوڕی عامری کوڕی حوزەیمی جەمحی
٧-سەلمانی فارسی
٨-ئەسمای کوری حاریسەکوڕی سەعیدی ئەسلەمی
٩-حەنزەلەی کوڕی ئەبی عامری ئەنصاری(غسیل الملائکه)
١٠-خەباب کوڕی ئەرەت
١١-زەیدی کوڕی خەتتاب
١٢-عبدالله کوڕی مەسعوود
١٣-سوهەیبی کوڕی سینانی ڕۆمی
١٤-بیلالی کوڕی رەباحی وچەندانی تریش خوای گەورە لە هەموویان ڕازیبێت

هەنــدێك لەتوێــژەرەوانیش کەوتنــە هەڵەیــەکی گــەورەوە، کاتێــك مەســەلەی صوففەیان کردە بەڵگە بۆ صۆفیە لادەرەکان وەکو کارنـەکردن وتەمـەڵی ومانـەوە لەتەکیۆ و... [2]

ئەبو هورەیرە کەلەهەمووان زیاتر پەیوەست بوو بەصوففەوە، دەرچووە بـۆ نـاو جەرگــەی ژیــان، بــەڵکو بووەتــە ســەرکردە لەســەر بــەحرەینیش بــۆ ماوەیــەك لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب، ژیـانێکی زبریـشی بەسـەر نـەدەبرد، [3] بـەڵکو

---

١- هەمان سەرچاوە ٣٤١/١ .
٢- بڕوانە: السيرة النبوية تربية امة وبناء دولة ١٨٦ .
٣- هەمان سەرچاوە ١٨٨ .

خەڵکی صوففە کەسانێکی موجاهید بوون لەپێناوی خوادا لەگۆڕەپانەکانی جەنگدا، ژمارەیەکیش لەئەوان شەهید بوون ·

**پێنجەم: پەندو ئامۆژگاری.**

**١- مزگەوت یەکێکە لەکۆڵەکەکانی بنیاتنانی کۆمەڵگا :**

دروستکردنی مزگەوتی زۆر گرنگە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی، چونکە موسڵمان سیفەتی جێگیربوون وپتەوی بەپەیوەست بوون بەسیستمی ئیسلام دەبێت لەڕووی بیروباوەڕەو ڕەوشتەوە، ئەوەش لەمزگەوتەوە سەرچاوە دەگرێت ·[١]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًاۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾ (التوبة:١٠٨).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِۙ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُواْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (النور:٣٦_٣٨).

**٢- مزگەوت هێمای گشتگیریە لەئیسلام :**

أ- چونکە پێکهێنراوە بۆ ئەوەی ببێتە جێگایەك بۆ پەرستن ونوێژو یادکردن وسوپاس کردنی خوای گەورە لەسەر نیعمەتەکانی، هەموو موسڵمانێك دەچێتە ناوییەوە، نوێژو پەرستنی تیادا دەکات، هیچ کەسێکیش ناتوانێت زیانی پێبگەیەنێت تاکو پیرۆزی ئەو جێگایەی پاراستبێت ·[٢]

---

١- بڕوانە: فقه السيرة للبوطي ٢٠٣ او ١٤٣ ط/ اخرى بەدەستکارییەوە ·

٢- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون ٣/٣٣ ·

ب- هەروەها مزگەوت پێکهێنراوە بۆ ئەوەی ببێتە شوێنی بەیەکگەیشتنی پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵان وئەو کەسانەی دێنە لای بۆ وەرگرتنی ڕێنمویی و باوەڕهێنان بەبانگەوازەکەی وپەیامەکەی .[1]

ج- هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە زانکۆیەك بۆ زانستە گەردونی وئەقڵیەکان کەقورئان هانی موسڵمانانی داوە پەیڕەوی بکەن و، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە قوتابخانەیەك ئیمانداران بیروڕای خۆیانی تیادا ئاڵو گۆڕ بکەن و، پەیمانگەیەك بێت قوتابییەکانی زانست لەهەموو لایەکەوە ڕووی تێبکەن، بۆ ئەوەی لەئایینەکەیان حاڵی ببن وبگەڕێنەوە لای میللەتەکانیان وەکو مژدەدەرو ترسێنەر، بانگەواز بکەن بۆلای خوای گەورە ...[2]

د- هەروەها پێکهێنراوە بۆ ئەوەی ببێتە پەناگەیەك بۆ بێگانەو هەژارو ڕێبوار، بۆ ئەوەی کەس منەتیان بەسەر دانەکات وەکەسیش ڕێگەی زانست وەرگرتنیان لێ نەگرێت، چەندین سەرکردە دەرچووی مزگەوتن، پاڵەوانێتیان لەنێو دیوارەکانیدا گەشەی دەکرد، چەندین زانایش زانستەکەی لەوێوە سەرچاوەی دەگرت وئینجا دەردەچوو بۆ ئەوەی تێنویتی خەڵکی بشکێنێ بۆ زانست، چەندین بانگخوازیش لەکۆڕەپانەکانی مزگەوتدا وانەکانی بانگەوازی بۆ لای خوا وەردەگرت، مزگەوت پێشەنگی بانگخوازان بوون، پێشەوای ڕێپیشاندەران بوو، ڕێحانەیەکیش بوو دڵەکانی ڕادەکێشا بۆ لای خۆی .[3]

چەندین عەرەبی بیابانشینی کەسورو زەردی لەیەکتر نەدەکردەوە، هاتە نێو مزگەوت وهاوەڵانی بینی دەوریان دابوو لەپێغەمبەر، بەئەو پەڕی شەرم و گوێڕایەڵی، ئەویش دەهات لەگەڵیان گوێی دەگرت، نیعمەتی بیرو هۆش لەلای دەردەکەوت پاش ئەوەی پەردەی نەفامی داپۆشیبوو، تێدەگەیی وفێردەبوو، ئینجا دەگەڕایەوە لای خزمانی ودەبووە پێشەوایان وبانگی دەکردن بۆ لای خواو، پەروەردەی دەکردن بەو زانستەی کەفێری بوو، بەو ڕەفتارەیش کەگرتیەبەر،

---

١- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد الصادق عرجون ٣/٣٣ .

٢- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد عرجون ٣/٣٣ .

٣- هەمان سەرچاوە ٣/٣٤ .

ئـەوانیش باوەڕیـان بەبانگەوازەکـەی هێنـاو بوونـە دێڕێکـی ڕونـاك لەمێـژووی ئیسلامیدا.[١]

هـ- هـەروەها مزگـەوت دروسـتکراوە بۆئـەوەی ببێتـە قەڵایـەك بـۆ کۆبوونـەوەی موجاهیدان کاتێك داوای دەرچوونیان لێدەکرێت، ئاڵاکانی جیهادو بانگەوازی تیا دەبەسترێت ودەگەشێتەوە لەسـەر سـەرکردەکان بـۆ بەڕێکـەوتن بـەرەو جێگـای ڕووداوەکـان، لەسایەشـیدا سـەربازانی خـوای گەورەبـە پەرۆشـەوە دەوەسـتان و چاوەڕوانی سەرکەوتن یان شەهیدیان دەکردن .[٢]

و- هـەروەها لـەپێناو ئـەوەدا کەکۆمـەڵگای نـوێ گۆشـەیەکی بـۆ خـۆی تیـا بدۆزێتـەوە بـۆ ئـەوەی ببێتـە نەخۆشـخانەیەك برینـدارانی جیهـادی تیـا چارەسـەر بکرێت، هەروەها بۆ ئەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەردانیان بکـات وبرینـەکانیان سارێژبکات وچاکەیان بخاتە ڕوو .[٣]

ز- ئینجـا بۆئـەوەی ببێتـە جێگایـەك بـۆ بڵاوبوونـەوەی هەواڵـەکان ونـاردنی پۆستەکان ودەرچـوونی نامـەکان و، هـەروەها بـۆ وەرگرتنـی هەواڵە سیاسییەکان دەربارەی شەڕو ئاشتی و، خوێندنەوەی نامەکان لە مژدەی سەرکەوتنی تیادا بـوو، یـان ئـەو نامانـەی داوای یارمەتیـدەکرد، یـان هـەواڵی شـەهیدبوونی هـاوەڵانی لەخۆدەگرت ، بۆ ئەوەی موسڵمانانی تر هەمان ڕێبازی ئەوان بگرنە بەر.[٤]

ح- ئامانجێکی تر لەپێکهێنانی مزگەوت ئەوە بوو ببێتە جێگایـەك بـۆ چـاودێری کردنـی جموجوڵـەکانی دوژمـن، بەتایبـەتی ئـەو دوژمنانـەی کەلـەنێو ڕیزەکـانی موسـڵماناندا خۆیـان حەشـاردا بـوو وەکـو جوولەکـەو مونافیقـەکان وپاشماوەکـانی بتپەرستان کەلەبتپەرستیدا پیر بوو بوون، بۆ ئـەوەی کۆمـەڵگا بپارێزێـت لەخراپـەو پیلانەکانیان وبەدووربن لەناپاکییەکانیان .[٥]

---

١- بڕوانە: محمد رسول الله، محمد عرجون ٣/٣٤، ٣٥ .

٢- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ٣/٣٥ .

٣- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ٣/٣٥ .

٤- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ٣/٣٥ .

٥- محمد رسول الله: محمد عرجون ٣/٣٦ .

مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ سەرەتا پێغەمبەر ﷺ بەخۆی دەستی کرد بەدامەزراندن ودروستکردنی لەسەرەتای هاتنیەوە بۆ مەدینە، بۆئەوەی ببێتە نموونەیەك تەماشابکرێت، لەسادەیی ڕواڵەت وقووڵی واتا، بۆئەوەی مەزنترین ئامانجەکانی پێبەدی بهێنرێت، بەکەمترین خەرجی وکەمترین نارەحەتی .[1]

**٣- پەروەردەکردن بە پێشەنگی کردەیی:**

یەکێك لەڕاستیە چەسپاوەکان ئەویە، پێغەمبەر ﷺ بەشداری هاوەڵانی کردووە لەکارکردن و بنیاتناندا، بەردی هەڵدەگرت وخشتی دەخستە سەرسنگ وشانی، زەویشی هەڵدەکەند بەدەستی وەکو هەر کەسێکی تر لەهاوەڵان، بۆیە ئەو نموونەی پێشەوای دادگەر بوو کە جیاوازی ناکات لەنێوان سەرۆك وهاوڵاتی، یان سەرکردەو سەرباز، یان هەژارو دەوڵەمەند، هەموان لەلای خوا یەکسانن، جیاوازی نییە لەنێوان عەرەب وعەجەمدا مەگەر بەخواناسین ولەخواترسان نەبێت، ئەوە ئیسلامە، دادگەری ویەکسانی لەهەموو شتێکدا، پێغەمبەریش ﷺ وەکو هەرکەسێکی تر چاوەڕوانی پاداشت بوو لەلای خواوە،[2] بەشداریکردنی پێغەمبەر ﷺ لەکارەکانی بنیاتناندا تەنها بەبڕینی ئاورپیشم نەبوو، یان تەنها وەشاندنی یەکەم پاچ، بەڵکو بەتەواوی سەرقاڵی کارکردن بوو، موسڵمانان سەرسام بوون لەپێغەمبەرﷺ کەبینیان خۆڵ وتۆز لەسەری نشتووە، ئوسەیدی کوڕی حوزەیری ڕەزای خوای لێبێت چووە پێشێ بارەکەی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ وەربگرێت، ووتی: بمدەرێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بارێکی تر هەڵگرە، تۆ لەمن هەژارتر نیت بۆ لای خوا[3]، کەموسڵمانان ئەو قسەی پێغەمبەر ﷺ یان بیست چالاکتر بوونەوە لەکارەکانیاندا،[4] دیمەنێکی تاك وبێ هاوتایە، ئەگەر سەرکردەکانی جیهان جار جارە دەچنە پێشێ بۆ کارکردن بۆ ئەوەی کەناڵەکانی تەلەفیزیۆن دەریان بخات وگۆڤارو ڕۆژنامەکان لەسەریان بنووسێ، ئەوا پێغەمبەر ﷺ

---

١- هەمان سەرچاوە ٢/٢٣ .

٢- بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، د.علي معطي ١٥٨ .

٣- بڕوانە: صور من حياة الرسول، امين دويدار ٢٦١ .

٤- بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، د.علي معطي ١٥٨ .

بەردەكەی بەزۆر لەموسڵمانان وەردەگرت ودەیوت تۆ لەمن هەژارتر نیت بۆلای خوا.

ئەم هەڵوێستە زۆر كاریگەری هەبوو لەسەر هاوەڵان، بۆیە چالاك بوونەوەو دەیانوت:

لـئن قعـدنا والـنبی یعمـل لذاك منا العمل المضلل.[1]

واتە: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ كاربكات وئێمە دانیشین، ئەوە كارێكی گومڕاكەرە .

ئەم پەروەردەكردنە بەئەنجام ناگات لەڕێگەی ئامۆژگارییەوە، یان لەڕێگەی قسەی نەستەقەوە، بەڵكو پێویستە لەڕێگەی كردەوەوە زیندوبكرێتەوە، كەهەرگیز نەدەكرا دروست بێت لەكەشی مەككە كەپڕبوو لە ڕاونان وچەوسانەوە، بەڵكو لەم كۆمەڵگا تازەیە دێتە دی. كەدەوڵەت پێكهاتووە هاوەڵان هەموویان دەڵێن یەك دەنگن ویەك دڵن، دەیانوت:

لاعـیش الاعـیش الاخـرة اللهم ارحم الانصار والمهاجرة

هەروەها بەیەك ئاواز دەیانوت:

لـئن قعـدنا والـنبی یعمـل لذاك منا العمل المضلل .

هاواركردنی سێیەمیشیان :

هـذي الحمـال لاحمـال خیـبر هـذا ابـر لربنـا واطهـر .[2]

ئەم بەردو خشتانە بارن نەكو بارەكانی خەیبەر كەبۆ یەسریب دەهات لەخورماو مێووژ، دڵنیابوون بەقسەی خوای گەورە: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾ (النحل:٩٦).

بانگەوازی چوارەمیشیان :

---

١- بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام ٤٩٦/١ .

٢- بڕوانە: التربیة القیادیة، منیر الغضبان ٢٤٩/٢ .

لایستوی من یعمر المساجدا    یدأب فیه قائماً وقاعدا

ومن یری عن الغبار حائدا .[1]

واتە: نابنە یەك، کەسێك ماڵی خوا ئاوەدان بکات وکەسێکیش خۆی لەتەپ وتۆزەکەی بەدوور بگرێت .

**٤- بایەخدان بەشارەزاییو پسپۆری :**

لەهەندێك ڕیوایەتدا باسی هاوەڵێك هاتووە ناوی تەلقی کوڕی عەلی یەمامی بوو ڕەزای خوای لێبێت، کەشارەزا بوو لەتێکەڵ کردنی قوڕ لەکاتی دروست کردنی مزگەوتی پێغەمبەر

پێغەمبەر ﷺ بایەخیدا بەم هاتووە تازەیە بۆ مەدینە، کەیەکێك نەبوو لەموسڵمانە سەرەتاکان، توانای خۆیشی لەوبوارەدا گەشە پێدابوو، ئەوەش وانەیەك بوو بۆ موسڵمانان لەتواناو کارامەییداو، ئامۆژگارییەکی پێغەمبەرانەیە بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن .[2]

**٥- دروشمی دەوڵەتی ئیسلامی :**

کەواتە نوێژ دروشم بوو بۆ یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی جیهانی (الله اکبر..الله اکبر)ئەو وشەیە ئەوە دەگەیەنێت کەخوا لەهەموو ئەوانە مەزنترە، گەورەترە لەدروستکەری کۆسپەکان و، فەرمانی خۆیشی زاڵ دەکات .

*(اشهدان لااله‌الاالله) واتە: هیچ فەرمانڕەواییەك وسەرگەورەییەك ودەسەلاتێك بۆ کەس نییە بۆ خوای گەورە نەبێت، (ان الحکم الاالله)چەمکی(لااله‌الاالله) ئەوە دەگەیەنێت هیچ فەرمانڕەوایەك نییە یان کەسێك شەریعەت دانێت جگە لەخوای گەورە .

*(اشهدان محمد رسول الله)خوای گەورە سەرکردایەتی داوەتە دەستی، هیچ کەسێك بۆی نییە ململانێی لەگەڵدا بکات، چونکە خۆی بەردەوام هەر بەڕێوەی

---

١- هەمان سەرچاوە ٢/٢٤٩ .

٢- بڕوانە: التربیة القیادیة، منیر الغضبان ٢/٢٥٢ بەدەستکارییەوە .

دەبات بەو وشانەی کەخوای گەورە دایاندەبەزێنێتە سەری و، بەو سوننەتانەی دەیانخاتە سەر دڵی، [1] هەروەهایش دانپێدانان دەگەیەنێت بۆ پەیامی پێغەمبەر ﷺ و سەرۆکایەتی ئایینی ودونیایی وگوێڕایەڵی تەواو بۆی. [2]

* (حي على الصلاة_حي على الفلاح) ئەی مرۆڤ وەرە بۆ هاتنە ژێر ئاڵای ئەم دەوڵەتەی دڵسۆزە بۆ خوا، یەکێك لەئامانجەکانیشی بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان موسڵمان وپەروەردگارێتی وبەهەمان شێوە لەنێوان ئیمانداراندا، لەسەر بنەمای بەها بەرزەکان.

* (قد قامت الصلاة) نوێژیش لەنێو هەموو پەرستنەکاندا کۆڵەکەی ئایینە، چونکە ئەو دروشمانەی کەتیایەتی وەکو ڕکوع وسجود، مەزنترین ڕواڵەتەکانی خوا پەرستنن بەواتا فراوانەکەی کەملکەچی وگوێڕایەلی بۆ سەر گەورە دەگەیەنێت، موسڵمان لەبەر دەستی خوای گەورە ڕادەوەستێت و، خۆی دەداتە دەستی پەروەردگاری، وەکو فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (غافر:٦٦).

ئەم پەیوەندییە لەنێوان دروشمی دەوڵەتی ڕەسمی بەفەرمانڕەوایەتی خواو و سەر گەورەیی شەرع و، ڕوخانی ستەمکاران ویاساو سیستمەکان وشەریعەتەکانیان بە(حي على الفلاح...قد قامت الصلاة) کەئاماژە دەکات بۆ ئەوەی نوێژ ئەنجام نادرێت وەکو پێویست لەسایەی دەوڵەتێك دا نەبێت کەچاودێری بکات لەسەر بنەمای ئەو بنیات بنرێت ولەپێناو ئەویشدابێت، موسڵمانان بەنهێنی ولەڕچەڕێگای شاخەکان نوێژیان دەکرد پێش دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان، بەڵام دوای ئەوەی کەپارێزگاریکردنی شمشێرەکاندا ئەو دەوڵەتە دامەزرا، ئیتر بەئاشکرا بانگ وقامەت بەرز دەکرێتەوە، ئەوانیش بائاشکرا خەریکی نوێژ کردن بن بۆ خوای گەورە.

---

١- بڕوانە: قراءة سياسية للسيرة النبوية د.محمد قلعجي ١١٤.

٢- بڕوانە: دولة الرسول ﷺ من التكوين الى التمكين، د.كامل سلامة الدقس ٤٣٨.

مێژوو باشترین شایەتە لەسەر ئەوەی خوای گەورە وەکو پێویست ناپەرسترێت لەژێر سایەی دەوڵەتێکی بەهێزدا نەبێت، کەبتوانێت بەرگری بکات لەلایەنگران و شوێنکەوتوانی ئایینەکە .

ئینجا وشەکانی بانگدان دوبارە دەبێتەوە بۆ ئەوەی هەمان ئەو چەمکانە دوپات بکەنەوە.[١]

ئێمە پێویستیەکی زۆرمان هەیە بەتێگەیشتنی واتای بانگدان وحالیبون لە چەمکەکانی وکارکردن بۆ وەرگێڕانی بۆ شێوەیەکی کردەیی بۆ ئەوەی جیهاد بەباشترین شێواز ئەنجام بدەین،بۆئەوەی دروشمەکانی بێباوەڕی پێ لە ناو بدەین و ، دروشمەکانی ئیمان و دەوڵەتی یەکتاپەرستی پێ ڕاگرین کەحوکم دەکات بەشەرعی خواو ڕێبازەکەی .

**٦-حوکمی مزگەوت دروستکردن وڕازاندنەوەی:**

زانیان بە گشتی مزگەوت دروستکردنیان پێ باشەوبە بەڵگەی ئەوەی عومەروعوسمان خوایان لێ ڕازی بێت مزگەوتی پێغەمبەریانﷺ دروستکردەوە ، بەڵام زانیان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی مزگەوت ڕازاندنەوە مەکروهەو هاوڕایشن لە سەر ئەوەی نابێت پارەی وەقفکراو بۆ ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت لەڕازاندنەوەی مزگەوتدا خەرجبکرێت،یەکەمین کەسیش مزگەوتی ڕازاندەوە وەلید کوڕی عبدالملکی کوڕی مەروان بوو،لەو کاتەوەش خەڵکی فێری ئەم کارە بوون کە دوورە لەو شێوازەسادەیەی پێغەمبەر ﷺ لە دروستکردنی مزگەوتدا.

مزگەوت دروستکردن

**٧- پلەو پایەی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ :**

پێغەمبەرﷺ باسی پلەو پایە بەرزەکانی مزگەوتی خۆی کردووە، بۆیە هاوەڵان پەیوەست بوون پێوەی، دەشتوانین بگەڕێینەوە بۆ هەردوو صەحیحی بوخاری و

---

١- بڕوانە: دولة الرسول ﷺ من التكوين الى التمكين ٤٣٩ .

موسلیم و کتێبەکانی تر، بۆ ئەوەی ئەو پلەو پایە بزانین، بەڵام لێرە تەنها باسی یەك فەرموودە دەکەین چونکە واتایەکی قووڵی تیایە کە ئەوەش

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت، گوێی لەپێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی: ((من دخل مسجدنا هذا ليتعلم خيراً او يعلمه كان كالمجاهد في سبيل الله، ومن دخله لغير ذلك كان كالناظر الى ماليس له)) [١] واتە: هەرکەسێك بێتە نێو ئەم مزگەوتە بۆ فێربوونی چاکەیەك یان فێرکردنی چاکەیەك، وەکو ئەو کەسەیە جیهاد دەکات لەپێناو خوادا، هەرکەسێکیش بۆ شتێکی تربێت وەکو کەسێکە تەماشای شتێك بکات هی خۆی نەبێت.

---

١- بڕوانە: المصنف لابن ابى شيبة ٢/٣٧١، ١٢/٢٠٩_رقم ١٢٥٦٧، واخرجه الحاكم ١/٩١ قال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين، فقد احتجا بجميع رواته ولم يخرجاه، ولا اعلم له علة واورد الحاكم شاهداً له عقبه.

## باسی دووەم: برایەتی لەنێوان موهاجیرو ئەنصارەکاندا.

یەکێك لەکۆڵەکە سەرەکییەکان کەپێغەمبەر ﷺ پشتی پێی بەست لەبەرنامەی چاکسازی وڕێکخستنی موسڵمانان‌ودەوڵەت ،بەردەوامی بوو لەبانگەواز کردن بۆ یەکتاپەرستی و، ڕێبازی قورئانی و، دروستکردنی مزگەوت و، دامەزراندنی برایەتی لەنێوان موهاجیرو ئەنصارەکانداو، ئەوەش هەنگاوێك بوو کەمتر نەبوو لەهەنگاوی یەکەم لەدروستکردنی مزگەوتدا، بۆ یەکگرتنەوەی کۆمەڵگای موسڵمان و دەرکەوتنی پێکهاتە تازەکانی .[1]

بنەمای برایەتی گشتی لەنێوان موسڵماناندا بەردەوام بوو لەسەرەتای بانگەوازەوە هەر لەسەردەمی مەککەوە، پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری موسڵمانانی کرد ڕق وکینەیان لەنێواندا نەبێت، دەیفەرموو: ((لاتباغضوا، ولاتحاسدوا، ولاتدابروا، وکونوا عباد اللة اخوانا، ولایحل لمسلم ان یهجر اخاه فوق ثلاثة ایام)).[2] واتە: خۆتان بە دووربگرن لەڕق وکینەو، چاوتێبڕینی ماڵی یەکترو، پشت لەیەکتر هەڵکردن و، ببنە بەندەی خواو برای یەکتری، ڕەوایش نییە بۆ موسڵمانێك قسە لەگەڵ براکەی نەکات لەسەروی سێ ڕۆژەوە .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((المسلم اخو المسلم لایظلمە ولایسلمە، ومن کان في حاجة اخیە کان الله في حاجتە، ومن فرّج عن مسلم کربة فرّج الله _عزوجل_عنە کربة من کربات یوم القیامة، ومن ستر مسلماً سترە اللە یوم القیامة))[3]

واتە: موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێناکات وئازاری نادات ونایەڵێت کەس ئازاری بدات، هەرکەسێك پێویستی براکەی بەجێبهێنێ خوای گەورە پێویستی ئو بەجێدەهێنێ، هەرکەسێك ناڕەحەتییەك لەسەر موسڵمانێك لابدات، خوای گەورە

---

١- بڕوانە: الادارة الاسلامیة في عصر عمر بن الخطاب، د.مجدلاوی ٥٢، ٥٣ .

٢- البخاری رقم ٦٠٦٥، واللفظ لە، ومسلم رقم ٢٥٥٩ .

٣- البخاری رقم ٢٤٤٢ واللفظ لە، والمسند: ٩١/٢ ورقمە ٥٦٤٦ .

یەکێك لەناڕەحەتییەکانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر لادەدات، هەرکەسێکیش نهێنی موسڵمانێك داپۆشێت، خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا دایدەپۆشێت .

قورئانیش جەختی کردووەتەوە لەسەر برایەتی گستی لەنێو موسڵمانانداو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ (آل عمران:١٠٣).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (الانفال: ٦٣).

بەڵام بابەتی ئەم باسە بریتی یە لەبرایەتی تایبەت، کەئەو ماف وئەرکانەی لەسەر بنیات نراوە کەتایبەتترە لەو ماف وئەرکە گشتی یانەی نێوان خاوەن باوەڕان بەگشتی .[1]

زانایان باسی برایەتییەکیان کردووە لەنێو موهاجیرەکاندا لەمەککە، (البلاذری) ئاماژەی کردووە بۆ ئەوەی کەپێغەمبەر ﷺ برایەتی ئەنجامداوە لەنێوان موسڵماناندا لەمەککە، پێش کۆچکردن لەسەر ڕاستی ودڵنەوایی، جابرایەتی بڕیاردا لەنێوان حەمزەو زەیدی کوڕی حاریسەداو، ئەبو بەکر وعومەرو، عوسمانی کوڕی عەففان وعەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و، زوبەیری کوڕی عەووام وعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو، عوبەیدەی کوڕی حاریس وبیلالی حەبەشی و، موصعەبی کوڕی عومەیرو سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح وسالیمی مەولای حوزەیفەو، سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل وتەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵاو، لەنێوان خۆی وعەلی کوڕی ئەبوتالیبدا .[2]

---

١- بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة للعمری ١/٢٤٠ .

٢- أنساب الاشراف للبلاذری ١/٢٧٠ .

(البلاذُري) (ت٢٧٦هـ) کۆنترین زانایە ئامـاژەی کردبێـت بـۆ ئـەو برایەتییـەی مەککە، بەدوای ئەویشدا (ابن عبدالبر)(ت٤٦٣هـ) هەمان قسەی کردووە بێ ئەوەی بەڕاشکاوی وتبێتی لەئەوی وەرگرتووە، هەروەها هەمان قسە کراوە لەلایەن (ابن سيِّد الناس)ەوە بێ ئەوەی ئامـاژەی کردبێت بۆ یەکێك لەو دوو زانایە،[1] حاکم یش لە(المستدرك)دا ڕیوایەتی کردووە لەڕێگەی جەمیعی کوڕی عومەیرەوە، لەئیبنو عومەرەوەکە: پێغەمبەر ﷺ برایەتی کردووە لەنێوان ئەبو بەکرو عومەرو، تەڵحەو زوبەیرو، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف وعوسمانی کوڕی عەففان، لەئیبنو عەبباسەوە بەهەمان شێوە هاتووە: ((پێغەمبەر ﷺ برایەتی کردووە لەنێوان زوبەیرو ئیبنو مەسعوددا))[2]

بەڵام (ابن القيم) و(ابن کثير) پێیان وایە برایەتی ڕوینەداوە لەمەککە، ئیبنو لقەیم دەڵێت: ((دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر ﷺ برایەتی کردووە لەنێوان خودی موهاجیراندا، وەکو برایەتیەکی دووەم، عەلیشی کردووە بەبرای خۆی، بەڵام تەنها برایەتی مەدینە جێگیربووە، موهاجیرەکانیش لەبنچینەوە برابوون بە برایەتی ئیسلامو ماڵ وخزمایەتی ڕەچەڵەك، پێویستیان نەبوو بەبرایەتیەکی تازە، بەپێچەوانەی موهاجیرو ئەنصارەکان))[3] بەڵام (ابن کثير) باسی ئەوەی کردووە کەزانایان نکۆڵییان کردووە لەو برایەتی یە لەبەر هەمان هۆ کە(ابن القيم) باسی کردووە.[4]

کتێبە سەراتاکانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ وهاوەڵان ئامـاژەیان نەکردووە بۆ وەها برایەتیەك لەمەککە، (البلاذری)یش هەواڵەکەی بەوشەی (وتیان) گێڕاوەتەوە بەبێ هێنانەوەی ئیسناد، ئەوەش ڕیوایەتەکە لاوازدەکاتەوە، بەڵکو خودی (البلاذری) زانایان بەلاوازیان زانیوە، بەڵام گریمان ئەم ڕیوایەتە ڕاستیش بێت،

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/٢٤٠ .

٢- فتح الباری، ٣٠٤/٧، ط دار المنار .

٣- زاد المعاد ٧٩/٢ .

٤- بڕوانە: السيرة النبوية لابن كثير .

لەسەر ئەوە هەڵدەگیردرێت برایەتی ئامۆژگاری وپشتگیری بووە لەنێوان ئەو برایانە، بێ ئەوەی مافی میراتی گرتن لەنێوانیاندا بووبێت .

**یەکەم: برایەتی لەمەدینە.**

یاسای بە برابوون بەشداریکرد لەگرێدانی موسڵمانان پێکەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو پەیوەندییەی لەسەر بنەمای برایەتی تەواو لەنێوانیاندا بەستبوو، ئەو برایەتیەی کەدەمارگیری نەفامی تیادەتوێتەوە، هیچ پەرۆشبونێك نییە بۆ ئیسلام نەبێت، هەموو جیاوازییەکانی ڕەچەڵەك ورەنگ ونیشتمانیش نامێنن، کەس نەدوادەکەوێت ونەپێش دەکەوێت تەنها بەهەڵوێست ولەخواترسانی خۆی نەبێت، پێغەمبەریش ﷺ ئەم برایەتییەی کردووەتە گرێبەستێکی کاریگەر نەك وشەیەکی بەتاڵ، کردارێکیشە پەیوەندی هەیە بەخوێن وماڵەوە، نەك سڵاوێك بێت لەسەر زمان وشوێنەواری نەبێت .

سۆزەکانی ئەو برایەتیە بڵاوبوویەوە بەناو کۆمەڵگای تازەو جوانترین نموونەی پێکدەهێنا .[١]

هۆی بەهێز بوونی برایەتی نێوان موهاجیرو ئەنصارەکان ئەوە بوو، خەڵکی کۆمەڵگای نوێ تەنها لەسەر ئایینی خوا یەکیان گرتبوو، ئایینەکەشیان و ایڕاهێنابوون وابکەن و وابڵێن و، ئەوان دوورترین کەسانێك بوون لەوەی قسەکانیان تەنها دروشم بێت لەسەر زاریان، ئەوان بەو شێوە بوون کەخوای گەورە باسی کردوون: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (النور:٥١).

بەم شێوەیش بەردەوامی دەستەبەر بوو بۆ ئەو برایەتیە، کەخوای گەورە بەهۆیەوە پشتی پێ ئەستور کردن، تاکو بەرهەمی خۆی هێنا لەهەموو قۆناغەکانی بانگەواز لەژیانی پێغەمبەرﷺ، شوێنەواریشی درێژەوە بوو تاکو دوای کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ، ئەم برایەتییەیش هەر بەردەوام بوو لەکاتی بەیعەتی ئەبو بەکر

---

١- بڕوانە: فقه السيرة للغزالي ١٩٣، ١٩٤ .

ڕەزای خوای لێبێت و، ئەنصارەکان هیچ درزێکیان دروست نەکرد لەپێناو حەزی دەسەڵاتدارێتیدا، بۆیە مەسەلەی برایەتی پێشکەوتنێکی سیاسی بوو پێغەمبەرﷺ ڕەچاوی کرد بۆ ڕەگ داکوتانی خۆشەویستی، هەموانیش پێشبڕکێیان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی بڕگەکانی ئەو برایەتییە، [١] بەتایبەتی ئەنصارەکان، کەنوسەرو توێژەران هەرچەند وەسفیان بکەن ناگەنە وەسفکردنی خوای گەورە بۆیان، [٢] کەفەرمووی: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ (الحشر:٩).

هەندێ ناوی موهاجیرو ئەنصارەکان کەبوونەبرا لەپێناو خوادا :

ئەبوبەکر _ڕەزای خوای لێبێت_ لەگەڵ خاریجەی کوڕی زوهەیر، عومەری کوڕی خەتتاب وعیتبانی کوڕی مالیك، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح وسەعدی کوڕی موعاز،عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وسەعدی کوڕی ڕەبیع،زوبەیری کوڕی عەووام و سەلامەی کوڕی سەلامەی کوڕی وەقش، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵاو کەعبی کوڕی مالیك، سەعیدی کوڕی زەیدو ئوبەی کوڕی کەعب، موصعەبی کوڕی عومەیرو ئەبو ئەییوبی خالیدی کوڕی زەید، ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو عەببادی کوڕی حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعەو عوەیمی کوڕی ساعیدە، سەلمانی فارسی وئەبوددەردا، بیلال وئەبو ڕوەیحەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی خەسعەمی ڕەزای خوایان لێبێت .[٣]

---

١- بڕوانە: فصول في السيرة النبوية د.عبدالمنعم السيد ٢٠٠ .

٢- بڕوانە: هجرة الرسول وصحابته في القران والسنة، للجمل ٢٤٥ .

٣- بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام ق١/٥٠٥، ٥٠٦، ط/دار ابن كثير، السيرة النبوية لابن كثير ٢/٣٢٤ .

**دووەم: پەندو ئامۆژگارییەکان.**

**١- پەیوەندی بیروباوەڕ بنچینەی پەیوەندییەکانە :**

کۆمەڵگای مەدەنی کەئیسلام پێکیهێنا کۆمەڵگایەکی بیروباوەڕی بوو ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەبوو بەئیسلامەوە، خۆشەویستیش تیایدا تەنها بۆ خواو پێغەمبەرو ئیمانداران بوو، کەئەوە بەرزترین جۆرەکانی پەیوەندی بوو، چونکە پەیوەندی هەیە بەیەی بیروباوەڕو هێزو گیانەوە .[١]

خۆشەویستی بۆ خواو پێغەمبەرو ئیمانداران گرنگترین شوێنەوارەکانی کۆچکردن بوو، قورئانی پیرۆزیش موسڵمانانی لەسەر ئەو واتا بەرزانە ڕادەهێناو پەروەردەدەکرد، قورئان ئاشکرای کرد کەکوڕەکەی نوح ئەگەر چی کوڕیشی بوو، بەڵام بەکەسی ئەو دانانرێت بەهۆی بێباوەڕی وجیابوونەوە لەهەق وشوێن نەکەوتنی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الحجرات:١٠).

بڕینی هەموو خۆشەویستیەکیش لەنێوان باوەڕداران وبێباوەڕان لەبتپەرست و جولەکەو گاور، باباوك وبراو کوڕیشیان بن، ناوبردنی ئەو جۆرە کەسانەش بەستەمکار، کەئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەگەر ئەو ئیماندارەی کەسێکی بێباوەڕی خۆشبوێت گەورەترین تاوانی ئەنجامداوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ (التوبة:٢٣).

جا ئەگەر خوای گەورە بڕواداارنی وریا کردبێتەوە لەخۆشەویستی بێ باوەڕان بەشێوەیەکی گشتی، لەهەمان کاتدا ئایەتێکی زۆریش هەیە دەربارەی ئاگادار کردنەوەی بڕواداران لەگوێڕایەڵی بۆ ئەهلی کیتاب، یان بکرێن بەخۆشەویست و لایەنگر[٢]، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ

---

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/٢٥٢ .

٢-بڕوانە: الهجرة في القران الكريم، احزمي جزولي ٤١٧ .

أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴾ (آل عمران:١٠٠).

هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (المائدة:٥١).

خوای پەروەردگار ئاراستەی خۆشەویستی بۆ باوەڕداران دەستنیشان كردووە و فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾ (المائـدة: ٥٥، ٥٦).

چـونكە هـاوەڵان تێگەیـشتبوون كەدڵـسۆزیان دەبـێ بـۆ سـەركردەكانیان وبیروباوەڕەكەیان بێت، جیهادیانیش دەبێ بۆ بەرزكردنەوەی فەرمانی خوای گەورە بێـت، ئەوانەشـیان هـەمووی لەخۆیانـدا بـەدیهێنا، خۆشەویـستی خۆیانیـان پـاك كردەوەو تەنها بۆ خواو پێغەمبەرو ئیمانداران تـەرخان كـرد، مێژوویـشیان پـڕ بـوو لەهەڵویـستە ناوازەكانیـان كـەئاماژەدەكات بـۆ تێگەیـشتنی قووڵیـان بـۆ واتـای خۆشەویستی ودڵسۆزی كەبەخشیان بەخواو ئایین وبیروباوەڕو براكانیان .

ئـەو برایەتیـەی كەڕوویـدا لـەنێوان موهـاجیرو ئەنـصارەكاندا لـەپێش ئـەوە بیروباوەڕێـك هـەبوو لەسـەر بنـچینەی یـەكگرتن وبـاوەڕ دروسـت بـوو بـوو، چـونكە برایەتی لەنێوان دووكەسـدا بیروباوەڕیـان جیابێـت خـەیاڵ وئەفسانەیە، بەتایبـەتی ئەگەر ئەو بیرو بۆچوونە خاوەنەكەی ناچار بكات ڕەفتارێكی دیـاری كـراوی هـەبێت لەژیاندا، بۆیە بیروباوەڕی ئیسلامی بڕبڕەی پـشتی برایەتیـەو خـەڵكیش هـەموویان دەخاتـە ڕیـزی بەندایـەتی پوخـت وپـەتی بـۆ خـوای گـەورە بـێ بایەخـدان بـەهیچ جیاوازییەك تـەنها جیاوازی خواناسین وكردەوەی چـاك نـەبێت، چـاوەڕوان كـراویش نییەكـە برایـەتی وهاوكـاری لـەنێو كەسـانێكدا بڵاوببێتـەوە كـەبیروباوەڕو بیرۆكـەی جیاجیـا پـەرتـەوازەی كـردبن وهەریـەكێكیان بووبێتـە مـوڵكی خۆویـستی و ئارەزووەكانی.[1]

---

١- بڕوانە: فقە السیرة للبوطی ١٤٨، ط/ دار السلام .

**٢- خۆشەویستی لە پێناو خوادا بنچینەی کۆمەڵگای مەدینە بوو :**

برایەتی لەسەر خۆشەویستی لەپێناو خوا بەهێزترین کۆڵەکەکانی بونیاتنانی ئوممەتی ئیسلامە، لاواز بوونیشی دەبێتە مایەی لاوازبوونی هەموو بونیاتەکە،[١] بۆیە پێغەمبەرﷺ هەمیشە هەوڵی دەدا ئەو چەمکە بەهێزبکات لەکۆمەڵگای تازە، دەیفەرموو: ((ان الله تعالی یقول یوم القیامة: أین المتحابون بجلالي الیوم اظلهم في ظلي یوم لاظل الا ظلی)).[٢]

واتە: خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: لەکوێن ئەوانەی یەکتریان خۆشدەویست لەپێناو مەزنی من، ئەمڕۆ دەیانخەمە ژێر سایەی خۆم، کەهیچ سایەیەکی تر نییە جگە لەسایەی من.

ئینجا ئەو خۆشەویستیەیش کاریگەری خۆی بوو لەکۆمەڵگای تازەدا، ئەنەسرضي الله عنه دەگێڕێتەوە: ((ئەبو تەڵحە لەهەموو ئەنصارەکان دارخورمای زۆرتر بوو لەمەدینە، لەهەمووشیان بەلایەوە خۆشەویستتر ئەوانەی بەیروحا بوون، کەبەرانبەر مزگەوتەکەی پێغەمبەرﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیشی دەچووە نێو ئەو باخەو ئاوێکی سازگاری هەبوو لێی دەخواردەوە، جاکاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَیۡءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِیمٌ﴾ (آل عمران:٩٢). ئەبو تەڵحە هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە وادەفەرموێت ومنیش ئەو باخەی بەیروحام لەهەموو ماڵەکانم بەلاوە خۆشەویستترەو دەیکەم بەصەدەقەو چاوەڕوانی پاداشتی دەکەم لەلای خوا، جاهەرچی خوا پێی خۆشە ئەنجامی بدە لەئەو باخە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو ماڵەت لەقازانجدایە، ئەو ماڵەت لەقازانجدایەو، من گوێم لە قسەکانت بوو، پێم باشە بیدەی بەخزمانت، ئەبو تەڵحە وتی: وابکە ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا دابەشی کرد بەسەر خزمان وئامۆزاکانی .[٣]

---

١- بڕوانە: محمد رسول الله، عرجون ١٢٩/٣ .

٢- مسلم: کتاب البر والصلة والادب، باب فضل الحب في الله، ورحمة ٢٥٦٦ .

٣- بڕوانە: السیرة النبویة الصحیحة ٢٥٤/١، وانظر: البخاری، ارقام ٤٥٥٤، ١٤٦١، ٥٦١١ .

هەروەها عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف باسی ئەو واتا بڵندانەمان بۆ دەکات ودەفەرموێت: کاتێك هاتین بۆ مەدینە پێغەمبەرﷺ من وسەعدی کوڕی ڕەبیعی کرد بەبرا، سەعد ووتی: من یەکێکم لەدەوڵەمەندترین خەڵکانی ئەنصار، ماڵەکەم دابەشدەکەم ونیوەیت پێ دەدەم، دوو خێزانیشم هەیە حەزت لەکامیان کرد تەڵاقی دەدەم وعیددەکەی تێپەڕ بوو مارەی بکە، عەبدوڕڕەحمان ووتی: نیازم نییە بەو شتانە، بەڵام بازاڕێك هەیە بازرگانی تیادا بێت؟ ووتی: بەڵێ بازاڕی قەینو قاع، [1] ئیتر عەبدوڕڕەحمان چوو بۆ ئەوی..... [2]

٣- ئامۆژگاریکردن لەنێو برایاندا :

برایەتی کاریگەری بوو لەسەر ئامۆژگاری نێوان موسڵمانانداﷺ، پێغەمبەرﷺ برایەتی کرد لەنێوان سەلمان وئەبوددەردا، جارێکیان سەلمان هاتە سەردانی ئەبو ددەرداو، خێزانی بینی لەپەشێویدا، ووتی: بۆ ئەوهای؟ ووتی: ئەبو ددەردای برات نیازی بەدونیا نەماوە، ئینجا خواردنێکیان بۆی دروست کرد وپێی ووت: بخۆ، ووتی: بەڕۆژوم، ووتی: هیچ ناخۆم تاتۆ نەخۆیت، ئینجا دەستی کرد بەخواردن، ئینجا لەسەرەتای شەو ئەبو ددەردا دەستی کرد بەنوێژکردن، سەلمان پێی ووت: بخەوە، ئەویش خەوت، جارێکی تر هەڵساو دیسان سەلمان پێی ووت: بخەوە، لەکۆتایی شەو سەلمان پێی ووت: ئێستا هەڵسە، جاپێکەوە نوێژیان کردو ئینجا سەلمان پێی ووت: خوای گەورە مافی هەیە لەسەرت، خۆتیش مافت هەیە لەسەر خۆت، ماڵ وخێزانەکتیش مافیان هەیە بەسەرتەوە، تۆیش مافی هەموو خاوەن مافێك بدە، دوای ئەوە هاتە لای پێغەمبەرﷺ وئەو قسەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((صدق سلمان)) [3] واتە: سەلمان ڕاستی کرد.

---

١- هۆزێکی جولەکەیە ئەو بازاڕە بەناوی ئەوانەوەیە .

٢- البخاري: كتاب البيوع، رقم ٢٠٤٨ .

٣- البخاري: كتاب الصوم، باب الوصال الى السحر، ورقمه ١٩٦٨ .

**٤- نەخێر، تائەو کاتەی ستایشیان بکەن ودوعای چاکەیان بۆ بکەن :**

ئەنصارەکان هەڵدەسان بەدڵدانەوەی موهاجیرەکان و، فەزڵی ئەوانیشیان دەدا بەسەر خۆیاندا، ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: ئەنصارەکان بەپێغەمبەرﷺ یان ووت: دارخورماکانمان دابەش بکە لەنێوان ئێمە وبراکانماندا، فەرمووی: نەخێر، ووتیان: باهەڵسن بەئەرکەکانی ولەبەرو بومەکەیدا بەشداریان دەکەین، ووتیان، بەڵێ بەسەر چاوە .[1]

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت کەئەنصارەکان پێشنیاران کردە سەر پێغەمبەرﷺ ماڵەکانیان بەش بکات لەگەڵ موهاجیرەکاندا، ماڵەکانیشیان بریتی بوو لەدارخورماو، پێغەمبەرﷺ ڕازی نەبوو، ویستی دڵنەواییان ستەمی تیانەبێت لەدرێیان، بەوەی کەخاوەنێتی ئەو باخانە لەدەست نەدەن، بۆیە ئەنصارەکان بەموهاجیرەکانیان ووت: ئەرکی باخەکانمان لەسەر لادەن وەکو ئاودێری وبژار کردن، بەشدارتان دەکەین لەبەرهەمەکەیدا، ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئەو بۆ چوونەی پێباش بوو .[2]

موهاجیرەکان سوپاسی ئەم کردەوەو هەڵوێستە بەرزانەیان کرد بۆ برا ئەنصارەکانیان و، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هەرگیز کەسانێکمان نەبینیوە بەم شێوە جوانە دڵنەوایی بکەن و، بەخشندەیی بکەن، کارونەرکیان لەسەر لابردوین ولەبەرهەمیشدا بەشدارمان دەکەن، تەنانەت واگومان دەبەین پاداشت هەمووی بۆ ئەوان بێت، ووتی: نەخێر، تائەو کاتەی ستایشیان بکەن ودوعای خێریان بۆ بکەن .[3]

لەئاماژەکردنی موهاجیرەکانیش بۆ پاداشت ئەوە دەردەکەوێت تاچەند وابۆ چوونیان بۆ ژیانی دوارۆژ قووڵ بووەو، زاڵبووەتە سەر بیروباوەڕیاندا .[4]

---

١- البخاری: المزارعة رقم ٢٣٢٥ .

٢- بڕوانە: التاریخ الاسلامی ٢٩/٤ .

٣- مسند احمد: ٢٠١/٣، وبرقم ١٣٠٧٥ ط/الرسالة، وقال الشیخ شعیب، والشیخ عادل مرشد: اسنادە صحیح علی شرط الشیخین. وانظر: ابن ابی شیبة ٦٨/٩، رقم ٦٥٦١ .

٤- بڕوانە: التاریخ الاسلامی للحمیدی ٢٩/٤ .

ئینجا پێغەمبەرﷺ ویستی پاداشتیئەنصارەکان بداتەوە لەسەرئەو هەڵوێست و جوامێریانـەی پێـشکەشیان کـرد بـەبرا موهاجیرەکانیـان، ((ئەنـەس دەگێڕێتـەوە کەپێغەمبەرﷺ بانگی ئەنصارەکانی کرد بۆ ئەوەی خاکی بەحرەینیان بـۆ تـەرخان بکـات، بـەڵام ئـەوان ڕازی نـەبوون و، ووتیـان مەگـەر چـی بەئێمـە دەدەیـت بـەبرا موهاجیرەکانیـشمانی بـدەیت، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ((إمـا لا، فاصـبروا حتـى تلقوني فانه سيصيبكم بعدي أثرة)) [١] واتە: ئەگەر هـەر ڕازی نـابن، ئـارام بگـرن تـا بەمن دەگەن( لە سەر حەوزی کەوسەر) چونکە لەپاش من ئێوە تووشی خۆپەرستی دەبن .

ئەم برایەتی یـە ئامانجـەکانی خـۆی بـەدیهێنا، یـەکێك لەوانـە لابردنـی دڵتـەنگی موهاجیرەکان وپشتگیریکردنیان، هەروەها هەڵسانەوەی دەوڵەتی تازە، چونکە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێـت هەلـسێ لەسـەربنەمای یـەکبوونی خـەڵکی نـەبێت، یـەکبوون و پاڵپشتیش بەدی نایەت بەبێ دروستبوونی برایەتی وخۆشەویستی، هەموو کۆمـەڵێك پەیوەنـدی خۆشەویـستی وبرایـەتی ڕاسـتەقینە دروسـت نەکـەن لـەنێوان خۆیانـدا، هەرگیز ناتوانن یەکبگرن لەسەر بنەمایەکی دیاریکراو، ئەگەر یـەکبوونیش بەڕاسـتی دروست نەبێت لەنەتەوەو کۆمەڵدا، هەرگیز دەوڵەتیان لێ پێکنایەت .[٢]

### ٥- میراتگرتن بەبرایەتی :

مێـژووی مرۆڤایـەتی بەگـشتی ڕووداوێکـی بەکۆمـەڵی بـەخۆوە نـەبینیوە، وەکـو ڕووداوی پێشوازیکردنی ئەنـصار لـەموهاجیرەکان، بەخۆشەویـستیەکی بێئەنـدازەو بەخشندەییەکی بێوێنەوەو بەشدارییەکی کاریگەرەو، کێبڕکێیان دەکرد بۆ داڵدەدان ودەسـت خـستنە ژێربـار، پێغەمبـەرﷺ ئـەو برایەتییـەی کـردە لێپرسـراوێتیەکی ڕاستەقینە لەنێو ئەو برایانەداو ((خوای گەورە مافی میراتی بەستووە بەئەو برایەتی یەوە بەدەر لەمافەکانی خزمایەتی، یەکێك لەحیکمەتەکانی ئەو کـارەیش ئـەوە بـوو ڕاستی برایەتی ئیـسلامی بەشـێوەیەکی ئاشـکرا دەرکـەوێت لـەبیری موسـڵمانانـدا و

---

١- البخاري: مناقب الانصار، رقم ٣٧٩٤ .

٢- في ظلال القرآن: ٦/٣٥٢٦ .

دڵنیابن لەوەی کە ئەو برایەتی یە بریتی نییە لەهەندێ دروشم وقسەی پەتی)).[١]

ماوەی سەرتای کۆچکردنیش ئەنصارو موهاجیرەکانی خستە بەرانبەر لێپرسراوێتییەکی تایبەت لەهاوکاری وپشتگیری کردن لەیەکتر، بەهۆی ئەوەی موهاجیرەکان ماڵ وحاڵی خۆیان بەجێهێشتبوو لەمەککەو بەمیوانی هاتبوونە لای برا ئەنصارەکانیان لەمەدینە، بۆیە ئەو برایەتییە زامنی بەدیهێنانی ئەو لێپرسراوێتیەبووکە لە ڕاستیدا زیاتر لەبرایەتی دایك وباوك بەهێزتربوو، جاکاتێك موهاجیرەکان جێگیر بوون لەمەدینەو ئیسلام دەسەڵاتی وەرگرت گیانی ئیسلامەتی بوو بەتاکە ڕەگێکی سروشتی بۆ کۆمەڵگای تازە لەمەدینە .

کاتێك موهاجیرەکان ڕاهاتن لەگەڵ کەشی مەدینەو شارەزایی ڕێگاکانی بەدەست هێنانی ڕۆزی بوون و، ئینجا پاش وەرگرتنی دەستکەوتەکانی بەدر، مەسەلەی میراتی گەڕایەوە بۆ دۆخی سروشتی گونجاو لەگەڵ فیترەتی ئادەمیزاد لەسەر بنەمای خزمایەتی، میراتگرتنی نێو بەبرا بووەکان لابرا، بەدەقی قورئانی پیرۆز: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ (الانفال:٧٥) .

ئەم ئایەتی نەسخی مەسەلەی میراتگرتنی بەبرا بووەکان کرد[٢]، بەڵام پشتگیریکردن وئامۆژگاری ومیوانداری هەرمایەوە لەنێویاندا، چونکە ئیبنو عەبباس ڕوونیکردوەتەوە کاتێك گەیشتووەتە ئەم ئایەتە: ﴿وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا﴾ (النساء:٣٣) .

کە(ولکل جعلنا موالی) مەبەستی میراتگرانە، (والذین عقدت ایمانکم).

موهاجیرەکان کاتێك هاتنە مەدینە، میراتگری ئەنصاریەکان بوون لە جیاتی کەسەکانیان بە هۆی ئەو برایەتیەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامیدا لە نێوانیاندا، جا کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ولکل جعلنا موالي﴾ ئەوەی نەسخ کرد، ئینجا فەرمووی:

---

١- بڕوانە: فقة السيرة للبوطي ١٤٩ .

٢- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة ١/٢٤٦ .

﴿واللذين عقدت ايمانكم﴾، واتا: لە پشتگیری و میوانداری و ئامۆژگاری.[١]

**٦- بەهای مرۆڤایەتی و بەهای نموونەیی:**

لە ڕێگەی پەیوەندی بەهێزی نێوان موهاجیر و ئەنصارەکان، چەند بەهایەکی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی نموونەیی بەرپا بوو کە پێشتر کۆمەڵگای خێڵەکی شتی وای بە خۆیەوە نەبینیبوو.

**٧- تواندنەوەی جیاوازیە هەرێمی و هۆزایەتیەکان:**

لەناوبردنی جیاوازی هەرێمی و هۆزایەتی کارێکی ئاسان نیە لە کۆمەڵگە نەفامەکاندا، چونکە ئەوان ئایینیان بریتیە لە دەمارگیری، جا ئامانج لە مەسەلەی بە براکردنیان تواندنەوەی ئەو جیاوازییانە بوو بە شێوەیەکی ڕاستی لەناو خودی ئەو دوو بەرە نەفامەوە.

لە ڕاستیدا هەندێ لەو نەخۆشیانەی تووشی ڕیزی ئیسلامی هاوچەرخ دەبێت بریتین لە زاڵبوونی گیانی هەرێمایەتی و دەمارگیری لە دڵی هەندێك لە بانگخوازەکاندا، ئەم نەخۆشیانەش ڕێگرە لە نێوان ئەوان و زاڵبووندا، ڕیزەکان لاواز دەکات، بەڵکو پەرتەوازەشی دەکات و موسڵمانان سەرقاڵی خۆیان دەبن لە جیاتی بایەخدان بە ئامانجە گەورەکان. ئەوانەش هەڵقوڵاوی نەخۆشی دەروونی هەندێك لە موسڵمانانە بەهۆی دوورکەوتنەوەیان لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئەوەی لەسەریان پەروەردە نەبوون ململانێ و کینە لە نێوانیاندا پەیدا دەبێت.

موسڵمان لەم ڕۆژگارەدا پێویستی زۆریان هەیە بەو برایەتیەی کە لە نێوان موهاجیر و ئەنصارەکاندا ڕوویدا، چونکە مەحاڵە ژیانێکی موسڵمانانەی پڕ لە سەروەری دەست پێ بکرێتەوە، ئەگەر کۆمەڵگا ئیسلامیەکان خۆیان نەڕازێننەوە بەو ئاکارە جوانانەوە و، بەرز نەبنەوە بۆ ئەم ئاستە ئیمانییە بەرزە.

---

١- تفسير القران العظيم، ابن كثير (٢/٢٥٢) ط/ دار الشعب.

## ٨- برایەتی نێوان موسڵمانان هۆیەکە بۆ دەسەڵاتی واتایی:

بەدەست هێنانیشی لە ڕێگەی پەروەردەکردنی تاکەکان دەبێت لەسەر ئیسلام و ئامادەکردنی سەرکردەکان و نەهێشتنی هۆکارەکانی جیاوازی و پەرتەوازەبوون و کارکردن بە بنچینەکانی یەکگرتن.[١]

گرنگترین بنەماکانی یەکگرتن بریتین لە: یەکبوونی بیروباوەڕ و ڕاستەقینەیی هاتنەپاڵ ئیسلام و بەدی هێنانی برایەتی لەنێوان موسڵماناندا، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾ (الانفال: ٦٢-٦٣).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴾ (الحجرات: ١٠).

کەسێك ناتوانێت شیرینی ئیمان بچەژێت تاکو برایەتی بەدی نەهێنێت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموویێت: ((ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الايمان: ان يكون الله ورسوله احب اليه مما سواهما، وان يحب المرء لايحبه الا لله، وان يكره ان يعود في الكفر كما يكره ان يقذف في النار))[٢] واتە: سێ شت لە هەر کەسێك هەبن شیرینی ئیمان دەچێژێت: خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی لە هەموو کەسێکی تر خۆشەویستتر بن لای، هەر کەسێکیش هەرکێی خۆش ویست لەپێناو خودا خۆشی بوێت، هەروەها پێیشی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی وەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بردێتە ناو ئاگرەوە.

برایەتی لە پێناو خودا گرنگترین ئەو هۆیانەیە کە کاردەکات بۆ خۆڕاگرتن لە ڕووی سەختترین دەردەسەری کە تووشی موسڵمانان بێت، هەروەها تێگەیشتنی

---

١ ـ بڕوانە: فقه التمكين في القران للصلابي (٢٥٣).

٢ ـ بڕوانە: البخاري، كتاب الايمان، باب حلاوة الايمان، ورقمه (١٦).

تەواو بۆ برایەتی دەبێتە مایەی یەکگرتنی ڕیزی موسڵمانان و بەهێز بوونیان و، سەربەرزی و دەسەڵاتیان.[١]

**٩- هەندێ لە چاکیەکانی ئەنصار:**

أ- خوای گەورە ناوی ناون (الانصار): خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەم ناوەیان لێ ناون، کاتێك بەیعەتیان دا لەسەر ئیسلام و پەنای خاوەن باوەڕانیان دا و، ئایینی خوایان سەرخست، ئەوان پێشتر بەو ناوە نەدەناسران، غەیلانی کوڕی جەریر رحمه الله دەڵێت: بە ئەنەسم وت (خوای لێ ڕازی بێت)، ئایا ئێوە بە ئەنصار دەناسران، یان خوا بەو شێوەیە ناوی ناون؟ وتی: بەڵکو ئەوە ناونانی خوای گەورەیە بۆ ئێمە،[٢] سەبارەت بە چاکیەکانیشیان ئەوەندە زۆرە لە ژماردن نایەن. هەندێکیان لە قورئان باسکران، بڕوانە: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّاۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ (الانفال: ٧٤)، ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ (التوبة: ١٠٠)، ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ (الحشر: ٩)، فەرموودەکانیش هەر زۆرن، لەوانە:

ب- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوان: لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئافرەتانو منداڵانی بینی – دەڵێت وادەزانم لە شاییەکەوە – دەگەڕانەوە و هەستایەوە و پێی فەرموون: ... ((اللهم انتم من احب

---

١- بڕوانە: نظریات في رسالة التعالیم، محمد عبدالله الخطیب، محمد عبدالحلیم حامد، (٢٦٢) بە دەستکاریەوە.

٢- البخاري، کتاب مناقب الانصار، باب مناقب الانصار رقم (٣٧٧٦).

الناس الیّ))[١] واتە: سێ جار فەرمووی: خوایە ئەوانە خۆشەویستترین کەسن لەلای من.

ج- خۆشەویستنی ئەنصار نیشانەی ئیمانە و، ڕق لێبوونیان نیشانەی نیفاقە ، هەر کەسێك خۆشیانی بوێت خۆشەویستی خوا بەدەست دەهێنێ، کەسێکیش ڕقی لێیان بێتەوە، بەت بەخت دەبێت بەقینی خوا: لەبەڕائی کوڕی عازیبەوە هاتووە فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ دەیفەرموو: ((الانصار لایحبهم الا مؤمن، ولایبغضهم الا منافق، فمن احبهم احبه الله، ومن ابغضهم ابغضه الله))[٢] واتە: ئەنصارەکان ئیماندار نەبێت خۆشیانی ناوێت، مونافیقیش نەبێت ڕقی لێیان نابێتەوە، هەر کەسێك خۆشیانی بوێت خوا خۆشی دەوێت، هەرکەسێکیش ڕقی لێیان بێت خوا ڕقی لێیەتی.

د- شایەتی داوێن پاك و ئارامگرتنی بۆ داون: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ما یضر امرأة نزلت بین بیتین من الانصار او نزلت بین ابویها))[٣] واتە: هیچ زیانی نیە، یان جیاوازی نیە، ئافرەتێك ماڵی لەنێو دوو ماڵی ئەنصاردا بێت، یان لە نێو دایك و باوکی دابێت.

هـ- ئەگەر کۆچکردن نەبوایە پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد یەکێك بووایە لە ئەنصارەکان:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لو ان الانصار سلکوا وادیا او شعبا لسلکت وادي الانصار، ولو لا الهجرة لکنت امرءا من الانصار"[٤] واتە: ئەنصارەکان بە دۆڵێك یان ڕچە ڕێگەیەکی نێو شاخەکاندا بڕۆن، منیش لەگەڵ ئەوان دەبم، ئەگەر کۆچکردنیش نەبووایە منیش یەکێك دەبووم لەوان.

---

١ ـ البخاري، کتاب مناقب الانصار، رقم (٣٧٨٥).

٢ـ البخاري، کتاب مناقب الانصار، باب حب الانصار من الایمان رقم (٣٧٨٣).

٣ ـ رواه احمد (٦/٢٥٧)، وابن حبان (٧٢٦٧)، والحاکم (٤/٨٣)، والبزار (٢٧٩٢ و ٢٧٩٣) ومجمع الزوائد (٣٩/١٠).

٤ ـ البخاري: مناقب الانصار رقم (٣٧٧٩).

و- دوعاکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوان و مندالْ و خێزانەکانیان:

بوخاری لە عەبدوڵای کوڕی فەزڵەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە ئەنەسی کوڕی مالیك بووە فەرموویەتی: خەمبار بووم بۆ ئەوانەی تووشی هاتن لە حەڕڕە، جا کاتێك زەیدی کوڕی ئەرقەم ئاگادار بوویەوە لە دڵتەنگی و خەمباریم بۆی نووسیم کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی: ((اللهم اغفر للانصار ولابناء الانصار)) واتە: خوایە لە ئەنصارەکان و کوڕەکانیان خۆش بە. ئیبنو فەزڵ گومانی بووە لەوەی ئایا پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کوڕەزاکانیشیان کردبێت.

هەروەها ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: الانصار کرشي وعیبتي، والناس سیکثرون ویقلون، فاقبلوا من محسنهم وتجاوزوا عن مسیئهم" واتە: ئەنصارەکان جێگای نهێنی و پێ سپاردنی منن، خەڵکی هەر لە زیادبووندان و ئەوان لە کەم بووندان.[١]

هەروەها لە ئەبو قەتادەوە هاتووە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە لەسەر مینبەرەوە فەرموویەتی:

((... فمن ولي الانصار فلیحسن الی محسنهم، ولیتجاوز عن مسیئهم، ومن افزعهم فقد افزع هذا اللذي بین هاتین – واشار الی نفسه)) واتە: هەر کەسێك بوو بە فەرمانڕەوای ئەنصار با چاکە لە چاکەکاریانەوە وەربگرێت و، چاوپۆشی لە خراپەکاریان بکات، هەر کەسێکیش ترس و بیم و بخاتە دڵیانەوە، ئەو کەسە بەرامبەر من ئەوەی کردووە.

---

١ ـ ئیبنو حەجەر دەڵێت: ئاماژەیەکی تیادایە بۆ موسڵمان بوونی هۆزەکانی عەرەب و عەجەم، کە ئەوانە چەند بەرامبەر هۆزی ئەنصاری، ئیتر ئەنصارەکان هەرچەنێکیش لە ڕێگای مندالْ بوونەوە زیاد بکەن هەر ناگەنە ئەو هەموو خەڵکەی کە موسڵمان دەبن، لەوانەشە پێغەمبەر ﷺ) ئاگادار کرابێتەوە کە ئەوان بە ڕەهایی کەم دەکەن.... فتح الباري: (١٢٢/٧).

## باسی سێیەم: دەستوری مەدینە

پێغەمبەر ﷺ) هەڵسا بە ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لەنێوان خەڵکی مەدینە، لەو بارەشەوە نووسراوێکی نووسیووە سەرچاوە مێژووییەکان باسیان کردووە، ئامانج لە ئەو نووسراوە — یان پەڕەیە — ڕوون کردنەوەی پەیوەست بوونی هەموو لایەنەکان لە مەدینەوە، دیاری کردنی ماف و ئەرکەکان لە سەرچاوە مێژووییە کۆنەکان ئەم بابەتە لەژێر ناوی (الكتاب) و (الصحيفة) باسکراوە، بەڵام توێژینەوەی نوێیەکان بە دەستوور ناویان بردووە.

دکتۆر ئەکرەم زیائولعومەری لە کتێبی (السيرة النبوية الصحيحة)دا لێکۆڵینەوەی کردووە سەبارەت بە دەستورە، وتوویەتی:... کۆی ڕێگەکانی ئەو دەستورە بەرز دەبن بۆ ئاستی فەرموودە ڕاستەکان.[1]

هەروەها ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کە شێوازی ئەو دەستورە ڕەسەنایەتی دەستورەکە دەردەخات، چونکە دەقەکانی پێکهاتوون لە هەندێ وشە و دەربڕین کە باو بووە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و دواتر بەکارهێنانی کەم بووەوە تاکو وای لێهات تەنها پسپۆڕەکان لە مێژووی ئەو سەردەمە نەبێت کەس شارەزای نیە دەربارەیان، هیچ دەقێکیش نیە لەو دەستوورەدا، پیاهەڵدان، یان شکاندنەوەی کەسی تیابێت لەسەر ئاستی تاك یان کۆمەڵ، بۆیە دەکرێت بڵێین دەستورێکی ڕەسەنە و ساختە نیە،[2] ئینجا لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان شێوازی دەستورەکەو شێوازی نووسراوەکانی تری پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەش سەلماندنێکی تری پێ دەدات.

یەکەم: نووسراوەکەی پێغەمبەر لە نێوان موهاجیر و ئەنصار و جوولەکەکاندا:

دەقی دەستورەکە:[3]

١- ئەمە نووسراوێکە لە موحەممەدﷺ (پێغەمبەری خوا) لەنێوان ئیماندار و

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري (١/٢٧٥).

٢ تنظيمات الرسول الادارية في المدينة لصالح العلى (٥،٤).

٣ مجموعة الوثائق السياسية لمحمد حميدالله ص ٤١-٤٧ وابن هشام (٢/١٤٧-١٥٠).

موسڵمانان لە قورەیش (خەڵكی یەسریب)و، هەر كەسێكیش هاتۆتە پاڵیان و جیهادی لەگەڵیاندا كردووە.

٢- ئەوان تەنها خۆیان - لەنێو خەڵكیدا - نەتەوەیەكی سەربەخۆن.

٣- موهاجیرەكان لە قورەیش لەسەر حاڵی خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام، لە خوێنباییدا بەشداری دەكەن و، ڕزگارانەی دیلیان پێكەوە دەدەن، بە چاكە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

٤- بەنو عەوف لەسەر حاڵی خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام، هاوكاری یەكتر دەكەن لە خوێنبایی و هەموو تایەفەیەكیانیش ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاكە دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

٥- هەروەها بەنو حاریس (كوڕی خەزرەج) لەسەر حاڵی خۆیان وەكو كاتی هاتنی ئیسلام، هاوكاری یەكتر دەكەن لە خوێنبایی و، هەموو تایەفەیەكیانیش ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاكە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

٦- بەنو ساعیدە لەسەر حاڵی خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام و هاوكاری یەكتر دەكەن لە خوێنبایی و، هەموو تایەفەیەكیانیش ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاكە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

٧- بەنو جوشەم لەسەر حاڵ خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام و، هاوكاری یەكتر دەكەن لە خوێن بایی و، هەموو تایەفەیەكیانیش ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاكە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

٨- بەنو نەجار لەسەر حاڵی خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام و هاوكاری یەكتر دەكەن لە خوێنبایی و هەموو تایەفەیەك ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاكە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

٩- بەنو عەمری كوڕی عەوف لەسەر حاڵی خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام و هاوكاری یەكتر دەكەن لە خوێنبایی و هەموو تایەفەیەك ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاكە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

١٠- بەنو نەبیت لەسەر حاڵی خۆیانن وەكو كاتی هاتنی ئیسلام و هاوكاری

یەکتر دەکەن لە خوێنبایی و هەموو تایەفەیەك ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاکە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

١١- بەنو ئەوس لەسەر حاڵی خۆیانن وەکو کاتی هاتنی ئیسلام و هاوکاری یەکتر دەکەن لە خوێنبایی و هەموو تایەفەیەك ڕزگارانەی دیلی خۆیان دەدەن بە چاکە و دادگەری لە نێوان خاوەن باوەڕاندا.

١٢- ئیمانداران نابێت کەسێك بەجێ بهێڵن لە نێوان خۆیاندا قەرزار بێت یان منداڵی زۆر بێت و پێویستە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن، لە ڕزگارانە و خوێنباییدا، هەروەها ئیماندار بۆی نیە هاوپەیمانێتی یاریدەدەرێکی ئیماندارێکی تر بکات بەبێ خۆی.

١٣- خاوەن باوەڕە لە خوا ترسەکان، لە دژی هەر کەسێکن لە نێو خۆیاندا ستەمکار بێت، یان بیەوێت بەرگری بۆخۆی بە دەست بهێنێت بەستەم، یان گوناه و دوژمنایەتی و خراپە لە نێوان خاوەن باوەڕاندا دروست بکات، هەموویان دەبێت دژی بوەستن ئەگەر کوڕی یەکێکیش بێت لە خۆیان.

١٤- هیچ ئیماندارێك بۆی نیە ئیماندارێکی تر بکوژێت لە پێناو بێ باوەڕێکدا یان پشتگیری بێباوەڕێك بکات لە دژی ئیماندارێك.

١٥- پەنای خوای گەورە یەك پەنایە، کام لە خاوەن باوەڕان پلە و پایەی کەمترە دەتوانێت پەنا بدات، خاوەن باوەڕانیش هەموویان لە نێو خۆیاندا پشتیوانی یەکترین.

١٦- هەر کەسێکیش لە جوولەکەکان شوێنی ئێمە بکەوێت، پشتگیری لێ دەکرێت و ستەمی لێ ناکرێت و پشتگیری کەس ناکرێت لە دژی.

١٧- ئاشتی بڕوادارانیش یەك ئاشتیە، بڕوادارێك بە جیا لە بڕوادارەکانی تر نابێت ئاشتی ئەنجام بدات لە شەڕێکدا کە لە پێناو خوادا بکرێت مەگەر یەکسانی و دادگەری نەبێت لە نێوان خۆیاندا.

١٨- هەرچی کەسانێکیش غەزامان لەگەڵدا بکەن، هەندێکیان بە دوای ئەوەکانی تردا دێن.

١٩- بڕواداران یەکسانن سەبارەت بەوەی کە بەسەریاندا دێت لە پێناو خوادا.

٢٠- خاوەن باوەڕە لەخوا ترسەکان لەسەر چاکترین و ڕاستترین ڕێبازن هیچ بتپەرستێکیش بۆی نیە پەنای ماڵێکی قورەیش بدات، یان دالّدەی کەسێکیان بدات، یان ڕێگە لە خاوەن باوەڕێك بگرێت لە دژی ئەو.

٢١- هەر کەسێکیش ئیماندارێك بکوژێت پێی دەکوژرێتەوە مەگەر کەس و کاری کوژراوەکە ڕازی بن بە خوێنبایی، هەموو ئیماندارانیش لە دژی دەبن، هیچ ڕێگەیەکی تریان لەبەر دەمدا نیە ئەوە نەبێت.

٢٢- هەر ئیماندارێکیش دان بنێت بەوەی لەم پەڕەیەدا هاتووە و، باوەڕی هەبێت بە خوا و ڕۆژی دوایی، ڕەوا نیە بۆی پەنای کەسێك بدات تاوانبار بێت و پشتگیری لێ بکات، هەر کەسیش وای کرد لەعنەت و ڕق و قینی خوای لەسەر بێت تا ڕۆژی قیامەت، هیچ چاکە و دادگەریەکی لێ وەرناگیرێت.

٢٣- هەر چەندیش جیاوازیتان هەبێت لەسەر هەر مەسەلەیەك پێویستە دەربارەی بگەڕێنەوە لای خوا و پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ.

٢٤- جوولەکەکان هاوکاری ئیمانداران دەکەن لە خەرجکردندا، تاکو جەنگاوەر بن.

٢٥- جوولەکەی بەنی عەوف نەتەوەیەکن لەگەڵ ئیمانداراندا، جوولە ئاینی خۆیان هەیەو، موسڵمانانیش ئاینی خۆیان هەیە، خۆیان و ئەوانەی لەگەڵیانان وەکو مەوالی. مەگەر کەسێك ستەم لە خۆی بکات و تاوان ئەنجام بدات، لەو حالەتەدا تەنها خۆی و خێزانەکەی خۆی تیا دەبات.

٢٦- جوولەکەی بەنی نەججار هەمان مافی جوولەکەی بەنی عەوفیان هەیە.

٢٧- جوولەکەی بەنی حاریس هەمان مافی جوولەکەی بەنی عەوفیان هەیە.

٢٨- جوولەکەی بەنی ساعیدە هەمان مافی جوولەکەی بەنی عەوفیان هەیە.

٢٩- جوولەکەی بەنی جووشەم هەمان مافی جوولەکەی بەنی عەوفیان هەیە.

٣٠- جوولەکەی بەنی ئەوس هەمان مافی جوولەکەی بەنی عەوفیان هەیە.

٣١- جوولەکەی بەنی سەعلەبەیش هەمان مافی جوولەکەی بەنی عەوفیان

هەیە، مەگەر کەسێك ستەم بکات و تاوانبار بێت، ئەوا تەنها خۆی و کەس و کارەکەی لەناو دەبات.

٣٢- جەفنە بنە تیرەیەکن لە سەعلەبە هەروەکو خۆیان.

٣٣- بەنی شوتەیبە هەمان مافی بەنی عەوفیان هەیە.

٣٤- ئەوانەی لەگەڵ سەعلەبەدان وەکو مەوالی هەروەکو ئەوانن.

٣٥- دەست و پێوەندی جوولەکە هەروەکو ئەوانن.

٣٦- هیچ کەسێکیش لە ئەوان بۆی نیە دەر بچێت بە ڕێگەپێدانی موحەممەد نەبێت ﷺ.

(هەر کەسێکیش شەڕ و دەست درێژی بکات، لە دژی خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی خۆی دەیکات، مەگەر کەسێك ستەمی لێ کرابێت. خوای گەورەیش لەسەر ئەمانە ڕازی نیە).[1]

٣٧- جوولەکە خەرجیان لەسەر خۆیانە و، موسڵمان خەرجیان لەسەر خۆیانە، پشتگیری کردنیش هەیە لە نێوانیاندا لە دژی کەسێك دژایەتی ئەم دەستورە بکات، هەروەها ئامۆژگاری کردنیش هەیە لە نێوانیاندا، لەگەڵ چاکەشیدا نەك خەراپە.

٣٨- کەسێك گوناهبار نابێت بە کردەوەی هاوپەیمانەکەی و، ستەملێکراو پشتگیری لێ دەکرێت.

٣٩- ناوەوەی یەسریب قەدەغەیە لەسەر ئەوانەی پەیوەندیان هەیە بە ئەم پەڕەوە.

٤٠- دراوسێ هەروەکو خۆتە بەبێ زیان و گوناه.

٤١- هیچ پیرۆزیەکیش پەنا نادرێت بە مۆڵەتی خاوەنەکانی نەبێت.

٤٢- هەرچی ناکۆکی ڕوودەدات لە نێوان ئەوانەی پەیوەندیان هەیە بە ئەم لاپەڕەوە، بۆ یەکلاکردنەوەی پێویستە بگەڕێنەوە لای خوا و پێغەمبەر ﷺ خوا گەورە و پشتیوانە بڕوادارەکانیش قایلن بەوەی کە لەم لاپەڕەدا هاتووە.

---

١- ئەوەی لە نێوان ئەم دوو کەوانەوەیە لە سیرەی ئیبنو هیشام وەرگیراوە.

٤٣- پێویستیشە هەموویان بەرگری بکەن لە یەسریب. (نە قورەیش و نە پشتیوانانی ڕەوا نیە پەنابدرێن).[١]

٤٤- ئەگەریش بانگبکرێن بۆ بەشداریکردن لە ئاشتی‌وڕێکەوتن ,لەسەریانەبەشداریبکەن ,هەمان ئەو مافەشیان هەیە لەسەر ئیمانداران مەگەر کەسێکیان دژایەتی ئاینی خوا بکات ئەوە بانگهێشتی جێبەجێناکرێت.

٤٥- جوولەکەکانی ئەوس، خۆیان و مەوالییەکانیان، حاڵیان حاڵی ئەوانەیە پەیوەندیدارن بەم لاپەڕەیەوە، لەگەڵ چاکەی تەواو لە لایەن ئەو کەسانەوە، چاکەیش وەکو خراپە نییە، هەر کەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات، لەگەڵ خۆیدا ئەنجامی دەدات، خوای گەورەیش لەسەر ئەوەی لەم لاپەڕەدا هاتووە ڕازییە.

٤٦- ئەم نووسراوە نابێتە ڕێگر لە گەیشتن بە ستەمکار و تاوانبار، هەر کەسێکیش دەربچێت، یان دانیشێت لە مەدینە، دڵنیا و بێ ترس دەبێت، مەگەر کەسێك ستەم بکات یان تاوانبار بێت، خوای گەورەیش پەنای هەموو چاکەکارێکە، هەروەها موحەممەدیش ﷺ.[٢]

**دووەم: هەندێك پەندو ئامۆژگاری سەبارەت بە دەستورەکە(نوسراوەکە).**

**١- دیاریکردنی چەمکی ئومەت:**

ئەو دەستورە(نوسراوە) هەندێك بنەمای گشتی لە خۆگرت، کە دەستورە نوێیەکانیش تاکو ئێستا دەیهێننەوە، پێشەنگی ئەو بنەمایانەیش دیاری کردنی چەمکی نەتەوەیە، چونکە نەتەوە لەو لاپەڕەیەدا موسوڵمانان هەمویان دەگرێتەوە. بە موهاجیرو ئەنصارەوە، هەروەها کەسانێکی تر کەخۆیان دابێتە پاڵیان وە جیهادیان لەگەڵ دا بکەن، ئەوان هەموویان پێکەوە نەتەوەیەکن لەناو خەڵکیدا.[٣] ئەمەیش شتێکی نوێ یە لەمێژوی ژیانی سیاسی لە دورگەی عەرەب، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەوانی گواستەوە لە دروشمی هۆزایەتی و پاشکۆیەتی بۆی، بەرەو دروشمی نەتەوە کە هەموو کەسێك دەگرێتەوە لەوانەی ئاینی تازەیان هەڵبژاردووە،

---

١ - ئەمەی نێو دوو کەوانەکە لە ئیبنو هیشامەوەیە.

٢- بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية (٤١/٤٧)، هەروەها بڕوانە: ابن هشام (١/٥٠١-٥٠٤).

٣ - بڕوانە: التاريخ السياسي والعسكري، د. علي معطي (١٦٩).

چونكە دەستورەكە ناویانی بردووە بەوەی یەك نەتەوەن، (مادەی بیست و یەك)، قورئانیش بڕیاری هەمان بنەمای داوە كە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ (الانبیاء: ٩٢).

هەروەها قورئانی پیرۆز ناوەندێتی ئەم نەتەوەی باس كردووە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلۡقِبۡلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيۡهَآ إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِۚ وَإِن كَانَتۡ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ (البقرة: ١٤٣).

خوای گەورە ڕوونیشی كردۆتەوە كە ئەم نەتەوە چونكە نەتەوەیەكی كاریگەرە، هەڵوێستی تەماشاكەر وەرناگرێت لە كێشەكانی سەردەمەكەی، بەڵكو فەرمان بە چاكە دەكات و، خراپە قەدەغە دەكات و، بانگەواز دەكات بۆ چاكەكاری و، وریایی دەدات لە خراپەكاری،[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾ (ال عمران: ١١٠).

لە ژێر ئەم ناوەی نرا لە كۆمەڵی موسڵمانان و ئیمانداران و ئەوانەی شوێنیان كەوتن لە خەڵكی یەسریب، موسڵمانان بە هەموو هۆزەكانیانەوە یەكیان گرت، لەسەر بنەمای پەیوەندی ئیسلام و هاوبەرپرسیارێتی لەنێوان خۆیان و، پشتگیریكردن لە ستەم لێكراو دژ بە ستەمكار و، چاودێری كردنی مافەكانی خزمایەتی و خۆشەویستی و، دراوسێیەتی و،[2] لە ڕاستیدا هەردوو تایەفەی ئەوس و خەزرەج لەناو كۆمەڵی ئەنصاردا توانەوە، ئینجا كۆمەڵی ئەنصار و موهاجیریش

---

١ ـ بڕوانە: دستور الامة، د. عبدالناصر العطار (٩).

٢ ـ بڕوانە: التاریخ السیاسي والحضاري، د. السید عبدالعزیز سالم (١٠٠).

توانەوە لە کۆمەڵی موسڵمانانەوە و بوون بە یەك نەتەوەی[1] پێکەوە بەستراو بە پەیوەندی بیروباوەڕ نەك خزمایەتی، چونکە هەست و بیروبۆچوون و ڕووگە و خۆشەویستمان بۆ خوایە نەك بۆ هۆز، پەنا بردنیانیش بۆ شەرعە نەك بۆ داب و نەریت، بەم شتانەش خۆیان جیاکردۆتەوە لە هەموو خەڵکی، ئەم پەیوەندیانە تەنها تایبەتن بە موسڵمانانەوە، کەسانی تر ناگرێتەوە لە جولەکە و هاوپەیمانەکانیان.

بێگومان جیاکردنەوەی کۆمەڵی ئاینی مەسەلەیەکی مەبەست بوو، ئامانجیش تیایدا زیاتر یەکگرتن و شانازیکردن بوو بە خۆیانەوە[2] ئەویش زیاتر لەوەدا دەردەکەوێت کاتێك کە جیابوونەوە لە هەمووان بەیەك قیبلە و ڕووکردنە کەعبە پاش سیانزە یان حەڤدە مانگ لە بەیتولمەقدیس.[3]

ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەر بەردەوام بوو لە جیاکردنەوەی هاوەڵانی لە زۆر بابەتدا، بۆیانیشی ڕوون کردەوە کە مەبەستی ناقایلی جولەکەکانە، بۆ نموونە جولەکەکان بە پێڵاوەوە نوێژ ناکەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی هاوەڵانی دا کە نوێژ بکەن بە پێڵاوەوە هەروەها جولەکەکان نیشانەی پیرییان ڕەنگ نەدەکرد، بۆیە موسڵمان سپێتی سەر و ریشیان بە خەنە و جۆرە ڕووەکێك کە تەمی پێ دەوترا ڕەنگ دەکرد هەروەها جولەکە ڕۆژی عاشوورا بەڕۆژوو دەبوون، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی ژیانیدا بڕیاریدا ڕۆژی نۆیەمیش لەگەڵ دەی موحەڕەم بەڕۆژوو بێت وەکو جیاوازییەك لەگەڵ ئەوان.[4]

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بنەمای بە پێچەوانە ڕۆیشتنی جگە لەخۆیانی بۆ بڕیار دان و فەرمووی: ((من تشبه بقوم فهو منهم))[5] واتە: کەسێك لاسایی کەسانێکی کردەوە

---

١ ـ بڕوانە: التاريخ السياسي والحضاري، د. السيد عبدالعزيز سالم (١٠٠).

٢ ـ بڕوانە: قيادة الرسول السياسية والعسكرية، احمد راتب (٩٣).

٣ ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢٩٣/١).

٤ ـ بڕوانە: تاريخ خليفة بن خياط (٢٣،٢٤)، و سيرة ابن هشام (٥٥٠/١).

٥ ـ بڕوانە: تاريخ خليفة بن خياط (٢٣،٢٤)، و سيرة ابن هشام (٥٥٠/١).

لە ئەوانە. هەروەها فەرموویەتی: "لاتشبَّهوا باليهود"[١] واتـە: لاسـایی جوولەکـەکان مەکەنەوە. فەرموودەش لەو بارەوە زۆرن، کە جیاوازی موسڵمانان لـە کەسـانی تـر دەردەخات، بێگومان لاسایی کردنەوەی کەسانی تریش ناگونجێت لەگـەڵ شـانازی کردن بە خۆ و بەرزبوونەوە بەسەر بێباوەڕاندا، ئەمیش بەربەسـتێك دروسـت ناکـات لە نێوان ئەوان و کەسانی تر چونکە قەوارەی کۆمەڵی ئیسلامی گەورەیـە و، فـراوان بوونەوە هەڵدەگرێت و کەسێك بـاوەڕ بـە بیروباوەڕەکـەی بهێنێـت دەتوانێـت خـۆی بداتە پاڵیان.[٢]

ئەو دەستورە جوولەکەی بە بەشێك لە هاوڵاتیـانی دەوڵـەتی ئیسلامی دانـاوە و ڕەگـەزێکی سـەرەکیش لـە ڕەگـەزەکانی، بۆیـە مـادەی شـانزە ئـەو چـەمکەی تیـا هـاتووە و لـە مـادەی بیـست و پێنجـیش زیـاتر ڕۆشـنایی خراوەتـە سـەر کاتێـك جوولەکەی بەنی عەوف بە نەوەیەك دانراون لەگەڵ ئیمانداران.

بەم شێوەیش دەبینین کـە ئیـسلام ئـەهلی کیتـابی بـەهاوڵاتی خـۆی ژمـاردووە، تائـەو کاتـەی هەڵدەسـتن بەئەرکـەکانی خۆیـان، چـونکە جیـاوازی ئـاین – بـەپێی بڕگەکانی دەستورەکە – هۆیەك نییە بۆبەهاوڵاتی نەبوون.[٣]

**٢- دەسەڵاتی بەرز بۆ خوا و پێغەمبەرەﷺ:**

دەستوری مەککە بڕینەوەی هەموو مەسەلەکانی گێڕاوەتەوە بۆ خوا و پێغەمبەرﷺ وەکو لە مادەی بیست و سێ هاتووە، مەبەستیش لەوە ئاشکرایە کە بریتیە لە دووپاتکردنەوەی دەسەڵاتی تایبەتی ئاینەکەزاڵ بێت بەسەر مەدینە و ناکۆکیەکان یەکلایی بکاتەوە بۆ ڕێگرتن لە دروست بوونی پشێوی لەناو مەدینە، لە هەمان کاتدا جەخت کردنەوەیەك بێت لەسەر سەرۆکایەتی پێغەمبەرﷺ، لەسەر دەوڵەت،[٤] چونکە دەستورەکە سەرچاوەی دەسەڵاتە، تەشریع و دادوەری و

١- بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (١/٢٩٣).

٢- بڕوانە: نظام الحكم، ظافر القاسمي (١/٣٧).

٣ - بڕوانە: تاريخ السياسي والحضاري، د. السيد عبدالعزيز (١٠٢).

٤ - بڕوانە: تفسير المنار (١٢/٣٠٩).

جێبەجێکردنەکانی دەستنیشان کردووە، پێغەمبەریشﷺ پەرۆشی بوو بۆ فەرمانڕەوایی خوای گەورە بەندایەتیەکی پەتیە بۆ پەروەردگار، چونکە یەکتاپەرستی دێتە دی و ئایین تەنها بۆ خوا دەبێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف: ٤٠).

واتە: حوکمی ڕاستەقینە لە خوایەتی و بیروباوەڕ و پەرستن و مامەڵەکردندا تەنها بۆ خوای گەورەیە، بە وەحی دەینێرێت بۆ هەڵبژاردەی خۆی لە پێغەمبەران وە ڕێگە نەدراوە بە هیچ ئادەمیزادێك بە بیروبۆچوون و ئارەزووی خۆی قسەی تیا بکات، یان بە کۆشش و بەباش زانینی خۆی بڕیاری تیا بدات، چونکە ئەم بنەمایە بنچینەی ئاینی خوایە لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران ناگۆڕێت بە گۆڕینی جێگا و کاتەکان.[1]

قورئانی پیرۆز دابەزیووە لەپێناو بەدی هێنانی بەندایەتی و فەرمانڕەوایی بۆ خوای گەورە، وەکو فەرموویەتی ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ﴾ (الزمر: ٢-٣).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ (النساء: ١٠٥).

وەکو چۆن بەدی هێنانی بەندایەتی ئامانجێکە بۆ دابەزاندنی قورئان، جێ بەجێکردنی فەرمانڕەوایەتیش ئامانجێکە لە دابەزاندنی، وەکو چۆن خواپەرستیش

١ـ بڕوانە: الحكم والتحاكم في خطاب الوحي (٤٣٣/١).

ئەنجام نادرێت لە ڕێگەی وەحیەوە نەبێت، بە هەمان شێوە ڕەوا نیە حوکم بە هیچ بکرێت جگە بە شەرعی خوای گەورە نەبێت یان بەشتێك کە بنچینەی هەبێت لە شەرعدا.[1]

جێبەجێکردنی حاکمییەت هەموارکردنی خواپەرستنە و هەڵسانە بەو ئامانجەی کە مرۆڤ و جنۆکەی لە پێناودا دروستکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات: ٥٦).

جوولەکەکانیش لەو دەستورەدا دانیان نا بە دەسەڵاتێکی دادوەری باڵادا، کە دانیشتوانی مەدینە بگەڕێنەوە لای بە جوولەکەکانیشەوە، بەپێی مادەی چل و دوو، بەڵام جوولەکە ناچار نەکران هەموو کاتێك هەر بگەڕێنەوە بۆ لای دادوەری ئیسلامی، بەڵکو تەنها لەو ڕووداوانەی لە نێوان خۆیان و موسڵماناندا ڕوو دەدات، بەڵام سەبارەت بە مەسەلە تایبەتەکانیان و بارە کەسایەتییەکانیان، خۆیان دەگەڕێنەوە بۆ تەورات و قەشەکانیان حوکمیان دەکرد لە نێوانیاندا، بەڵام ئەگەر بیانویستبا دەیانتوانی دادوەرییان بهێننە لای پێغەمبەر ﷺ.

قورئانیش پێغەمبەر ﷺی ئازاد کرد لەوەی قایل بێت بە حوکم کردن لە نێوانیاندا، یان گێڕانەوەیان بۆ لای قەشەکانیان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ (المائدة: ٤٢).

یەکێك لەو مەسەلانەش جوولەکەکان ویستیان پێغەمبەر ﷺ بکەن بە دادوەر تیایدا، ناکۆکی نێوان بەنی نەزیر و بەنی قورەیزە بوو لە خوێنبایی کوژراوەکانیاندا، چونکە بەنی نەزیر بەهێزتر بوون لە بەنی قورەیزە، بۆیە خوێنبایی دوو بەرامبەریان دەسەپاندە سەریان بۆ کوژراوەکانیان، جا کاتێك ئیسلام بوو بە خاوەن دەسەڵات

---

١ ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة (٢٩١/١).

لە مەدینە بەنی قورەیزە قایل نەبوون بە زیادەکە و داوای یەکسانیان[1] کرد لە خوێنباییدا، بۆیە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ (المائدة: ٤٥).

بەپێی مادەی چل و دوویش پێغەمبەر ﷺ بوو بە خاوەن دەسەڵاتی دادوەری باڵا کە هەموان دەگەڕێنەوە لای، هێزێکی جێبەجێ کردنیشی بوو، چونکە فەرمانەکانی خوای گەورە پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت و جێبەجێ بکرێت، بە هەمان شێوە فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺیش پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت.[2]

بەم شێوەیەیش پێغەمبەر ﷺ بوو بە سەرۆکی دەوڵەت، لە هەمان کاتیشدا سەرۆکی دەسەڵاتی دادوەری و جێبەجێ کردن و شەرعەکان، پێغەمبەر ﷺ بە خۆی ئەو سێ دەسەڵاتەی گرتەدەست وەکو پێغەمبەری خوا و داوا لێکراو بە گەیاندنی شەرعی خوا و، لێکدەرەوەی کتابی خوا، دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی وەکو پێغەمبەری فەرمانڕەوا و سەرۆك وەرگرت، چونکە بەپێی برگەکانی دەستورەکە سەرۆکایەتی گرتە دەست، هەروەها بە پێکهاتنی تایەفە جیاجیاکان لەوانەی مادەی سی و شەش دەیانگرێتەوە، کە هاوپەیمانێتیان لەسەر قەدەغە کراوە لەگەڵ قورەیشدا، یان هەر هۆزێکی تر دوژمنی ئیسلام بێت، بەڵکو برگەی لەوەش ڕوونتر ئەوەیە کە بڕیار درا کەس پەنای قورەیش یان پشتیوانانی قورەیش نەدات، لەو دوستورەشدا ناوی کەس نەهاتووە جگە لە پێغەمبەر ﷺ.[3]

### ٣- هەرێمی دەوڵەت:

هەروەها لە یەکێك لە برگەکانی دەستورەکەدا هاتووە کە مەدینە قەدەغە کراوە، بنچینەی ئەو قەدەغە کردنەش ئەوە بوو درەختەکانی نەبڕێتەوە و،

---

١ ـ بڕوانە: دولة الرسول (ﷺ) من التكوين الى التمكين (٤١٨).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٤٢٠).

٣ ـ بڕوانە: نظام الحكم: ظافر القاسمي (٣٨/١).

پەلەوەرەکانی نەکوژرێن، جا ئەگەر ئەوە حوکمی درەخت و پەلـەوەر بێـت، ئـەبێت حوکمی ماڵ و ئادەمیزادەکـان چۆن بێـت؟[١] ئـەم دەسـتورە نیـشانەکانی دەوڵـەتی دیاری کرد، یەك نەتەوە و، یەك هەرێم کە مەدینەیە و دەسـەلاتێکیش کـە هـەمووان دەگەڕێنەوە لای و قسەی خوای گەورە حوکم دەکات.

مەدینە بریتی بوو لە سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامی و خاڵی دەرپـەڕین و ناوەنـدی بازنەکە کە دەوڵەت لێوەی گەورەوە دەبوو، بۆ ئـەوەی سنوورێك دیـاری بکـات بـۆ پشێوی و نائارامی و ئاسایشی گشتی تیا بەرقەرار بێت.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی خۆی نارد بۆ جێگیرکردنی هەنـدێ ئـالآ لـە هـەموو لاکانی مەدینە، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، لە نێوان کێـوی سـەور لـە بـاکوورەوە و، کێوی عەیر لە باشوورەوە.

ئینجا ئەم هەرێمە فراوان بوویەوە بە فراوان بوونەوەی فتووحاتەکان و موسڵمان بـوونی ئـەو گەلانـە تـاکو ڕووبـەرێکی فـراوان و بـەربڵاوی گرتـەوە، لـە زەریـای ئەتڵەسیەوە لە ڕۆژئاواوە کە ناوچەگەلێکی زۆری لە ڕۆژئـاوای ئـەورووپا و باشـووری گرتەوە، بۆ ناوچەگەلێکی تری بەربڵاو لە ڕۆژئاوای ئاسیا و باشووری، تاکو دەگاتـە زۆربەی خـەڵکی چـین و ڕووسـیا لـە ڕۆژهەڵاتـەوە و، هـەمووی بـاکووری ئـەفریقیا و ناوەڕاستی،[٢] هەرێمی دەوڵەت کراوە بوو، هیچ سنوورێکی جوگرافی یان سیاسی بـۆ دەستنیـشان نـەکرابوو، چـونکە لـە پایتەختـەوە دەسـت پێـدەکات کـە مەدینـە و، هـەموو گـۆی زەوی دەگرێتـەوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (الاعراف: ١٢٨).

هـەروەها چـەمکی نەتـەوەیش بـە هـەمان شـێوە کراوەیـە و دەنـەخراوە لەسـەر دەستەیەکی دیاری کراوە بەڵکو پـان دەبێتـەوە بـۆ ئـەوەی مرۆڤایـەتی بگرێتـەوە،

---

١ ـ بڕوانە: دولة الرسول (ﷺ) من التكوين الى التمكين (٤١١).

٢ ـ هەمان سەرچاوە (٤٢١).

ئەگەر وڵامی ئاینی خوای گەورە بدەنەوە.

چونکە دەوڵەتی ئیسلامی پەیامی جیهانیە، هەمرو کەسێك لەسەر زەویدا پشکی تیادا هەیە وە لە ڕێگەی جیهادیشەوە فراوان دەبێت.[1]

**٤- ئازادییەکان و مافەکانی مرۆڤ:**

دەستورەکە بە ئاشکرا ئاماژە دەکات بۆ بلیمەتی پێغەمبەر ﷺ لە داڕشتنی بابەتەکان و دیاری کردنی پەیوەندییەکان بە یەکتریەوە، چونکە ئەو بابەتانە بە شێوەیەکی گشتی بە یەکەوە بەسترابوون و، دەگونجا بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخ و کێشەکانی ناو مەدینە لەو کاتەدا، ئەوەندەیش بنچینە و بنەمای تیادا بوو کە دادگەری ڕەها و یەکسانی تەواو بەدی بهێنێت لە نێو ئادەمیزادەکاندا و، هەمووان ماف و ئازادییەکانیان دەستەبەر بێت.[2]

دکتۆر (محمد سليم العوا) دەڵێت: تاکو ئەم ڕۆژگارەیش ئەو بنەمایانەی دەستورەکە هەر کاریان پێ دەکرێت، پێ دەچێت هەر کاریانیش پێ بکرێت لە سیستەمەکانی حوکمڕانیدا، خەڵکی لە پاش چەندین سەدە بەوە گەیشتن کە لە یەکەم دەستوری سیاسیدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ نووسیویەتیەوە.[3]

دەستورەکە ئاشکرای کرد کە ئازادیەکان پارێزراون، وەکو ئازادی بیروباوەڕ و خوا پەرستی و، مافی ئاسایش... هتد.

بۆ نموونە ئازادی ئاین دەستەبەر بوو بۆ موسڵمانان و جوولەکەکان، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٥٦).

ئینجا دەستورەکە بە توندی هەڕەشەی کردووە لە سەرپێچی کەران لەو بنەمایانەی تیایدا هاتوون، ئینجا دەستورەکەش بە ڕوونی باسی بەرپاکردنی

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٤٢٠).

٢ ـ بڕوانە: النظام السياسي في الاسلام (٦٥).

٣ـ هەمان سەرچاوە (٥٨).

دادگەری و یەكسانی كردووە لە نێوان خەڵكیدا.

دەوڵەتی ئیسلامی پێویستە لەسەری بوار برەخسێنێت بۆ هەموو مرۆڤێك داوای مافی خۆی بكات و پێ بگات بە ئاسانترین رێگەوە بەبێ ماندوو بوون و زیان بینین،[1] پێویستیشە لەسەری هەر رێگرێك قەدەغە بكات كە كۆسپ بێت لە رێگەی وەرگرتنەوەی مافەكەیدا، بێ رەچاوكردنی زمان و نیشتیمان و باری كۆمەڵایەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا ۚ اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (المائدة: ٨).

واتە: رقتان لە كەسانێك واتان لێ نەكات ستەمیان لێ بكەن، لە لایەكی تریشەوە ئەوە دەگەیەنێت خۆشەویستیتان بۆ كەسانێك واتان لێ نەكات چاوپۆشیان لێ بكەن.[2]

سەبارەت بە بنەمای یەكسانیش، دەقەكان بە راشكاوی هاتوون دەربارەی، وەكو مادەی پانزە و نۆزدە كە بە ئاشكرا وەكو سوهەیلی دەڵێت — ئاماژە دەكات بۆ یەكسانی.[3]

بنەمای یەكسانی یەكێكە لەو بنەمایانەی ئیسلام دانی پێداناوە، چونكە بنەمایەكە بەشداری دەكات لە دروستكردنی كۆمەڵگای موسڵمان، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ (الحجرات: ١٣).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( يأيها الناس الا ان ربكم واحد، وان أباكم واحد، الا لا فضل لعربي على اعجمي، ولا لعجمي على عربي، ولا لأحمر على أسود، ولا لأسود على أحمر إلا بالتقوى، ابلّغتُ))[4]؟

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٥٢).

٢ـ بڕوانە: الروض الانف (١٧/٢) نقلا عن نظام الحكم للقاسمي (٣٨/١).

٣ـ بڕوانە: مسند امام احمد (٤١١/٥)، برقم (٢٣٤٨٩) ط/ الرسالة، وقال محققوه: اسناده صحيح.

٤ ـ بڕوانە: مبادئ نظام الحكم في الاسلام، عبدالحميد متولي (٣٨٥).

واتە: ئەی خەڵکینە خوای ئێوە یەك خوایە، باوکتان یەك باوکە، چاك بزانن، هیچ عەرەبێك چاکتر نیە لە کەسێك عەرەب نەبێت، یان کەسێك عەرەب نەبێت چاکتر نیە لە عەرەبێك، یان سوورێك لە ڕەشێك یان ڕەشێك لە سوورێك، تەنها بە تەقوا و لەخوا ترسان نەبێت، ئایا ئەمەم ڕاگەیاند؟

ئەم بنە مایە بووەهۆی ڕاکێشانی زۆرێك لەگەلان لەکۆن و تازەدا بەرەو ئیسلام، ئەم بنەمایە سەر چاوەیەك بوو لەسەرچاوەکانی هێز بۆ موسڵمانان.

لێرەشدا مەبەست لە یەکسانی یەکسانی گشتی نییە لەنێوان هەموو خەڵکدا، لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، وەکو هەندێ لەفریو خۆرەکان بانگەشەی بۆدەکەن و بەدادگەرانەی دەزانن،[١] چونکە جیاوازی لەبەهرەو تواناکان، هەروەها لەپلەکان ئامانجێکە لەئامانجەکانی دروست کردن،[٢] بەڵکو مەبەست لەو یەکسانیە کە شەریعەت بانگەوازی بۆ کردووە، کەیەکسانییەکە پەیوەستە بەباروودۆخەکانەوەو، ڕەها نییە لە هەموو بارودۆخەکاندا،[٣] یەکسانی لەمامەڵەکردنی خەڵکی دایە بەرامبەر شەرعو دادوەری و، هەموو حوکمە ئیسلامی و مافە گشتییەکان بەبێ جیاوازی بەهۆی نەژادوو ڕەگەزو ڕەنگ و ماڵ و سامان و ناوداری و ....[٤]

دەستورەکە هەموو ئەو پێویستیە دەستورییەو کارگێڕییەکانی تێدایە بۆدەوڵت و ، پەیوەندی تاکەکان بەدەوڵەتەوە، قورئانیش بۆماوەی دەساڵ بەسەر پێغەمبەردا دابەزی لەمەدینەو نەخشەی دەکێشا بۆ ڕێبازەکانی ژیان و هەڵدەسا بەداڕشتنی بنەماکانی حوکم و بنچینەکانی سیاسەت و کارو باری کۆمەڵگاو، حوکمەکانی حەڵاڵ و حەرام و بنچینەکانی دادوەری و، یاساکانی دەوڵەتی موسڵمانان لە ناوە و دەرەوە، سونەتی بڵندی پێغەمبەریش ﷺ پاڵپشتی دەکرد و شیکردنەوە و بەرچاو ڕوونی دەکرد، چونکە دەستورەکە بریتی بوو لە هەندێ هێڵی پان لە ڕێکخستنی دەستووری و دەستنیشانکردنی پەیوەندی بە بێباوەڕە نیشتەجێکانی مەدینە، لە ئەوپەڕی لێبوردن و یەکسانیدا، بە تایبەتی کاتێك تێبینی ئەوە بکرێت ئەم

---

١ ـ بڕوانە: الاخلاق الاسلامية واسسها، للميداني (٦٢٤/٤).

٢ـ بڕوانە: فلسفة التربية الاسلامية، ماجد الكيلاني (١٧٩).

٣ـ بڕوانە: مبادئ علم الادارة، محمد نورالدين (١١٦).

٤ـ فقه التمكين، د. علي الصلابي (٤٦٣).

دەستورە بۆ کەسانێك بووە کە دیلی دەمارگیری هۆزایەتی بوونەوە هەستیان بە بوونی خۆیان نەدەکرد بە زاڵبوون و دەسەڵات نەبێت،[١] ئەم دەستورە واتای شارستانی زۆری تێدابوو، لەوانەی کە خەڵکی ئەمڕۆ ناوی دەبەن بە مافەکانی مرۆڤ، کە پێویستە لەسەر هەردوولا پابەند بن بە بڕگەکانیەوە، جا ئایا ئەم پابەندبوونە دروست بوو؟[٢]

**سێیەم: هەڵوێستی جوولەکە لە مەدینە.**

جوولەکەکان بە بەڵگەی سەلمێنراو بۆیان دەرکەوت کە موحەممەدﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام ئەوان زیاتر بەرهەڵستی و دوژمنایەتیان دەکرد و ڕق و کینەیان پەرەی دەگرت لە دژی پێغەمبەرﷺ و ئیمانداران، سەفیەی کچی حویەی کوڕی ئەختەبی دایکی بڕواداران رضي الله عنها دەفەرموێت: من خۆشەویستترین منداڵەکانی باوکم بووم لە لای باوکم و ئەبو یاسری مامم، هەر کاتێك لەگەڵ منداڵێکی تر منیان ببینیایە تەنها منیان هەڵدەگرت، دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خواﷺ هاتە مەدینە و، لەلای بەنی عەوف لە قوبا لایدا، باوکم چوو و مامم بەیانی زوو پێش ڕووناك بوونەوەی دونیا چوونە لای، نەشگەڕانەوە تا نزیکی خۆرئاوابوون، بە ماندوویی و خاوەخاو گەڕانەوە، دەڵێت: منیش بۆیان پێکەنیم وەکو جارەکانی تر، بەڵام کەسیان ئاوڕیان لێم نەدایەوە، ئەوەندە خەمبار بوون، دەڵێت: گوێم لە یاسری مامم بوو بە باوکمی دەوت: ئایا ئەوە خۆی بوو؟ وتی: بەڵێ سوێند بە خوا خۆی بووە، وتی: ئایا دەیناسی و جێگیری دەکەی؟ وتی: بەڵێ، وتی: کەواتە چیت لە دڵدایە بەرامبەری؟ وتی: دژایەتی کردنی تا ماوم.[٣]

جوولەکەکان چەندین هێرشی ڕاگەیاندنیان بەرپاکرد بۆ ناشیرین کردنی پێغەمبەرﷺ و ڕەواندنەوەی خەڵکی لە دەوری، چونکە جوولەکە هەستیان کرد بە مەترسیەکی ڕاستەقینە لەسەر بەرژەوەندیەکانیان، هەروەها لەسەر بیروباوەڕە

---

١ـ بڕوانە: صور وعبر من الجهاد النبوي في المدينة، د. محمد فيض الله (٢٩-٣٠).

٢ـ بڕوانە: هجرة الرسول وصحابته للمجل (٢٦١).

٣ـ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (١/٥١٨-٥١٩).

ساختەکەیان کە لەسەر سەرکەشی و خەڵکی بە کەمزانین بنیات نراوە، ئیسلام بانگەوازی دەکرد بۆ یەك خوا پەرستن، ئەوان دەیانوت عوزەیر کوڕی خوایە، ئیسلام بانگەوازی دەکرد بۆ یەکسانی لە نێوان ڕەگەزی ئادەمیزاددا بەگشتی، ئەوان خۆیان بە گەلی هەڵبژاردەی خوا دەزانی و خەڵکی تریان لە خۆیان بە کەمتر دەزانی،[1] بۆیە ئەوان پابەند نەبوون بە بڕگەکانی دەستورەکە و، دەستیان کرد بە گومان دەربڕین بەرامبەر پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ و پەیامەکەی، پرسیاری زۆریشیان دەکرد بۆ ئەوەی لە ڕوودا بمێنێت و سەغڵەت بێت، هەروەها ئیماندارانیان دەخەڵەتاند و درۆیان لەگەڵ دەکردن،[2] بێجگە لە کاری خراپەی تریش.

**١ـ هەوڵدانی جوولەکە بۆ شەقکردنی بەرەی ناوخۆیی:**

یەکێك لە هۆکارە نەگریسەکانیان بۆ دژایەتی ئیسلام پەرتەوازەکردنی ڕیزی موسڵمانان بوو، لە ڕێگەی پچڕاندنی پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوانیاندا، بە وروژاندنی پشێوی ناوخۆیی و بەرزکردنەوەی دروشمی نەفامی و، دەمارگیری هەرێمایەتی و، بانگەشەی ڕەگەزپەرستی و هۆزایەتی و، ئاشووبەگێڕی لە نێو برایاندا، کە وەکو یەك جەستە هەڵوێستیان دەکرد.[3]

یەکێك لە پیرەکانی جوولەکە تەڵەکەیەکی دۆزیەوە بۆ پەرتەوازەکردنی ئەنصارەکان، لە ڕێگەی وروژاندنی دەمارگیری بۆ ئەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ نەفامی جاران و پێغەمبەرﷺ کەسانێك لە باشترین پشتیوانەکانی لە دەست بدات،[4] دەربارەی ئەم هەواڵە موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەگێڕێتەوە: شاسی کوڕی قەیس، کابرایەکی بەساڵاچوو بوو بێباوەڕێکی سەرسەخت و کینە لە دڵ بوو بەرامبەر بە موسڵمانان، بە لای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ تێپەڕ بوو لە ئەوس و خەزرەج، لە کۆڕێکدا پێکەوە گفت و گۆیان دەکرد، ئەویش بە ڕووخۆشی و

١ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود، د. محمد ابو فارس (٣١/١).

٢ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود، د. محمد ابو فارس (٣١/١-٤٦).

٣ ـ هەمان سەرچاوە (٤٤/١).

٤ ـ بڕوانە: التاريخ الاسلامية للحميدي (٣٧/٤).

قسەکانیان بێ تاقەت بوو، وتی:

کوڕانی قەیلە[1] پێکەوە دابنیشن پێکەوە لەم وڵاتە، ئیتر ئێمە دانیشتنمان چۆن دەبێت، ئیتر داوای کرد لە لاوێکی جوولەکە بچێتە نێویانەوە، باسی ڕۆژی بوعاس بکات، کە لەو ڕۆژەدا ئەوس سەرکەوتنە سەر خەزرەجدا و، سەدانیان کوژران.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ئەویش وایکرد و هەندێك هەڵبەستی وەبیر هێنانەوە دەربارەی شەڕەکە، ئیتر دوو کەس لەوان لە یەکتر ڕاست بوونەوە و دەستیان کرد بە قسە بەیەك وتن، تا یەکێکیان بە ئەوەی تری وت: گەر حەز دەکەن شەڕەکە لە جاران گەرمتر بەرپا دەکەینەوە، ئیتر هەردوولا تووڕەبوون و وتیان بەڵێ با وابێت، جێگای یەکتر بینینیشمان حەڕڕە بێت.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ کۆمەڵێك لە موهاجیرەکاندا ڕۆیشت بۆ لایان و فەرمووی: ((یا معشر المسلمین، الله الله، ابدعوی الجاهلیة، وانا بین اظهركم بعد ان هداكم الله للاسلام واكرمكم به، وقطع به عنكم امر الجاهلیة، واستنقذكم به من الكفر والف به بین قلوبكم؟)).

واتە: ئەی کۆمەڵانی موسڵمانان لە خوا بترسن، ئایا بانگەشەی نەفامی دەکەن و من لە نێوانتان دام، لە پاش ئەوەی کە خوای گەورە ناسینی ئیسلامی پێ بەخشین و، لە نەفامی ئێوەی دابڕی و، ڕزگاری کردن لە بێباوەڕی و دڵەکانتانی یەکخست.

ئیتر بۆیان دەرکەوت کە شەیتان فریوی داون و دوژمن پیلانی بۆ گێڕاون، ئەوسا دەستیان کرد بە گریان و باوەشیان کرد بەیەکدا هەموویان، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بە گوێڕایەڵی گەڕانەوە، دوای ئەوە سەبارەت بە ئەم مەسەلە خوای گەورە ئایەتی دابەزاند: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (ال عمران: ٩٨-٩٩).

---

١ ـ قەیلە: دایکی ئەوس و خەزرەجە.

هەروەها دەربارەی ئەوسی کوڕی قەیزیی و جەباری کوڕی سەخر و ئەوانەی لەگەڵیان بوون لە کۆڕەکەدا، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ۚ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخْتَلَفُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (ال عمران: ١٠٠-١٠٥).

لە ئەم بەسەرهاتەدا توانای پێغەمبەرﷺمان بۆ دەردەکەوێت بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکانی جوولەکە بۆ تێکدانی ڕیزی موسڵمانان و، بایەخدانی بە کاروباری موسڵمانان و، بەزەیی پیاهاتنەوەیان، چونکە بە پەلە چووە لای ئەنصارەکان و خوای گەورەی بە یادیان هێنایەوە و ئامۆژگاری کردن، لە ڕاستیدا وشەکانی پێغەمبەرﷺ کاریگەری زۆر هەبوو لەسەریان و هەموو شوێنەوارێکی نەفامی لە دڵ و دەروونیاندا سڕیەوە و، بۆیان دەرکەوت ئەویش پلانێك بووە لە دوژمنەکانیانەوە وە دەستیان کرد بە گریان..[1]

## ٢- هێرش کردنە سەر زاتی خوای پەروەردگار:

زیاتر لە کەسێك لەوانەی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ یان نوسیووە، ئاماژەیان کردووە بۆ ئەوەی ئەبو بەکرﷺ چووەتە سەر جوولەکەکان لە ماڵی میداس کە

١- بڕوانە: التاريخ الاسلامي (٤/٤١-٤٢).

جێگەیەك بوو تەوراتیان تیا دەخوێند، لەوێ خەڵکێکی زۆری بینیووە کۆبوونەتەوە لەسەر یەکێکیان پێی دەوترا (فنحاص)، یەکێك بوو لە زانا و قەشەکانیان قەشەیەکی تریشی لەگەڵدا بوو ناوی ئەشیەع بوو، ئەبو بەکر بە فینحاصی وت: بەڵات لێدا، لە خوا بترسە و موسڵمان بە، سوێند بە خوا تۆ چاك دەزانی موحەممەد پێغەمبەری خوایە بەڕاستی لەلای خواوە هاتووە، لە تەوراتیشدا لە لای خۆتان نووسراوە. فینحاص بە ئەبو بەکری وت: سوێند بە خوا ئەی ئەبو بەکر هیچ پێویستیمان بە خوا نییە، بەڵکو ئەو پێویستی بە ئێمەیە، ناشپاڕێینەوە لێی ئەوەندەی ئەو دەپاڕێتەوە لە ئێمە، ئێمە بێ نیازین لە ئەو بەڵام ئەو بێ نیاز نیە لە ئێمە، ئەگەر پێویستی پێمان نەبووایە قەرزی لێ نەدەکردین، وەکو هاوەڵەکەتان بانگەشە دەکات، سوو لە ئێوە قەدەغە دەکات و دەیدات بە ئێمە، ئیتر ئەبو بەکر توڕە بوو، بە توندی لە ڕوومەتی فینحاصی دا و وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئەو پەیمانە نەبووایە کە لە نێوانماندایە لە گەردەنتم دەدا، جا فینحاص چووە لای پێغەمبەرﷺو وتی: ئەی موحەممەد بڕوانە هاوڕێکەت چی پێ کردووم، ئیتر پێغەمبەرﷺ بە ئەبو بەکری وت: چی وای لێ کردیت وا بکەیت؟ ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دوژمنی خوا قسەیەکی زۆر گەورەی کرد، دەڵێت خوا هەژارە و ، ئەوان دەوڵەمەندن و منیش لە پێناوی خوادا تووڕە بووم و لە ڕوومەتیم دا، بەڵام فینحاص نکۆڵی کرد و وتی: قسەی لەم جۆرەم نەکردووە، ئینجا خوای گەورە بەرپەرچی دایەوە و ڕاستگۆیی ئەبو بەکری لەم ئایەتەدا دابەزاند: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ (ال عمران: ١٨١).

هەروەها لە ئەبو بەکردا (ڕەزای خوا لێ بێت) ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ

ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ (ال عمران: ١٨٦).[١]

قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا باسی ڕەوشت ناشرینی ئەوانی کردووە لەگەڵ خوای گەورە و، چەند قسەی نابەجێیان کردووە دەربارەی وەکو فەرموویەتی: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ (المائدة: ٦٤).

واش دەردەکەوێت ناوەڕۆکی هەڵوێستەکەیان لە کینەی دڵیان دژ بە پێغەمبەرﷺ و بانگەوازەکەی سەرچاوە دەگرێت، لەوانەشە بەجێهێشتنی موسڵمانان بۆ ئەوان هۆکارێکی تر بێت، یان ئەوەی کە موسڵمانان پەیوەندیان لەگەڵیان بڕیەوە و وەڵامی فەرمانەکانی قورئانیان دایەوە و، ئەمە ش کاریگەری خەراپی هەبوو لەسەر باری ئابووریان، کە ئەمەیش وای کرد زیاتر توڕە بن و ڕەوشت ناشرینی پیشان بدەن سەبارەت بە قسەکردن دەربارەی خوای گەورە.[٢]

**٣ـ ڕەوشت ناشرینیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و جنێودانیان بە پێغەمبەران و قورئان:**

جوولەکەکان قسەی ناشیرینیان دەکرد بە پێغەمبەر ﷺ لە ئامادەبوونی و کاتی وتارخوێندنی و تانە و تەشەریان لێدەدا و جۆرێك سڵاویان لێ دەکرد ئاماژەی تیابوو بۆ بێڕەوشتی خۆیان.

عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە کە کەسانێکی جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و وتیان: (السلام عليك) ئەی ئەبو لقاسم، واتە مردنت لەسەربێت، منیش وتم مردن لەسەر خۆتان بێت و خوا ئاوهاو ئاوهاتان لێ بکات، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((مه یاعائشة فان الله لا یحب الفحش والتفحش)) واتە: نەکەی ئەی عائیشە خوای

---

١ـ بڕوانە:تفسیر القرطبي (٤/٢٩٥)، السیرة النبویة لإبن هشام (ق١/٥٥٨-٥٥٩)، سبل الهدی والرشاد (٣/٥٨٣-٥٨٥)، وتفسیر مجاهد (١٤٠).

٢ـ بڕوانە:الصراع مع الیهود (١/٥١).

گەورە حەزی لە قسەی ناشیرین نیە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەبینی چی دەڵێن؟ فەرمووی: ئایا نابینی من وەڵامیان دەدەمەوە و دەڵێم: (وعلیکم)، دەڵێت ئەوسا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نُهُوا عَنِ النَّجْوَى ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَيَتَنَاجَوْنَ بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (المجادلة: ٨).

ئەم ئایەتەیش ئەو کینە دەردەخات کە زاڵ بووبوویە سەر جوولەکەکاندا و پاڵی پێوە دەنان هەموو ڕێگایەك بگرنە بەر بۆ لێدانی ئیسلام و، لەناوبردنی خاوەن پەیامەکە و، زاڵبوونە سەر موسڵمانانەدا، بەڵام لاوازیان لەوەدا دەردەکەوێت کە بەو جۆرە سلاویان کردووە لە پێغەمبەرﷺ، چونکە وا دەردەکەوێت کە لە قەیرانێکی دەروونیدا ژیاون بەهۆی لەدەستدانیان بۆ پلە و پایەکەیان هاتنی هێزێکی تازە، یەکێك لە کێشە سەختەکانی جوولەکەیش ئەوە بوو بەلای خۆیانەوە کە هەموو شێوازەکانی دژایەتیان بەکاردەهێنا و هیچ ئاکامێکی نەبوو، بۆیە پەنایان دەبردە بەر ئەو جۆرە ڕێگە لارانە، چونکە دوعاکردن لە دژی ناحەزدا واپیشان دانیش کە سڵاو دەکات چەکی بێدەسەڵاتانە و ئامرازی بێ ئومێدانە و مەی داخ لە دڵانە.[1]

کاتێکیش پێغەمبەرﷺ گوێی لە قسەکانی عائیشە بوو ڕەزای خوای لێ بێت) ئامۆژگاری کرد نەرم و نیان بێت، ڕوونیشی کردەوە بۆی موسڵمان بۆی نیە خۆی بداتە دەستی توڕەییەوە.

چونکە لەسەرخۆیی بەرهەمێکە هەوڵقوڵاوی ڕەوشت جوانیە، خوای گەورەیش پاداشتی نەرمی و لەسەرخۆیی باشتر دەداتەوە لە توند و تیژی.[2]

سەبارەت بە قسەکردنیشیان بە پێغەمبەران، جارێکیان چەند کەسێکیان هاتنە لای پێغەمبەرﷺ، کە بریتی بوون لە ئەبو یاسری کوڕی ئەختەب و نافیعی کوڕی

---

١ـ بڕوانە: حوار الرسول مع اليهود، د. محسن الناظر (١٠١).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٨٧).

ئـەبی نـافیع و عـازیری کـوڕی ئـەبی عـازیر و کەسـانی تـر، پرسـیاریان کـرد لـە پێغەمبەرﷺ باوەڕی بە چ پێغەمبەرێك هەیـە، پێغەمبـەریشﷺ فـەرمووی: ((نـؤمن بالله، وما انزل الينا وما انزل على ابراهيم واسحاق والاسباط وما اوتي موسى وعيسى وما اوتي النبيون من ربهم لا نفرق بين احد منهم ونحن له مسلمون)).

جا کاتێك گەیشتە باسی عیساعليه السلام وتیان: ئێمە باوەڕمان نیە بـە عیسـای کـوڕی مەریەم و باوەڕیش بە کەسێك ناهێنین باوەڕی بە ئەو بێت.

ئـیتر خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دەربارەیـان دابەزانـد: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ﴾(المائـدة: ٥٩).

سەبارەت بە هەوڵەکانیان بۆ کەم کردنەوە لەقورئانی پیرۆز، لە پرسیارو مشت و مڕەکانیاندا، ئیبنوعباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، قەشەکانی جولەکە وتیان :ئەی موحەمەد، ئەم ئایەتە: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (الاسراء: ٨٥).

ئایا مەبەست لە ئێمەیە یان نەتەوەکەی تۆ، فەرمووی هەردوولا، وتیان:بەڵام تـۆ لەوەی کەبۆت هاتووە تیایەتی کەئەوان باسی هەموو شتێکی تیایـە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: ئەوە لەزانستی خوادا کەمە، ئـەوەش کەهەتانـە بەشـتان دەکـات ئەگـەر کـاری پێبکـەن [١] دەفـەرمووێت:ئـیتر دوای ئـەوە لەوەڵامیانـدا خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (لقمان: ٢٧).

---

١ ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢٤١/١)، هەروەها بڕوانە: تفسير ابن كثير: سورة الاسراء (٨٥).

**٤ـ پاڵپشتی کردنی موونافیقەکان و پیلانگێڕانیان لەگەڵیان:**

قورئانی پیرۆز باسی سەرکردایەتی هزریی جوولەکەی کردووە بۆ پارتی موونافیقەکان،ئەوان هەڵسان بەپیلان دانان و ئاراستەکردنیان و شێوازەکانی پیلان و فریودان و وروژاندنی پشێویان فێر دەکردن، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾ (البقرة: ١٤).

نەسەفی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (شیاطینهم) ئەوانەن کە وەکو شەیتانەکانن لە هەڵگەڕانەوەیاندا، کە جوولەکەن.[١]

جوولەکەکان شان بەشان لەگەڵ موونافیقەکاندا پیلانیان ساز دەکرد لە دژی موسڵمانان، لەو بارەشەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ (النساء: ١٣٨-١٣٩).

مامۆستا (محمد دروزه) دەڵێت: جمهوری ڕاڤەکەرانی قورئان لەسەر ئەوەن کە (الکافرین) مەبەست لە جوولەکەکانە، هەر لە خودی ئایەتەکەشدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە، لە ئایەتی دوای ئەویشدا بەڵگەیەکی تر هەیە ئاشکرایشە کە ڕاگرتنی جوولەکەکان لە لایەن موونافیقەکانەوە وەکو سەرگەورە و، پەیوەندی بەهێزی نێوانیان، شوێنەوارێکە لەشوێنەوارەکانی پیلانگێڕانیان لەدژی بانگەوازی ئیسلامی و دەوڵەتەکەی.[٢]

ئینجا هانی موونافیقەکانیشیان دا بۆ هەڵگیرسانی شەڕ لە دژی پێغەمبەر ﷺ، لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە هاتووە کە ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوای لەسەر بێت)بۆی گێڕاوەتەوە: پێغەمبەری خواﷺ سواری گوێ درێژێك بوو، ئوسامەی

---

١ـ بڕوانە: تفسیر النسفي (٢١/١).
٢ ـ بڕوانە: سیرة الرسول (ﷺ) لدروزة (١٧٩/٢-١٨٠).

کوڕی زەیدیشی لەگەڵ خۆی سوار کرد بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە لە بەنی حارسی کوڕی خەزرەج پێش ڕووداوی بەدر، دەڵێت: تاکو بەلای کۆڕێکدا تێپەڕبوو عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبی سەلوولی تیادابوو، پێش موسڵمان بوونی عەبدوڵا، تەماشای کرد تێکەڵەیەك هەیە لەو کۆڕەدا لەموسڵمان و بتپەرست و جوولەکە، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەیش لەوێ بوو، کاتێك تۆزی ژێر پێی گوێدرێژەکە گەیشتە کۆڕەکە، عەبدوڵای کوڕی لووتی خۆی داپۆشی بە چمکی پۆشاکەکەی، ئینجا وتی: تۆز مەکەن بە سەرماندا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لێکرد و ڕاوەستا و بانگی کردن بۆ لای خوا و، قورئانی بەسەردا خوێندن ئینجا عەبدوڵا وتی: ئەی کابرا قسە لەم قسانە جوانتر نیە ئەگەر ڕاست بووایە، جا ئازارمان مەدە لە کۆڕەکەماندا، بگەڕێوە لای وڵاخەکەی خۆت و هەر کێ هاتە لات بۆی بگێڕەوە، ئەوسا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە وتی: بەڵکو بێرە لامان لە کۆڕەکەماندا، چونکە پێمان خۆشە، ئینجا موسڵمانان و جوولەکەکان دەستیان کرد بە جنێودان بە یەکتر تاکو خەریك بوو دەست بکەن بە شەڕکردن، بەڵام پێغەمبەرﷺ هەر هێمنی دەکردنەوە تا بێدەنگ بوون، دوای ئەوە سواری وڵاخەکەی بوو تا گەیشتە لای سەعدی کوڕی عوبادە و پێی فەرموو: ((یا سعد الم تسمع ما قال ابو حباب...)).

واتە: ئەی سەعد ئایا نەتبیست ئەبو حوباب – مەبەستی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بوو – ئاوها و ئاوهای وت، سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی خۆش بە، سوێند بەو کەسەی قورئانی بەسەرتدا دابەزاندووە، خەڵکی مەدینە هەموویان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی بیکەن بە سەرگەورە، جا کاتێك خوای گەورە ئەوەی ڕەتکردەوە بەو حەقەی کە بە ئێوەی بەخشی، ئەو دوورخرایەوە، بۆیە ئەوە دەکات کە دەیبینی، ئیتر پێغەمبەرﷺ لێی خۆش بوو.[١]

---

١ـ البخاري: كتاب التفسير – باب (١٥)، رقم (٤٥٦٦).

**٥ـ تانە لێدانی جوولەکەکان لەو کەسەی ئیمانی هێنا لە قەشەکان (عەبدوڵای کوڕی سەلام) ﷺ:**

عەبدوڵای کوڕی سەلام کاتێك بە هاتنی پێغەمبەر ﷺی زانی بۆ مەدینە، هاتە لای وتی: من دەربارەی سێ مەسەلە پرسیارت لێ دەکەم پێغەمبەر نەبێت کەس وەڵامەکەی نازانێت، وتی: یەکەمین نیشانەکانی قیامەت چیە؟ یەکەمین خواردنی بەهەشت چیە؟ بەهۆی چیەوە کوڕ لە باوك دەکات؟ یان لە خاڵوانی دەکات؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((خبرني بهنّ آنفا جبريل)) واتە: پێش کەمێك جبریل ئاگاداری کردمەوە، دەڵێت عەبدوڵا وتی: ئەوە دوژمنی جوولەکەیە لە فریشتەکان، ئینجا پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ((اما اول اشراط الساعة: فنار تحشر الناس من المشرق الى المغرب....))[1].

واتا: یەکەمین نیشانەکانی قیامەت، ئاگرێکە خەڵکی کۆدەکاتەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، یەکەم خواردنی بەهەشتیەکانیش جگەری ماسیە، مەسەلەی لێکچوونیش لە مناڵدا، پیاو ئەگەر چووە لای خێزانەکەی و ئاوی خۆی پێش خێزانەکەی هات لە خۆی دەچێت مناڵەکە، ئەگەر ئاوی ئافرەتەکەیش پێشتر بێت لە ئافرەتەکە دەچێت، وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایت، ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جوولەکە خەڵکێکی بوختانکەرن ئەگەر بزانن موسڵمان بوومە پێش ئەوەی پرسیاریان لێ بکەیت بوختانم بۆ دەکەن، جوولەکەکان هاتن و عەبدوڵا چووە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عەبدوڵای کوڕی سەلام چۆن پیاوێکە لە نێوتاندا؟ وتیان: زاناتر و کوڕی زاناترمانە و، چاکترو کوڕی چاکترمانە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پێتان چۆنە ئەگەر عەبدوڵا موسڵمان بێت؟ وتیان خوا لەوە بیپارێزێت، ئیتر عەبدوڵا دەرچو بۆلایان و وتی: ((اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله)) ، وتیان بەڵکوتۆ خراپتر و کوڕی خراپترمانی و، دەستیان کرد بەقسە پێکردنی.[2]

---

١ـ البخاري: كتاب الانبياء، باب خلق ادم، رقم (٣٣٢٩).

٢ـ البخاري: كتاب الانبياء، باب خلق ادم، رقم (٣٣٢٩).

ئەوان هەر قەشەیەك موسڵمان بوایە ئازاریان دەدا و گومانیان لەدەوری دروست دەکرد و بوختانیان بۆ دەکرد، قورئانیش باسی ئەم هۆکارەی بۆمان کردووە و بەرگریشی لە ئەو موسڵمانانە کردووە کە ئەو هێرشانە لە دژیان کراوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ﴾ (ال عمران: ١١٣-١١٥).

واحیدی لە (اسباب النزول)دا وتویەتی: ئیبنو عەباس و موقاتیل وتویانە: کاتێك عەبدوڵای کوڕی سەلام و سەعلەبەی کوڕی سەعیە[1] و ئوسەیدی کوڕی سەعیە و ئەسەدی کوڕی عوبەید و، ئەوانەی لە جولەکە موسڵمان بوون، قەشەکانی جولەکە وتیان: پیاو خراپەکانمان نەبێت کەس ئیمانی بە موحەممەد نەهێناوە، ئەگەر ئەوانە چاك بوایەن وازیان لە ئاینی باو باپیرانیان نەدەهێنا، ئینجا پێیانیان وت: ئێوە ناپاکیتان کرد کەلە ئاینی خۆتان هەڵگەڕانەوە. ئیتر خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ (ال عمران: ١١٣).

### ٦- واتەوات کردن و تانەلێدان لە پێغەمبەرﷺو موسڵمانان:

جوولەکە بەدوای هەل دەگەڕان بۆ زیان گەیاندن بە موسڵمانان و پەرتەوازەکردنیان، یەکێك لەو هەلانە ئەوە بوو، لە مانگە سەرەتاکاندا یەکێك لەو نەقیبانەی بەیعەتیان بە پێغەمبەرﷺدا لە عەقەبە وەفاتی کرد، کە ئەبو ئومامە ئەسعەدی کوڕی زورارەی خەزرەجی بوو ڕەزای خوای لێ بێت، ئەو کاتەی ڕوومەتی‌و جەستەی سوور بوویەوە پێغەمبەرﷺ سەردانی کرد و فەرمووی:

---

١ ـ ئیبنو حەجەر دەڵێت: دەوترێت سەعنە، دەگێڕنەوە: سەعیە، (الاصابة – ترجمة اسید بن سعية) هەروەها ئیبنو حەجەر باسی ئەسەدی کردووە نەك ئوسەید لە ژیاننامەی ئەسەدی کوڕی سەعیەی قەرەزی.

((سیقولون، لو لا دفع عن صاحبه، ولا املك له ضرا ولا نفعاً، ولأتمحَّلَنّ لـه)) واتـه: ئێستا جووله‌کەکان دەڵێن با ئەو نەخۆشیەی لەسەر هاوەڵەکەی لابردایە، منیش نە سوود و نە زیانی ناتوانم پێ بگەیەنم، بەڵام هەوڵێکی بۆ دەدەم ڕزگاری بێـت، ئـیتر فەرمانی کرد لە دوو جێگەوە سەری داخ کرا و مرد، ئەم ڕووداوەش تاکە ڕووداوێك نـەبوو کینـەی جوولەکـەی لـە دژی موسـڵمانان دەرخـست چـونکە لـە سـەرەتای کۆچکردندا ئەوەیان بڵاودەکردەوە کـە جادوویـان کـردووە لـە موسـڵمان و کوڕیـان نابێت، بۆ ئەوەی موسڵمانان سەغڵەت بکەن و ئەو کەشە خۆشەیان لێ تێك بدەن کە تیای دەژیان، بۆیە کاتێك یەکەمین منداڵی کوڕ لە دایك بوو لە نێـوان موهاجیرەکانـدا کە عەبدوڵای کوڕی زوبەیر بوو، خۆشی و شادیەکی زۆر بڵاو بوویەوە لە نێوانیاندا.[1]

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ڕەزای خوایـان لێ بێـت دەگێڕێتـەوە کاتێـك عەبـدوڵای کوڕی زوبەیر لە سکیدا بوو، دەڵێت:

دەرچووم و کاتی منداڵ بوونم بـوو، هاتمـە مەدینـە و، لـە قوبـا دابـەزیم و لـەوێ منداڵم بوو، ئینجا بردمە لای پێغەمبـەر ﷺ و ئـەویش منداڵەکـەی خـستە باوەشـی و داوای خورمایەکی کرد و جوی و تفی کردە ناو دەمی، ئیتر ئەوە یەکەمین شت بـوو چووە ناو سکیەوە، دوایی کەمێکی لە خورماکە خستە ناو دەمی و دوعای بـۆ کـرد، ئەو یەکەم منداڵ بوو لەوێ لەدایك بوو، بوو بە مایەی شادیەکی زۆر لای موسـڵمانان، چونکە پێیان وترابوو جوولەکە جادوویان کردووە و کوڕتان نابێت.[2]

لە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە کـە نـاوی نـاوە عەبـدوڵا، پـاش ئـەوە کـە تەمـەنی گەیشتە حەوت یان هەشت ساڵ هـات بـۆ ئـەوەی بەیعـەت بـدات بـە پێغەمبـەر ﷺ، زوبەیری باوکی ئەوەی پێ وتبوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ پێکـەنی کـە بینـی بـەرەو لای دێت... موسڵمانان لە کاتی لەدایك بوونی عەبدوڵا (الله اکبر)یان دەکرد.[3]

---

١ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٢٦٥).

٢ـ البخاري، كتاب العقيقة – باب تسمية المولـود، ورقمـه (٥٤٦٩) واللفـظ لـه، ومسلم كتـاب الاداب – بـاب استحباب تحنيك المولود ورقمه (٢٥–٢١٤٦).

٣ ـ بڕوانە: المستدرك، للحاكم: كتاب معرفة الصحابة (٣/٥٤٨)، وقال هذا حديث صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي.

### ٧ـ هەڵوێستیان لە گۆڕینی قیبلە:

لەوانەیە ڕووداوی گۆڕینی قیبلە یەکەمین ڕووداو بێت کە شەڕەکەی گواستەوە لە قسەکردنەوە بۆ پەلاماردان و دەستێوەردانی کردەیی لە لایەن جوولەکەوە، بە مەبەستی لەقکردنی دەوڵەتی ئیسلامی تازە پێگەیشتوو،[١] لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕنەوە، یەکەمین جار پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، چووە لای باووباپیرانی – یان خاڵوانی – لە ئەنصارەکان و شانزە یان حەڤدە مانگ لە نوێژدا ڕووی دەکردە بەیتولمەقدیس، بەڵام خۆی پێی خۆش بوو قیبلەکەی ڕووە و ماڵی خوا بێت، یەکەمین نوێژیش کە کردی نوێژی عەصر بوو، یەکێك لەوانەی کە لەگەڵیدا نوێژیان کرد، دەرچوو بە لای مزگەوتێکدا تێپەڕی لە نوێژدا بوون، لە کاتی کڕنووشدا وتی: سوێند بە خوا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺنوێژم کرد و ڕوومان بەرەو مەککە بوو، ئەوانیش هەر لە جێگای خۆیانەوە سووڕانەوە بەرەو ماڵی خودا، جوولەکەکان پێیان خۆش بوو پێغەمبەرﷺ ڕووی دەکردە بەیتولمەقدیس، بەڵام کاتێك ڕووی کردە کەعبە پێیان ناخۆش بوو،[٢] لەم ڕووداوەشدا هەندێ ئایەتی مەزن دابەزییە سەر پێغەمبەر ﷺ کە پەند و ئامۆژگاری تێدابوو بۆ موسڵمانان، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟

---

١ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (١/٢٥٨).

٢ـ البخاري: كتاب الايمان، باب الصلاة من الايمان، ورقمه (٤٠).

لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ (البقرة: ١٤٩-١٥٢).

- خوای گەورە باسی ئەوەی کردووە کە جوولەکە دەیڵێن لەکاتی گۆڕینی قیبلەدا، لە دروستکردنی گومان و پرسیار لە پێش ڕووداوەکە، ئەمەیش ئاماژە دەکات بۆ پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ، چونکە ئەوە مەسەلەیەکی نادیار بوو، باسی کرد و ئینجا ڕوویدا، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەرە و باسی شتگەلێك دەکات کە هێشتا ڕوویان نەداوە.

هەروەها ئاماژەیش دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لە پێش کەوتنەوەیان، بۆ ئەوەی موسڵمانان خۆیان ئامادە بکەن بۆ زاڵ بوون بەسەر گرفتەکاندا، چونکە ڕووداو کە کتوپڕ بێت قورس دەبێت لەسەریان و تووشی شپرزەییان دەکات، بە پێچەوانەی ئەوەی کە پێشتر ئاگایان لێ بێت.[1]

(ابو السعود) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: باسی مەسەلەکەی کرد پێش ڕوودانی بۆ ئەوەی موسڵمانان دڵ و دەروونیان ئامادەبێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێستی ئەوان، چونکە هەواڵی ناخۆش ئەگەر کتوپڕ بێت قورس دەبێت لەسەر دەروون، وەڵامی ئامادەکراویش بەهێزتر دەبێت بۆ ناحەزی سەرسەخت.[2]

خوای گەورەیش جوولەکەکانی بە نەزانین و بەد ڕەوشتی لەبەر ڕەخنەگرتنیان لە گۆڕینی قیبلە و پلان گێڕانیان لە دژی پێغەمبەرﷺ... خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ (البقرة: ١٤٣).

ئایەتەکە باسی ئەوە دەکات کە نوێژکردن بەرەو بەیتولمەقدیس تاقیکردنەوە بوو، گواستنەوەشی بۆ کەعبە هەر تاقیکردنەوەیە، (البیضاوي) لە تەفسیرەکەیدا

---

١ـ بڕوانە: الصراع مع الیهود، د. محمد ابو فارس (١٠٢/١).

٢ـ بڕوانە: تفسیر ابن سعود (١٧١/١).

دەڵێت: ئێمە قیبلەی تۆمان نەکردە بەیتولمەقدیس تەنها بۆ ئەوە نەبێت بزانین کێ دەکەوێتە شوێن پێغەمبەرﷺ و کێ پاشگەز دەبێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ تاقیبکەینەوە، بزانین کێ شوێنکەوتووی تۆ دەبێت لە نوێژکردندا و کێ واز لە قیبلەی باووباپیرانی ناهێنێت،یان بۆئەوەی بزانین کێ شوێنی پێغەمبەر دەکەوێت و کێ شوێنی ناکەوێت، هەرچیش لەبەر شتێکی کاتی بێت بە لاچوونی لادەچێت،... واتە: ئێمە تۆمان نەگێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی کە لەسەری بووی تەنها بۆ ئەوە نەبێت بۆمان ئاشکرا بێت کێ جێگیر دەبێت لەسەر ئیسلام کێ پاشگەز دەبێتەوە بەهۆی دوو دڵی و ئیمان لاوازییەوە.[1]

چونکە سەرەتا نوێژکردن ڕووەو کەعبە بوو، ئینجا ڕوویان کردە بەیتولمەقدیس، جارێکی تر گەڕانەوە بەرەو کەعبە، ئەوەیش هیچی تیا نیە، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، واتە ڕووکردنە هەر جێگایەك لەسەر فەرمانی خوا هەر خوا پەرستنە، خەڵکی ئەوەندەیان لەسەرە ملکەچ بن بۆ فەرمانی خوا و، پەیوەست بن بە ئاراستەکانی، ئەو کەسەی گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ دەبێت بە سەرکەوتوو دادەنرێت لە تاقیکردنەوەکەدا، هەر کەسێك ڕازی نەبێت بە حوکمێك لە حوکمەکانی شەرع دەکەوێت و تیادەچێت، ئیمانی ڕاستەقینەش ئەوەیە کە خاوەنەکەی پابەند دەکات بە شوێنکەوتنی شەرع و لادان لە ئارەزوو،[2] بۆیە هاوەڵان جێگیر بوون و وەڵامی فەرمانی خوایان دایەوە.

لە ئیبنو عومەرەوەرضي الله عنه فەرموویەتی: لە کاتێکدا خەڵکی نوێژیان دەکرد لە قوبا لە نوێژی بەیانی کەسێك هات و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بەسەردا دابەزییوە ئەمشەو، فەرمانی پێکراوە ڕووبکاتە کەعبە لە نوێژدا، ئەوانیش ڕوویان کردە کەعبە، پاش ئەوەی ڕوویان کردبوویە شام.[3]

هەروەها ئایەتەکە پەرۆشی ئیمانداران دەردەخات لەسەر براکانیان، چونکە دەیانوت چارەنووسی براکانمان چۆن دەبێت کە مردوونە و لە ژیانیاندا ڕوویان

---

١ـ بڕوانە: تفسير البيضاوي نقلا عن الصراع مع اليهود (١/١٠١).

٢ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١٠١).

٣ـ بڕوانە: تفسير ابن كثير (١/٢٧٥) ط/ دار الشعب.

دەکردە بەیتولمەقدیس، خوای گەورەیش ئاگاداری کردنەوە کە نوێژەکانیان وەرگیراوە، ئیبنو عەبباس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە:

کە پێغەمبەرﷺ داوای لێکرا ڕوو بکاتە کەعبە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، وەی براکانمان کە لە دونیا دەرچوون و نوێژیان بەرەو بەیتولمەقدیس دەکرد؟[١]

ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ (البقرة: ١٤٣).

هەروەها بۆیانی ڕوون کردەوە کە خوای گەورە بە سۆز و بەزەییە و بەم شێوەیش ئاسوودەیی دەخاتە دڵ و دەروونی موسڵمانانەوە و لە دڵەڕاوکێ ڕزگاریان دەکات و، ڕەزامەندی و متمانە و جێگیربوونیان پێ دەبەخشێت...[٢]

- ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ ۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٤٤-١٤٨).

پێغەمبەرﷺ بە پەرۆش بوو لە نوێژکردنیدا ڕووبکاتە کەعبەی ئیبراهیمی باوکی عليه السلام، چونکە مافدارترین کەسە بە ئەو، خۆی بەرهەمی دوعای ئەوبوو، هەڵگری ئاڵای یەکتاپەرستیە بە ڕاستی وەکو چۆن ئیبراهیم هەڵیگرت، ئینجا

---

١ بڕوانە: سنن الترمذي (٥/٢٠٨)، ورقمه (٢٩٦٤) وقال الترمذي هذا حديث حسن صحيح.

٢- في ظلال القران (١/١٣٣).

پێغەمبەرﷺ، بە هەمان شێوە بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی جیاواز و سەربەخۆ بێت لە ئاینەکانی پێش خۆی، کە لایان دابوو وەکو جوولەکە و گاورەکان، بۆیە پێغەمبەرﷺ قەدەغەی دەکرد لێیان لاسایی ئەوان بکەنەوە و فەرمانیشی دەکرد بە جیاوازی بوون لەگەڵیاندا و، ئاگاداری دەکردنەوە نەکەونە هەمان هەڵەکانی ئەوان، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە بە شێوەیەکی بەردەوام ڕووبکاتە قیبلەی باوکی پێغەمبەران، کە یەکەمین ماڵە بۆ خوا دروست کرابێت.[1]

ڕووداوی گواستنەوەی قیبلە چەندین واتای سیاسی و سەربازی و ئایینی و مێژوویی تێدایە، لایەنە سیاسیەکەی ئەوە بوو دوورگەی عەرەبی کرد بە خولگەی ڕووداوەکان، لایەنی مێژوویشی ئەوە بوو جیهانی بەستەوە بە میراتی عەرەبی بۆ ئیبراهیم (علیه السلام)، لایەنی سەربازیشی ئەوە بوو ڕێگەی خۆشکرد بۆ فەتحکردنی مەککە و کۆتایی پێهێنانی باری نەگونجاوی ماڵی خوا، بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندی یەکخواپەرستی پاش ئەوەی کە مەڵبەندی بتپەرستی بوو.[2]

• ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ (البقرة: ١٤٩-١٥٢).

وەکو چۆن خوای گەورە بە ئیمانداارانی وتبێت: نیعمەتی ڕووکردنتان بۆ قیبلەکەتان و، جیاکردنەوەتان بە کەسایەتی خۆتان، لە نیعمەتەکانی خوایە لەسەرتان، پێش ئەوەیش چاکی تری زۆری لەگەڵتان کردووە، لەوانە:

---

١ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/١٠٠).

٢ ـ بڕوانە: الاساس في السنة (١/٤٤٠).

- ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا﴾ چونکە بوونی پێغەمبەر ﷺ وەکو سەرکردەی پەروەرشکاران و بانگخوازان، تایبەتمەندی ئەو بژاردەیە کە خوای گەورە سەربەرزیانی کرد بە ئەو پێغەبەرە، زانای دەروونەکان و چارەسەرکەری دڵەکان و ڕووناکی چاوەکان....

- ﴿يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا﴾ چونکە بابەتی سەرەکی بۆ بنیاتنان و پەروەردەکردن، وتەکانی خوای گەورەیە کە هەمیشە لەگەڵ ڕووداوەکاندا دادەبەزی، بۆیە ئەوان بوون بە نەوەیەکی ناوازە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

- ﴿وَيُزَكِّيكُمْ﴾ چونکە مامۆستای پەروەرشکار - پێغەمبەر ﷺ - خۆی بەرپرس بوو لە هەڵمەتی پەروەردەکردن، هەر خۆیشی بوو کە ڕەوشتی و جێبەجێکردنی بۆ حوکمەکانی قورئانی پیرۆز گەیشتە ئەو ئاستەی تاك بوویەوە لە نێوان هەموو ئادەمیزادەکاندا: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ (القلم: ٤). هەر ئەویش بوو کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) بە مەزنترین خەسڵەت وەسفی کرد کاتێك فەرمووی: (کان خلقه القران)، واتە: ڕەوشتی ئەو ڕەوشتی قورئان بوو، ئیتر هاوەڵانیش قورئانیان دەبیست لە زمانی پێغەمبەر ﷺ و ئەو قورئانەیان دەبینی کە بەبەر چاویانەوە ڕێی دەکرد.

- ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾، ئەمە ئەرکی سێهەمە کە بریتیە لە فێرکردنی هاوەڵە بەڕێزەکان، قورئانی پیرۆز بۆ ئەوەی کاریگەر بێت پێویستی هەیە بە پەروەرشکارێکی خواناس کە دڵەکان پاك بکاتەوە و، هەڵسێت بە فێرکردنی شەرعی خوا بۆ خەڵکی و، هەڵەکانیان بۆ چاك بکاتەوە لە تێگەیشتنیاندا، پێغەمبەری خواﷺ هاوەڵانی فێردەکرد لەسەر ڕێبازی خوایەتی، ئیتر هاوەڵانیش ڕێبازی فێرکردن و پەروەردەکردن و، بانگەواز و، سەرکردایەتی کردنی خەڵکی لە پێغەمبەر ﷺ فێر دەبوون، پێغەمبەر ﷺ توانی نەوەکە بە تەواوی ئامادە بکات بۆ سەرکردایەتی مرۆڤایەتی، هاوەڵانیش لە دوای خۆی بەردەوام هەر پەروەردەی

قورئان و پێغەمبەرایەتیان هەڵدەگرت بۆ هەموو جێگایەك و، بوون بە شایەت لەسەر خەڵکی.

- ﴿وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ﴾: ئەوان چی بوون پێش پەیامی پێغەمبەرﷺ دوای ئەوە بوون بە چی؟ ئەوان هەمیشە لە جەنگ و ململانێ و نەفامییەکی کوێرانەدا بوون،بەڵام بە فەزڵی خوا بوون بە نەتەوەیەکی مەزن،پەیام و ئامانجێکی هەیە لە ژیاندا، هیچ خەمێکیان نیە تەنها ڕەزامەندی خوا و گوێڕایەڵی بۆ خوا و پێغەمبەرﷺ، لە تاکڕەوی و خۆپەرستیەوە ڕۆیشتن بەرەوبنیاتنانی کۆمەڵ و نەتەوە و، دەوڵەت و دروستکردنی شارستانی، بەوەش بوون بە شایستەی مەزنترین دوو نیشانە لە بوونەوەردا.[1]

- ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ (ال عمران: ١١٠).

هەروەها نیشانەی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (البقرة: ١٤٣).

- ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ ئەم چاکە و بەخششانە، پێویستی هەیە بە یادی خوا و سوپاسکردنی بەیانیان و ئێواران، خوای گەورەیش هانی دەدان لەسەر ئەوەی یادی بکەن، خۆیشیان پاش ئەوەی ونبووی نێو بیابان بوون، لە لای خوا گەورە باس دەکرێن.

---

١ـ بڕوانە: التربية القيادية، منير الغضبان (٢/٤٣٨_٤٤٢) بە دەستکارییەوە.

جێگای خۆیەتی خوای گەورە سوپاس بکرێت لەسەر ئەو هەموو چاکانە.[١]

بەو شێوەش، ئایەتە پیرۆزەکان هاوەڵانی پەروەردە دەکرد لە ڕێگەی ڕووداوە گەورەکانەوە و، کەسایەتی بەهێزی موسڵمانی دروستکرد کە جگە لە ئیسلام بە هیچ ئایینێکی تر ڕازی نابێت، کە جوولەکەیشی ناسیووە لە ڕێگەی قورئانەوە و بە تەواوی لێیان حاڵی بووە، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ (البقرة: ١٢٠).

**٨ـ هەندێك لە سیفەتەکانی جوولەکە کە لە قورئاندا هاتووە:**

ئەو کەسەی بە دوای جوولەکە و هەڵوێستەکانیان بگەڕێت لە دژی پێغەمبەر ﷺ ناشیرینی کردەوەکانیانی بۆ دەردەکەوێت، هەروەها ئەو بەدڕەوشتیەی ئەوان لەسەرین، هیچ سەیریش نیە بۆ کەسانێك کە لە ئایینی خۆیان هەڵگەڕێنەوە بەو شێوە بن. دەردەسەری پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی لەگەڵ جولەکەدا سەخت و ناخۆش بوو، قورئانی پیرۆز باسی هەندێکیانی کردووە، هەروەها کتێبەکانی سیرەو مێژوو پڕن لەو شێوە هەواڵانە، قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ باسی خەسڵەتە ناشرینەکانیان کردووە وەکو دووڕوویی و، بەدڕەوشتی لەگەڵ خوا و پێغەمبەردا، پیلان گێڕان و تەڵەکەبازی و، ڕووپامایی و، سوود وەرنەگرتن لە زانست و، ڕق و کینە و، چاو تێبڕینە ماڵی خەڵکی و، تەماعکاری و، ڕەزیلی و، نانکوێری و، بێشەرمی و، لەخۆبایی بوون و خۆبەزل زانین و خۆ دەرخستن و هاوتا بۆ خوا بڕیاردان و دژایەتی کردنی پیاوچاکان و لاسایی کرنەوەی کوێرانە و زانست شاردنەوە و تێکدانی زانیاریەکان و تەڵەکەبازی لە دەور قەدەغە کراوەکان و جیاوازی و چینایەتی لە جێبەجێکردنی حوکمەکان و بەرتیل خواردن و درۆکردن و ناپاکی.[٢]

---

١ـ بڕوانە: التربية القيادية، (٢/ ٤٤٢).

٢ـ بگەڕێوە بۆ کتێبی بە پێزی: د. عبدالله الشقاری (اليهود في السنة المطهرة).

*** هاوتا پەرستن لەگەڵ خوادا:**

خوا پەرستنیان پوچەڵ و تێکەڵ بە شیرك بوو، چونکە باوەڕیان وابوو خوای گەورە کوڕی هەیە، کەسانی تریشیان لەگەڵ خوا دەپەرست، قورئانی پیرۆزیش هەندێك لەوانە باس کردووە: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (التوبة: ٣٠-٣١).

ئەوان پێغەمبەران و پیاوچاکەکانیان دەپەرست و گۆڕەکانیان دەکرد بە پەرستگا و بت و دەیانپەرستن،[١] پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: لەعنەتی خوا لە جوولەکە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکرد بە پەرستگا.[٢]

*** دژایەتی کردنی پێغەمبەران و پیاوچاکان:**

لە هەمان کاتدا کە قەشە و زاناکانیان پیرۆز ڕادەگرت تا دەگەیشتە ئاستی پەرستنیان، دەبینین لە بەرامبەردا دژایەتی پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکەکانیان دەکردو، هەڵمەتی پیلانگێڕیان بە چەندین شێواز دەکردە سەریان، بەڵکو جاری واش بوو دەیانکوشتن، وەکو کوشتنیان بۆ زەکەریا و یەحیا (علیهما السلام)،[٣] خوای گەورەیش بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا

---

١ ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢/٥٠٧)

٢ ـ البخاري، كتاب الصلاة – باب (٢٥)... رقم (٤٣٧).

٣ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢/٥٠٩).

وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾ (البقرة: ٦١).

*** شاردنەوەیان بۆ زانست و تێکدانیان بۆ ڕاستیەکان:**

ئەو خەسڵەتە هەر لەدێر زەمانەوە لەگەڵ جوولەکەدا بووە، ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: "قيل لبني اسرائيل (وادخلوا الباب سجدا وقولوا حطة) فبدّلوا، فدخلوا يزحفون على استاهم، وقالوا: حبة في شعرة"[١] واتە: بە بەنی ئیسرائیل وترا ... (وادخلوا الباب سجدا وقولوا حطة) بەڵام ئەوان گۆڕیان و، خۆیان خشان لەسەر پاشی خۆیان و وتیان: دەنکە تۆیەك لە موویەکدا.

گەورەترین ئەو زانستانەش قەشەکانی جوولەکە هەوڵیاندا بیشارنەوە، زانیان بوو بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ڕافیعی کوڕی حاریسە و سەلامی کوڕی میشکەم و مالیکی کوڕی سەیف و ڕافیعی کوڕی حوریملە، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و وتیان: ئەی موحەممەد ئایا تۆ بانگەشەی ئەوە ناکەی لەسەر ئاینی ئیبراهیمی و باوەڕیشت هەیە بە تەوراتی ئێمە و شایەتی دەدەیت کە ڕاستە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئێوە شتتان داهێناوە و نکوڵیتان کردووە لە ئەو پەیمانەی خوای گەورە لێی وەرگرتبوون، ئەوەش فەرماننتان پێکراوە ئاشکرای بکەن بەڵام دەیشارنەوە، منیش بێ بەریم لەوەی داتانهێناوە، وتیان: ئێمە دەست بەوە دەگرین کە لامانە و ئێمە لەسەر ڕێگای ڕاستین و، باوەڕیشت پێ ناهێنین و شوێنت ناکەوین، ئیتر خوای گەورە دەربارەیان ئەم ئایەتەی داگرت: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ

---

١ـ البخاري، كتاب احاديث الانبياء (٦/٤٣٦) – رقم (٣٤٠٣).

إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (المائدة: ٦٨).[١]

*** دووبەرەکی:**

جوولەکە هەمیشە ناکۆکن لە بیروباوەڕدا، جیاوازن لە حوکمەکانیاندا، وا دەزانن کۆکن بەڵام دڵەکانیان پەرتەوازەیە، وەکو خوای گەورە باسیانی کردووە: ﴿لَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴾ (الحشر: ١٤).

*** بەرتیل:**

یەکێك لە خەسڵەتەکانی جوولەکە ئەوەیە، لە پێناو بەدی هێنانی ئەو ئامانجەی دەیانەوێت پێی بگەن هەموو ڕێگایەك دەگرنەبەر، با ناکۆکیش بن لەگەڵ شەرعدا وەکو، بەرتیلدان و ماڵی حەرام، خوای گەورەیش بەم شێوەیە باسیانی کردووە: ﴿سَمَّـٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّـٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ (المائدة: ٤٢).

*** دوو ڕوویی:**

هەندێك لە سەرانی جوولەکە موسڵمان بوونی خۆیان خستەڕوو کاتێك ئیسلام بەهێز بوو لە مەدینە، بەڵام خۆیان لەسەر جوولەکەیی مابوون لە پەنهانیدا، خوای گەورە لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ (البقرة: ١٤-١٥).

---

١ـ سيرة ابن هشام (ق١/٥٦٧-٥٦٨) واللفظ له، تفسير الطبري، الاثر رقم (١٢٢٨٤)، والاثر رقم (١٢٢١٩). عن تفسير الاية (٦٨) والاية (٥٩) من سورة المائدة والاثر (٢١٠١) عن تفسير الاية (١٣٦) من البقرة، (فتح الباري ٢٦٩/٨).

*** ڕووپامایی:**

لەگەڵ ڕۆژ و کۆمەڵگادا خۆیان دەگونجاند، خەراپەیان قەدەغە نەدەکرد، بۆیە خوای گەورە لەعنەتی لێ کردوون لە قورئاندا: ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ (المائدة: ٧٨-٧٩).

*** سوود وەرگرتن لە زانست:**

خوای گەورە باسی ئەم خەسڵەتەی بۆ کردووین بە وردی فەرموویەتی: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ بِئۡسَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الجمعة: ٥).

*** ڕق و کینە و ملەجوڕی:**

یەکێك لە خەسڵەتە جێگیرەکانی جوولەکە ڕق لێبوونیانە بۆ هەموو شتێك لە خۆیان نەبێت و، هەموو کەسێك جوولەکە نەبێت، بە تایبەتی ئەگەر پەیوەندیەکی هەبێت بە پێغەمبەر ﷺ، وەکو ڕووداوی قیبلە و، مەسەلەی قەدەغەکردنی مەی، عەبدوڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: کاتێك حەرام بوونی مەی دابەزی، جوولەکە وتیان: ئەی باشە براکانتان کە مردن مەییان نەدەخواردەوە، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾ (المائدة: ٩٣).

ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((قيل لي: انت منهم)) واتە: پێم وتراوە تۆ یەکێکی لە ئەوان.[١]

---

١ ـ بڕوانە: المستدرك للحاكم: كتاب الاشربة (٤/١٤٣-١٤٤). صحيح الاسناد، ووافقه الذهبي.

* حەسوودی:

جوولەکە چاویان بڕیبوویە پێغەمبەر ﷺ بەهۆی پەیامەکەی، چونکە ئەوان چاوەڕوانی پێغەمبەرێك لە خۆیان دەرکەوێت دەوری بدەن و شەڕی لەگەڵدا بکەن لە دژی ناحەزەکانیان، جا کاتێك پێغەمبەر لە کەسانی تر هات، ئەوان شێت بوون و، ڕێگای ڕاستیان ونکرد، دەستیان کرد بە دژایەتی کردنێکی سەخت، هەروەها حەسوودیان دەبرد بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر باوەڕ و ڕێگای ڕاست هەڵبژاردنیان.[1]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ۖ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ (البقرة: ١٠٩).

* لەخۆبایی بوون و خۆ بەزلزانین:

ئەم خەسڵەتەیان هەر لە کۆنەوە لەگەڵدا بوو، چونکە ئەوان وا دەزانن چاکترینی خەڵکن و، خۆیان بە گەلی هەڵبژێردراوی خوا دەزانن، پێشیان وایە بەهەشت بۆ جوولەکە دروست کراوە و ڕێگەی ئەوان نەبێت هەموو ڕێگایەکی تر بەرەو گومڕایی دەڕوات، خوای پەروەردگاریش باسی ئەم خەسڵەتە ناشرینەی ئەوانی کردووە و[2] فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (البقرة: ١١١).

ئەم لەخۆباییبوون و خۆبەزل زانینەیان لە چەندین شێوازدا خۆی دەبینێتەوە بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺدا،[3] ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ چووە لای نوعمانی کوڕی ئەزائە و بەحری کوڕی عەمر و، شاسی کوڕی عەدی و، قسەیان لەگەڵ کرد و، قسەی لەگەڵ کردن، ئینجا بانگی کردن بۆ

١ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/٧٠).
٢ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/٧١).
٣ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢/٤٩٥-٤٩٦).

لای خوا و لە تووڕەیی خوا ترساندنی، وتیان: لە چی دەمانترسێنی ئەی موحەممەد، سوێند بە خوا ئێمە کوڕ و خۆشەویستی خواین، – وەکو وتەی گاورەکان – ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ﴾ (المائدة: ١٨).[1]

* چرووکی:

یەکێك لە سیفەتە کۆنەکانیان چرووکیە و، پارە خەرجنەکردنە لەپێناو خوادا، ئەوان دەهاتنە لای پیاوانێك لە ئەنصار و دەیانوت: پارەکانتان خەرج مەکەن دەترسین هەژار بن، پەلەیش مەکەن لە پارەخەرجکردندا، ئێوە نازانن بۆ چی ڕوودەدات،[2] ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ (النساء: ٣٧).

واتە: لە تەوراتدا بەڵگەی ڕاستێتی قورئان هەیە: ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ (النساء: ٣٩).

* سەرکەشی:

سەرەڕای ئاشکرابوونی بەڵگەی سەلمێنراو لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ بەڵام جوولەکە هەر باوەڕیان نەدەهێنا بەهۆی سەرکەشیەوە کە وای کردبوو ئەقڵەکانیان دابخرێت و خوای گەورەش باسی ئەو سیفەتەی لە ئەواندا کردووە و فەرموویەتی: ﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ ۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ (البقرة: ١٤٥).

---

١ـ بڕوانە: تفسير الطبري، واللفظ لە بالاثر رقم(١١٦١٣)عن تفسير الاية(١٨)من المائدة،سيرة ابن هشام (ق١/٥٦٣).

٢ـ بڕوانە: اليهود في السنة المطهرة (٢/٤٨٧–٤٨٨).

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەزار بەڵگە پێشکەش بکەیت قایل نابن، ناگۆڕێن و باوەڕ ناهێنن:[١] ﴿......وَمَا تُغْنِي ٱلْآيَـٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ (یونس: ١٠١).

ئەمە هەندێ بوو لە سیفەتە خراپەکانی جوولەکە کە قورئان ئاماژەی پێکردووە، بۆ ئەوەی موسڵمانان لە هیچ شوێن و سەردەمێکدا پێیان هەڵنەخەڵەتێن.

**چوارەم: (إنّ الله لا يصلح عمل المفسدين):**

خوای گەورە کردەوەی خراپەکاران ڕاست ناکاتەوە:

دەستورەکە ئاستی ئەو دادگەریەی ئاشکرا کرد کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جوولەکە ئەنجامی دا، هەروەها چەمکی ئازادی بە هاوڵاتیانی دەوڵەت بەخشی و بنەمای دەمارگیری و ڕەتکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی تر بەجارێك نە هێشت، تەکتیکێکیش نەبوو لەو قۆناغە بەرپا بکرێت تا پێغەمبەرﷺدەسەڵات پەیدا بکات و دوژمنە دەرەکیەکان لەناو دەبات، حاشا پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە بێت، ئەوە هەڵوێستێك بوو هەڵقوڵاو لە سیاسەتێکی ئیسلامی وەرگیراو لە شەریعەتی خوای پەروەردگار.[٢]

لە ڕاستیدا پێغەمبەر ﷺ هەندێ ڕێکەوتننامەی بەست لەگەڵ جوولەکەدا کە ژیانێکی سەربازانەی بۆ دەستەبەر دەکردن لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا، بە بۆنەی ئەوەی ئەوان ئەهلی کیتابن، بەڵام جوولەکە بە سروشتیان خەڵکێکی ناپاك و ستەمکار و بێ ئەمەکن، نەشیانتوانیووە و ناشتوانن خۆیان بڕازێننەوە بە خەسڵەتی چاك، بۆیە پەیمانەکانیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ شکاند و چارەنووسیان بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ کردەوەکانیان کۆتایی پێهات و، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بە چۆڵکردنی مەدینە لە بەنی قەینوقاع و بەنی نەزیر و هەروەها کوشتنی پیاوانێك لە بەنی قورەیزە،[٣] قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی داوە بە سروشتی جوولەکە لەگەڵ

---

١ـ بڕوانە: العهد والميثاق في القران الكريم، د. ناصر العمر (١٢١).

٢ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود (٧٢/١).

٣ـ بڕوانە: العهد والميثاق في القران الكريم، د. ناصر العمر (١٢١).

ڕێککەوتننامەکاندا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ﴾ (الانفال: ٥٦).

ئەو پەیمانەش ئایەتەکە ئاماژەی بۆ دەکات بریتییە لەو بەڵێننامانانەی پێغەمبەرﷺ دەیبەست لەگەڵ جوولەکە، کە جەنگی لەگەڵ بەرپا نەکەن و یارمەتی دوژمنانی ئیسلام نەدەن،[1] وەکو لێکدەرەوانی قورئان ئاماژەیان پێکردووە.

جوولەکە چەندین ڕێگای جیاجیایان دەگرتەبەر بۆ پیلانگێڕان لە پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداران، بەڵام ڕێگاکانیان هەرگیز سەری نەدەگرت و بێ بەرهەم بوو، ئەوەیش بێگومان بەهۆی پەروەردەکردنی پێغەمبەرﷺ بوو کە واتاکانی ئیمانی دەچەسپاند لە دڵەکانیاندا و، بەندایەتی تەواوی بۆ خوای گەورە بەدی دەهێنا و، ڕووبەڕووی بتپەرستی دەبوویەوە بە هەموو شێوازەکانی و، هاوەڵانیشی فێر دەکرد لەسەر وەرگرتنی هۆکارەکانی ڕاپەڕین و دەسەڵاتی واتایی و کردەوەیی، پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی پەروەردەکرد لەسەر سەربەرزی پیاوەتی و جوامێری و قبووڵ نەکردنی سەرشۆڕی و بەرگری کردنی ستەم و خۆبەدەستەوەنەدان بۆ پیلانەکانی جوولەکە و کەسانی تر، بۆیە هەر لە هەوڵداندا بوون تا سەرکەوت.[2]

فێڵ و تەڵەکەکانی جوولەکە لە دژی موسڵمانان لە ئەوپەڕی ژێریدا نەخشەی بۆ دەکێشرا، بەڵکو هیچ سەرکەوتنێکیان بەدەست نەدەهێنا، لەگەڵ ئەوەی یەکەمی هاوەڵان بە هۆی سەرکردایەتی و ڕێبازی پێغەمبەرﷺ کە بەرپای دەکرد.[3]

بەڵام موسڵمانانی ئەمڕۆ دەڕووخێن لە بەرامبەری پیلانەکانی جوولەکە، لەبەر دووریان لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و شێوازی بەرەنگاری کردنی بۆ جوولەکەکان، نەتەوەی ئیسلام پێویستی زۆری هەیە بە سەرکردایەتیەکی ژیر و هۆشمەند، شارەزابێت بە ئاکارەکانی جوولەکە، بۆ ئەوەی بزانێت چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات لە ڕۆشنایی سیاسەتی پێغەمبەر ﷺدا لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە.

---

١ـ بڕوانە: تفسیر الطبري (٨/٣٠) والتحرير والتنوير (١٠/٤٨).

٢ـ بڕوانە: الصراع مع اليهود (١/٨٠).

٣ ـ بڕوانە: (١/٧٩).

لەم ڕۆژگارەی خۆماندا، پەنجە پیسەکانیان هاویشتۆتە نێو زۆر لایەنەکانی ژیانی گەلان و ولاتان، ئامانجیشیان تەنها خراپە کردنە لەسەر زەویدا کە ئەوەیش دەربڕینی قورئانی پیرۆزە: ﴿ويسعون في الاض فساداً﴾ لە ڕاستیدا بەکارهێنانی(يسعون) وەکو ئاماژە دەکات بۆ تازە بوونەوە و هەمیشە بەردەوامی ئەو کارەیان خراپەکاری ئەوان قۆناغێکی مێژوویی نەبووە و تەواو نابێت، بەڵکو ئەوە چارەنووسی گەردوونی ئەوانە تا ڕۆژی دوایی، جوولەکەیش توانیویانە زاڵ ببن بەسەر زۆرێک لە دەستکەوتی نەتەوەکان لە ڕێگەی تەلەکە نەخشە بۆکێشراوەکانیان و نەبوونی قەوارەی ئیسلامی، کە توانای هەڵوەشاندنەوەی ئەو پیلانانەی هەبێت.

بلیمەتی جوولەکە لە ڕووخاندندا مەسەلەیەك نییە جێگای گومان بێت، ئەو بلیمەتییەی ڕووداوەکان دەقۆزێتەوە بۆ بەرژەوەندی خۆی، جوولەکەیش بوونی کاریگەری خۆیان هەیە لە دەوڵەتە گەورەکاندا، لە ڕووی ئابووری و سیاسی و ڕاگەیاندن و، هیچ کاتێکیش دوا نەکەوتوون لە هەردوو سیستەمی جیهانی سەرمایەداری و شیوعی، یان لە شۆڕشە گەورەکانی جیهان، چەند سازمانێکی نێودەوڵەتیش هەیە هەوڵی گەورەی بەگەڕخستووە بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی جوولەکە، ناودارترینیان لە (ماسۆنییەت) و (لیونز) و (ڕوتاری) و (شهود ويهوده)... هتد.

ئایا توێژەری وریا هەست ناکات لەم مەسەلە جۆرێك لە زیادەڕەوی هەیە بە مەبەست یان بەبێ مەبەست؟

ئەم وێنەی کەوا دەریدەخات جوولەکە جیهان دەجووڵێنن و ئەوان سەرکردەی سیاسی و بیر و داهێنەر و... گوایە کەسایەتیە گرنگەکان لەوانەی کە جوولەکە نین وەکو بەردی شەترەنج وان وەکو (وليام غای کار) دەڵێت.[1] ئەم برە زۆرە لە کتێب کە باسی ڕۆڵی ترسناکی جوولەکە دەکەن، یارمەتی دەدات بۆ ئامادەکردنی کەسێك بۆ خۆبەدەستەوەدان و لێکدانەوەیەکی ئامادە پێشکەش دەکات بۆ هەموو ئەو

---

١ ـ بڕوانە: قضايا في المنهج، سلمان العودة، (٨٤-٨٥).

شکاندن و بەزینانەی تووشی نەتەوە بووە، بەزین لە ڕووی شارستانی و سەربازی وەکو یەك.

هەستکردنی خەڵکی بەوەی کە هەموو شتێك پێش وەخت ئامادە کراوە و بڕاوەتەوە و نەخشەی بۆ کێشراوە لە لایەن جوولەکەکانەوە، سستیان دەکاتەوە لە جیهادکردن، ئەوەشی کە دەوترێت دەربارەی جوولەکە دەکرێت بوترێت دەربارەی هەر دوژمنێکی تر، بۆ نموونە کۆمەڵە باتنیەکان لە جیهانی ئیسلامی کە قەوارەی بەهێزیان پەیدا کردووە لە زۆر دەوڵەتدا، بەڵکو قەوارەی سەربەخۆی خۆیان هەیە لە زیاتر لە وڵاتێکی ئیسلامی.

ئەو کۆمەڵانە زۆرجار کەسانێکیان دەست دەکەوێت کە گەورەیان کاتەوە زیاتر لە ئەندازەی خۆیان، بۆ نموونە هەر کەسێك دەربارەیان بنووسێت یان قسە بکات، ڕۆژی یان ژیانی لە مەترسیدا دەبێت،[1] ئەم زلکردنەوە ترسناکە بۆ دوژمنانمان ڕاستییەکی نییە، چونکە لایەنگرانی شەیتان هەرچەندێك زلە و زەبەلاح بن هەر لاوازن.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ (النساء: ٧٦).

لە ڕاستیدا هێزی ئەوان لە لاوازی ئیمان و دووری ئێمەدایە لە ڕێبازی خوای گەورە، چونکە ئیمانی ڕاستەقینە هەموو پیلانەکان لەبەر دەمیدا دەڕوخێن، بەڵام پێویستە ترس وەلا بخرێت چونکە دەبێتە هۆی کوشتنی هیمەت و وره.

کاتێکیش ئەو دەستە بە ئارامە ئیماندارە پەیدا دەبێت، هەموو پیلانەکانی جوولەکە و کەسانی تر تێکدەشکێت.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ

١ ـ بڕوانە: قضايا في المنهج، سلمان العودة، (٨٦).

مُحِيطٌ ﴾ (ال عمران: ١٢٠).

ئەمەیش لە هیچ حالەتێکدا ئەوە ناگەیەنێت، کە هێزی دوژمن پشتگوێ بخرێت یان بە کەم سەیر بکرێت، یا هەرچەند بێبایەخ بێت.

پێویستە ڕێگای میانڕەوی بگرینەبەر لە هەڵسەنگاندنی هێزی دوژمن نە زیادەڕەوی بکەین لە گەورەکردنەوەیاندا بە شێوەیەك ورەمان دابەزێت و پاساومان بۆ دروست بکات بۆ بەزین، لە هەمان کاتیشدا خۆ بێئاگا نەکەین لە بوونی ئەوان.[1]

١ بڕوانە: قضايا في المنهج، سلمان العودة، (٨٦–٨٧).

## باسی چوارەم: بەربەرەکانی یەکتری کردن و بزوتنەوەی پۆلە سەربازیەکان.

### یەکەم: سوننەتی بەربەرەکانی.

ئەوە یەکێ بوو لەو سوننەتانەی پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، ئەوەیش بە شێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێت لە قۆناغی مەدینەدا لەگەڵ بزوتنەوەی پۆلە سەربازی و نێردە و غەزاکان کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی دەدا لە دژی بتپەرستەکان، ئەم سوننەتەیش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی هەیە بە دەسەڵاتی پەیدابوونی ئەم دینەوە، خوای گەورەیش ئاماژەی پێکردووە کاتێك فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٥١﴾ (البقرة: ٢٥١).

هەروەها لە فەرموودەی خوای گەورەدا: ﴿ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ٤٠﴾ (الحج: ٤٠).

لە ئایەتەکەی سورەتی بەقەرەدا، تێبینی دەکرێت لە پاش باسکرنی نموونەیەك لە نموونەکانی ململانێ هاتووە لە نێوان هەق و ناهەقدا، کە بریتیە لە باسکردنی تالوت و سەربازە ئیماندارەکانی و جالووت و شوێنکەوتووانی، خوای گەورەیش لەو بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ (البقرة: ٢٥١).

کە ئەوە دەگەیەنێت پاڵنان بە خراپەوە لەم ڕێگایەدا نیعمەتێکە هەموو خەڵکی دەگرێتەوە[١] ئینجا ئایەتی سورەتی حەج دێت پاش ڕاگەیاندنی ئەوەی کەخوای

١ ـ بڕوانە: مفاتيح الغيب، الفخر الرازي (٣/٥١٤).

گەورە بەرگری دەکات لەپشتگرە باوەڕدارەکان ، هەروەها پاش ڕێگەدان بەجەنگکردن خوای گەورە بڕیاری بنەمایەکی سەرەکی دەدا کەئەویش بریتیە لە: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾.

شەریعەت دانانی جەنگ کردنیش بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕی:

قۆناغی یەکەم: قەدەغەبوون ، لەو کاتەی موسڵمانان لە مەکە بوون و داوایان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی شەڕکردنیان پێبدات ، ئەویش پێی فەرموون: ((اصبروا فاني لم اؤمر بقتال))[١] واتە: ئارام بگرن چونکە من فەرمانم پێنەکراوە جەنگ بەرپابکەم.

قۆناغی دووەم: ڕێگە پێدان بەبێ واجب بوون، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ (الحج: ٣٩).

قۆناغی سێیەم: واجب بوونی شەڕکردن دژ بە ئەوانەی جەنگ لە دژی موسڵمانان بەرپا دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ (البقرة: ١٩٠).

قۆناغی چوارەم: فەرزبوونی جەنگکردن دژ بە هەمو بێباوەڕان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾﴾ (التوبة: ٣٦).

ئەم پلە بە پلە ڕەچاوکردنە لە حوکمی شەڕکردندا، خواستی دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو بوو، هەروەها حاڵەتی سوپای ئیسلامی کە تازە پێکهاتبوو لە ڕووی ژمارە و کەرەستەوە، وای دەخواست، بۆیە پێویست بوو ماوەیەکی دیاری کراو هەبێت ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی بانگەوازی ئیسلامی فەرز نەبێت، تا ئەو کاتەی دەوڵەتی ئیسلامی خۆی دەگرێت و بەهێز دەبێت و دەتوانێت خۆی ڕاگرێت لە

---

١ـ بڕوانە: تفسير الالوسي (١٨/٦).

بەرامبەر هێزەکانی کوفر لە دوورگەی عەرەبدا، با قورەیشیش سەرقاڵی ڕاپەڕاندنی ئەو هێزانە بوون لە دژی موسڵمانان، وەکو ڕووشیدا دواتر، لەو کاتە شەڕکردن واجب دەبێت کاتێك دەوڵەتی ئیسلامی ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئەگەرەکان دەبێت، ئەمە سەبارەت بە جەنگ کردن لەگەڵ بێباوەڕانی قورەیش فەرمان درا بە ڕێگەدان بە جەنگ فەرزبوون، بەڵام لە حالەتێکدا موسڵمانان لە دەوڵەتی خۆیان بن لە مەدینە و تووشی هێرش ببنەوە لە لایەن دوژمنەکانیانەوە، جەنگ لەو کاتەدا دەبێت بە فەرز، هیچ بوارێك نیە بۆ ئەگەرێکی تر، وەکو جێبەجێ هێنانێك بۆ بەیعەتی شەڕکردن، کە ئەنصاری ناچار دەکرد شەڕ لەگەڵ هەموو کەسێکدا بکەن لە پێناوی بەرگری کردن لە دەوڵەتی ئیسلامی و خاوەنەکەی و شوێنکەوتووانی،[١] هاوکات لەگەڵ دابەزینی مۆڵەت دان بە جەنگ، پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە ڕاهێنانی هاوەڵانی لەسەر هونەرەکانی جەنگ، بەخۆشی بەشداریان دەکرد لە ڕاهێنان و مەشقی سەربازیدا، هەروەها هەوڵدانی لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا بە مەزنترین ئەو کردەوانە ژمارد کە موسڵمان نزیك دەکاتەوە لە خوای خۆی، پێغەمبەریشﷺ هەڵسا بە جێبەجێ کردنی وتەی خوای گەورە: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠﴾ (الانفال: ٦٠).

بەرنامەیشی لە ئامادەکردنی موجاهیدی موسڵمان پشتی دەبەست بە دوو ڕێبازی هاوسەنگ: ئاراستەکردنی واتایی و ڕاهێنانی کردەیی.

**١ـ ئاراستەکردنی واتایی:**

پێغەمبەرﷺ هەوڵی دەدا ورەی موجاهیدەکان بەرز بکاتەوە و هیوایان پێ ببەخشێت بە سەرکەوتن یان بە بەهەشت، هەر لەو ساتانەوە ئەو هیوایە لەگەڵ سەربازەکاندا بوو لە گۆڕەپانەکانی جەنگ دا و پاڵی پێوە دەنان هەموو توانا

---

[١] ـ بڕوانە: القتال والجهاد، لمحمد خير هيكل (١/ ٤٦٣-٤٦٤).

دەروونی و جەستەیی و هونەرییەکان بە خەرج بدەن لە پێناو بردنەوەی شەڕەکان، یان مردن لەژێر سێبەری شمشێرەکاندا.[١]

لە وتەکانی پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە، فەرموودەیەکە ئەمە واتاکەیەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت پیاوانێك لە ئیمانداران دڵیان ئاسوودە نابێت لە پاش من بەجێ بمێنن، منیش توانام نییە ئامادەیان بکەم بۆ جەنگ، هیچ کاتێك لە پۆلێکی سەربازی دوا نەکەوتم کە جەنگ بکات لە پێناو خوادا، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، پێم خۆشە بکوژرێم لە پێناو خوادا و زیندوو بکرێمەوە و دووبارە بکوژرێم و ئینجا زیندوو بکرێمەوە و بکوژرێم و زیندوو بکرێمەوە و جارێکی تر بکوژرێم.[٢]

بێجگە لە چەندین فەرموودەی تری پێغەمبەر ﷺ کە باسی فەزڵی شەهیدی و شەهید دەکات لە پێناو خوای گەورە.[٣]

**٢ـ شێوازی کردەیی:**

پێغەمبەرﷺ هەوڵیدا پشت ببەستێت بەهەموو تواناکانی موسڵمان بەپیاو و ژن و منداڵ و لاو و پیرەوە، هەروەها ڕاهاتن لەسەر لێهاتوویی لە شەڕکردن بە ڕم و شمشێر و تیر و مەشقی سەربازی لەسەر پشتی ئەسپ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو جۆری پەروەردەیی سەربازی لە ئاڕاستەکردن و ڕاهێنان و هێوا بە سەرکەوتن یان بەهەشت ئاوێتە دەکرد و هانی موسڵمانانی دەدا بۆ شارەزایی لە هونەرەکانی تیر هاویشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((من تعلم الرمي ثم تركه، فليس منا، او قد عصى))[٤]

واتە: هەر کەسێك فێری تیرهاویشتن بوو ئینجا وازی لێهێنا، ئەو کەسە لە ئێمە نیە، یان تاوانی کردووە.

---

١ـ بڕوانە: دراسة في السيرة (١٦١).

٢ـ بڕوانە: البخاري: كتاب الجهاد والسير، باب تمنى الشهادة، رقم (٢٧٩٧).

٣ـ بڕوانە: البخاري: كتاب الجهاد والسير، رقم (٢٨١٧).

٤ ـ مسلم: كتاب الامارة، باب فضل الرمي والحث عليه، رقم (١٩١٩).

جا ئەوە بانگەوازێکە بۆ ئومەت بە گشتی، تەنانەت بۆ ئەوانەش پیرن، خۆیان ڕابهێنن لەسەر پێکانی نیشانە و دەست ڕاستی و گورجی جموجۆڵ، لە ڕاستیدا ئیسلام گرنگی دەدات بە تواناکانی ئومەت و ئاراستەیان دەکات بەرەو کاری مەزن.

پێغەمبەرﷺ خۆیشی گرنگی دەدا بە ئامادەکردنی بەپێی هەموو بارودۆخەکان و هانی هەموو کارێکی دەدا موسڵمانان ئەنجامی بدەن، جێگیریشە وەك فەرموویەتی: ((واعدوا لهم مااستطعتم من قوة، الا ان القوة الرمي، الا ان القوة الرمي، الا ان القوة الرمي))[1] واتە: ئەوەی لە تواناتاندا هەیە وەکو هێز بەکاری بهێنن، هێزیش تیر هاویشتنە (سێ جار دووبارەی کردۆتەوە).

**دووەم: لە ئامانجەکانی جیهاد لە پێناو خوادا:**

**١ـ پاراستنی ئازادی بیروڕا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾﴾ (الانفال: ٣٩-٤٠).

**٢ـ پاراستنی دروشم و پەرستنەکان:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ (الحج: ٣٨-٤١).

---

١ـ مسلم: كتاب الامارة، باب فضل الرمي والحث عليه، رقم (١٩١٧).

**٣ـ نەهێشتنی خراپە لەسەر زەوی:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَمَّا بَرَزُوا۟ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ (البقرة: ٢٥٠-٢٥٢).

(ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ (البقرة: ٢٥١). دەفەرموویت: واتە: ئەوە نەبێ خوای گەورە خەڵکانێکی تر پاڵ دەنێت وەکو بەنی ئیسرائیلی پاڵنا بە شەڕکردن لەگەڵ تالوت و ئازایی داوود، ئەگەرنا لەنێو دەچوون.[١]

**٤ـ تاقی کردنەوە و پەروەردەکردن و چاکسازی:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾ (محمد: ٤-٦).

(ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەربارەی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾(محمد: ٤). فەرموویەتی: واتە: بەڵام جیهاد و جەنگ کردنی لەگەڵ دوژمنان بۆ ئێوە داناوە وەکو تاقی کردنەوە،[٢] هەروەها باسی حیکمەتی

---

١ ـ تفسير ابن كثير (٢٦٢/١)، او ص (٤٤٧) من ط/ دار الشعب

٢ـ تفسير ابن كثير (١٥٤/٤).

دانانی جیهادی کردووە کاتێك فەرموویەتی: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (ال عمران: ١٤٢).

**٥ـ ترساندنی بێباوەڕان و ڕیسواکردنیان و سەرشۆڕکردنیان و لەناوبردنی پیلانەکانیان:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ (الانفال: ٦٠).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: ١٤-١٥).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ (الانفال: ١٧-١٨).

**٦ـ ئاشکراکردنی دووڕووەکان:**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ (ال عمران: ١٧٩).

(ابن کثیر) دەفەرموێت: واتە: پێویستە هۆیەك دروست بکات بۆ دەردەسەری پشتگیری خوای تیا ئاشکرابێت و دوژمنی خوای تیا ڕیسوا بێت، ئیمانداری خۆڕاگرو مونافیقی خراپەکاری تیادا بناسرێن، مەبەستی لە ڕۆژی ئوحودە کە خوای گەورە

ئیمانـدارانی تـاقی کـردەوە، بـەو شـێوەیەش بـاوەڕ و خـۆڕاگری و گوێڕایـەڵیان دەرکەوت بۆ خـوا و پێغەمبەرەکـەی، پـەردەی لەسـەر موونافیقـانیش ڕامـاڵی، ئـیتر ملپێچی ئەوان دەرکەوت و ئاشکرا بوون کـە جیهـاد ناکـەن و ناپـاکن لەگـەڵ خـوا و پێغەمبەر ﷺ.

**٧ـ بەرپاکردنی حوکمی خوا و سیستەمی ئیسلامی لەسەر زەویدا:**

لەڕاستیدا بەرپاکردنی حوکمی خوا لەسەر زەوی یەکێکە لە ئامانجەکانی جیهاد، خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾ (النساء: ١٠٥).

**٨ـ بەرگری کردن لە دژی دەست درێژی بێباوەڕان:**

ئەمەیش یەکێکە لە ئامانجەکانی جیهاد لە ئیسلامدا و دەبێتە چەند بەشێکەوە:

- دەستدرێژی کردنی بێباوەڕان لەسەر دەستەیەکی ئیمانـداری چەوسـاوە لـە خاکی بێباوەڕاندا: بە تایبەتی ئەگەر نەتوانن بچنە جێگایەك دڵنیا بن تیایـدا لەسـەر ئایینەکەیان، پێویستە لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی خـۆی ئامـادە بکـات بـۆ جیهـادی بێباوەڕان بۆ ڕزگارکردنی ئەو دەستە موسڵمانە لەو ستەمەی کەوتووەتە سەریان.[1]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلْيُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَـٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ (النساء: ٧٤–٧٥).

- دەست درێژی کردنی بێبـاوەڕان لەسـەر خـاکی موسـڵمانان، خـوای گـەورە فەرموویـــــەتی: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا

---

[1] ١ ـ بڕوانە: تفسیر ابن کثیر (١/٣٧١) او (٢/١٥٠) ط/ دار الشعب.

يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (البقرة: ١٩٠-١٩٢).

زانایان ڕوونیان کردووەتەوە، ئەگەر بێباوەڕان دەستدرێژی بکەنە سەر خاکی ئیسلامی پێویستە بەرگری لێ بکرێت، چونکە ئەگەر دوژمن ئەو خاکە داگیر بکات موسڵمانان دەچەوسێنێتەوە و حوکمەکانی کوفری تیادا بەرپا دەکات و خەڵکەکەش ناچار دەکات ملکەچ بن بۆی، ئەوسا دەبێتە (دار الکفر) دوای ئەوەی کە (دار الاسلام) بوو.

هەندێ لە زانایانی حەنەفی وتوویانە: هەر جێگایەك مەترسی هێرشی دوژمنی لەسەر بێت پێویستە جیهادی تیا بکرێت و سەرۆك فەرمانی پاراستنی ئەو جێگەیە دەربکات، ئەگەر خۆیشیان توانایان نەبوو پێویستە لەسەر نزیکترین کەسانێك لە ئەوان یارمەتیان بدەن تا توانای بەرگری کردنی دوژمنانی بۆ دروست دەبێت..[١]

- لە حاڵەتێکدا دوژمن ستەم بڵاو بکاتەوە لە نێو هاوڵاتییەکانی خۆیدا با بێباوەڕیش بن:

چونکە خوای گەورە ستەمی قەدەغە کردووە لەسەر بەندەکانی، بەرپاکردنی دادگەریش لەسەر زەویدا پێویستە لەسەر هەموو خەڵکی، ئەگەر موسڵمانان بەرگری نەکەن لە ستەم لێکراوەکان تاوانبار دەبن، چونکە ئەوان فەرمانیان پێکراوە جیهاد بکەن بۆ سەرخستنی هەق و پوچەڵکردنەوەی ناهەق و بڵاوکردنەوەی دادگەری و نەهێشتنی ستەم، سەرفرازیش نابن بەوە نەبێت خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ (المائدة: ٨).

---

١- بڕوانە: الجهاد في سبيل الله، د. عبدالله القادري (٢/١٦٢).

- لە کاتی وەستان لە دژی بانگخوازان بۆ لای خوا و قەدەغەکردنیان بۆ گەیاندنی دینی خوا:

موسڵمانان خوای گەورە پێویستی کردۆتە سەریان پەیامەکانی خوای گەورە بگەیەنن، بۆ تەواوی خەڵك، وەکو فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (ال عمران: ١٠٤).

دوژمنانی خوایش ڕێگە لە پشتگرانی دەگرن بانگەوازەکە بگەیەنن و کۆسپیان بۆ دروست دەکەن لەو بوارەدا، بۆیە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر بەندە ئیماندارەکانی بجەنگن لە دژی هەموو کەسێك دەبێتە تەگەرە لە ڕێگای خوا.[1]

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿١﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۙ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ ﴿٣﴾ فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ (محمد: ١-٤).

**سێیەم: گرنگترین پۆلە سەربازییەکان پێش غەزای بەدر.**

بەجێگیربوونی موسڵمانان لە مەدینە بە سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ و، سەر دروستبونی کۆمەڵی ئیماندار لەکۆمەڵگای نوێ، پێویست بوولەسەر موسڵمانان ، سەرکردەکانیان ئاگاداری بارودۆخی دەوروبەری خۆیان بن و ئەوەی چاوەڕوانیان دەکات لە لایەن دوژمنانیانەوە، پێویستیش بوو بانگەواز بەڕێکەوێت بۆ ئەو ئامانجەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕەوانەکراوە بۆی و خۆی و هاوەڵانی دەردی سەری زۆریان بینی لە پێناویدا.

---

١ـ بڕوانە: حاشية ابن عابدين (١٢٤/٤).

هەڵوێستی قورەیشیش لە مەدینە یەکێك لەو مەسەلانەی پێویستی بە چارەسەرکردن بوو لە لایەن سەرکردایەتی مەدینە، چونکە خەڵکی مەککە ڕازی نابن ئیسلام قەوارەیەکی هەبێت لە مەدینە، لەبەر ئەوەی دەبێتە مەترسی لەسەر قەوارەی خۆیان و پێویستە لە ڕووی ڕاوەستن و بەرەنگاری بکەن، خەڵکی مەککە هەوڵی زۆریان دا پێغەمبەرﷺ نەگاتە مەدینە، هەڵوێستی دوژمنانەیان هەبوو لە دژی پێغەمبەرﷺ و موسڵمانان،[1] دژایەتی کردن هەر بەردەوام بوو لەپاش کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ دیارترین ئەو هەڵوێستانەش ئەوەیە کە بوخاری گێڕاویەتیەوە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە سەعدی کوڕی موعاز گێڕاویەتیەوە: کە ئەو هاوڕێی ئومەییەی کوڕی خەلەف بوو، ئومەییەیش کە بە مەدینەدا تێپەڕبووایە لای سەعد لای دەدا، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ هاتە مەدینە سەعد چوو بۆ عەمرە، چووەماڵی ئومەییە لە مەککە و پێی وت: کاتێکی گونجاوم بۆ بدۆزەوە بەڵکو تەواف بکەم بە دەوری ماڵی خوا، ئیتر لە دەوری نیوەڕۆدا دەرچوون و تووشی ئەبو جەهل بوو، وتی: ئەی باوکی صەفوان، ئەوە کێیە لەگەڵ تۆ؟ وتی: ئەوە سەعدە، ئەبو جەهل پێی وت: ئەبینم بەبێ ترس تەواف دەکەیت بە دەوری کەعبەداو، لە دین دەرچووەکانیش داڵدەت دەدەن، سوێند بە خوا ئەگەر لەگەڵ ئەبو صەفوان نەبوایەی بە ساغی نەدەگەڕایتەوە، سەعد پێی وت و دەنگی بەسەریدا بەرز کردەوە: سوێند بە خوا ئەگەر ڕێگام لێ بگریت لەمە، لە شتی لەمە قورستر لە سەرت ڕێگات لێ دەگرم، ڕێگات لەسەر مەدینە....[2]

لە ڕیوایەتی بەیهەقیشدا هاتووە: سوێند بە خوا ئەگەر تەوافم لێ قەدەغە بکەیت بازرگانیت بەرەو شام قەدەغە دەکەم.[3]

ئەم ڕووداوە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی ئەبو جەهل سەعدی کوڕی موعاز بە دوژمن دەزانێت، ئەگەر لە پەنای سەرگەورەیەکیشدا نەهاتایە خوێن ڕشتنی ڕەوا

١ ـ بڕوانە: فقه التمكين في القرآن الكريم للصلابي (٤٨٨).

٢ ـ البخاري، كتاب المغازي، رقم (٣٩٥٠).

٣ـ بڕوانە: دلائل النبوة للبيهقي (٢٥/٣).

دەکرا، ئەمەیش مامەڵەیەکی تازە بوو لە لایەن سەرانی مەککەوە بەرامبەر خەڵکی مەدینە، پێش دروست بوونی دەوڵەتی ئیسلامی کەس پێویستی بە پەنادانی کەسێك نەبوو بۆ ئەوەی بێتە ناو مەککەوە بەڵکو قورەیش لەوە دەترسان شەڕ دروست بێت لە نێوان خۆیان و خەڵکی مەدینە، لەم بارەیشەوە بە خەڵکی مەدینەیان وت: سوێند بە خوا گەڕەکێك نییە لە گەڕەکەکانی عەرەب ئەوەندەی ئێوە پێمان ناخۆش بێت شەڕ لە نێوانماندا هەڵگیرسێت.[1]

هەروەها ئەم بەسەرهاتە ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کاروانەکانی بازرگانی قورەیش لە ڕێگەیاندا بۆ شام لە ئاسایشدا بوون لە کاتی ڕوودانی ئەم ڕووداوە، واتە: دەوڵەتی ئیسلامی مامەڵەی دوژمنی لەگەڵ خەڵکی مەککەدا نەدەکرد، کەواتە کاربەدەستانی مەککە دەستپێشخەر بوون بۆ ڕاگەیاندنی شەڕ لە دژی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە و موسڵمانانیان بە دوژمنی جەنگی لە قەڵەم دەدا و ڕێگەیان نەدەدا بێنە مەککە، لە پەنای کەسێکدا نەبێت.[2]

بەڵگەیەکی تریشمان لەبەر دەستدایە لەسەر ئەو ڕاستیە، لە سونەنی ئەبو داوددا هاتووە، لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، لە یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، کە بێباوەڕانی قورەیش نوسراویان نوسیبوو بۆ ئوبەی، هەر کەسێکیش لە بتپەرستەکانی ئەوس و خەزرەج، (پێغەمبەر ﷺ لەو کاتە لە مەدینە بوو، پێش ڕوودانی جەنگی بەدر)، تیایدا هاتبوو:

ئێوە پەنای کەسێکی ئێمەتان داوە و ئێمەش سوێند بە خوا دەخۆین ئێوە یان جەنگی لەگەڵ بکەن یان دەری بکەن، یان هەموومان دێین بۆتان و، جەنگاوەرتان دەکوژین و ئافرەتانتان دەبەین، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە ئوبەی و ئەو بتپەرستانەی لەگەڵیدا بوون، کۆبوونەوە بۆ جەنگ کردنی پێغەمبەر ﷺ، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ ئاگادار بوویەوە، فەرمووی: ((لقد بلغ وعيد قريش منكم المبالغ، ما كانت تكيدكم باكثر من تريدون ان تكيدوا به انفسكم، تريدون ان تقاتلوا ابناءكم واخوانكم)).

---

١ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (الروض الانف ٢/١٩٢).

٢ـ بڕوانە: الجهاد والقتال (١/٤٧٦).

واتـە: قـورەیش هەڕەشـەی زۆرتـان لێ دە کـەن، ئەوەنـدەیش پیلانیـان بۆتـان نەدەگێڕا کە خۆتان بۆ خۆتانی دەگێڕن، دەتانەوێت لەگەڵ کوڕ و براکانی خۆتـان شەڕ بکەن، کاتێك ئەوەیان بیست لە پێغەمبەر ﷺ بڵاوەیان کرد.[1]

ئا لێرەشدا مەزنی پێغەمبەرﷺ دەردەکەوێت، چونکە توانی ئـەم ئاشـووبە بنـبڕ بکـات لەسـەرەتاوە و، سـەربەرزی هۆزایـەتی لایـان وروژانـد، چـونکە پێغەمبـەرﷺ دەروونی ئادەمیزادی لە ناخەوە دەناسی، بۆیە گوتارەکەی لەگـەڵیان کاریگـەربوو، ئێمەیش پێویستمان بـە تێگەیشتنێکی وا گـەورە هەیـە بۆ لـەناوبردنی هەوڵـەکانی بێباوەڕان بۆ پەرتـەوازەکردنی موسـڵمانان و بونیـاتی ناوخۆییـان، ئینجا لـە پـاش ڕاگەیاندنی شەڕ لە لایەن قورەیشەوە دژ بە دەوڵەتی ئیسلامی و، دابەزینی ڕێگەدان بە جەنگ کردن هەڵوێستی ئاسایی ئـەوە بـوو کـە مەدینـە بـەپێی بارودۆخی تـازە مامەڵە بکات، جموجۆڵی پێغەمبەر ﷺ بـەرەو بـەهێزکردنی پلەوپایـەی دەوڵـەت و، بەرپەرچدانەوەی قورەیش لەم شەڕەی ڕاگەیاندووە لە دژی موسـڵمانان، بۆیـە ئـەم پۆلە سەربازی و غەزایانە ڕوویاندا لەپێش غەزای بەدری گەورە:

**١ـ غەزای (الابواء):**

یەکێکە لـە سـەرەتا غـەزاکانی پێغەمبـەر ﷺ،[2] هـەروەها دەناسـرێت بـە غـەزای وەددان،[3] دوو جێگەن لە نزیك یەك، شـەش یان هەشـت میلیـان لـە نێوانداـیە شـەڕ ڕووی نەدا لەم غەزایەدا، بەڵکو ڕێککەوتن لەگەڵ بەنی زەمرە لە کینانە، ئەم غەزایە لە صەفەری ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو، ژمارەی موسـڵمانانیش دووسـەد کـەس بـە سوار و پیادەوە.[4]

**٢ـ پۆلی سەربازی عوبەیدی کوڕی حاریس:**

یەکەمین ئاڵای تیا بەسترا بە دەستی پێغەمبەر ﷺ ژمارەیان شەست کـەس بـوو لە موهاجیرەکان، ژمارەی دوژمنـیش لـە قـورەیش دووسـەد کـەس بـوون لـە نێـوان

---

١ـ سنن ابي داود (٣/٢١٣)، ورقمه (٢٠٠٤) صحيح سنن ابي داود للالباني، وقال: صحيح الاسناد.

٢ ـ دەڵێن لە ناوی (زباء)ەوە وەرگیراوە واتە: دەرد و نەخۆشی.

٣ ـ لادێیەکە لە نزیك (الابواء).

٤ ـ بڕوانە: جيش النبي (ﷺ) لمحمود شيت خطاب، (٥٤).

سوارو پیادەدا، سەرکردەی بتپەرستەکان ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بوو، هەندێك پەلاماردان لە هەردوو لاوە ڕوویدا نزیك ئاوی ڕابیغ، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص تیرێکی هاویشت، کە یەکەم تیر بوو لە ئیسلامدا بهاوێژرێت، ئەوەش لەپاش گەڕانەوەیان بوو لە (الابواء).[١]

**٣- پۆلی سەربازی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب:**

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە پاش گەڕانەوەی لە ئەبوا حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبی نارد بۆ ڕۆخی دەریا، لە لای عەیصەوە بە سی سوار لە موجاهیدەکان، لەوێ تووشی ئەبو جەهل بوو لەگەڵ سێ سەد سواردا لە خەڵکی مەککە، بەڵام مەجدی کوڕی عومەری جوهەینی کەوتە نێوانیان کە لە هەدوو لاوە نزیك بوو، ئیتر هەر یەکە و گەڕانەوە شەڕ بەرپا نەبوو.[٢]

**٤- غەزای (بواط):[٣]**

ئەم غەزایە لە مانگی ڕەبیعولئەوەلدا بوو لە ساڵی دووەمی کۆچی، پێغەمبەر ﷺ لەسەر دووسەد سوار لە هاوەڵانی دەرچوو، مەبەستیشی ڕێگەگرتن بوو لە کاروانێکی قورەیش کە پێکدەهات لە ئومەییەی کوڕی خەلەف و سەد سوار و دوو هەزار و پێنج سەد وشتر.

**٥- غەزای عوشەیرە:[٤]**

تیایدا پێغەمبەر ﷺ غەزای قورەیشی کرد، ئەبو سەلمەی کوڕی عەبد و ئەلئەسەدی لە جێگای خۆی دانا لە مەدینە، لەوێ مانگی جومادی یەکەم و چەند شەوێك لە جومادی ئاخیرە مایەوە، تووشی شەڕیش نەبوو، چونکە کاروانەکە چەند ڕۆژێك پێش ئەوە تێپەڕ بووبوو بەرەو شام،[٥] ئیتر لە قەراغی دەریا مایەوە،

---

١ - بڕوانە: حديث القران عن غزوات الرسول، د. محمد بكر العباد (١/٤٠).

٢ - بڕوانە: سيرة ابن هشام (ق١/٥٩٥).

٣ - شاخێکە لە شاخەکانی جوهەینە، بە لای شاخی ڕەزا و نزیك یەنبوع.

٤- جێگایەکە لە نێوان مەککە و مەدینە لە لای یەنبوعەوە لە لای ڕۆخی دەریای سوورە، (مراصد الاطلاع ٩٤٣/٢)، هەندێ ناوی تریش هەیە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، – كتاب المغازي – الباب الاول: (العشيرة، العسيرة، العشير)، ئیبنولجەوزی بە (ذات العشير) و (ذات العشيرة) ناوی بردووە.

٥ - بڕوانە: طبقات ابن سعد (١٠/٢).

هەواڵەکەشی گەیشتە قورەیش و، دەرچوون بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و دوای ئەوە غەزای بەدری گەورە ڕوویدا.[١]

**٥ـ پۆلی سەربازی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص:**

لەپاش غەزای عوشەیرە، پێغەمبەری خواﷺ هەڵسا بە ناردنی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە پۆلێکی سەربازیدا کە پێك دەهات لە هەشت کەس لە موهاجیرەکان، ئەویش دەرچوو تاکو گەیشتە خەڕراڕ،[٢] لە خاکی حیجاز و پاشان گەڕایەوە، بەبێ ئەوەی تووشی هیچ شەڕێك بێت.[٣]

**٦ـ غەزای بەدری یەکەم:**

هۆکەی ئەوەبوو کورزی کوڕی جابیری فیهری، هێرشی کردبوویە سەر وشتر و مەڕ و ماڵاتەکانی مەدینە و هەندێکی بە تاڵان بردبوو، بۆیە پێغەمبەرﷺ بە دوایدا ڕۆیشت تاکو گەیشتە دۆڵێك سەفوانی پێ دەوترێت لە لای بەدر، فریای کورزیش نەکەوت و پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە.[٤]

**٧ـ پۆلی سەربازی عەبدوڵای کوڕی جەحشی ئەسەدی بۆ نەخلە:**

پێغەمبەرﷺ عەبدوڵای کوڕی جەحشی نارد لەگەڵ هەشت کەس لە موهاجیرەکان بۆ نەخلە لە باشووری مەککە لە کۆتایی مانگی ڕەجەبدا، بۆ ئاگایی و شارەزابوون لە هەواڵەکانی قورەیش، بەڵام ڕێگەیان گرت لەکاروانێکی بازرگانی قورەیش و دەستیان بەسەرداگرت عەمری کوڕیحەزرەمی سەرکردەی کاروانەکەشیان کوشت و دوو پیاویشیان بە دیل گرت کە عوسمانی کوڕی عەبدوڵا و حەکەمی کوڕی کەیسان بوو، هەردووکشیانیان هێنایەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر ﷺیش هیچ بڕیارێکی نەدا لەو دەستکەوتانەوا تاکو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ

---

١ ـ هەمان سەرچاوە (٢/١١).
٢ ـ جێگایەکە لە حیجاز نزیك جوحفە (مراصد الاطلاع ١/٤٥٥).
٣ ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (٢/٦٠٠).
٤ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (٢/٦٠٠).

ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ (البقرة: ٢١٧).

لەپاش دابەزینی ئەم ئایەتە پێغەمبەر ﷺ کاروانەکەی وەرگت لەگەڵ دوو دیلەکەدا، لەم پۆلە سەربازیە موسڵمانان یەکەمین دەستکەوتیان دەستکەوت و، عەمری کوڕی حەزرەمیش یەکەمین کەس بوو بە دەستی موسڵمانان بکوژرێت و عوسمانی کوڕی عەبدوڵا و حەکەمی کوڕی کەیسانیش یەکەم دیل بوون لە لای موسڵمانان.[١]

**چوارەم: هەندێ سوود و پەند و ئامۆژگاری.**

**١ـ کەی فەرمان بە جیهاد کرا؟**

دکتۆر موحەممەد ئەبو شەهبە پێی وایە فەرمانی جیهاد لە سەرەتاکانی ساڵی دووەمی کۆچی بووە، پاساویشی بۆ ئەوە هێناوەتەوە کە موسڵمانان لە ساڵی یەکەمدا سەرقاڵی ڕێکخستنی کاروباری ئاینی و دنیایی بوون، وەکو دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و، کاروباری بژێویان و، ڕێگەکانی خۆژیاندن و، ڕێکخستنی بارودۆخی سیاسی و، مەسەلەی برایەتی نێوانیان ون ڕێککەوتن لەگەڵ جوولەکەکان کە لە مەدینە دەژیان بۆ ئەوەی سەلامەت بن لە زیانەکانیان،[٢] مامۆستا صەلاح شامیش پێی وایە ڕێگەدان بە جیهاد لە کۆتاییەکانی ساڵی یەکەمی کۆچیدا بوو.[٣]

**٢ـ جیاوازی لە نێوان پۆلی سەربازەکان و غەزادا:**

نووسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ، ناوی (غزوة) یان لە هەموو کۆمەڵێك لە موسڵمانان کە پێغەمبەر ﷺ خۆی لەگەڵیان دەرچووبێت بۆ پێکدادان لەگەڵ دوژمن، ئیتر شەڕ ڕوویدابێت یان ڕووی نەدابێت، ژمارەیان زۆر بووبێت یان کەم،

---

١ ـ بڕوانە: حديث القران الكريم عن غزوات الرسول (ﷺ).

٢ ـ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (١/٧٥-٧٦).

٣ ـ بڕوانە: معنى السيرة (١٧٥).

هەموو کۆمەڵێکیش لە موسڵمانان پێغەمبەر ﷺ ناردبێتنی بۆ بەرەنگاری دوژمن وشەی (سرية) یان (بعث)یان بۆ بەکارهێناوە، جاری وابووە تووشی شەڕ بوونە و هەندێ بەبێ شەڕکردن گەڕاونەتەوە، یان بە مەبەستی هەواڵگری دوژمن دەرچوونە، ژمارەشیان زۆرجار کەم بووە، چونکە بۆ ئەرکێکی دیاریکراو ڕۆیشتوون، وەکو پەلاماردان یان ترساندنی دوژمن، پێغەمبەر ﷺ خۆی سەرکردایەتی بیست و حەوت غەزای کردووە، پۆلە سەربازییەکانیش کە ناردوونی مەزەندە دەکرێت بە سی و هەشت پۆلی سەربازی، هەموو ئەوانەش لە ماوەیەکی کەم لە تەمەنی نەتەوەکاندا نەخشەی بۆ کێشاوە کە تەنها دە ساڵ بووە.[1]

**٣ـ ژمارەی دانیشتوانی مەدینە و پەیوەندیان بە پۆلە سەربازییەکانەوە:**

پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا فەرمانی کرد بە ئەنجامدانی سەرژمێریەکی دانیشتوان، ڕاستەوخۆ لە پاش برایەتیەکە و تەنها موسڵمانانیشی گرتەوە، وەکو لە دەقی فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺدا هاتووە، کاتێك فەرمووی: ((اكتبوا لي من تلفظ بالاسلام من الناس)) واتە: ناوی هەموو ئەوانەم بۆ بنووسن کە موسڵمان بوونە.

دەرکەوتن تەنها ژمارەی جەنگاوەرەکان دەگاتە (١٥٠٠) پیاو،[2] موسڵمانان لە پاش ئەم سەرژمێریە پرسیارێکیان کرد لە خۆیان: ئایا بۆ بترسین کە ژمارەمان هەزار و پێنج سەد کەسە، چونکە ئەوان پێشتر نەدەخەوتن بەبێ چەك، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەدەدا بە شەو دەرچن لە ترسی ئەوەی ناپاکیان لەگەڵدا نەکرێت،[3] بەڵام ڕاستەوخۆ پاش ئەم سەرژمێریە پۆلە سەربازی و غەزاکان دەستیان پێکرد، ئەم جێبەجێ کردنەش شێوازێك بوو لە ڕێکخستن و پەرەسەندنی دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو.[4]

---

١ ـ في ظلال السيرة، غزوة بدر، لأبي فارس (١٢).

٢ـ بڕوانە: الوثائق السياسية، حميدالله (٦٥).

٣ـ بڕوانە: الروض الانف للسهيلي (٤٣/٥).

٤ـ بڕوانە: دراسات في عهد النبوة للشجاع (١٦٣).

**٤ـ پاسەوانێتی هاوەڵان بۆ پێغەمبەر ﷺ:**

هاوەڵان (رەزای خوایان لێ بێت) پاسەوانێتی پێغەمبەر ﷺی دەکرد، دایکی ئیمانداران عائیشە (رەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: لە شەوێکدا پێغەمبەر ﷺ خەوی لێ نەدەکەوت و فەرمووی: "لیت رجلا صالحا من اصحابي، يحرسني الليلة" واتە: خۆزگە پیاوچاکێك لە هاوەڵانم پاسەوانی بکردایەم، لەو کاتە گوێمان لە دەنگی چەك بوو، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتی: سەعدم ئەی پێغەمبەری خوا، هاتووم پاسەوانیت بکەم، ئیتر پێغەمبەر ﷺ خەوی لێکەوت تا گوێمان لە پرخەی بوو.[1]

ئەویش پێش غەزای بەدری گەورە بوو،[2] لە فەرموودەکەی عائیشەیشدا رەوایی پاسەوانێتی وەردەگیرێت هەروەها دووربینی کەمتەرخەمی نەکردن، ئینجا بەپێی فەرموودەکە پێویستە لەسەر خەڵکی پاسەوانێتی سەرگەورەکەیان بکەن بە هۆی مەترسی کوشتنەوە، هەروەها ستایشی چاکەی تیادایە بۆ خۆبەخش بەکاری چاکە، پێغەمبەر ﷺ وای کرد سەرەڕای پشت بەستنی بەهێزی بە خوای خۆی بەڵام مەبەستی ئەوە بوو سونەتێك بۆ ئومەتەکەی دیاری بکات.[3]

**٥ـ دەقی بەڵێننامەیەکە لەگەڵ بەنی زەمرە و پەراوێز دانان لەسەری:**

((بسم الله الرحمن الرحيم))، ئەمە نووسراوێکە لە موحەممەد ﷺ بۆ بەنی زەمرەی کوڕی بەکری کوڕی عەبدومەنافی کوڕی کینانە کە ئەوان بێ ترس بن لەسەر خۆیان و ماڵیان، پشتگیریش بکرێن لە دژی هەر کەسێك نیازی خراپ بێت بەرامبەریان، مەگەر لە حالەتێکدا ئەوان هەڵسن بە دژایەتی کردنی دینی خوا، هەتاکو دەریا خوری تەڕ بکات هەروەها ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن بۆ پشتیوانی کردن پێویستە لەسەریان بێن، پەیمانی خوا و پێغەمبەریان لەسەر بێت، پشتگیری کردنیش بۆ پیاوچاك و لە خوا ترسانە.[4]

---

١ـ البخاري: كتاب التمني: باب قوله (ﷺ) "ليت كذا وكذا" (٧٢٣١).

٢ـ بڕوانە: تفسير القرطبي لاپەڕە (٦/٢٣٠).

٣ـ بڕوانە: ولاية الشرطة في الاسلام، د. عمر محمد الحميداني (٦٣).

٤ـ الوثائق السياسية محمد حميدالله (٢٢٠، رقم ٢٥٩).

پێغەمبەر ﷺ هەلێکی زێڕینی قۆستەوە لە غەزای (الابواء)دا و، پەیمانێکی سەربازی ئەنجامدا لەگەڵ سەرگەورەی بەنی زەموورەدا، جێگای ئەوان بایەخێکی سەربازی خۆ هەبوو لە ململانێی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی تازە پێگەیشتوو لەگەڵ قورەیشدا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کاری دەکرد بۆ دەستەبەرکردنی بێ لایەنییان، لە کاتی ڕوودانی پێکدادانی سەربازی لە نێوان مەدینە و خەڵکی مەککە، پلانیشی تا کاتی جەنگی بەدر ئەوەبوو کاروانەکانی قورەیش جارس بکات بە ناردنی هەندێ پۆلی سەربازی بچووك لە موهاجیرەکان، بە تایبەتی لە کاتێکدا ئەو کاروانانە پارێزراو نەبوون بە سوپایەك، چونکە قورەیش تا ئەو کاتە بیری لەوە نەکردبوویەوە.[1]

نزیکی بەنی زەمرە و هاوپەیمانەکانیان لە مەدینە کە بازاڕ و سەرچاوەی ئابووری ئەوان بوو، ئەوانی خستبوویە هەڵوێستێك ڕێگە چارەیەکیان نەبێت جگە لە ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامی، کە لە زاراوەی نوێدا دەستدرێژی نەکردنی پێ دەوترێت.[2]

ئەم ڕێککەوتننامەیەش ئەوەی ئاشکرا کرد کە سیاسەتی شەرعی لەوانەیە وا بکات لە موسڵمانان کە هاوپەیمانێتی سەربازی، ئابووری، یان بازرگانی ببەستن، لەگەڵ هەر هێزێك لەو هێزانەی قەوارەی هەیە، هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە هاوپەیمانێتی سیاسی بنچینەی هەیە لە شەرعدا، پێویستیەکیشە مەبەستی لابردنی زیانی ڕووداو یان چاوەڕوان کراو دەیسەپێنێت،[3] هاوپەیمانێتیەکەشی پێویستە بنیات نرابێت لەسەر بنەمای لابردنی زیان و بەرژەوەندی هاوبەشی، هەروەها پێویستە ئامانجێکی شەرعی ئاشکرای تیا بەدی بکرێت، موسڵمانانیش بڕیار و ڕا و بۆچوونی خۆیانیان تیادا هەبێت، بەڵام ئەگەر تەنها پاشکۆ و جێبەجێکەر بن، وەکو ڕێککەوتننامەکانی ئەم سەردەمە، ئەوە نابێتە ڕێککەوتننامەیەکی شەرعی، پێویستە لەسەر سەرانی نەتەوەی ئیسلامیش چاك حاڵی بن لە بەرنامەی

---

١ـ بڕوانە: نشأة الدولة الاسلامية، د. عون شريف لاپەڕە (٤٣).
٢ـ بڕوانە: الفقه السياسي، خالد سليمان الفهداوي (١١٩).
٣ ـ هەمان سەرچاوە (١٢٤).

پێغەمبەرﷺ لە بزووتنەوەی سیاسیدا، هەروەها چاك تێبگەن لەو بنەما شەرعیەی کە دەڵێت: ((لا ضرر ولا ضرار)) واتە: نە زیان بەخش بە نە زیان بە خۆتیش بگەیەنە.[1]

مامۆستا (مصطفى الزرقا) لە میانەی باسکردنی ئەم بنەمایە دەڵێت: ئەم بنەمایە لە کۆڵەکەکانی ئایینە و دەقەکانی قورئان و فەرموودەکان شایەتی بۆ دەدەن، ئەو زیانە دەگرێتەوە کە قەدەغەکراوە ئیتر چ زیانێکی گشتی بن یان تایبەتی، هەروەها ئەوە دەگرێتەوە کە بە ڕێگەی گونجاو لابرێت پێش کەوتنەوەی، لە پاش ڕوودانیشی کاری پێویست بکەیت بۆ ئەوەی شوێنەوارەکانی لابرێت و، دووبارە نەبێتەوە، هەروەها ئاماژە دەکات بۆ پێویستی کارکردن بە سووکترینی خراپە لە نێوان دوو خراپەدا، بۆ ئەوەی خراپترینیان پاڵ بنرێت، ئەوەش سووك کردنەوەیەکە بۆ ئەو خراپەی کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێت لابرێت.[2]

ئەم ڕێککەوتننامەیە شەرعی بوونی ئەو جۆرە گرێبەستانە ئاشکرا دەکات لە نێوان دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتێکی تردا، ئەگەر بەرژەوەندی موسڵمانان وا بخوازێت، دەوڵەتی ئیسلامی لەم حاڵەتەدا پێویستە پشتگیری بکات لە دەوڵەتی هاوپەیمان گەر داوای لێکرد، هەروەها دەکرێت دەوڵەتی ئیسلامی داوای چەك و جەنگاوەر بکات لە دەوڵەتی هاوپەیمان بۆ ئەوەی شەڕ بکەن لە ژێر ئاڵای ئیسلامی، لە دژی دوژمنان.[3]

هەروەها پێغەمبەرﷺ مەرجی کرد لەسەر بەنی زەمرە کە دژ بە ئاینی خوا جەنگ نەکەن، تاکو پشتگیری موسڵمانان بەدەست بهێنن، ئەمەش دوورخستنەوەیەك بوو بۆ ئەو کۆسپانەی دەوەستن لە ڕێگای بانگەوازدا،[4] ئەم

---

١ـ ئەم بنەمایە بنچینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ (ابن ماجە) دەیگێڕێتەوە (٣٩/٢، رقم ١٨٩٦) کە فەرموویەتی صەحیحە و ئەلبانی هێناویەتیەوە لە صەحیحی سونەنی ئیبنو ماجەدا وە وتوویەتی: صەحیحە بە ژمارە (١٩١٠ (٢٣٧٠)، ١٩١١ (٢٣٧١).

٢ـ بڕوانە: المدخل الفقهي، للشيخ الزرقا (٩٧٢).

٣ـ بڕوانە: الجهاد والقتال في السياسة الشرعية، د. محمد خير هيكل (٤٧٩/١).

٤ـ بڕوانە: دولة الرسول من التكوين الى التمكين (٥٣).

ڕێککەوتننامەیــە بــە دەســتکەوتێکی سیاســی و عەســکەری دەژمێردرێــت بــۆ موسڵمانان.[١]

**٦ـ (من یەکەمین پیاوم تیرێکی لە پێناو خوادا هاویشتبێت):**

پۆلی سەربازی عوبەیدەی کوڕی حارس (ڕەزای خوای لێ بێ) یەکەمین پـۆل بـوو لە مێژووی ئەو جۆرە هێزانە، کە موسڵمانان تیایدا ڕووبەڕووی بتپەرستان ببنەوە لە پێکدادانێکی سەربازیدا، شەڕ لە نێوان هەردوولادا شێوەی پەلامار بە تیرهاویشتنی وەردەگـرت، بـە سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەقاصـیش (ڕەزای خـوای لێ بێـت) یەکـەم عەرەبە کە تیرێکی وەشاندبێت لەپێناو خوای گەورە، لـەو شـەڕەدا کـە درێژخایـەن نەبوو، چونکە هەردوولا بڕیاری پاشەکشەیان دا، پاشەکـشەکردنی موسـڵمانان زۆر بەهێز و ڕێکخراو بوو، بە سەرکردایەتی سەعدی کـوڕی ئـەبی وەقـاصﷺ، ڕۆڵێکـی گەورەی هەبوو لە تێکدان و پەرتەوازەکردنی دوژمن بە مەبەسـتی پەکخـستنیان لـە هێرشکردن، لە ڕێگەی تیر باران کردنیان، کە ئەمەیش بـوو بـە قـەلغانێکی بـەرگری کردن، لەو ڕۆژەدا عوتبەی کوڕی غەزوان و میقدادی کوڕی ئەسوەد[٢] هەڵهاتن بەرەو لای موسڵمانان کە ئەوان پێشتر موسڵمان بووبوون، لەم پۆلـە سـەربازیەدا سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەقــاص (ﷺ) پێـشکەوتنێکی سـەربازی ئیـسلامی تۆمـارکرد، لـە ژیاننامەی پڕ سـەروەری خۆیـدا، هـەروەها لـەم پۆلـە سـەربازیەدا جـەخت کرایـەوە لەسـەر سیاسـەتی تایبـەت بـە کۆکردنـەوەی موهـاجیران بـۆ ئـەو غـەزا و پۆلـە سەربازییانە لە لایەن پێغەمبەر ﷺ تا کاتی جەنگی بەدر، وەکو جێبەجێکردنێك بـۆ ڕێککەوتننامەی عەقەبەی دووەم.[٣]

---

١ـ بڕوانە: الدعوة الاسلامية، د. عبدالغفارعزيز (٢٩٦).

٢ـ سەرگەورەمان میقدادی کوڕی عەمری بەهرانی کیندی، دەشڵێن حەزرەمی، زیاتر بـە ناوبـانگی میقـدادی کوڕی ئەسوەد ناسراوە (الاصابة لأبي حجر ٦/١٦٠ عن ترجمة برقم ٨٢٠١).

٣ ـ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية، د. بريكك العمري (٩٢).

**٧ـ دەقی دەستوری ڕێککەوتن لەگەڵ جوهەینەو قسەکردن لەسەری.**

((ئەوان بێترس دەبن لەسەرخۆیان و ماڵەکانیان، کۆمەکیش دەکرێن دژی هەر کەسێك ستەمیان لێبکات، یان جەنگیان لەگەڵ بکات، تەنها لەئاین و خێزاندا نەبێت، ئەومافانەی بۆچاکەکاری بیابان نشینەکانە، هەمان ئەومافانە بۆ شارنشینەکانیشە)).[1]

گرنگی ئەم ڕێکەوتننامەیە لەوەدایە، کاتێك مەجدیی کوڕی عەمری جوهەنی ناوبژی کرد لەنێوان پۆلی سەربازی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب و کاروانە قورەشییەکە بەسەرکردایەتی ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و پاسەوانێتی سێ سەد سواری قورەیشی.[2] کە لەلای ناوچەی دەسەلاتی جوهەینەوە ریزیان بەست و خۆیان ئامادە کرد بۆجەنگ،[3] بەلام پێش هەلگیرسانی شەڕەکە مەجدیی کوڕی عەمر هاتە نێوانیانەوە کەیەکێك بوو لەسەرانی جوهەینە، توانیشی سەرکەوتووبێت لە هەوڵی ئاشتی خوازانەی لەنێوان هەردولا، چونکە مەجدی و هۆزەکەی هاوپەیمان بوون لەگەڵ هەردوولایاندا، ئەوانیش لەقسەی دەرنەچوون و هەردوولایانیش گەڕانەوە بۆشوێن و ڕێی خۆیان بەبێ شەڕ.[4]

لەم ڕێککەوتننامە دەردەکەوێت کە دەوڵەتی ئیسلامی ڕێکەوتنی بەستووە لەگەڵ هۆزەکانی نزیکی خۆی پێش ئەو کارە سەربازیانەی پێی هەڵساوە، بە بەلگەی ئەوەی کە بزووتنەوەی پۆلە سەربازیەکان کە ئاراستە دەکرا لە دژی قورەیش، پێش ئەوە ڕێککەوتننامەیەکی ئاشتی هەبوو لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامی و هۆزی جوهەینە کە جێگیر بوون لەسەر ڕۆخی دەریای سوور، کە ناوبژیان کرد بۆ ڕوونەدانی شەڕ لە نێوان موسڵمانان و بێباوەڕانی مەککە.

یەکێك لەو شتانەش کە لەو ڕێککەوتننامەوە فێری دەبین شەریعەتی ڕێککەوتنە لە نێوان دەوڵەتی ئیسلام و دەوڵەتێکی تردا، کە ئەویش لە لای خۆیەوە پەیوەندی

---

١ـ بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية، محمد حميدالله (٦٢).

٢ـ بڕوانە: المواهب اللدنية (١/٧٥).

٣ـ بڕوانە: طبقات ابن سعد (٢/٦) هەروەها بڕوانە: السرايا والبعوث، (٨٥).

٤ ـ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (٨٦).

ئاشتی هەبێت لەگەڵ دەوڵەتێکی دژ بە ئیسلام، بە مەرجێك پشتگیری ئەو دەوڵەتـە نەکرێت دژ بە موسڵمانان، هەروەها دەکرێت پاشی خـۆ سـازدان واز لـە جـەنگکردن بهێنرێت لەگەڵ دوژمنـدا، وەکـو وەڵامدانەوەیـەك بـۆ ناوبـژیکردنی دەوڵـەتێکی تـر، ئەگەر زیانێکی تێدا نەبێت بۆ موسڵمانان.[١]

ئاکامەکانی پۆلی سـەربازی حـەمزە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) لەسـەر سـەربازگەی بتپەرستان لە ئەوپەڕی خراپیدا بوون چونکە قەوارەی قورەیشی لەق کرد و، ترسی خستە دڵی ئەوانەوە و چاویانی لەسەر ئەو مەترسیەی ڕووی تێ کردبوون کـردەوە، چونکە ڕێگەی بازرگانی و هێزی ئابووری قورەیش کەوتە مەترسیەوە[٢] ئـەبو جـەهل لەپاش گەڕانەوەی بۆ مەککە وتی: ئەی کۆمەڵانی قورەیش، موحەممەد لە یەسـریب جێگیر بووە و هێزەکانی دەنێرێـت، مەبەسـتیـشی ئەوەیـە زیانتـان پـێ بگەیـەنێت، بۆیە وریابن لە ڕێگەی ئـەوەوە تێپەڕنەپـەڕن، یـان نزیکـی بکەونـەوە، چـونکە ئـەو وەکو شێری بە هەڵمەتە و زۆر تووڕەیە لێتان، سـوێند بـە خـوا جادوویـەکی ئـەوتۆی هەیە، خۆی و هاوەڵانی کە دەبینم شەیتانیان لەگەڵدا دەبینم، ئینجا ئێوە گاوران لە دوژمنایەتی کوڕانی قەیلە (ئەوس و خەزرەج)، کەواتە موحەممەد دوژمنـە و پـەنای بردۆتە بەر دوژمن.[٣]

**٨ـ پۆلی سەربازی عەبدوڵای کوڕی جەحش و پەند و ئامۆژگاریەکانی:**

پۆلەکەی عەبدوڵای کوڕی جەحش هەنـدێ دەرەنجـامی گرنگـی هـەبوو، هاوکـات هەندێ پەند و ئامۆژگاریشی تیابوو، لەوانە:

أ- لە هەواڵی ئەو پۆلـەدا هـاتووە کـە پێغەمبـەر ﷺ نووسـراوێکی بـۆ ئـەمیری پۆلەکە نووسیوە و فەرمانی پێکردووە کە نەجوولێتـەوە لـە پـاش دوو ڕۆژ ڕێکـردن نەبێت، ئەمـەیش نموونەیەکە بـۆ جێبـەجێکردنی بنەمایـەکی گـرنگ لـە بنـەماکانی جەنگ، ئەویش شاردنەوەی پلانەکانی جەنگە، یەکێك لەوانەیش هێڵی ڕێکردنە تاکو

---

١ـ بڕوانە: الجهاد والقتال في السياسة الشرعية (١/٤٧٨-٤٧٩).

٢ ـ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (٨٦).

٣ ـ بڕوانە: الجهاد والقتال في السياسة الشرعية (١/٤٧٨-٤٧٩).

سوپاکە بەبێ ترس بەڕێبکەوێت دوور لە پلانەکانی دوژمن، مەدینە لەو سەردەمەدا بتپەرست و جوولەکەشی تێدا بوو، شتێکی چاوەڕوان کراویشە کە ئەو ساتە خەڵکی مەککە ئاگادار بکەنەوە بە هێڵی ڕێکردنی ئەو پۆلە سەربازییە، جا کاتێك کەسانی پۆلەکە ڕێککەوتن و، خۆیشیان نەیاندەزانی بەرەو کوێ دەڕۆن، پێغەمبەرﷺ ترسی نەما لەوەی کە ئەنجامەکەی ئاشکرا بێت بۆ دوژمن.[1]

کاریگەری پەروەردەکردنی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا دیارە لەم پۆلە پیرۆزەدا، چونکە هەموویان گوێڕایەڵ بوون و ڕۆیشتن بۆ ناوچەی دوژمنەکانیان و، لێشیان تێپەڕین تا گەیشتنە ناوچەیەك لە پشتیانەوە، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر باوەڕی هاوەڵان و گوێ نەدانیان بە گیانی خۆیان لەپێناو خوادا.[2]

ب- قورەیش هەوڵیدا کەوتنەوەی جەنگ بقۆزێتەوە لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا:

بەم بۆنەیەوە قورەیش شەڕێکی ڕاگەیاندنی چڕی بەرپاکرد، لەگەڵ هەندێ پڕوپاگەندە لە دژی موسڵمانان، ئەو ڕێنماییە ئیبراهیمیانەی قۆستەوە کە شوێنەواریان لە کۆمەڵگای جاهیلیدا هەر مابوویەوە، وەکو قەدەغەکردنی شەڕ لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا، قورەیش ئەم هەلەیان قۆستەوە بۆ ناوزڕاندنی پێغەمبەرﷺ و، دەرخستنیان لە شێوەی ستەمکاردا، کە ڕێز ناگرێت لە ڕێزدارەکان،[3] ئەوان دەیانوت: موحەممەد و هاوەڵانی مانگە قەدەغەکراوەکانیان شکاند و خوێنیان تێدا ڕشت و ماڵیان تالان کرد و پیاوانیان تیا بە دیل گرت.[4]

قورەیش لەو پیلانەیاندا سەرکەوتن لە سەرەتاوە، چونکە (پڕوپاگەندەکەیان دەنگێکی زۆری دایەوە، شوێنەوارێکی بەرچاوی هەبوو تەنانەت لە خودی مەدینەدا، چونکە مشت و مڕ لە نێو موسڵمانانیشدا زۆر بوویەوە، ڕەخنەیان گرت لە پیاوانی پۆلە سەربازیەکە کە لەو مانگەدا شەڕیان کردووە، هەڵوێستەکە توندبوویەوە و

---

١ـ بڕوانە: التأريخ الاسلامي، مواقف وعبر (٧١/٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٧١/٤).

٣ـ بڕوانە: مكة والمدينة في الجاهلية وعهد الرسول (صلى الله عليه وسلم للاستاذ احمد الشريف (٤٤٥).

٤ـ بڕوانە: سنن البيهقي (٥٩/٩) نقلا عن السرايا والبعوث النبوية (١٠٠).

جوولەکە دەیانویست ئاشووب بنێنەوە)،[1] دەشیانوت: بێگومان جەنگ بەرپا دەبێت لە نێوان موسڵمانان و قورەیشدا، بەڵکو لە نێوان ئەوان و هەموو عەرەبدا بە بۆنەی شکاندنیان بۆ ڕێزی مانگی قەدەغەکراو، تەنانەت هەندێ قسەیان بڵاوکردەوە، کە دەربڕینی دەکرد لە ڕق و کینەی دڵیان بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان، وەکو ئەوەی مانای خراپیان جووت دەکرد لەگەڵ ناوی ئەوانەی بەشداریان کرد لەو پۆلە سەربازییەدا.[2]

کاتێك بەشداربووانی پۆلەکە وایانزانی ئیتر تیاچوون، وەڵامی خوای گەورە هەست و زمانی بتپەرستەکانی بڕی و پەردەی لەسەر ئەو تاوانبارانە ڕامالی و، وەڵامی دانەوە کە بەرگری کردن لە ڕێگای خوای گەورە و کوفر پێکردنی گەورەترە لە شەڕکردن لە مانگە قەدەغەکراوەکان و (المسجد الحرام) و دەرکردنی خەڵکەکەی تاوانێکی گەورەترە لەو شەڕەی ئەوان باسی دەکەن، قورەیش هەموو ئەو تاوانانەی ئەنجام دا و هەمووشی لەبیر خۆی بردەوە، تەنها ڕێزی ئەو مانگە نەبێت کە وەکو ئامرازێك سوودی لێ وەردەگرت بۆ بەرپاکردنێکی شەڕێکی توند و تیژ لە دژی موسڵمانان و دەوڵەتەکەیان، بە مەبەستی هەڵگەڕاندنەوەی هۆزە بتپەرستەکان و ڕەواندنەوەی خەڵکی لە دەوری ئاینی ئیسلام، بە ئەندازەیەك کە پێغەمبەر ﷺ خەمی دەخوارد و لۆمەی سەرکردەی پۆلە سەربازیەکەی دەکرد لەسەر ئەوەی کە کردوویانە،[3] بۆیە ئایەتەکان زۆر بە هێز و توندیەوە بەرپەرچی پڕوپاگەندەکانی قورەیشی دەدایەوە و ، ڕوونی دەکردەوە ئەو مانگانە هەرچەند ڕێزدارن، بەڵام هەر کەسێك دژ بە ڕێگای خوا بێت ڕێزی نیە.[4]

**ج- پەرۆشی سەرکردە بۆ سەلامەتی سەربازەکانی:**

کاتێك سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عوتبەی کوڕی غەزوان دواکەوتن بەهۆی گەڕانەوەیان بە دوای وشترێکدا لێیان ون بووبوو، قورەیشیش لەو کاتەدا هاتبوون

---

١ـ بڕوانە: مكة والمدينة في الجاهلية وعهد الرسول (٤٤٥).

٢ ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (ق١/٦٠٣-٦٠٤)، التاريخ الاسلامي (٤/٧٢).

٣ـ بڕوانە: دولة الرسول من التكوين الى التمكين (٥٣٣).

٤ـ بڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١٠٠).

بۆ ڕزگارکردنی هەردوو دیلەکەیان، پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو، فەرمووی: ((اخاف ان تكونوا قد اصبتم سعد بن مالك، وعتبه بن غزوان)) واتە: دەترسم شتێکتان هێنابێت بەسەر سەعدی کوڕی مالیك و عوتبەی کوڕی غەزوان ئیتر ڕزگاری نەکردن تاکو گەڕانەوە و، دوای ئەوە بە ڕزگارانە ئازاد کران، ئەوسا حەکەمی کوڕی کەیسان موسڵمانان بوو،[1] هەر لەلای پێغەمبەر ﷺ مایەوە، عوسمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی موغیرە بە کافری گەڕایەوە.[2]

لەڕێبازی پێغەمبەرﷺئەوە تێدەگەین، کە پێویستە سەرکردە بایەخ بداتە ساغ و سەلامەتی سەربازەکانی، چونکە ئەوانن کە گیانی خۆیان دەکەنە قوربانی لە پێناو ئایینی خوای گەورە و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی.

قوتابخانە سەربازیە نوێیەکان دەڵێن: سەرباز کاتێك هەست بە بایەخدانی سەرکردایەتی دەکات بە ساغ و سەلامەتی و ئاسایش، ئەوە هیچ کاتێك دوو دڵ نابێت لە بەخشینی هەموو شتێك بتوانێت بیبەخشێت.[3]

### د- پەیدابوونی پەروەردەی هێمن لە گۆڕەپاندا:

پۆلی سەربازی عەبدوڵای کوڕی جەحش ئامانجەکانی خۆی بەدی هێنا، توانایشی دەرکەوت لە پەل هاویشتنە نێو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی قورەیش، بە ڕادەیەك بوو بە مایەی سەرسام بوونیان، تەنانەت سیخوڕەکانی قورەیشیش نەیانتوانی بزانن ڕووی پۆلە سەربازیەکە بەرەو کوێیە، ئەوەش ئامانجی پێغەمبەر ﷺ بوو لە نەخشەکەیدا، بۆ پاراستنی زانیارییەکان، ((چونکە شاردنەوە گرنگترین هۆکارەکانی (مباغتة) واتە کت و پڕ ئەنجامدانی کار، کە ئەویش یەکێکە لە بنەماکانی جەنگ)).[4]

نهێنی کارکردن ئەوەی سەلماند کە پۆلە سەربازییەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بەهێزن دەتوانن هەر ئەرکێکی قورس ئەنجام بدەن، پێویستیەکانی جەنگ و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان لە خۆیاندا بەدی بکەن.

---

١ ـبڕوانە: السرايا والبعوث النبوية (١٠٠).

٢ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى، د. محمد ابو فارس (٢٣).

٣ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى، د. محمد ابو فارس (٢٣).

٤ ـ بڕوانە: الرسول القائد، خطاب (٩٤).

یەکێك لە شوێنەوارەکانی پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ لە توند و تۆڵی سەربازیدا خۆی دەبینێتەوە لە سەرکردەی پۆلەکەدا و گوێڕایەڵی کردنی تەواوی بۆ پێغەمبەرﷺ بێ هیچ دوو دڵییەك، بەڵکو لە پاش خوێندنەوەی بۆ نوسراوەکە خۆی کرد بە پێشەنگێکی چاك بۆ سەربازەکانیشی، کاتێك پێی وتن: هەر کێ لە ئێوە حەزی لە شەهیدبوونە با لەگەڵمان دەربچێت، هەر کەسیش حەز لە شەهیدی ناکات با بگەڕێتەوە، بەڵام من دەڕۆم بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.[١]

**٩ـ ئامانجی پۆلە سەربازییەکان:**

کاتێك دەکۆڵینەوە لە بزوتنەوەی پۆلە سەربازی و غەزاکان کە پێغەمبەر ﷺ سەرکردایەتی دەکرد، دەتوانین حاڵی بین لە زۆرێك لەو ئامانجانە، بۆ نموونە ئەگەر ورد بینەوە لە بزوتنەوەی پۆلە سەربازەکان کە پێش جەنگی بەدر دەردەچوون، دەبینین هەموو بەشداربووانی لە موهاجیرەکان بوون، یەك کەسێکی ئەنصارییان تیانەبوو، ئیبنو سەعدﷺ دەڵێت: ((هەمووان لەسەر ئەو بۆچوونەن کە تەنها موهاجیرەکان بەشدار دەبوون))، تاکو کاتی جەنگی بەدر پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسێکی لە ئەنصار نەنارد بۆ هیچ کارێکی سەربازی،[٢] ئەوەیش کارێکی نەخشە بۆ کێشراو بوو، ئامانجی خۆی تیابوو، یەکێك لەو ئامانجانە زیندووکردنەوەی کێشەی ئەنصارەکان خۆیان بوو لە دڵی خۆیاندا و لەسەر ئاستی دەرەکی و ماندووکردنی ئابووری قورەیش و گەمارۆدان و گێڕاندنەوەی هەندێ لە مافە زەوتکراوەکانیان و، لاوازکردنی قورەیش لە ڕووی سەربازییەوە، ڕاهێنانی هاوەڵان لەسەر فێربوونی هونەرەکانی جەنگ کردن و دەستنیشانکردنی جموجۆڵەکانی قورەیش و ترساندنی دوژمنە ناوخۆییەکانی ناو مەدینە و دەوروبەری و تاقیکردنەوەی هێزی دوژمن،[٣] لە ڕاستیدا ئەو پۆلە سەربازیانەیش ئامانجەکانی خۆیان جێبەجێ کرد، لەوانە:

**أ ـ پانکردنەوەی شکۆمەندی دەوڵەت لە ناوخۆ و دەرەوە:**

ئەو پۆلە سەربازی و غەزایانە توانیان سەرنجی دوژمنانی بانگەواز ڕابکێشن بۆ هێزی موسڵمانان و توانایان لەسەر لێدانی هەر بزوتنەوەیەکی ناحەز لە ناوخۆ یان

---

١ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (ق٦٠٢/١) من رواية ابن اسحاق عن عروة.

٢ـ بڕوانە: الطبقات الكبرى لابن سعد (٦/٢).

٣ ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى لأبي فارس (١٤-٢٤).

دەرەوە، تاکو کەس بیر لەوە نەکاتەوە هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی ئیسلامی کە سوپاکەی ڕانەوەستێ بە شەو و ڕۆژ، ئەوەیش بووە هۆی ترساندنی جوولەکەکان و هۆزە بتپەرستەکانی دەوروبەری مەدینە و، وای کرد کە دوژمنان هەزار جار بیر بکەنەوە پێش ئەوەی شەڕ بکەن لەگەڵ موسڵمانان، یان پشتگیری دوژمنەکانیان بکەن، تێبینیش دەکەن ژمارە و هێزی ئەو هێزانە لە زیادبووندا بوو، پۆلێکی سەربازی نەدەگەڕایەوە یەکێکی تر دەردەچوو، بۆ بەدیهێنانی هەمان ئامانج، کە بریتیە لە لێدانی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی قورەیش و، ڕێگەگرتن لە بازرگانییەکانیان بە تایبەتی بەرەو شام، ئەوەیش وای دەکرد ژمارەی پاسەوانانی ئەو کاروانانە زیاد بکەن و نرخی کاڵاکان بەرزبێتەوە، بێجگە لەو ترسەی کە بازرگانەکان و دەوڵەمەندەکانی مەککە هەستیان پێ دەکرد.[١]

**ب - بەدەست هێنانی لایەنگیری هەندێ هۆزەکان و کەمکردنەوەی ڕۆڵی عەرەبە بیابانشینەکان:**

چونکە پێغەمبەرﷺ ڕێککەوتنی کرد لەگەڵ هۆزی جوهەینە و هاوپەیمانی لەگەڵیان کرد، هەروەها لەگەڵ هەندێ لە هۆزەکانی تر بۆ دەستەبەرکردنی بێ لایەنییان لە ململانێی نێوان مەککە و مەدینە و کارکردن بۆ ڕاکێشانیان بۆ لای خۆیان چونکە لە بنچینەدا ئەو هۆزانە لایەنگیری قورەیشن و هاوکاریان لەگەڵ دەکەن و، هاوپەیمانێتی مێژوویی لە نێوانیاندا هەیە کە قورئان بە (ایلاف)[٢] ناوی بردووە، لەو ڕێگەیەوە قورەیش هەوڵی داوە دڵنیا بێت لەسەر بازرگانییەکەی لەگەڵ شام و یەمەندا.[٣]

ئینجا لە پاش ڕێککەوتنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هەندێ لەو هۆزانە، بوو بە مایەی مەترسی بۆ بازرگانی قورەیش و موسڵمانان بوون بە سەرگەورەی ناوچەکە.[٤]

---

١- بڕوانە: دولة الرسول من التكوين الى التمكين (٥٣٢).

٢- سورەتی قورەیش.

٣ - بڕوانە: المجتمع المدني، د. اكرم ضياء العمري.

٤- بڕوانە: دراسات في السيرة (١٩).

پێغەمبەرﷺ هەڵسا بە کەمکردنەوەی ڕۆڵی عەرەبە بیابانشینەکان، بۆ ئەوەی بوونیان نەبێت لە ڕێگای بازرگانییەکاندا، چونکە ئەو عەرەبانە سەرچاوەیەکی هەڕەشە بوون بۆ کاروانە بازرگانییەکان، ئەوانەی بە ناوچەی ئەواندا تێپەڕ دەبوون ئەبوایە باجیان بدایەوە ئەو کاتە دەیانتوانی تێپەڕ بن، بە دروست بوونی دەوڵەتی ئیسلامی ئەوەیان لە دەست دەرچوو، بۆیە خۆیان تاقی کردەوە هێرش بکەنە سەری، ئەم کارەیش کوڕزی فیهری پێی هەڵسا، بەڵام پێغەمبەرﷺ وەدووی کەوت تاکو صەفوان (جێگایەکە نزیک بەدر (١٥٠) کیلۆمەتر لە مەدینەوە دوورە)، نووسەرانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ ئەم ڕووداوەیان بە غەزای بەدری بچووك ناویردووە، ئەو غەزایە وانەیەك بوو بۆ هەموو عەرەبێکی بیابان نشین، چونکە پاش ئەوەی جارێکی تر هیچ کەسێك لەوانە نەیانتوانی بیر لە هێرش کردنە سەر مەدینەدا بکەن، ئالێرەشەوە بوو کە نەتەوەی ئیسلام ڕازی نەبوون بە پێدانی باج بە چەتە و ڕێگرەکان، بەڵکو ناچاری کردن پاشەکشە بکەن وە بچنە نێو هەندێ ڕێککەوتن نامەوە لەگەڵ موسڵمانان.[١]

**ج- پەیوەندی ئەم پۆلە سەربازییانە، بە بزووتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی:**

ئەم غەزا و هێزە بچووکانە وەکو ڕاهێنان و ئامادەکارییەکی سەربازی بوو بۆ سەربازانی ئیسلام، ئەم چالاکییە پڕ گوڕە بەڵگە بوو لەسەر دەوڵەتی ئیسلام وەکو شانەی هەنگ ماندوو نەناسانە کار دەکەن، هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێت لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ، کە هاوەڵان پەرۆش بوون بۆ بەشداریکردن وەکو سەرکردە و سەرباز، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی پێدەدان بۆ جێگیرکردنی کۆڵەکەکانی دەوڵەت و خۆ ئامادەکردن بۆ فتوحاتی چاوەڕوانکراو کە بەردەوام پێغەمبەر ﷺ مژدەی بە هاوەڵان دەدا لەو بارەوە لە هەموو حاڵەتێکدا.

ئینجا بە وردبوونەوە لە سەرکردە و پۆلە سەربازیەکان، هەندێ ناوی پڕشنگدارمان بەرچاو دەکەوێت کە ڕۆڵی گەورەیان بینی لە بزوتنەوەی فتوحاتی

---

١ـ بڕوانە: دراسات في عهد النبوة، د. عبدالرحمان الشجاع (١٣١).

ئیسلامیدا، وەکو سەرکردەی فتوحاتی شام (امین الامة) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص سەرکردەی قادسیە و مەدائین و خالیدی کوڕی وەلید، شمشێری هەڵکێشراوی خوای گەورەو بەزێنەری ڕۆمەکان لەیەرمووك و عەمری کوڕی عاص، فاتحی میصر و لیبیا و، چەندین سەرکردەی تر (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە ڕاستیدا خالید و عەمر پاش موسڵمان بوونیان سەرکردەی هەندێ لەو پۆلە سەربازیانەیان گرتە ئەستۆ، ئەو جموجۆڵە سەربازیانەش بە گشتی ڕاهێنانێکی زیندووی چاك بوو لە ژیانی خودی خۆشەویستمان موحەممەد ﷺ، بەڵکو دەکرێت وەکو خولی سەربازی بۆ سەرکردەکان کە توانییان دواتر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی فەتح بکەن.

## باسی پێنجەم: بەردەوامی بونیاتنانی پەروەردەی و زانستی.

سەرەتای سورەتی بەقەرە یەکێك لەو ئایەتانەی لە سەرەتای سەردەمی مەدینەدا دابەزین و، باسی سیفەتەکانی باوەڕدار و بێباوەڕ و دوو ڕووەکان دەکات، ئینجا ئاماژەیەکی تێدایە بۆ جوولەکە و گاورەکان و، جەخت کردن لەسەر دەرخستنی ڕاستی جوولەکە کە هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە بەرهەڵستی بانگەوازی ئیسلامیان کرد لە مەدینە، سورەتی بەقەرە بە دوور و درێژی باسی لە سیفەتەکانی جوولەکە کردووە.[1]

ئەوەش پێویستە تێبینی بکرێت کە سورەتی بەقەرە لە سەرەتای دابەزینی قورئان بوو لە مەدینە و بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ وەرگرتنی ئاینی خودا و پەرستنی، وەکو دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ۝٢١ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ (البقرة: ٢١-٢٢).

ئایەتەکانی سەردەمی مەدەنی هوشیاری دەدایە موسڵمانان کە سیفەتی دوو ڕووەکان وەربگرن، مەترسی مونافیقەکانیشی دەخستە ڕوو لەسەر دەوڵەتی تازە، بزوتنەوەی نیفاق لە سەردەمی مەدینەدا دەستی پێکرد چونکە ((موسڵمانان لە مەککە ئەوەندە هێزیان نەبوو کەس لێیان بترسێت، یان بە تەمای شتێك بێت لێیان، تاکو خۆیانیان لێ نزیك بکەنەوە، یان پیلانیان بۆ بگێڕن، ئینجا ئایەتەکان سیما و هەواڵ و هەڵوێستی مونافیقەکانی باسکردووە و، کەم سورەتی مەدەنیش هەیە باسێکی لەو جۆرەی تیا نەبێت، بە تایبەتی سورەتە درێژ و مامناوەندییەکان، ئەوەش وا دەگەیەنێت کە ئەو بزووتنەوەیە بوونی هەبووە بە درێژایی سەردەمی مەدەنی، ئەگەرچی دوای نیوەی یەکەم لاواز دەبوو)).[2]

---

١ ـ بڕوانە: الظلال (١/٢٧).

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية، دَروَزَة (٢/٧٣-٧٦) نقلا عن دراسات في عهد النبوة، د. عبدالرحمان الشجاع (١٧٢).

قورئانی مەدەنی هەر بەردەوامیش بوو لە باسکردنی مەزنی خوا و ڕاستی گەردوون و هاندان بۆ بەهەشت و ترساندن لە دۆزەخ و شەریعەت و حوکم دانان بۆ پەروەردەکردنی ئومەت و، بەهێزکردنی کۆڵەکەکانی دەوڵەت کە هەڵدەستێت بە بڵاوکردنەوەی بانگەواز لە نێوان خەڵکیدا و جیهاد دەکات لە پێناو خوادا.

کاروانی زانستی موسڵمانانیش پەرەی دەسەند لەگەڵ پەرەسەندنی قۆناغەکانی بانگەواز و بونیاتنانی کۆمەڵگا و دامەزراندنی دەوڵەت، قورئانی پیرۆزیش ستایشی زانست و زانست پەروەرانی کردووە و بە هەمان شێوە فەرموودەیش هاتووە لە پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە، کتێبەکانی فەرموودەیش چەندین بابەتی دەربارەی زانست تیادایە.

موسڵمانان لەوە دڵنیا بوون کە زانست یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی دەسەڵات، چونکە مەحاڵە خوای گەورە دەسەڵات بداتە نەتەوەکی نەفام، دواکەوتوو لە کاروانی زانست، ئەو کەسەیش ورد بێتەوە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا ئەوەی بۆ دەردەکەوێت، قورئانی پیرۆز زانستی کردووە بە دژی کوفر،[1] وەکو فەرموویەتی: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ (الزمر: ٩).

تاکە شتێکیش خوای گەورە فەرمانی کردووە، داوای زیادەی لێ بکرێت زانستە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴾ (طه: ١١٤)، هەروەها یەکەمین خاسیەت خوای گەورە ئادەمی پێ جیاکردەوە زانست بوو، وەکو دەفەرمووێت: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ (البقرة: ٣١).

پێغەمبەرﷺ هەر بەردەوام بوو لە ڕێبازی پەروەردەیی بۆ فێرکردنی هاوەڵانی و خوا بەیادهێنانەوەیان و هاندانیان بۆ ڕەوشتی جوان و شیرین، هەروەها وردەکاری

---

١ـ التمكين للامة الاسلامية (٦٢).

شەریعەتی بۆ ڕوون کردنەوە، ئاراستەکردنیشی بۆ هاوەڵانی جاری وابوو بە شێوەی تاك بوو یان بە کۆمەڵ، خۆشەویستمان سەروەتێکی زۆری بۆ بەجێ هێشتووین لە هۆکاری پەروەردەیی لە فێرکردن و وانە وتنەوەدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕەچاوی هۆکاری پەروەردەیی دەکرد کە یارمەتیدەر بێت بۆ لەبەرکردن و وەرگرتن، یان ببێتە مایەی جێگیربوونی واتا لە دڵ و دەروندا، یەکێ لەو هۆکارانەش لە سەردەمی مەککە و مەدینەشدا ئەمانە بوون:[1]

**یەکەم: گرنترین هۆکار و بنەما پەروەردەییەکان.**

**١ـ دووبارەکردنەوەی قسە :**

ئەوە ئاسانترە بۆ لەبەر کردن و یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتنی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ سووربوو لەسەر دووبارە کردنەوەی قسەکانی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێبێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر قسەی بکردایە سێ جار دووبارەی دەکردەوە تاکو لێی تێبگەن ...[2]

**٢ـ لەسەرخۆ قسەکردن و، جیاکردنەوەی وشەکان:**

پێغەمبەرﷺ لەسەرخۆ قسەی دەکرد و پەلەی نەدەکرد لە قسەکردندا، بەڵکو وشەیەکی لە وشەیەکی تر جیادەکردەوە بۆ ئەوەی لەبەرکردنی ئاسان بێت و ، نەگۆڕدرێت لەکاتی گواستنەوەیدا، ئەوەندەیش ئاسانی دەکردەوە تاکو ئەگەر گوێگر بیویستبا قسەکانی بژماردایە دەیژمارد،[3] عورووەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە لە عائیشە ڕەزای خوایان لێبێت، کە فەرموویەتی: ئایە سەیرت نایەت لە باوکی فلان (ئەبو هورەیرە)؟ هاتووە لە نزیك ژوورەکەمدا دانیشتووە فەرموودە لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە، دەیدا بەگوێمدا، منیش نوێژم دەکرد، ئینجا ڕۆیشت پێش ئەوەی نوێژەکەم تەواو بکەم، ئەگەر فریای بکەوتایەم بەرپەرچم دەدایەوە، پێغەمبەرﷺ بەو شێوەیە قسەی نەدەکرد کە ئێوە دەیکەن.[4]

---

١ـ بڕوانە: مناهج واداب الصحابة في التعلم والتعليم، د. البر (٥٩-٦٠).

٢ـ البخاري: كتاب العلم، باب من أي والحديث ثلاثا...... ورقمه (٩٥).

٣ ـ بڕوانە: مناهج واداب الصحابة، د. عبدالرحمان البر (٦٢).

٤ـ البخاري: كتاب المناقب، باب صفة النبي (ﷺ) رقم (٣٥٦٨).

**٣ـ میانەڕەوی و بێزارنەکردن و هەڵبژاردنی کاتی گونجاو:**

پێغەمبەرﷺ میانەڕە و (واتا نەدرێژەی دەدایە و نە کورتی دەکردەوە) بوو لە فێرکردن و بڕی ئەو بابەتەی دەیوتەوە، لە جۆر و کات بۆ ئەوەی هاوەڵان بێزار نەبن و چالاك بن بۆ لەبەرکردن، تێگەیشتنیشی ئاسان بێت لەسەریان، لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: کان النبيﷺ يتخولنا بالموعظة في الايام كراهة السامة علينا.

**٤ـ بەکارهێنانی پەند و نموونە:**

پەند کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە گەیاندنی واتا بە عەقڵ و دڵ، چونکە شتی واتایی بە شێوەیەکی هەستپێکراو باس دەکات، جگە لەوەی کە جۆرێکیشە لە ڕەوانبێژی سەرنج ڕاکێش، بە تایبەتی سەرنجی قسەزانەکان، بۆیە قورئان زۆرجار پەند و نموونە دەهێنێتەوە، هۆکاری ئەو کارەشی باس کردووە و، دەفەرمووێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر: ٢١).

لەسەر هەمان ڕێبازیش پێغەمبەرﷺ بەردەوام بوو، بە زۆری پەندی بەکاردەهێنا، عەبدوڵای کوڕی عومەرﷺ دەفەرمووێت: (هەزار پەند لە پێغەمبەرﷺ فێر بووم).[١]

چەندین کتێبیش دانراوە لەبارەی پەندەکانی پێغەمبەرﷺ، کۆنترینیان بەناوی (امثال الحديث)ی ڕامهورمزییە (ت ٣٦٠).

**٥ـ پرسیارکردن:**

پرسیارکردن یەکێکە لە هۆکارە پەروەردەییە گرنگەکان لە گرێدانی بەهێز لە نێوان پرسکەر و پرسیارلێکراودا، و کردنەوەی زەین و سەرنج ڕاکێشانی بۆ وەڵامدانەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺ پرسیاری بەکاردەهێنا لە چەندین شێوازدا، بۆ فێرکردنی هاوەڵان، ئەوەیش کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە چاك حاڵی بوونی هاوەڵاندا، جاری وابوو پێغەمبەرﷺ پرسیاری دەکرد تەنها لەبەر سەرنج ڕاکێشان و

١ـ بڕوانە: مناهج واداب الصحابة (٦٥).

وروژاندن، لەو کاتەیشدا پرسیارەکە لە شێوەی ئاگادارکردنەوەدا دێت (الا) — ئایا — زۆرجار، لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتووە، کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((الا ادلّكم على ما يمحو الله به الخطايا، ويرفع به الدرجات؟ قالوا: بلى يا رسول اله! قال: اسباغ الوضوء على المكاره وكثرة الخطا الى المساجد، وانتظار الصلاة بعد الصلاة، فذلكم الرباط)).[1]

واتە: ئایا ئەوەتان پیشان بدەم کە خوای گەورە تاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە و پلە و پایەکانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ هاوەڵانیش وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا: پێغەمبەریشﷺ فەرمووی دەست نوێژگرتن لە کاتی ناخۆشیدا و زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوتەکان و چاوەڕوانکردنی نوێژ لە دوای نوێژ، چونکە ئەوە ڕیباتە لەپێناو خوادا.

جاری واشبوو پێغەمبەرﷺ پرسیارێکی لێ دەکردن و دەیزانی ئەوان وەڵامەکەی نازانن و دەگەڕێنەوە لای خوا و پێغەمبەرەکەی، مەبەستیشی سەرنج ڕاکێشانیان بوو بۆ مەسەلەکە،[2] لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

((أتدرون من المفلس)) واتە: ئایا دەزانن کێ موفلیسە؟ وتیان: موفلیس ئەو کەسەیە کە ماڵ و شتومەکی نەبێت لە ناو ئێمەدا، بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرموودەیەکی ئاراستەکرد کە ئەمە واتاکەیەتی:

فەرمووی: موفلیس لە ئومەتی من ئەو کەسەیە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت، بە نوێژ و ڕۆژوو و زەکاتەوە، بەڵام جنێوی بە ئەم داوە و بوختانی بە ئەودا کردووە، ماڵی ئەوی خواردووە و خوێنی ئەوی ڕشتووە و لە ئەوی داوە، ئیتر لە چاکەکانی دەدرێت بە ئەو کەسانە، کە چاکەکانی تەواو بوو بەر لەوەی مافەکانی لێ وەربگیرێتەوە لە گوناهەکانی ئەوان دەخرێتە سەر ئەو کەسە ئینجا دەخرێتە دۆزەخەوە.[3]

---

١ـ مسلم: كتاب الطهارة، باب فضل اسباغ الوضوء، ورقمه (٤١ — ٢٥١).

٢ ـ بڕوانە: مناهج واداب الصحابة (٦٧).

٣ـ مسلم: كتاب البر والصلة، باب تحريم الظلم، ورقمه (٥٨١).

جاری واشبوو پرسیاری دەکرد و یەکێك لە هاوەڵان وەڵامی باشی دەدایەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ ستایشی ئەو کەسەی دەکرد وەکو هاندانێك بۆ خۆی، و ئەوانی تر، وەکو ئەوەی کردی لەگەڵ ئوبەی کوڕی کەعبدا (ڕەزای خوای لێ بێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((يا أبا منذر أتدري أي اية من كتاب الله أعظم؟)) واتە: ئەی باوکی مونزیر ئایا دەزانیت کام ئایەتی کتابی خوا مەزنترە؟ دەفەرمووێت وتم: خواو پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەی باوکی مونزیر ئایا دەزانیت کام ئایەتی کتابی خوا مەزنترە؟ دەفەرمووێت، وتم: ﴿الله لا اله الا هو الحي القيوم﴾، ئینجا پێغەمبەرﷺ لەسەر سنگی ئوبەی دا و فەرمووی: پیرۆزت بێت ئەو زانستە ئەی ئەبو مونزیر.[1]

ئەم بە چاك زانین و هاندانە ڕێگە هەموار دەکات لە لایەن ئەو کەسەی فێر دەبێت هەست بکات دڵنیایی و متمانە بەخۆبوون وای لێ دەکات زیاتر هەوڵی لەبەرکردن و زانست بەدەست هێنان بدات.[2]

**٦ـ خستنەڕووی واتای سەیر بۆ سەرنج ڕاکێشان و گرینگی دان:**

یەکێك لە جوانترین ئەو شێوازانەش ئەوەیە کە جابری کوڕی عەبدوڵلا ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ بە لای بازاڕێکدا تێپەڕی و، خەڵکی بە تەنیشتیەوە بوون، گیسکێکی کەڕەی مردارەوە بووی بینی، پێغەمبەر ﷺ هەڵیگرت و فەرمووی: کامتان حەز دەکەن ئەمە هی ئێوە بێت بەیەك درهەم؟ وتیان: بەهیچ بەرانبەرێك حەز ناکەین بۆ ئێمە بێت، چی پێبکەین؟ فەرمووی: ((فو الله للدنيا اهوان على الله من هذا عليكم))[3] واتە: سوێند بە خوا ئەم دونیا لای خوا بێ بایەخترە لەو ئاژەڵە لەلای ئێوە.

---

١ ـ مسلم: كتاب صلاة المسافرين وقصرها، باب فضل سورة الكهف، واية الكهف والكرسي، ورقمه (٨١٠).

٢ ـ بڕوانە: مناهج واداب الصحابة (٦٩).

٣ ـ مسلم: كتاب الزهد و الرقائق، ورقم (٢٩٥٧).

**٧- بەکارهێنانی هۆکاری ڕوونکردنەوە:**

پێغەمبەر ﷺ هەڵدەسا بە بەکارهێنانی ئەوەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت هۆکاری ڕوونکردنەوە بۆ دوپاتکردنەوەی واتاکان لە دڵ و مێشکی گوێگراندا و سەرنج ڕاکێشانیان بۆ لای باسەکە، لەو هۆکارانە:

- دەربڕین بە جوڵەی دەست: وەکو ئەوەی پەنجەی دەکرد بەناو یەکدا بۆ ڕوونکرنەوەی پەیوەندی نێوان ئیماندار و براکەی، لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێبێت، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((المؤمن للمؤمن کالبنیان یشد بعضه بعضاً))[١] واتە: ئیماندار بۆ ئیماندار وەکو بونیاتە هەندێکیان هەندێکی تریان ڕادەکێشن.

- دەربڕین بە وێنە کێشان: پێغەمبەرﷺ چەند هێڵێکی لەسەر زەوی ڕادەکێشا بۆ سەرنج ڕاکێشانی هاوەڵان، ئینجا دەستی دەکردە ڕوونکردنەوەی وشەکانی ئەو هێڵانە و مەبەستی لێیان، لە عەبدەڵڵای کوڕی مەسعودەوە، ڕەزای خوای لێبێت، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هێڵێکی ڕاکێشا، ئینجا فەرمووی: ((هذا سبیل الله)) واتە: ئەمە ڕێگای خوایە، ئینجا چەند هێڵێکی بەلای ڕاستیدا ڕاکێشا، هەروەها بەلای چەپیدا، ئینجا فەرمووی: ئەمانە ڕێچکەن- یەزید دەڵێت پەرتەوازەن- لەسەر هەموو ڕێچکەیەك شەیتانێك ڕاوەستاوە بانگەوازی بۆ دەکات، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[٢] (انعام:١٥٣).

- دەربڕین بە بەرز کردنەوە و خستنە ڕووی ئەو شتەی باس دەکرێت: پێغەمبەرﷺ کاتێك باسی حوکمی لەبەرکردنی ئاوریشم و ئاڵتونی دەکرد - وەکو لە فەرموودەیەکی عەلیدا هاتووە ڕەزای خوای لێبێت کە دەیفەرموو - پێغەمبەر ﷺ

---

١ـ البخاري: کتاب المظالم، باب نصر المظلوم، رقم(٢٤٤٦).

٢ـ مسند الامام احمد (٤٣٥/١)و رقمه في ط/ الرسالة (٤١٤٢) (ح/٢٠٧،٢٠٨) و قال محققوه: اسناده حسن،...و اخرجه الحاکم (٣١٨/٢)و قال الحاکم: هذا حدیث صحیح الاسناده.

ئاوریشمێکی هەڵگرت بە دەستی ڕاستی و ئاڵتونێکی هەڵگرت بە دەستی چەپی و فەرمووی: (( انا هذين حرام على ذكور امتي))[١] واتە: ئەم دووانە قەدەغەن لەسەر نێرینەکانی ئوممەتی من، لە ڕیوایەتی نەسائیشدا هاتووە: ((احل الذهب و الحرير لاناث امتي، و حرم على ذكورها))[٢] واتە: ئاڵتون و ئاوریشم ڕەوایە بۆ مێینەکانی ئوممەتم و قەدەغەیە لەسەر نێرینەکانیان، کەواتە پێغەمبەر ﷺ کۆی کردەوە لە نێوان و قسە کردن و بەرزکردن ئاڵتون و ئاوریشمەکە بۆی بە تەواوی سەرنجیان ڕابکێشێ، بۆ ئەوەی مەسەلەکە ڕونتر بێتەوە و ئاسانتر بێت بۆ لەبەر کردن.

– فێرکردنی کردەیی بە ئەنجامدانی کارەکە لە پێش چاوی خەڵکیدا: وەکو ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ ئەنجامی دا کاتێك سەرکەوتە سەر مینبەرەکە و نوێژی کردو هەموو موسڵمانان بینیان، لە سەهلی ساعیدییەوە ڕەزای خوای لێبێت، فەرموویەتی: پێغەمبەرم بینی ﷺ لەسەر مینبەرەکە نوێژی کرد و (الله اكبر)ی کردو هەر لەسەر مینبەرەکە بوو، دوایی کڕنووشی برد و، ئینجا دابەزی و هاتە خوارەوە لە بن مینبەرەکەدا سوجدەی برد و جارێکی تر گەڕایەوە، کاتێك لێبوویەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بۆ ئەوە وام کرد وەکو من بکەن و فێری نوێژەکەم بن.[٣]

**٨- بەکارهێنانی وشەی جوان و ناسك:**

بەکارهێنانی گوتاری جوان دڵەکان یەکدەخات و ڕادەکێشێت بۆ لای ڕاستی و، پاڵ دەنێ بە موسڵمانانەوە تێبگەن و لەبەر بکەن، پێغەمبەرﷺ پێشەکی بەکاردەهێنا بۆ قسەکانی، بەتایبەتی ئەگەر لە باسکردنی مەسەلەیەکدا بوایە شەرمی لێبکرایە، وەکو ئەوەی کردی لە کاتی فێرکردنیان بۆ مەسەلەی چوونە سەرئاو، پێشەکییەکی لەو بارەوە بەکارهێنا بەوەی کە فەرمووی: ((انما انا لكم بمنزلة الوالد اعلكم، فاذا اتى احدكم الغائط، فلا يستقبل القبلة، و لا يستديرها، ولا

---

١ـ ابو داود، كتاب اللباس، باب في الحرير للنساء رقم (٤٠٥٧) و صححه الالباني في صحيح سنن ابي داود.

٢ ـ صحيح سنن النسائي، الالباني، و رقمه (٥١٦٣) و صححه.

٣ـ البخاري: كتاب الجمعة، باب الخطبة على المنبر (٩١٧).

یستطب بیمنیە))[1] واتە: من لە جێگەی باوکم بۆ ئێوە فێرتان دەکەم، ئەگەر کەسێکتان چووە سەر ئاو با ڕوو نەکاتە قیبلە و پشتی تێنەکات، بە دەستی ڕاستیشی خۆی پاك نەکاتەوە. مامۆستای یەکەم ﷺ کۆمەڵێ بنەمای پەروەردەیی ڕەچاو کرد لە ئەوپەڕی بەرزی ڕەوشتی و بیروهۆشدا بوون، بە شێوەیەك کە لە دڵی هاوەڵاندا جێگیر دەبوو، ئەمەیش هەندێکە لەو بنەما بەرزانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەکاریدەهێنا:

**- هاندانی چاکە کار و ستایش کردنی:**

بۆ ئەوەی چاکتر بێت و زیاتر بەرەو زانست بێت، وەکو ئەوەی لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری کردی ڕەزای خوای لێبێت لە کاتێك وەسفی دەنگ خۆشی ئەوی کرد لە قورئان خوێندندا، ئەبو موسا ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووە: ((لو رایتني و انا استمع لقراءتك البارحة، لقد اوتیت مزماراً من مزامیر آل داود))[2] واتە: خۆزگە دەتبینیم دوێنێ گوێم لە قورئان خوێندنەکەت دەگرت، دەتوت بە گەرووی داود دەیخوێنی.

**- بەسۆز بوونی لەگەڵ ئەو کەسەی هەڵە دەکات و توند نەبوون لەگەڵیدا:**

پێغەمبەری خواﷺ بارودۆخی خەڵکی تەماشا دەکرد و پاساوی دەهێنایەوە بۆ نەزانینیان و بە نەرم و نیانی هەڵەکانی بۆ چاك دەکردنەوە و، ڕاستەکانی فێر دەکردن، بێگومان ئەوەش دڵی ئەو کەسەی پڕ دەکرد لە خۆشەویستی پەیامی ئیسلام، هەروەها دڵی ئەو کەسانەیش کە ئامادەی ئەو ڕوداوە دەبن ئامادە دەکات بۆ لەبەرکردنی،[3] موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی دەگێڕێتەوە ڕەزای خوای لێبێت و دەفەرمووێت: لە کاتێکدا نوێژم دەکرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پیاوێك پژمی، منیش وتم: ((یرحمك الله)) خەڵکەکەیش هەموویان تەماشایان کردم، وتم: ئەی

---

١ـ ابو داود، کتاب، باب کراهیة استقبال القبلة عند قضاء الحاجة (٣/١، رقم ٨) و حسنه الالباني في صحیح سنن ابي داود.

٢ ـ مسلم: کتاب صلاة المسافرین، باب استحباب تحسین الصوت بالقران و رقمه (٢٣٦-(٧٩٣)).

٣ـ بڕوانە: مناهج و اداب الصحابة (٨٦).

لەباری دایکم بچوایەم، بۆ ئاوها تەماشام دەکەن؟ ئەوانیش بە دەستیان دەیاندایە سەر ڕانی خۆیاندا، کە بینینم دەیانەوێت بێ دەنگم بکەن بێ دەنگ بووم، جا کاتێك پێغەمبەر- دایك و باوکم بە قوربانی بێت- نوێژەکەی تەواو کرد، مامۆستای وەکو ئەوم نەبینیوە نە لەپێش ئەو نە لەدوای ئەو، شێوازی فێرکردنی لە ئەو جوانتر بێت، سوێند بە خوا هیچ قسەیەکی زبری پێم نەوت، نە لێی دام و نە قسەیەکی پێکردم، فەرمووی: ((ان هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الناس، انما هو التسبيح و التكبير و قراءة القران))[1] واتە: ئەمە نوێژە و ناکرێت قسەی تیا بێت لەو شێوازەی خەڵکی دەیکەن، بەڵکو هەمووی (سبحان الله) و (الله اكبر) و قورئان خوێندنە.

جا تەماشاکە- ڕەحمەتی خوات لێبێت- چەند پێغەمبەری خوا ﷺ نەرم و نیان بووە لە فێرکردندا، ئینجا تەماشاکە ئەو شێوازە جوانە چ شوێنەوارێکی بەجێهێشتووە لە دڵی موعاویەدا.

**- بە ڕاشکاوی زەم نەکردن بەڵکو تەنها بەکارهێنانی ئاماژە:**

چونکە ئەوە جۆرێکە لە چاودێری کردنی هەستی ئەو کەسەی هەڵە دەکات، کاتێك پێغەمبەرﷺ عەبدوڵڵای کوڕی لە تەبیبیەی بەکارهێنا ڕەزای خوای لێ بێت لەسەر کۆکردنەوەی زەکاتی بەنی سولەیم، دیاری وەردەگرت لە ئەوانەی زەکاتیان دەردەکرد، ئەبو حومەیدی ساعیدی ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەکارهێنا بۆ کۆکردنەوەی زەکات لە بەنی سولەیم ئیبنو لەتەللوتبییەی پێ دەوترا، کاتێك گەڕایەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ کرد، وتی: ئەوەماڵی ئێوەیە و ئەو دیارییە بۆ خۆم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئایا ئەگەر لە ماڵی باوکت و دایکتدا دابنیشتبایت ئەم دیاریەت با بۆ بهاتبا گەر ڕاست دەکەیت، دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ وتاری خوێند و ستایشی خوای گەورەی کرد و هەندێ شتی بۆ ڕوون کردنەوە، ئەمە واتاکەیەتی: (( هەر کەسێك لە ئێوە بەکاردەهێنم لەسەر کارێك لەوانەی خوای گەورە پێی سپاردوم،ئەوکەسەیش دێت و

---

[1] ـ مسلم: كتاب المساجد، باب تحريم الكلام في الصلاة، و رقمه (٥٣٧).

دەڵێت: ئەوە ماڵی ئێوەیە و، ئەوەش دیارییە بۆ خۆم، ئەی بۆ لە ماڵی دایك و باوکیدا دانانیشێ بەڵکو دیاری بۆ بێت، سوێند بە خوا کەسێك لە ئێوە شتێك بەبێ مافی خۆی وەربگرێت، خوای گەورە دەربارەی ئەوە لێی دەپرسێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، جا با کەستان لەوانە نەبن دەچنە لای خوای شتێکیان لەو جۆرە کردبێت، پاشان دەستی بەرز کردەوە تاکو سپێتی ژێر باڵی بینرا، دەیفەرموو: ((اللهم هل بلغت)) واتە: خوایە، ئایا ڕام گەیاند.[1]

**- توڕە بوون و سەرزەنشت کردن هەرکاتێك پێویست بکات:**

وەکو ئەوەی هەڵەیەکی شەرعی لە کەسانێکەوە دەردەکەوێت کە بارێکی تایبەتیان هەیە، یان ئەو هەڵە لە بازنەی تاکە کەسێك دا نەبێت و ببێتە مایەی ئاژاوەیەك، ئەو توڕەبونەیش شێوازێکی ئاڕاستە کردنەوە وەربگرێت، بێ زیادە ڕەوی، بەڵکو بەپێی پێویست، بۆ نموونە توڕە بوونی پێغەمبەرﷺ لە عومەر ڕەزای خوای لێ بێت کاتێك بینی تەوراتێکی بە دەستەوەیە بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە، جابرﷺ دەفەرمووێت: عومەری کوڕی خەتتاب نوسخەیەکی لە تەورات هێنایە لای پێغەمبەرﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە نوسخەیەکە لە تەورات، پێغەمبەرﷺ بێ دەنگ بوو، عومەریش دەستی کرد بە خوێندنەوەی و ڕەنگی پێغەمبەرﷺ دەگۆڕا، ئیتر ئەبوبەکر فەرمووی: لەباری دایکت بچوایەیت عومەر، نابینی ڕومەتی پێغەمبەرﷺ چۆن دەگۆڕێ؟ ئیتر عومەر تەماشای ڕومەتی پێغەمبەرﷺی کرد و وتی: پەنا دەگرمە خوا لە توڕە بوونی خوا و پێغەمبەری خوا، ڕازی بووین بە خوایەتی خوا و ئایینی ئیسلام وەکو ئایینمان و موحەممەدیش وەکو پێغەمبەرمان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (( و الذي نفس محمد بيده لو بدا لكم موسى فابتعتموه و تركتموني لضللتم عن سواء السبيل، لو كان حياً و ادرك نبوتي لا تبعني)).[2] واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئەگەر موسا

---

١ـ البخاري، كتاب الحيل، باب احتيال العامل ليهدى له، و رقمه(٦٩٧٩).

٢ـ مجمع الزوائد: (١/١٧٣،١٧٤)، له شواهد كثيرة تقوى الحديث، روى الحديث ائمة منهم: احمد(٣/٣٨٧) و مواضع اخرى، و اورده الشيخ الالباني في(ارواء الخليل– ج٦/٣٤) و اورد تقوية العلماء له، ثم قال: ((لكن الحديث قوى فان له شواهد كثيرة)) و ذكرها فانظرها عنده.

دەركەوێت و شوێنی بكەون و من بەجیٚ بهێڵن گومڕا دەبن لە ڕێگای ڕاست، ئەگەر موسای خۆیشی لە ژیاندا بوایە و فریای من بكەوتایە شوێنم دەكەوت.

هەروەها توڕەبوونی پێغەمبەر ﷺ لە هەندێك لە هاوەڵانی كە پێش نوێژییان دەكرد و نوێژیان بە خەڵكی درێژ دەكردەوە، كە ئەوەیش ناڕەحەت بوو بۆ ئەوانەی لاواز و نەخۆش و سەرقاڵ بوون، ئەبو مەسعودی ئەنصاری ڕەزای خوای لیٚ بێت دەگێڕێتەوە، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فلانە كەس نوێژ زۆر درێژ دەكاتەوە، دەڵێت: پێغەمبەرمﷺ نەدیبوو پێشتر لە ئامۆژگاریكردندا بەو شێوە توڕە بێت و فەرمووی: ((ایها الناس انكم منفرون فمن صلی بالناس فلیخفف، فان فیهم المریض و الضعیف و ذا الحاجة)).[1] واتە: خەڵكینە، ئێوە خەڵكی دەڕەوێننەوە، هەركیٚ لە ئێوە پێش نوێژی كرد بۆ موسڵمانان با نوێژێكی كورتیان بۆ بكات، چونكە لە ئەواندا هەیە نەخۆشە، یان لاوازە، یان كاری هەیە.

هەروەها توڕەبوونی لە كاتی مشت و مڕی هاوەڵان دەربارەی قەدەر، عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص ڕەزای خوای لیٚ بێت، دەفەرمووێت: پێغەمبەرﷺ دەرچوو بۆ لای هاوەڵانی لەكاتێكدا ئەوان خەریكی مشت و مڕ بوون دەربارەی قەدەر، دەتوت دەنكە هەنارە دەتەقێنێتە ڕوومەتی ئەوەندە توڕەبوو، فەرمووی: ((بهذا أمرتم؟ او لهذا خلقتم؟ تضربون القران بعضه ببعض؟ بهذا هلكت الامم قبلكم)).[2]

واتە: ئایا بەمە فەرمانتان پێكراوە؟ یان بۆ ئەوە دروستكراون؟ هەندیٚ لە قورئان بە ئەو دوایدا دەدەن؟ بەم شێوە نەتەوەكانی پێش ئێوە لەناوچوون.

نمونەیەكی تر لە توڕەبوونی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە كە عائیشە ڕەزای خوای لیٚ بێت دەیگێڕێتەوە، دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرمانێكی بكردایە بۆ ئەنجامدانی كارێك، فەرمانی دەكرد لە توانایاندا بوایە، ئەیانوت: ئێمە وەكو تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گوناهی ڕابردووت و داهاتوتی لابردووە، ئیتر

---

[1] ـ البخاري، كتاب العلم، باب الغضب في الموعظة و التعليم... رقم(٩٠).

[2] ـ ابن ماجه، كتاب المقدمة، باب في القدر، رقم (٨٥)، و قال البوصيري في الزوائد: هذا اسناد صحيح، رجاله ثقات، و صححه الالباني في صحيح سنن ابن ماجه، و رقمه (٦٩–٨٤).

پێغەمبەرﷺ[١] تورە دەبوو تاکو لە ڕومەتیدا دەردەکەوت و دەیفەرموو: (( ان اتقاکم واعلمکم باالله انـا)) تـورە بـوونی پێغەمبـەرﷺ لـەو جێگایانـەدا بـۆ فێرکـردن و ئاراستەکردن بوو، بۆ ئەوەی هاوەڵان وریا ببنەوە و نەکەونـە نێـو هەڵـەوە، چـونکە ((ئامۆژگاریکـار دەکرێـت لـە شـێوەی تـوڕەدا دەرکـەوێت، چـونکە جێگاکـەی وا پێویست دەکات خەڵکی وریا بکاتەوە، هەروەها مامۆسـتایش، ئەگـەر هەسـتی کـرد ئەو کەسەی فێر دەبێت لای، باش حاڵی نابێـت بێـزاری دەربـڕینی مامۆسـتا چـاکتر دەبێت، ئەوەیش پێویست نییە لە هەموو حاڵەتێکدا، بەڵکو لە کەسـێك بـۆ کەسـێك دەگۆرێ)).[٢]

- **قۆستنەوەی هەندێك ڕووداو بۆ ڕونکردنەوە و فێرکردنی واتای گونجاو:**

هەندێ شت ڕویـدەدا لـە لای پێغەمبـەرﷺ، ئـەویش سـودی لێـوەردەگرت وەکـو هـەلێك بـۆ ڕونکردنـەوەی مەسـەلەیەك بـۆ هـاوەڵان، عومـەر ڕەزای خـوای لـێ بێـت دەگێڕێتەوە کە هەندێ دیلیان هێنا بۆ لای پێغەمبەرﷺ ئافرەتێکیان تێدا بـوو شـیر لە مەمکیدا زۆر بوو، بە پەلە ڕێی دەکـرد و، منـاڵێکی لـە نـاو دیلەکانـدا بـینی و لـە باوەشی گرت و شیری پێدا، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((اترون هذه طارحة ولدها في النار؟ قلنـا: لا، و هـي تقـدر علـى ان لا تطرحـه فقـال: ((لله ارحـم بعبـاده مـن هـذه بولدها)))).[٣]

واتە: پێتان وایە ئەو ئافرەتە مناڵەکەی خۆی فڕێداتە ئاگرەوە، وتیان: نەخێر بە ویستی خۆی هەرگیز کاری لەو جۆر ناکات، فەرمووی: خوای گەورە بە بەزەیی تـرە بە بەندەکانی لەو ئافرەتە بە مندالەکەی.

بەم شێوە پێغەمبەرﷺ ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ ئاشناکردنی خەڵکی بـە سـۆز و بەزەیی خوای گەورە بە ئەوان.[٤]

---

١ـ البخاري: كتاب الايمان، باب قول النبي(ﷺ) ((انا اعلمكم بالله)) رقم (٢٠).

٢ـ فتح الباري(١/١٨٧).

٣ـ البخاري: كتاب الادب (٥٩٩٩). هەر لە بوخاریدا بە هەندێ شێوازی تر هاتووە، ومسلم (٢٧٥٤).

٤ـ الرسول المعلم، عبدالفتاح ابو غدة (١٦٠) ئەم باسەم پوختە کردەوە لە (مناهج و اداب الصحابة في التعلم والتعليم) د. عبدالرحمن البر.

**دووەم: ئاکاری هاوەڵان لە کاتی گوێگرتنیان لە پێغەمبەرﷺ.**

هاوەڵان بە پەرۆش بوون بۆ پەیوەست بوون بە هەندێ ڕەوشتی جوان و بنەمای گرینگ، کە کاریگەری زۆری هەبوو لە چاکی لەبەر کردن و فێربوون و گەیاندنی ئایینی خوا، لەوانە:

**١- بێدەنگی تەواو و چاك گوێگرتن:**

پێغەمبەرﷺ لەوە مەزنترە لە دڵی هاوەڵانیدا کە دەنگیان بێت لە کۆڕەکەیدا، یان سەرقاڵی شتێکی تر بن، یان دەنگیان بەرز بکەنەوە، بەڵکو بە تەواوی گوێیان دەگرت و خۆیان ساز دەدا بۆ سود وەرگرتن، عەلی ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ... ئەگەر قسەی بکردبا هاودەمانی وەکو مەلیان لەسەر سەر نیشتبێتەوە وابوون، کە بێدەنگ دەبوو قسەیان دەکرد.....[1]

مامۆستا عەبدولفەتتاح ابو غدە ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێت: بنچینەی لە ئەوەوە هاتووە کە قەلەڕەشیش جاری وا هەیە لەسەر وشتر دەنیشێتەوە، گەنە لە سەری وشترەکە هەڵدەچنێت و دەیخوات، ئیتر وشترەکەش ناجولێتەوە بۆ ئەوەی قەلەڕەشەکە هەڵنەفڕێت و ئەو گەنەیە ئازاری نەدات، قسەکە لە ئەوەوە پەیدا بووە..[2]

**٢- وازهێنان لە ناکۆکی و قسە پێنەبڕینی تا تەواو دەبێت:**

ئەوەیش ئەو پەڕی ڕەوشت جوانییە، کە دەبێتە مایەی پێخۆشبوونی هەموو دانیشتوان وە یارمەتیدەرە بۆ ئاسان تێگەیشتن و فێربوون، لەهەمان فەرموودەکەی عەلی هاتووە،.. مشتومڕیان نەدەکرد لەبەردەمیدا، کەسێکیش قسەی بکردایە گوێیان لێ دەگرت تا قسەکەی تەواو دەکرد....[3] کەواتە ئەو کۆڕە

١ـ الترمذي في الشمائل المحمدية، باب ما جاء في خلف رسول الله، رقم(٣٣٥)، و انظر تحقيق و تعليق أ. سميع عباس على مختصره للشمائل الذي سماه، اوصاف النبي (ﷺ) عند الاحاديث (٧،٢٢٦،٢٤٥)، و انظر حديث هند ابي هالة، و الاجنار التي تشهد له بالصحة في دلائل النبوة للبيهقي، تحقيق د. عبدالمعطي قلعجي(ج١/٢٨٥-٣٣٢).

٢ـ بروانە: الرسول المعلم و اساليبه في التعليم(٣٠).

٣ـ الترمذي في الشمائل المحمدية، باب ماجاء في خلق رسول الله، رقم (٣٣٥) وانظر (هـ٢-ص٤٦٧).

هیچ مشت و مڕو دەنگ بەرزکردنەوەی تیادا نەبووە بەڵکو لە ئەوپەڕی شکۆمەندیدا بووە.

**٣- گەڕانەوەیان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەو شتانەی لێیان گیر دەبوو:**

سەرەڕای ڕێزی زۆریان بۆ پێغەمبەر ﷺ و بە مەزن سەیرکردنیان بۆی، بۆ هەموو شتێك پێویستی بە ڕونکردنەوە بوایە دەگەڕانەوە لای، حەفصە ڕەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((انی لارجوا الاّیدخل النار احد ان شاء الله ممن شهد بدراً و الحدیبیة))، واتە: ئومێدم هەیە لای خوای گەورە کەسێك نەچێتە ئاگرەوە لەوانەی ئامادەی بەدر و حودەیبییە بوونە. دەفەرمووێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا خوا نەیفەرمووە: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ (مریم: ٧١)، فەرمووی: ئایا خوای گەورە نەشیفەرمووە: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ (مریم:٧٢).

هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵڵا، لە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوای گەورە بەندەکان یان خەڵکی حەشر دەکات بە خەتەنە نەکراوی و هیچ شتێکیان پێ نیە، ئینجا بە دەنگێك بانگیان دەکات دوور و نزیك وەکو یەك گوێیان لێ دەبێت. دەفەرمووێت: من پاشام، من خاوەن ئایینم، کەس لە خەڵکی بەهەشت نابێ بچنە بەهەشت و، خەڵکی دۆزەخ بچنە دۆزەخ، تاکو هەر کەسێك ستەمی لێکرابێت مافی بۆ وەرنەگرمەوە، تەنانەت شەپازلەیش. وتیان: ئەوە چۆن دەبێت لە کاتێکدا ئێمە بە ڕووت و خەتەنە نەکراوی دەچینە لای خوا؟ فەرمووی: بە چاکە و خراپە. ئینجا فەرموودەی خوای گەورەی خوێندەوە: ﴿الْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ ۚ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ ۚ﴾ (غافر:١٧)[١] .

بەم شێوە هاوەڵان پرسیان دەکرد دەربارەی ئەو شتانەی کە نەیاندەزانی، وتووێژ و گەڕانەوەشیان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر تێگەیشتن و لەبەرکردنیان.

---

١ـ اخرجه الحاكم (٤٣٧/٢) وصححه ووافقه الذهبي.

**٤- ڕەوانەکردنی فەرموودە:**

هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت ئەگەر گوێیان لە شتێك بوایە لە پێغەمبەر ﷺ و زانستێکیان لێ وەربگرتایە، لەنێو خۆیاندا باسیان دەکرد و ڕەوانەیان دەکرد، ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرمووێت:(( کاتێك لای پێغەمبەرﷺ دەبووین وە گوێمان لە فەرموودەیەك بوایە لەنێو خۆماندا دووبارەمان دەکردەوە تاکو لەبەرمان دەکرد)).[١]

بنەمای ڕەوانەکردن هەر مایەوە لەنێوان هاوەڵاندا تاکو دوای لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەریشﷺ، ئەبو نوزرەی کوڕی مونزیری کوڕی مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت:(( هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە کۆدەبوونەوە، لە نێوان خۆیاندا باسی زانستیان دەکرد و سوڕەتێکیان دەخوێندەوە)).[٢]

**٥- پرسیارکردن بە مەبەستی زانست و کارکردن:**

پرسیارەکانی هاوەڵان بە مەبەستی زانست و کارکردن بوو، نەك بۆ کات بەسەربردن، چونکە ئەوەیان دەزانی کە پێغەمبەر ﷺ حەز بە کات بەفیڕۆدان ناکات وە ڕقی لە زۆر پرسیار کردنە، سەهلی ساعیدی ڕەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت: (( حەزی نەدەکرد لە زۆر پرسیار کردن و بە شتێکی خراپی دەزانی)).[٣]

نەوەوی دەفەرموێت: (( مەبەست لەو پرسیارانەیە کە پێویست نین، بەتایبەتی ئەوانەی کە نهێنی موسڵمانێك دەربخات، یا خراپەیەك بڵاو بکاتەوە، یان ناشرینیەکی تیادابێت لە دژی موسڵمانێك. زانایان دەفەرموون: بەڵام ئەگەر پرسیارەکان دەربارەی بابەتگەلێك بن کە لە مەسەلەکانی ئاییندا پێویستین، ئەوە هیچ قەدەغەکردنێکی دەربارە نەهاتووە)).[٤]

---

١ـ اخرجه الخطيب في الجامع (١/٣٦٣، ٣٦٤) وفيه يزيد الرقاشي، قال الهيثمي في المجمع (١/١٦١) وهو ضعيف.

٢ـ الجامع لاخلاق الراوي، تحقيق د. محمود الطحان (ج١/٢٣٧ و رقمه٤٦٨) و اورد نحوه الهيثمي عن ابن نضرة عن ابي سعدي في المجمع (١/١٦١) و قال: رواه الطبراني في الاوسط و رجاله رجال الصحيح.

٣ـ اخرجه ابو حنيفة زهير بن حرب باسناد صحيح في كتاب العلم (٢٠، رقم ٧٧).

٤ـ شرح النووي على مسلم (٣/٧٤١) ط/الشعب.

**٦- وازهێنان لە توند ڕەوی و پرسیار نەکردن دەربارەی شتی لەیەکچوو:**

وەکو جێبەجێکردنێك بۆ وریا کردنەوەی پێغەمبەرﷺ و قەدەغەکردنی دانیشتنی لەگەڵ ئەو کەسانە، عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەفەرمووێت: پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَـٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾ (ال عمران:٧). دەفەرمووێت: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((فاذا رايت الذين يتبعون ما تشابه منه فأولئك الذين سمى الله فاحذروهم)).[١] واتە: ئەگەر ئەوانەت بینی کە شوێن ئەوانە دەکەون کە لە یەك دەچن، بزانە ئەوانەن کە خوای گەورە وریایی داوە دەربارەیان.

**٧- پرسیار کردن دەربارەی ئەو شتانەی شەرعی خوا بێدەنگ بووە دەربارەیان:**

هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێت پەیوەست بوون بەم ڕەوشتەوە ئەو جۆرە پرسیارانەیان نەدەکرد، بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی فەرز بوونی شتێك کە فەرز نەکراوە لەسەریان، یان قەدەغەکردنی شتێك کە قەدەغە نەکراوە لەسەریان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴾ (المائدة:١٠٢،١٠١).

هەروەها سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ((ان اعظم المسلمين جرماً من سأل عن شيء لم يحرم، محرّم من اجل مسألته)).[٢]

واتە: تاوانبارترین کەس لە موسڵمانان ئەو کەسەیە پرسیار دەکات دەربارەی شتێك کە قەدەغە نییە و قەدەغە دەبێت بە هۆی پرسیاری ئەو کەسەوە.

---

١- البخاري: كتاب التفسير، سورة ال عمران، رقم (٤٥٤٧).

٢ - البخاري، كتاب الاعتصام، باب ما يكره من كثرة السؤال.. و رقمه (٧٢٨٩)، اللفظ له، و مسلم: كتاب الفضائل- باب توقيره (ﷺ) و ترك اكثار السؤال.. و رقمه(٢٣٥٨).

**٨- سوود وەرگرتن لە کاتی بێ کاری پێغەمبەر ﷺ و پرسیار کردن لە کاتی گونجاودا:**

ئەبو موسا ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی بەیانی دەکرد لار دەبووینەوە بەرەو لای، هەندێکمان پرسیاری قورئانمان لێ دەکرد و، هەندێکمان پرسیاری بەشی میراتیمان لێ دەرد و، هەندێکمان پرسیاری خەونمان لێ دەکرد)).[1]

**٩-ڕێز لێنانی بارودۆخەکانی پێغەمبەر ﷺ و مکوڕ نەبوون لەسەر پرسیار کردن:**

بەتایبەتی دوای ئەوەی ئاگادار کرانەوە، بۆیە ڕێگەیان بە عەرەبە بیابان نشینەکان نەدەدا پرسیار بکەن و چاوەڕوانی هۆشمەندەکانیان دەکرد بێن، بۆ ئەوەی پرسیار بکەن لە پێغەمبەر ﷺ، ئەنەسی کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: (( نەهیمان لێکرابوو پرسیار بکەین لە پێغەمبەر ﷺ، بۆیە پێمان خۆش بوو عەرەبێکی بیابان نشینی هۆشمەند بهاتایە و پرسیاری بکردایە لە پێغەمبەر ﷺ و ئێمە گوێمان بگرتایە، جارێکیان کەسێك لە بیابانەوە هات و وتی: ئەی موحەممەد، نێردراوەکەت هاتە لامان و بانگەشەی ئەوەی دەکرد گوایە خوا تۆی ڕەوانە کردووە، فەرمووی: ڕاست دەکات.[2]

بەم شێوە بونیاتنانی پەروەردەیی بەردەوام بوو لە کۆمەڵگای تازە، بە هەڵوێستی کردەیی ڕوون، هاوکات لەگەڵ بڵاو کردنەوەی فێربوون و فێر کردندا لە نێوان موسڵماناندا، ئەو ئاڕاستەکردنانەش بەشداری دەکرد لە ئامادەکردنی موسڵمانان وەکو تاك و کۆمەڵ و دەوڵەت کە پێغەمبەر ﷺ دایمەزراند.

---

١ ـ قال الهيثمي في مجمع الزوائد (١٥٩/١)، رواه الطبراني في الكبير. و فيه محمد بن عمر الرومي، ضعفه ابو داود و ابو زرعه، ووثقه ابن حبان.

٢ ـ مسلم: كتاب الايمان، باب السؤال عن اركان الاسلام، و رقمه (١٠-(١٢)).

## باسی شەشەم: ڕووداوەکان و یاسادانان

### یەکەم: چارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری.

کۆچکردنی موسڵمانان بۆ مەدینە بوو بە مایەی بارقورسیەکی زۆر بەسەر شانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، سەرکردەی گشتی دەوڵەتیش دەستی کرد بەچارەسەرکردنی ئەو قەیرانە بەچەند ڕێگایەك، سەرەتا برایەتی لەنێوانیاندا کرد، ئینجا هەڵسا بە دروستکردنی سوففە لەلای مزگەوتەکەدا بۆ داڵدەدانی گەورەترین ژمارە لە هەژارانی موهاجیرەکان و، گرنگی دا بە لێکۆڵینەوەی دۆخی ئابوری لە مەدینە و، بۆی دەرکەوت کە هێزی ئابوری لە دەستی جولەکەدایە و، ئەوان خاوەنی بازاڕ و سامانی مەدینەن، نرخی کالاّ و شت و مەکیش ئەوان دەستنیشانی دەکەن و قۆرخی دەکەن و، پێویستی خەڵکی دەقۆزنەوە، بۆیە پێویست بوو بازاڕێك دروست بکرێت بۆ مسوڵمانان کە کێبڕکێ بکات لەگەڵ جولەکەکاندا سەبارەت بەسەرچاوەکانی ئابوری لەمەدینەدا، کە ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلام تیایدا دەرکەوێت لە جیهانی بازرگانیدا.

شەریعەتی خوای گەورە چارەسەری کێشەی ئابوری کردووە لە ڕێگەی بەسەرهاتە قورئانییەکانەوە کە خەڵکی پێویستە پەندی لێوەربگرن، خوای گەورە چاودێری ئەو ئومەتەی دەکرد و، هەنگاوەکانی پێ هەڵدەگرت بۆ ئەوەی ئامادە بێت بۆ هەڵگرتنی ڕاسپاردەی ئیسلام و، جیاوازیش نەبوو لە دەوڵەتدا لە نێوان شتی گەورە و بچووکدا چونکە هەمووی بەشداری دەکرد لە بەرز کردنەوەی دەوڵەتدا و بەهێزکردنی لە بەرامبەر ئەو مەترسییانەی ڕووی تێدەکەن، جا زەکات و سەرفیترە و ڕۆژوگرتن لەو یاسایانە بوون کە تێبینی سوننەتی پلە بە پلەیان تیا دەکرێت لە بونیاتنانی کۆمەڵگەی موسڵماندا و، چاودێرکردنی بۆبارودۆخی خەڵکی و گواستنەوەیان بەرەو چاکتر، بەبێ هیچ پەلە کردنێك، بەڵکو هەموو شتێك لە کاتی خۆیدا.[١]

---

١ ـ بڕوانە: دراسات في عصر النبوة للشجاع (١٦٦،١٦٨).

## دووەم: هەندێ لە یاساکانی ئیسلام

### ١- یاسای فەرز بوونی ڕۆژوو لە ئیسلامدا:

لەساڵی دووەمی کۆچی و لە مانگی شەعباندا، خوای گەورە ڕۆژووی فەرز کردە سەر موسڵماناندا و کردی بە یەکێك لە ڕووکنەکانی ئیسلام، وەکو چۆن لەسەر نەتەوەکانی پێش ئیسلامیش هەر فەرز کرابوو، ئەوەیش جەخت کردنێك بوو لەسەر گرنگی ئەو خوا پەرستنە مەزنە و پلە و پایەی وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ (البقرة:١٨٣).

### ٢- یاسای سەرفیترە:

لە ڕەمەزانی هەمان ساڵدا، خوای گەورە یاسای زەکاتی سەرفیترەی بۆ موسڵمانان پێویست کرد، لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد یان کۆیلە، نێر یاخود مێ، منداڵ یاخود گەورە، لە موسڵمانان، ابن عباس دەفەرمویێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەرزکرد، وەکو پاکبوونەوەیەك بۆ ڕۆژوان لە قسەی بەتاڵ و کاری نابەجێ و، وەکو خواردنێکیش بۆ هەژاران، هەرکەسێك دەری بکات پێش نوێژ ئەوە زەکاتێکی وەرگیراوە، هەرکەسێکیش دوای نوێژ دەری بکات چاکەیەکە لە چاکەکان.[1]

### ٣- نوێژی جەژن:

هەر لەم ساڵەدا پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی جەژنی کرد، بۆ یەکەمین جار، خەڵکی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەرچوون بۆ نوێژگا لە دەرەوەی شار و دەیانوت (لاإله الاالله)و (الله اکبر) و سوپاسی خوایان دەکرد لەسەر ئەو هەموو چاکەی لەگەڵیان دەیکات.

---

١ ـ سنن ابي داود، كتاب الزكاة، باب زكاة الفطر رقم (١٦٠٩) وحسنه الالباني في صحيح ابي داود، بالرقم نفسه.

**٤- یاسای زەکات:**

لەساڵی دووەمی کۆچییدا، خوای گەورە یاسای زەکاتی دانا بۆ موسڵمانان وەکو یەکێك لەکۆڵەکەکانی ئیسلام، ئەوەیش لەدوای مانگی ڕەمەزان بوو، چونکە زەکاتی گشتی دوای زەکاتی سەرفیترە بوو، زەکاتی سەرفیترەیش دوای ڕۆژوو بوو بەدڵنیایی یەوە، ئەمەیش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی ڕوایەت کراوە لەلایان پێشەوایان ئەحمەد و ئیبنو خوزەیمە و نەسائی و ئیبنو ماجە و حاکیم، لە فەرموودەی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە، فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە صەدەقەی خێر پێش فەرزبوونی زەکات، دوای ئەوە زەکات فەرز بوو، ئیتر نە فەرمانی پێکردین و نە لێمانی قەدەغەکرد.[١]

ئیبنو حەجەر دەڵێت: ئیسنادەکەی تەواوە، زۆرینەی زانایانیش لەسەر ئەوەن لە سەلەف و خەلەفی موسڵمانان، کە زەکات لە مەدینە دابەزی لە ساڵی دووەمی کۆچیدا.[٢]

**٥- هاوسەرگیری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عائیشە رضي الله عنها :**

مارەبڕینەکە لە مەککە بوو پێش کۆچکردن کاتێك تەمەنی شەش ساڵان بوو دوای لە دونیا دەرچوونی خەدیجە ڕەزای خوای لێبێت، گواستنەوەکەشی لە مەدینە بوو لە نۆ ساڵیدا، لە مانگی شەوال لە ساڵی یەکەمی کۆچی.[٣]

بزوتنەوەی بانگەواز و جیهاد و پەروەردە کردن و دروستکردنی دەوڵەت هەر بەردەوام بوو، هاوسەرگیریش هەر بەردەوام بوو لە مەدینە، بەڵکو کارێکی زۆر و ئاساییش بوو وەکو خواردن و خواردنەوە، ئەوەیش یەکێکە لە دیاردەکانی ئیسلام، چونکە ئایینی فیترەتە، بەڵکو هاوسەرگیری بەشێکی گرنگە لە دروستکردنی کۆمەڵگای موسڵمان.[٤]

---

١ـ صحيح سنن النسائي، للالباني، كتاب الزكاة، باب فرض صدقة اللفطر قبل نزول الزكاة و رقمه (٢٥٠٦) و صححه.

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية لابي شهبة (١١١/٢).

٣ـ بڕوانە: من معين السيرة (١٦٨).

٤ـ بڕوانە: الاساس في السنة (٤٢٠/١).

ئەو کاتەی پێغەمبەرﷺ هەڵسا بە گواستنەوەی عائیشە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵ، ئەم تەمەنەیش وا دێتە پێش چاوی بەرانبەر کە ئەوە کەسێکی پیرولاوازە، بێگومان تێپەڕبوونی ساڵان پێوەرێکی گشتییە بۆ تەمەنی خەڵکی وەکو بنەمایەکی گشتی، بەڵام پێوەری ڕاستەقینە زیندویەتی مرۆڤە و چالاکی و توانایەتی لەسەر کارکردن، ئێمە لەوانەیە کەسێك ببینین لە سی ساڵیدا بێت بەڵام لە لاشەی خۆیدا لاوازی کەسێك هەڵبگرێت لە پەنجا ساڵیدا بێت، بە پێچەوانەیش لەوانەیە کەسێك ببینین پەنجا ساڵان بێت بەڵام لە سی ساڵ زیاتری بۆ مەزەندە ناکرێت، کەسایەتی پێغەمبەریشﷺ لەم بوارەدا زۆر تاك بوو کاتێك لە پەنجا ساڵیدا بوو، کەسێك بوو لە ئەوپەڕی هێزی گەنجی و ورە بەرزی و پیاوەتیدا بوو، لەوەشدا کەسی پیا نەدەگەیی لە مرۆڤەکان.

لە ڕووی کردەییشەوە، جیاوازی تەمەن لە نێوان پێغەمبەرﷺ و عائیشەدا ئەو زۆرە نەبوو، ئەوەتا جاری وابوو پێشبڕکێی دەکرد لەگەڵ عائیشەدا و پێشی دەدایەوە و جاری وابوو عائیشە پێشی ئەوی دەدایەوە، ئیتر دەیفەرموو:ئەمەیان لە جیاتی ئەوەیان،[1] نمونەیش زۆرە لەم بارەیەوە.[2]

هەموو خاوەن دیدێکی ڕاست دەتوانێ لە دانایی ئەو کارە بگات کە بۆچی پێغەمبەرﷺ هاوسەرگیری کرد لەگەڵ عائیشە ڕەزای خوای لێبێت، ئەم هاوسەرگیرییە لە سەرەتای سەردەمی مەدینەدا ڕویدا، هەروەها لە سەرەتای ژیانی یاسادانانی پێغەمبەرەوەﷺ. بێگومان مرۆڤ بەشێکی زۆر لە ژیانی لەماڵدا لەگەڵ خێزاندا بەسەر دەبات، پێویستیش بوو ئەو ئاکارانەی پێغەمبەر ﷺ بگوێزرێنەوە بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگ بۆ خەڵکی، ئەوەیش ئەرکی خاتو عائیشە بوو بەتایبەت، هەروەها دایکانی ئیمانداران ڕەزای خوایان لێبێت، عائیشە ڕەزای خوای لێبێت بەو تێگەیشتنەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، ڕۆڵی خۆی بە باشترین شێوە دەگەیاند، بە سەیرکردنێکی خێراییش بۆ کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ ئەم

---

١ـ بڕوانە: من معين السيرة (١٧٢).

٢ـ هەمان سەرچاوە(١٧٢).

ڕاستیە دەردەکەوێت. ئەوەیش کە یارمەتی دا ئەم ڕۆڵە ببینێ تەمەنی درێـژی بـوو، کە نزیکەی پەنجا ساڵ تەمەنی کرد لە پاشان لـە دونیـا دەرچـوونی پێغەمبـەر ﷺ، کە لەو ماوەیەدا توانی ئـەوەی کـە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ فێربـوو بیگەیـەنێت، ڕەزای خوای لێبێت و ڕازی بکات.[1]

---

١ بڕوانە: من معين السيرة (١٧٣).

# بەشی هەشتەم

# غەزای بەدری گەورە

## باسی یەکەم: قۆناغی پێش جەنگەکە

موسوڵمانان هەواڵیان پێ گەیشت کە کاروانێکی گەورەی[١] قورەیش، ماڵێکی زۆری تیایە بە سەرکردایەتی ئەبو سوفیان، لە شامەوە دەرچووەو، سی تا چل کەس پاسەوانێتی دەکەن،[٢] پێغەمبەر ﷺ هەستا بە ناردنی بەسبەسی کوڕی عەمر[٣] بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی کاروانەکە، جا کاتێك گەڕایەوە بە هەواڵی تەواو دەربارەی کاروانەکە، هانی هاوەڵانی دا بۆ دەرچوون و پێی فەرموون:- هذه عير قريش فيها أموال فاخرجوا اليها لعل الله ينفلكموها))[٤] (واتە: ئەوە کاروانی قورەیشەو سامانەکانیانی تیادایە، دەربچن بەڵکو خوای گەورە بیکاتە دەستکەوت بۆ ئێوە)، دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا لە ڕۆژی دوانزەی ڕەمەزان لە ساڵی دووەمی کۆچی بوو، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەکاتی دەرچوونی مەبەستی شەڕکردن نەبوو، بەڵکو مەبەستی کاروانەکەی قورەیش بوو، ئەو کاتە حاڵەتی نێوان هەردوو لاش حاڵەتی شەڕ بوو، لەو کاتانەیش ماڵ و خوێنی دوژمن ڕەوا دەبێت، نەخوازەلا ئەوەش کە زۆرێك لەو ماڵانەی لەو کاروانەدا بوون ماڵی موهاجیرەکان بوو، قورەیش بە ستەم و زۆرداری دەستیان بەسەردا گرتبوو.[٥]

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کرد لە عەبدوڵای کوڕی ئوممو مەکتووم پێش نوێژی بکات بۆ خەڵکی لە مەدینە، کاتێك کە خۆی دەرچوو بۆ بەدر، ئینجا ئەبو لوبابەی

---

١ ـ ئەو کەلوپەلانەی لەم کاروانەدا بوو بە سەد و پەنجا هەزار دینار مەزەندە دەکرا، بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم في مكارم اخلاق الرسول الكريم (١/٢٨٦).

٢ ـ جوامع السيرة لأبن حزم (١٠٧).

٣ ـ ئەم ناوە لە (صحيح مسلم)دا بە (بسبسة) هاتووە وە ئیبنو حەجەر چاکی کردۆتەوە.

٤ ـ سيرة ابن هشام (٢/٦١) (بسند صحيح) الى ابن عباس رضي الله عنه.

٥ ـ بڕوانە: حديث القران عن غزوات الرسول، د. محمد ال عابد (١/٤٣).

لە ڕەوحا گەڕانەوە بۆ مەدینە و کردی بە فەرماندەی شارەکە.[١]

پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بە ناردنی دوو کەس لە هاوەڵانی[٢] بۆ بەدر وەکو پێشەنگێك بۆ زانینی هەواڵی کاروانەکە، ئەوانیش هەواڵیان هێنایەوە،[٣] لە سەرچاوە ڕاستەکانیشدا هەندێك جیاوازی دروست بوو، سەبارەت بە ژمارەی ئەو هاوەڵانەی کە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەرچوون بۆ غەزای بەدر، لە کاتێکدا بوخاری بە سێ سەدو بڕێك دایانی ناوە،[٤] موسلیم باسی ئەوە دەکات کە ژمارەیان سێ سەد و نۆزدە کەس بووە،[٥] ئەمە لە کاتێکدا سەرچاوەکان ناوی سێ سەد و چل هاوەڵیان نووسیوە لە بەشداربووانی بەدر،[٦] هێزی موسڵمانان لە بەدر بریتی نەبوو لە هەموو توانای سەربازی دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە دەرچوونی ئەوان لەپێناو دەست بەسەرگرتنی کاروانێکدا بوو، نەشیاندەزانی ڕووبەڕووی هێزەکانی قورەیش و هاوپەیمانەکانیان دەبنەوە، کە ژمارەی ئەوان گەیشتە هەزار کەس،[٧] دوو سەد سواریان لەگەڵ بوو لە پاڵ وشترەکان و کۆیلەیان لەگەڵ بوو دەفیان لێ دەدا و، گۆرانیان دەوت لە دژی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی،[٨] ئەمە لە کاتێکدا کە موسڵمانان تەنها دوو ئەسپیان پێ بوو، لەگەڵ حەفتا وشتر کە بە نۆرە سواری دەبوون.[٩]

یەکەم: هەندێك ڕووداو لەکاتی ڕێکردن بەرەو بەدر.

ئەمەیش چەند ڕووداوێکە کە پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدایە لە ڕێگادا ڕوویاندا:

**١- گێڕانەوەی بەڕائی کوڕی عازیب و عەبدوڵای کوڕی عومەر بە هۆی منداڵیانەوە:**

لە پاش دەرچوونی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی لە مەدینە، گەیشتنە جێگایەك لە

---

١ ـ البداية والنهاية (٣/٢٦٠)، المستدرك للحاكم (٣/٦٣٢).
٢ ـ (عدي بن الزغباء وبسبس بن عمرو) بوون ئەو دوو کەسە .الطبقات لابن سعد (٢/٢٤).
٣ ـ الطبقات لابن سعد (٢/٢٤) بسند صحيح.
٤ ـ فتح الباري: ابن حجر العسقلاني، (٧/٢٩٠-٢٩٢).
٥ـ مسلم، شرح النووي، تحقيق أ. محمد تامر (٦/٣٤٠)، ط/ دار الفجر للتراث.
٦ـ البداية والنهاية (٣/٣١٤) هەروەها: الطبقات، خليفة بن خياط.
٧ـ مسلم، بشرح النووي. محمد تامر (٦/٣٤٠) ط/ دار الفجر للتراث.
٨ـ البداية والنهاية (٣/٢٦٠).
٩ـ المسند (١/٤١١) و مجمع الزوائد (٦/٦٩)، جوامع السيرة (١٠٨).

دەرەوەی مەدینە (بیوت السقیا) و لەوێ ڕاوەستان و پێغەمبەر ﷺ تەماشای ئەوانەی کرد کە بەشدارن لە هێزەکەدا، ئیتر ئەوانەی گێڕایەوە کە توانایان نەبوو لەگەڵ سوپای موسڵمانان ڕێ بکەن و بەشداری جەنگ بکەن، بۆیە بەڕائی کوڕی عازیب و عەبدوڵای کوڕی عومەری گێڕایەوە بە هۆی منداڵیانەوە، ئەوان دەرچووبوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بە ئارەزووی خۆیان و پەرۆشی بەشدار کردن لە جیهاددا.[1]

**٢- بگەڕێرەوە وە هاوکاری وەرناگرم لە کەسێکی موشریك:**

لەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ڕێیان دەکرد، یەکێك لە بتپەرستەکان حەزی کرد لەگەڵ خزمەکانی خۆیدا دەربچێت بۆ جەنگ، پێغەمبەر ﷺ ئەوی گێڕایەوە و فەرمووی: ارجع فلن استعین بمشرك))، واتا: بگەڕێرەوە من قایل نابم بە هاوکاری کردنی کەسێکی بتپەرست، ئەو پیاوەش زۆر هەوڵی دا بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕازی نەبوو، تاکو موسڵمان بوو، ئینجا بەشداری کرد.[2]

**٣- بەشداری کردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی لە کارە سەختەکاندا.**

عەبدوڵاکی کوڕی مەسعود دەگێڕێتەوە: لە ڕۆژی بەدر هەر سێ کەس و لەسەر وشترێك بووین، ئەبو لوبابە و عەلی کوڕی ئەبو تالیب لەگەڵ پێغەمبەربوون ﷺ ، ئیتر نۆرەی پێغەمبەر بووﷺ لە ڕێکردندا،وتیان ئێمە لەجیاتی تۆ ڕێ دەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ما أنتما بأقوى مني، ولا انا باغنى عن الاجر منكما))[3] واتە: ئێوە لەمن بەهێزترنین و، منیش لەئێوە کەمتر پێویستم نییە بە پاداشت.

دووەم: سووری بتپەرستان لە سەر ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ ئەبو سوفیان هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەر ﷺی پێگەیشت لە مەدینە،بەمەبەستی ڕێگرتن لە کاروانەکە و دەست بەسەراگرتنی، بۆیە ئاڕاستەی کاروانەکەی گۆڕی بەرەو ڕێگای کەناری دەریا، لەهەمان کاتدا هەڵسا بەناردنی عەمری کوڕی زەمزەمی غیفاری نارد بۆ لای

---

١ ـ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي شهبة (٢/١٢٤).

٢ ـ بڕوانە: السيرة النبوية الصحيحة للعمري (٢/٣٥٥).

٣ ـ بڕوانە: المسند (١/٤١١) برقم (٣٩٠١)، وصحح اسناده، الشيخ احمد شاكر..

قورەیش داوای دەرچوونیان دەکات بۆ ڕزگارکردنی کاروانەکەیان،[١] ئەبوسوفیان وریابوو بۆ وەرگرتنی هەواڵی موسڵمانان و جموجۆڵیان، بەڵکو بەخۆی هەوڵی دەدا دەنگ و باسیان بزانێت، خۆی بەرەو بەدر چوو، لەوێ پرسیاریان کرد: ئایا کەستان بینیوە؟ وتیان: نەخێر، تەنها دوو پیاو نەبێت، وتی: شوێنی لادانی ولاخەکانیانم پێ پیشان بدەن، ئەوانیش پیشانیاندا، ئەویش پشقلەکەی هەڵگرت و لەتی کرد بینی ناوەکە خورمایە وتی: سوێند بەخوا ئەمە ئالیکی یسریبە،[٢] بەم شێوەیەش توانی هەواڵی دوژمنانی خۆی بزانێت، تەنانەت هەواڵی ئەو پۆلەی کە دەرچوون بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ، لە ڕێگەی خواردنی ولاخەکانەوە، بەم شێوەیش بۆی دەرکەوت کە کاروانەکەی لە مەترسیدایە، بۆیە هەڵسا بە ناردنی عەمر و ئاراستەی کاروانەکەشی گۆڕی بەرەو ڕێگای ڕۆخی دەریا.[٣]

ئەم هەواڵە قورس بوو لەسەر سەرانی قورەیش و زۆر تورەیانی کرد، چونکە ئەوەیان بە سووکایەتییەك ژمارد بە کەرامەتیان و بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان کە مەترسی لەسەر دروست بوو، ئەمە جگە لەوەی جۆریك بوو لە داگرتنی پلەو پایەیی قورەیش لەنێو هۆزەکانی عەرەب دا، بۆیە ئەوان پەرۆش بوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان بە ئەو پەڕی توانایانەوە.[٤]

عەمری کوڕی (ضمضم)ی غیفاری بەشێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش چووە لای قورەیش، کاری دەکردە سەر هەموو کەسێك ببینیایە یان ببیستایە، جێگای سەر ولاخەکەی هەلاوديو کردبوو، لووتی وشترەکەشی بڕیبوو، کراسەکەی خۆیشی لەبەرو دواوە دادڕیبوو، بەم شێوەیە هاتە ناو مەکەوە و بەهەمووی توانای هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش، کاروانەکەتان، ماڵەکانتان لەگەڵ ئەبوو سوفیانە و موحەممەد و هاوەڵانی ڕێگایان پێ گرتووە، وانازانم فریای بکەون : هاوار هاوار.[٥]

---

١ ـ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/٢٨٧).

٢ ـ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٣٠).

٣ ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى لأبي فارس (٣٣-٣٤).

٤ ـ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/٣٨٧).

٥ ـ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٢١).

بەڵام کاتێك ئەبو سوفیان دڵنیا بوو لەسەر سەلامەتی کاروانەکە کەسێکی نارد بۆ لای سەرانی قوڕەیش بە نامەیەکەوە، کاتێك لە جوحفە بوو، تیایدا ئاگاداریکردنەوەکە خۆی و کاروانەکە ڕزگاریان بووە و، داوای لێکردن بگەڕێنەوە بۆ مەککە، ئەمەیش بووە مایەی دابەشبوونێکی زۆر لە نێوان بۆچوونەکاندا، چونکە زۆربەیان سووربوون لەسەر پێشکەوتنی بۆ بەدر، بۆ تەمێ کردنی موسڵمانان و، ئارام کردنی ڕێگای بازرگانیەکەیان، هەروەها ئاگادارکردنەوەی هێزەکانی تر بەهێزی قوڕەیش و دەسەڵاتی، لەم کاتەدا بەنو زوهرە جیابوونەوە و،[1] بەنو عەدیش هەر لەسەرەتاوە نەهاتبوون، ئیتر بەنو زوهرە گەڕانەوە بۆ مەککە، بەڵام زۆربەی هێزەکانی قوڕەیش و هاوپەیمانەکانیان، ڕۆیشتن بەرەو بەدر.[2]

سێ یەم : ڕاوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی.

کاتێك هەواڵی قوتاربوونی کاروانەکە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی کەسەرانی قورەیش سوورن لەسەر شەڕکردنی لەگەڵ موسڵمان و، پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی کرد بە هاوەڵان لەم بارەوە،[3] هەندێ لە هاوەڵان ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازییان پێ چاك نەبوو لەگەڵ قوڕەیشدا، چونکە پێشبینی ئەوەیان نەکردووە و خۆیان بۆی ئامادە نەکردووە، هەوڵیشیاندا پێغەمبەر ﷺ بە بۆچوونەکەیان قایل بکەن، قورئانی پیرۆزیش باسی هەڵوێستی دەستەی ئیماندارانی کردووە بەم شێوەیە: ﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ٦ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ (الانفال: ٥-٨).

---

١- ئەخنەسی کوڕی شورەیق ئامۆژگاریانی کرد جیا ببنەوە، بڕوانە: ابن هشام (٢/٢٣١).

٢- بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/٣٨٧).

٣ - صحيح البخاري، كتاب المغازي، باب (قصة غزوة بدر) (٣/٣٩٥٢).

سەرانی موهاجرین بەکۆی ڕا پشت گیریان کرد لە بیرۆکەی پێشکەوتن بەرەو ڕووی دوژمن،[1] میقدادی کوڕی ئەسوەدیش هەڵوێستێکی جیاوازی هەبوو، عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەفەرموێت: هەڵوێستێکم بینی لە میقداد، پێم خۆش بوو خاوەنی ئەو هەڵوێستە بووایەم لەوەی کە خاوەنی هەرشتێکی تربوایەم، لەو کاتەی پێغەمبەرﷺ دوعای کرد لەبتپەرستان، میقداد هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ئێمە وەکو قەومەکەی موسا نالێین: ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾ (المائدة: ٢٤)، بەڵکو شەڕ دەکەین لە لای ڕاست و لە لای چەپت و لەبەر دەم و لە دواوەت، ئیتر پێغەمبەرﷺ ڕووی گەشایەوە و، لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە،[2] میقدادی کوڕی عەمر لە ڕۆژی بەدردا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە ئەوەت پێ ناڵێین کە بەنی ئیسرائیل بە موسایان وت: ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾ (المائدة: ٢٤)، بەڵکو بەڕێکەوە و ئێمەیش لەگەڵت دەبین، ئیتر پێغەمبەرﷺ وەکو چۆن بڵێی ڕووی گەشایەوە.

لە پاش ئەوە پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە و فەرمووی: ڕاوبۆچوونی خۆتانم بۆ باس بکەن خەڵکینە، مەبەستیشی ئەنصارەکان بوو زیاتر، چونکە ئەوان زۆرینەی سەربازەکانیان پێك دەهێنا، هەروەها لەبەر ئەوەی بەیعەتی عەقەبەی دووەم ناچارکەر نەبوو بۆ ئەوان لە ڕوواڵەتدا کە پارێزگاری بکەن لە پێغەمبەر ﷺ لە دەرەوەی مەدینە، سەعدی کوڕی موعاز کە هەڵگری ئاڵای ئەنصارەکان بوو، دەرکی کرد بە مەبەستی پێغەمبەر ﷺو هەستایە سەرپێی و فەرمووی: سوێند بە خوا وا دەزانم مەبەستت ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش وتی: ئێمە ئیمانمان پێت هێناوە و باوەڕمان پێ کردووی، بڕۆ بۆ ئەنجامدانی هەر شتێك کە دەتەوێت و ئێمەیش لەگەڵتداین، سوێند بەو کەسەی تۆی بەڕاستی ڕەوانە کردووە، ئەگەر لە دەریا بدەیت لەگەڵت لە دەریا دەدەین، یەك

---

١ـ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/٢٨٨).

٢ـ البخاري: كتاب التفسير (٣/٤٦٠٩).

پیاومان دواناكەوێت لە تۆ، بەوەیش ناڕەحەت نین سبەی ڕووبەڕووی دوژمنمان بكەیتەوە، ئێمە لە جەنگدا بە ئارامین لە ڕووبەڕووبوونەوەدا ڕاستگۆین، بەڵكو خوای گەورە شتانێكت لە ئێمە پێ پیشان بدات چاوتی پێ گەش ببێتەوە، بڕۆ بە پیرۆزبایی خوای گەورە.[1]

پێغەمبەرﷺ بە قسەكانی سەعد پێ خۆشحاڵ بوو و، چالاك بوویەوە، ئینجا فەرمووی: ((سیروا وابشروا، فان الله تعالى قد وعدني احدى الطائفتين والله لكاني أنظر الى مصارع القوم))[2] واتە: بەڕێ كەون و مژدە بدەن، چونكە خوای گەورە بەڵێنی یەكێك لە دوو كۆمەڵەكەی پێ داوم، سوێند بە خوا وەكو ئەوەیە تەماشای ئەو جێگانە بكەم كە تیایدا دەكوژرێن.

قسەكانی سەعد هاندەر بوون بۆ پێغەمبەرﷺ و گڕیان بەردایە هەستی هاوەڵان، ورەی هاوەڵانی بەرزكردەوە و هانیدان لەسەر شەڕ كردن. سووربوونی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕاوێژكردن بە هاوەڵان لە غەزاكاندا، بەڵگەیە لەسەر گرنگی ڕاوێژ لە كاتی جەنگدا بە شێوەیەكی تایبەت، چونكە جەنگەكان چارەنووسی گەلان دیاری دەكەن، یان بەرەو سەركەوتن، یان بەرەو گڵێ.[3]

چوارەم: پێغەمبەرﷺ هەڵسا بە ڕێكخستنی سەربازەكانی پاش ئەوەی گوێڕایەڵی هاوەڵانی بینی، هەروەها ئازاییان و كۆبوونەوەیان لەسەر جەنگ كردن، بەیداخی سپی بەست و دایە دەستی موسعەبی كوڕی عومەیر، دوو بەیداخی ڕەشیشی دایە دەستی سەعدی كوڕی موعاز و عەلی كوڕی ئەبی تالیب، هەروەها قەیسی كوڕی ئەبی سەعسەعەشی دانا لەسەر بەشی دواوەی لەشكرەكە.[4]

---

١ ـ رواه ابن هشام (٢/٦٣-٦٤) عن ابن اسحاق بدون اسناد واورده الامام الذهبي في مغازيه — تحقيق د. عمر التدمري (ص١٠٧) كلمات قريبة من سيرة ابن هشام، و عنوان لها الامام الذهبي:... ذكر غزوة بدر من مغازي موسى بن عقبة فانها من اصح المغازي))، صحيح مسلم: رقم (١٧٧٥) كتاب الجهاد — باب غزوة بدر.

٢ـ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٢٦٢) باسناد صحيح، المسند (٥/٢٥٩) رقم (٣٦٩٨).

٣ ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى لأبي فارس (ص ٣٧).

٤ ـ بڕوانە: زاد المعاد (٣/١٧٢).

پێغەمبەرﷺ هەستا لەگەڵ ئەبوبەکردا بۆ زانینی بارودۆخی سوپای موشریکان، لەو کاتەی ئەوان خەریکی گەڕان بوون لە ناوچەکە پیرە پیاوێکی عەرەبیان بینی، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرد دەربارەی سوپای قورەیش، هەروەها پرسیاری موحەممەد و هاوەڵانی لێکرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی: وتی پێتان ناڵێم تاکو پێم نەڵێن ئێوە کێن. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر پێمان بڵێی پێت دەڵێین، وتی: واتە یەك بە یەك؟ فەرمووی: بەڵێ، کابرای پیر وتی: بیستوومە موحەممەد و هاوەڵانی لە ڕۆژی ئەوەندە و ئەوەندە دەرچوونە، ئەگەر ئەو کەسە ڕاستی کردبێت لەگەڵم ئەمڕۆ سوپای موحەممەد لە فلانە جێگان، هەواڵیشم زانیوە قورەیش لە ڕۆژی ئەوەندە و ئەوەندە دەرچوونە، جا ئەگەر ئەو کەسە پێی وتم ڕاستی کردبێت، ئەمڕۆ سوپاکەیان لە فلانە جێگایە، ئینجا وتی: ئەوەی ویستتان پێم وتن، ئێوەش پێم بڵێن ئێوە کێن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((نحن من ماء)) واتە: ئێمە لە ئاوین، ئینجا پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر پیاوەکەیان بەجێهێشت و، لەبەر خۆیەوە دەیوت: مەبەستی چی بوو لە ئاوین؟ ئایا مەبەستی هۆزی (ماء السماء)ە لە عێراق؟[1]

لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەی پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر دەرچوون، پێغەمبەرﷺ هەڵسا بە ناردنی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و، زوبەیری کوڕی عەوام و، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و چەند هاوەڵێك بۆ سەر ئاوی بەدر بە مەبەستی بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی سوپای قورەیش، لەوێ دوو گەنجیان بینی خەریك بوون ئاویان هەڵدەگۆزی بۆ سوپای بتپەرستان، ئەوانیش هێنایانیان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی فەرموون: ((اخبراني عن قريش)) واتە: هەواڵم بدەنێ دەربارەی قورەیش، وتیان: سوێند بە خوا ئەوان لە پشت ئەو تەپۆلکە دوورەن، پێغەمبەر ﷺ پێی وتن: ژمارەیان چەندە؟ وتیان: زۆرن، فەرمووی: کەرەستەی چیە؟ وتیان: نازانین. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەموو ڕۆژێك چەند سەردەبڕن؟ وتیان: ڕۆژێك نۆ و ڕۆژێك دە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوان لە نێوان نۆسەد و هەزار دان، ئینجا پێی فەرموون: کێیان تیایە لە سەرانی قورەیش؟ ئەوانیش وتیان: عوتبە و شەیبەی

---

١ ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (٢/٢٢٨).

كوڕانی ڕەبیعە و، ئەبو جەهل و، ئومەییەی كوڕی خەلەف و هەندێكی تر لە ئازایانی قوڕەیش، پێغەمبەر ﷺ بەرەو لای هاوەڵانی ڕۆیشت و فەرمووی: ((هذه مكة قد القت اليكم افلاذ اكبادها))[1] واتە: ئەو قوڕەیشە جگەرگۆشەكانیان فڕە داوەتە بەر دەستتان.

ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو كە پەرۆش بوو بۆ ناسینی سوپای دوژمن و، زانینی ئامانجەكانیان، چونكە یارمەتی دەدا بۆ نەخشەكێشانی سەربازی گونجاو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، شێوازی كۆكردنەوەی زانیاری لە غەزای بەدر، جاری وابوو لە ڕێگەی خۆی و جارجارەش لە ڕێگەی كەسانی ترەوە، هەروەها پێغەمبەرﷺ بنەمای نهێنی ڕاگرتنی جێبەجێ دەكرد لە جەنگەكانی، چونكە قورئانی پیرۆز ئامۆژگاری موسڵمانانی دەكرد بۆ گرنگی ئەو بنەمایە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ (النساء: ٨٣).

ئینجا پێغەمبەرﷺ پەیوەست بوو بە بنەمای پەنهانی لە هەموو غەزاكانی بە شێوەیەكی گشتی، لە كەعبی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ((پێغەمبەرﷺ كاتێك بیویستایە غەزایەك بكات وای دەردەخست بەرەو لایەكی تر دەڕوات.... )).[2]

لە غەزای بەدریشدا ئەم ئاكارە پیرۆزە بەم شێوازە دەركەوت:

١- پرسیاركردنی پێغەمبەرﷺ لەو پیاوە پیرە كە چاوی پێكەوت لە بەدر دەربارەی موحەممەد و سوپاكەی، هەروەها دەربارەی قوڕەیش و سوپاكەیان.

٢- بەكارهێنانی شاردنەوە لە كاتی وەڵامدانەوەی پرسیاری ئەو پیاوە: ئێوە كێن؟ ئەویش فەرمووی: ئێمە لە ئاوین، چونكە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی شاردنەوەی

---

١ـ بڕوانە: المسند (٩٤٨).

٢ ـ البخاري: كتاب الجهاد والسير، باب من اراد غزوة فورّى بغيرها (٢/٢٤٧).

هەواڵی سوپای موسڵمانان بوو لە قوڕەیش.

٣- پاش وەڵامەکەی یەکسەر کابرایان بەجێهێشت، ئەویش بەڵگەیە لەسەر دانایی پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەگەر وەڵامی ئەو پیاوەی بدایەتەوە و، لە جێگای خۆی ڕاوەستایە، ئەو پیاوە داوای ڕوونکردنەوەی دەکرد لە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو قسەی.[1]

٤- پێغەمبەرﷺ کە فەرمانی کرد زەنگی وشترەکان بپچڕێت، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد زەنگەکان لە ملی وشترەکان ببڕدرێن لە ڕۆژی بەدردا.[2]

٥- شاردنەوەی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو ئاڕاستەی کە مەبەستی بوو، کاتێك دەرچوو بۆ بەدر، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((... ئێمە کارێکمان هەیە هەر کێ وڵاخی ئامادەیە با سواربێت لەگەڵمان)).[3]

ئیمامی نەوەوی ئەمەی کردووەتە بەڵگە لەسەر (مستحب) بوونی شاردنەوەی کارەکان لە کاتی جەنگدا، هەروەها ئاشکرا نەکردنی سەرکردەی جەنگ بۆ ئەو ئاڕاستەی مەبەستیەتی بۆ ئەوەی هەواڵەکە بڵاو نەبێتەوە و، دوژمن لێیان ئاگادار نەبێتەوە.

هەروەها تێبینی دەکەین کە پەروەردەی هێمنی لە ڕێبازی پێغەمبەرایەتی بەردەوام بوو لە قۆناغی نهێنی و ئاشکرا لە مەککە و، نەبڕایەوە لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەت و، بەڵکو هەر گەشەی دەکرد لەگەڵ بەرەوپێش چوونی دەوڵەت، بە تایبەت لە کاتی غەزاکانی پێغەمبەر ﷺدا.

پێنجەم: ئامۆژگاری حوبابی کوڕی مونزیر لە بەدر: پاش کۆکردنەوەی پێغەمبەرﷺ بۆ هەندێ زانیاری ورد دەربارەی قوڕەیش، بە پەلە خۆی و هاوەڵانی بەڕێکەوتن بۆ بەدر، بۆ ئەوەی پێش ئەوان بگەنە ئاوی بەدر و، ڕێگەیان لێ بگرن

---

١ ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (١/٢٢٨).

٢ ـ بڕوانە: المسند (٦/١٥٠) برقم (٢٥١٦٦).

٣ـ مسلم: كتاب الامارة (٣/١٥١٠) رقم (١٩٠١).

دەسەڵات بگرنە سەر ئاوەکە، بۆیە لە لای نزیکترین جێگا لە ئاوی بەدر دابەزین، حوبابی کوڕی مونزیر هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم جێگایە، جێگایەکە، خوای گەورە بۆی دەستنیشان کردووی بۆمان نییە گۆڕانکاری تیا بکەین؟ یان بیروڕا و جەنگ و پلانە؟ فەرمووی: ((بل هو الرأي والحرب والمكيدة))، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەواتە ئەمە جێگایەکی باش نییە، خەڵکی هەڵسێنە تاکو بچینە نزیکترین ئاو لە سوپای بتپەرستانەوە، لەوێ دابەزین، هەرچی ئاو و بیرەکانی خوار خۆمان هەیە تێك بدەین، حەوزێکیش دروست بکەین پڕی لە ئاو بکەین و ئینجا شەڕیان لەگەڵ بکەین، ئێمە ئاو دەخۆین و ئەوان ناتوانن ئاو بخۆن، ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریەکەی وەرگرت و سوپاکەی برد تاکو گەیشتە نزیکترین ئاو لە دوژمنەوە و لەوێ دابەزی، ئینجا حەوزیان دروست کرد و بیرەکانی تریان پڕکردەوە، ئەمەیش نموونەیەکە لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی، کە هەر کەسێك لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە دەیانتوانی بیر و بۆچوونی خۆیان بخەنەڕوو، هەرگیز بە بیریشیدا نایەت ئەو سەرکردە تووڕە ببێت و، ئەو تووڕە بوونە چی لێ ببێتەوەن وەکو دابەزینی ناوداری ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکات بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی سەرکردە، یان زیان بینینی خۆی و ماڵی لە ئەرەنجامدا.

ئەم ئازادییەی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی لەسەر پەروەردە دەکرد، ڕێگەی هەموارکرد بۆ سوود وەرگرتنی کۆمەڵگاکەیان لە بیروبۆچوونی هەموو هۆشمەندەکان، سەرکردە لە ناو کۆمەڵگایە زۆر سەرکەوتوو دەبێت، با تەمەنیشی گەورە نەبێت، چونکە بە تەنها بۆچوونی خۆی کار ناکات، یان بە بۆچوونی کەسانێك کە زاڵ بن بەسەریدا و، لەوانەیە تەماشای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بکەن، پێش بەرژەوەندی، سەرکردە پێویستە بە بۆچوونی هەموو سەربازەکانی بیر بکاتەوە، لەوانەشە بۆچوونی پەسندیشی لە کەسێکی زۆر بێ ناو و پلە و پایە دەست بکەوێت، چونکە هیچ ڕێگرێك نییە لە گەیاندنی بیروڕاکەی بۆ لای سەرکردە.[1]

---

١ ـ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (١١٠/٤).

ئینجا ئێمە تێبینی مەزنی پەروەردەی پێغەمبەرایەتی دەکەین لە کەسێکی حوبابی کوڕی مونزیر، کاتێك بە ئەوپەڕی ئەدەبەوە دەچێتە پێشەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، بۆ ئەوەی پلانەکەی بخاتە ڕوو بێ ئەوەی داوای لێ بکرێت، بەڵام ئەوە لە پاش پرسیارکردنی بوو لە پێغەمبەرﷺ کە ئایا ئەو جێگا خوای گەورە دیاری کردووە یان بوار هەیە بۆ بەڕووخستنی بیروبۆچوونی کەسێتی. ئەو پرسیارە مەزنی ئەو گەوهەرە سەرکردەیە تاکە دەردەخات کە دەزانێت لە کوێ و کەی قسە دەکات لە پێش سەرکردەکەی، چونکە ئەگەر ئەم جێگایە وەحی هەڵی بژاردبێت، ئەگەر لە گەردنی بدرێت پێی خۆشترە لەو بارەوە یەك وشە قسە بکات، بەڵام ئەگەر بۆچوونی مرۆڤانەیە ئەوا ئەو پلانێکی ستراتیژی تەواوی پێیە.

ئەم دەروونە بەرزە، شارەزای بنچینەی ئامۆژگاری کردن و بیروڕا دەرخستن بوو، هەروەها گەیشتبوو لە واتای گوێڕایەڵی و چەمکی گفت و گۆکردن و خستنەڕووی بیروبۆچوونی جیاواز بۆ بیروبۆچوونی سەرگەورەی ئادەمیزادەکان (درووود و سڵاوی خوای گەورەی لەسەر بێت).

ئینجا مەزنی سەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ لە گوێگرتنی بۆ پلانی نوێدا دەردەکەوێت کە سەربازێکی لە سەربازەکانی یاخود یەکێك لە سەرکردەکانی پێشنیاری دەکاتوئەمیش جێبەجێی دەکات .[1]

شەشەم: باسکردنی قورئان بۆ دەرچوونی بتپەرستەکان: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴾ (الانفال: ٤٧).

خوای پەروەردگار نەهی کردووە لە لاسایی کردنەوەی بێباوەڕانە کە لە ماڵەکانی خۆیان دەرنەچوونە بەهۆی لەخۆبایی بوون و ڕووپامابییەوە.

هەروەها خوای گەورە لەم ئایەتەدا سێ وەسفی داوەتە پاڵ بێباوەڕان:

لەخۆبایی بوون و ڕووپامایی و بەرهەڵستی ڕێگای خوا.

---

١ ـ بڕوانە: التربية القيادية (٢١/٣).

ئەوەش تێبینی دەکەین کە پەروەردگار دەربڕینی کردووە لە سەرکەشی و، لەخۆبایی بوونیان بە شێوەی ناو کە ئاماژە دەکات بۆ دەسەڵات و چەسپاندن، لە بەرهەڵستیشیان بە شێوەی کردار کە ئاماژە دەکات بۆ نوێبوونەوە و ڕوودان.[١]

لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتەیشدا قورتوبی دەفەرمووێت: مەبەست لە ئەم ئایەتە ئەبوجەهل و هاوڕێکانی بوون کە دەرچوون لە ڕۆژی بەدر بۆ پشتگیری کردنی کاروانەکە، دەرچوون بە کۆیلە و گۆرانی بێژ و ئامرازی مۆسیقا ژەنین، کاتێك گەیشتنە جوحفە، خوفافی کینانی — کە هاوڕێی ئەبو جەهل بوو — هەندێ دیاری نارد بۆی لەگەڵ ئامۆزایەکیدا و وتی: ئەگەر جەنگی ئێمە لەگەڵ خوا بێت، وەکو موحەممەد بانگەشەی دەکات، سوێند بە خوا ئێمە توانای جەنگ کردنمان نییە لەگەڵ خوا، ئەگەر جەنگی ئێمەیش لەگەڵ خەڵکیدا بێت، سوێند بە خوا ئێمە توانای ئەو جەنگەمان هەیە. بەو خوایە ئێمە لە شەڕی موحەممەد ناگەڕێینەوە، تاکو دەگەینە بەدر و ئارەقی تیا دەخۆینەوە و، کۆیلەکان مۆسیقا بژەنن لەسەرمان، چونکە بەدر وەرزێکە لە وەرزەکانی عەرەب و، بازاڕێکە لە بازاڕەکانیان، با عەرەبیش ببیستن بە دەرچوونمان و هەتا هەتایە ترس و بیممان بکەوێتە دڵیانەوە، ئیتر گەیشتنە بەدر و بەو شێوە لە ناوچوون.[٢]

حەوتەم: هەڵوێستی بتپەرستان کاتێك گەیشتنە بەدر: خوای گەورە هەڵوێستی ئەوانی ئاشکرا کردووە، دەفەرمووێت: ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا فَقَدْ جَاءَكُمُ الْفَتْحُ وَإِن تَنتَهُوا فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَعُودُوا نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْئًا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ (الانفال: ١٩).

پێشەوا ئەحمەد لە عەبدوڵای کوڕی سەعلەبە دەگێڕێتەوە کە ئەبو جەهل کاتێك پێکدادان ڕوویدا لە نێوان هەردوولا، وتی: خوایە ئەمە لە هەموومان زیاتر پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنێت، شتێکیشی هێناوە نازانین چییە، خوایە ئەمڕۆ لە ناوی

---

١ ـ بڕوانە: حديث القران عن غزوات الرسول، (١/٦٥–٦٦).

٢ ـ بڕوانە: تفسير القرطبي (٨/٢٥).

بدەیت، جا ئەو دەست پێشخەر بوو.[١]

کاتێك سوپای مەککە گەیشتە بەدر ناکۆکیان تێکەوت و، ڕیزە ناوخۆییەکانیان بزواندنی تێکەوت، ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: کاتێك موسڵمانان دابەزین و بتپەرستەکان هاتن، پێغەمبەر ﷺ تەماشای عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کرد لەسەر وشترێکی سوور بوو، فەرمووی: ئەگەر لە کەسێك لە ئەواندا چاکەی هەیە لە لای خاوەنی وشترە سوورەکە با شوێنی بکەون سەرفراز دەبن، ئەویش دەیوت: ئەی خزمان گوێڕایەڵیم بکەن سەبارەت بە ئەوان، چونکە ئەگەر جەنگ بکەن هەر لە دڵەکانتاندا دەمینێتەوە، هەریەکە و تەماشای بکوژی براکەی و بکوژی باوکی دەکات، ئەو کارە بخەنە ئەستۆی من و بگەڕێنەوە، ئەبو جەهل وتی: سییەکانی بای کرد، کاتێك موحەممەد و هاوەڵانی بینی، موحەممەد و هاوەڵانی بەرخ خۆرن، با یەکتر ببینین دەزانن. عوتبە وتی: بۆت دەردەکەوێت کێ ترسنۆك و خراپەکەرە بۆ کەسانی خۆی، سوێند بە خوا من خەڵکانێك دەبینم بە لێدان لێتان دەدەن، ئایا نابینن سەریان دەڵێی سەری مارە و، ڕووخساریان وەکو شمشێرە.[٢]

ئەوەیش حەکیمی کوڕی حیزامە باسی ڕۆژی بەدرمان بۆ دەکات کە ئەو کاتە خۆی لە ڕیزی بتپەرستەکان بوو و هێشتا موسڵمان نەبوو، دەڵێت: دەرچووین تاکو گەیشتینە ئەو شوێنەی خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردووە: (العدوة القصوى)، منیش چوومە لای عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و وتم: ئەی باوکی وەلید ئایا بۆ سەروەری ئەم ڕۆژە بۆ خۆت نابەیت هەتا ماویت؟ وتی: چی بکەم؟

وتم: ئێوە تەنها داوای خوێنی ئیبنولحەزرەمی دەکەن لە موحەممەد، ئەویش هاوپەیمانی تۆیە، جا خوێن بابییەکەی بدە و بە خەڵکەکە بگەڕێرەوە، وتی: بەڵێ من خوێن بابییەکەی هەڵدەگرم، ئینجا بڕۆ بۆ لای ئیبنولحەنزەلییە — واتە ئەبو جەهل — و پێی بڵێ: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە پێت دەڵێت: ئامادەی ئەمڕۆ خۆت و ئەوانەی لەگەڵتدان واز لە ئامۆزاکەت بهێنن و بگەڕێنەوە؟ وتی: ئایا کەسی تری

---

١ـ المسند (٥/٤٣١)، برقم (٢٣٦٦١)، وقال محققوا ط/ الرسالة: صحيح وهذا اسناد حسن.

٢ ـ بڕوانە: مجمع الزوائد (٦/٧٨) وقال: رواه البزاز ورجاله ثقات.

دەست نەکەوت لە تۆ زیاتر بینێرێت؟

وتم: منیش نەدەبوومە نێردەی کەسێکی تر جگە لە ئەو.

حەکیم دەڵێت: منیش بە پەلە چووم بۆ لای عوتبە بۆ ئەوەی هیچم لە هەواڵەکە لە دەست نەچێت، ئەوە عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیە لە سەرکردایەتی قورەیشدایە و، پێویستیەك نابینێت بۆ شەڕکردن لەگەڵ موحەممەد، بانگی قورەیشیشی کردووە بۆ واز هێنان لە موحەممەد، جا ئەگەر ڕاست بکات لەو قسانەی دەیکات سەربەرزی ئەو سەربەرزی قورەیشە و، مولکی ئەو مولکی قورەیشە، تۆیش دەبیتە خۆشحاڵترین کەس بە ئەو، ئەگەریش درۆزن بێت لەناو عەرەبدا دەتوێتەوە و تەواو دەبێت.

بەڵام خۆبەزلزانینی جاهیلی لە هەموو سەردەم و جێگایەکدا ڕێگە ناداتە ڕاستی بجوڵێتەوە، چونکە دڵنیایە سەرکەوتنی نەمانی خۆی دەگەیەنێت.[1]

ئینجا قورەیش هەڵسان بە ناردنی عومەری کوڕی وەهبی جومەحی، بۆ ئەوەی مەزەندەی هێزی موحەممەد بکات، ئەویش نزیکی سەربازگەکەیان بوویەوە و گەڕایەوە بۆ لایان و وتی: سێ سەد کەس کەمێك زیاتر یان کەمتر دەبن، بەڵام مۆڵەتم بدەن، ئینجا لەناو دۆڵەکەوە ڕۆیشت و دوور کەوتەوە، بەڵام هیچی نەبینی، وتی: ئەی کۆمەڵانی قورەیش من بەڵام بینی مەرگی لەگەڵ خۆی هێناوە، وشترەکانی مەدینە مردنی ڕەشیان هەڵگرتووە، ئەوانە کەسانێکن هیچ بەرگریەکیان نییە شمشێرەکانیان نەبێت، سوێند بە خوا وانازانم کەسێکیان بکوژرێت تاکو کەسێك نەکوژێت، جا ئەگەر ئەوەندەی خۆیانتان لێ بکوژن، خۆشی ژیان چیە دوای ئەوە، ئیتر خۆتانیش دەزانن.[2]

خودی ئومەییەی کوڕی خەلەفیش سەرەتا ڕازی نەبوو لە مەککە دەربچێت لە ترسی مردندا، ئەبو جەهل هاتە لای و وتی: ئەی ئەبو سەفوان، خەڵکەکە ببینن تۆ سەرگەورەی خەڵکیت و دواکەوتویتە ئەوانیش دوا دەکەون، دوایی قایل بوو و وتی:

---

١ ـ بڕوانە: مرويات غزوة بدر (ص ١٥٥).

٢ ـ بڕوانە: البداية والنهاية (٣/٢٦٩).

کە تۆ هەر وازم لێ ناهێنی، دەبێت هەر چاکترین وشتر بکڕم لە مەککەدا.

ئینجا ئومەییە وتی: ئەی دایکی سەفوان ئامادەم بکە.

ئەویش پێی وت: ئەی باوکی سەفوان بیرت چوو برا یەسریبیەکەت چی پێ وتی؟ مەبەستی سەعدی کوڕی مەعاز بوو کاتێك وتبووی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە تۆ دەکوژرێیت.[1]

وتی: لە بیرم نەچووە من بە تەما نیم زۆر لەگەڵیان بچم، جا کاتێك کە دەرچوون دەگەشتنە هەر کوێ وشترەکەی دەبەستەوە، هەر وایش بوو تاکو خوای گەورە بە کوشتی دا لە بەدر.[2]

یەکێك لە فێڵەکانی ئەبو جەهلیش نەفرینی خوای لەسەر بێت ئەوە بوو عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیتی ناردە لای بە جێگایەکی مێخوڕەوە و وتی: تۆ ژنی. ئەویش وتی: خوا ناشرینت بکات.[3]

لە ڕاستیدا هێز و ورەی سوپای مەککە لەرزۆك بوو لە دڵەکاندا، ئەگەرچی بە ڕواڵەت هێز و جێگیربوونی پێوە دیاربوو، بەڵام لە ناخەوە لە ترس و ڕاڕاییدا دەژیان.[4]

ئینجا ئەو خەونەی عاتیکەی کچی عەبدولموتەلیب کاریگەری هەبوو لەسەر وەرەی خەڵکی مەککە، ئەو لە خەونیدا بینیبووی پیاوێك داوای دەرچوونی قوڕەیش دەکات بۆ شەڕ، بەردێکی گەورەشی لەسەر کێوی ئەبو قوبەیسەوە لە مەککە خستبووە خوارەوە، پارچە پارچە بووبوو، چووبووە هەمووماڵێکەوە، ئەم خەونە ناکۆکییەکی دروست کرد لە نێوان عەبباس و ئەبو جەهلدا، تاکو (ضمضم) هات و هەواڵی کاروانەکەی بۆ هێنان و، ئەوسا مەککە هێمن بوویەوە و خەونەکەیان بە شێوەیەکی تر لێکدایەوە.[5]

---

١ ـ بڕوانە: فتح الباري (٧/٢٣٨)، المطبعة السلفية، مصر.

٢ ـ بڕوانە: مرويات غزوة بدر (ص ١٣٦).

٣ ـ بڕوانە: مرويات غزوة بدر (ص ١٣٧).

٤ ـ هەمان سەرچاوە (ص ١٣٨).

٥ـ بڕوانە: المجتمع المدني في عصر النبوة للعمري، (ص ٤١).

هەروەها جوهەیمی کوڕی سەڵتی کوڕی موتتەلیب بە هەمان شێوە خەونێکی بینیبوو کاتێك قورەیش لە جوحفە دابەزین، ئەو لە خەونیدا پیاوێکی بینیبوو، بەسەر ئەسپێکەوە دێت و ڕادەوەستێت و وشترێکیشی پێیە و دەڵێت: عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە و ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام و ئومەییەی کوڕی خەلەف و فلان و فلان کوژران، چەند ناوێکی تریشی باس کردبوو لەوانەی لە بەدر کوژران و، ئینجا وشترەکەی سەربڕی و بەرەڵای کردە ناو سەربازگەکە و جێگا نەما لەناو ئەو سەربازگەیە خوێنی ئەو وشترەی بەر نەکەوێت، کاتێك ئەبو جەهل هەواڵی ئەم خەونەی پێگەیشت، وتی: ئەوەیش پێغەمبەرێکی ترە لە نەوەی عەبدولموتەلیب دەزانێت سبەی کێ لە ئێمە دەکوژرێت کە دەستەویەخە بووینەوە.[1] ئەو خەونانە کاریگەری خراپی خۆیان بوو لەسەر ورەی ئەوان.

---

١ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٣٣).

## باسی دووەم: پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان لە گۆڕەپانی جەنگدا.

### یەکەم: دروست کردنی کەپری سەرکردایەتی.

پاش دابەزینی پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان لەسەر نزیکترین ئاوی بەدر لە بتپەرستانەوە، سەعدی کوڕی موعاز پێشنیاری کردە سەر پێغەمبەر ﷺ کەپرێك بۆ سەرکردایەتی دروست بکرێت و دوور بێت لە مەترسی دوژمنان، سەعد لە میانەی پێشنیارەکەیدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا کەپرێکت بۆ دروست نەکەین تیایدا بمێنیتەوە و، دوای ئەوە ڕووبەڕووی دوژمنانمان ببینەوە، ئەگەر خوای گەورە سەری خستین ئەوەیە کە پێمان خۆشە، ئەگەر ئەوەکەی تریش بوو دەچینە سەر یەکێك لە وڵاخەکان و دەگەڕێینەوە لای ئەوانەی لە مەدینە ماونەتەوە، چونکە کەسانێك لەوێ بەجێمان ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە ئەوان زیاتر تۆمان خۆش ناوێت، ئەگەریش بیانزانیبا تووشی شەڕ دەبین دوا نەدەکەوتن، بەڵکو خوای گەورە بە ئەوان بەرگریت لێ بکات و بانگەواز و جیهادت لەگەڵدا بکەن، پێغەمبەر ﷺ ستایشی سەعدی کرد و دوعای چاکەی بۆ کرد، ئینجا موسڵمانان کەپرەکەیان دروست کرد بۆ پێغەمبەر ﷺلەسەر تەپۆلکەیەك کە زاڵ بوو بەسەر گۆڕەپانی شەڕەکەدا، ئەبو بەکریش (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کەپرەکە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوو، کۆمەڵێکیش لە لاوانی ئەنصارِ بەسەرکردایەتی سەعدی کوڕی موعاز پاسەوانێتی کەپرەکەیان دەکرد.[1]

هەندێك لە سوودەکانی دروستکرنی کەپرەکە:

١- پێویستە جێگای سەرکردایەتی بەرزتر بێت لە شوێنی شەڕەکە بۆ ئەوەی سەرکردە بتوانێت بەدواداچوون و بەڕێوەبردنی شەڕەکە بە ئەنجام بگەیەنێت.

٢- پێویستە بارەگای سەرکردایەتی جیایەکی ئارام بێت و پاسەوانێتی پێویستی هەبێت.

---

١ ـ بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٣٣).

٣- پێویستە بایەخ بدرێت بە ژیانی سەرکردە و دوو بخرێتەوە لە مەترسی.

٤- پێویستە سەرکردە هێزێکی یەدەکی هەبێت بۆ قەرەبوو کردنی ئەو زیانانەی لە گۆڕەپانی جەنگدا ڕوو دەدەن.[١]

## دووەم: هەندێك لە نیعمەتەکانی خوا لەسەر موسڵمانان پێش شەڕەکە.

یەکێك لەو نیعمەتانەی خوای گەورە منەتی کردووە بەسەر موسڵماناندا لە ڕۆژی بەدر ئەوە بوو وەنەوز و بارانی بەسەردا دابەزاندن، پێش ئەوەی ڕووبەڕوو ببنەوە لەگەڵ دوژمنەکانیان، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴾(الانفال: ١١).

قورتوبی دەفەرموێت: ئەو خەوهاتنە لەو شەوەدا بوو کە بە ڕۆژی دواییدا شەڕەکە هەڵگیرسا، خەوەکە زۆر سەر سووڕهێنەر بوو لەو کاتە ناڕەحەتەدا، وەکو چۆن خوای گەورە خۆی دڵی دامەزراندن و قایمی کرد.

عەلیؓ دەفەرموێت: سوارمان تیا نەبوو تەنها میقداد نەبێت بەسەر ئەسپێکی بەڵەکەوە بوو، ئەو شەوە هەموومان خەومان لێکەوت تەنها پێغەمبەرﷺ خۆی نەبێت تاکو بەرەبەیان نوێژی دەکرد و دەگریا لەژێر دارەکە.

سەبارەت بە نیعمەتی خەو برانەویان لەو شەوەدا، بە دوو شێواز لێك دەدرێتەوە:

١- بەبۆنەی ئەو خەوەوە بەهێزی کردن لەسەر شەڕکردن لە ڕۆژەکەیدا.

٢- هێمن و دڵنیای کردنەوەی بە لابردنی ترس و بیم لە دڵەکانیان، وەکو وتراوە: هێمنی خەو هێنەرە و، ترس خەو لابەرە.[٢]

خوای گەورەیش ڕوونی کردەوە بۆ ئیمانداران کە چاکەی لەگەڵ کردن بە باراندنی باران، کە وەرزی بارانیش نەبوو، وەکو فەزڵ و چاکەیەك.

---

١ ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى، (٦٦).

٢ ـ بڕوانە: تفسیر القرطبي (٧/٣٧٢).

خستنە پاڵی باراندنەکەش بۆ خوای گەورە بۆ ئاگادارکردنەوەیە کە خوای گەورە چاکەی لەگەڵیاندا کردووە.

پێشەوا ڕازی دەفەرموویێت: زانراویشە بە باو کە کەسی ئیماندار قیزی لە خۆی دێتەوە کاتێك لەشی گران بێت و غەمگین دەبێت ئەگەر نەتوانێت خۆی بشوات، بێگومان ئاسان کردنی خۆشۆردنی موسڵمانان لەو کاتەدا یەکێکە لە نیعمەتەکانی.[١]

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دابەزی – واتە کاتێك ڕۆیشت بەرەو بەدر، لە نێوان موسڵمانان و ئاوەکەدا خۆڵێکی زۆر هەبوو کۆبوویەوە – موسڵمانان تووشی لاوازیەکی زۆر بوو، شەیتانیش تووڕەبوونێکی زۆری خستە دڵەکانیان و گومانی بۆ دروست کردن، ئێوە بانگەشەی ئەوە دەکەن خۆشەویستی خوان و پێغەمبەرتان تیایە و وا بتپەرستەکان پێش ئێوە دەستیان گرتە سەر ئاوەکەوە و ئێوە بە لەش گرانی دەگەن، ئیتر خوای گەورە بارانێکی زۆری بۆ باراندن وە موسڵمانان لێیان خواردەوە و خۆیان پێ پاك کردەوە و گومانەکانی شەیتانی لەسەر لابردن، خۆڵەکەیش پاش بارانەکە لە جێگای خۆی جێگیر بوو، خەڵکەکە و وڵاخەکان لەسەری ڕێیان کرد بەرەو لای بتپەرستەکان.[٢]

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە بارانی باراندووەتە سەر بەندە ئیماندارەکانی پێش هەڵگیرسانی شەڕەکە، ئەوانیش لە ڕووی هەست و واتاییەوە خۆیان پێ پاك کردەوە، چونکە خوای گەورە دڵەکانیانی بەهێز کرد و پێیانی جێگیر کرد، چونکە هەر کەسێك تەماشا بکات لە ناوچەی بەدر لمێکی جوڵاوەی زۆر دەبینی تاکو ئەمڕۆیش هەر هەیە، زۆر گرانیشە ڕێکردن لەسەری، چونکە تۆزی زۆری هەیە. جا کاتێك بارانەکە باری لمەکە خۆی گرت و ڕێکردن ئاسان بوویەوە لەسەری و تۆزەکەی دامرکا، هەموو ئەوەش نیعمەتێکی خوای گەورە بوو لەسەر بەندەکانی.[٣]

---

١ ـ بڕوانە: تفسير الفخر الرازي (١٣٣/١٥).

٢ـ بڕوانە: تفسير الطبري (١٩٥/٩).

٣ ـ بڕوانە: حديث القران عن غزوات الرسول (٩١/١).

## سێیەم: پلانی پێغەمبەر ﷺ لە جەنگەكە.

لە ڕۆژی هەڵگیرسانی شەڕی بەدر، پێغەمبەر ﷺ شێوازێكی نوێی داهێنا بۆ جەنگ كردن لەگەڵ دوژمنانی خوا، پێش ئەو ڕۆژە زانراو نەبوو ئەو شێوازە لە شەڕكردن، ئەویش بریتی بوو لە سیستەمی ڕیزبەندی،[1] كە قورئان ئاماژەی بۆ دەكات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ﴾ (الصف: ٤).

شێوازەكەشی بەم جۆرە دەبێت: جەنگاوەرەكان بە وێنەی ڕیزەكانی نوێژ ڕادەوەستن، ئیتر ئەو ڕیزانەش بەپێی زۆر و كەمی ژمارەیان زیاد و كەم دەكات، ڕیزە یەكەمەكان لە هەڵگرانی ڕم دەبن بۆ شكاندنی هێرشی سوارەكان، ڕیزەكانی دوای ئەوانیش تیر هاوێژ دەبن بۆ ئەوەی تیرەكانیان ئاراستەی دوژمنان بكەن، لە سوودەكانی ئەم شێوازەیش لە جەنگی بەدردا:

١- تۆقاندنی دوژمنان و ئاماژەیش بوو بۆ جوانی ڕێكخستن لە لای موسڵمانان.

٢- بواری هێشتەوە لە دەستی سەركردەی گشتی كە هێزێكی یەدەكی لا بمێنێتەوە بۆ چارەسەركردنی هەلوێستی لە ناكاو و شكاندنی دژە هێرش، یان لێدانی هێزێكی نادیاری چاوەڕوان نەكراو، هەروەها سوودی لێ وەرگیرا بۆ پاراستنی باڵەكان لە مەترسی پیادە و سوارەكان، جێ بەجێكردنی ئەم شێوازە بە دەست پێشخەرییەكی سەربازی دەژمێردرێت بۆ قوتابخانەی سەربازی، چونكە بۆ یەكەمجار بوو لەو شەڕەدا بەكارهێنرا پێش هەزار و چوار سەد ساڵ.[2]

توێژەری ژياننامەی پێغەمبەر ﷺیش بۆی دەردەكەوێت، كە پێغەمبەر ﷺ لە ناكاو هەندێ شێوازی سەربازی داهێنراوی لە دژی دوژمنەكانی بەكاردەهێنا، بە تایبەتی ئەو شێوازانەی كە پێشتر عەرەب پێی ئاشنا نەبوون، وەكو ئەوەی لە ڕۆژی جەنگی بەدر و ئوحود ئەنجامی دا لەگەڵیان.

---

١ـ بڕوانە: القيادة العسكرية، د. محمد الرشيد (٤٠١).

٢ ـ بڕوانە: الرسول القائد، خطاب (ص١١١، ١١٦، ١١٧).

لە ڕووی سەربازیشەوە لە ڕاستیدا ئەم شێوازانە مایەی سەرسام بوونە بە کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ و لێهاتوویی سەربازی، چونکە فەرمان و ئاراستە سەربازییەکانی کە دەری دەکرد هاوشێوەی بنچینە نوێیەکانە لە بەکارهێنانی هێزی سەربازیدا.[1]

شیکردنەوەکەشی ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ شێوازی بەرگری کردنی ڕەچاو کرد و هێرشی نەکردە سەر هێزی قورەیش، ئاراستە تەکنیکییەکانی کە سەربازەکانی جێ بەجێیان کرد هۆکارێك بوون بۆ جووڵەپێکردنی ناوەندی دوژمن و دابەزاندنی ورەیان، بەم شێوەیش سەرکەوتنی تەواو لەسەر دوژمن بەدەست هات بە پشتیوانی خوای گەورە، سەرەڕای ئەوەی هێزی ئەوان سێ بەرامبەر هێزی ئەوان بوون، چونکە پێغەمبەرﷺ لە هەموو هەڵوێستێکدا بەپێی بەرژەوەندی هەڵسوکەوتی دەکرد، ئینجا پێغەمبەرﷺ لە لایەنی سەربازییەوە شێوازی سەرکردایەتی ئاراستەکردنی لە جێگای گونجاوی خۆیدا بەکارهێنا، هەروەها کارکردنی بە شێوازی قایل کردن لە غەزای بەدردا لە ڕاوێژەکانی پێغەمبەرﷺ ڕەنگی دەدایەوە و لە چەندین جێگەدا، چونکە ئەو سەرکردایەتی سەربازەکانی نەدەکرد بەپێی دەسەڵات بەڵکو بەپێی لێهاتوویی و متمانە، هەروەها پێغەمبەرﷺ سوور نەبوو لەسەر چەسپاندنی بیروبۆچوونی خۆی، بەڵکو ڕاوێژی دەکرد و بیروبۆچوونی پەسەندی وەردەگرت، هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە غەزای بەدردا هەستا بەجێ بەجێکردنی شێوازی سەرکردایەتی ئاراستەکردن، ئەوەیش لە چەند مەسەلەیەکدا دەرکەوت:

١- فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵان کە تیر بهاوێژنە دوژمنەکانیان کاتێك نزیك بوونەوە، چونکە لەو حالەتە زیاتر دەیپێکێ ((ان دنا القوم منکم فانضحوهم بالنبل))[2] واتە: ئەگەر دوژمن لێتان نزیك بوونەوە تیر بارانیان بکەن.

٢- قەدەغەکردنی بۆ هەڵکێشانی شمشێر تاکو ڕیزەکانیان بچن بەیەکدا[3] ((ولا

---

١ ـ المدخل الى العقيدة والاستراتيجية العسكرية، د. محمد محفوظ (١٢١).

٢ ـ صحيح السيرة النبوية برواية اخرى ونفس المعنى (٢٣٩).

٣ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى، ص (٦٣-٦٤) لأبي فارس.

تسلوا السیوف حتی یغشوکم)) واتا: شمشێرەکانتان هەڵمەکێشن تاکو دێنە ناوتانەوە.

٣- فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵان کە کەم تیر بهاوێژن: ((واستبقوا نبلکم))[١] کاتێك ئەم ئاراستە سەربازیانە بەراورد دەکەیت بە بنەما نوێیەکان لە بەرگریدا، دەبینی پێغەمبەر ﷺ دەست پێشخەر بووە، بەبێ خەریك بوون بە توێژینەوە و ڕۆیشتن بۆ هیچ کۆلێژێکی سەربازی، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامیدا لە بەدر ئەمڕۆ بە دامرکانی ئاگر دەناسرێت تاکو ئەو کاتەی دوژمن دەکەوێتە جێگای کاریگەر بۆ چاکەکان، پێغەمبەر ﷺیش هەمان مەبەستی هەبوو کاتێك فەرمووی: ((واستبقوا نبلکم)).

أ- هەلی سوود وەرگرتن لە بارودۆخی سروشتی لە کاتی شەڕی دوژمناندا، پێغەمبەر ﷺ ئەم هەلەی پشت گوێ نەخست، بەڵکو لە هەموو بارودۆخەکان سوودی وەردەگرت لە گۆڕەپانی جەنگ بۆ بەرژەوەندی سوپا، مەقریزی دەڵێت: ((پێغەمبەر ﷺ لە پێش قورەیشەوە گەیشتە بەدر، لە کاتی خۆرهەڵاتن پێغەمبەرﷺ خەریکی ڕێکخستنی ڕیزەکان بوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە خۆرئاوا و ئەوان ڕوویان کەوتە خۆرەوە))[٢].

ئەم کارەیش بەڵگەیە لەسەر بەڕێوەبردنی جوانی پێغەمبەر ﷺ و سوود وەرگرتنی لە بارودۆخە سروشتیەکان، هۆکاری ئەوەیش ئەوە بوو چونکە خۆر ئەگەر ڕووبەڕووی جەنگاوەر بێت بینینی تێك دەدات و بەرگری کردنی کەم دەکاتەوە لە ڕووی دوژمن،[٣] لەو کردارەی پێغەمبەر ﷺیش بۆمان دەردەکەوێت کە خۆر و با و کەش و هەوا و... کاریگەریان هەیە لەسەر هێزەکان لە کاتی جەنگدا، خوای گەورەش داوای لێمان کردووە ئەو جۆرە هۆکارانە وەربگرین بە مەبەستی سەرکەوتن.[٤]

---

١ ـ البخاري: کتاب المغازي، باب فضل من شهد بدرا رقم (٣٩٨٤، ٣٩٨٥).

٢ ـ بڕوانە: القیادة العسکریة، (٤٥٣).

٣ ـ بڕوانە: تحفة الاحوذي بشرح جامع الترمذي (١٧٥/٧).

٤ ـ بڕوانە: القیادة العسکریة في عهد الرسول (ص٤٥٤).

ب- سەوادی کوڕی غەزییە لەنێو ڕیزەکاندا:
پێغەمبەر ﷺ لە بەدردا ڕیزەکانی ڕێك دەخست بۆ ئەوەی ڕێك و پێك بن، تیرێکی بە دەستەوە بوو بۆ ئەو مەبەستە نووکی پێوە نەبوو، پیاوێکی بینی ناوی سەوادی کوڕی غەزییە بوو لەنێو ڕیزەکاندا دەرچووبوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەو تیرە لە سکی دا و پێی وت: ڕێك ڕاوەستە ئەی سەواد، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئازارت دام، خوای گەورەش تۆی بە ڕاستی دادوەری ناردووە، من داوای تۆڵەی خۆم دەکەم، پێغەمبەر ﷺ پۆشاکەکەی لەسەر سکی خۆی هەڵماڵی و فەرمووی: تۆڵەی خۆت بکەرەوە، ئەویش باوەشی پێی کرد و سکی ماچ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی وای لێ کردی ئەو کارە بکەی؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەبینی ئێمە لەم حاڵەتە داین، حەزم کرد کۆتایی پەیمان ئەوە بێت پێستم لە پێستت بدات، ئیتر پێغەمبەر ﷺ دوعای خێری بۆ کرد.[1]

ئەم بەسەرهاتە چەند سوودێکی تیابوو:

١- جەختکردنەوەی ئیسلام لەسەر ڕێکخستن.

٢- دادگەری ڕەها: چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو تۆڵە لە لاخودی خۆی بکرێتەوە.

٣- خۆشەویستی سەرباز بۆ سەرکردەکەی.

٤- وەبیر هێنانەوەی مردن و شەهیدی.

٥- لاشەی پێغەمبەر ﷺ پیرۆزە، دەست پێوەدانیشی پیرۆزە، بۆیە سەواد لەسەر ئەوە سوور بوو.

٦- سکی پیاو عەورەت نییە، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئاشکرای کرد، ئەگەر عەورەتیش نەبوایە ئاشکرای نەدەکرد.[2]

ج- هاندانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی لەسەر شەڕکردن:
پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی لەسەر ئەوە پەروەردە دەکرد کە خاوەنی تین و

---

١ـ صحيح السيرة النبوية (ص٢٣٦).
٢ـ بڕوانە: غزوة بدر الكبرى، لأبي فارس (٥٢).

ورەی بەهێز و پتەو بن، دڵیانی پڕ دەکرد لە ئازایی و بوێری و هیوا بە سەرکەوتنە سەر دوژمناندا، بۆ ئەو مەبەستەیش شێوازی هاندان و ترساندنی بەکاردەهێنا، هاندان بۆ پاراستنی موجاهیدان و ترسان لە هەڵاتن لە ڕۆژی جەنگدا، هەروەها باسی هۆکارەکانی سەرکەوتنی بۆ دەکردن بۆ ئەوەی کاری پێ بکەن و، وریای دەکردنەوە لە هۆکارەکانی بەزین بۆ ئەوەی لێی دوورکەونەوە،[1] پێغەمبەر ﷺ هانی هاوەڵانی دەدا لەسەر جەنگ کردن وەکو گوێڕایەڵیەك بۆ فەرموودەی خوای گەورە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴾ (الانفال: ٦٥).

لە غەزای بەدری گەورەدا پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: هەستن بۆ بەهەشتێك پانایی ئاسمانەکان و زەوی هەیە، عومەیری کوڕی حومامی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: بەه بەه (ئەوەندە پێی سەرسام بوو).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی دەڵێی بەه بەه؟

وتی: نە سوێند بە خوا تەنها لەبەر ئەوەی یەکێك بم لەوانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ یەکێکی لەوانە.

ئەویش چەند خورمایەکی لە تیردانەکەی دەرهێنا و دەستی کردە خواردنیان و دوای ئەوە فەرمووی: ئەگەر من ئەوەندە بمێنم تاکو ئەو خورمایانە تەواو بکەم، ئەوە تەمەنێکی درێژە، ئینجا ئەو چەند خورمایەی فڕێدا و شەڕی کرد تا کوژرا.[2]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، ئەنەس فەرمووی: ئەو خورمایانەی فڕێدا و وتی:

رکـضا الى الله بغـير زاد    الا التقـى وعمـل المعـاد

والـصبر فى الله علـى الجهـاد    وكـل زاد عرضـة النفـاد

غير التقى والبر والرشاد

---

١ـ بڕوانە: المدرسة النبوية العسكرية لأبي فارس (١٤٠).

٢ ـ بڕوانە: مختصر صحيح مسلم للمنذري (٢/٧٠)، رقم (١١٥٧) ورقمه في الصحيح (١٤٥– (١٩٠١)).

ئیتر شەڕی کرد تاکو شەهید بوو، ڕەحمەتی خوای لێ بێت.[1]

یەکێکی تر لە شێوازەکانی ئامادەکردنی واتایی ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ مژدەی کوژرانی پیاوە ئازاکانی قورەیشی بە موسڵمانان دەدا، وەکو زیادەیەك لە دڵنیایی جێگای کوژرانەکەشی دیاری دەکرد، هەروەها مژدەی دەدا بە ئیمانداران بە سەرکەوتن پێش دەست پێکردنی شەڕەکە و دەیفەرموو: مژدە بێت ئەی ئەبو بەکر.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەرانبەر هاوەڵان ڕاوەستا و فەرمووی:

سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەمڕۆ هەر کەسێك شەڕیان لەگەڵ بکات و بکوژرێت و دانی بە خۆیدا گرتبێت و چاوەڕوانی پاداشت بکات و هەڵنەهاتبێت، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە.[2]

ئەم شێوە ئامادە کردنەیش کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر دەروونی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت) هەروەها لەسەر ئەوانەیش پاش ئەوان هاتن.[3]

د- دوعاکردن و پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ (الانفال: ٩).

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ڕیزەکانی سوپاکەی ڕێکخست و فەرمانەکانی دەرکرد و هانیدان لەسەر شەڕکردن، گەڕایەوە بۆ کەپرەکەی لەگەڵ ئەبو بەکردا (ڕەزای خوای لێ بێت)، سەعدی کوڕی موعازیش لە دەرگای کەپرەکە شمشێرەکەی هەڵکێشابوو پاسەوانێتی دەکرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە پەروەردگاری دەپاڕایەوە و داوای ئەو سەرکەوتنەی دەکرد کە بەڵێنی پێداوە، لە پاڕانەوەکەیدا دەیفەرموو:

خوایە ئەوەی بەڵێنت پێداوم بۆم بەجێ بهێنە، خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لەناو

---

١ـ بڕوانە: صفة الصفوة (٤٨٨/١)، زاد المعاد (١٨٢/٣)، تأريخ الطبري (٤٤٨/٢).

٢ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (٢٣٩/١).

٣ـ المدرسة العسكرية الاسلامية لأبي فارس (١٤٣).

بچن لە هەڵگرانی ئیسلام ئیتر ناپەرستریێت لەسەر زەوی، ئەوەندە پاڕایەوە و هاواری کرد تاکو پۆشاکەکەی لەسەر شانی کەوتە خوارەوە، ئیتر ئەبو بەکر هەڵی گرت و خستیەوە سەر شانی و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بەستە پاڕانەوە لە پەروەردگارت ئەو بەڵێنی خۆی بەجێ دەهێنێت بۆت،[1] خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إذ تستغيثون ربكم فاستجاب لكم﴾ لە ڕیوایەتی ئیبنو عەباسدا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی بەدر فەرمووی: خوایە من داوای بەڵێن و پەیمانەکەت لێ دەکەم، خوایە ئەگەر بتەوێت ئیتر ناپەرستریێت، ئیتر ئەبو بەکر دەستی گرت و فەرمووی: خوای گەورە بەستە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەرچوو و دەیفەرموو: ئەو کۆمەڵە دەشکێن و پشت هەڵ دەکەن.[2]

ئیبنو ئیسحاق دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوایە ئەوە قورەیشە بە لەخۆبایی بوون و شانازی کردنەوە هاتووە دژایەتیت دەکات و پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخاتەوە، خوایە گیان کوا سەرکەوتنەکەت کە بەڵێنت پێدام.[3]

ئەمەیش وانەیەکی پەروەردگارانەی گرنگە بۆ هەموو سەرکردەیەك یان سەرۆك و سەرگەورەیەك، یان تاکە کەسێکدا، کاتێك کە واز لە دەروونی خۆی دەهێنێت و پەنا دەباتە تەنها خوای گەورە و کڕنووش بردن بۆ تەنها خوای پەروەردگار، بۆ ئەوەی سەرکەوتن دابەزێتە سەریان، دیمەنی پێغەمبەریش ﷺ کە پۆشاکەکەی لەسەر شانی کەوتە خوارەوە ئەوەندە پاڕایەوە، دیمەنێکە هەڵکۆڵاوە لەسەر دڵەکاندا، لەو جۆرە ساتانەدا.[4]

هـ- ((وما رميت إذ رميت ولكن الله رمى)):

پاش پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کەپرەکە و، هاوارکردنی بە پەروەردگاری لە کەپرەکە دەرچوو، ئینجا مشتێك خۆڵی هەڵگرت و کردی بە ڕووی بتپەرستەکانداو فەرمووی: ((شاهت الوجوه)) واتە: ڕووخسارەکانتان قێزەون بێت.

---

١ـ بڕوانە: مسلم، كتاب الجهاد، باب الامداد بالملائكة ببدر (٣٨٤/٣).

٢ـ البخاري، كتاب المغازي، باب قصة بدر (٦/٤)، رقم (٣٩٥٣).

٣ـ بڕوانە: البداية والنهاية (٢٦٧/٣).

٤ ـ بڕوانە: التربية القيادية (٣٦/٣).

ئینجا فەرمانی کردە هاوەڵان هەمان کارەکەی ئەو بکەن و خوای گەورە هەموو ئەو خۆڵانەی گەیاندە چاوی بتپەرستەکان و کەسیان نەما بەری نەکەوێت، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ (الانفال: ١٧).

واتای ئایەتەکەیش ئەوەیە خوای گەورە دەست پێکردنی خۆڵ فڕێ دانەکەی بۆ پێغەمبەرەکەی جێگیر کردووە، بەڵام گەیاندنەکەی بۆ ئەو جێگیر نەرکردووە، چونکە فڕێدان واتا تێگرتن و گەیاندن، جا تێگرتنی چەسپاند بۆ پێغەمبەرەکەی و گەیاندنی بۆ ئەو جێگیر نەکرد.[1]

تێبینی ئەوە دەکەین کە پێغەمبەرﷺ هۆکارە مادی و واتاییەکانی وەرگرت و، پشتی بە خوای خۆی ئەستوور بوو، بۆیە سەرکەوتن و پشتگیری لە لای خوای گەورەوە هات، لە غەزای بەدردا هۆکارەکان بە گوێرەی توانا کۆبوویەوە لەگەڵ یارمەتیدانی خوای گەورە لە ئامادەکردنی هەموو هۆکارەکانی سەرکەوتن و، لە جیهانی هۆکارەکاندا، لێکۆڵینەوەی زەوی و کەش و هەوا و، بوونی سەرکردایەتی و متمانە پێ بوونی، هەروەها ورەی بەرز، ئەمانە هەمووی چەند خاڵێکی سەرەکی بوون بۆ پەسەندی بڕیاری سەربازی، لە ڕاستیشدا زەوی لە بەرژەوەندی موسڵماناندا بوو، کەش و هەوایش گونجاو بوو بۆ شەڕکردن، سەرکردایەتی باڵایش بوونی هەبوو، هاوکات لەگەڵ متمانەی زۆر بە ئەو سەرکردایەتییە و، ورەی بەرز، هەندێك لەم واتایانە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە خوای گەورەوە بوو، هەندێکیشی لە کرداری پێغەمبەرﷺەوە بوو بە ڕێگەی کارکردنی بە هۆکارەکان، جگە لەمەش پشتگیری نادیاری لە ئاسا بەدەریش هەبوو، ئەمانەش پێکەوە نموونەیەکە لەسەر ئەوەی بە موسڵمانان دەبەخشرێت ئەگەر نیەتەکان پاك بنەوە بۆ خوای گەورە وە موسڵمانان کار بکەن بە هۆکارەکان.[2]

---

١ـ بڕوانە: زاد المعاد (٣/١٨٣).

٢ ـ بڕوانە: الاساس في السنة وفقهها ,السيرة النبوية (١/٤٧٤).

## باسی دووەم: هەڵگیرسانی جەنگ وشکستهێنانی بتپەرستان.

سەرەتا شەڕەکە بە ڕووبەڕووبوونەوەی تاکە کەسی دەستی پێکرد، لە سوپای بتپەرستان عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی برای و وەلیدی کوڕی دەرچوون و داوای زۆرانبازیان کرد، سێ کەس لە ئەنصارەکان بۆیان دەرچوون، بەڵام پێغەمبەرﷺ گێڕانیانیەوە و حەزی کرد هەندێك لە خزم و کەسەکانی خۆیان ڕووبەڕوویان ببنەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەستە عوبەیدەی کوڕی حارس، هەستە حەمزە، هەستە عەلی، حەمزە بەرامبەری شەیبەی گرت و کوشتی، هەروەها عەلی بەرامبەر وەلیدی گرت و کوشتی، عوبەیدەی کوڕی حاریسیش بەرامبەری عوتبەی گرت و هەریەکێکیان بە لێدانێکی کاریگەر لەوەی تری دا، بەڵام حەمزە و عەلی گەڕانەوە سەر عوتبە و کوشتیان، عوبەیدەشیان هەڵگرت و بردیانە لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵام زۆری پێ نەچوو، بە کاریگەری برینەکەی گیانی سپارد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((اشهد انك شهيد))[١].

واتە: من شایەتم لەسەر ئەوەی تۆ شەهیدی، لەو شەش کەسەیشدا ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ (الحج: ١٩-٢٤).

---

١ـ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/١٢٦).

بتپەرستان زۆر تووڕە بوون بە بینینی ئەو سێ کەسەیان کە کوژران، هێرشێکی فراوانیشیان کردە سەر موسڵمانان، کە ئەوپەڕی خۆڕاگریان پێشاندا، لە کاتێکدا ئەوان هەڵوێستی بەرگریان وەرگرتبوو، بە تیریش لێیان دەدان و، دروشمی موسڵمانان لەو ڕۆژەدا (أحد أحد) بوو، دوای ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردن دژە هێرش بکەن و هانی دان لەسەر شەڕکردن و پێی فەرموون: هێرش بکەن، پەیمانی بە هەموو کەسێکیشدا بکوژرێت و خۆڕاگر بێت و چاوەڕوانی پاداشت بکات، کە دەچێتە بەهەشتەوە، ئەوەشی چالاکی موسڵمانانی زیاد کرد ئەوە بوو لە پێغەمبەرﷺیان دەبیست دەیفەرموو: ﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴾ (القمر: ٤٥).

هەروەها زانینیان و هەستکردنیان بە یارمەتی فریشتەکان و کەم کردنەوەی دوژمنان لە چاوی موسڵمانان و کەم کردنەوەی موسڵمانان لە چاوی بتپەرستاندا،[1] چونکە پێغەمبەر ﷺ شەوی پێش بەیەکگەیشتنی هەردوو سوپاکە، ژمارەی بتپەرستانی لە خەونیدا بینی کەم بوون، ئەو خەونەشی گێڕایەوە لای هاوەڵانی و ئەوانیش وەکو مژدەیەك تەماشای ئەو خەونەیان کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلًا وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ (الانفال: ٤٣). واتە: پێغەمبەر ﷺ لە خەونیدا بتپەرستانی بینی بە کەمی و ئەو خەونەشی بۆ هاوەڵانی گێڕایەوە، ئەویش هۆیەك بوو بۆ خۆڕاگری ئەوان، موجاهید دەڵێت: ئەگەر بێت و لە خەونەکەیدا بە زۆری بیبینیایەن هەرەسیان دەهێنا و دەترسان لە کاتی جەنگدا و، ناکۆکی دەکەوتە نێویان: ئایا شەڕیان لەگەڵ بکەن یان نا؟ شێوازی ئایەتەکەش ڕابووردوو دەگەیەنێت، چونکە دابەزینی ئایەتەکە پاش خەونەکە بوو ((ولكن الله سلم))، واتە: پاراستنی لە هەرەس و ناکۆکی و کەمی کردنەوە لە چاوی پێغەمبەرداﷺ،[2] لەکاتی پێکدادانی هەردوو سوپاکە، هەر یەکە و ژمارەی ئەو

---

١ـ بڕوانە: الرحيق المختوم (ص ١١٦-١١٨).

٢ ـ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/١٢٥).

سوپاکەی بە کەم دەهاتە پێش چاو، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ (الانفال: ٤٤).

کەم کردنەوەشیان لە چاوی موسڵماناندا وەکو ڕاست خستنەوە بۆ خەونەکەی پێغەمبەرﷺ بوو، بۆئەوەی باسکرا بۆیان بەچاوی خۆیان ببینن و زۆرتر دڵنیا بن و لە کاتی شەڕدا خۆڕاگر بن، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموویێت: بە پیاوێکم وت بە تەنیشتمەوە بوو: ئایا ژمارەیان حەفتا کەس دەبێت؟ وتی: بەڵکو وا دەزانم سەد کەس بن، ئینجا پیاوێکیان بە دیل گرت لە ئەوان و پێیان وت ژمارەتان چەند بوو؟ وتی: هەزار کەس، ئەوەیش کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ويقللكم في أعينهم﴾ تەنانەت کەسێك لە بتپەرستەکان وتیان: ئەوانە بەرخ خۆرن، سۆز و بەزەیی خوایش لەو کەم کردنەوەیەدا ئەوەبوو جێگیربوون و چالاك بوونەوە و، ورەیان بۆ شەڕکردن بەرزبوویەوە، کەم کردنەوەی ژمارەی موسڵمانان لە چاوی بتپەرستاندا بۆ ئەوە بوو، کاتێك ئەوان موسڵمانانیان بە کەمی بینی بەبێ ترس و وریایی هێرشیان کرد، بەڵام کاتێك دەستەویەخەوە بوونەوە سەرسام بوون و شکانەوە، چونکە مەزەندەیان هەڵەبوو، ئەوەیش هۆیەك بوو بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان و تێکشکاندی بتپەرستان.[١]

**یەکەم: یارمەتیدانی خوای گەورە بۆ موسڵمانان بە فریشتە:**

جێگیربووە بە دەقی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرﷺ و ڕیوایەتی ژمارەیەك لەو هاوەڵانەی بەشداری جەنگی بەدریان کرد کە خوای گەورە ترس و بیمی خستە دڵی بتپەرستانەوە، وەکو دەفەرموویێت: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ۚ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ (الانفال: ١٢).

---

١ـ بڕوانە: تفسير الزمخشري (٢/٢٢٥)، تفسير ابن كثير (٢/٣١٥).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾(ال عمران: ١٢٣-١٢٦).

چەند ڕیوایەتێکی ڕاستیش هاتووە لە ڕێگەی بوخاری و موسلیم و ئەحمەدی کوڕی حەمبەلەوە،ئاماژە دەکەن بۆبەشداری کردنی فریشتەکان لەجەنگی بەدردا و، هەڵسانیان بە لێدان و کوشتنی بتپەرستان.[١]

ئیبنو عەبباسﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموویت: لە کاتێکدا یەکێك لە موسڵمانان بە توندی ڕایدەکرد بە دوای یەکێك لە بتپەرستاندا، گوێی لێ بوو یەکێك بە قامچی لە سەرەوە لەو پیاوەی دا، دەنگی سوارەکەیشی دەهات و دەیوت: بڕۆ حەیزوم،[٢] ئیتر تەماشای بتپەرستەکەی کرد لە پێش خۆیدا کەوتە خوارەوە، دوای ئەوە تەماشای کرد شوێنەواری لێدانەکە لەسەر لووتی ماوەتەوە، ئەنصارییەکە هات و باسی ئەم ڕووداوەی کرد و پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەیت، ئەمە یارمەتی ئاسمانی سێیەمە،[٣] هەروەها لە فەرموودەکەی ئیبنو عەبباسدا هاتووە کە فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی بەدردا فەرمووی: (ئەوە جیبریلە سەری ئەسپەکەی گرتووە و کەرەستەی شەڕی لەبەر کردووە)،[٤] لە فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبی تالیبدا ڕەزای خوای لێبێت هاتووە فەرموویەتی : پیاوێك لە ئەنصارەکان کورتە باڵابوو ، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی بەدیلی گرت ، عەباس

---

١ـ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم في مكارم اخلاق الرسول الكريم (١/٢٩١).

٢ـ ناوی ئەو ئەسپەیە کە فریشتەکە سواری دەبوو.

٣ـ مسلم — الجهاد، باب الامداد بالملائكة، رقم (١٧٦٣).

٤ ـ البخاري — المغازي، باب شهود الملائكة بدرا، رقم (٣٩٩٥).

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا ئەم پیاوە منی بەدیل نەگرت، بەڵکو پیاوێك منی دیل کرد سەری ڕووتابووەوە، ڕوخسارێکی زۆر جوانی هەبوو، لەسەر ئەسپێکی بەڵەك بوو، وانازانم لە ئێوە بێت، ئەنصارییەکە وتی: من دیلم کرد ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی : (اسکت فقد ایدك الله بملك)[1] واتە: بێ دەنگ بە، چونکە خوای گەورە پشتگیری تۆی کردووە بە فریشتەیەك، لە فەرموودەی ئەبو داودی مازنیشدا هاتووە، فەرموویەتی: بە دوای یەکێك بووم لە بتپەرستان بۆ لێدانی بەڵام ئەو لە گەردنی درا پێش ئەوەی شمشێرەکەی منی پێ بگات، بۆیە زانیم کە جگە لە من یەکێکی تر کوشتی.[2]

((یارمەتیدانی خوای گەورە بۆ موسڵمانان بە فریشتە مەسەلەیەکی براوەیە و گومان نییە لە جێگیر بوونیدا، حیکمەتیش ئەوە بوو ببێتە هۆکارێك بۆ سەرخستنی موسڵمانان، ئەمەیش بوو کە ڕوویدا بە دابەزینی فریشتەکان، چونکە ئەوان هەڵسان بە ئەنجامدانی هەموو شتێك کە ببێتە مایەی سەرکەوتن بۆ موسڵمانان، وەکو مژدە پێدان و جێگیرکردنیان بەوەی کە خستیانە نێو دڵیانەوە لە هیوا و چالاکی شەڕکردن لەگەڵ بێباوەڕاندا، هەروەها بە بەشداری کردنی ڕاستەوخۆ لە جەنگدا، بێگومان ئەو بەشداریکردنە کردەییە دڵەکانیانی بەهێز کرد و جێگیری کردن لەسەر شەڕکردن، ئایەتەکەیش ئەم ئاماژەیەی تێدایە و فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ بە ڕاشکاوی باسیان کردووە.

لەوانەشە کەسێك پرسیار بکات: حیکمەت چیە لە یارمەتیدانی موسڵمانان، بە فریشتە، لە کاتێکدا یەکێك لە فریشتەکان وەکو جبریل بە پشتیوانی خوای گەورە دەتوانێت هەموو بێباوەڕان لەناو بدات؟

مامۆستا عەبدولکەریم زەیدان وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: سوننەتی خوا بەوە هاتووە کە ڕاستی و ڕێبوارانی ڕێگای ڕاستی پاڵ پێوەنانیان هەبێت لەگەڵ ناهەق و لایەنگرانی، سەرکەوتنیش بەپێی سوننەتەکانی خوای گەورە

---

١ـ بڕوانە: صحیح السیرة النبویة (٢٤٧).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٢٤٧).

دەبەخشرێت، ئەم پاڵ پێوەنانەیش لە بنچینەدا لەنێو لایەنگرانی هەق و ناهەقدا ڕوودەدات، یەکێك لە بەروبوومەکانی دەست گرتن بە هەق و هەڵسان بە پێویستیەکانی ئەوەیە کە یارمەتی و هاوکاری خوای گەورە بەدەست بهێنن، بە چەندین جۆر و شێواز، بەڵام ئەو پاڵ پێوەنان و ململانێیە بەردەوام دەبێت بەپێی سوننەتەکانی خوای گەورە، لە ئەنجامیشدا ئەو لایەنەی بەهێزترە بە هەموو واتاکانی بەهێزی پێویست بۆ سەکەوتن سەردەکەوێت، جا یارمەتی دانیش بە فریشتەکان هەندێکە لە بەروبوومی ئیمان بوو بۆ کۆمەڵی موجاهیدان، بەڵام ئەو دوای زاڵبوونی لەسەر خودی ئەو ئیماندارانە ڕادەوەستێت لە ڕووی کارە جەنگیەکانەوە، وەکو نزیك بوونەوە لە کوژران و خۆڕاگری لە جەنگدا، هەمیشە پشت بە خوا بەستنیان و متمانەیان بە خوای خۆیان ئەم واتایانە خوای گەورە کردوونی بە هۆکار بۆ سەرکەوتن، لەگەڵ هۆکارە کردەییەکانی تردا، وەکو کەرەستە و ژمارە و ئامادەیی شەڕ و فێربوونی هۆزەکانی.... هتد، بۆیە ئیسلام بانگی موسڵمانان دەکات بۆ ئەوەی بە خۆیان بچنە جەنگ و لە دژی بێباوەڕان بجەنگن، هەرچی هۆکاری سەرکەوتنیش هەیە بە دەستی خۆیان ئامادەی بکەن...

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: ١٤–١٥).

دابەزینی فریشتەکان سەلامی خوایان لێ بێت، لە ئاسمانەکانەوە بۆ زەوی بە مەبەستی سەرخستنی موسڵمانان، بە ڕاستی ڕووداوێکی مەزنە، چونکە هێزێکی هەرە گەورەیە، ورەیەکە بۆ ئیمانداران، بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیا بن ئەوان تەنها خۆیان نین لە گۆڕەپانەکەدا، ئەم هەستە مەزنەیش ورەیەکیان پێدەدات لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنانیاندا، با لە ڕووی جەربەزەیشەوە بێت، چونکە هاوسەنگی کردەیی نییە لە نێوان سوپای بێباوەڕان لە ڕووی ژمارە و لە ڕووی ئامادەکارییەوە، لەگەڵ سوپای ئیماندارانی ژمارە کەم و لاواز لە ڕووی ئامادەکارییەوە.

لە هەمان کاتیشدا هۆکارێکی بەهێزە بۆ تێکشکانی ورەی بێباوەڕان، کاتێك لە نێویاندا ئەگەری دوبارە بوونەوەی دابەزینی فریشتەکان دروست بێت کە هەندێکیان بە چاوی خۆیان بینییان، ئەوان هەر مەزەندە بکەن بۆ هێزو ژمارەی موسڵمانان ، بەڵام ترس و بێمێکی ناڕەحەتیان هەر لا دەمینێتەوە لە ئەگەری بەشداریکردنی هێزێکی بە چاو بینرا و، نازانن ژمارەی چەندەو، تواناکەی چۆنە ، ئەم هەستە هاوڕێی موسڵمانان بوو لەهەموو ئەو جەنگانەی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەنجامیان دەدا لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ و سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین، هەروەها لەگەڵ هەندێ ئیمانداراندا هەر مایەوە وەکو هۆکارێکی بەهێز لە سەرکەوتنە دووبارە بووەکانیان لە دژی دوژمن.[1]

**دووەم: سەرکەوتنی موسڵمانان لەسەر بتپەرستان و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوانەی خرانە بیرە کۆنەکەوە:**

جەنگی بەدر بە سەرکەوتنی موسڵمانان تەواو بوو بەسەر بتپەرستاندا، کوژراوانی ئەوان حەفتا کەس بوو، حەفتا کەسیشیان بە دیلی گیران، کە زۆربەیان لە سەرکردەکانی قورەیش بوون، لە موسڵمانانیش چواردە کەس شەهید بوون، شەش لە موهاجیرین و هەشت لە ئەنصاریەکان، پاش بە دەستهێنانی سەرکەوتن و شکاندنی بتپەرستان، پێغەمبەرﷺ هەڵسا بە ناردنی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە و زەیدی کوڕی حارسە بۆ مەدینە بە مەبەستی مژدە پێدانیان بە سەرکەوتنی موسڵمانان و تێکشکانی بێباوەڕان.[2]

ئینجا پێغەمبەرﷺ سێ ڕۆژ لە بەدر مایەوە، لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەرﷺ کاتێك سەردەکەوتە سەر کەسانێکدا سێ ڕۆژ لەو جێگایە دەمایەوە......[3] لەوانەشە حیکمەت لەوە بریتی بێت لە:

١- پالاوتنی هەڵوێستەکە بە لێدانی هەر جموجۆڵێك لە بەرگری بێ هیوا، کە

---

١ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/ ١٤٥).

٢ بڕوانە: المستفاد من قصص القران (٢/١٣٣).

٣ صحيح السيرة النبوية (ص ٢٥٩).

لەوانەیە هەندێ پاشماوەی تێکشکاوەکان پێی هەڵسن لەوانە بەرەو چیاکان هەڵهاتوون.

٢- ناشتنی ئەوانەی شەهید بوون لە پێناو خوادا، کە شەڕ نیە ئەو جۆرە ڕووداوانەی تیا دروست نەبێت، چونکە شەهیدانی موسڵمانان هەر لە خاکی شەڕەکەدا نێژراون و، جێگیریش نەبووە کە نوێژیان لەسەر کرابێت، یان کەسێکیان لە دەرەوەی بەدر نێژرابێت.[1]

٣- کۆکردنەوەی دەستکەوت و پاراستنیان و دانانی کەسانێك بۆ پاراستنیان، بۆ ئەوەی بە تەواوی بدرێتە شایستەکانیان، دەستکەوتەکانی بەدر سپێردران بە ئیبنو حاریس عەبدولای کوڕی کەعبی ئەنصاری کە یەکێك بوو لە بەنی مازین.[2]

٤- بەخشینی هەلێك بۆ سوپای سەرکەوتوو بۆ پشوودان، دوای ماندووبوونی دەروونی و لاشەیی ناڕەحەت کە تووشیان بوو لەناو گۆڕەپانی جەنگدا، هەروەها بۆ سارێژکردنی برینەکان و، بیرهێنانی سەرکەوتنی خوای گەورە، کە بە ئاسان بەدەست نەهات و، پێکەوە باسکردنی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو جەنگە و، دلێری فلانەکەس و بوێری لە پەلامالاردانی دوژمن و، ئەو وانە و پەندانەی وەرگیردرا لە ئەنجامدانی جەنگەکە و بیرهاتنەوەی فەرمانەکانی سەرکردایەتی باڵا و هەڵوێستی نەخشەکێشان و بەشداریکردنی کردەیی لە جێبەجێکردنیدا، بۆ ئەوەی ببێتە ڕووناکیەك لەبەری ڕێ بکەن لە ڕووداوە داهاتووەکاندا.

٥- شاردنەوەی لاشە بۆگەنەکانی دوژمنان، هەروەها ڕۆیشتنە سەر بریندارەکانیان، بە مەبەستنی کوشتنی هەر کەسێك لەوانە کە سەرکردایەتی سوپای ئیسلامی بە باشی دەزانێت و، وەکو ئەبو جەهل کە فیرعەونی ئەم ئومەتەیە و، کەسانێکی تر وەکو سەری بێباوەڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف و هاوشێوەکانیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە فڕەدانی ئەو گلاوانە بۆ ناو بیرە کۆنەکانی بەدر، ئینجا لە لێواری بیرەکان وەستا و، فەرمووی: ((بئس عشيرة النبي كنتم لنبيكم،

---

١ـ بڕوانە: موسوعة نضرة النعيم (١/ ٢٩١).

٢ـ بڕوانە: محمد رسول الله ﷺ صادق عرجون.

کذبتموني وصدقني الناس، وخذلتموني ونصرني الناس، واخرجتموني واواني الناس)).[١]

واتە: بەڕاستی کەس و کارێکی خراپ بوون بۆ پێغەمبەرەکەتان، بە درۆتان خستمەوە و خەڵکی باوەڕی پێکردم، پشتتان بەردام و خەڵکی پشتی گرتم، دەرتان کردم و خەڵکی داڵدەی دام.

ئینجا فەرمانی کرد و ڕاکێشران بۆ لای بیرە کۆنێك لە بیرەکانی بەدر و خرانە ناوی، پاش ئەوە لەسەریان ڕاوەستا و فەرمووی: ((یا عتبة بن ربیعة، ویا شیبة بن ربیعة ویا فلاو ...))[٢]

واتە: ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و ئەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و، ئەی فلان و فلان، ئایا ئەوەتان بەدی کرد کە خوای گەورە بەڵێنی پێدابوون، چونکە من ئەوەم بە ڕاستی بەدی کرد کە خوای گەورە بەڵێنی پێدابووم، عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! قسەی چی دەکەیت لەگەڵ کەسانێکدا بوونەتە کەلاکی بۆگەن؟ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، ئێوە لە ئەوان باشتر گوێتان لە من نیە، قەتادە وتی: خوای گەورە زیندووی کردنەوە تاکو قسەکانی پێغەمبەرﷺیان بیست وەکو سەرکۆنە کردن و کەمکردنەوە و خەشم و داخ و پەشیمانی.

بانگکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ کوژراوانی بەدر مەسەلەیەکی گەورەی ئاشکرا کرد، ئەویش ئەوەبوو ئەوان ژیانێکی تازەیان دەست پێکرد. کە ژیانی بەرزەخە، کە تیایدا قسەی زیندووەکان دەبیسن، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە یان قسە بکەن، باوەڕهێنان بەم ژیانە یەکێکە لە بیروباوەڕەکانی موسڵمانان، خۆشی و سزای گۆڕیش جێگیربووە لە ڕێگەی فەرموودە ڕاستەکانەوە. تەنانەت پێغەمبەر ﷺ بە لای دوو گۆڕدا تێپەڕ بوو فەرمووی: ((إنهما یعذبان وما یعذبان في کبیر))،[٣] واتە: ئەو

---

١ـ زاد المعاد (١٨٧/٣).

٢ ـ الاساس في السنة وفقهها – السیرة النبویة (٤٧٩/١)، البخاري المغازي، باب قتل ابي جهل رقم (٣٩٧٦) ومسلم: ح (٢٨٧٣– ٢٨٧٤).

٣ـ بڕوانە: البخاري، کتاب الوضوء، باب (ما جاء في البول) رقم (٢١٨).

عەفرا لێیان داوە تاکو گەیشتووەتە سەرەمەرگ، ئەویش کردی بە ڕیشیدا و وتی: تۆ ئەبو جەهلی، ئەویش وتی: کێ لەو کەسە مەزنترە کە خزمەکانی خۆی بیکوژن، یان وتی: کوشتتان،[1] لە فەرموودەی عەبدوڵای کوڕی مەسعودیش (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتووە کە فەرموویەتی: فریای ئەبو جەهل کەوتم لە ڕۆژی بەدردا کەوتبوو، وتم: ئەی دوژمنی خوا، خوای گەورە ڕیسوای کردی؟ وتی: ڕیسوای کردم؟

منیش شمشێرێکم بە دەستەوە بوو، دەستم کرد بە لێدانی، ئەویش شمشێرێکی چاکی بە دەستەوە بوو، منیش لە دەستیم داو شمشێرەکەی لە دەست کەوت و ئینجا هەڵم گرت، دوای ئەوە پۆشەرەکەی سەری لابرد و منیش لە گەردەنیم دا و، هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەم بۆ باسکرد و ئەویش فەرمووی: سوێند دەخۆی بەو خوایەی کە خوایەکی تر نییە جگە لە ئەو.

وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لە ئەو خوایەکی تر نییە.

فەرمووی: دە بڕۆ دڵنیا بە لە هەواڵەکە، منیش دەرچووم و وەکو باڵندە ڕام دەکردەوە بە ڕاکردن گەڕامەوە بە پێکەنینەوە هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاند.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با بچین، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم و پێم نیشاندا کاتێك ڕاوەستا لەسەری فەرمووی: ئەمە فیرعەونی ئەم ئومەتەیە.[2]

پاڵنەری ئەو دوو لاوە ئەنصاریە بۆ کوشتنی ئەبو جەهل ئەوەبوو کە بیستبوویان ئەو جنێو و قسەی ناشرینی کردووە بە پێغەمبەر ﷺ، ئا بەو شێوەیە گەنجانی ئەنصار خۆشەویستیان هەبوو بۆ پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەك ئامادەبوون گیانی خۆیان بکەن بە قوربانی لە پێناو تۆڵەکردنەوە لەو کەسەی ئازاری پێغەمبەرﷺ دەدات، ئەوەیش کە ڕوویدا لە نێوان عەبدوڵای کوڕی مەسعودﷺ و ئەبو جەهلدا، کە لەسەرەمەرگدا بوو، پەندێکی گەورەی تیایە، چونکە ئەوەتا ئەو زۆرداره ستەمکارە کە بە توندی ئازاری موسڵمانانی دەدا لە مەککە، وا کەوتووتە دەستی خودی ئەوانەی کە ئازاری دەدان.

---

١ البخاري، كتاب المغازي، باب ((قتل ابي جهل)) رقم (٣٩٦٣).

٢ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (ص ٢٤٢).

ویستی خوای گەورەیش لەسەر ئەوە دەبێت ئەو کەسەی کە کۆتایی بە دوا هەناسەی دەهێنێت یەکێ بێت لە کەسانەی کە دەچەوسانەوە بە دەستی ئەبو جەهلەوە، چونکە ئەبو جەهل لەخۆباییەکی سەرکەشی زۆرداربوو، تەنانەت لەو کاتەیشدا کە کەوتبووە سەر زەوی و کۆتا هەناسەکانی هەڵدەکێشا،[1] چونکە لە ڕیوایەتێکی ئیبنو ئیسحاقدا هاتووە کە بە عەبدوڵای کوڕی مەسعودی وتووە کاتێك ویستوویەتی سەری ببڕێت: تۆ چویتەتە سەر بەرزاییەکی سەخت ئەی شوانی مەڕەکان.[2]

((خوای گەورە بە پەلە گیانی نەگریسی ئەبو جەهلی نەسەندەوە بە دەستی بێچووە شێرانی ئیسلام بەڵکو بە برینداری و تۆقیوی هێشتیەوە لە حالەتێکی ئاگا لە خۆبووندا، بۆ ئەوەی ئاستی ئەو سەرشۆڕییەی خۆی ببینێت لەسەر دەستی ئەوانەی دەیچەوساندنەوە، لە پیاوانی یەکەمی ئیسلام، عەبدوڵای کوڕی مەسعود، چووە سەر سنگی و، بە هەردوو پێی دوژمنی خوای شێلا و، کردی بە ڕیشیدا وەکو سوکایەتی پێکردنی و، سەرکۆنەی دەکرد بەهۆی لەخۆبایی بوونی لەسەر زەویدا و، بە شمشێرەکەی خۆی دەیکوژێت.... داخی زۆریش دەکاتە دڵیەوە بەوەی کە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانانی پێ دەگەیەنێت و، هەروەها پێی ڕادەگەیەنێت کە ئابڕوو چوون و سەرشۆڕی شکست بەسەر دوژمنانی خوادا دابەزییوە، کە خودی ئەم بێباوەڕە سەرکردایەتی دەکرد....)).[3]

**ب ـ کوژرانی ئومەییەی کوڕی خەلەف:**

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفﷺ دەفەرموێت:

نامەم نووسی بۆ ئومەییەی کوڕی خەلەف کە ماڵ و کەس و کارم لە مەککە بپارێزێت، منیش ماڵ و کەس و کاری لە مەدینە دەپارێزم، جا کاتێك (الرحمن)م نووسی، وتی من نازانم (الرحمن) چییە؟ ئەو ناوەی خۆتم بۆ بنووسە کە لەسەردەمی

---

١ـ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٥٨–١٦٠).

٢ـ بڕوانە: السيرة النبوية لإبن هشام (٢/٢٤٧).

٣ـ بڕوانە: محمد رسول الله، الصادق عرجون (٣/٤٣١–٤٣٢).

جاهیلیدا هەتبوو، دەڵێت: منیش نوسیم (عبد عمرو).

لە ڕۆژی بەدردا چوومە سەر شاخێك بۆ ئەوەی بیپارێزم کاتێك خەڵکی خەویان لێکەوت، ئیتر بیلال چاوی پێکەوت، دەرچوو تاکو گەیشتە کوڕێك لە کوڕەکانی ئەنصار، وتی: ئومەییەی کوڕی خەلەف! ڕزگار نەبم ئەگەر ئەو ڕزگاری بێت، ئیتر کۆمەڵێك لە ئەنصارەکان لەگەڵی بێت دەرچوون بە شوێنەواری ئێمەدا، کاتێك ترساین فریامان بکەون کوڕەکەیمان بۆ بەجێهێشتن بۆ ئەوەی سەرقاڵیان بکەم، ئەوانیش کوشتیان و، هەر سووربوون لەسەر شوێنکەوتنمان – ئەویش پیاوێکی قورس بوو، کاتێك فریامان کەوتن پێم وت: لەسەر ئەژنۆت بکەوە، منیش خۆم بەسەریدا خست بۆ ئەوەی بیپارێزم، بەڵام ئەوان بە شمشێرەکانیان لێیان دا و دەریان کرد لە ژێرم و کوشتیان، یەکێکیشیان بە شمشێرەکەی لە قاچی دام، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف شوێنی ئەو برینەی پێ نیشان دەداین لە بان پێی.[1]

لە گێڕراوەکانی پێشوو تێبینی ئەوە دەکەین کە:

١- ئەوەی ڕوویدا لەگەڵ بیلال ڕەزای خوای لێ بێت کاتێك دوژمنە سەرسەختەکەی خۆی بینی، کە ئەو لە مەککە سەختترین ئەشکەنجەی بیلالی دەدا و، ئێستا دیلە بە لای عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە.

ئەوە هەلێکی بوو لە هەلێستەکانی تۆڵە سەندنەوە لە گەورە بێباوەڕەکان لە ژیانی دونیادا، وەکو نیعمەتێك بۆ ئیمانداران، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة: ١٤-١٥).

٢- ئەو شێوە کوشتنەی ئومەییە پێی کوژرا وانە و پەندێکە بۆ هەموو زۆردارەکان و، هەموو ئەوانەی هەڵدەخەڵتێن بە پلە و پایەی خۆیان. لەوانە خوای گەورە دەسەڵات بە چەوساوەکان بدات بەسەریاندا لە دونیا پێش ڕۆژی قیامەت،

[1] ١- البخاري: كتاب الوكالة، باب (اذا وكل المسلم حربيا) رقم (٢٣٠١).

وەکو ئەوەی کە ڕوویدا وەکو ئومەییە و هاوشێوەکانی لە سەرانی کوفر.[١] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴾ (القصص: ٥).

٣- عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: ((ڕەحمەتی خوا لە بیلال، قەلغانەکانم ڕۆیشت هەردوو دیلەکەی کوشتم)[٢] ئەوەیش کە ڕوویدا لە بیلالەوە کە بە زۆر دوو دیلەکەی لە عەبدوڕڕەحمان سەند، بەهێزی ئەو ئەنصارانەی کە هاواری بۆ بردن، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر پشتیوانی کردنی برایانە لە نێوان هاوەڵە بەڕێزەکاندا.[٣]

٤- هەڵوێستی دایکی صەفوان: پاش موسڵمان بوونی پێیان وت ئەو پیاوە بوو قاچی عەلی کوڕی صەفوانی بڕی لە بەدردا، وتی: باسی ئەو کەسانە مەکەن کە لەسەر بتپەرستی کوژراون، خوای گەورە عەلی سەرشۆڕ کرد بەوەی کە حوبابی کوڕی مونزیری کوشت، ئەو کاتێك لێرە دەرچوو موسڵمان بوو، بەڵام لەسەر ڕێبازێکی تر کوژرا،[٤] ئەم هەڵوێستەیش بەڵگەیە لەسەر پتەوی ئیمانی، کاتێك ئەوەندە موسڵمانانی خۆش دەویست با لە هۆزەکەی خۆیشی نەبن، ڕقی لە بێباوەڕانیش بوو با کوڕی خۆیشی بێت.[٥]

واش دەردەکەوێت کە کوڕەکەی موسڵمان بووە لە مەککە، بەڵام بەزۆر دەرکراوە بۆ جەنگی بەدر، بەڵام لەکاتی پێکدادانی هەردوو سوپاکە کەمی ژمارەی موسڵمانانیان بینی هەڵگەڕانەوە.[٦] ئیتر خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰؤُلَاءِ دِينُهُمْ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (الانفال: ٤٩).

---

١- بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٥٢-١٥٣).

٢- بڕوانە: سيرة ابن هشام (٢/٤٤٤).

٣- بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٥٣).

٤- بڕوانە هەمان سەرچاوە (٤/١٥٣).

٥- بڕوانە هەمان سەرچاوە (٤/١٥٤).

٦- بڕوانە: تفسير الطبري (١٠/٢١).

**ج- کوژرانی عوبەیدی کوڕی سەعدی کوڕی عاص لەسەر دەستی زوبەیر:**

زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەفەرمووێت:

لە ڕۆژی بەدردا عوبەیدی کوڕی سەعدی کوڕی عاصم بینی، پڕ چەك بوو، تەنها هەردوو چاوی دەبینرا، نازناوی (ابو ذات الكرش) بوو، وتی: منم (ابو ذات الكرش) واتە من ناسراوم بە ورگن، منیش پەلامارم دا بە ڕمەکەم و لێمدا و کوشتم، هێشتا وتی: پێم وترا کە زوبەیر وتوویەتی: من پێم خستە سەری.

عوروە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ داوای کرد و پێی دا، کاتێك پێغەمبەرﷺ لە دونیا دەرچوو وەری گرتەوە، ئینجا ئەبو بەکر داوای کرد و پێی پێدا، کاتێك ئەبو بەکر لە دونیا دەرچوو، عومەر داوای کرد، لە پاش عومەریش وەریگرتەوە و، عوسمان داوای کرد و، لە پاش کوژرانی عوسمان کەوتە لای خاو و خێزانی عەلی، ئیتر عەبدوڵای کوڕی زوبەیر داوای کردەوە و تاکو کاتی کوژرانی لای بوو.[1]

((ئەم هەواڵە باسی وردی زوبەیر دەکات (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێکانی ئامانجدا، چونکە توانی ڕمەکە بخاتە ناو چاوی ئەو پیاوە سەرەڕای تەسکی ئەو جێگایە، ئینجا توانی کە وزە و توانای خۆی دابەش بکات لە نێوان پەلاماردان و بەرگریکردن، چونکە پێکانی ئەو پیاوە کارێکی گرانە لەبەر ئەوەی هەموو گیانی خۆی بە ئاسن داپۆشی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زوبەیر توانی چاوێکی بپێکێت و کۆتایی بە ژیانی بهێنێت، برینەکەیش زۆر قووڵ بوو، ئەوەیش ئاماژە دەکات بۆ بەهێزی زوبەیر، جگە لە وردی و لێهاتوویی لە پێکانی ئامانجدا.[2]

**د- کوژرانی ئەسوەدی مەخزومی:**

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ئەسوەدی مەخزومی کابرایەکی دڕندە و بەدڕەوشت بوو، لە بەدردا دەیوت: پەیمان دەدەمە خوا لە حەوزەکەیان ئاو بخۆم، یان بیڕوخێنم، یان لە پێناو ئەو مەبەستە بمرم، کاتێك دەرچوو، حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بۆی دەرچوو، کاتێك بەیەك گەیشتن حەمزە لە پێی ئەسوەدی دا بە نیوەی لاقیەوە

---

١- بڕوانە: صحيح البخاري، المغازي رقم (٣٩٩٨).

٢- بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (١٦٣/٤).

پەڕاندی پێش ئەوەی بگاتە حەوزەکە و فیچکەی خوێنی دەهات قاچی، ئینجا نزیك بوویەوە لە حەوزەکە بەو حاڵەی و خۆی پێ گەیاند، بۆ ئەوەی پەیمانەکەی بەجێ بهێنێت، بەڵام حەمزە بە دوایدا ڕۆیشت و لەناو حەوزەکە کوشتی.[1]

ئومەییەی کوڕی خەلەفیش پرسیاری کرد لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دەربارەی ئەو کەسەی پەڕێکی حوشترمورخی بەسەر سنگەوەیە، عەبدوڕڕەحمانی وتی: ئەوە حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیبە، ئومەییە وتی: ئەوەیە کە کردەوەی خراپی بەسەردا هێناوین،[2] کە ئەمەیش شایەتیەکە لە یەکێك لە سەرانی بێباوەڕییەوە، ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی سوپای بتپەرستان چەند شکستیان خواردووە بە دەستی شێری خوا حەمزەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)، چونکە ئەو دڕندە ناپاکە بەربەرەکانی کرد لەگەڵ موسڵمانان، بۆیە حەمزەی پاڵەوان لەناوی برد و کردی بە پەندێك بۆ هاوشێوە سەرکەشەکانی.[3]

## دووەم: لە دیمەنەمەزنەکان

**شەهیدبوونی حاریسەی کوڕی سوراقە:**

لە ئەنەسەوەﷺ هاتووە کە دەفەرمووێت: حاریسە لە ڕۆژی بەدردا کوژرا، کە هێشتا لاو بوو، دایکی هاتە لای پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ئەزانی حاریسە بۆ من چی ئەگەیاند؟ جا ئەگەر لە بەهەشتدا بێت ئارام دەگرم و چاوەڕوانی پاداشت دەکەم، بەڵام ئەگەر وا نەبێت من چی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ويحك، او هبلت، او جنة واحدة هي؟ انها جنان كثيرة وانه في جنة الفردوس))[4] واتە: بەڵات لێدا، ئایا تۆ تێکچوویت، بۆچی یەك بەهەشتە، بەڵکو چەندین بەهەشتە، حاریسە لە بەهەشتی فیردەوسدایە. لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە فەرموویەتی: ئەی دایکی حاریسە، چەندین بەهەشتە و لەناو بەهەشتێکدایە،

---

١ـ بڕوانە: سيرة ابن هشام (٢/٢٣٧).

٢ـ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٥١).

٣ـ هەمان سەرچاوە (٤/١٢١).

٤ـ البخاري: المغازي، باب فضل من شهد بدرا، رقم (٣٩٨٢).

کوڕەکەی تۆیش فیردەوسی باڵای بە دەست هێنا.[١]

**أـ شەهیدبوونی عەوفی کوڕی حاریس:**

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: عاصمی کوڕی عەمری کوڕی قەتادە بۆی گێڕامەتەوە: کە عەوفی کوڕی حاریس، دایکی ناوی عەفرا بوو،[٢] فەرموویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چیە پەروەردگار پێدەکەنێنێت لە بەندەکەی؟ فەرمووی: ((عمسة یده في العدو حاسراً)) واتە: دەستی بخاتە ناو دوژمن بەبێ قەلغان، ئەویش قەلغانێکی لەبەردا بوو دایکەند و فڕێیدا، ئینجا شمشێرەکەی هەڵگرت و شەڕی کرد تاکو کوژرا.[٣]

ئەم گێڕاوەیە پتەوی پەیوەندی هاوەڵان دەردەخات بە قیامەت و پەرۆشیان بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە، بۆیە عەوفی کوڕی حاریس وەکو تیر دەرچوو، بەبێ قەلغان لە دوژمنانی دەدا تاکو کوژرا و پلەی بەرزی شەهیدی بەدەست هێنا، لە ڕاستیدا چەکەکان گۆڕانکارییان بەسەرداهات لە کۆمەڵگای تازە، چونکە ئەندامەکانی پەیوەست بوون بە ڕۆژی دواییەوە و، پەرۆشییان پەیداکرد بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە، دوای ئەوەی کە پەژارەیان ئەوەبوو ئافرەتان باسی جوامێریان بکەن و سەرگەورەی هۆز لێیان ڕازی بێت و هەڵبەست بە ئازادییاندا بوترێت.[٤]

**ب - شەهیدبوونی سەعدی کوڕی خەیسەمە و باوکیﷺ:**

ئیبنو حەجەر دەفەرموێت: موسای کوڕی عوقبە فەرموویەتی، لە ئیبنو شیهابەوە: تیر و پشك کرا لە ڕۆژی بەدردا بۆ سەعدی کوڕی خەیسەمە و باوکی، ئیتر ناوی سەعد دەرچوو، باوکی پێی وت: کوڕم ئەمڕۆ چاکەم بدە بەسەر خۆتا و، من با بچم، سەعد فەرمووی: ئەی باوکم ئەگەر جگە لە بەهەشت شتێکی تر بووایە

---

١ـ اساس في السنة وفقهها، سيرة النبوية (١/٤٧٥).

٢ـ عەفرائی کچی عوبەیدی کوڕی سەعلەبەی نەججاری، هەر حەوت کوڕەکەی بەشدار بوون لە جەنگی بەدردا.

٣ ـ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية، (٢٤٥)، الاصابة لابن حجر، ترجمة عوف بن الحارث برقم (٦١٠٧).

٤ـ بڕوانە: التربية القيادية (٢/٣١).

وام دەکرد، ئیتر سەعد دەرچوو بۆ جەنگی بەدر و کوژرا، باوکیشی لە ڕۆژی ئوحوددا کوژرا.[1]

ئەم گێڕراوەیش وێنەیەکی پرشنگدار دەخاتەڕوو لە هاوەڵانەوە، لە ڕووی پێشبڕکێیان لەسەر جیهاد لە پێناو خوادا، ئەوە سەعدی کوڕی خەیسەمە و باوکیەتی ناتوانن پێکەوە دەربچن لەبەر پێویستی خێزانەکەیان بە یەکێکیان، کەسیان ڕازی نەبوون واز لە ڕۆیشتن بهێنن بۆ گۆڕەپانی شەڕ تاکو ناچار بوون تیر و پشکیان کرد، کوڕەکەیش لە ئەوپەڕی ڕەوشت جوانیدا بوو لەگەڵ باوکی، بەڵام تێنووی بەهەشت بوو، بۆیە بەو شێوە جوانە وەڵامی باوکی دایەوە.[2]

**ج- نزای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە:**

لە عائیشەوە رضي الله عنها فەرموویەتی: کاتێك کوژراوانی بەدر فەرمان درا ڕابکێشرێن بۆ ناو بیرە کۆنەکە، نارەحەتی وەدی کرا لە ڕووخساری ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبە، کاتێك بینی باوکی بەرەو ناو بیرە کۆنەکە ڕادەکێشرێت، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەبو حوزەیفە! سوێند بە خوا بەوە دەکەی نارەحەت بوویێتی بۆ باوکت؟ ئەویش وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەر گومانم نییە لە خوا و پێغەمبەرەکەی، بەڵام باوکم پیاوێکی لەسەر خۆ و هۆشمەند بوو، منیش حەزم دەکرد نەمرێت تاکو خوای گەورە هیدایەتی دەدات، جا کاتێك بینیم ئەو هیوایە لە دەست چوو، ئیتر منیش خەمبار بووم، ئیتر پێغەمبەرﷺ نزای چاکەی بۆ کرد.[3]

ئەم هەڵوێستە پتەوی ڕاکێشان دەردەخات لەنێوان باوەڕ و سۆزی ئادەمیزاد، چونکە باوەڕ هەستە مرۆییەکان نامرێنی، بەڵکو پەروەردەی دەکات و دەیگۆڕێ لە دەمارگیرییەکی جاهلیی یەوە بۆ ئەمەکێك کە ڕێبازی خوای گەورە نکۆڵی لێناکات، ئیمانی ئەبوحوزەیفە رضي الله عنه ئیمانێکە ڕوداوەکان نایجولێنن، چونکە ئەو کاتێك باوکی

---

١ـ الاصابة (٢/٢٣-٢٤).

٢ـ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/٨٧).

٣ـ بڕوانە: صحيح السيرة النبوية (٢٥١-٢٥٢)، اخرجه الحاكم (٣/٢٢٤) وقال صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي.

دەبینی لەناو سەرانی قوڕەیش بەبێباوەڕی و دەخرێتە ناو ئەو بیرە کۆنەوە، سۆزی مرۆیی وای لێدەکات داخ بۆباوکی بخوات وەکو ئەمەکێك، بەلاّم پشتی هەرئەستووردەبێت بە ئیمانی خۆی، تەنها ئەوەندەیە کەبێتاقەتی دەردەبڕێت بۆ باوکی کە بێبەش بوو لەچاکەی ئیسلام.[١] لەبەر ئەم مەبەستە پیرۆزەیش، پەژارەی ئەبوحوزەیفە بوو بەهۆی پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی.[٢]

**د-عومەیری کوڕی وەقاص :**

کاتێك پێغەمبەر ﷺ کەوتە ڕێ بەرەو بەدر و سوپاکەی بەسەرکردەوە، کە عومەیری کوڕی ئەبی وەققاصی گێڕایەوە، ئەویش دەستی کرد بە گریان بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێدا و، هەڵگری شمشێرەکەیان گرێدا، عومەیر خۆی دەشاردەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەیبینێ، سەعد وتی: چیت لێ قەوماوە برام؟ وتی: ئەترسم پێغەمبەر ﷺ بمبینێت و بە منالّم بزانێت و بمگێڕێتەوە، منیش حەزدەکەم دەربچم بەڵکو خوای گەورە شەهیدیم پێ ببخەشێت.[٣] هەر وایش بوو شەهید بوو.

١ـ بڕوانە: محمد رسول الله (٣/٤٤٦).

٢ـ بڕوانە: التاريخ الاسلامي للحميدي (٤/١٧٤)

٣ بڕوانە: السيرة النبوية لأبي فارس، (٣١٧)، نقل عن صفة الصفوة (١/٢٩٤)، والمستدرك (٣/١٨٨)، والاصابة (٣/٣٥).

# ناوەڕۆك


پێشەکی وەرگێڕ ..................... ٥
پێشەکی ..................... ٧
بەشی یەکەم: گرنترین ڕوداوە مێژووییەکانی پێش ناردنی پێغەمبەر..................... ٢١
باسی یەکەم: ژیارو ئاینەکانی پێش هاتنی پێغەمبەر ..................... ٢١
یەکەم: ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی. ..................... ٢١
دووەم: ئیمپراتۆریەتی فارسی ..................... ٢٢
سێ یەم: هیندستان..................... ٢٣
چوارەم: بارودۆخی ئایینی جیهان پێش ناردنی پێغەمبەر ..................... ٢٥
باسی دووەم: بنچینەو شارستانی عەرەب..................... ٣١
یەکەم: بنچینەی عەرەب: مێژوونوسان بنچینەی عەرەبیان. ..................... ٣١
دووەم: ژیارەکانی دوورگەی عەرەب ..................... ٣٤
باسی سێ یەم: بارودۆخی ئاینی وسیاسی و کۆمەلایەتی و. ..................... ٣٧
یەکەم: باری ئاینی..................... ٣٧
دووەم: باری سیاسی..................... ٤٠
سێ یەم: باری ئابووری ..................... ٤٢
چوارم: باری کۆمەلایەتی..................... ٤٥
١ـ شانازی کردنی بێ ئەندازە بە ڕەچەڵەك و نەژاد:..................... ٤٥
٢ـ شانازی کردن بە وشە، بە تایبەت هۆنراوە: ..................... ٤٥
٣ـ ئافرەت لە کۆمەڵگای عەرەبدا: ..................... ٤٥
٤ـ هاوسەرگیری: ..................... ٤٨
٥ـ جیابوونەوە: ..................... ٥٠
٦ـ جەنگ و پەلامار و بەسەردادان: ..................... ٥١
٧ـ زانست و خوێندنەوەو نووسین: ..................... ٥٢
پێنجەم: باری ڕەوشتی..................... ٥٣
باسی چوارەم: گرنگترین ڕووداوەکانی پێش لە دایك بوونی پێغەمبەرﷺ..................... ٦١
یەکەم: بەسەرهاتی عەبدولموتتەلیبی باپیری پێغەمبەر..................... ٦١
دووەم: بەسەرهاتی(أصحاب الفیل): ..................... ٦٤

چەند پەندو سوودێك لە ڕووداوی فیل:........................ ٦٧
باسی پێنجەم: لە لە دایکبوونەوە تاکو(حلف الفضول)........................ ٧٢
یەکەم: ڕەچەڵەکی پێغەمبەرﷺ:........................ ٧٢
دووەم: هاوسەر گیری عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتتەلیب:........................ ٧٤
سێ یەم: لە دایك بوونی خۆشەویستمان موحەممەد:........................ ٧٦
چوارەم: شیردەرەکانی پێغەمبەرﷺ:........................ ٧٧
پێنجەم: مردنی دایکی و لە ئەستۆگرتنی لە لایەن باپیرو مامی........................ ٨٤
شەشەم: کارکردنی پێغەمبەرﷺ لە شوانی........................ ٨٦
هەروەها شوانی چەند خەسڵەتێکی پەروەردەیی بۆ خاوەنەکەی هەمواردەکات........................ ٨٧
حەوتەم: پاراستنی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی پێش ئەوەی........................ ٨٩
هەشتەم: چاوپێکەوتنی بەحیرای قەشە بە پێغەمبەرﷺ لە تافی لاویدا........................ ٩١
لە بەسەرهاتی بەحیرا ئەم سودانە وەردەگرین:........................ ٩٢
نۆیەم: جەنگی فیجار........................ ٩٣
دەیەم: (حلف الفضول)........................ ٩٤
باسی شەشەم: بازرگانی کردنی وهاوسەرێتی لەگەڵ خەدیجەو........................ ٩٨
یەکەم: بازرگارنی کردنی لەگەڵ خەدیجە و ئینجا هاوسەرگیریان........................ ٩٨
دووەم بەشداریکردنی پێغەمبەرﷺلە دروستکردنی کەعبە........................ ١٠٢
سێ یەم: ئامادەکردنی خەڵکی بۆ پێشوازیکردنی پێغەمبەرایەتی موحەممەدﷺ........................ ١٠٥
**بەشی دووەم**: دابەزینی وەحیی خواو بانگەوازی نهێنی........................ ١١٣
باسی یەکەم: دابەزینی وەحیی خوا لەسەر گەورەی هەموان موحەممەدﷺ........................ ١١٣
یەکەم: خەونی ڕاست........................ ١١٤
دووەم: خەڵوەتی بەلاوە دڵگیربوو،بەتەنهاش لە ئەشکەوتی........................ ١١٦
سێیەم: تا ئەوکاتەی ڕاستی و دڵنیایی بۆ هات لە ئەشکەوتی........................ ١١٧
چوارەم: ئەو نا ڕەحەتیەی تووشی پێغەمبەرﷺ بوو........................ ١١٩
پێجەم: جۆرەکانی وەحی........................ ١٢٢
شەشەم: کاریگەری ئافرەتی چاك لە خزمەتکردنی بانگەوازدا........................ ١٢٤
حەوتەم: بە ئەمەك بوونی پێغەمبەرﷺ بەرامبەر خاتوو خەدیجەل........................ ١٢٨
هەشتەم: بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران........................ ١٢٩
نۆیەم: (وفترالوحی) خاوبوونەوەی وەحیی........................ ١٣٠
باسی دووەم: بانگەوازی نهێنی........................ ١٣٢

یەکەم: فەرمانی خوایی بە گەیاندنی پەیام........................ ١٣٢
دووەم: دەستپێکردنی بانگەوازی نهێنی. ........................ ١٣٤
سێ یەم: بەردەوام بوونی پێغەمبەرﷺ لە بانگەوازدا........................ ١٤٣
چوارەم: گرنترین تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵی یەکەم........................ ١٤٧
پێنجەم : کەسایەتی پێغەمبەرﷺو کاریگەری لەسەر دروستکردنی سەرکردە. ........ ١٤٨
شەشەم: بابەتی خوێندن لە ماڵی ئەرقەم........................ ١٥٠
حەوتەم: هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ماڵی ئەرقەم. ........................ ١٥١
هەشتەم: خاسیەتەکانی کۆمەڵی یەکەم........................ ١٥٢
نۆیەم: بڵاوبونەوەی بانگەواز لە تیرەکانی قورەیش و. ........................ ١٥٥
باسی سێیەم: بنیاتنانی بیروباوە لە سەردەمی مەککەدا. ........................ ١٥٨
باسی چوارەم: مەسەلەی خواپەرستن لەسەردەمی مەککەدا........................ ١٦٨
یەکەم: خاوێن کردنی نەوەی یەکەم بەجۆرەها خواپەرستن:........................ ١٦٨
دووەم: پەروەردەی بیرو هۆش. ........................ ١٧٠
سێ یەم: پەروەردەی لەش........................ ١٧١
چوارەم: پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر ڕەوشتی جوان و........................ ١٧٢
پێنجەم: پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر ڕەوشتە جوانەکان. ........................ ١٧٤
**بەشی سێیەم:** ئاشکراکردنی بانگەوازو شێوازەکانی دژایەتی ........................ ١٧٩
باسی یەکەم: ئاشکرا کردنی بانگەواز ........................ ١٧٩
* گرنگترین رخنەی بتپەرستان:........................ ١٨٢
یەکەم: ڕەخنەکانیان لەسەر یەکتاپەرستی........................ ١٨٢
دووەم: باوەڕنەبوونیان بەڕۆژی دوایی. ........................ ١٨٤
سێیەم: ڕەخنە گرتنیان لەپێغەمبەرﷺ........................ ١٨٧
چوارەم: هەڵوێستیان لەقورئانی پیرۆز........................ ١٨٩
باسی دووەم: تاقیکردنەوە........................ ١٩٢
حیکمەتی تاقیکردنەوەو سودەکانی: ........................ ١٩٣
باسی سێیەم: شێوازەکانی بەرەنگاری بانگەوازی ئیسلام لەلایەن. ........................ ١٩٧
یەکەم: هەوڵدانی قورەیش بۆ دوورخستنەوەی ئەبو تالیب:........................ ١٩٧
دووەم: هەوڵدان بۆ ناشیرین کردنی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ. ........................ ٢٠٠
سێیەم: ئەو ئازارو ئەشکەنجانەی پێغەمبەرﷺ تووشی بوون. ........................ ٢١٤
چوارەم: ئەو ئازارو ئەشکەنجانەی تووشی هاوەڵانی پێغەمبەر بوونﷺ ........................ ٢١٩

پێنجەم: هۆی شەڕنەکردن لەمەککەو، گرنگیدانی پێغەمبەرﷺ بەبنیاتنانی ناو خۆیی. ..... ٢٣٩
شەشەم: کاریگەری قورئانی پیرۆز لەبەرزکردنەوەی وردی هاوەڵاندا. ........ ٢٤٧
حەوتەم: شێوازی دانوستان. ........ ٢٥٢
هەشتەم: شێوازی مشت ومڕو هەوڵی یەکخستن. ........ ٢٦١
دەیەم: ئابڵۆقەی ئابووری وکۆمەڵایەتی لەکۆتاییﷺ . ........ ٢٧٠
بەشی چوارەم: کۆچکردنی حەبەشەو، دەردەسەری تائیف و، ........ ٢٧٩
باسی یەکەم: مامەڵەکردنی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ سوننەتی ........ ٢٧٩
باسی دووەم: کۆچکردن بۆ حەبەشە ........ ٢٨٣
یەکەم: کۆچکردنی یەکەم بۆ خاکی حەبەشە........ ٢٨٣
* ئاشکرا بوونی ئیمان: ........ ٢٨٣
* هەڵهاتن بەئایین : ........ ٢٨٤
* بڵاوکردنەوەی بانگەواز لەدەرەوەی مەککە: ........ ٢٨٤
* گەڕان بەدوای جێگایەکی بێ مەترسی بۆ موسڵمانان : ........ ٢٨٥
دووەم: کۆچی دووەمی موسڵمانان بۆ حەبەشە. ........ ٢٩١
باسی دووەم: ساڵی خەم ودەردەسەری تائیف........ ٣١٠
یەکەم: ساڵی خەم. ........ ٣١٠
دووەم: گەشتەکەی پێغەمبەرﷺ بۆ تائیف. ........ ٣١١
باسی چوارەم: ئیسراو میعراج..... ئەوپەڕی ڕێزلێنان........ ٣٢٩
دووەم: سوودو وانەو پەندەکان........ ٣٣٥
**بەشی پێنجەم: گەڕان بەسەر هۆزەکانداو کۆچکردنی هاوەڵانی بۆ مەدینە** ........ ٣٤٣
باسی یەکەم: گەڕان بەسەر هۆزەکاندا بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری........ ٣٤٣
یەکەم: هەندێك لەشێوازەکانی پێغەمبەرﷺ لەبەرپەرچدانەوەی. ........ ٣٤٤
دووەم: دانوستان لەگەڵ بەنی عامیر........ ٣٤٦
سێ یەم: دانوستان لەگەڵ بەنی شەیبان........ ٣٤٦
چوارەم: سوودو وانەو پەند. ........ ٣٤٨
باسی دووەم: کەژاوەی چاکەو پێشەنگی ڕوناکی........ ٣٥١
یەکەم: پەیوەندیە سەرەتاییەکان بەئەنصارەکان لەکاتی حەج وعومرە........ ٣٥١
دووەم: سەرەتای موسڵمان بوونی ئەنصارەکان. ........ ٣٥٣
سێ یەم: بەیعەتی عەقەبەی دووەم........ ٣٥٤
چوارەم: بەسەرهاتی ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو، سەعدی........ ٣٥٦

پێنجەم: سوودو وانەو پەندەکان.................................... ٣٥٩
بەیعەتی عەقەبەی دووەم.................................... ٣٦٣
باسی چوارەم: کۆچ کردن بۆ مەدینە .................................... ٣٧٣
دووەم: پێشەنگی موسڵمانان.................................... ٣٧٤
سێ یەم: جۆرەکانی دژایەتیکردنی قورەیش بۆ موهاجیرەکان.................................... ٣٧٦
چوارەم: ماڵە لەئامێزگرەکان وکاریگەری لەسەر دڵەکان.................................... ٣٨٤
پێنجەم: بۆچی مەدینە وەکو پایتەخت هەڵبژێردرا. .................................... ٣٨٨
**بەشی شەشەم: کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکر ﷺ** .................................... ٣٩٥
باسی یەکەم: تێکشکانی پلانی بتپەرستان بۆ تیرۆرکردنی پێغەمبەرﷺ.................................... ٣٩٥
دووەم: ڕێکخستنی پێغەمبەرﷺ بۆ کۆچکردن. .................................... ٣٩٦
سێ یەم: دەرچوونی پێغەمبەرﷺ و گەیشتنی بەئەشکەوتەکە.................................... ٣٩٨
چوارەم: دڵ ناسکی پێغەمبەرﷺ لەکاتی دەرچوونی لەمەککە.................................... ٣٩٨
پێنچەم: چاودێرکردنی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرﷺ.................................... ٣٩٩
شەشەم: ڕەشماڵی ئوممومەعبەد لەڕێگای کۆچدا. .................................... ٤٠٠
حەوتەم: ڕاونانی سوراقەی کوڕی مالیك بۆ پێغەمبەر ﷺ.................................... ٤٠٢
هەشتەم: پاکی بۆ ئەو خوایەی کەدڵەکان دەگۆڕێ.................................... ٤٠٤
نۆیەم: پێشوازیکردنی ئەنصارەکان لەپێغەمبەر ﷺ.................................... ٤٠٤
دەیەم: پەندەو ئامۆژگاری. .................................... ٤٠٧
باسی دووەم: ستایش کردنی موهاجیرەکان و، هەڕەشەکردن لەدواکەوتوەکان.................................... ٤٢٧
یەکەم: وەسف کردنی موهاجیران بەخسڵەتی چاك . .................................... ٤٢٨
دووەم: بەڵێن بەموهاجیران.................................... ٤٣١
سێ یەم: هەڕەشە کردن لەوانەی دواکەوتن لەکۆچکردن.................................... ٤٣٢
**بەشی حەوتەم: کۆڵەکەکانی دەوڵەتی ئیسلام لەمەدینە** .................................... ٤٣٧
باسی یەکەم .................................... ٤٣٨
کۆڵەکەی یەکەم: دروستکردنی مزگەوت لەمەدینە. .................................... ٤٣٨
باسی دووەم: برایەتی لەنێوان موهاجیرو ئەنصارەکاندا. .................................... ٤٥٨
باسی سێیەم: دەستوری مەدینە .................................... ٤٧٥
باسی چوارەم: بەربەرەکانی یەکتری کردن و بزوتنەوەی پۆلە سەربازیەکان. .................................... ٥٢٣
یەکەم: سوننەتی بەربەرەکانی. .................................... ٥٢٣
باسی پێنجەم: بەردەوامی بونیاتنانی پەروەردەی و زانستی. .................................... ٥٥٣

باسی شەشەم: ڕووداوەکان و یاسادانان ........ ٥٧١
یەکەم: چارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری ........ ٥٧١
دووەم: هەندێ لە یاساکانی ئیسلام ........ ٥٧٢
**بەشی هەشتەم**: غەزای بەدری گەورە ........ ٥٧٧
باسی یەکەم: قۆناغی پێش جەنگەکە ........ ٥٧٧
باسی دووەم: پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان لە گۆڕەپانی جەنگدا ........ ٥٩٤
یەکەم: دروست کردنی کەپری سەرکردایەتی ........ ٥٩٤
دووەم: هەندێك لە نیعمەتەکانی خوا لەسەر موسڵمانان پێش شەڕەکە ........ ٥٩٥
سێیەم: پلانی پێغەمبەر ﷺ لە جەنگەکە ........ ٥٩٧
باسی دووەم: هەڵگیرسانی جەنگ وشکستهێنانی بتپەرستان ........ ٦٠٥
باسی چوارەم: چەند دیمەن و بەسەرهاتێك لە جەنگەکەوە ........ ٦١٥
یەکەم: کوژراوی ستەمکاران ........ ٦١٥
دووەم: لە دیمەنەمەزنەکان ........ ٦٢١
ناوەڕۆك ........ ٦٢٥